

# تەصەووف چی یە ؟


نوسینی

ئەمین شێخ علاء الدین

نەقشبەندی



ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیری و لاوان یارمەتی لەچاپدانی داوە

## پێشکەش کردن

پێشکەش بێت بەدایك وباوکم

ئەو دایکو باوکەی گەورەترین

ئاواتیان دینداری و خوێنەواریی ئێمەبو

«اَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا اَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللّٰهِ؟»

# تەصەووف چی‌یە؟

رێبازی نەقشبەندیی‌لە تەصەووفداکامە؟

تەسەووف چ کارێکی کردوەتە سەری وێژەی کوردی ؟

- تەصەووف چۆن وە لەکەیەوە هاتوە ؟
- فەرقی فەلسەفەو تەصەووف چی‌یە ؟
- فەرقی تەصەووفی ئیسلامیی وە تەصەووفی بەرلەئیسلام چی‌یە ؟


نوسینی

ئەمین شێخ علاء الدین

نەقشبەندی




١ - چەن تێبینی.

٢ - گفتوگۆیێک لەگەڵی خوێنەواری کورد.

٣ - پێشەکی.

# چەن تێ بینی یێک

نزیکەی حەفدەساڵێکە وردەوردە سەبارەت بەتەصەووف شتم خوێندوەتەوەو مەبەستم یادداشت کردوە ، وە کتێبی زۆریشم بەدەس هێنان کە لە پێ ڕستی پایانا بەیارمەتی خوا ناوەکانیان پێش کەش ئەکەم ، مەبەستم ئەوەتەبڵێم ئەوشتانەی کەنوسیومە بڕێ جار دەسنیشانی سەرچاوەکەم کردوە ، بڕێ جاریش وەکو باوەڕیکی خۆم نوسیومە ، ئەمەوێ بڵێم زۆرجار لەو بەراوردانەدا ، گۆڕینەکان دەق بەدەق نین ، بۆچی ؟ چونکە لەڕاستیدا زۆریان شتێکن پاش بەرانبەرڕاگرتنی دەیان باوەڕ ، سەبارەت بە مەبەستێك ، وە تەتەڵەکردنو چنین و لەهێڵەك دانیان ، شیرەی مەبەستەکانم گرتوەو ، شتێکم لێ نوسیوە ، هەم ناوەڕۆکەکەی شیاوی تێ گەیشتن وە خۆێندنەوەی خوێنەواران بێت ، وەهەم بەباشترین جۆر مەبەستەکەم روونکردبێتەوە ، وەکوبڵێین ووشەی فەنا ، یان ، تەوحید ، یان ، تەوبە ، دەیان باوەڕم موتالاٚ کردوە ، ئەوشتەم لێ هەڵبژاردوە کەنوسیومە ، شایەت دێڕێکی باوەڕی

ئەونوسەرەکەو دودێری هی ئەمی تر بەشێکی هی ئەوی تربێ ، تابوەتە شتێکی پاکو پوختەو شیاوی تێگەیشتن ، ئەوەشی دەق بەدەق بێت وا دیارە .

بەلاّم ئەوەی هەیە ئەوەی کەنوسراوە هەموی لەم سەرچاوانە وەرگیراوە کەلەپێ ڕستەکەدا نوسراون ، کتێبی واهەیە بگرە دێریکم لێ بەدەس هانی بێت هی وایشی هەیە چەن لاپەڕە .

بێگومان تێگەیشتنی خۆیشم لەمەبەستەکە ، هەم بەهۆی خوێندنەوەو هەم بەهۆی دیتن و بیستن ئەکەوێتە سەری باسەکان .

ئەمەسەبارەت بەباسی تەصەووف ، بەلاّم ئەو موناقەشەو وتووێژە بێگومان هی بیروباوەڕی خۆمە .

وەمێژوی ژیانی هەرکەسم نەنوسیبێت ئەوە دەستم نەکەوتوە .

مەبەستی دووهەم ، سەبارەت بە ڕێنوسە ، هەرچەن هەوڵی خۆم داوە ، بەلاّم زۆرجاریش بەهۆی عادەت کردنی دەست بەڕێنوسی لەمەوپێشەوە ، بەتایبەت «**واوی عەطف**» ، ئەگەر لەوهەڵەیەی تیابو ، ببورن . ئەبێ ئەوەش بڵیم بڕێ واو هەیە ، هەرباوەڕم لەسەری ئەوەتە ئەبێ جوێ نەکرێتەوە لەپیتە پێشوەکە ، ئەویش لەکاتی «**وەصفی مورەککەب**» دا وەکو بڵیین «**شۆخوشەنگ ، جەموجۆر**» ، لاموایە ئەبێ واوەکە بنوسرێت بەپیتی پێشەوە ، وە (**شۆخ وشەنگ**) یان (**جەم وجۆر**) ، بەدروست نازانم ، بەلاّم جوان و ناشیرین ئەوە جوێ بێت باشە .



برای‌کوردم ، لەم رۆژگارەدا کەزانیاری زۆر والەپێش‌کەوتنا ، کامپیوتەرو ئەلکترونیك ، وەهەزاران جۆرە پێویستییێکی ژیان ، بەمێشکی مرۆڤ ئەکەوێتەکار ، سا ، یان هۆی ئاوەدانکاری ، یان وێرانکارین ، ئەو ولآتانەی کەخۆیان خاوەنی ئەو زانیاری‌یە بەرزانەن ، چونکی زانیاری بایەخی هەیە بەلایانەوە ، هەر ئەو ولآتانە زۆر بەگەرمی وان بەشوێنی ناسینی زانیاری تەسەووفەوە ، ئەیانەوێ ئەم‌زانیاری‌یە بناسن ، شایەد بکرێ لەوریگەوە خزمەتێ بکەن ، بەئاوات‌و داخوازەکانی خۆیان جا ئاواتی وێرانکاری بێت ، یان خزمەت بە زانیاری ، رۆژهەلآت‌ناسان تەسەووف ناسانێکی وەکو ، نیکلسۆن ، وەجولدزیهر ، وە ماسینیۆن وصەدانی‌تر ، ئەمانە ، زۆر کۆلّیونەتەوە و کتێبی تەسەووفیان تەرجومەکردوەو خۆیشیان نوسیویانە ، بەلآم نوسینەکان هەرگیز لەدلّسوزی‌و دلّپاکی‌یەوە سەرچاوەی نەگرتوە چەندە خزمەتیان کردبێت ئەوەندەش شتی نارەوایان تاشیوە ، وەزۆریشی لە بەدگومانی‌ی خۆیان لەئیسلام وەناشارەزایی لەقولآیی کارەکەوە سەرچاوەی گرتوە .

بەلآم هی‌وایشیان‌بوە ، وەکو «**لیوبولدفایس**» کەپاشان ناوی «**محمد اسد**»ی بۆخۆی هەلّبژاردوە کورنوشیان‌بردوە بۆهەق‌وراستی ، هەم موسولّمان‌بون ، وەهەم سەبارەت بەو چەوتانە راوەستاون وەپەردەیان لەسەری کردەوەکانیان لاداوە .

محمد اسد کەخەلّکی نەمسایە لە کتێبێکی خۆیا «**الاسلام علی مفترق الطرق**» لاپەرەی (**٥٢**) بەباشی‌ی پەردەی لەسەری چەوت‌کاری ئەو رۆژهەلآت‌ناسانە لاداوە کە بەعەمدی ویستویانە ئیسلام وەتەسەووف بەدناوبکەن .

جا ئالەم‌چۆنیەتی رۆژگارەدایە ، تۆکە خۆت خاوەنی‌ئەم‌سەرمایە فیکری‌و مەعنەوی و زانیاری‌یەی ، لێت‌بوەتە رموزن ، وەدورت لی‌گرتوەو بە بێگانەی

سەیرئەکەیت ، لەکاتێکا تۆزیاتر لەهەموکەسێ شیاوی‌ئەوەیت لەم‌زانیاری‌یەبگەیت‌و لێی‌بکۆڵیتەوە کەچی بەپێچەوانەوە . هەرناتەوێ بزانیت چی‌یە ، بەلاّم بەراستی زۆر زیانێکی‌گەورەیە ، مرۆڤ لەشتێ نەگات ، وەلەبارەیەوە باوەڕ دەربڕێ ، وە لەوەش‌زیان‌بارتر ، بۆهەرخوێنەوارێ ، ئەوەتە (زانیاریێك) لەبن‌دەسیا بێت وەهەوڵی ئەوەنەدا لێی‌تێ‌بگات ، کەواتە ئەی‌برای‌کورد ، ئەم‌زانیاری‌یە کەلەپوری‌تۆیە ، ئەم زانیاری‌یە لەگەورەپیاوانێکی وەکو : باباتاهیری هەمەدانی ، پیرخدری‌شاهۆ ، پیرشالیاری هەورامان‌و هەرنەوەدونۆ پیرەکەی هەورامان ، لەشیخ عیسی وشیخ موسی ، شیخ حەسەنی‌گڵەزەردە لەشێخ ڕەشی‌شارەزورو لە شیخ مارفی‌نۆدێی ، لەمەولانا خالیدی‌نەقشبەندی ، لەکاکەئەحمەدی‌شیخ ، لەشیخ عوسمانی‌تەوێڵەو شێخ عومەری‌بیارە ، وە لەصەدان و هەزاران سەربەرزو سەرەفرازی دنیاوقیامەت ، بۆتۆ بەجێ‌ماوە ، بۆچی لەم‌زانستە تۆراوی‌و لوتت لێ‌هەڵکردوە ، بەدەردی ڕۆژهەلاّت ناسان ئەخوات !!! بەلاّم بەدەردی تۆ ناخوات !!!؟ .

تا برام ئەمرۆ پێش‌کەوتوترین ولاّتانی جیهان لەچوارچێوەی «**پاراسایکۆلۆجی**» «**PARAPSYCHOLOGY**» «**علی هامش علم النفس**» دا ، یان «**MYSTICISME**» «**العلم الروحاني او المذهب الصوفي**» دا ، لەم زانیاری‌یە گرنگە ئەکۆڵنەوە ، کەواتە تۆیش هەوڵ‌بدە بزانی‌چی‌یە ، ئەوساکە ، ئەرچاك‌بو ، بکەوە شوێنی ، خراپ‌بو لێی‌دورکەوە ، بۆهیچکامیشی‌نەبو هەربۆ زیادە خوێنەواری‌و زیادە تێ‌گەیشتنیش‌بێت ، پێویستی هەمو وێژەوانێکە لەتەصەووف بگات ، تابتوانێ گوێ‌ڕاگرێ بۆسۆزی بابەتاهیرو مەولەوی ، یان بۆپەروانەی سوتاوی خۆشەویستی ، رابیعەی عەدەوی ، وە حەللاج ، وەابن العربي ، وەصەدان شاعیری‌کورد کە بەفارسی‌و عەرەبی شیعریان‌وتوەو لەگەڵی خوای خۆیانا ڕازونیازیان کردوە . یان هەزاران شاعیری عەرەب وتورك‌و فارس وزمانەکانی‌تر .

پاش‌ئەم‌گفتوگۆیە لەگەڵی‌ئێوەی خۆشەویستا ، ئەوەپیشەکیێك سەبارەت بەچۆنیەتی نوسینی ئەم‌کتێبەو برێ بەسەرهاتی خۆم کەبونەتە هۆی نوسینەکە پێش‌کەش ئەکەم .

# پێشەکی

تەصەووف ووشەیێك نەبو بەلای منەوە بێگانە بێت . لەرۆژێکەوە چاوم کردوەتەوە وە ئاوەزم بەژیانشکاوە ، وشەی تەوبەکردن ، سلوكکردن ، حاڵلێهاتن ، کەشفوکەرامەت ، وە هەمو ووشەکانی تری تەصەووف ، کەمتازۆر ئەکەوتەگوێم ، بێگومان شارەزایییەکانم لەو ووشانە زۆر سادەو ساکار ، وە رەواڵەتی بون ، ووردە ووردە تەمەن چویەسەر ، بەڵام بەپێی رۆڵەیێکی خانەدانێکی تەصەووف ، زانینی من لەم رێبازەدا پێشنەئەکەوت ، چونکە بەراستی شاگردیی باوکمم نەئەکرد ، هەروەکو باقی رۆڵەکانیتری خانەوادەکە ، بەتایبەت هاو تەمەنەکانی خۆم ، ئەوتیگەیشتنە هەروا بەچەشنێکی سادە ، مایەوە ، تا زیکەوتیژیان واهاتەپێشەوە ، لەتەمەنی سێنزە ساڵیدا بوم ، دایکم خوابیبەخشێ رۆیشت بۆدیدەنی براکانی بۆ «سوریە» ، من لەوکاتەدا دووساڵبو دەسم لەخوێندنی حوجرە ، هەڵگرتبو وەلەمەکتەبا ئەمخوێند ، وەتازە چوبومە پۆلیشەش ، کاتی سەفەر پاییزبو تازە خوێندنگە کرابویەوە ، بەلای کەسەوە هیچگرنگ نەبو منوبراکانم ثابتومظهر برۆین بۆ دیدەنێکی ئاوا دوورودرێژ ، وەبۆماوەی ساڵێ ، یانزیاتر ، خوێندنەکەمان بنێین بەتاقەوە ، بەهەرحاڵ ، پایزی (١٩٤٤)بو کەرۆیشتین ، پاش نۆمانگ جا هاتینەوە ، کەهاتینەوە ئاخریبەهار بو ، مەبەستم ئەوەتە کەچوینە «**دیرالزور**» ماڵیخاڵۆکانم ، دیم خەڵکی ئەوناوە ، زۆریان موریدو مەنسوبی باوکمن ، بەرادەیێك رێز لەئێمە ئەگرن هەرمەپرسە ، سەیرئەکەم ئیترمن لیرە ، نەك هەرنابێ وەکو منداڵێك هەڵسمودانیشم ، بەڵکو ئەبێ وەکو پیاوێکی ماقوڵبم ، بەکورتیی ئەم نۆمانگە من ، ناویشارم نەدی ، نەمزانی دنیا چخەبەرە ، تاقەشەوێك «**خەتموتەهلیلە**»م بەجێ نەهێشت .

«**خەتم ذیکری تایبەتی نەقشبەندییەکانە . تەهلیلەش ذیکریخوایە بەدەنگیبەرز ، کە لەزەمانی شیخ عومەری باوامەوە لەتەکیەکانی ئێمەدا کراوە**» بەڵێ ، بەکوردیی لیرە ، خوایخۆم بەهەقناسی ، وەخوا ، ریازەت ، یان سەعادەتی ، ئیجباریی کردە بەشم .

لەم ماوەیەدا تا رادەیێك سەبارەت بەم ڕێڕەوە چاوم کرایەوە ، ئیمە لەوێ‌بوین جەنگی جیهانیی دوهەم دوایی‌هات ، وەشۆڕش لەدژی ئیستیعماری فەرەنسەش ڕوی‌داو سەرکەوت .

کە گەڕاینەوە بۆبیارە ، ئیتر‌من خووخدەم گرتبو بە خەتم‌و خانەقاو ئەوجۆرەشتانەوە ، وە هەرلەوێ ناچار مێزەرێکی سپیشیان بەست بەسەرمەوە .

لەبیارەش ئیتر تازە نە دڵم‌ئەهات و نەڕویشم‌بو لەوقاڵبە بێمەدەرەوە ، کەنۆمانگ‌بو ، خدەم پێوەگرتبو ، لەم‌کاتەدا ، لای مەرحومی مامۆستا مەلابەهاءالدین ، ئیمامی‌خانەقا ، کە خەڵکی **(دزاوەر)** بو ، دەرسی تەجویدی‌قورئان ، وەلای جەنابی مامۆستامەلاکەریم ، دەرسی نەحوو صەرفم ئەخوێند ، حوجرەیێکم‌بو ، لەخانەقا ، لەبانی‌مەرقەدا ، وە بەهیچ‌جۆرێ توخونی ناوی ماڵ‌و خێزان نەئەکەوتم ، تەنانەت ڕوم نەئەهات بڕۆم بۆماڵی براکانی‌ترم ، تارۆژێ لەوماوەیەدا ، لەخذمەتی باوکما بوم ، ماموستا مەلابەها تەشریفی هاورد ، وەزۆر تەعریفی منی‌کرد لای‌باوکم ، کەوا هەمیشە دێتە خەتم ، وە بەیانیان بەجەماعەت نوێژئەکات ، وە لەم‌جۆرەشتانە ، شێخ‌دیاربو زۆری پێ‌خۆشە ، ئەوشەوە بانگی‌کردم فەرموی تەمەسسوکی تەریقەت‌بکە ، واتە بیەرە سۆفی ، منیش دەس‌بەجێ لەبەردەمیا دانیشتم وە «**تەلقینی» تەریقەتی کردم**» ، بەلام ڕاستەکەی ، نەبەرلەوا ، وە نەلەپاش ئەو تەلقینەش ، کەئیستەش بەگەورەترین تۆشەی ژیانی خۆمی ئەزانم ، هیچم لێ‌حاڵی‌نەبو ، لەوەی کەئەوترێ ، لەرێ‌بازی تەصەووف‌دا دەستی خواپێ‌داوان ئەکەوێت ، وادیاربو خوا نەی‌کردبوە نەسیب ، وەکو ئەفەرمێ «**ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء**» لاموایە ، زۆرتری هی‌ئەوەبو من بەوجۆرەی بشێ نەم‌ئەزانی چی‌بکەم ، ڕویشم‌نەبو هیچ‌بپرسم لەباوکم ، ئەویش تەمەنی‌گەورەبو لەهەشتاساڵ زیاتربو ، جەنجاڵ‌و قەرەباڵغ‌و ئەوانەش فرسەتیان نەئەدا ، بێ‌پەرژێتەوە سەری ئیمە ، بەهەرحاڵ ، من دەس‌کەوتێکم دەس نەکەوت ، جگە ئەوپەیوەندە ڕۆحی‌یە ، وەجگە . عەلاقەو هۆگرییێك بە پیاوچاکانو خواناسانەوە ، کە هەرئەوە خۆی ، هۆییێك‌بو بۆئەوەی من ئەم‌بەرهەمە بێرمەدەست ، واتە ئەم‌کتێبە ، ...

پاش‌ساڵێ ، سەرلەنوێ چومەوە مەکتەب ، وەلەپاشان ، هاتم بۆسلیمانی بۆخوێندن لە ناوەندیی‌دا ، سالی **(٤٧ و ٤٨)** .

لێرەدا ، چەن مەبەستێك هەیە : کاتی گوێنی هاتوە

**یەکەم :**

هەمیشە باوکم ناوی باوکی خۆی ، حەزرەتی شیخ عومەر ضیاءالدینی : لەسەر زمانبو هەمیشە باسی کەشفو کەرامەتو دەسەڵاتی مەعنەوی باوکی ئەکرد ، یان هی باوای حەزرەتی شیخ عوسمان ، بەڵام ، جگە ئەودوانە ، زۆر ڕێزی ئەگرت لەدووکەس ، وەهەمیشە ناوی ئەبردن یەکێ حاجی **(شیخ عبد الرحمن)** ی مامی ، کە نازناوی شیعرەکانی «**وەفا**» یە ، وە دەسەلاتی مەعنەوی لەرادەبەدەربوە ، وە هەروەها ، ئیامی غەززالی ، وەزوربەی لەکاتی برێ باسی تەصەووفدا ، دەس نیشانی ئەکرد ، بۆ وتەکانی غەززالی ، جامنیش ئەم هەستە ، کاری تێکردیوم ، وە تائیستەش ئەم دوو زاتەم خۆش ئەوێ ، وە هەمیشە وان لەکونجی دڵما .

مەبەستێکی تر ئەوەتە ، لەکاتی باسی کەشفو کەرامەتدا وتم بەڵگەیێکم هەیە ، ئەویش بریتی یە ، لە کاغەزێك ، کاتێ ئێمە لەسوریە بوین ، باوکم نوسیویەتی بۆ ئێمە ، نامەکە خەتی ماموستا سەیید مەزهەری **(عەلەوی)** یە کە کاتی باوکمبو ، بەلام لە قەراغەکەیا ئەم چەن ووشەیە باوکم بەخەتی خۆی نوسیویەتی ، قبلکم ایام سمعت صوتا قال ابن عبدالخالق مریض ماادري أصحيح أم مناد غير صادق أخبروني ، واتە دەنگێکم بیست گوتی کوری «**عبدالخالق**» نەخۆشە ، دا هەواڵم لێ بگێڕنەوە بزانم ئەودەنگە ڕاستبوە یام نا .

شتەکەش بەمجۆرەبو پیاوێکمان بوو ، ناوی حەمەی ئەولخالق بو ، کوڕێکی ڕاستگۆو بێ درۆو دەلەسەبو ، نوێژوڕۆژوویەکی ڕێکوپێکی هەبو ، باوکیشی هەر خذمەتی ماڵی باوکمی ئەکرد ، ئەم حەمەیە هەمیشە لەگەڵی منابو تەنانەت بۆحوجرەو بۆمەکتەبیش ، بەوبۆنەوە ، دەرسیشی خوێند ، تاپۆلی شەش ، کەڕۆیشتین بۆسوریە هات لەگەڵما ، هەر گەیشتینەئەوێ ماوەیێکی نەبرد ، حەمە توشی گرانەتێ یێکی خرابو ، پزشکەکان فەرەنسەیی بون ، هاتن ، وە قەدەغەیانکرد ئەبێ پارێزی لێبکرێت ، با خەڵکی تریش دوچار نەبن ، وەوتیان ئەمە پاش ئەوەندە ڕۆژ جا چاك ئەبێتەوە .

بەکورتی پاش ڕۆژێ ، یان ، دووڕۆژ ، حەمە عارەقی کردو چابویەوە ، کابرای فەرەنسەیی هەرئەهاتو هەرئەچو ئەیوت ئەمە سەیرە چۆن وازووچاكبو .

بەکورتی ، پاش ماوەیێك نامەیێکی باوکم بەبەریدا هات ، بەریدی ئەوزەمانەو جەنگی جیهانی ی دووهەم ، هەمان نامە کە لەپێشاوتم ، مێژوی نامەکەش ، هەمانشەوبو کە حەمە عارەفی کردو چابویەوە ، جائەمە لەروانگەی تەسەووفەوە هەم کەشفە هەم کەرامەت ، کەشفەکە ، ئەوەتە ئەودەنگە هاتوەتە گوێی ، یان خوا پیشانی داوەو ئیتر نەی ویستوە بلێ بەچاوی خۆم دیم ، کەرامەتەکەش ، ئەوەتە دوعای بۆکردوەو چاك بوەتەوە ، بەرلەوەی کەپزشکەکان چاوە روانی چاكبونەوەی بن ، ئەگەربمەوێ کەرامەتی شێخ بنوسم ، کتێبێکی ئەوێ ، تەنانەت هەرئەوانەش بنوسم کەلەدەمی ماموستامەلاکەریمم بیستوە ، کتێبێکی ئەوێ ، «بەراستی جەنابی ماموستامەلاکەریم کەماوەیێکی زۆر لەخزمەتی شێخدابوە وەلەسەری دەستی شێخدا تەمەسسوکی کردوە ، ئەوەندەی کەشف وکەرامەتی شیخی باوکمی لەبەرە ، بەشی یەك کتێب خۆزگە هەروا کەمەلاحامید وەشێخی سەرانی سەرگوزەشتی ژیانی شیخ عوسمان ، وە مەلاموحەممەدی باکی سەرگوزەشتی ژیانی شێخ عومەریان نوسیوە ، کە هاوچەرخو شاگردی ئەو بون ، بەوجۆرەش ، جەنابی ماموستا مەلاکەریم ، سەرگوزەشتی شیخی باوکمی ئەنوسی ، نەك بە کورتی ، بەلکو بەوجۆرەی کەشارەزایەو خۆی دیویەتی» .

شێخی باوکم تەنها ئاواتی ئەوەبو کەئێمە رێگەی تەصەووف لەدەس بەرنەدەین ، وەهەرگیز هیچ هەلێکی لەدەس نەئەدا ، بۆ ئامۆژگاری کردن ، دل گەرم کردن ، پالّ پێوەناتمان بۆگرتنەبەری ئەوشاریگەیە ، والیرەدا بۆنمونە ، سێ نامەی باوکم یەکێ بەعەرەبی ، یەکێ بەکوردی ، یەکێ بەفارسی ، کە بۆمنی نوسیون ئەخەمەپێش چاو ، کە زۆرشتی تیادا روون ئەبێتەوە .

لای کەمی بەناوی بەلگەیێك بۆجۆری نوسینی شێخ بەوسی زمانە ، چونکە هەرسێکی خەتی خۆیەتی ، وە دووهەم بۆدەرکەوتنی ئەمەی ئەوگەورەپیاوانە ویستویانە منالّەکانیان چۆن بن ، وەچی یان لەوان ویستوە ، وە زۆر پەندی تر.

قوناغی سێهەمی سەردەرهاوردنی من لەزانیاری تەصەووف ، بریتی بو لەنوسینی ئەوکتێبە فارسی یەی ، کەبەیارمەتی خوا پاشی چاپی ئەم کتێبە دەس ئەکەمە گورینی بۆکوردی ، کتێبەکەش بریتی یە لەچۆنیەتی پەیدابونی زانستە ئیسلامی یەکان ، جالەکاتی گەیشتنە بەشی تەصەووفدا ، کەوتمە سەرچاوەبشکنینو کتێب پەیدا کردنو کتێب خوێندنەوە ، بەراسی لەم ماوەیەدابو ، کەبەباشی تەصەووفم بەچەشنێکی قولّو شارەزایانە ناسی ، بەتایبەت ، لەکاتی خوێندنەوەی هەرکتیبێکا ،

دەس نیشانی ئەکرد بۆ چەن سەرچاوەیێك ، ئەچوم ئەوانیشم سەیرئەکرد ، بەوجۆرە بۆم دەرکەوت ، تەصەووف دەریایێکی بێ پایانەو زانیارییێکی گرنگەو ، ئێمە لەکوێو تەصەووف لەکوێ ، ئەرزوئاسمان لێك دورین .

بەتایبەت لەکاتی نوسینی ژیانی بەشێك لەگەورەپیاوانی تەصەووف دا ، عاشقی رێبازەکەیان بوم ، وەئەگەر خوا بۆم بکات ئەمەوێ لەکتێبێکی جیاوازا ، راڤەی ژیانی سەرزنجیرەی تەریقەتەکان بنوسم ، وەکو تەریقەتی شاذلی ، رفاعی ، قادری ، نەقشبەندی ، کوبرەوی ، چەشتی ، تیجانی ، مەولەوی ، سەهرەوەردی وەئەوانی تر ، سابزانین ، تەمەن تا کەی ماوە ئەدات . وە تاچ رادەیێ بۆم ری ئەکەوێ . بەراستی من ئەمەویست ، نوسینی ئەم کتێبە دانێم بۆپاشتر ، بەڵام ، چەن شتێك بونە هۆی دەس جوڵاندنەوەم لەم کارەدا . یەکەمیان : وابزانم ساڵی هەشتاویەك بو لەسلیمانی دا کۆبونەوەیێك کرا ، بۆ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی شیعری کلاسیك ، منیش بانگ کرابوم ، لەوێدا دیم برێ لەبرایان ، سەبارەت بەتەسەووف باسیان کرد ، وەزۆربەیان واتێگەیشتون تەسەووف ، ئەبێتە شێخ یەتی ، وە هەر کەموکورییێك لەکوڕە شیخی لەرێ باوك و باپیر دەرچوە ، هەموی گوناهی تەسەووفە ، جائەو تاوانە هەروەکو ئەوەتە ، تاوانی چەوتی و بەدرەفتاری موسڵمانەکان ، بکەینە گوناهی دینی ئیسلام ، شایەد لەناوی هەموی ئەوخەڵکەدا چوار موسوڵمانی رێك وپێك دەس نەکەوتایێ ، گوناهی ئیسلام چی یە ، تەصەووفیش هەربەوچەشنەتە ، تەصەووف کاکڵەی ئیسلامە ، تەصەووف موبەمو ئەنجام دانی ئیسلامە ، بەدەرو ، بەدەرون ، بەئاشکراو بەنهێنی ، ئیترمن ناوی خۆم بنێم سۆفی ، وەفرم بەسەری تەصەووفەوە نەبێ ، گوناهی تەسەووف چی یە . ؟ هەروەها هەستی ئەوەم لەوبرادەرانەکرد ، کە ، واچاوەروان ئەکرا ، ئەبێ تەصووف ، وەکو زانیارییێکی ماددی ، بەرهەمی ماددی هەبێت ، وەشیاوی پەرە پێ دان بێت ، هەروەکو هەموهونەرێکی زۆر زۆرگەورە ، لەناوی ملیۆنها کەسا یەك کەس ئەتوانێ بگاتە یەکێ لەدواپلەکانی ، هەروەکو سەیری زانیاریی فەلسەفە ئەکەین سەیرئەکەین لەصەدەیێکا جایەکێ بەناوی فەیلەسوف هەڵ ئەکەوێ ، لەحاڵێکا ، فەلسەفە هەرگیز ناگاتە ئاکام و دەس مایەیێکی ، یێکەموزیاد ، بەڵکو هەر سەیقەلی دەرەوەو ، پاك کەرەوەی هەست و بیرو زانیاری مرۆڤەو زاخاودەری مێشك ، وەفەیلەسوفەکان تائێستەش هەر بەشوێنی خوادا ئەگەرێن و هیچکام نەگەیشتونەتە ئاکام ، ئەوەش بگاتەئاکام ،

هەرخەیاڵەو پاش ماوەیێك یەکی تری بۆتاین ئەبێ، هەرچی ئەوریساویەتی ئەم ئەیکاتەوە بەخوری، وەسەرلەنوێ تێ هەڵ ئەچێتەوە بەڵام صوفی یەکان هەمووخۆشحاڵ وسەربەرزن بەوەی گەیشتونەتە راستەقینەی خواناسی، واتە «**عین الیقین**»، وەهەرچەن رەوشی جۆراوجۆریان پێشنیارکردوە، بۆگەیشتنە سەرلوتکەی ئاوات، بەڵام هەمویان هەر ئەگەنە ئەوسەرلوتکەیەو، هەموی ئەگەنە ئاواتی خواناسی، بەتایبەت، هەمویان هەر خولیێکیان هەیە، کەتاكو تەنیاو بێ هاوتاو بێ چونە، .

جالێرەدا لەسەری خۆم بەفەرززانی، مادام من تۆزێ شارەزاییم هەیە ئەبێ بۆچی ئەم هاووڵاتی یانەم لەمزانستە گەورەیە، لەم بەرهەمە بەکەڵکە، شارەزانەکەم، بۆئەوەی ئەگەر دژی تەسەووف بون بزانن دژی چین، وە ئەگەر لاین گری تەسەووف بون بزانن لاینگری چین، نەك هەرشوێنی «**عاطیفە وە أحساس**» بکەون، یان ئەوەی شێخێکی خۆش ویست، تەسەوفی لاباش بێت، ئەوەش رقی لەکورەشێخی کەوت، تەسەوفیش بەخراب بزانێت .

لە هەموی گرنگ تر، ئەی هاوزوانی ئازیز، دوومەبەست هەیە، نابێ لەیادی بەریت بەکەم : تۆی خوێنەوار وە تۆی وێژەوان، ئەبێ بزانیت ئەدەبی کوردو ئەدەبی هاوسی کانی کورد وەکوعەرەب، تورك فارس هیند، هەموی پریەتی لە ئەدەبی تەصەووف، پڕیەتی لەموصطەلەحالی تەصەووف، تۆئەگەر نەزانی تەصەووف چی یە، لەوکاروانەجی ماوی، وەهەرگیز ناتوانی لەوئەدەبە ، بەتەواوی بگەیت، تەنانەت، کوردی یەکەی خۆیشت، بگرە زۆرجار خۆت وشەیێك بەکاربێریت وە بەوردی و بەقوڵی ی لەواتاکەی تێ نەگەیت . کەواتە تۆ، هەم لەروانگەی وێژەوە وەهەم لەروانگەی زانیاری یەوە پێویستت بەگەیشتن لەتەصەووف هەیە، کەواتە لەسەرتە، بەرێکوپێکی لەتەسەووف بگەیت .

جامنیش لەمروانگەیەوەبو، کاتێ سەیرم کرد تۆی کورد سەبارەت بەمزانیاری یە بەرزە هیچ بەڵگەو سەرچاوەیێکی کوردیت بەدەستەوەنیە، بەپێی توانایم هەوڵم دا کتێبخانەکەت بەم کتێبە برازینمەوە، هەوڵم داوە رونی کەمەوە تەصەووف چی یە، وەئەگەرتۆویستت، ببیت بەسۆفی، ئەبێ چی بکەیت، وە هەموقۆناغەکانم گوتووە. بەڵام، ئەوەی بیەوی ببێتەسۆفی لەهەموی گرنگ ترئەوەتە ئەبێ مامۆستایێکی باش پەیدا کات «**کەبەداخەوە نایابە**» یان، لەوکتێبانەدا کەباسی چۆنیەتی چلەکێشانو

ذیکرکردنو ئەوجۆرە شتانەی تیایە، مەبەستی خۆی بێرێتەدەست. بەڵێ مەبەستی من هەرئەوەتە خوێنەواری کورد لەمزانیاری یە بگات، وەبزانی چی یەوچۆنە، ئەگینا من نەخۆم بەمورشید ئەزانم، کەبمەوێ پرۆپاگاندە بۆخۆم بکەم، وەنە ئەمزانینەشم هی تاقی کردنەوەو، زانینو بەسەرهاتی خۆمە، بەڵکو ئەوەی ئەیزانم، هی موتاڵاکردن و خوێندنەوەیە، وەخۆیشم لەهەموکەسێ زیاتر بەپێویستی چاكبونو ریێ راستگرتنەبەر، ئەزانم، تەنها ئەو دڵ خۆشی یەم هەیە، ئەڵێم شایەد بەوەی بەقەڵەم، خۆم لەو گەورەپیاوانە نزیك کردوەتەوە، لەپاشەرۆژا خوا بمبەخشێ بەوان، وەبەڵکو ئەمە خوایە، «موحەممەدی خۆشەویست» درودی خوای لەسەر، لەبەرخاتری خۆشەویستەکانی، بەیەکێ لەپەیرەوانی خۆی وەرم گریت .

بەباوەری من خوایێ داو کەسێکە خۆی بۆی دەس بدات وە لەم ڕێبازەدا سەرکەوێت، بگاتە، یەقینی تەواو، وە لەشاری بەقای پاش فەنادا، خانوییکی بەرچاوفەرەحو پرلەگوڵ وگوڵزاری مەعنەوی بێرێتەدەس، وە دڵ ودەرونی تیا بحەسێنێتەوە .

هۆییکی تری نوسینەکەم ئەوەبو باوباپیرانی من، چونکە خۆیان خاوەنی زانیاری یەکەبون هەولیان نەداوە بنوسن، وەکو ئەوەی بڵێن ئەوەی نەخۆشە با بێت دەرمانی دڵی بکرێت، چونکو بەراستی تەصەووف کردەوەیە، نەگفتوگفتار، وەکو خۆیان فەرمویانە «فِعلٌ وَلَيسَ بانفِعال»، بەڵام من وتم، مادام کاکڵەکەو جەوهەرەکە لەدەس دەرئەچێت، لای کەم بەڵکومن بتوانم بەنوسین ئەوەی بۆم ئەکرێ بینوسم، وە دەس نیشانی سەرچاوەکان بکەم، بۆ ئەوبرایانەی، لەئاییندەدا ئەیانەوێ باشتر لەم بارەوە بنوسن، وەبەڵکو خوا ئەم تێکۆشانەم بەکردەوەییکی پەسەند بۆحسێب کات .

تاقە مەبەستێکم کەماوە بیڵێم ئەوەتە، هەوڵم داوە نوسینەکەم جۆرێ بێت خەڵك بەئاسانیی لێی تێ بگات، واتە ناوەرۆك نەکەمە قوربانی ووشەو یاری کردن بەووشە، بەڵکو هەوڵم داوە کاری بێت خەڵك لەزانیاری یەکە بگات . وەبەو زمانە بێت کەخەڵکی لەناوی خۆیانا بەکاری دێنن .

# نامەکان ١ / ٢ / ٣

## تێبینی سەبارەت بەم سێ نامەیە . (١، ٢، ٣.)

دوو نامەیان هی بەروارێکە کە من لە سلێمانی ئەمخوێند (١٩٤٨) وە ئەو شێخ فەرەجە ، کە باوکم هەواڵی پرسیوە ، شێخ فەرەجی ئاسنگەرە کە خزمی دایکمە وەحاجی برایم زاوایان بو .

باسی مەعاشیش لە نامە عەرەبی یەکەدا ئەوەتە شێخ مانگانەی ئەدا بە ژنەکانی بۆ ئەوەی دادگەری ی شەرعی پێش چاو گرتبێ وە هیچ کام زیاد نەبەن .

جا من نووسیبووم ئایا ئەم مانگانەیەی لە سلێمانی ئەدرێتە من لە سەری مانگانەکەی دایکمە ؟ شێخ لە وەڵاما ئەفەرمێ : نا... خەمت نەبێ ، لە مانگانەی دایکت نیە ، وە ئەوەش بەپێی رەفتاری تۆ هێشتا کەمە.

باقی باسی ماینەکەش روونە : ماینێکی باشیان بۆهانی بو زۆرێ لەبراوخزمان داوایان کردبو ؛ هەرچەن من خۆیشم لەوێ نەبوبوم ، بەڵام دای نابو بۆمن .

ئەوەش هەرلوتفی خۆی بو ئەگینامن هیچ چاکی یێکم لەخۆما نەئەدی .

نامەفارسیەکەش ، مێژوی ١٩٤٩ م یە ؛ کەمن دەستم لەخوێندن هەڵگرتبو وەلەئەحمەدئاوادابوم سەرگەرمی کشتوکاڵ بوم ؛ وە هەرسێ نامەکە هەرئاموژگاری یەو هەر پاڵپێوەنانە بۆ رێگای خۆش بەختی ، رێگای دانش وئەدەب وەبەخەتی خۆیەتی .

ئەمین نەقشبەندی

**بسمه سبحانه وتعالى**

کوری عەزیزم نوری چاوم ئەمین چاوت ماچ ئەکەم دوعای عیلم و عەمەل و صەلاحت بۆئەکەم ، کاغەزت گەیشت بەخەبەری خۆشیت مەسروربوم ، کورم مەعصومی ی بۆئینسان لەهەموچت بەلای خواوه گەورەتره سەعی بکە ئەووەلەن مەعصومیت لەدەس دەرنەچیٚ کەسبی ئەخلاقی حەسەنە بکە تالای خواو لەلای مەخلوقی خوا موعەززەز وەموحتەرەم بژیت ، وەلەقیامەتا سەر دانەخەیت ئیتر حەواڵەی لوطفی خواو هیمەتی شێرانی پێشەی تەوحیدت دەکەم وە بەینابەین خەبەری سەلامەتی خۆتم بورەوانەبکە ، عەزیزم شیخ فەرەج وەئەهل و ئەولادی وە حاجی برایم هەمویان دوعای خێریان بۆئەکەم وەئەحواڵیان ئەپرسم ، والسلام ١٩٤٨ م

علاء الدين

بسمه سبحانه وتعالی

کورم وەنوری‌چاوم ئەمین چاوت‌ماچ ئەکەم وەدوعای زیادبونی خۆش‌بەختیت بۆئەکەم ان نشاء الله لەبەدەس‌هێنانی ئینسانیەت وە زانیاری وەرەوشی‌چاك‌داسەرکەوتوئەبی منی‌فەقیر هەمو بەیانی‌و ئێوارەیێك فەرامۆشت ناکەم ئومێدەوارم تێکۆشی بۆبەدەست‌هێنانی خۆش‌بەختی‌و رەوشی‌بەرز ئەوەبزانە کەسبی‌ئەدەب وەخۆش‌ناوی لەهەموکاری‌باشترە ، تەمەنت بەفیرۆدامەنێ خوای گەورە «**جل جلاله**» لەخۆت مەرەنجێنە ، بی‌گوناهی‌بەلای خواوە لەهەموشتی‌باشترە هاوری‌کان هەرکامیان رەوشیان‌چاك‌نیە دوری‌یان لێبگرە «**المجاورە مؤثرە**» فەرمویانە هاورێی‌چاك چاکت‌ئەکات وەهاورێی خراپ خراپت‌ئەکات ، مەخلوقی‌ئەم‌رۆژگارە زۆربەیان دوارۆژیان لەبیربردوەتەوە وەتەمەنی بەنرخی‌خۆیان بەشتی‌هیچ‌وپوچ ئەبەنەسەر بەهۆی‌نەزانی‌یەوە ئەومردوە دارزیوانە یان‌لەبیربردوەتەوە کەکەس بەحاڵیان نازانێ وەبی‌هەوالانە خۆیان لەخۆش‌بەختی بی‌بەهرە کردوە وەبەهەشتی‌جاویدانەیان گۆڕیوەتەوە بەم دووڕۆژەعومرە ان شاء الله کوری من تۆ بەپێچەوانەی ئەوانەوە تێئەکۆشی ، فەرمویانە ، لەکی‌وە فێری ئەدەب بویت گوتی لەبی ئەدەبانەوە «**واتەئەوەی لەوان کردویانە من نایکەم**» «**ئەمین**» لەکی‌وە فێری دین‌داری بویت وتی‌لە بێکارانو بی‌دینانەوە .

ئیتر ئەوەی‌کەسە حەرفێ بەسە .

علاء الدین

١٩٤٩

– بسمه سبحانه وتعالى

ولدى وفرحة قلبى المسعود وقرة عينى محمد امين اهدى اليك الدعوات الخيرية التي تكون سبب طول عمرك ومزيد عزك وسعادتك ، وأقبل عينيك إن تسئل عنا بحمده تعالى سالمين مفرحين ونسئل الله تعالى صحتك وفتح باب العزة والسعادة عليك ، وصل مكتوبك اخذناه بيد المحبة لأنه كان نصف المواصلة ، فاعلم إن المعاش الذي تأخذه من الحاج عبد الله الشالى هو من راتبى ، ومعاش أمك على قاعدته ، مثل السابق ، وماهو ناقص ، وإنى أعطيتك بالمحبة هذا المبلغ الذي تاخذه ، بكمال المحبة والرافة ، وماهو قابل في مقابلة حركاتك واوصافك الذي نسمعه ونشكر الله على هذه الاوصاف والاخلاق الذي نسمعه من الواردين ، فياولدى انى علمت انك ماتحب الفرس التى اعطيناكها فعلى هذا فبدلناها بالتى هى احسن ، فجابولى فرسا من طرف المكريان فطلبوها منى اغلب الاولاد وبنى الاخوان فانى اعطيتها بيد محمد عبد الخالق ليخدمها لك وهى تسوى خمسة فرسان مثل فرسك الاحمر وهى تميل لونها الى البياض ، فادام تكون انت على الاخلاق المحمودة تكون اسبق من اخوانك فى قلبى ، وهو يتولى الصالحين . ويدعون لك بالخير جميع الاولاد والاهل والمحبين . وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين .

(١)
خادم المحاسن النبوية الشريفة
علاء الدين

---

(١)مەحاسن بەعەرەبی بەموی ریش ئەڵێن لێرەدا مەبەست لەچەن تاڵ موی ریشی پێغەمبەرە درودی خوای لەسەر . کە لەکاتی خۆیا سوڵتانی عوسمانی وابزانم (عبد الحمید) ی دووهەم بوە . بەدیاری بەفەرمانێکی ڕەسمی داویەتی بە حاجی شێخ ئەحمەدی مامی باوکم کە ئێستە چەن تاڵێکی لەیارەبەو چەن تاڵێکی لە ئەوێڵە . جا باوکم نوسیویە . خادم المحاسن النبویە : مەبەستی لەم چەن تاڵە موو وە پیرۆزەیە .



ئەمین شێخ علاء الدین نەقشبەندی

## «بە پێنوسی خۆی»

نوسەر، ئەمین کوری شێخ عەلادینی بیارە، کوڕی شێخ عومەری شێخ عوسمانی نەقشبەندی‌یە.

لە گوندی بیارە، لە بەرەبەیانی ڕۆژی یەك‌شەممەی ٢١ / ١٢ / ١٩٣١ میلادیی وە شەعبانی (**١٣٥٠**)ی کۆچی‌دا لەدایك بوە.

دایکی، ناوی رابیعە، کچی شێخ ئەحمەدی عیززی، خەڵکی (**دیر الزور**)ە لەسوریە.

هەر لە منالّی‌یەوە لە خانەقای بیارە دا، کە ناوەندێکی گەورەی بڵاوکردنەوەی تەصەووف وە شەریعەتە لای مامۆستا مەلاکەریم، مودەریسی بیارە، وە مەلابەها، ئیامی خانەقا خوێندویەتی.

خوێندنی سەرەتایی لە مەکتەبی بیارە، وە ناوەندیی، لەسلیمانی خوێندوە.

پاش پشودانی ساڵی ١٩٤٨ بەهۆی ئەوەوە بەدەستوری باوکی، سەرپەرستی‌ی براو خۆشکانی لەخۆی منالّ‌تری گرتوەتە ئەستۆ، دەستی لەخوێندن هەڵگرتوە، وە دەستی کردوەتە کشتوکاڵ‌و باخ‌داریی لە ئەرزو ئاوی ئەحمەدئاوا ی نزیکی سەرچاوەی زەڵم دا، کە موڵکی باوکی بوەو داویەتی بە نوسەرو براو خۆشکەکانی واتە «ثابت، مظهر، أدیبه».

لەساڵی (١٩٥١)دا زەماوەندی کردوەو نەجیبە خانمی کچی مەحمود خانی دزڵی مارەکردوە، کە ئیستە چوار کوڕو کچێکیان هەیە.

«ئەمیر، بێوەی، ئازاد، ئارێز، ڕەنگین» وە دوو کوڕەزای هەیە، کۆچەر وە ماردین، کە کوڕی ئەمیرن.

نوسەر تاساڵی ١٩٦٢ سەرگەرمی کشتوکاڵ‌و باخ‌داریی بوە وە لەم پیشەیەدا باش شارەزا بوە، کاتی بێ‌کاریی‌و پشودانی بە خوێندنەوە، یان ڕاوکردن بەو ناوچەیەدا، یان ئەسپ‌سواریی بردوەتەسەر، وە بست بەبستی هەورامانی ئەم دیوو ئەودیو گەڕاوە، بەم بۆنەوە هەست‌و ڕەوانی، لەگەڵی سورشتی ناوچەکەو جوانی‌ی مەڵبەندەکەدا شێلراوە.

لەساڵی ١٩٦٢ دا کە ناوچەکەی بوەتە جێگەی ئاژاوە، بەجیّ‌ی هێشتوەو چوەتە دزڵی.

پاش ساڵێ لەوێوە باری‌کردوەتە مەحمودئاوای دووڕۆ، تاساڵی ١٩٦٧، پاش ناکام‌بون لە ئاواتی ئاسایش وە لەبەری خوێندنی مناڵەکانی چوەتە کرماشان.

لە کرماشان خۆیشی سەرلەنوێ تیٚ‌هەڵ‌چوەتەوە بۆ خوێندن، وە ئیعدادیی لەوێ تەواوکردوەو پاشان باری کردوە بۆتاران، لەوێش لە زانکۆی «الاداب» دا لیسانسی وەرگرتوە، لەم ماوەی خوێندنەدا بەدەمی خوێندنەوە کاریشی کردوە بۆئەوەی نانی بێ‌منەت بخوات، وە هەرگیز بەناوی پەناهاوەرەوە موچەو مانگانەی وەر نەگرتوە لە ئێران، وە لە (٦٢) وەوە تا شەصت‌و حەوت بە تۆزە تۆزەی بەرهەمی باخەکەی ژیاوە کە ساڵانە داویەتە ئیجارەو پارەکەی خەرج‌کردوە، پاشان لەساڵی ١٩٧٨دا کە وردە وردە ئاژاوە لەئێراندا کەوتوەتەوە، باری کردوە بۆ شاری سنە، وە لە ساڵی (١٩٧٩)دا، کە ئاگری ئاژاوە بڵێسەی سەندوە، گەڕاوەتەوە بۆ داوێنی دایکی نیشتانی خۆشەویست.

سەیر ئەوەتە هەموی ئەم کۆچانەی لەمانگی ئەیلول‌دا بوە.

ئیستە کاربەدەستی میری‌یەو منداڵەکانیشی لە دەرەوەی وڵات سەرگەرمی خوێندنن.

لە ساڵەکانی هەشتاو دوو وە هەشتاوسیٚ دا لە بەشی فارسی‌ی دانشگەی بەغدا دا بەشێوەی «**محاضره**» دەرسی گوتوەتەوە.

نوسەر لەساڵانی ١٩٧٠ و ٨١ ٨٣ دا چوە بۆ حەج وەسیٚجار حەجی کردوە.

لە ساڵی (**١٩٨١**)دا دیوانێکی لە شیعرەکانی خۆی بەناوی (**بەرهەمی ژیان**)، بە کوردیی سۆرانی‌و هەورامی‌و فارسی چاپ‌کردوە، وە نازناوی بیٚوەی هەڵبژاردوە بۆخۆی.

ئیستەش بەشی دیوانێکی‌تر شیعری هەیە، هەروەها نوسراوەیێکی فارسی‌هەیە کە نزیکەی حەوصەد لاپەرەیە، سەبارەت بە چۆنیەتی بەدی‌هاتنی (**علومی ئیسلامی‌ی**» وە سەبارەت بە چۆنیەتی بەدی‌هاتنی یەکە یەکەی زانیاری‌یەکانی ئیسلامی‌ی باس ئەکات، کە چۆن وە لەکەیەوە هاتونەدی، وە سەبارەت بەچی‌یە، وە گەورەپیاوانی ئەو زانیاریی‌یانەش ئەناسێنیٚ، ئیستە خەریکە وردە وردە ئەیکاتە کوردیی.

لێکۆڵینەوەییێکی بەدەستەوەیە سەبارەت بە «**شارەزوورو شارەزووری‌یە کان**» کە بەرکوڵێکی لە بەرگی دەیەمی گۆڤاری کۆری زانیاریی عیراق دەستەی کوردی دا لە چاپ دراوە، هەروەها قەصیدەی بوردەی گۆڕیوەتە سەری کوردیی کە ئەویش وا لەخولی ئامادەکردنا.

ئەمەتا ئیستەش ئازیز ترین بەرهەمی ژیانی خۆی، وە ئاواتی گەورەی تەمەنی، واتە کتێبی «**تەصەووف چی‌یە**»تان پێش‌کەش ئەکات.

کەواتە نوسەر، سەردەمی منالی‌و نەوجوانی‌ی خۆیی لە بیارە، وە جوانی‌و پی‌ٚنانە پیاوەتی‌ی لە ئەحمەدئاوا، وە لە ٣٢ ساڵەوە تا ٤٩ ساڵەی لە هەورامان‌و کوردستان‌و کرماشان‌و تاران‌دا داوەتە سەر، وا شەش ساڵیشی لە پایتەختی خۆشەویستی عیراقی مەزن دا بردەسەر، بزانین رۆژگار لەبەشی دوایی تەمەنا، چ داهاتوێك ئەکاتە بەشی.

هەر جۆر وە هەر چۆن وە هەرچی بێت هەر لەخودا بەزیاد بێت.

«**هەرچی لای خۆشەویستەوە بێت خۆشە**» خودا عاقیبەت خێرمان کات.

«**هەر خۆش‌بن**».





وێنەی شێخ عەلائەددینی بیارە کە نوسەر لە بەردەمیایە
وە بڕێ لەکوڕەکانی وە دەستو پێوەندی بەدەوریان



وێنەی نوسەر
لەبەردەمی باوکیا
لە تەمەنی سێ ساڵیدا .
ئەم وێنەیە ساڵی ١٩٣٤ م
لەبیارەدا گیراوە .




١- تەسەووفچییە ؟ چۆن وە لە کەیەوە بەدیهاتوە ؟

٢ - تەسەووفی بەر لە ئیسلام کامەو چۆنە ؟

٣ - تەسەووفی ئیسلامی کامەو چۆنە ؟

٤ - فەرق لەنێوانی فەلسەفەو تەسەووفدا چی یە ؟



ماوەیێکی زۆربو بۆهەلێك ئەگەڕام بۆم دەست بدات بەڵکو تائەورادەیەی لەوزەو توانامابێت. بۆ خوێنەواری کوردی ڕوون بکەمەوە کەتەسەووف چی‌یە ؟ ئامانجوئاکام لەودا ئەبێ‌چی‌بێت ؟ بۆکوێ ئەڕوات؟ وەزۆرپرسیاری تریش کەهەرلەم بابەتەوە سالهای‌سال سرنجی‌خوێنەواری کوردی ڕاکێشاوە .

جامن ئێستە نامەوێ هەریەك‌سەر خۆم بکوتمە ناوباسەکەوەو هەرنایش‌کرێ لەناکاێکا پەردە لەسەر هەمو ڕازو نهێنیەکانی ئەم باسە گرنگە هەلدەینەوەو یان بەجارێکا هەموپرسیارەکانمان کەڵەکە کەینە سەر یەك‌و جالەپاشان دەسکەینە شی‌کردنەوەو باس‌لی‌کردنیان ، بەڵکو من لام وایە هەروردەوردە لەناوباسەکاناخۆی هەموشتێك دێتەپێشەوەو ئێمەش بەئەندازەی توانایی خۆمان هەم‌بەبەڵگەی «**ئاوەزیی**» واتە «**عەقلی**» وەهەم بەدەس‌ڕاکێشان بۆسەرچاوە نوسراوەکان ، وەهەم بەپشت‌بەستن بەبرێ شارەزایی‌و سەرگوزەشتی‌خۆیشم ، هەوڵی ئەوە ئەدەین بەڵکو بەرهەمو دەساوردێك پێش‌کەشی خوێنەواری کوردبکەین کەئەویش هەروەکو خوێنەوارانی هەمو زوانەکانی‌تر . لەم‌مەبەستە گرنگە شتێك تێ‌بگاتو ، برێ لەم نهێنیانەی بۆڕوون بێتەوە . وە سەرچاوەکان بناسێ . بەلکو ژیرەکانو پشت‌بەخۆ بەستوانی کوردیش بتوانن لەم‌ڕێبازە ئاگاداربن وەزانیاری خۆیان‌یان پی‌دەوڵەمەندو بەهێزبکەن .

جا هەروەکو وتمان ئێستە بۆبرێ‌پرسیار زوە . وەکو ئەوەی بلێین ئایا «**تصوف**»

هەرتەصەفی ئیسلامی یە یان لەوەوبەریش تەسەووف هەربوە؟ یان بلێین بۆچی بەم ناوە ناونراوە . وەئەم جۆرە باسانە . بەلاّم بەباوەری من جاریّ ئەوە بەپێویست ئەزانم کە بتوانم بۆئیوەی خۆشەویست ریشەو سەرچاوەی باسەکە روون کەمەوە . تاوردەوردە مەبەستەکان یەکە یەکەدێنە پێشەوە .

بێ‌گومان لەرۆژێکەوە کە «ئادەمی‌زاد» . یان بەواتاییکی تر . ئەم‌گیاندارە ئاوەزدارە ، لەم سەرزەوی‌یەدا چاوی کردوەتەوە . وە لەرۆژێکەوە ئاوەزومێشکی مرۆڤ خراوەتەکار بۆگورینو چاككردنی ژیان واتە بۆ «تطور» . بێگومان یەکەم هەنگاوی ئەوگیاندارە ئاوەزدارە ئەوەبوە ، کەورد بێتەوە . . . . لەچی؟ لە هەموشتیّ لەهەرچی شتێك دا دەوروبەری ئەوی گرتوەو هەموشتێك کەئازارێکی پیّ‌ئەگەیێنیّ ، وەیان سودو بەر هەمو قانجازێکی هەیە بۆی ، لە هەرشتێك کەمەترسی هەبیّ بۆی ، یاخۆ بیبێتە هۆی ئارامی و دل‌گەرمی و دلّخۆشی وەبکریّ خۆی بخاتە پالّیو پەنای پیّ‌بەرێت .

بۆنمونە . گیان‌دار بێ‌گومان پێویستی بەئاو هەیە بەلاّم ئاویش هەمو جۆریکی هەیە ، ئاوی تاڵ ئاوی سوێر ئاوی شیرین ئاوی کوشندە ئاوی رەوانو بەکەلّك کەوابو ئەبیّ ئەم‌گیاندارە هەموی ئەمانەی تاقی کردبێتەوە وەجەورو ئازاری تاقی کردنەوەکەشی کێشابێت . تابۆی دەرکەوتوە کامی بەکەلّکەو کامیّ بێ‌کەلك ، کامی زیان ئەگەیێنێتو کامیشی سودی‌هەیە . وەئەم تاقی‌کردنەوەیەی چینی پێشوو ماوەتەوە بۆ رۆلّەو نەوەکانیان . ئەوانیش تاقی‌کردنەوەی تازەیان خستوەتەسەر . تابەم‌چەشنە ، ئالوگۆر ، وە «پێش‌کەوتن» واتە «تَطَوّر» ، وەهەروەها مێژو ، دروس‌بوە . بەلاّم پاش ئەمە شتی گرنگ‌تر دێتە پێشەوە کە بریتی‌یە لە «**دۆزینەوەی سەرچاوە**» . سەرچاوەی هەمو شتێکی باش یان خراپ . ئەمەش هەم بەهۆی «**غەریزەوە**» وەهەم بۆ مەبەستی کەلك‌وەرگرتن لە چاك وەخۆدورخستنەوە لەخراپ .

بۆنمونە ، ئادەمی‌زاد کە لەدەشتو پێبنارا لەناو ئاوەکانا ، ئەوئاوانەی کەوان بەدەوروبەریا ، دی . چەن جۆر ئاوهەیە . ئاوی دەریا کە سوێروتالەو ناخورێتەوە . ئاوی گەراوەکانیش کە ناخورێتەوە بەلاّم بۆ مەلەکردن گەرموخۆشەو . بریندارو گەرۆلەکانیش کەئەرۆنە ناوی چاك ئەبنەوە . وەئاوی چەمەکانو سەرچاوەکان شیرینوخۆشن . جا دیارە ئەبیّ بکەوێتە شوێنی ئاوی چەم تا وردەوردە سەیر ئەکات سەرچاوەیێکی هەیەولەبن بەردێکا یان لەقەد پالێکا هەل‌ئەقولّێتو

دێتەدەر . ئیترلێرەدا دۆش داماوەو هیچی تری پێ نەکراوە ، کەبزانێ سەرچاوەی ئەم سەرچاوەیە لەکوێوەدێت هەروەها بۆگەڕاوەکەش ، بەڵێ زانیویەتی کە بریندارو گەڕ چاكئەکاتەوە ، بەلاَم چۆن وەبۆچ لەوێشا هەر پەکی کەوتوە ، وە لێرەوەیە کە بیرکردنەوە نەدایك ئەبێتو مرۆڤ ئەیەوێ بیربکاتەوە کەخۆی کێیەو ، چی یەو ، لەکوێوە هاتوەو ، بۆکوێ ئەڕوا ، سەرچاوەی هەموی ئەمشتانە ئەڕۆنەوەکوێ ، وە کەم کەم بیرکردنەوەی قوڵتر دەس پێ ئەکات ، وەکو ئەوەی مرۆڤ باڵدارو گیان لەبەری تر ئەبینی وە پەیدابونو لەدایك بونی جۆراو جۆربەدی ئەکات لەدایك بونی بالدار وگیان لەبەری تر ئەبینی ، ئەبینێ هەمویان لەهێلکە پەیدابونو ئەیشکێنی سەیرئەکات دووجۆرە «مادە» ی تیایە ، وەئەگەریش ویستی ئەیخوات ، نەگیانی دیارەو نەگیان لەبەرێ ، کەچی ئەگەر دەستی لێ نەدات هەرئەو دوئاوە دورنگە ئەبنە یەك بالدارو ئەدات لەشەقەی باڵو دەستی کەسی پێناگات ، جا بیرئەکاتەوە ئایا «**باڵدارەکە لەهێلکەکە بوە یان هێلکەکە لەباڵدارەکە**»؟ وەئایا ئەو ڕەوانوگیانە لەکوێی هێلکەکەدا بوە لێرەشا دوبارە هیچ وەلاَمێکی دەس ناکەوێتو هەر بەوداخەوە سەرئەنێتەوە ، مشتێ دانەویلەی وشك یان گوێزو بادامو بەری درەخت ئەشارێتەوە پاش ماوەیێك بۆ خۆی ئەبێتەوە بەشتە پێشوەکە ، وەبۆی دەرئەکەوێ ئەم دانە گوێزەتە کە ئەبێتە ئەو درختە گەورەیە ، بەلاَم پاش ساڵهای ساڵ ، کەچی گەنمەکە هەرپاش چەن مانگێ ئەبێتەوە بە ، دە بەرانبەری خۆیو پێ ئەگات ، ئەوەبۆچی ئەو وایەو ئەمیان وانیە ، خۆ هەردوکی لەگیرفانی ئەوابون ؟ ، ئەی داخۆ گوێزەکە لەدارەکەبوە یان دارەکە لەگوێزەکە ئەی داخو ئەوەڵ جارو یەکەم گوێزو یەکەم گەنم چۆنو لەچی ڕوابن ؟ لێرەشا دوبارە هەر لوتی ڕەق ئەبێتو ناگاتە هیچ ، ئیتر هەر بەمچەشنە سەیرئەکا برێ لەهێلکەو ، برێ بەزکی دایکو ، برێ بەتۆو ، دێنو ئەڕۆن جاپاشان مەرگ دێتە پێشەوە ، مەرگی هەمو گیان لەبەرێ هی ئادەمی زاد ، یان وشك بونی دارودرەخت یان مەرگی باڵدارو هەموگیان دارانی تر ، لێرەشا سەروکار لەگەڵ ڕەوانا پەیدائەکات ، ڕەوان چی یە لەکوێوەدێ چۆن ئەڕوا بۆکوێ ئەڕوا بۆنابینرێ؟ سەیرئەکا لێرەدا لەهەمو کاتێك داماوترو لێ نەهاتوترەو هیچی لێ تێ ناگات ، بەڵێ ئەم هەستی سەرچاوە زانینەو ئەم هەستی بۆسەرچاوە گەڕانەتە کە ئەبێتە ماخۆلیا بۆ ئادەمی زاد ، یان بۆ «**گیان لەبەری ژیر**» ، گیان لەبەری ژیر ، واتە ئادەمی زاد لێرە بەملاوەیە کە ئەکەوێتە سەوداو خولیای سەرچاوە دۆزینەوە ، مرۆڤ ئەیەوێ بزانێ

خۆی کێیە لەکوێوە هاتوە چۆن هاتوە بۆکوێ ئەڕوا ، ئایا سەرچاوەی هەموی ئەم بەدیهاتو ڕوداوانە هەریەکێکە ، یان هەرشتێکو بەدی هێنەرو سەرچاوەی خۆی هەیە ؟ مرۆڤ پاش ئەوەی دەوروبەری خۆیی بشکنی سەرێکی هەڵبڕیو سەیری گەردونی کردسەیری هەڵهاتنو نیشتنی خۆرو مانگو ، جوانی ئەستێرەو پرشنگ وەشاندنی ئەوانی کرد ، سەیری شینیی ئاسمانو جوانیی سورشتی کرد ، هەروا ترسولەرزی هەورەگرمەو بومەلەرزەو تەقینەوەی «**بورکان**» چوەدلیەوە لیرەدابو «**گیانداری بەئاوەز**» وە خاوەن بیروژیر ، کەوتە شوێنی شوێنەوارو ڕیچکەی دۆزینەوەی «**سەرچاوەی ئەم سەرچاوانە**» ، ئایا ئەمە چۆن نەترسێکە کەهەموی ئەم هێزانەی بەدەستە ، ئەمە چۆن نەترسێکە کەهەموی ئەم مەترسییانە نایترسێنن ؟ داخۆ خۆی چەن جوان بێت کەئەم هەموە جوانیەی دروس کردوە ؟ داخۆ شتیواهەبێ یان هەرمن خۆم بۆخۆمی دروس ئەکەم ؟ ئەیئەگەر نیە سەرچاوەی ئەم هەموە سەرچاوەیە ، وە بەدیهێنەری ئەمهەموە ژیانو گیانو ترسو ئارامییە کێیە ؟ ، ئایا ئەوهێزە گەورەیەیە ؟ ئەگەر هەبێت داخۆ من چۆن ببمە دۆستو خۆشەویستی ؟ چۆنی لەخۆرازی کەم ؟ چی بکەم پێی خۆشەو چی لەلاخراپە ؟ خۆزگە لەکوێ بێت ؟ چۆنی بەدیکەم ؟ چۆن لێم خۆشنود ئەبێت؟ چۆنی بدۆزمەوە؟ داخۆ ئەگەر ئەوبیەوێت ئەکرێ ئیتر من نەمرم ، داخۆ ئەگەر ئەو منی خۆش بوێت ئەکرێ زاڵم کات بەسەر هەمو دوشمنو کۆسپێکا ؟ داخۆ چی لەمن ئەوێت ؟

بەڵێ گیانداری ژیرو ئاوەزدار بەمچەشنە کەوتە بشکنینو لێکۆڵینەوە وەبویە سەوداگەری «**دۆزینەوەی خاوەنی ئەمهەموەسەرچاوەیە ، خاوەنی ئەم هەموەهێزە خاوەنی ئەم جیهانە ڕنگاوڕنگەو ئەوئاسمانە بەرزو بەرینەجوانوشینە**» . بەڵێ سەوادی دۆزینەوەی هەڵچەرخێنەری ئەم چەرخو گەردونە وەتیکۆشان بۆ خوڵی نزیك کردنەوە لەمسەرچاوەی ڕوناکی و گیانە ، وە هەوڵدان بۆ بەجێهێنانی هەمو فەرمانێکی ئەمگەورە پیرۆزە وەلە هەمو گرنگتر دڵنیابون لەوەی بەڕاستی ئاوا هێزێکی گەورەو بەك گرتوهەیە ، ئەمانە بویە پیشەی زۆرێك لەئاوەزدارانو ژیرانو هەڵکەوتوانی چینەکانی مرۆڤ کە وردە وردە لەپەرەسەندنو زۆربونابون ، جابرێك لەوئادەمیزادە هەڵکەوتوانە لە دورێگەوە بەجیاوازی کەوتنە بشکنین برێکیان لەخەڵك دورئەکەوتنەوەو لەئەشکەوتو جەنگەڵەکانا ، یان لەبنەبەردی لوتەی شاخەکانا ئەمانەوەو بیریان لەسوروشت وەچۆنیەتی بەدیهاتنی ئەمجیهانەیان ئەکرد

وەبەخواردنی بەری درختە کێویەکانو گژوگیاکان قنیاتیان ئەکرد تاوەکو زۆری وایان بو لەرێگەی «**إشراقەوە**» واتە دەرکی جیهانی پشت‌سورشتەوە «**ماوراء الطبیعة**» ئەگەیشتنە مەرامی خۆیانو بەمرازی خۆیان شادئەبون وەئیتر ساتێ لەوژیانەیان نەئەگوریەوە بە هەموی ژیان ، یان هی‌واشی‌بو یان شێت‌ئەبو وەیان بەر لەگەیشتن بەوئاواتە ئەمردو سەری‌ئەنایەوە .

جائەمە ئەبێتە بناغەیێك بۆ «**تەسەووف‌کۆن**» وە بەرەبەرە هەر بەردەوامە تائەگاتە سەردەمی ئیسلام .

دەستەی دوهەمیش ئەیانەوێ لەرێگەی ئاوەزو عەقلو زانیاریو لێکۆڵینەوە بگەنەئاواتو «**هەل‌سوورێنەری**» ئەم‌جیهانە بناسن وەبەمانەش ئەڵێن «**فەیلەسوفەکان**» بەلاّم ئەودەستەی دوهەمە لەگەڵ هەموزانیاریکیانا تائیستەش هەربەمراز نەگەیشتونو هەرسەرگەردانن وەهەریەکەی ئەوەی‌پیشو بەدرۆ ئەخاتەوە وەتاوەکوئیستە نەیانتوانیوە رێگاییکی زانیاری بۆناسینی خاوەنی‌جیهان بدۆزنەوە کەلەداهاتودا باسیان‌ئەکەین جا ئەم هەولو تێکوشانە بۆدوزینەوەی سەرچاوەی سەرچاوەکان وە هەڵسورێنەری کاروباری گەردوونو گیان‌داران . وەهەولّو تەقەلادان بۆ خۆنزیك کردنەوە لەم سەرچاوەیەوە ئەنجام‌دانی هەرشتێك کەئەو پێی خۆش‌بێت ، وەدەس لەهەموشتو هەموکەسێ هەڵگرتن تائەوکاتەی کەبەتەواوی بەومرازە بگەنو لەوهێزە تێ‌گەنو لەخۆیانی رازی‌کەن ، وەپشت بەو زیاتر پشت بەکەس نەبەستن ، وەهەوڵ بۆ دڵنیابوون لەبوونو لەچۆنیەتی ئەوهێزە ، بریتی‌یە ، لە «**تەسەووف**» کەوابو هیچ درۆنیە ئەگەر بڵێین «**تەسەووف**»لە سەرەتای هاتنی مرۆڤەوە لەسەرەتای بەدی‌هاتنی ئاوەزو ژیری‌یەوە ، هەربوە ، چونکو هەموی بریتی‌یە لەشەیدابون بەشوێنی سەرچاوەی سەرچاوەکانو بەشوێنی هەڵسورێنەری نەناسراوی ئەم‌گەردونەدا ، وە تێکۆشانە بۆناسینی «**ئەودیوی هەموی ئەم شتانەی کە ئەیانبینین لە گیاندارو بێ گیان . بۆچی ؟ بۆگەیشتن بەباوەری تەواو واتەبە** «**یەقین**» بەئارامی‌ی دڵوگیان .

بەڵی ، تەسەووف ئەوتێکۆشانەیە ، بەلاّم ئایا تەسەووفی ئیسلامی کامەو چۆنە ؟ وەئایا کامی لەگەل ئەو تەسەووفانەدا یەکێکەو کامی‌جیاوازە ؟ ئایا گەورەپیاوانی تەسەووف لە ئیسلاما چی‌یان ویستوەو ویلوسەرگەردانی چی کە بوون کەلەوانی‌ترا نەبوبێت ؟ ئایا سلوك چی‌یە؟ تەریقەت‌چی‌یە ؟ ئەمانە لەمزانیاریە گرنگەدا بەکوێیان گەیاندوە ؟ ئایندەی ئەمزانیاریە بەکوێ‌ئەگات رێرەوی سۆفی‌یەکان

بۆگەیشتن بەم ئاواتە چۆنبوە ؟ شتە بەکەڵکەکانی ئەم ڕێڕەوە لەروانگەکانی ئاینیو ، کومەڵایەتیو ، ژیان ، وەهەروەها مرۆڤایەتیەوە چی‌یە ؟ وە زیانەکانی بۆهەموی ئەمانە چین ؟ ڕێڕەوی ڕاستی تەسەووف کامەولاریێو هەڵەکانیشی کامەنە ؟ فەرقی نێوانی فەلسەفەو تەسەووف چی‌یە ؟ ئەمیان لە چ ڕێگاییێکەوە ئەیەوێ بگاتە ئاواتو مراز، ئەویان لە کام ڕێگاوە؟ ئەمانە هەموی ئەومەبەستانەن کەلەداهاتودا ئەگەرخوا بۆی کردم وەئێوەش تاقەتتان گرتو شوێنی باسەکە کەوتن واوردە وردە باسی لیوە ئەکەینو بەپێی توانایی شی‌ئەکەینەوە .

ئێمە لەپێشا وتمان کەمرۆڤ بەناوی گیانلەبەرێکی خاوەن ئاوەزو زێر تێ‌ئەکۆشا بۆ دۆزینەوەی ئەوسەرچاوە وهێزە نادیارو نەناسراوەی کە کاروباری ئەم جیهانە هەڵ‌ئەسورێنێ ، وەئایا هەڵ‌سورێنەرو بەدی‌هێنەر هەریەکێکە؟ وەئایا مرۆڤ بەم مێشکو توانای بیرکردنەوەیەوە ئەتوانێ پەی بەناسینی ئەوهێزەو ئەوسەرچاوە بەرێت وەئایا ئەوسەرچاوەیە یان ئەوهێزە ئەتوانێ مرۆڤ جاویدان بکات؟ ئەتوانێ خۆشیوچاکەی- بۆ دابین‌کات وە لە کۆسپو دەردی سەر لای‌دات... وەهەزاران پرسیارو ئاواتی‌تر کە بەمێشکی مرۆڤا تێ‌ئەپەری.

جائەم مەشرەبو هەستی بیرکردنەوەی سەرەتایی‌یە کە لە سەرەتای بونی ئادەمی‌زادەوە ئەبێ هەر بوبێ ، بە مەرجێك ئەتوانین ئەمە بە سەرچاوەی تەسەووف دابنێین کە تەسەووف تەنها پەیوەندی بەیەك دەستە ، یان یەك چین لە مرۆڤەوە هەبێت ، یان لە قوناغێکی تایبەتی ژیانا ، وە لەیەك شوێنی ئەم جیهانەدا هاتبێتەدی.

وە لە هەموی گرنگ‌تر ، ئەگەر داخوازو ئاواتەکانی (**تەسەووف ئیسلامی**)ش هەر ئەمانە بێ ، وە تەنانەت هەمو مرۆڤە گەورە بەناوبانگەکانی تەسەووفی ئیسلامی ، خۆیان واتای تەسەووفیان هەر وەك یەك لێکدابێتەوە ، وەکو بۆنمونە ، کە لە بارەی باسای ئیسلامەوە ، کە سەبارەت بە ئیمان ڕێکوراست ئەڵێ چی‌یە ، وە سەبارەت بە ئیسلامیش هەروا ، وە لە هەر مەلاو خوێنەوارێکی ئایینی بپرسیت ئیمان چی‌یە ، خێرا وەلامت ئەداتەوە : باوەر بە خواو پێغەمەران ، بە مەلایکان بە کتێبە ئاسمانیەکان بەرۆژی زیندوبونەوە وە موقەددەر ، هەروا سەبارەت بە ئیسلامیش ، بەلام تەسەووفی ئیسلامی چونکو مەبەستێکی تامو مەزەکردنی رۆحی‌یە وە برێ شێوازو ڕێچکەیە کە هەرچەن دواکەشی هەموی هەر بگاتەوە بە یەك وەك بڵێین بگاتە دوایلەی نزیکی لە خوا وە هەست بە تەواوی باورەوە «**حق الیقین**» یان «**عین الیقین**»

یان بڵێین «بەقای پاش فەنا» هەستی ی پاش نیستی. لەگەڵ ئەوەشا هەر باغەوانێکیان سەبارەت بە میوەی باغەکەی خۆی باس ئەکاتو هەر گوڵێکیان بۆنی تایبەتی خۆی ئەدا بە لووتماناو هەر سەرچاوەییێکیان تامو مەزەی گەوارای خۆی ئەدا لە چەشتنگەمان.

جا لەبەر ئەوەتە کە تا ئیستەش هەر پاڵەوانو کەڵەمێردێکی ئەم گۆرەپانە گرنگە، بەو جۆرەی کە خۆی شارەزایە، پێمان ئەڵێ کە تەسەووف چی یە، لەگەڵ ئەوەشا کە وەسفەکان جۆراجۆرن، کەچی هەموویان ئەتوانن یەك ئاکامو ئامانجمان بۆ دەرخەن، کە ئەبێتە: خواناسینێك، بەتەواوی باوەر.

ئێمە ئەمانەویست بڵێین کە تەسەووف لەکەیەوە بەدی هاتوە وەوتمان ئەر بەو جۆرەی لێك بدەینەوە کە روتمان کردەوە. وا هەر لە سەرەتای ژیانی مرۆڤەوە تێکۆشان بۆ ناسینی شتە نادیاریەکانی «ما وراء الطبيعة» «ئەودیوی سورشت»، هەر بوە، بەلاَم راستەکەی یۆنانیەکان توانیان ئەم تێکۆشانە بخەنە قاڵبێکی زانیارانەوە، وە کەم کەم مرۆڤە هەڵکەوتوەکانی یۆنان، ناوێکیان دۆزی یەوە بۆ ئەم تی کۆشانە، وە ناویان نا «فەلسەفە»، ئەوەش بەوجۆرەبو کە، هەروەکو ئەزانین وشەی فەلسەفە وشەیێکی یۆنانیە وە لە دوو وشەی فیلۆس واتە دۆستداری، یان «مەحەبیەت» وە «سوفیا» واتە «حیکمەت» پێك هاتوە: کەتێکرا ئەکاتە «دۆستداری حیکمەت» یان (حیکمەت ویست)، ئەمەش گوایالە سەرەتادا لە سەردەمی فیثاغورس دا بە حوکەما: واتە زانیاران وێژراوە، ئەوەش بەوچەشنەبوە، ئەم مرۆڤە بەرزە pythagoras(٦٠٠) بەر لە (ز) وتویەتی «من ناتوانم بەخۆم بڵێم حەکیم، بەلاَم من ویستیاری حیکمەتم»، کەواتە فەیلەسوف ئەبێتە «حیکمەت ویست» وە فەلسەفەش «حیکمەت ویستی ی» جا لەو سەردەمەو، لەوە پێشتریشەوە شەیدایی بە شوێنی زانینا شێوەییێکی زانیارانەی وەرگرتو مەکتەبەکانی فەلسەفەش یەك لە شوێنی یەك پێك هاتن، وە کەڵە مەردانی وەکو سوقراط «٤٦٨- ٣٩٩» ق م مامۆستای افلاطون و لە پاشان ئیفلاطون «٤٣٠- ٣٤٧» ق م وە بەشوێنیا ئەرەسطو «٣٨٤- ٣٢٢» ق م وصەدان زانای تریش چاویان لەم جیهانەدا کردەوەو گەلێ لە زانیاری کۆڵینەوەو ئەوانیش رۆیشتن وە فەلسەفەش تا ئەمرۆیش هەر بەردەوامەو فەیلەسوفی تازەش بە شوێنیانا، چ لە جیهانی ئیسلاماو چ لە پاشانیش، لە ئەوروپاو ئەمریکادا، وە هەریەکەی رێچکەی تایبەتی خۆیان، بۆهەڵبەستن بەکێوی «ما وراء الطبيعة» ناسیندا، یان باشترە بڵێین: گەردون بەدی هێنەرو گەردون

هەڵسورێنەر ناسیندا یان روونا کتر بڵێین خواناسینا، گرتەبەر بەڵام هەرچەن زۆریان حەوت پێڵاوی ئاسنیشیان لەم ڕێگەدا دری، بەڵام بەداخەوە هەرچەن زۆریان بە پلەی یەکەمی باوەڕ «واتە» «**علم الیقین**» گەیشتن بەڵام هیچکام بە پایەی «**عین الیقین**» یان «**حق الیقین**» هەر نەگەیشتن، جا بۆچی نەگەیشتن؟ ئەوە باسێکە کە بە پێی توانا بۆتانی باس ئەکەم، وە ئێمە کارمان بە کام دەستە لەو فەیلەسوفانە وەکام مەکتەبیانە: ئەوەشتان هەر بۆ باس ئەکەم، فەلسەفەش لە سەرەتادا لەچی دواوەو بەچی وێژراوە. ئەوەش هەر روون ئەکەمەوە. بەڵام لەوە زیاتری، هەم پەیوەندێکی بە باسەکەی ئێمەوە نیە، وە هەم دەریایێکی ئەوەندە بێ پایانە کە خۆی بەتەنها پێویستی بە خوێندنەوەی صەدها کتێب و نوسینی دەها کتێبی هەزار لاپەڕەیی هەیە.

بەڵام باسەکەی خۆمان، باسی زانینی تەسەووف، ئەوەندە شیرینە، وە ئەوەندە بۆ خوێنەواری کورد بە پێویستی ئەزانم، دەستمان لە هەمو باسێکی تر پێ هەڵئەگرێت: وەتا ئەورادەیەی پەیوەندی بە تەسەووفەوە هەیە، هەروەك لە سەرەوە وتم، کورتە پەنجەیێکی بۆ ئەکێشین.

ئێمە ئێستە ئەپرسین، ئایا فەلسەفە لە سەرەتادا لەچی دواوە؟

لە یۆنانی پێشودا وتەی «**فەلسەفە**» یان «**حیکمەت**» هەمو جۆرە زانیارێکی ئەگرتەوە، واتە هەرچی تێ گەیشتنی «**نەزەری وەعەمەلی**» یان «**نەزەری وەعیلمی**»: بەکوردی ئەبێتە «**هەمو بینینو زانینێ**». «**ئۆگوست کۆنت**» لای وایە فەلسەفە «**نەزەری بەیێکی گشتی یە سەبارەت بە زانیاری**» «**١٧٩٨ – ١٨٥٧**» ز «**فیلیسین شالیە**» ی فەرەنسەیی، ئەڵێ ئەتوانین بڵێین کە فەلسەفە زانیاری، یان لێکۆڵینەوەیێکە لە ژیانی دەرونیی وە پەیوەندی، بە ژیانی گشتی. وە جیهانی یەوەیە: «**کتێبی ڕێڕەوی ناسینی زانیاریەکان**». «**ابن خلدون**» ئەڵێ تێبینی فەیلەسوف سەبارەت بە «**الهیات**» بیر کردنەوەیێکە لەهەستیی بە هەمو مانایێ. برێ تر لەزانایان ئەڵێن «**فەلسەفە سەرەتاکەی هەوڵە بۆزانین ناوەندی یەکەی زانین وەناسینی ڕاستەقینەی هەمو بونێکە لەهەموی جیهاندا. وە پابانەکەشی گوفتارو کردارێکە کە ڕێ کەوێت لەگەڵ زانیاری دا**»ە خاوەنی کتێبی «**تأریخ الفلسفة العربیة**»، کە ئەم وتارە دوایینەیە گێراوەتەوە خۆیشی ئەڵێ: کەوابو فەلسەفە سەردەرهێنانە لەو زانیاری یانەی کە بەهۆی ئەوانەوە سەردەرکەین لەهەستیی. تاوەکو لەئاکاما لەڕێی ئەوزانیاری یانەوە ڕووەو ئامانجی بەرز بڕۆین.

ئیفلاطون، بەزوانی سوقراطەوە، ئەڵێ «**ئەوکەسەی کە بویە خاوەنی «حیکمەت» زانیاری، ئەوە ئارەزوی نەفسی ئەبێتە خزمەتکاری ئاوەزی. بەڵام ئەوەی لەزانیاری دووربێت وا ئاوەزی ئەبێتە خزمەتکاری ئارەزووی**».

بەهەرحاڵ فەلسەفە بەیەکێ لە بەدیهاتە زۆر بەرزو جوانەکانی زانیاری مرۆڤ دائەنرێت، بەڵام وەنەبێ هەروەکو بەشەکانی تری زانیاری تەنها بەدی هاتیك بێتو هیچی تر. بەڵکو بیر کردنەوەیێکە کە بەرچاوی دەرونی ئێمە، سەبارەت بەزانیاری روونالترو پاکتر ئەکاتەوە.

فەلسەفە بە چەشنێکی گشتی بینشێکە، سەبارەت بە جیهانی ژیان، وە سەرنویشتی مرۆڤ، وە پایەو پلەی مرۆڤ لە جیهانا، وە کارکردێك کە مرۆڤ ئەتوانێ بیکاتە سەری جیهان.

بە چەشنێکی تایبەتی تریش ئەتوانین بڵێین فەلسەفە بیر کردنەوەیێکی رەخنەگرانەیە سەبارەت بەکاروبار وە گیروگرفتی ئەمجیهانە بۆدۆزینەوەی رێگای چارەسەرکردنیان، هەروەها فەلسەفە ئەتوانێ کەهەموی ئەم «**تعریف**»انە بگرێتەبەرو صەدانو هەزاران لێك دانەوەی تریش، کە هەر لەسەردەمی فەیلەسوفە لەمێژینەکانی یۆنانەوە تاسەردەمی، کانتو، دیکارتو، هیگلو، هەموی کەڵەمەردانی ئەمرێگایەوە بۆی دانراوە.

بەڵام لاموایە ئەم پێناساندنەی کە دەسمان بۆکێشان بتوانن دەریخەن کە ئەبێ فەلسەفە چیبێت وەلە چی بکۆڵێتەوە. جا لە داهاتودا سەبارەت بەوە باس ئەکەین کە بۆچی فەلسەفە ناتوانێ لەبارەی خواناسییەوە بگاتە ئەوپەری ئاوات. واتە «**عین الیقین**»، وەلەو گرنگتریش «**حق الیقین**» وە بۆچی تەسەووف توانیویە بگاتە ئەو مەرزو سنورە، وە کام جۆرە فەلسەفە تا رادەیێك پەیوندی بە تەسەووف ئیسلامییەوە هەیە، وە چۆن؟ وە ئایا فەلسەفەی کۆن هیچ کارێکی کردوەتە سەری تەسەووفی ئیسلامی یامنا، وە لەگەڵ وڵامی هەموی ئەو پرسیارانەشا کە لە ناوونیشانی وتارەکەمانا نوسراوە. وە هەروەها لێك دانەوەی (**یەقین**) چییەو بەکوردی ئەبێتەچی.

ە

## تەصەووف چی‌یە
## بەشی سێهەم

١ – بۆچی فەلسەفە ناگاتە «عين اليقين».؟

٢ – تەصەووفی ئیسلامی ی چی‌یە،
لەکەیەوە دەستی‌پێ کردوە ؟

٣ – ئامانجی تەصەووفی ئیسلامی ی چی‌یە، وەئایا
لەگەڵی ئایینی ئیسلامدا هیچ جیاوازی‌یێکی هەیە ؟

٤ – تەصەووفی ئیسلامی ی، لەزمانی
گەورەپیاوانی تەصەووفەوە.

٥ – سەرگوزەشتی غەززالی وەکو خۆی گوتویە.

٦ – وەڵامی بیستوچوار پرسیاری‌تر.

«بۆچی فەلسەفە ناگاتە پلەی «عَیْنُ الیقین» وە «حقُّ الیقین»؟

لەپێشان با ڕوونی کەینەوە کە «یەقین» چی یەو چەن پلەی هەیە.

زانایان بۆ «دڵنیایی» واتەیەقین سێ پلەیان داناوە،



## أ - عِلْمُ الیَقین

واتەدڵنیایی وەباوەڕ لەڕێگەی زانیاری یەوە.

وەکوئەوەی تۆ ئەچیتە شارێك وە ناشارەزایت ئەتەوێ بڕۆیتە چاخانە، یان چێشتخانەیێکەوە بە پرسیارکردن، یان بە خوێندنەوەی سەردرگای ئەوشوێنە، وا بۆت دەرکەوت کەئەمە شوێنی خواردن، یان خواردنەوەیە، بەمەئەڵێن «عِلْمُ الیَقین»، واتە دڵنیابون بەهۆی زانیاری یەوە، چونکە بەپرسیار، یان بەخوێندنەوە، بۆت دەرکەوت کەئەبێ ئەمە چاخانەبێ. بەڵام ئەم باوەڕە ناتەواوە،.. بۆ؟ چونکە بگرە ئەم نوسینە هی ماوەیێکی کۆن، یان تازەی لەوەوپێش بێت وەئیستە ئەم شوێنە کرابێتە شتێکی تر، یان هەر بەتاڵ بێ.

## ب - عَیْنُ الیَقین

لەقۆناغی دوهەمدا ئەڕۆیتە ناوەوە وە بەچاوی خۆت ئەبینی کە خەڵك خەریکی خواردن وەخواردنەوەن لێرەدا بەچاو دیت، کەواتە دڵنیاییەکەت زیاتربو وەبوە «عین الیقین» واتە بەچاوی خۆت دیت.

بەلاَم ئایا تەنها ئەمدیتنە وات لیٚ‌ئەکات بزانی تامی ئەوخواردنانە چۆنە، بەتایبەت کەتۆ نەزانی خواردنەکان چین، وادانیٚ، نوسراییٚ خواردنی «چینی» ئایا ئەمدیتنە ئەتوانیٚ تێرت‌کات، برسیوتینوییە کەت لابات ؟. یان بزانێت تام‌ومەزەی خواردنی چینی چۆنە ؟ ئایاشتێك تانەیچێژی ئەکریٚ لەزەتی لیٚ‌بەریت ؟.

کەوابو، لەم‌قۆناغەدا زانیاری‌یەکەت زانیاری‌یێکی دیتنی‌یە، واتە، «عین الیقین»ە.

## ج – قۆناغی سیٚ‌هەم
### دێتەپێشەوە کەئەبێتە «حق الیقین»

واتە، ئەوپەری تیٚ‌گەیشتن ئەوپەری دڵنیایی‌و زانیاری، کەئەویش بەخواردنی خواردنەکە وەتام‌و مەزەکردنی جۆری خواردنەکان، وەتێروتەسەل بون پەیدا ئەبیٚ، بۆیەئەبێتە ئەوپەری دلنیایی‌و زانیاری چونکە بە تام‌و مەزە کردن‌و تێربون هاتوەتەدی، جا، بەم جۆرە تیٚ‌گەیشتنە ئەوتریٚ «حق الیقین». واتەباوەری راستەقینە.

جالێرەدایە کە ئەپرسین ئایا فەلسەفە کەپشتی ئەبەستیٚ بەرادەو بردو توانایی زانیاریی مرۆڤەوە، ئەتوانیٚ سەبارەت بەناسینی راستەقینەی، هەڵسورێنەرو بەدی‌هێنەرو بەرێوەبەری ئەم‌جیهانە، یان روناك‌تربڵێین، سەبارەت بەناسینی راستەقینەی «خودا» بگاتە ئەوپەری ئاوات‌و زانیاری، واتە «حق الیقین»؟

لێرەدا ئێمە هەم خۆمان بەهەمو دڵنیایێکەوە ئەڵێین... «نا»وەبیرو باوەری خۆیشم دەرئەبرم، وەهەم بیروباوەری کەڵەمێردانی ئەم گۆرەپانەش وەکو «غەززالی» دەر ئەبرین.

جالەپاشان هەم دیسان ئەرۆینەوە سەر باسی تەسەووف، وەلەپێشا دەس بۆبریٚ فەلسەفەی نزیك‌بەتەسەووفیش رائەکێشین.

ئێستە ئەپرسین بۆچی فەلسەفە، واتە «بردو توانایی ئاوەزی مرۆڤ» ناتوانیٚ بگاتە ئەوپەری ئاواتی خواناسیی؟ هەروەکوتمان فەلسەفە پشت بەئاوەزی مرۆڤەوە ئەبەستیٚ، ئاوەزی ئادەمی‌زادیش

أ – هەرچەن بێت، هەر بڕدێکی دیاریکراوی هەیە، وەکو هەمو هێزیکی تر، ئاخرەکەی ئەگاتە شوێنێك کە لەوەبەولاوە بڕناکات، وەکاری خواناسیش لەرادەی «حق اليقين» دا بێ پایانە، کەواتە شتی ڕادە بۆدانراو چۆن ئەتوانێ شتی بێ ڕادە بناسێ.؟ شتی پایاندار چۆن شتی بێ پایان بناسێت؟.

ب – ئاوەز تەنها کاتێك ئەتوانێ شت بناسێ وە بەخەڵکیشی بناسێنێت کەبتوانێ لەچواردەوری ئەوشتە، وە لەناوەرۆکی ئاگادار بێت، واتە «عەقل محیط بێت» بەسەری ئەوشتا تابتوانێ بیناسێ وەبەخەڵکیشی بناسێنێت. دەی ئاوەزو عەقڵی مرۆڤ چۆن بتوانێ هەموی «کەون وەکائنات» وەهەروەهابەدیهێنەری هەموی جیهانەکانو ئەستێرەکانو ئەوانەش کەتیایانائەژین یان ناژین، هەروەهالەکەیەوە هاتون چۆنو چەنیان چی یە، هەموی بناسێ وبیان گرێتەبەر ئادەمیزادێك بەتەمەنێکی دواهاتووەوە، وە ئاوەزێکی سنوردارو دیاریکراوەوە، چۆن دەست بداتە ئەم زانیاری یە بەرینو بێ پایانە. ؟

ج – زانیاری «ماوراء الطبيعة» واتە، ئەودیوی سوروشت، زانیاری یێکی «مەعنەوی» یە، واتە پەیوەندی بەرەوان، یان شتێکی ویجدانیات وەدەرونی یە، وە لەبازنەی «مادة» بەدەرە، ئەم مرۆڤە چۆن لەبەشی مادەیی مرۆڤایەتی، بۆناسینی بەشی (مەعنەوی) یان رەوانی مرۆڤ، وەجیهان کەڵك وەرگرێ؟.

کەواتە ئەوشتەی کەوا لەپشتی پەردەی هەستو هەست پێ کردنەوەیە چۆن ئێمە بە ئامرازی هەست پێ کردن بیناسین؟. هەستی ئاشکراو ناسراوی مرۆڤ پێنج هەستە، دیتن، چەشتن، لێك کەوتن، بیستن، بۆن کردن، ئەم هەستانە

کە تەنها ئامرازێکن وان بەدەستی عەقڵەوە بۆشت ناسین، چۆن بتوانن شتی ئەولای خۆیان هەست کەن وبیناسن؟ کەوابو ئەگەر ئێمە بەم ئامرازانەی کەوان بەدەست ئاوەزمانەوە بگەرێین بۆشتی پشت سوروشت، وەشتێ نەسەرەتای دیاری بێتو نەپایانی، ئایا کارێکی ژیرانەیە؟ وە ئایا کارێکی شیاوە؟

کەواتە : ئەبێ ئێمەش بەچەکی خۆی، چەکی پێویستی ئەو زانیاری یە، بڕۆینە مەیدانیەوە، کەبریتی یە لەڕیگەی، «رەوان» واتەمەعنەویات، جا ڕیگەی فەیلەسوفەکان، ڕیگەی ئاوەزو هەستەکانە، بۆ دۆزینەوەو ناسینی. ڕاستەقینەی

خواناسی‌ی، وەرێگەی سوفی‌گەریش رێگەی «مەعنەویاتە» کەبریتی‌یە لە رەوان، یان بەواتای سوفی‌یانە، «تەزکیەی‌نفس»، واتە پاك کردنەوەی ئاوێنەی دەرون. تائەورادەیەی کەنورو روناکی «خوا»، واتە «هەڵسورێنەری کەونو کائناتی» تیادادەرکەوێ، کەئەونورەی تیادرەوشایەوە «کەئەبێتەئیشراق» وە دڵ بەخۆشەویستی خوا گەرم‌داهات، واتەکاتێ کەدڵ، کەدەرونی مرۆڤ بەنوری خواگەرمو رووناك داهات، جائەوکاتەیە، ناسین وەزانین وە دڵنیایی، ئەبێتە زانینی«حق الیقین»، واتە باوەری‌تەواو، وەئەوەش بزانە، گەورەپیاوانی رێگەی خواناسی، وەك پەیامبەران وەك دۆستەکان وەهاوەڵانی پیغەمبەر، وەمرۆڤە پاکەکانی پاش‌ئەوانیش، بەملیونها کەس‌بوە، کە گەیشتونەتە ئەو باوەرە راستەقینەیە.

جالێرەدا ئێمە ئەپرسین، دەی کەوابو ئێمە کە رێگەی سوفی‌یەتیان نەگرتوەتەبەر، یان تەنانەت ئەوانەی کەهەر موسوڵمان نین، یان هەر ناوی ئیسلامیشیان نەبیستوە، ئایا ئەمانە چۆن خوابناسن؟ وەئایا ئەتوانن بیناسن؟

ئایا ئەکرێ جگە سۆفی، وەجگە مەردانی رێگەی مەعنەویەت، کەسی‌تر باوەری بەخوا نەبێ؟.

لەوەلاما ئەڵێین وانیە، زۆری واهەیە بەر لەئیسلام‌بوە، یان ئیستەش نازانێ ئیسلامیش‌چی‌یە، وەباوەری بەخوایش هەیە وەزۆریك، لەوفەیلەسوفانە هەر لەئیفلاتونەوە تائەگاتە کانت خوایان ناسیوە بەلام، ئێوە مەبەستەکەتان لانەشێوێت، ئێمە ئەلێین ناسینەکەی ئەوان «علم الیقین»ە واتە لەرێگەی ئاوەزەوە، لەرێگەی بیرکردنەوەی دروستەوە، لە رێگەی سرنجی عەزەمەت وگەورەیی ئەم جیهانی هەستی‌یەوە، گەیشتونەتە باوەری زانیارانە، وەزانیویانە کەخوایێك هەیە، هەروەکو کەتۆ لە خوێندنەوەی سەردرگای کتێب‌خانەیێك ئەزانی ئەوە کتێب خانەیە «علم الیقین»، وەلەدیتنی‌کتیبەکان‌باورت‌ئەگاتە «عین الیقین» واتە موشاهەدە وە چاوپی‌کەوتن، بەلام بەخوێندنەوەی کتێبەکان جائەگەیتە «حق الیقین»، ئەوزانیارانە، وەزۆرێ لەم خەڵکەش، هەموی ئەگەنە «علم الیقین»، واتە باوەر لەرێگەی زانیاریەوە بەلام، ناتوانن بگەنە باوەری راستەقینە چونکە ئەوچەکە، ئەو ئامرازە، ئەو هۆیەی، وابەدەستی ئەوانەوە، چەکی‌ناسینی «حەواسی پێنج‌لانەیە»، چەکی ئاوەزو بیرکردنەوەیە، چەکی‌مێشکە، چەکی‌بیرو میشکو ئاوەزیش، هەر ئەوەندە برئەکات، وە بوردو توانایی لەوە زیاتر ناروات، بەلام لەدەرونی ئێمەدا

چەکێکی زۆر بەهێزترهەیە، کەئەگەر خوابیکاو بۆمرۆڤ بکەوێتەکار، زۆر باش بۆی دەرئەکەوێ، کە لەپشتی پەردەی ئەم جیهانی‌مادەوە، بێ‌گومان هەستی وەبوونێکی کەش هەیە کە بونی راستەقینە ئەوبوونەیە.
من لە داهاتودا، پشت‌بەخوا لەوباسە ئەدوێم، کە چۆن مرۆڤ ئەتوانێ لەرێگەی ئەم هەستی پێنج‌لانەی ئێستەوە، وەلەرێگەی ئاوەزی رێکو «مەنطق» یەوە، پەی ببا بە بونی خوا واتەقۆناغی «علم الیقین»، وەتائەوشوێنەی بۆم‌بکرێ، بەدەلیلی‌عەقڵی باوەری‌خۆم دەرئەبرم.
وە داوەری کردن، سەبارەت بەو باوەرانە، ئەدەمەوە دەس خۆتان.
جاپاش دەربرینی باوەر سەبارەت بەتوانائی ئاوەز بۆناسینی خوا، تارادەی ناسینی زانیاری، سەرلەنوێ باسی کارکردی برێ لەفەلسەفەی کۆن بۆسەری تەسەووف ئەکەین.
وەلەپاش هەموی ئەوانەیە، کەئەبێ هۆشی ئێوە ئامادەبوبێت بۆباسی تەسەووفی ئیسلامی، وە هەر ئەوکاتەشە کەنۆرەی باسەکەمان ئەگات وەدێتەپێشەوە.
وتمان ئایا ئەکرێ لەرێگەی ئاوەزەوە بگەینە ئەوەی کەئەم جیهانە، «واتە هەموی کەون»، ئەبێ هەڵسورێنەرو بەرێوەبەرێکی هەبێ؟ لەوەڵاما وتمان ئەکرێ،... بەڵام ئەوزانینە والەرادەی تێگەیشتنی زانیاری‌دا؛ واتە «علم الیقین»، جا چۆن؟
هەروەکو وتمان مرۆڤ هەرلەسەرەتای ژیانەوە حەزی‌کردوە، ئەگەر بۆی بکرێت سەرلەهەموشتێ دەرکات، وەهەموشتێ بزانێ، «حب الاطلاع»، وەئەم خوویە، خووێیکی دەروونی‌ی، مرۆڤە، «بۆنمونە»، منالێ لەتەمەنێکی دیاری‌کراوا، واتە پاش‌سێ‌ساڵ ئەکەوێتە پرسیارکردن، لە باوكو دایك وەئەوەندە ئەپرسێ کە هەراسانیان ئەکا،، بۆچی؟ چونکە هەرچی‌شتێ ئەبینێ بۆئەو تازەیەو نەناسراو، ئاوەزیشی کراوەتەوە، بەڵام سەرمایەی زانینی کەمەو ناتەواو، جاهەرئەپرسێ‌و ئەپرسێ تا پاش‌تەمەنێك، ئیتر تۆزێ تێ‌ئەگاتو خۆیشی ئەکەوێتە خوێندنەوەو تاقی‌کردنەوە، جا لەمناڵێدا یەکێ لەوشتانەی زۆرجار منداڵ ئەیپرسێ ئەڵێ ئەومانگە چییە؟ هی‌کێ‌یە؟ کێ‌دروسی‌کردوە؟
ئێمەی باوکودایك، بەپێی سەرمایەیێك کەباپیرانمان بۆیان جێ‌هێشتوین، وە پێی‌ئەوتریێ زانیاری، وەڵامی مناڵەکانمان ئەدەینەوە، بەڵام، خەڵکی زۆر لەمێژین، ئەبوایێ خۆیان، وەڵامی‌خۆیان بدایێتەوە..، بەوچەشنە، بشکنین دەستی‌پێ‌کرد،

وەمەکتەبە جۆراوجۆرەکانی فەلسەفە پێك‌هات، وەپەیامبەرانیش ئەنێردران، بۆ ڕێبەرایەتیو شارەزایەتی، **بۆنمونە** کەئاینی عیسی، لەرۆژئاوادا باوی‌سەند، **فەلسەفەی** کزکرد، بەهەرحاڵ، دوورێگەی خواناسی، پەیدابو، یان هەر بڵێین دوورێگە هەبوو، ڕێگای ئاینی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا، وە فەلسەفەش لە ڕۆژئاوای ڕۆژهەڵاتیدا ،لە بەشی پیشوودا ، ڕێگای پەیامبەران، وائاشکرایەو، بناغەکەشی بەسەر موعجیزەوە دانرابو، کە لەرێگەی پیشان‌دانی موعجیزەوە، باوەر بەخەڵك پەیدا کەن، بەڵام فەیلەسوفەکان، لەرێگەی لێکدانەوەو ئاوەزەوە، کە گەورەترینیان، ڕێگای ئەرەسطوبو، «**العلة الفاعلية والعلة الغائية**»، کەئەکرێ بەخوێندنەوەی فەلسەفەی ئەرەسطو، خۆتان سەیری‌کەن، جالەسەردەمی ئیسلامیشا هەرلەرێ‌رەوی فەلسەفەوە «**فارابی**»، باس، یان سەرچاوەی «**واجب وە مومکین**» ی بەدی هێنا، لەپاشان «**ابن سينا**» ڕێکوپێکتری‌کردو کردیە سەرچاوەیێك بەناوی «**واجب الوجود**» بەپێی ئەوفەلسەفە، خوایێکی هەڵسورێنەرو بەدی‌هێنەری کەون «**واجب الوجود**» ە، وەباقی دروس‌کراوەکان «**ممكن الوجود**» ن، واتە، بەردەوام‌بونی کەون بێ‌خواناکرێ وەبێ‌ئێمەئەکرێ هەروەها «**کندی**» سەبارەت بەدرووس‌بون و دواهاتنی جیهانەوە باوەری‌تایبەتی‌هەیە، وەبرێ ڕێگای‌تری فەلسەفە، بەچەشنێکی گشتی، باسێکی‌ترهەیە کەبریتی‌بێ لەوەی چونکی‌ئەم‌جیهانە خاوەنی «**رژیم**» نیظامێکی ڕیکوپێکە، کەواتە، ئەبێ ڕێك‌خەرێکی هەبێ، یان بڵێین، «**سبب ومسبب**»وە «**مسبب الاسباب**»، یان «**اثر وەمؤثر**» واتە «**شوێنەوار وەخاوەن‌شوێن**»، کە بەکوردی ئەبێتە، شوێن هەڵکردن، یان شوێنەپێ، کەئەمەش بەشێکی زانیاری «**کەلام**» بو، بۆ ئەوەی، باوەر بەبونی «**خوا**» لەرێگەی ئاوەزەوە ببەنە دڵی ئەوانەی کەباوەریان نەبو، یان، کەم باوەربون.

جائەمە سەرگوزەشتێکی زۆرزۆرکورت‌و کەمتر لەچاوپیاخشانە وەمێژولکەیێکە لە میلونەمێك لەو باوەرانەی کەلەرێگەی ئاوەزەوە ویستویانە بگەنە «**خواناسی‌ی**» (**زانیارانە**)، یان (**زانیاری**)، کەهەروەکو وتمان ناوی‌نراوە بە علم اليقين.
جامنیش ئەمەوێ بەش‌بەحاڵی‌خۆم، هەر لەم ڕێ‌رەوەوە ڕێ‌ی، خوێنەواری کورد ڕۆشن کەمەوە وەبەپێی‌ی ئەم سەردەمەی خۆمان، واتە سەردەمی «**مادده**»، یان سەردەمی زانیاری‌نوێ، هەر لەرێگەی ئاوەزەوە، برێ لەگەڵی خوێنەواری کوردا بدوێم، وەباوەرێکی تایبەتی خویشم هەیە بیخەمە بەرچاوتان.

من هەرچەن‌وتم، تەنها باوەری خۆم دەرئەبڕم بەڵام ئەم‌مەبەستە چونکو پەیوەندی بەباسەکەمەوە هەیە، نیشان‌کردی ئەکەم، ئەویش پەنجەراکێشانە بۆکتێبی بڕیێ تازەی «**الله یتجلی في عصر العلم**» نوسینی «**جون کلوو مونسما**» کەلەسالی ١٩٥٨ داچاپ‌کراوە بەزۆر زوانیش (**ترجمة**) کراوە John Glover Monsma – ئەم کتێبە بریتی‌یە لەبیروباوەردەربڕینی چل‌پسپۆڕو کارناسی پایەبەڵە، کە ناوی‌شەهادەو پایەی زانیاری هەریەکەیان نیوەلاپەرەیێکی گرتوەتەوە، کەهەریەکەی کارناسو پسپۆڕی زانیارێکی زانینەکانی ئەمرۆن، وەهەریەکەی لەرشتەی زانیاری خۆیدا، باش ڕوونی کردوەتەوە وەئەڵێ ئەوەی بۆی‌دەرکەوتوە، ئەوەتە، ئەو کارە، بێ‌بونی ڕێبەرو دروس‌کەرو ئەندازیارێکی تایبەت، هەرگێزنەبوەو نابێ، جائەمەخۆی بەڵگەیێکی‌زۆرگەورەیە بۆخوێنەوارانی زۆربەرزو خوێنەواری ئەمرۆ، کەئەتوانن خۆیان سەیری‌کەن.

جادێمەوە سەرباسەکەی خۆم.

من‌ئەڵێم ئێمە دوو ڕێگەمان لەپێشایە، سێ‌هەمی‌نیە ئەویش ئەوەتە، باوەڕمان‌بێتەسەرئەوەی ئەم‌گەردوونە، یان لەرێگەی هەڵ‌کەوتەوە واتە بە«**صودفە**» دروس بوبێت، کەهەروەکو ماتریالیەکان واتە باوەڕکردوان بە«**ئەصالەتی‌مادده**» ئەڵێن.

یان ئەبێ دروس‌کرابێ، واتە ڕێك‌خەری هەبێت، بێگومان جیهان هەیە، وەئەوەتا هەستی‌ئەکەین، بێگومانیشە لە(**مادده**) دروس‌بوە، نابێ بڵێین هیچە، جا بەرلەوەی ئەوان، بەروکی ئێمەبگرن بڵێن دەی‌باشە جیهان کەهەیەو کەمادده‌شە. وەهەڵکەوتیش‌نیە، دەی‌چۆن‌دروس‌بوە؟ ئێمە ئەڵێین ئەی‌ئەگەر جیهان هەشەو لەمادده‌یشە وەبەهەڵکەوتیش ئاوا ڕێك‌کەوتوە، دەتۆبڵێ، چۆن‌بوە کەی‌بوە، مادده چۆن‌بوە ، ؟ وەهەڵکەوت چۆن ئەم‌هەمو گەردونەو، ئەم‌هەموە گیان‌لەبەرەی دروس‌کردوە، ،؟ واتە چۆن هەرلەخۆوە ئەم هەموە ڕێکی‌یە درووس‌بو؟

دیارە کەئاوەز ئەوەستێ، وەوەڵامی‌نیە، چونکە مرۆڤ کەشتێکی نەناسی وەلەسەرەتاو دوادواییەکەی ئاگادارنەبو وەئاوەز، بەهەرچواردەوریا نەسوڕابێەوە، خۆی چۆنی‌بناسێ وەبەمنی چۆن بناسێنێ.؟

فەرق ئێمەی باوەڕدارو، ئەوانی بێ‌باوەڕ، ئەوەتە من ئەڵێم، ئەمە تەلەفزیۆنە ئەشی بینم، کەواتە هەم هەیەو هەم‌دروسیش کراوە، هەم وەکوتۆئەڵێیت لە (**ماددەیە**)، بەڵام نەئەزانم چۆن دروس‌کراوەو نەئەیش‌زانم دروس‌کەرەکەی کێ‌یەو

خەڵکی کوێ بەو دایك وباوکیان ناوی چییە، وە نە نەناسینی من ئەبێتە هۆی دروس نەکرانی . ئایا نەناسینی دروس کەر، ونەزانینی چۆن دروس بون ئەبێتە هۆی «انکار»وە باوەڕنەکردنی تۆ، بەتەلەفزیۆن وە پێم بڵێیت ، مادام تۆنازانی چۆن دروس بوە، ئیترئەمە هەرلەخۆیەوە دروس بوە، چونکە، ماددەیە، ئەی تۆ چۆن ئەتوانی بۆمنی بسەلمێنی، کەئەم شتە جوانە، هەروا لەخۆیەوەبوە، وەئەم ماددە هەر بەری کەوت لەخۆیەوە بوە بەتەلەفزیۆن.

نمونەی تر ئەوەتە، تۆ لەچۆڵیکا لەماڵەکۆنێکا هەیکەلێکی جوان داتاشراو، یان پارچەشیعرێکی جوان نوسراوی مەعناداری بەرز، بدۆزیتەوە، وەبڵێیت، مادام نازانم کێ نوسیویەتی، ئەمە هەرلەرێگەی ڕیکەوتەوە، بوەتەشیعر، یان بوەتە هەیکەل.

یان، لەبیابانێکا ڕێت کەوتە کۆشکو تەلارێکی رووخاو، یان نەروخاوی چۆڵ، هەربەوەی نەزانی کێ دروستی کردوە، ئەبێ مل بادەیتو «انکار» بکەیت، بڵێیت ئەمە هەر بەرێ کەوت دروس بوە؟

جا مرۆڤ، ئاوەزی خۆی بکاتە داوەر ئایا دروس کردنی هەیکەلێ، یان نوسینی پارچە شیعرێك، یان دزوس کردنی دەسی مالێ، نارەحەتە، یان دروست کردنی، ئادەمی زادێك کەهەموی ئەمانە دەس کردی ئەون؟ ئادەمی زادێك کەصاروخ، دروس ئەکا، کە گەیشتوەتە ناومانگ، وە لەوەلاتریش ئەڕوات، کە ئەم هەمو «اختراعاتە» ی ئەمرۆ هی ئەوە؟

دەی بۆبڵێین هەیکەلێ لەرێگەی ڕێکەوتەوە دروس نابێ، تەلەفزیۆنی دەس کردی ئینسان بەری کەوت دروس نابێ، پارچەهەڵبەستێکی بەرز کەلەسەرچاوەی مێشکی ئینسانەوە هاتوە، لەخۆیەوە بەری کەوت نەچوەتە سەری ئەوپارچە کاغەزە بەڵام ئادەمی زادەکە خۆی کەخاوەنی ئەم هەموە ئاوەزەتە، کە (موختەریعو) فەننانو نوسەرە، هەروا لەخۆیەوە وەکو قارچك هەڵقوڵیوە، بۆچی؟ چونکە «ماددەیە»؟؟؟ ئەمەش بەجێگەی خۆی، ئەی میشولەیێك ئەی فیلێك ئەی ئەم هەموە تەنظیات ورێکو پێکی کردنەی جیهانو گیان لەبەران و گژوگیاو خواردنومیوەو گوڵو جوانی سورشتە؟ ئەم هەموە کائناتەو تیشکی ڕۆژە، «کە بوونی دائمی هەرنەبێتەهۆی نەبونی گیان دار وەنەبوونی دائمی هەرنەبێتە هۆی نەبونی گیان دار» وەکو «لەکورەی مانگدا»!!!، هەروا بەرێ کەوت هەمویان هاتنەدی، یان هەرمادام من عەقڵم پێ ناشکێ چۆنەوچۆن بوە ئیتر هەر لەخۆیەوە بوە؟

دەی خۆ عەقڵم بەماددەکە ئەشکێ، وەخۆم لەماددەم، دەی چۆنم وەچۆن ئەبم؟ دەی مادام نازانم ماددە چۆن بوە، کەواتە ماددەیش وجودی نیەو منیش هەرنیم، چونکە نەئەزانم ماددەچۆن بوە نەئادەمی زاد یان هێلکە، ئەم هێلکەیەی، کە بە هەزارجۆر ئەی خۆین، وە بەمەکینەیش هەڵدێت وەگیانی تیایە، مادام من نازانم ئەوگیانەی کامەو چۆنە، هەزار کەڵە شێرو مامریشی لێدەربەرێ باوەری پێ ناکەم.

جائەمانەی کەوتمان هەموی لەژێرسایەی دووباوەرا کۆئەبنەوە.

ا – رێکوپێك کراوو رێکوپێك کەر، واتە «**مونەززەم**» وە «**مونەززیم**»

ب – خاوەن شۆێنو شوێنەوار، «**ئەسەر وە موئەسسیر**» چونکو مادام شتی رێکوپێك هەبو بێ گومان هێزێك وەئاوەزێك رێکی خستوە، وەمادام شوێنەپێ وەشوێنەوار هەبو خاوەن شوێنو شوێنەواریش هەیە وەهەرگیز لەرێگەی هەڵکەوتەوە، نەخانوێك لەدەشتێکا هەڵئەتۆقێ وەنە لەناو بەفرو قورو لمێکا، جێگای پێی کەرویشکو کەوو، وڵاخێك بە رێکەوت دروس ئەبێ.

جائەوشتەی کەمن بەئاوەزی خۆم ئەیخەمە سەری ئەم روونکردنەوەیە، مەبەستێکە ئەگەریش لەمەوبەر وترابێت، من نەبیستومەو نە خوێندویشمەتەوە، کەئەویش باسی... «**زەوجیە**»تە، واتە جووت، یان، جووت بون. یان «**نێرومێ**»، دیارە وشەی «**نێرومێ**» واتەجووت، هەموو بیستومانە، وەلەقورئانی پیرۆزیشا چەندین ئایەت ووشەی «**ازواج**» ی تێدایە، واتە نێرومێ، بەڵام مەبەستەکەی من شتێکی ترە، ئەویش هەرلەم رێ رەوی پەیبردنەیە بە «**خالیق**»، واتە دروس کەر، واتە هەڵسورێنەری جیهان، ئەویش ئەوەتە، بە «**فەرزی مەحاڵ**» وتمان وا لەملیاردها ساڵی لەمەوپێش، لەرێگەی رێکەوتەوە لەم سەرزەوییەدا نێرێك، بەهەمو پێویستێکی نێرینەیی یەوە دروست بو، یان، مێ یینەیێك دروس بو، «**ئەڵبەت بەرێکەوت**»!!!!، ئایا چ ئاوەزو چ عەقڵێك ئەیگرێ، هەر لەوکاتو سات وجێگەو رێگەیەدا، قووت، لەوبەریشیەوە، مێیەکەی، یان نێرەکەی، یان بڵێین، جووتەکەی، ئەویش هەر «**بەرێکەوت**» دروس بو؟ عەقڵ ئەیگرێ؟

جا با بپرسین، ئایا ئەم ژن وپیاوە هەربەپانزە شانزە ساڵەیی هەڵ قورتیان، یان بەمناڵی؟ یان بە «**دەلەمەیی**» وەیان بەتۆمی؟ ئەرتۆم بوون لەکام زکا پەروەردەبوون؟ ئەردەڵەمەبون چون ژیان؟ ئەرپێویستی بەگەرمای وەك زکی دایکە، ئەم گەرما یەك

جۆرە چۆن پێك هات، باشە بەهەرحاڵ، ئەرمناڵ بوون کێ شیری دانێ کام شیر، کام خواردن؟ !!! وەچۆن گەورەکران جاهەروا سەیری «موستەلزمات» ی، واتە پێویستی نێرینەیی و هەرچی بۆنیربوون لازمە، هەروا لەخۆیەوە، وەهەرچی بۆمێ بوون پێ ویستە هەروا لەخۆیەوە، وەهەرچی بۆجوت گیری، منداڵ دان، پەیدابون، مەمکو شیردان، لازمە، هەموی ئەم لەملا ئەو لەولا، هەردو بەری کەوت، وەلەیەك کات و لەیەك شوێنا پێك هاتن!!! توخوا ئەمە چ عەقڵێ ئەیێ وەری گرێ؟

جا تابگاتە هەزاران هەزار نێرومێ، لە هەزارن هەزار گیان لەبەر، لەهەزاران هەزار شوێنی سەرزەویدا، هەروەها لەملیاردها جۆری درەختو گیاو ڕووەکو میوەدا.؟

ئەمە جوتی ئەمانە هەمویان بەبێ وپەتا، بەبێ موهەندیس، بەبێ دروس کەر هەموی لەرێگای هەڵکەوتەوە هاتەدی؟ توخوا هەر، یەك چرای قوتولە، یان درگایێکی دارین یان جەروجێگاجەرێك، نەکرێ لەخۆیەوە دروس بێت کەچی ئەم هەموە جوتە، هەر بەکەی جوتی خۆی، لەرێگەی هەڵ کەوتەوە، دورس بێت،؟ ئەمە چییە؟ واللە چونکە من عەقڵم پێ ناشکێ چۆن دروس بوە!!!!

بابە عەقڵی منوتۆ بۆئەوە دروس نەکراوە کەبتوانین دروس کەری خۆمانی، بەتەواوی پێ بناسین واتە «عین الیقین» یان «حق الیقین»، لەکاتێکا ناتوانین چۆنیەتی پەیدابون و بەدی هاتنی «مادده»شی بێ بناسین، چۆنیەتی خۆمانو ئەرزوئاسمانیشی پێ بناسین لەکاتێکا، کەهەین، ئایا دروس کردنی «تەنهاچاوی گیان لەبەرێك» یان «دڵ» یان، «مێشك» یان، هەرئەندامێکی گرنگی ئەوان، بیرلێ کردنەوەی، بۆمانی دەرناخات، کەناکرێ لەرێگەی هەڵ کەوتەوە هاتبێتەدی؟.

جا بەمزانینە ئەوترێ تێگەیشتن لەرێگەی ئاوەزەوە پەی بردن بەوەی کە هەڵ سوڕێنەرو دروس کەرێك هەیەلەرێگەی مێشکو لێك دانەوەی ئاوەزەوە. واتە «عیلم الیقین».

جا خواناسی ی زانیاران وەفەیلەسوفان وەتێگەیشتوانی بەرلەئیسلامو دوای ئیسلام، تێ گەیشتوانی ئیسلام و غەیری ئیسلام، لەئێستەو لەکۆنەوە، ئەم جۆرە تێگەیشتنەیە، بەڵام رێگەی تەسەووف کە بەیارمەتی خوا، باستانی بۆئەکەین، بۆئەوەتە کەبەگرتنەبەری ئەورێگایە بگەینە (عین الیقین) وەشایەد (حق الیقین). وەبۆئەوەتە بەگیانودڵ بگەینە باوەڕی ڕاستەقینە وەخۆت بیچێژی وەبەگیان

تامی بکەی، وە «اطمئنان»، دلنیایی دەرونی بەدەست بێریت، وەئەم بەدەستهێنانی باوەری تەواوە بەخودا ، بۆیە لەمرێگایەوە دەست ئەدات چونکەخوا خۆی ئەیەوێ، چونکە بەگرتنەبەری ئەورێگە تایبەتە، رێگەی (مەعنەوییات) مرۆڤ ئەوەندە پاکئە بێتەوە ئەگاتە رادەیێك شیاوی ئەوە ئەبێت خوایگەورە، لەرێگەی (موکاشەفە) ، کەشف ودەرخستن یان موشاهەدە، چاویی‌کەوتن بەچاوی دەرون چاویبەصیرەت، یان ئیشراق درەوشانەوەی نوری خوا لەدەرونا، باورەکەی ببێتە باوەرێکی «عین الیقین» یان «حق الیقین» وەئیتر هیچ‌گومانیٚ رووبەکاتە دەرونی.

لێرەدا وشەیێك هەیە گوتنی پێویستە، ئەویش‌ئەوەتە ئەگەرباس لە«تەطەوور»، گێرانەوە بکەن، کارناکاتە سەری نێرومیٚ، وەجیهازی پێویست بۆ «زلکوزا» مەیمونیٚ ئەگەریش ببێتە «ملکة الجمال» نێرەکەی نێرەومیٚیەکەی میٚیە، وەدروس‌کەریٚ لەیەکی جیاکردونەوە.

ئێمە هەولی ئەوەماندا رووني کەینەوە ئەکرێت لەرێگای بەکاربردنی هێزی ئاوەزەوە بگەینە ئەوەی کەئەم «کەونە» لەرێی هەلکەوتەوە وابەمجۆرە پێك‌نەهاتوە، بەتایبەت بەشیگیان‌داران، بەتایبەت دەسمان بۆ ئەو مەبەستە راکێشا، کەچۆن نێرێکو میٚیێك کەهەمو ئەندامێکی لەشیان بۆ جوت‌گیری وە سکوزا، یان بەردەوام بونی ژیان، دروس‌بوە، چۆن هەر لەرێگەی «صودفە» وە، واتە هەل‌کەوت، هەم میٚوە هەم نێریش، دروس‌بو، لەهەموی گرنگ‌تر، ئینسانێك ئەوەندە رێکوپێکە کەخۆی شت «ئیختیراع» ئەکات، چۆن ئەکریٚ بەهەل‌کەوت دروس بوبێت، ئەویش میٚ بەجیا بەهەلکەوت، وە لەهەمان کاتوساتو جیٚوشوێنا، نێرەکەشی، هەر بە «صودفە» دروس‌بو؟

جاوتمان فەیلەسوفەکان هەرلە مێژەوە هەولیان‌داوە بۆناسینی خاوەنی ئەم «کەونە»، وصەدها باوەریان دەربریوە، بەلام چونکو پشتیان بەئاوەز بەستوە، ئاوەزیش وزەو توانایو بردی، دیاریکراوی هەیە، جگە ئەوەی بتوانن بگەنە ئەوەی خواهەیە، ئیترلەوەلا نەیانتوانیوە چیدی برۆن، ئەمانەش باوەری وەکو «مثل» یئیفلاطون، وە یان «واجب الوجود» وەئەو جۆرە باوەرانەیان خستوەتە قالبێکی مەنطقیەوە، وەکو ئەوەی وتمان باوەری شوێنەوار وەخاوەن شوێن، «أثر ومؤثر» یان «حادث ومحدّث» واتە بەدی هاتوبەدی هێنەر، ئەمانەش لە رێرەوی زانیاری «کەلام» ەوە، کەزانیارییکی

ئیسلامی‌یە، بۆیچون، بگرە ئەم تێکۆشانەی موسوڵمانانی زانیاری کەلام، ئەو ئایەتە بگرێتەوە کەخوا بەپەیامبەر ئەفەرموێ «**ادْعُ إلى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالحِكْمَةِ والمَوْعِظَةِ الحَسَنَةِ وَجادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنْ**» واتە خەڵك بانگ‌کە بۆلای خوا پەرستی لەرێگەی زانیاریو ئامۆژگاری باشەوە، وەلەگەڵ ئەوانا بەباشترین جۆر باسو لیکۆڵینەوە بکە.

لەگەڵ ئەوەشا زانیارانی کەلام، گێرەوکێشەیێکی زۆریان هاوردە سەر رێگەی باوەری سادەو پاکو بێ‌ئالایشی ئیسلام؛ وەگرێ کوێرەی زۆریان تێخست، بەڵام ئەوپەری ئەم باوەرەش، هەرباوەری «**عیلمی**» بو، بەلام فەرقی ئەمان لەگەڵ فەیلەسوفە پێشوەکانا ئەوەبو، کەئەمان ئەیانەویست راستی ئاینی ئیسلامیش بسەلمێنن نەك تەنها هەر بونی خوایێك.

جا مەبەستەکە تا ئەم رادەیەی پەیوەندی بەباسەکەی ئیمەوەبو، لەبەر ئەوە تەنها پەنجەیێکمان بۆراکێشا، بۆئەوەی کە بلێین بۆیە فەلسەفەی کۆنو تازە، یان تەنانەت زانیاری کەلام، کە زانیاریێکی ئیسلامی‌یە، ناتوانن کانگەو سەرچاوەی «**تصوف**» بن، چونکی بردو توانایی ئەوان بەسراوەبە «**ئاوەز**» واتە عەقڵەوە، وە وەکو وتمان عەقڵیش لەگەڵ هەمو بایخێکی دا، هەر سنوردار وە رادە دارە، کەواتە عەقل تەنها ئەتوانێ بمان گەیێنێتە «**علم اليقين**» ئیتر چۆن کاری‌کردوەتە سەر تەصەووف، کە «**عين اليقين**» وە «**حق اليقين**» ە بەلام بێ‌گومان فەلسەفەی کۆن، سەرچاوەیە بۆ فەلسەفەی ئیسلامی، نەك بۆتەصەووفی ئیسلامی، هەروەها سەبارەت بە تەصەووفەکانی پێش ئیسلامیش، چ «**صيني**» چ «**هيندى**» چ «**فارسي**» چ «**يۆناني**» هیچکام ناتوانن سەرچاوەبن بۆ تەسەووفی ئیسلامی؛ چونکی تەصەووفی ئیسلامی هەروەکو لەئایندەدا رووتی ئەکەینەوە هەر لەئاینی ئیسلامەوە سەرچاوە ئەگرێت؛ وەهەر لەزەمانی «**پەیامبەریشەوە**» درودی خوای لەسەربێ دەستی پێکردوە.

وە هەمو ئەزانین، چ فەلسەفەو چ رێ‌رەوەکانی تەسەوفی ئەو ولاتانەش، لە ئاخرو ئۆخری سەدەی دوهەمی کۆچی‌دا، بەڵکو لەصەدەی سێ‌هەمدا گۆرانە سەر زوانی عەرەبی، «**حوذەیفەی**» یەمانی کە هاورێی پەیامبەرە «د. خ» لەکوێ، یۆگای چینو رێ‌رەوی «**ئەسکەندەرانی**» ئیفلوطین لەکوێ، کەپاش صەدها ساڵ «**تەرجومە**» کراون بە عەرەبی، بەلام بۆ روون کردنەوەیێکی زۆرتری باسەکەمان، ئەپرسین، فەلسەفەکەی وەچۆن هاتوەتە ناو موسڵمانەوە؟ وە لە چ خولێکا؟

هەروەها باوەری کارتێ کردنی، تەسەووفی گەلانی تر بۆسەری تەسەووفی ئیسلامی، چۆن وەبۆچی پێك هاتوە؟

ئەوەی کەبۆمان روون بوەتەوە، کتێبە کانی فەلسەفەی یۆنان لەسەردەمانی هارون الرشید «٧٦٦- ٨٠٩» زاینی بەڵکو لەسەردەمی مأمونی کوری هارون دا «٧٨٦- ٨٣٣» گۆراونەتە سەرزوانی عەرەبی- بروانە کتێبی «أعلام الفلسفة العربية» هەرچەن لە دوادوایی دەسەلأتی ئەمەوی یەکان، لەشاما بریێ کتێبی کیمیایی لەیۆنانیەوە گۆراونەتەوە سەرعەرەبی، بە تایبەت لە رۆژگاری دەسەلأتی خالیدی کوری یەزیدی کوری مەعاویەدا. بروانە کتێبی «الفهرست» ی «ابن النديم» بەلأم هەروەکو ابن النديم «٩٣٦- ٩٩٥» ز «٣٨٥» کۆچی مردوە ئەڵێ گومانی تیانیە کە گۆرینی کتێبەکانی فەلسەفە بۆسەری زوانی عەرەبی، لەسەردەمانی عەبباسی یەکانا دەستی پی کردوە، وەکتێبی «أعلام الفلسفة العربية» یش هەر ئەم باوەرە تازە ئەکاتەوەو دانی پیائەنیێ. کەواتە ئەبیێ بڵێین نەفەلسەفەی کۆنی یۆنانی، بەتایبەت فەلسەفەی ئەرەسطو وە ئیفلاطون، وەنەفەلسەفەی تازەی «ئیفلوطین» کەبەناوی فەلسەفەی اسکندرانی، یافەلسەفەی ئیفلاطونی تازە، بەناوبانگە، کەسەرچاوەکەی، لە ئیفلوطین «٢٠٣- ٢٧٠» زوە سەرچاوە ئەگریێت، مادام کە لە سەدەی سیێهەمی «هجري» دا کراونەتە عەرەبی، ناتوانن کاریان کردبێتە سەر تەسەووفی ئیسلامی، کەسیێ صەدەی لەوەپێش دەستی پی کردوە.

ئەم باوەرانە زۆر تری لەرۆژهەلأت ناسەکانی ئەورووپاو ئەمریکاوە سەرچاوە ئەگریت، ئەویش زۆرتری بەهۆی لەیەکچونی بریێ لە وتارو باوەرێکەوەیەکە تاك وتراك لە گوفتاری کەڵەمەردانی رێرەوی تەسەووف لەگەلێ گەورەپیاوانی گۆرەپانی فەلسەفەدا لەیەك ئەچن، بەتایبەت فەلسەفەی ئیفلاطونی تازە. بروانە کتێبی «تاريخ الفلسفة العربية» نوسینی حەننا فاخوری وەدوکتور خلیل، بەم فەلسەفە تازەیە ئەڵێن فەلسەفەی «ئەسکەندەرانی» یان فەلسەفەی «ئیفلوطین» دیارەئەگەر بێتو ئێمە باسی ئەو لەیەك چونانەش بکەین ئەوەخۆی پێویستی بە لێکۆڵینەوەی باوەری، لایکەمی دەکەس لە فەیلەسوفەکان ودەکەسیش لە صوفی یەکانی ئەوێت، کە هەم لەوزەی باسەکەیشمان بەدەرەو هەم خویشی بەتەنها هەزار لاپەرە باسی ئەوێت، کە پێویستێکیشی نیە، چونکی ئێمە لەملاوە رووغمان کردەوە، وەوتمان بەر لەگورینی

فەلسەفە بۆزوانی عەرەبی، لای کەمی بەدوصەد ساڵ تەسەووفی ئیسلامی دەستی پی کردوە.

جاوتمان ڕۆژهەڵات ناسان، ئەولەیەك چونە تاکو تراکەیان کردوەتە بەڵگە کەئەڵێن «رابیعەی عەدەوی یە» بناغەی مەحەبەت «واتەخۆشەویستی» کردوەتە سەرچاوەی تەسەووفی خۆی، کەوتوویەتی خودایا من لەترسی جەهەنەم نیە، بەڵکو هەر بۆ خۆشەویستی وەرەزامەندبونتەلێم، کەمن بەندەگی تۆئەکەم «١٨٥ هـ».

جائەڵێن ئەم جۆرە خۆشەویستییە لەهی «راهبە» کان، واتە رەبەنەکان ئەکات، یان برێ باوەری «حلول» یان «ریازەت» کێشان وەهی تریش کەلەهی هیند ئەچی یان باوەری «ئیشراق» واتە دەرکەوتنی نوری خوداوەند، لەرەوشی یۆنانییەکان ئەچی، وەهی تر.

ئەم جۆرە هەڵسوکەوتو رەوشو باوەرانە، کەبرێکی لەهیندی وەبرێکی لەفارسی وەبرێکی لەیۆنانی وەبرێکی لەمەسیحی ئەچی، لەناوی کرداروگوفتاری سوفی یەکانا بەرچاو ئەکەون.

بەڵام کاتێ کەئێمە ئەبینین گرنگترین ڕێرەوی تەسەوف، لەهەڵسونیشتی پەیامبەری گەورەو یارانی یەوە، وە لە دەستوراتی قورئانو ڕێرەوی ئیسلامەوە، وەسالەها بەر لەگورینو نوسینەوەی ئەو فەلسەفەو وشانەوە، دەستی پێ کردوەو سەرچاوە ئەگرێت، چۆن ئەبێ بکەوینە ئەوگومانەوە کە بگرە تەسەووفی ئیسلامی لەوانەوە سەرچاوە بگرێت، جاشتێکی تر دێتە پێشەوە ئەویش ئامانجو ئاکامە، کەهەرگیز بەرهەمو ئاکامی ئەوری رەوانە یەك نین هەروەکو کەسەرچاوەکانیان لەیەك جیان.

**بۆچی؟**

بێگومان بنەرەتی باوەر لە تەسەووفی ئیسلامیدا، ئاینی «ئیسلامە» باوەر کردن بەتاکو تەنیایی خودا «توحید» باوەر بە «ریسالەت» واتە بەپەیام هاوردنی پەیامبەر لەلای خوداوە، ئەنجامدانی قەرزەکان بەرێکوپێکی، وەدەرنەچون لەچوارچێوەی «شەریعەت» وەلانەدان لەرێرەوی مەردایەتیو پیاوەتیو پیاوچاکی، وەهەمورەوشێکی پەسەند، وە بەکورتی، بە «ظاهرو باطن» واتە بەئاشکراو بەنهێنی، پەیرەوی کردن لەدەستوراتی قورئان وەپەیامبەر، لەلایی مرۆڤە هەرەگەورەکانی رێرەوی تەسەووف، بۆمانی دەرئەخەن کەتەسەووف رێرەوێکی راستەقینەی ئیسلامە، بەڵام نەك هەر

بەروالەت وە «ظاهیر»، بەڵکو لەکانگەی دڵیشەوە وەبە پەنامەکی؛ ئەویش بۆ نزیك بونەوە لەخوا هەروەکو وتمان بۆگەیشتن بەپلەی «عین الیقین»، «حق الیقین» وە بۆ بەدی هێنانی دەستوراتی قورئان کەلەمەوپاش یەکە یەکە دەسیان بۆئەکێشین وە لێیان ئەکۆڵینەوە. واتە لەو ئایەتانەی بونەتە سەرچاوەی تەسەووف هەروەکو پەیامبەر ئەفرمویّ «الاحسان أن تعبد الله کأنك تراه فان لم تکن تراه فإنه یراك» واتە ئیحسان بەوە ئەڵێن خوا جۆرێك بپەرستیت وەکو ئەوەی کەچاوت لێبەتی ئەگەر تۆچاوت لەو نیە ئەوچاوی لەتۆیە، جا بەمە ئەڵێن مەقامی ئیحسان.

جا ئەمەلەکویّ وەئەوە لەکویّ فەیلەسوفێك لەرێگەی ئاوەزەوە باوەرێکی بۆ خۆی سەلماندبیّ ئەویش لەرۆژگارێکا کەناوی ئیسلام هەرنەبوە وە صەدان سالّ بەر لەهاتنی ئاینی ئیسلامیش، مەبەستێکی تریش دەربارەی بەهەڵەداچونی رۆژهەلاّت ناسەکان، سەبارەت بەناسینی تەسەوفی ئیسلامی؛ هەر لەو بەشی لەیەك چونی بریّ شتی تەسەووفی ئیسلامی، لەگەلّ «رەبەن گەری» گاورەکان، یان هەڵسونیشتی، گۆشەگیرانی ولاّتانی تر، یان وتاری فەیلەسوفەکان دا، جگە لەروونکردنەوەکەی ترمان ئەوەتە.

ئیمە وتمان تێکۆشان بۆناسینی «ماوراء الطبیعة» خوو خدەیێکە؛ بگرە لەهەمو مرۆڤێکی ئیستەوکۆنیشا بوبێت وەهەیە؛ جابریّ کەس ئەوەندە چوەژێری باسەکە تاگەیاندویەتە رادەیێك هەموکاتی خۆی؛ وەژیانی خۆیی بۆ تەرخان کردوەو بوەتە گۆشەگیریك، ئەگەر لەکاتی ئاینی مەسیحا بوبێت بوەتە «رەبەن»، لەوەو پێشیش بەناوێك ناونراوە وەکو «تەرکی دنیا کردو» یان «عەودال». کەجیایە لەوشەی «ئەبدال»ی صوفی گەری، وەئاینی ئیسلامیش بیرکردنەوەی لە ئەرزو ئاسمان وەچۆنیەتی دروس بونیانی لاپەسەندە، «الَّذِینَ یَذْکُرُونَ اللهَ قِیاماً وَقُعُوداً وَعَلی جُنُوبِهِمْ وَیَتَفَکَّرُونَ فی خَلْقِ السَّماواتِ وَالأَرْضِ رَبَّنا ما خَلَقْتَ هذا باطِلاً سُبْحانَكَ فَقِنا عَذابَ النّارِ» (سورة آل عمران) خوا، ج رەزامەندی خۆی دەرئەبریّ سەبارەت بەوبەندانەی، کەبیر ئەکەنەوە لەدروس بونی کەون، ئەفەرمیّ ئەوانەی کەلەهەموکاتا لەهەڵسانو دانیشتنیشا خوایان لەیادناچیّ وەبیر ئەکەنەوە لەچۆنیەتی دروس بونی کەون. خوایا ئەمانەت بەگاڵتە دروس نەکردوە گەورەیی هەربۆتۆیە، بمانپارێزە لەسزای ئاگر، جا بەتەنها بوونی ئەم خووخدەیە. نابێتە بەدی هێنەری ئەوباوەرەی بڵێین، تەسەووفی ئیسلامی درێژەی ئەو تەسەووفانەیە؛ «تەنها ئەکریّ بڵێین» مرۆڤ لەرۆژێکەوە بوە هەرشەیدابوە بەشوێنی

ناسینی «ماوراء الطبیعة» دا، ئیتر لەیەك چونی «ئارادەیێك» ئامانجەكەیە وهیچی تر.

ئەگینا تەسەووفی ئیسلامی تەنها هەر لەئاینی ئیسلامو ڕێڕەوی «**موحەممەدی**» یەوە سەرچاوە ئەگرێت.

ئەبێ ئەوە لەیادنەبەین كە پێویستیەكانی جێگەژیان وەچۆنیەتی ژیان، هەروەها ساختمانی لەش، وەبیر كردنەوەی گیانلەبەران سەبارەت بەشتی لەیەكچو، ئاكامی لەیەكچویشی ئەبێت «**وەپێویستی بەلاسایی كردنەوە نیە**»، بۆنمونە، باوەری مرۆڤ سەبارەت بە جوانی سوروشت، سەبارەت بەهەمو جوانیێك، هەمو بۆنێكی خۆش، «**سەبارەت بەئەوین**» زۆرجار لەیەك چوەو لەیەكیش ئەچێ، زۆركات ئامانج وەئاكام «**لە عیشقی مەجازیدا**» واتە خۆشەویستی نێوانی نێرومێ، لەناو هەموی گەلاندا لەیەك چوە. لەیلاو مەجنونێ لەناو عەرەبا، یان رۆمیو جولێتی لەناو رۆژئاواییانا مەموزین وە شیرینو فەرهادێ لەناو ئیمەدا، وە سەدان خۆشەویستیی لەم جۆرە لەم سەرزەوییەدا پێكهاتوە. هیچی لاسایی كردنەوە لەوی تر، یان درێژەو دوابەشی ئەوەی پێشو نیە، كەچی هەر سەرچاوەییكی هەیەو، دورونزیكیش هەر ئامانجێكی بوە، كە پەیدابونی ئەوینێكی توندە لەناو دو مرۆڤی نێرومێدا.

هەروەها چۆنیەتی ژیانی هاوچەشن وە «**ظروف**» وە «**ئەوضاعی**» هاووێنە، وەناوانو «**بیئەی**» لەیەك چویش. بگرە ڕووداوو بەرهەمو داهاتی لەیەكچوو بێرێتەدی، جا ئەو «**زروفو**» «**بیئە**» یەی كە تەسەووفی ئیسلامی تیایانا زیاتر لەكانی تر گەشەی كردوەو باوی سەندوەو «**هەمە جاگیر**» بوە، بگرە ئەوەش هەر لەو زروفە چوبێت كەئەو جۆرە تەسەوفە تایبەتەی لەو ولاتانەشا هاوردبێتەدی، بەلام هەروەكو وتمان چونكو تەسەوفی ئیسلامی لەسەرەتای ئیسلامەوە دەست پێ ئەكا، وەبەوردی پەیرەوی ئەكات لەرێرەوی ئیسلام، خۆی ڕێبازو ئامانجێكی جیاوازی هەیە. ئێمە تائیستە گەیشتینە ئەوەی كە هەر لەسەرەتای بوونی ئینسانەوە لەرووی زەویدا مرۆڤ هەولی داوەبۆ خواناسی. وەبەگیانودڵ كۆشیوە بۆ ئەوەی لەچەنو چۆنی بەدیهاتنی جیهان. وەئاكامی ژیان سەردەربێرێت، بەلام ئامرازی دەستی مروڤ بۆگەیشتن بەم ئاواتە، تەنها ئاوەزی خۆی بوە. ئاوەزیش دیارە لەگەڵ هەمو بەكەڵك بونیدا. سنوردارەو چوارچێوەییكی هەیەو بڕدێكی هەیە، وەلە وزەی خۆی بەولاوە ناتوانێ بڕوات كەواتە ئاوەزی ئینسان پاش تەواوبونو دواهاتنی بڕدو توانایی خۆی ڕائەوەستێ.

لێرەدایە پەی ئەبەین بەگرنگی بەکاربردنی هێزی دەروونی، بۆخواناسی، بۆ پەی بردن بە رازو نهێنیەکانی ئەولای سورشت ومادده، جا لێرەدایە کەپایەی بوڵەندی تەسەووفمان بۆ دەرئەکەوێت، ئێمە وتمان کە تەسەووفی ئیسلامی هەرچەن شتی وای هەبێت کە لە تەسەووفی گەلان، یان رێ رەوو ئاینەکانی جیهانبچێت، هیچ کاتێ لەوانەوە سەرچاوەی نەگرتوە، وە تەسەووفی ئیسلامی لەزەمانی پەیامبەرەوە «د- خ» دەستی پێ کردوە وە ئەوجۆرە رەوشو فەلسەفەو هەڵسونیشتانە پاش سێ «صەدە» لەهاتنی ئیسلام، جا «بەعەرەبی» تەرجومەکراون و موسڵمانان لێیان ئاگاداربوون. واتە کاتێ ئەو شوێنەوارانە لەناو موسڵمانا ناسراون، کەتەسەووفی ئیسلامی چەندین قۆناغی خستوەتە پشت سەری، وەدەها صوفی بەناوبانگ هاتونە ئەمجیهانەوەو رویشتون و «تالیفاتیان» لە تەسەووفدا، کە ئیستە سەرچاوەن، بۆ ئێمە نوسراوەتەوەو، بناغەی تەسەووفی ئیسلامی یان ئەوەندە بتەو دارژاندوە، کەهەتاهەتایە هەر لەبتەو بونایە.

پاش ئەم پێشەکیە کورتەیە، کە ئێتر دەس ئەکەینە باسە بناوانیە کەمان، وەئەتوانین بڵێین تا ئیستە هەرچی مان نوسیوە هەموی هەر پێشەکی بوە وەلەمەولایە کەئێتر ئەپرسین:

**تەصەووفی ئیسلامی چی یە؟**

**لەکەیەوە دەستی پێ کردوە؟**

**ئامانجی تەسەووفی ئیسلامی چی یە؟**

**ئایا بەراستی تەسەووفی ئیسلامی لەگەڵ ئاینی ئیسلامی هیچ جیاوازی یەکی هەیە؟**

جا لێرەدایە من سەیری خۆم ئەکەم کەسەبارەت بە وەڵام دانەوەی تەواوو لێ کەموکوری ئەم پرسیارانە چەن بچوکو بێ دەسەڵاتم، وە هەر چەن سەرچاوەی زۆرم بەدەستەوەیە وەخوێنیم لەناو خێزانیکی صوفی مەسلەکا چاوم کردوەتەوە، وە لەم پەنجاساڵەی تەمەنا بەخزمەتی زۆرێك لەشارەزایانی ئەم رێگایە گەیشتوم، لەگەڵ ئەمانەشا ئەڵێم، چۆن وەلەکوێوە دەستی پێ بکەم، بەڵام ئومێد بەخوا تائەوێ کە

ئەتوانامانێت هەوڵ ئەدەم بۆ ئەوەی کاتێ کەدوایی بەنوسینەکەهات، وەکاتێ کەخوێنەواری کورد لەخوێندنەوەی نوسراوەکان بویەوە- ئیتر بەباشی بتوانێ وەڵامی ئەوپرسیارانە بداتەوە کەوان لەسەرەتای کتێبە کەدا.

جا سادەست لەدەستو قەوەت لەخوا.

ئیستە لەیەکەم پرسیارەوە دەست پێ ئەکەین ئایا تەصەووفی ئیسلامی چی یە وەئایا تەصەووف وەشەریعەت هەریە کێکن یان جیاوازن؟

ئەگەر یەکێکن ئەم چی یەو ئەوچی؟

ئێمە ئیستە کەدەست ئەکەینە باسەکەمان ئیتر بەناوی کەسێکەوە باس ئەکەین کەباوەڕی بەبونی خوای گەورە هەیە وەباوەڕی بەئایینی ئیسلام هەیە بەڵام ئەیەوێ بزانێت تەصەووف ئەتوانێ چ خدمەتێ بەبتەوکردنەوەی باوەڕەکەی بکات، وە تاچ رادەیێك ئەتوانێ لەخوای گەورەوە نزیکی کاتەوە، وەچۆن دەروی رووناکی لێ ئەکرێتەوەو ئەگاتە پایەی بتەوی «**یەقین**» واتە «**عین الیقین**» و «**حق الیقین**».

هەروەکو لە سەرەتادا وتمان «**تەصەووف**» بریتیە لە «**ذەوق**» واتە چەشتن وە «**ئیشراق**» واتە هەڵهاتنو تابشی نوری خوداوەند لەناودڵاندا وە ئەگەر بێتوبمانەوێ لە رێگەی ئاوەزو «**بورهان**» وسەلماندنی زانیاریوە بۆی برۆین کارمان ئەبێتە کاری رۆژهەلاَت ناسەکان؛ وەسەری دەزووەکەمان لێ ون ئەبێت، وەهەموی ئەکەینە گرێ کوێرە، هەروەکو ئەوەی کەبێین لەرێگەی زانیارییەوە لەبارەی «**وەحی**» وە «**میعراج**» وناردنی پەیامبەران بکۆڵینەوە وای لێ دێت، ئێمە وەنەبێ بایەخ وەنرخ بۆ زانیاری دانەنێین، بەڵام زانیاری راستودروست بەوە ئەڵێن کەدان بنێت بەسنورداری زانیاری دا، وەبزانێت کەئاوەز وە «**عیلم سنورێکی هەیە، وەناتوانێ لەبەرەی خۆی زیاتر پێ راکیشێت**»، کەواتە سنوری ئاوەز وەزانیاری ناتوانێ لەچوارچێوەی «**تاق کردنەوەی ماددەیی**» بترازێت، وەهەرچی کە لە سنوری رواڵەتی ماددە تاق کردنەوە دەرچو ئیتر لەوزەی زانیاریو ئاوەز بەدەرە.

بەڵام تاق کردنەوەی تەصەووف ئازمونیکێ «**رۆحی**» واتە رەوانی یە، وەکاری بەکاری ماددەوە نیە.

ئەتوانین بڵێین، «**عیلم**»، ئەزەوی، لەماددە، وەلەکاری پێنج هەستەکەرەکان «**حواس خمسة**» ئەکۆڵێتەوە، بەلاَم گۆڕەپانی گەردشی تەسەووف وا لە کەونو ذەوقو رۆحو هەستی دەرونیو ئیشراقی نوری خودایيدا وە بەرزتر ئەفرێت.

تەسەووف تانەی چیژیت ناتوانی هەستی پی بکەیت، کەوابو تەسەووف ئازمونی ڕەوانە نەك «نەظەریەییکی عیلمی».

لێرەدا دێینە سەر ئەوەی کەئایا تەسەووف هەر پەیرەوی یە لە ئاینی ئیسلام؟ کەواتە لەگەڵ شەرعا فەرقیان چی یە.

وەڵام ئەوەتە بەڵێ تەسەووفی ئیسلامی هەرپەیرەوی یە لەئاینی ئیسلام، بەڵام شەریعەت ئەوەی کەئەیەوێ لەمرۆڤ، ئەوەتە، کەبەپێی دەستوری شەرع، سپاردەکانی ئەنجامدات. وەکوئەوەی بۆ نوێژکردن پی ویست نیە بیروهۆشت نەڕوابە لایێکا، بەڵکومادام سپاردەکەت ئەنجامدا، لەکوڵت کەوتوە. بەڵام تەصەووف، وردەوردە وات لی ئەکات، لەهەموی نوێژەکەتا، چرکەیێك بیرت بەم لاولادا نەڕوات. هەرئەوەش نیە بەڵکو لەهەموی کاتی نوێژەکەتا، لەنوروبەرەکەت وەهەزاران بەرهەمو دەس کەوتیش بەهرەمەندبیت. کەوابو، ئەتوانین بڵێین، پەیرەوی لەشەریعەت، پەیرەوی یە لەدەستوری ئیسلام بەجۆرێکی ڕەواڵەتی، بەڵام تەصەووف سەرەڕای ئەو ڕواڵەتیەش پەیرەوییکی دەرونی و ویجدانی شە لەئیسلام، وەئەنجامدانی حەقیقەت و جەوهەرو کاکڵی ئیسلامە، بەدەرودەرون، بەدڵ وبەگیان. بەبارێکی تراەوانەی کە ئیمانەکەیان تەقلیدی یە، وەیەقینەکەیان یەقینێکی عیلمی یە بەئیمان و یەقینەوە پەیرەوی ئەکەن لەشەریعەت، بەڵام صوفی یەکان ئیمانەکەو یەقینەکەیان (عین الیقین)ە کەواتە، بەئیمانێکی یەقینی وکامل ترەوە بەیرەوی شەرعن.

کەوابو، فەرقێك نیە، بەڵکو پەیرەوی صوفی یەکان گەرم ترو دەرونیترە.

چۆن.. هەروەکو ئەڵێن.. شەرع ظاهیربینە. واتە ئەگەر تۆ ویستت دزی، یان درۆ، یان خراپەیێك، بکەیت، وەماوەیێکیش هەستو بیرت بەوکارە دژانەی ئاینەوە مەشغول بو، مادام تۆدەستت نەدایە کارەکەو ئەوکارەت نەکرد «شەرعا» بە تاوانبار دانانرێیت قانونیش هەروایە. بەڵام تەسەووف وات لی ئەکات «**ئەوەی دژی ئاینە، ئەوەی بەزیانی خەڵکەهەرگیز بەدڵتا تی نەپەڕێ وەخەیاڵی نەکەیت، بەڵکو جگەئەوەش هەمیشە بیر لە ئەنجامدانی کردەوەی چاك بکەیتەوە**». وە دڵودەرونت ئەبێتە هێلانەی «**خۆش ویستن**».

بەپێی شەرع، تۆ لەسەرتە، دەستورەکانی خوای گەورە وەکو نوێژ، زەکات، حەج، ڕۆژو، ئەمانە ئەنجامدەیت، بەلام تەسەووف وات لی ئەکات کەساتێ لەیادی

خوداوەند غافڵ نەبێ، وە زۆریش لەم‌کردوەیەت خۆشنودبیت وە لەذذەتی لێ‌بەریت. وەگەشەی پێ‌بکەیت.

ئەنجام‌دانی فەرمانی خوداوەند بۆ موسڵمانانی‌تر، جۆرێکە لەفەرمان‌بەری بۆپاداش، یان لەترسی‌سزادان، چونکی ناسینی خوداوەند ناسینێکی **«عەقڵی، یان عیلمی یان ئیرثی»** یە، بەڵام چونکی ناسینی **«خواناسان»** ناسینێکی یەقینی‌یە، ئەبێتە فەرمان‌بردن بۆ خوشەویست کە لەپێش هەموشتێکا هەر لەبەر خۆشەویستیە. وەمرۆڤ لەئازاری خوشەویست دڵخۆشە نەك لەنەوازشو کەرەمیشی.

لێرەدایە ئەپرسین کەئایا ئەم‌ڕێ‌ڕەوەی تەسەووفە لەگەڵ فەرمانی خوداوەند وەدەستوورانی قورئانا ڕێك ئەکەوێت یان هەر ڕێرەوێکی تایبەتە؟

بێ‌گومان ڕێ‌ڕەوی تەصەووف، ڕێ‌ڕەوی گەورەپیاوان‌و کەڵەمێردانی ڕێگای خودادۆستی‌و خوداپەرستی‌یە وەئەگەر‌بێتو لە ڕوانگەی ئاینەوە لەرەوشو کرداری شامەردانی ئەم ڕێگایە بکۆڵینەوە، وەبیان دەین لەمەحەکی تەقواو پارێزگاری سەیر ئەکەین کردارو گوفتاریان، سەری‌موییێك لە ڕێگەی شەریعەت لانادات.

جائێمە لەداهاتودا دەس‌نیشان ئەکەین بۆ ئەو ئایەتە پیرۆزانەی قورئانی مەزن، کە ئەم ڕێگابەرزەیان خستوەتە بەردەمی مرۆڤ، وەئەم خەلاتە جوانەیان تایبەت‌کردوە بۆ ئادەمی‌زاد، وەسەبارەت بە **«نەفس» «قەلب» «ذکر» «تەوبە» «سلوك» «طریقەت»** ەوەباس ئەکەین، تا وردە وردە بۆمان دەرئەکەوێت کەتەصەووف چۆن جەوهەری ئیسلام وەشەریعەتە، وەچۆن مرۆڤ ئەگەیێنێتە سەرمەنزڵی مەقصود.

وەسەبارەت بەزۆر مەبەستی‌تر باس‌ئەکەین کە وردە وردە خۆیان دێنەپێشەوە، وە بەیارمەتی خوا نی‌ئەکۆشم هەر بەئایەتی قورئان ڕوونی کەمەوە، چۆن خوداوە ندی گەورە، کەخۆی فەرمان‌ئەدا بە بەندە هەڵکەوتوو وەلەخۆبردووەکانی، بۆئەوەی ئەم‌ڕێگایە بگرنەبەرو بەری‌نەدەن تا ئەگەنە مەرام، وەان‌شاءالله بۆتانی ڕوون ئەکەینەوە کەپایەی مرۆڤی خواناس چەن‌بەرزەو ئەگاتە کوێ، وەهیممەتی مەردانی ئەم ڕێگایە چۆن جێگەی سەربەرزی کۆمەڵی مرۆڤە.

وەچۆن **«نیکرانی‌ذات»** **«لەخۆبوردن»** درۆشمی دەستی پێشەوایانی جیهانی تەصەووفە. وە گوێ‌ڕائەگرین بۆ گوفتاری زۆرێك لەوپێشەوایانە کە لەروانگەی خۆیانەوە تەسەووفیان بە ئێمە ناساندوە وەپێمان ئەڵێن کەسۆفی بەکێ‌ئەڵێن، هەروەها باسی خزمەتی گرنگی ئەم‌ڕێ ڕەوشتان بۆ ئەکەین بە جیهانی ئەدەب وەزانیاری.

لێرەدا هەربۆسەلماندنی ئەوەی کە ئەم ڕێ‌ڕەوە ڕێ‌ڕەوی ڕاستینی ئیسلامە، دەس نیشان ئەکەین بۆ وتەیێکی «ابن سینا» لەکتێبی «الأشارات والتنبیهات» دا کە ئەڵێ:
زاهید، بەوکەسە ئەڵێن کە دەستی هەڵگرتبێت لەسەرمایەو سامانی دنیاییی وەلەرابواردن، وەپشتی تێ‌کردبێ.

عابید، بەوکەسە ئەڵێن تەمەنی خۆی تەرخان کردبێت بۆ نوێژو هەمو جۆرە فەرمان بەردارێکی تری خوداوەند.

عاریف، بەڵام عاریف بەکەسێ ئەڵێن کەبەردەوام هەستو بیرو سرنجی خۆی کردوەتە لای «عظمەتی» خوداوەند وەئەیەوێ خوداوەند بەلوطفی خۆی دڵودەرونی ڕوون کاتەوە، وەتوری خودا لەدەرونیا بدرەوشێتەوە، جابرێ‌جار، وارێك ئەکەوێت کە هەموی ئەم ناوانە بەجارێکا بۆ یەك کەس کەخاوەنی هەموی ئەم «صیفاتانە» بێت بەکار ئەبرێت، واتە ئەکرێت کە یەك کەس، هەم زاهید بێت وەهەم عابید وەهەم عاریف، وە بەوکەسە ئەوترێت «صوفی».

لێرەدا بەباشی بۆمان دەر ئەکەوێت کەبەکێ ئەوترێ صوفی.

ئیمە تائیستە ئەوەمان بۆروون بویەوە کە ڕێ‌ڕەوی «تەصەووف» هەوڵ‌و تێکۆشانێکە بۆگەیشتن بەپلەی خواناسی لەرێگەی هەستی دەرونەوە، وە ئەم هەستەش هەروەکو لەئایندەدا ڕونی ئەکەینەوە، هەم بە «ذەوق» واتە چەشتن لەرێگەی دەروونەوە نەك زوان وەهەم بە «موشاهەدە» واتە چاوپێ‌کەوتن «نەك چاوپێ‌کەوتنی چاوی سەر» بەلکو بەچاوی دەروون کە پێی ئەوترێ بەصیرەت هەست ئەکرێ،

وە ئەم دیتنو چەشتنانەش کەصەدها جۆری هەیە ئەوە خۆی ئەبێتە هۆی دڵنیاییو ناسینێکی ڕاستەوخۆی گومان لێ‌نەکراو، بەجۆرێك کە ئیتر باوەری مرۆڤ بەخوایەتی خوا ئەگەر نەگاتە پلەی «حق الیقین» بێ‌گومان ئەگاتە پلەی «عین الیقین» وە دەرون لەگومان ئەکەوێت و ئینسان دەس لە دڵەراوکێ‌و بشکتینو دوّدڵی هەڵ ئەگرێ وە بەمرازی خۆی ئەگات. جالێرەدا چەن پرسیارێ دێنەپێشەوە،

أ: سەبارەت بەوکەسەخۆی ئەپرسین، ئایا پاش ئەوەی کەباوەر بویە باوەرێکی تەواو وەمرۆڤ هیچ گومانێکی لەخوایەتی خوادا نەما وەکەوتەسەر ڕێ‌ڕەوی خواناسی، ئیترمرۆڤ هەروەکو لەوەپێش ئەمێنێتەوە..؟ ئایا کرداری ئەگۆرێت؟ ئایا

بیروباوەڕی سەبارەت بە هەڵسونیشت لەم‌جیهانەدا چی بەسەردێت ؟ **«لمە سەبارەت بەرەفتاری ئەومرۆڤە»** .

ب : بەڵام سەبارەت بەڕێڕەوێك كەئینسان پاش دڵنیایی تەواو وە گومان لێ‌نەكراو ، واتە **«عین الیقین»** وە موشاهەدە ، یان **«حق الیقین»** واتە **«ذوق»**وەچەشتن ، وە بەهرەداربون لە تابشی نوری خوداوەندی ئەیگرێتەبەر ، كەئەویش بریتی‌یە لەڕێڕەوی **«تەسەووف»**پرسیاری زۆرێتر بۆئیمە دێنەپێشەوە .

وەكو ئەوەی بپرسین :

**یەكەم :**

تەسەووف چۆن بناسین واتە **«تەعریف»**وە پی‌ناسێكی ڕێكوپێكی تەصەووف كامەتا ، ئایا لەڕوانگەی گەورەپیاوانی تەصەووف ، وەلەڕوانگەی زانیارانی ئەم ڕێڕەوەوە ، تەصەووف چی‌یە ؟ چۆن تەصەووفان پی‌ئەناسن ، وەصوفی‌كێیە ؟ بەكێ ئەتوانین بڵێین صۆفی .

**دووهەم :**

ئایا چۆن بزانین ڕێڕەوی تەسەووفی ئیسلامی دەق‌بەدەق لەگەڵ دەستورو فەرمانی قورئانو **«سونەتی»**پەیامبەرا یەكێكە ؟

**سێهەم :**

ڕێڕەوی تەصەووف چی‌یە چۆن ئەكرێ پەیرەوی لێوە بكەین ، بەچی دەسبت پی‌ئەكات پایانی كامەو تاكامی بەكوێ‌ئەگات ؟

**چوارەم :**

چۆن‌بزانین كە تەسەووفی‌ئیسلامی هەر لەسەردەمی پەیامبەرەو بوە ، بەڵگەمان‌چی‌یە ؟

**پێنجەم :**

ئایا ئەم ڕێڕەوانە **«طەریقەتانە»**لەیەك جیان یان‌هەموی بۆیەك‌ئامانجە ؟

**شەشەم :**

ئایاشێخ‌یەتی وەئیرشاد یان **«شێخ‌بونو موریدبون»** لەگەڵ تەسەوفدا هەریەكێكن یان لەیەك جیاوازن ؟ وەچۆن ؟

**حەوتەم :**

لە «اصطلاح» ی تەصەووفدا بەکێ ئەوترێ شێخ ؟

**هەشتەم :**

صوفی بەکێ ئەڵێن وە «متصوف» بەکێ ئەوترێ ؟

**نۆهەم :**

کارکردی تەسەووف بۆسەری وێژەی هەموی ئەو زوانانەی کەتەسەووف لەناویانا گەشەی کردوە وەدەس ڕاکێشان بۆ وێژەی تایبەتی تەسەووف بەتایبەت عەرەبی ، کوردی ، فارسی وە هی‌تریش وە چەندین پرسیاری تریش کەبگرە لەکاتی لێکۆڵینەوەو شی‌کردنەوەی باسەکەماندا بێنەپێشەوە ، من تی‌ئەکۆشم تائەورادەیەی بۆم بکرێت و بتوانم ، بۆ خوێنەوارانی خۆشەویستی ڕوون کەمەوە وەبەوردی وەڵامی پرسیارەکان بخەمە پێش چاویان .

لام‌وایە لەپێشا پێویستمان بەڕوون‌کردنەوەیێکی زانیارانەی «ئیمان» ، واتە باوەڕ ئەبێت چونکە پەیوەندێکی ڕاستەوخۆی بەباسەکەمانەوە هەیە ، کەوابو ئەڵێین باوەڕ دوجۆرە .

**یەکەم** : باوەڕی «**تقلیدی**»واتە شوێن‌کەوتن ، یان «**لاسایی‌کردنەوەی لەخۆ گەورەتر ، بەتایبەت دایك‌وباوك ، لەوەتە ئەیبینێ منال ، بەك‌سەر ئاینی باوكودایکیان وەرئەگرن وەشوێنی‌ئەکەون .**

**دووهەم**: باوەڕی «**ئیستیدلالی**» واتە باوەڕ بەپێی بەڵگەو سەلماندن ، وەپرسیارو لێکۆڵینەوە .

جا باوەڕی ئیستیدلالیش ئەبێتە دووجۆر

أ : لەرێگەی بەڵگەی ئاشکراو «**ئاوەزپەسەندەوە**» بەڵگەیێ کەئەکرێ لەرێگەی یەکێ یان هەموی هەست‌پێ‌کەرەکانەوە هەست‌بکرێ ، وە ئاوەز پەسەندی بکات .

ب : لەرێگەی هەستی دەرونی‌یەوە ، هەروەکو وتمان دیتنو چەشتنی دەرونی ، واتە «موشاهەدە ذەوق کە بەرهەمی «**ئیشراق**» واتە تابشی نوری خوداوەندییە ، کە

ئەم جۆرە باوەڕە هەروەکوو ئێمان باوەڕی ڕێڕەوی تەسەوووفە ، کەوابو لەمەولا باسی ئێمە سەبارەت بەم جۆرە باوەڕە ئەبێت واتە «ئیمانی شهودی» لەرێگەی دەروونەوە ، کە هەمان «تەسەووف»ە .

مەبەستێکی گرنگی تریش هەیە کەئەبێ ڕوونی بکەینەوە ئەویش ئەوەتە ، موسولمان هەرئەوانەنین کەڕێڕەوی سوفیەتی یان گرتبێتەبەر ، بەڵکو هەروەکو وتمان هەم ئیمانی تەقلیدیش هەیە وەهەم ئیمانی ئیستیدلالی ، کەئیستیدلالی لەرێگەی ئاوەزەوە ، وەبەهۆی هەست کردنی «پێنج حەواسەوە» ئەبێ وە ئەمانەو ئاکامی هەموی ئەم ئیمانانە ، پەیرەوی کردنی «ظاهیری»یە لە «شەریعەت» ، یان ، ئەکرێ بڵێین پەیرەوی یە لە «ظاهیری شەرع» ، بەڵام «ئیمانی شهودی» واتەباوەڕکردنی دیتومەزەکردنی دەروونی ئەوە ، بە پەیڕەوی کردن ئەبیت «لەظاهیروباطنی شەرع» یان بە «ظاهیروباطن» ، واتە بەئاشکراو پەنامەکی ، وە لەدەرەوەو لەدەروونا پەیڕەوی کردن لەرێڕەوی ئیسلام ، کە بە پەیڕەوی ظاهیرئەڵێن شەریعەت بەمی تریش ئەوترێ طەریقەت ، وە تەریقەت ڕێڕەوێکە بۆگەیشتن بەحەقیقەت وە حەقیقەتی ئیسلام بریتی یە لەپەیڕەوی کردن لەئایینی ئیسلام لەئاشکراو لەپەنامەکیشدا واتە هەم بە لەش و زوانو گوفتارو کردار هەم بەگیان و دڵو دەروون ! جائیستە باش ڕوون کردنەوەی مەبەستی «ئیمان» واتە باوەڕ ، هەرچەن لەداهاتودا بەوردی باسی چونیەتی ئەو باوەڕە ئاشکراو نهێنیە ئەکەین ، بەڵام بۆنمونە ، خوای گەورە لەدوا ئایەتی سورەی «الکهف» دائەفەرمون «فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا ، وَلاَيُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا» لێرەدا هەر تەنهالەم ئایەتەدا ئەگەر بەچاوی خیرەد سەیرکەین ، ئەو پەرستنی ئاشکراو نهێنی یەمان بۆدەرئەکەوێ ، یەکەم ، خوداوەند چاوپێ کەوتنی خۆیانیان پەیوەند داوە بەکردەوەی چاکەوە ، کردەوەی چاکەش بێ گومان «هەمولاگرە» واتە هەم ئەنجامی فەرزەکان ئەگرێتەوە وەهەم هەموکردەوەیێکی چاك ، بەڵام ئەومەرجەی کە خوای گەورە بۆکردەوە چاکەکانی داناوە لەهەموی گرنگترو سرنج ڕاکیش ترە کە ئەفەرمێ «ولا يُشْرِكْ .. هتد» موسولمان نابێ لەکاتی ئەنجامدانی ئەوکارە چاکانەدا وەلەکاتی ئەنجامی دەستورەکانی خوادا ، شەریك وە هاوبەش بۆخوا دانێ ، شایەد ئێمە بپرسین بڵێین من کەهاتو نوێژم کرد ، حەجم کرد ، زەکاتم دا چاکەم کرد ، چۆن شەریکم بۆخودا داناوە ، وەلام ئەوەتە کە ئەبێ لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کارانەدا باوەکو بەئاشکرایش ئەنجام درابن ، ئەبێ تۆ بۆخوات ئەنجام

دابیّ ، واته «ریاءی تیانه‌بیّ» ، فیز به‌سه‌رکه‌سا نه‌که‌ی ، منه‌ت به‌سه‌رکه‌سا نه‌نیّیت ، «سوء استفاده» له‌وکاره چاکه نه‌که‌یت ، ئه‌گه‌ر کردت،نابیّ‌به‌ته‌مای پاداشه‌که‌ی بی، که‌چاوپی‌که‌وتنی خوایه‌و گه‌یشتن‌به‌خوایه ، وه ئه‌گه‌ر کردت ئه‌وه شه‌ریکت بۆخوا قه‌رارداوه ، واته‌په‌رستشه‌که‌ت ظاهیره‌که‌ی بۆخوایه‌و نهێنی‌یه‌که‌شی بۆ ئه‌وه‌ته به‌پیاوچاك بزانرێیت ، جا گرتنه‌به‌ری ڕیْ‌ڕه‌وی ته‌سه‌ووف بۆئه‌وه‌ته مرۆڤ وای‌لیْ‌بیْت ، که په‌رستشه‌که‌ی ته‌نها بۆخوابیْتو به‌س ، پاش ئه‌م ڕوون‌کردنه‌وه‌یه ، ئه‌گه‌ڕێمه‌وه بۆسه‌ری وه‌لاّمی ئه‌وپرسیاره‌ی که له‌سه‌ره‌تای باسه‌که‌دا پرسیان ، **«ئایا پاش‌گه‌یشتن به‌باوه‌ڕی ته‌واو ، ئه‌ومرۆڤه هه‌روه‌کو له‌وه‌وپیش ئه‌مێنیْته‌وه ؟ ... هتد»**

بیْگومان مرۆڤ له‌هه‌رکاریْك وه له‌هه‌رمه‌به‌ستیْك که دلّنیابو وه‌باوه‌ڕی گه‌یشته پله‌ی چاوپی‌که‌وتن ، یان چه‌شتنو مه‌زه‌کردن و تاقی‌کردنه‌وه ، ئیتر ناتوانیّ به‌پیْچه‌وانه‌ی ئه‌وراسته‌قینه‌یه هه‌نگاو هه‌لّگریّ .

**بۆنمونه** : ئایا که‌س ئاماده‌ئه‌بیّ که ده‌ستی‌خۆی بدا به‌ئاگره‌وه ؟ بیّ‌گومان ئاماده‌نیه ، بۆچی ؟ چونکی بۆی ده‌رکه‌وتوه که ئه‌سوتیّ ، یان له‌کاتی سه‌فه‌را که گه‌یشته بیابانیْکی وشکولم‌دار یان ماهوسه‌ختیْکی کویْستانیْکی گه‌وره،ئایا ئاماده‌ئه‌بیّ ڕوی ئوتومبیله‌که‌ی تیْ‌کا ؟ بیّ‌گومان .. ناء ، بۆچی ؟ چونکی لای‌ڕوونه که‌ڕیْگانیه ، وه‌هه‌ستی ئاوه‌ز پالّی‌پیْوه‌ئه‌نیّ که‌بیْهوده خۆی ماندو نه‌کات ، به‌هه‌رحالّ ، پاش دلّنیابون له‌هه‌رمه‌به‌ستیّ چاك یان‌خراب ، خۆش یان ناخۆش ، ئیتر هۆش‌وبیر وه ئاوه‌ز ، به‌باری ڕاسته‌قینه‌که‌دا هه‌نگاومان پیّ‌هه‌لّ‌ئه‌گریّ .

جا که‌وابو مرۆڤ ئه‌گه‌ر له‌ڕیْگه‌ی خواپه‌رستی‌یه‌وه گه‌یشته پله‌ی خواناسی ، ئیتر هیچ‌کاتیّ ناتوانیّ له‌و ڕاسته‌قینه‌یه ، له‌و کامه‌رانی‌یه ، له‌و پایه‌وپله بالاّیه ، ده‌س هه‌لّگریّ ، وه‌بۆهه‌میشه ئه‌بیْته ڕیْبواریْکی تیْکۆشه‌ر له‌وڕیْگا مه‌زنو پڕ له‌کامه‌رانیه‌دا بۆگه‌یشتن به مه‌نزلّی **«مه‌قصود»** .

پاش ئه‌م ڕوون‌کردنه‌وه‌یه ئه‌لّیْم ئیْمه که‌هه‌موی باسه‌که‌مان بۆ ناسینی ڕیْ‌ڕه‌وی ته‌سه‌ووفه ، له ئاینده‌دا ئه‌گه‌ڕیْینه‌وه بۆسه‌ری باسه‌که‌مان وه‌ده‌س ئه‌که‌ینه وه‌لاّمی ئه‌و پرسیارانه‌ی که ڕاسته‌وخۆ په‌یوه‌ندی‌یان به‌باسه‌که‌مانه‌وه هه‌یه .

بۆ نمونه ئه‌پرسین .

**یەکەم** : تەسەووف چۆن «تەعریف» ئەکرێت وە بەکێ ئەوترێ صوفی ؟

ئێمە لەپێشا وتمان چونکە تەسەووف مەبەستێکی «ذەوق» ، واتە مەزەکردنە وەشتێکی دەرونی و مەعنەوی یە ، ناتوانین بەوجۆرەی دەس ئەدات بۆ وشەی «ئیسلام» کە بریتی یە لە ئاینوشەریعەت وەیاساو «قانونی» تایبەتی ئاشکرای هەیە ، تەعریف دانێین هەر بەوجۆرەش بۆتەسەو وفیش چوارچێوەو «تەعریف» ی دیاری کراو دانێین ، بەلاْم خۆناکرێ هەروا دەستیشی لی هەلگرین ، کەوابو بۆناسینی صوفی وە تەصەووف پەناتەبەینە بەر ئاستانەی کەلەمەردانی ئەم ریْرەوە خۆیان ، وە لەزوانی ئەوانەوە پەنجە بۆ وەلاْمەکە رائەکێشین ، بەتایبەت هەروەکو زوتر بەلێنمان دا نوسینەکەی ئیمام «غەززالی» لەکتێبی «المنقذ» دا ئەکەینە کوردی بۆتان .

لێرەدا دومەبەستی تریش هەیە کەئەبێ سەرنجێکیان بدەین :

**یەکەم** : ناسینێکە کە هەریەکە لەگەورەپیاوانی ریْرەوی تەسەووف سەبارەت بەناساندنی «صوفی» وەتەسەووف وتویانە ،

**دوهەم** : بیروباوەری کارناسان و نوسەران و لێکۆلەرانێکە کە لەکتێبەکانی خۆیانا باسیان کردوە . هەرچەن ئەگەر بێتو بیروڕای هەموی ئەو گەورەپیاوانە بنوسین ، خۆی تەنها پێویستی بەکتێبێکی جیاوازە ، کەوابو ، ئێمە برێ لەوبیروڕایانە دەس چن ئەکەین وە بەیارمەتی خوا لە داهاتودا پێش کەش تانی ئەکەین ، بەلاْم ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئاکامو ئامانج لەهەموی ئەو بیروڕایانەدا هەریەکێکە ، بەلاْم هەرکام لەوان لەروانگەی خۆیانەوە باوەڕیان دەربڕیوە ، لەپاشان دەس ئەکێشین بۆ باوەری برێ لێکۆلەران و کارناسان و نوسەرانی باسی تەسەووف .

ئەم جۆرەکەسانە هەرچەن خۆیان سوفی نەبوون بەلاْم بەهۆی خوێندنەوەو لێکۆلینەوە بونەتە پسپۆر لەم ریْرەوەدا ، پاش ئەوەش باوەری خۆیشم هەرئەنوسم ، وەبەیارمەتی خوا وەلاْمی پرسیارەکانی تریش ئەدەمەوە .

ئومێدەوارم بەنوسینی ئەوبیروڕایانە بتوانم تارادەیێك ئەرکی سەرشانم سەبارەت بەناساندنی تەسەووف بۆخوێنەواری کورد بەجی بێنم ، هەرچەن ئەرکێکی زۆرگرنگوگرانیشە ، وەهەروەکو دوکتور «زکی مبارك» لەبەرگی یەکەمی کتێبەکەیا

«**التصوف الاسلامي في الادب والاخلاق**» پاش حەوت‌ساڵ لێکۆڵینەوە پێی‌دێت ، وەئەڵێ ، ئەرکی ناسینی تەسەووف لەوزەی تەنها یەك‌کەس بەدەرە ، وەخۆی سەبارەت بەئەنجام‌دانی ئەوسپاردەیەبە ناتەوان ئەزانێت ، جامنیش هەرچەن خۆم لەناوی خێزانێکی ئاینی «**تەسەووف مەسلەك**‌دا» چاوم‌کردوەتەوە وەزۆربەی تەمەنیشم لەگەڵ دۆستان‌و شارەزایانی ئەم رەنگایەدا بردوەتەسەر وەئیستەش زیاتر لەصەدوبیست سەرچاوەی چاپ‌کراوو چاپ‌نەکراوی عەرەبی‌و فارسیم لەبەردەستایە ، سەرەڕای ئەوەش هەرئەنجام‌دانی بی‌کەموکوڕی ئەم سپاردەیەم لاگرنگە .

لەگەڵ ئەوەشا بەیارمەتی‌خوا هەوڵی خۆم‌ئەدەم ، وەداوای‌لێ بوردنیش ئەکەم ،

## «وتەی گەورە پیاوان»

هەموی سەروەرانی ڕێگای تەصەووف ، باوەڕیان لەسەر ئەوەتە کەتەصەووف بریتی یە لە «زانیاری خواناسی» واتە «حیکمەت» ، زانیاری خواناسی ئەوزانیاری یەیە کەئەبێتە هۆی خۆش بەختی لەهەردوجیهاندا ، وەکو خوا ئەفەرمێت «وَمَنْ يُؤْتَ الحِكْمَةَ فَقَدْ أوتِيَ خَيْراً كَثيراً» ئایەتی «٢٦٩» البقرة ، هەروەها خوا لە سورەی جومعەدا ئەفەرمێ «هُوَ الَّذي بَعَثَ في الأُمِيّنَ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلو عَلَيْهِمْ آياتِهِ وَيُزَكّيهِمْ ويُعَلِّمُهُمْ الكتابَ والحِكْمَةَ» کەواتە ئەوەی بیەوێ دەستی بگاتە حیکمەت واتە «خواناسی» یان زانیاری دەرونی ، بێ گومان ئەبێ خۆی برازێنێتەوە بە پەیرەوی کردن لە «شەریعەت» ، وە بە پاك کردنەوەی دەرونیش لەهەموشتێکی ناپەسەند .

جائەگەر کردار دەق بەدەق شەریعەت دەرهات وە دڵودەرون پاك کرایەوە لەهەرچی شتی ناپەسەندو دژی باوەری ئیسلامە ، وەگسکی لێ درا ، واتەودەرونە شایستەبێ ئەوە پەیداتەکات کەنوری هەق تیا بدرەوشێتەوە ، پەیامبەر ، درودی خوای لەسەربێت ، ئەفەرمێ «قَلْبُ المُؤْمِن عَرْشُ اللهِ» یان «عَرْشُ الرَّحْمٰن» .

عطاءالله ی ئەسکەندەری ، کەیەکێکە لەگەورەپیاوانی ئەم ڕێگەپیرۆزە لەکتێبی «حِكَمُ العَطائِيَّة» دا ئەفەرمون : جابەڵکو روناکی خودایی روی کردە دەرونت ، بەڵام کاتێ دی ئەودەرونە خاوێن نیە سەرلەنوێ روی لێ وەرچەرخاندو گەرایەوە ، کەواتە تۆ دەرونت پاك کەرەوە لەهەرچی شتە «واتە دڵی مرۆڤ جگە لەیادی خوا هیچی تری تیانەبێت» جائەوکاتە خوا پری ئەکات لە «ئەسرارولەئەنوار» واتە لەنهێنیەکانو لە روناکی یەکان .

خوا لەسورەی «نازعات» دا ئەفەرمی . «وأمّا مَنْ خافَ مَقامَ رَبّهِ وَنَهى النَّفْسَ عَنِ الهَوىٰ فَإِنَّ الجَنَّةَ هِيَ المأوىٰ» گەیشتن بە بەهرەو خەڵاتی خواناسی دەس کەوتی خاوێن کاری «نەفسە» واتەدەرون .

وتراوە زانیاریی تەصەووف لەهەرچی زانینە پیرۆزترو گەورەترە ، ئەمەش بۆچی ؟ چونکە زانیاری ناسینی خوای گەورەیە ، بێگومان زانینێ کەهی خواناسی بێت لەهەرچی زانیاری یە گرنگ‌ترو پیرۆزترە ، وە بەرهەمیشی لەهەموبەرهەمێ بەکەڵک‌ترە ، وەخاوەنی ئاوا زانیارییێک ، لەهەرزانایێکی تر بەرێزترە ،

صوفی بە کەسێک ئەڵێن لەرێ‌ڕەوی ئایینی تەصەووفەوە تێ ئەکۆشێت پلە بەپلە باوەری زیادبێت‌و لەخوا نزیک‌بێتەوە ئائەگاتە دوایلەی باوەر ، وەدڵی ئوقرەئەگرێت ، هەروەکو خوای گەورە لەسورەی «الفتح» دا ئەفەرمێ «هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ» ئەمەش ئەگەر بەتێکۆشان نەبێت دەس ناکەوێ «وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى» سورەی «والنجم» ، ئەوکەسەش بەدڵوگیان وەبەپاکی تێ ئەکۆشێت بۆنزیک‌بونەوە لەخوا ، خواخۆی ئەیبێتە رێ‌بەرو رێ‌پیشان‌دەری ، «وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا» ئاخری سورەی «عنكبوت» .

زانیاری تەصەووف ، یان زانیاری «مەعنەوی» ، بۆدوناسین تێ ئەکۆشێت ، کە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە ، ناسینی خۆی وەناسینی خوای گەورە ، چونکە یەکێ خۆی نەناسێ چۆن ئەتوانێ خوای خۆی بناسێ ؟ وەئەگەر توانی خۆی بناسێت رێگەی خواناسیشی بۆخۆی هەموارو ئاسان کردوە ، «مَنْ عَرَفَ نَفْسَهُ فَقَدْ عَرَفَ رَبَّهُ» ، بێگومان خۆناسی کارێکی ئاسان‌نیە وە باسی خۆناسی بەتەنهاخۆی پێویستی بەکتێبێکە ، بەڵام بۆنمونە ، مرۆڤ ئەبێ بزانێت کەخۆی بەندەیەو دروس کراو ، بەرانبەر بە «خالق» ، وەبەرانبەر بەهەموکەسێکی تر ، سپاردەی لەسەرە هەروەها دەربارەی خۆیشی هەرسپاردەی لەسەرە ، سەبارەت بەدایکو باوکو ژنومنداڵ ، بەهاوسێ‌وهاوولاتی .. هتد .. مرۆڤ ئەبێ رۆژانە سەیری دەرونی خۆی بکات ، کە لەم سپاردانە کامی جێ‌بەجێ کردوە ، وەلەکامی لای‌داوە ، زیانی سەبارەت بەخۆی ، بە خەڵک ، چی بوە ، وەکەڵکی کام بوە ، وەئایا سەبارەت بەسپاردەکانی خوا ، کە دروس کەرو رۆزی دەریەتی ، چۆن هەستاوە ، رەوشی چاکەی چی یە ، ئازیادی کات ، رەوشی ناپاکی کامە ئالای بات ، وەلەم بابەتە ..

جاهەرکەس بەم چەشنە خۆیی ناسی وەهەستی چاکەی لەدەرونی خۆیا بزواندو پەروەردەی کرد ، وەهەستی ناچاکی‌و ناپاکی لەدەرونا گسک‌داو نابودی کرد ، ئەوسا کە ئامادەیی پەیدائەکات بۆخواناسیش ، ئەوەتا کەئەڵێ ئەوەی خۆی ناسی خوایش ئەناسێت ، وەئەوەی خۆی ناسی چارەی هەمودەردێکی دەرونی کراوە ، بەڵام کەسێ کەلوتی بەئاسمانەوەبێت ، وەلەخۆی بایی بێت وەنەتوانێ سەرنجێکی دەرونی خۆی بدات ، ئیترچۆن بتوانێ خوابناسێ ؟

خوائەفەرمێ «سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفاقِ وفِي أنفُسِهِمْ حَتّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أنّهُ الحَقُّ» سورەی «السجدە» یان هەرلەم بارەوە ئەفەرمون «وَفِي أنفسكم أفَلا تُبصرون»؟ سورەی «ذاریات».

ئەبو سولەیمانی دارانی : کەیەکێکە لەگەورەپیاوانی رێگەی تەصەووف ئەڵێت «دڵی صۆفی مەنزڵی خوایگەورەیە ، ئەوشتەش کەخوایدی نامرێت ، کەواتە دڵی صۆفی هەرگیزنامرێت»

پێشەکی نوسانی کتیبیّ «التعرّف لمذهب اهل التصوّف» لەنوسینی «ابو بكر محمد الكلاباذی» کەلەساڵی «۳۸۰» کۆچی (۹۹۰) زایینی دا فەوتی کردوە ، واتە دوکتور «عبد الحلیم» وەهاوری کەی ئەڵێن .

هەرهەنگاوێك کەصوفیەکان هەڵیان گرتوە هەنگاوەکەشیان نەمرە ، هەروەکودڵیان کەنەمرە ، بۆچی ؟

چونکە هەرهەنگاوێکیان کەهەڵ گرتوە ، هەربۆ خوایان هەڵ گرتوە .

جالەبەرئەوە صوفیەکان خۆیان لەسەرئەوباوەرەن ، کە خۆشەویستو هەڵبژاردەو «وەلی» خوان ، وەهەروەها پارێزەری کەلامی خوایشن .

پرسیویانە لە شیخ مەعروفی کەرخی ، «خۆشەویستی چۆنەو چی یە» ؟ فەرمویانە ، «ئەیبرام خۆشەویستی شتێك نیە خەڵك بەدەرس بیڵێنەوە ، خوشەویستی لەلایی خۆشەویست خۆیەوە بەدەرس ئەوترێتەوە .» کەواتە هەرئەم خۆشەویستی یە گەرمەیە ئەبێتەهۆی ئەوەی صوفی ، روو لەهەرلایێك بنیّ ، جگەخوا هیچ نابینیّ ، «فأینَما تُوَلّوا فثَمّ وَجهُ الله» سورەی «البقرە» ئەم خۆشەویستی یەش بەپەیرەوی کردن لەفەرمانی خوایگەورە بەدەست دێت کە لە رێگەی پەیامبەرەوە (د . خ) بە ئێمە گەیشتوە کە ئەفەرمێ «قُلْ إنْ كُنتُمْ تُحِبّونَ اللهَ فاتّبِعوني يُحْبِبْكُمُ الله» سورەی «ال عمران» .

لای صوفی هەرچی وا لەم جیهانەدا ئاوێنەیێکە کە خوایگەورەی تیابەدی ئەکات ، وەجگە لەشوێنەوارو «ئایات» توانایی و میهرەبانی خوانەبێت هیچی تێدا نابینێت .

ذو النون میصري «۲٤٥» کۆچی کەیەکێکە لەکەڵەمەردانی ئەمگۆرەپانە ، لەمبارەوە ئەفەرمێت .

«ئەیخوایگەورە قەت گوێم نەداوە بەدەنگی گیانلەبەرێك یان بەخشەیگەڵای دارێك ، یان بەخورەی ئاوێك ، یان نەوایپەلەوەرێك ، یان دەنگوئاوازێکی خۆش ، یان هاژەی تاڵگەی ئاوێك گرمەیهەورێك ، کە هۆیێك وە

**بەلگەیێك نەبوبن لەسەر پیشاندانو دەرخستنو دەربڕینی تا کوتەنیایی تۆ وەلەسەرلەوەی کەتۆ خوایێکی بێوێنەی وە وێنەت نیە»** هەروەکو لەپێش تڕا دەسیان بۆکێشا ، کوشتنی نەفس گەورەترین سپاردەی هەر ڕێڕەوێکی ڕیگەی تەصەووفە ، بۆچی ؟ چونکە سەرکێشیو لاڕێڕەوی نەفس ، «**واتە هەستی دەروونی مرۆڤ**» گومانی تیانیە هەروەکو لەزوانی یوسفەوە خوا خۆی ئەفەرمێ ، «**اِنَّ النَّفْسَ لَأمّارَةٌ بِالسّوءِ**» .

وەخوا خۆی ڕەزامەندی بەرانبەر بەو بەندانەی دەرئەبڕن ، کەجڵەوی نەفس ئەگرن «**وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الهَوَى**» ، کەوابو صوفی تێئەکۆشێت بەرادەیێك جڵەوی هەستی ناپەسەندی خۆی ڕاگرێت ، تاوای لێدێت کرداری ئەبێتە کردارێکی خوایی وە خواپەسەند . «**عَبْدِی کُنْ رَبّانِیاً تَقُلْ لِلشّيْ کُنْ فیکون**» «حەدیثی قودسی» .

«**جونەید**» .. ماموستای ماموستایانی شارێگەی تەصەووف ئەفەرمێ .

«**صوفی وای لێدێت هەرچی جوڵانەوەیێکی ئەبێت بەوجۆرەئەبێت کەخوایێ خۆشە ، وەهەرگیز سەرپێچی ناکات لەفەرمانی هەق ، بەچەشنێك هەستی لاڕێگری خۆی ئەکوژێت ، وەهەتاهەتایە لەناوی هەستی فەرمانبەرداریدا ئەمێنێتەوە**» .

بەڵێ صوفی ڕاستەقینە ڕەوشی مرۆڤ گەرایەتی ئەگۆڕێت بەرەوشی خودایی ، وە ئەم پایەبەرزەیەی بەشەر کەس ناتوانێ پێی بگات جگە لەڕێڕەوی «**تەصەووفی ئیسلامی یەوە نەبێت**» .

فەناو تیاچونی صوفی لاشەلەناولاشەدا «**یانلاشە لە ڕێگەی ویستی لاشەدا خۆی تیابیات**» ئەوەنیە ، وەتیاچونی ڕۆح بۆڕۆح «**یان لەناوڕۆحدا**» نیە ، بەڵکو ، فەنای ویستنایەلەویستنا ، وەفەنای ڕەوشەلەرەوشا وە «**صفات لەصفات**» دا ؛ واسە ، ویستی خۆت تیائەبەی بۆویستی خودا ، ڕەوشت ئەبەیتەسەری ڕووشی ئەوەصیفاتت ئەکەیتە صیفاتی خودایی ، وەصیفاتی ، بەشەریی خۆت تورئەدەیت ، هەروەکو صوفی یەکان خۆیان ئەڵێن «**فانِیاً عَنْ اوصافِهِ باقِیاً بأوصافِ الحَقّ**» ، واتە چۆنیەتی خۆیی تیابردوە وە هەر چۆنیەتی خودای لاماوەتەوە .

تەصەووف هەڵفرینو پەروازو بەرزبونەوەیە ، ڕوەو ، «**کمال**» ئەوەندە ئەڕوات تائەگاتە پایەی بەرزی لەبەرکردنی خەلاتی «**مەوصوف بە سیفاتی خودایی**» هەروەکو لەحەدیسی قودسیدا ئەفەرمون «**کُنْتُ سَمْعَهُ الذي یَسْمَعُ بِهِ وبصرُه الذي یُبْصِرُ به ، الخ**» واسە خوائەفەرمێ ، ئەوبەندەیەم کەڕەفتاری وای لێهات ؛ ئیترمن ئەبمە هەستی بیستنی ئەو وەهەستی بینینی ئەو هتد» ..

کلاباذی ... کەیەکێکە لەگەورەپیاوانی تەصەووف ئەفەرمێ ، پایەی فەنابون لەویستی جیهان «**مقام الفناء عن ارادة الدنیا**» لەوتاری «**عبد الله بن المسعود**» کەیەکێکە لەیارانی پێغەمبەر «د.خ» دەرئەکەوێ. عبدالله وتویەتی من هەرگیز بەخەیاڵما نەئەهات لەناوی یارانی پەیامبەردا کەسێ هەبێت کە ... ویستی دنیای هەبێت ، تائەوکاتەی ئەو ئایەتە هاتەخوارەوە کەخوائەفەرمێت «**مِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الآخِرَة**» ... سورەی «آل عمران» جا ، کلاباذی ئەفەرمێ «**عبد الله بن المسعود**» لەوکاتەدا لەمەقامی «**فانی عن ارادة الدنیا**» دابوە ، واتە بەهیچ جۆرێ ویستی دنیا لەدرونیا نەبوە .

توێژەرانی کتێبی «**التعرف لمذهب اهل التصوف**» ئەڵێن ، صوفی یەکان لەکورەی خۆشەویستی خوداوەندا سوتاون ، خووخدەیان بوەتە خووخدەی ئەو، هەڵسونیشتیان بەوجۆرەیە کە خواپێی خۆشە ، لەسەرخوانی نیعمەتی پەروەردە بوون ، وەزبانیان بەیادی ئەوو ناوبردنی ئەو بردوەتەسەر ، خودایش دەرونی لەهەموئالایشێك پاك کردونەتەوە . وەدای شۆربون لەهەمو ناخاوێنێك وە هەڵی بژاردوون بۆخۆی ، پایەی بەرز کردونو خۆشی ویستونو رازی بوەلێیان ، دەرگای نهێنیەکانی لی کردونەتەوە ، بە بەخشندەیی خۆی لەهەموزانیارییەکی ، چەشتن وزانینو بینین ، بەهرەمەندی کردون «**واتقو الله ويُعلِّمَكُم الله**» سورەی «**البقرة**» .

صوفی کەسێکە هەرچەند ئاگای هەیە لەخۆشیی بەهەشت ، لەگەڵ ئەوەشا بۆ نزیك بوونەوە لە خاوەنی بەهەشت ئەکۆشێ ، نەك بۆبەهەشت ، هەروەکو یەکێ لەگەورەپیاوانی جیهانی تەصەووف ئەڵێ بەموریدێکی «**ئەگەر بەهەشت ئەوێ بڕۆبۆلای اِبنُ مَدْيَنْ، کەعالم بوە**» ، ئەگەریش خاوەنی بەهەشت ئەوێ ، وەرەبۆلای من ، لە کتێبی «**نفح الطیب**»دا ئەڵی رێگەی گەیشتن بە بەهەشت رێگەی شەریعەتە ، وەرێگەی گەیشتن بەخوا ، رێگەی تەصەووفە ، واتە رێگەی «**حقیقەت**» .

رابیعەی عەدەویە : باڵندەی پەرسوتاوی رێگەی «**مەحەبەتی**» خودایی ئەڵێ ، خودایا من نە لە ترسی دۆزەخ تۆئەپەرستم وە نە بۆ پاداشی بەهەشت ، بەڵکومن ، هەر لەخۆشەویستیدایە کەکورنوشی بەندەیی بۆ گەورەیی تۆ ئەبەم .

دوکتۆر «**زکی مبارك**» لەسەرەتای کتێبەکەیا «**التصوف الاسلامي**» کە لەکتێبەسەرچاوەکانە ئەڵێ : ئەمە کتێبێکە لەتەصەووف دا وەتەصەووف لەخۆبوردنە «**نکران الذات**» ، لەپاشان ئەڵێ ، من وام ئەزانی ، تەصەووف پەیوەندی لەگەڵ

ئیشارات ، وه ڕێڕەوو نەریت (تقالید)ەوە هەیە ، بەلاَم ئیسته بۆم دەرکەوتوە کەبەستراوە بە دلّو دەرونو گیانەوە ...

ابو نصر السراج :... کەله (٣٧٨) کۆچی دا فەوتی کردوه لەکتێبی «اللمع» دا کەیەکێکە لەسەرچاوە گەورەکانی تەصەووف ئەڵێ ، «ابراهیم بن المولد الرقی» سەبارەت بەناساندن واته «تعریف» ی تەصەووف زیاتر له صەدوەلاَمی داوەتەوە .

هەروەها یافعی لەکتێبی «نشر المحاسن الغالیة» دا ، ئەڵێت ، سەبارەت بەناساندنی وشەی «تەصەووف» پتر لەهەزاروەڵام دراوەتەوە .

مەبەست ئەوەتە کەبۆ پەردەلادان لەسەری ئەم رازە ، وە پەی بردن بەم نهێنیە ، وەبەم جیهانە بێ پایانە ، وەئەم دەریای بێ بنوکەنارە ، زۆرباس کراوەو زۆر وتراوە .

«شیخ احمد الشرباصی» : کەیەکێکە لەنوسەرانی ئەم چەرخە وەئوستاذی ئەزهەریوە ، له زنجیرە وتارەکانی «الثقافة الاسلامیة» دا لەمارسی «١٩٦١» دا لەبەشی «التصوف عند المستشرقین» دا ئەڵێت .

تەصەووف ڕێڕەوێکی ڕەوشی کۆمەلاَیەتی و دەرونی یە ، کەبۆخۆی سەرەتاو ، ڕێڕەوو «بورهان» وبەڵگەو ، مەردانو ، قارەمانانو ، کتێبو ، سەرچاوەو ، کەڵکو ، سودو ، کانگەی ، تایبەتی خۆی هەیە .

هەروەکو لەمەوبەریش وتمان ، لەبەرئەوەی کە جیهانی تەصەووف جیهانێکە ئەگەرکەسێ بیەوێ بەتەواوی لێی تێ بگات ، ئەبێ خۆی بێتە گەشت کەرو گەڕۆکی ئەوجیهانە ، وەکو هەمو جیهان و زانیارێکی نەناسراوی تر ... بەلاَم هێشتا ناسینی جیهانی تەصەووف لەزانیاری یەکانی تریش نەناسراوو داپۆشراوترە ، بۆچی؟ چونکە تەصەووف هەم دیتنەو هەم چەشتن ، هەم .. تابشی نوری هەقە بۆسەری دەرون واتە «ئیشراق» ، وەهەم مەقامو ئەحواڵە. مەقام هەروەکو پایەوپلەی ئیشی دنیایی وایە ، وەکوبڵێین فیسارکەس ، مودیرە یان ، مولاحیظە ، واتە حەلاَتێکی دەوام دارتری خوداوەندی یە کەلەرێگەی خواپەرستی و ذیکرو پارێزگاری «تەقوا» وە ، بۆصوفیەکان دەست ئەدات ، بەلاَم حالّ ، هەرچەن ئەویش هەرشتێکە لەم بابەتە ، بەلاَم بەردەوام نیە ، واتە گۆڕان لەحالێکەوە بۆحالێ زوو زوو دەست ئەدات وەبگرە چەن جاریش هەرئەوحاڵە بڕواتوبگەڕێتەوە ، بەلاَم مەقام دامەزراوە کەگۆڕاپش

بۆلای سەروترەوە ئەڕوات، سامەگەر خوانەخواستە کارێکی ناپەسەندی لیٚ ڕوبدات، وەئەوپلەوپایەیەی لەدەست بدات.

جا مەبەست ئەوەیە، صۆفی چۆن ئەتوانیٚ کەسی تر تیٚ بگەیێنێت لەوجیهانەڕەنگاوڕەنگەی خۆی، لەکاتێکا ئێمە ئەگەر بمانەویٚ مەزەی میوەیێك باس کەین بوکەسێك کەئەومیوەیە نەخواردبێت، نازانین چۆنی بۆباس کەین و تیٚی گەیێنین؛ چۆن بڵێین تامی هەرمیٚ یان هەنجیر چۆنە، ئەگەر بڵێین شیرینە، خۆشەکرو هەنگوین و خورمایش شیرین، بەلاّم هەریەکەش تامی خۆی هەیە، کەی ترشی هەنارو سرکەوسماق ئەبنەیەك:؟ جا ئەگەر شتیٚ، هەم چەشتن و هەم دیتن، وەهەم تابشی نوربو، هەم حاڵومەقام، وەهەمویشی لەڕێگەی دەرونەوەبو، واتە «مەعنەوی» بو، دەی ئیتر چۆن ئەکریٚ ئەم جیهانە بەکەسی تر بناسرێت، تاخۆی سەرنەکێشێتە ناوی ئەوجیهانە وە.

«موریدێکی شیخ محی الدین ابن العربی» «١١٦٥ – ١٢٤٠» هاتەلای شیخ، وتی، خەڵك ئازارم ئەدەن وەباوەڕ بەم ڕێڕەوەمان ناکەن. شیخ فەرموی ئەگەرکەسێك داوای بەڵگەی کرد بۆناسینی ئەم ڕێگایە، تۆش لیٚی بپرسە، بەچی یا ئەزانێت کەهەنگوین شیرینە؛ بی گومان ئەڵیٚ چەشتومە، بڵیٚ، کەواتە ئەمیش تانەی چەشتیٚ نای زانیٚ.

شتێکی تر هەر سەبارەت، بەگرانی ناسینی جیهانی تەصەووف ئەوەتە، ئەوانەی کەخۆیان مەستی شادی وخۆشی ئەوجیهانەن، وە سەرگەرمی چنینی گوڵوبەرهەمی ئەوباغ و باغچەیەن؛ وەمەدهۆشی بۆن وشنەی ئەومەڵبەندەشیرینەن، وەگومی ناوگۆمی لوطف وکەرەمی خوداوەندن، وەحەیران وسەرگەردانی عەزەمەتوگەورەیی و پاکی وڕووناکی وە بەندەنەوازی و میهرەبانی خوای گەورەن: کەی ئەیان پەرژێتە سەری ئەوەی باسی ئەوجیهانەو ئەوژیانەی خۆیان بۆئێمەبکەن، وە چۆنی بکەن؛ جگەئەوەی، کەبڵێن ئەم جیهانەمان خۆشە، ئەم میوانە نایابن: وەهەرکەس مەردە بابێت خۆی لەم خۆشی وشادی یە بەهرەمەندبێت و خۆی بیٚ بەش نەکات، جگەئەوە ئەتوانن چی بڵێنو چی بکەن ؟؟.

مەبەستێکی گرنگی کەش بۆتەناسراوبی جیهانی تەصەووف ئەوەتە: بۆچۆنیەتی ئەوخۆناسینو ڕێگاناسینە، کەزانیارانی ئەوڕێگایانە ویستویانە بەئێمەی بڵێین زۆرتری

بەزوانی ئیشارەو کینایە، یان بەجۆرە وتەیێك، دواون، کەوەکو زوانی تایبەتی خۆیان وەهایە، کەوابو ئەکری بڵێین، هەریەکە لەوگەورەپیاوانە بەزوانی پایەوپلەو کاتوساتی خۆیان، لەگەڵ ئێمەدا دواون، کەوابو بەزوانی حاڵی خۆیان، یان، بەدەس هەڵتەکاندنو ئیشارەت، یان بەزوانێك کە تارادەیێك ئێمەش لێی تێ بگەین، ئێمەیان بانگ کردوە، بۆ سەرکێشانەناوی ئەوجیهانە شیرینەیان، وەهەرکەسەی بەزوانی حاڵی خۆی، وەلەپایەی خۆیا، باسی ئەوشوێنەی بۆکردووین کەخۆی تیایەو، باسی ئەو چەشتنو دیتنەی کردوە کەبەشی خۆیەتی و، خۆی لێی بەرخوردارەو لێی بەهرەمەندە، کەوابو ئەتوانین بڵێین، ئەکرێت بەرادەی هەرچی گەورەپیاوانو زانایانی ئەم ڕێگایە هەیە، «تەعریف» وەپێ ناس، بۆتەصەووف دابنێین.

جالەگەڵ ئەوەشا ئەبێ بزانین کە هەدەفو ئامانجی هەموی ئەمانە هەریەکێکە، وەهەموی هەرباس لەخۆشی و لەگەورەیی و لەراستی وچاکی ئەم ڕێگایە ئەکەن، بەلاّم بە «تەعبیر» واتە لێك دانەوەو ڕاگەیاندنی جۆراوجۆر، ئامانج یەکێکە، هەموی بانگ کردنە بۆسەر ڕێگەی خواناسی وخوادۆستی، وەباسی خۆشی ومەزنی ئاکامی کارەکەیە، بەلاّم هەریەکەی بەوزوانەی کەئەی زانی باسی ئەوشتەمان بۆئەکات کە دیویەتی و چەشتویەتی و لێی بەهرەمەند بوە، وەهەرکەسەی لە «حالێ ولمەقامێکا» دێتە وتارو بانگەواز، کەخۆی تیایابەرخوردارە.

جائیستە باگوێ ڕاگرین بۆ «تەعریف» واتە ناساندنی تەصەووف لەزوانی برێ لەگەورەپیاوانی ئەم شارێگەوە، هەروەکو لەپێشاوتمان تائیستە هەزاران «تەعریف» کراوە ئێمەش وابرێ لەوتەعریفانە کەنزیکترن لەرادەو وزەی پەی پێ بردنی ئێمەوە، ئەی خەینە بەرچاوتان، وەخۆیشتان ئەتوانن لەناو ئەوکتێبە سەرچاوانەدا کەهەم لەم بەشەداو هەم لەکۆتایی کتێبەکەدا، پێش کەش تانی ئەکەین، لەباسەکە بگەن.

ئەبێ ئەوەش لەیادنەبەین هەریەکێ لەم گەورەپیاوانە دەهاجار سەبارەت بەپێ ناسی تەصەووف باسیان کردوە وە صەدها کتێبیان نوسیوە، بەلاّم ئەمەی کەئەینوسین نمونەیێکی زۆربچوکە لەبەشێکی کەم لەوتاری ئەو گەورەپیاوانە.

**شیخ مەعروفی کەرخی:**

کەلەساڵی دوصەدی کۆچی دا فەوتی کردوە، لێیان پرسیوە تەصەووف چی یە

لەوەلاّمائەڵێت. «تەصەووف پەیرەوی‌کردنە لەحەقایق، وەدوورەپەرێزی‌کردنە لەوشتەی کەبەدەستی خەڵکە».

**ئەبوسولەیمانی دارانی:**

ئەڵێت، تەصەووف بەوەئەڵێن صوفی شتی‌وای بەسەرادێت جگەخوانەبێت کەس سەری لی‌دەرناکات، هەروەها لەگەڵ‌خوای‌خۆیا والەحاڵێکا جگەخوانەبێت کەس‌نای‌زانێت.

**ئەبوتورابی‌نەخشەبی:**

ئەڵێت، صوفی‌کەسێکە هیچ‌شتێ لێلی‌ناکات، وەهەموشتێك بەو روون‌ئەبێتەوە «٢٤٥» هجری‌فەوتی کردوە.

**بشرالحافی:**

ئەڵێت، صوفی‌بەکەسێ ئەڵێن کەدڵودەرونی پاك‌بوبێتەوە «١٥٠ - ٢٢٧» کۆچی ٧٦٧ - ٨٤١) میلادی

**بایەزیدی‌بەسطامی:**

«١٨٨ - ٢٦١» کۆچی، ئەڵێت صوفیەکان وەك‌منداڵێك وەهان کەخواخۆی پەروەردەکردنیانی گرتوەتەخۆی «وان‌لەپەنای‌خوادا».

**ئەبو یەعقوب‌ئەلسوسی:**

ئەڵێت، صوفی کەسێکە هەرچی‌یێکی‌هەیە بیبەن بێزارنابێت، وەلەرێگەی گەیشتن بەمورادیشا قەت کۆڵ‌نادات.

**ئەبولحەسەنی‌نوری:**

کەلەساڵی (٢٩٥) کۆچی‌دا دواکۆچی‌کردوە. ئەڵێت، صوفیەکان، خێڵێکن کەدڵیان گسك‌دراوە لەزیانەکانی ئادەمی‌زادیەتی، وەلەئافەت‌و نەخۆشی «نفس»، چاك‌بونەتەوە، وەلەدەس ئارەزوو ویستوخوامتی دەرون رزگارن، وە گەیشتونەتە بەرزترین وەپێش‌ترین پلەی خوادۆستی، وەمادام کەدەسیان‌هەڵگرتوە لەهەرچی‌شتە جگەخوانەبێ، کەوابو ئیتر نەخاوەن‌شتن، نە کەسیشیان‌کردوەتە خاوەنی‌خۆیان

«نەهیچیان هەیەو نەهی کەسیشن»جونەید: کەلە «٢٩٧» هجری‌وە «٩١٠» میلادی‌دا لەدنیادەرچوە، ئەڵێت، تەصەووف بەوەئەڵێن کەخودا هەرچی پەیوندت هەیە لەگەڵ «نەفسی» خۆتا بی برێت، وەپەیوەندت بدات بەخۆیەوە «لەگەڵ خوتا» بتمرێنێ وەلەگەڵ خۆیا زیندوت کاتەوە».

هەروەها ئەڵێت، تەصەووف بەوەئەڵێن کە لەگەڵ خودادابیتو هیچی‌تر، واتە «جگەخواپەیوەندت بەهیچەوە نەبێت».

هەروەها ئەڵێت، «صوفی وەکوزەوی وەهان، کە هەزارشتی ناپاکی بخەیتەسەر، ئەو جگە لەشتی پاک هیچی لی ناروێت، وەهیچ دەرنادات».

هەروەها ئەڵێت، «صوفیەکان پەیوەندیان تەنها لەگەڵی خوادایە، وەجگەلەخوایش کەس نایان‌ناسێت». جونەید، مامۆستای مامۆستایانی ڕێڕەوی صوفیەتی لەپێناسێکی تۆزێ درێژترا ئەڵێت.

تەصەووف بریتی‌یە لە پاک‌کردنەوەی دەرون بەچەشنێک کەهەرگیز ناپاک نەیێتەوە «ناپاکی بۆنەگەڕێتەوە»، وە هەرگیز زەبونی‌ولاوازی ڕوی‌تی‌نەکاتەوە، بەچەشنێ بۆهەمیشە لەخووخدە «حەیوانی» یەکانی مرۆڤ دەس‌بەرداربێت، وەئاگری «بەشەری‌یەتی» بکوژێتەوە، وەدوربی‌بگرێت لەئارەزوی «نەفس»،وە نزیکی‌بکات لەئارەزوی «ڕۆحی» ، وە دڵ‌بدات بەزانیاری ڕاستەقینە (مەعنەوی) وە هەتاهەتایە جگەلەچاکە هیچ‌کردەوەیێکی نەبێت، وەئامۆژگاری چاکەی هەموکەسی‌بکات، وەپەیرەوی بکات لەڕێڕەوی‌ئیسلام ڕێڕەوی پێغەمبەری‌گەورە.

**حوسەینی حەللاج:**

کەلە، «٣٠٩ کوچی / ٩٢٢ زاینی‌لە دنیا دەرچوە» ئەڵێت‌صوفی، تەکڕەوە، نەکەس ئەتوانێ بیگرێتەخۆی وەنە ئەویش کەسی‌گرتوەتەخۆی.

**ئەبوبەکری‌شیبلی:**

(٨٦١ – ٩٤٥) زاینی، ئەڵێت، تەصەووف بریتی‌یە لەدانیشتن لەگەڵ خودادا بەبی‌هەم «واتە بی‌پێویستی هیچی‌تر».

هەرئەو ئەڵێت، صوفی دەستی لەخەڵک‌بەرداوە «بچڕاوەلەخەڵک»، وە بەستراوە

بەخوداوە، هەروەکو خوا ئەفەرمێ بەموسی «واصطنعتك لنفسي» بەم جۆرە بچڕیوبە لەهەموکەسیێ، لەپاشان فەرمویەتی «لن ترانی».

**ئەبوحسەنی حصری:**

ئەڵێت، صوفی کەسێکە دەستی هەڵگرت لەئافاقی جیهان، ئیتر ناگەڕێتەوە بۆلایان وە کە ڕوی کردەلای خودا ئیتر ڕوی وەرناگێڕێت، وەهیچ ڕوداوێك ناتوانێ کاری تێ کاتو حاڵی بگۆڕێت.

هەرئەو ئەڵێت، صوفی بەکەسێك ئەڵێن، لەم جیهانەدا دڵی بەهیچ ئارامو ئوقرەنەگرێت بەخوانەبێت، وە کەسێکە کە کاری خۆی دابێتە دەستی خوا، خوایێك کەخۆی ئەزانێت چی بۆداناوە، «لەپاشان لەپەرستن» ئایاتۆ کەپەیرەویت نەکرد لەحەق ئەوەناگەیێت کەپەیرەویت کردوە لەگومراهی ؟.

**ئەبوسەعیدی ئەبوخەیر:**

«٣٥٧ - ٤٤٠» کۆچی، ئەڵێت، صوفی بەکەسێك ئەڵێن، هەرچی لەسەردایە لای بات، وەهەرچی لەدەستدایە بیدات، واتە هەرچی لەویستی خراب وەخراپەکردن لەسەریایەتی دەری کات، وە مشتەقوچاونەبێت وە لەبەخشینی سامانوسەرمایە بەهەژاران دریغ نەکات. بەکورتی «دڵپاکو بەخشندەبێت».

بەخشندەیی لای هەموی ڕیرەوانی ڕێگەی تەصەووف بەیەکێ لەپایەکانی ئەورێگایە دانراوە «لەکاتی خۆیا بەیارمەتی خوا باسی ئەکەین» بەکورتی مەبەستیان ئەوەتە، مرۆڤ بەردەو کۆیلەی سامان نەبێت، بەڵکو ماڵوسامانەکەی بەردەی ئەوبن.

**شیخ عبد القادری گیلانی:**

«٤٧٠ - ٥٦١» کۆچی، لەم بارەوە ئەفەرمون، ماڵی دنیا لەڕێگەی حەڵاڵەوە بێرەدەست، بەڵام، لەناوی دڵا دای مەنێ بەڵکو لەناوی دەستتابێت.

ئەمانەهەموی بۆئەوەتە مرۆڤ تێ کۆشێت بۆئەوەی خوخدەی دوورندەیی وەجانەوەری لەمێشکودەروندا دەرکات وە پی ئاخنێت لەخدەی ئینسانی ومەلەکوتی تائەبێتە ئینسانێکی فریشتە خوو.

**لە محمد بن علي القصاب:**

ماموستای جونەیدیان پرسی، تەصەووف چی یە؟... لەوەلاما وتی، بریتی یە

لەرەوشێکی چاك لەمرۆڤێکی چاك لەکاتوزەمانێکی چاکا بەرانبەر بەچاکان ئەکرێت. لەسەمنون یان پرسی، تەصەووف چی یە ؟ وتی تەصەووف ئەوەتە **(نەبیتە بەندەی کەس وەکەسیش نەکەیتە بەندەی خۆت)**.

**عمرو بن عثمان المكي:**

**(٢٩٨)** کۆچی فەوتی کردوەوتی، تەصەووف ئەوەتە بەندەی خودا لەهەموکاتێکا کردەوەیێك بکات، لەوکاتەدا ئەوکردەوەیە لەهەموکردەوەیێك باشترو پەسەندتربێت.

**ئەبی نەصر ئەلسەرراج:**

**«٣٧٨»** کۆچی مردوە ئەڵێت. صوفی یەکان ئەوانەن کە خوائەناسن وەلەدەستورو فەرمانەکانی شارەزان، وە رەفتارئەکەن بەودەستوورانەی کەخوا شارەزای کردوون لێی، هەرشوێنی ئەوشتانەئەکەون کەخوا شارەزای کردوون لێ یان، ئەوشتانە ئەنجام ئەدەن کەخوابۆی داناون، ئەوەشیان دەس کەوتوە کەبۆی گەراونو وێڵی بوون، وەدەسیان هەڵگرتوە لەهەرچی شتێکی تر کەبەدەست دێت.

ذوالنون میصری:

لە «٨٦٠ **میلادی** ، **٢٤٥ کۆچی**» فەوتی کردوەئەڵێت. نیشانەی خواناس سێ شتە، یەکەم روناکی خواناسی ی ئەو نابێتەهۆی کوژاندنەوەی **«نوری وەرعی»** **«وەرع بریتی یە لەپاریزکردن لەهەموحەرامێك، تەنانەت گومان لێ کراویش»** دوهەم، هەرگیز بەزانیاریێکی دەرونی باورناکات کەپێچەوانەبێت لەگەڵی **«ظاهیری شەرعا»**، سێ هەم: زۆری نیعمەت وکەرەمی خوا لەگەڵیا، نابێتەهۆی شکاندنی پەرژینی خەڵك، **«واتە دەسەڵات وای لێ ناکات پێ لەبەرەی خۆی دریژکات وەدەس دریژکات بۆسەری خەڵك»**.

سهل بن عبد الله التستري:

**(٨١٦ - ٨٩٦)** ز، ئەڵێ صوفی کەسێکە دەرونی «پاك بوبێتەوە لە لێڵی وئالایش وە پربوبێ لەپەندوزانین وە بەسترابێت بەخواوەو لەخەڵك بچرابێت، وە **«زێروخاك بەلایەوە یەك سان بێت»**.

ذوالنون: ئەڵێت، لەنزیکی شامدا ژنێکم دی **«کەخۆی لەخواناسان بو»** لێم پرسی ئەی خۆشکە خوات لێ رازی بێت، لەکوێوە دێیت ؟ وتی لەلای کەسانێکەوە **«تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا»** ئایەت لەسورەی **«سوجدە»** ئەڵێ لەپاشان

پرسیم ئەی بۆکوێ ئەڕۆیت ؟ وتی بۆلای «رِجالٌ لا تُلهيهِمْ تِجارةٌ ولا بَيْعٌ عَنْ ذِكرِ الله» ئایەت لەسورەی «النور» ئەڵێ گوتم تۆخوا باسیانم بکە بۆم ژنەکە بەشێعر هۆنراوەی جوان باسیان ئەکات بۆی کەئەمە سەرەتای هۆنراوەکەیەتی، «قوم همومهم بالله قد علقت،..... هتد» جائەوەش ئاسانتێکی تری صوفی یەکانە، بەزوانی قورئان.

ئایەتی یەکەم خوا باسی خواناساتێك ئەکات، کەزۆربەی کاتی خۆیان (بەتایبەت، لەشەوانیدا، کەکاتی حەسانەوەیە) بەیادی خوا ئەبەنەسەرو، ناتوون، وەئەفەرمێ تەنشتیان بێزارە لەپاڵ کەوتن و ڕاکشان لەسەرنوێن. ئەمە سەبارەت بەشەوو بەکاتی حەسانەوەو خەو.

ئایەتی دوەمیش هەر خوای گەورە باسی ئەوبەندانە ئەکات کە کاروکاسبی نایێتە هۆی ئەوەی کەخوا لەیادبەرن، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشا کە کاسبی خۆیان ئەکەن، خواپەرستیش ئەکەن و یادی خوائەکەن و خوایان لەبیرناچێتەوە.

جاباسی ئەم جۆرە ذیکرو یادوپەرستنە، لەکاتی باسی ووشەی (ذیکر)دا، بەدرێژی بۆتانی ڕوون ئەکەینەوە.

**یوسف بن الحسین:**

ئەڵێت. لەناوی هەمو «ئوممەتێك» دا برێکیان هەڵبژاردەی ئەو ئوممەتەن، ئەوانە خوا هەڵیان ئەبژێرێت بۆخۆی وەلەخەڵکیان ئەشارێتەوە، وەئەگەر لەناوی ئوممەتی موحەممەدا ئەوهەڵبژێرراوانە هەبن بێ گومان «صۆفی یەکانن».

**ئەبوسەعیدی خەرراز** : کەلە «٢٦٨» کۆچی دا فەوتی کردوە ، ئەڵێ صوفی کەسێکە خوداوەند دەرونی خاوێن کردوەتەوە وەپری کردوە لەنور ، وەکەسێکە کە بەیادکردن و ناوبردنی خوا ئەگاتە ئەوپەڕی خۆشی و کامیابی .

**جەعفەر ئەل خولدی** : کەلە «٣٤٨» کۆچی دا لەدنیادەرچوە . ئەڵێت ، تەصەووف بەوەئەڵێن نەفس بخەیتە ژێرباری بەندەگی ، وەدەرچی لەهەمو ویستێکی بەشەری ، وەبەهەمو هەستێکەوە ڕوبکەیتەخواناسی .

**شبلی** : «٨٦١ - ٩٤٥»ز ، ئەڵێت ، سەرەتای تەصەووف خواناسینە و ئاکامەکەشی خوا بە تاك زانینە ، «توحید» .

بۆڕوونکردنەوەی ئەمباوەڕە ئەڵێن گەورەیی خوایەتالێزانین لەوەدا دەرئەکەوێ کەخوا بەپێغەمبەر (د. خ) ئەفەرمێت «قل هو الله احد» ... هتد . واتە بڵێ خوا تاکە «هەر یەکێکە» . مەبەست ئەوەیە کەسێ کە خوای بەتالێزانی «جگەخوا ، نەکەس ئەپەرسێ وە نەلەکەس ئەترسێ»

**ئەبوبەکر ئەل‌کەتتانی** : کەلە «٣٢٢» کۆچی‌دا کۆچی‌کردوە ، ئەڵێت : تەصەووف «ئەخلاقە» ئەوکەسەی ڕەوشی لەتۆ بەرزتربێت ڕووناکی‌و پاڵێوراویشی لەتۆ زیاترە .

**شاهی‌نەقشبەند «محمد بهاء الدین»** (١٣١٧ – ١٣٨٩) ز (٧١٧ – ٧٩١) ئەڵێت : ئەم‌ڕێ‌ڕەوەی‌ئێمە سەرانسەری «ئەدەبە» .

**لە ئەباموحەممەد ئەلجەریری** : یان پرسی تەصەووف چی‌یە ؟ وتی ، (**پەیڕەوی‌کردنە لەهەمو ڕەوشتێکی‌پەسەند وەدورکەوتنەوەیە لەهەموڕەفتارێکی ناپەسەند**)

**لەکتێبی تذکرة الأولیای عطاردا** : بەزوانی «ابو الحسن نوری» یەوە ئەڵێت ، تەصەووف نەرەسمە «**واتە دابونەریت**» وەنە زانیاری‌یە ، بەڵکو «**ئەخلاقی خودا وەندی‌یە**» چونکە ئەگەر ڕەسم‌بوایە بەتێ‌کۆشان ئەهاتەدەست ، وەئەگەر زانیاری‌بوایە بەخوێندن فێری ئەبوین ، بەڵام ڕازانەوەیە بەڕەفتاری خوداوەندی ، وەکەسیش ناتوانێ لەڕێگەی خوێندنو تێکۆشانەوە بیێتەخاوەنی ئەو ڕەفتارە ، مەگەر بە پەیڕەوی‌کردن لەڕەفتارەکە .

**هەروەها نوری** : ئەڵێت ، تەصەووف بریتی‌یە لەئازادیی وە سەخاوەت وە جوامێری وەخواپەرستنی بێ «**تەکەللوف**» واتە بەشەوقو مەیلو ئارەزو .

**شیخ محمد امین الکردي** (**ئەربیلی**) ، کەلە (**١٩١٣**)ز فەوتی‌کردوە لەکتێبی «**تنویر القلوب**» دا ئەڵێت ، شەریعەت درەختە ، تەریقەت لقوپۆپەکەیەتی وە «**حەقیقەت**» بەرهەمەکەی ، وە حەقیقەتیش خواناسی‌یە لەڕێگەی‌دەرونەوە کە بریتی‌یە لە «**تەصەووف**» .

**ئەبوبەکری کەتتانی** : جارێکی تریش ئەڵێ ، «**التصوف صفاء ومشاهدة**» واتە تەصەووف پاکی‌یەو دیتن ، بەڵێ بەڕاستی لەم دوو ووشەکورتەدا هەم (**هق**)

باس کراوه هەم (**ئاکام**) ، مەبەستو «**غایە**»کە (**موشاهەدە**)یە واتە دیتن ، یان ، «**عین الیقین**» ، چاوپێ کەوتنی نهێنیەکانی ، «**ماوراء الطبیعة**» کە لەم ڕێگایەوەنەبێ دەس نادات ، وە هۆیەکەش بۆگەیشتن بەم ئاکامە پاکی دەرونە واتە «**صفاء**» ڕێگەی تەصەووفیش ڕێگەی خاوێن کردنەوەی دەرونە کەواتە «**التصوف صفاء ومشاهدە**» خاوێنی یەو دیتن .

ئەم ڕێگەیەش هەرچەن لەئایندەدا بەدرێژی باسی لێوە ئەکەین بەڵام بەکورتی ، لە «**تەوبە**»وە دەس پێ ئەکات واتە دەس هەڵگرتن لەهەموکارێکی زشت «**الاخلاق المذمومە**» لەپاشان «**مجاهدە**» واتەتێکۆشین ، بۆ ڕازاندنەوەی دەرون ، بەهەمو ڕەوشێکی پەسەند «**الاخلاق الحمیدة**» ، لەپاشان پەیوەندی دڵ برین ، لەهەرچی شتی هەڵخڵەتێنەرە ، وەکو دەسەلاٌتو سامان ، «**بێ گومان پەیوەندی دەرونی ، نەك تەرکی دنیاو تەرکی کاسبی ، وەبونەبار بەسەری خەڵکەوە**» ، وەڕووتانەئاستانەی خاوەن و دروس کەری ئەم جیهانەیە ، کە «**ذاتی**» **اللە**یە ، خوایش بڕیاری داوە هەرکەسێ کەوابو ، ئەیخاتەسەری ڕێگاو ، ئەبێتە ڕێ پێشان دەری ، وە نوری خۆی ئەخاتەدڵیەوە «**والَّذِینَ جَاهَدُوا فِینَا لَنَهْدِیَنَّهُمْ سُبُلَنا**» سورەی «**عنکبوت**» «**وهو یتولی الصالحین**» .

**ئیمامی غەززالی** : لەسالٌی «**١٠٥٩ – ١١١٤**»ز (**٤٥٠ – ٥٠٥**) کوچی داژیاوە ، کەیەکێکە لەپیاوە هەرەگەورەکانی ڕێگەی خوانامی وەیەکێکە لەدانشمەندە هەرەگەورەکانی ئیسلام وەخاوەنی دوصەد تاچوارصە «**تالیف**» بووە ، ئەم گەورەپیاوە بەشێوەیێکی عیلمی وزانیارانە ، ڕێ ڕەوی تەصەووفی ڕوون کردوەتەوە ، وە بەباشی سەلماندویەتی چۆن (**شەریعەتو طەریقەت**) هەردو یەك ڕێگان وەئامانجو ئاکامو بەرهەمیان هەریەکە . وەڕونی کردوەتەوە کە ڕیگەی شەریعەت ڕێگەی «**ظاهری**» ئیسلامە وە ڕێگەی تەصەووف ڕیگەی دەرونی و نهێنی یەتی ، ئەم کەڵەمێردە لای وایە تەصەووف جگە بۆمەردی مەیدانی خۆی نەبێت بۆکەس ناناسرێت ، وە هەرکەس بیەوێ لەڕێگەی خوێندن و باس کردن و بشکنینەوە ، شتێکی لێ تێ بگات سەری خۆی ئێشێنێ ، بەڵکو هەرکەس بیەوێ لێی تێ بگات ، زۆربەباشی ئەتوانێ وەکوپیاو ، چاکی لێ بکات بەلاداو ، بێتەمەیدانەوە تاوەکو زۆرباش دڵی ئاوبخواتەوەو لێی تێبگات ، جا ، کە تێی گەیشت ، ئیتر ئەوڕێگایە بەرنادات وئەویش ئەبێتە

بولبولێکی ئەوباغچەیەو هەنگێکی ئەوگوڵەشیرینانەو ، پەروانەیێکی باڵسوتاوی ئەوروناکی یە .

غەززالی ئەڵێت ، زانیاری دەرونیی زانیاریێك نیە هەرگیز فێربکرێت ، چونکە قەت کەس ناتوانێ وشە پەیدابکات بۆ ئەو حاڵو مەقامو دیتنو بیستنو چەشتنانە ، کەوابو ئەگەرباس کرا ، سەر لە وێژەریش و بیستیاریش ئەشێوێت .

غەززالی ئەفەرمێ ، ئەمزانینە کەس ناتوانێ بیزانێت خاوەنی خۆی نەبێت ، وەلایشی وایە ئەوکەسەی لەوتێنیانە سەردەربێرێت ، نابێ باسیان بکات بۆکەسانێك کە سەریان تیە لەناوی ئەوکارەدا ، وەشتیان لێ حاڵی نەبوە .

وامن لێرەدا بەشێکی بچوك لەبیروڕای ئەمەردەگەورەیە بۆئەوەی کە تامومەزەجوانەکەی خۆی لەدەس نەدات هەربەعەرەبیەکەی ئەینوسمەوە .

غەززالی لەکتێبی «إحياءُ علومِ الدِّين» دا سەبارەت بەڕێڕەوی تەصەووف ئەفەرمێ .

**«الطريق تقديم المجاهدة ومحو الصفات المذمومة وقطع العلائق كلها ، والاقبال بكنه الهمة على الله تعالى ، ومهما حصل ذلك «اي متى حصل ذلك» الكاتب . كان الله المتولى لقلب عبده والمتكفل له بتنويره بانوار العلم واذا تولى الله امر القلب فاضت عليه الرحمة ، واشرق النور في القلب ، وانشرح الصدر وانكشف له سر الملكوت ، وانقشع عن وجه القلب حجاب الغرة بلطف الرحمة ، وتلألأت فيه حقائق الامور الالهية» .**

ئەبێ ئەوەش بزانین ئەمزانینەی کەغەززالی دەس نیشانی ئەکات ، وەئەڵێ پەردە لەسەری دڵی پیاوچاکان ، «وەلی» لائەچێت ، لەگەڵی زانینی پەیامبەراندا لێك جیان ، زانینی پەیامبەران «وەحیە» ، وەهی پیاوچاکان ئیلهامە ، وە چەنوچۆنی کەشفو کەرامات و وەحی وە ئیلهام وەئەوجۆرە شتانەش ، لەداهاتودا بەپێی توانای خۆم باس ئەکەم ، هەروەها خۆیشتان ئەتوانن لەکتێبەکانی ئیمامی غەززالی دا وەکو «**المنقذ من الضلال ، وە احياء علوم الدين**» هەروەها کتێبی «**الرسالة القشيرية**»ی عبد الكريم بن هوازن وە «**التعرف لمذهب اهل التصوف**» ی ابو بكر محمد الكلاباذی وە «**قوت القلوب**»ی ابی طالب المكي «**٣٨٦**» هجری وە «**اللمع**» ی ابی نصر السراج «**٣٧٨**» هجري وە «**مەکتوباتی ئیمامی ڕەببانی**» وە «**تذكرة الاولیا**»ی عەتتار وە دەها کتێبی لەمێژینو کۆندا ، یان کتێبی «**المواهب السرمدية** ، **وە تنوير القلوب**»ی «**شيخ محمد امين اربيلي**» وە «**التصوف الاسلامي**» زەکی موبارەك کەتازەترن وەهی تریش

بخوێننەوە بەڵام چونکە کتێبەنوێکانیش هەر دەستیشان ئەکەن بۆ ئەوسەرچاوەکۆنانە وەنوسەرەکانیشیان خۆیان لەوزانیاری‌یە بێبەشن، کەواتە بەکەڵک‌تر وایە، هەرسەیری کتێبە سەرچاوەکۆنەکان بکەن.

جا ئەمەتە چۆنیەتی ڕێگای صوفیەتی، وەهەروەکو وتمان، هەموی ئەم ڕێڕەوانە، وەئەم باوەڕانەی کە خرانەبەرچاوتان، بریتین لە پەیرەوی‌کردن لەڕێڕەوی «قورئان»، بەڵام، پەیرەوی کردنێکە بە دڵوبەگیان نەك‌تەنها بەلەشو بەزمان، وەهەمویش هەر یەك‌شت ئەگرێتەوە، ئەویش «گەیشتنە بەپلەی خواناسی وەبەدەست‌هێنانی ڕەزامەندی‌هەق».

بۆ چاوکرانەوەیێکی زیاتر، سەبارەت بەرێرەوی تەسەووف، بەپێویستی ئەزانم بەکورتی شیرەی نوسراوەیێکی هەڵوێی بەرزەفڕی ئاسمانی دانشوییش، ئیمام موحەممەدی غەززالی‌تان بخەمە پێش‌چاو، کتێبەکەش بریتی‌یە لەکتێبی «المنقذ من الضلال».

غەززالی لەم کتێبەیا هەم سەرگوزەشتی ژیانی‌خۆی بەکورتی باس‌کردوە، وەهەم باسیان بۆئەکات کە چۆن کەڵکەڵەی ڕێگەی سۆفیەتی کەوتوەتە سەری وەچۆن بەئامانجو ئاکام، وە ئارەزوی دڵی خۆی گەیشتوە، غەززالی لەتەمەنی‌خۆیا دوکاری گرنگی ئەنجام داوە ئەکە، ئەگەر بە ڕێبەرو پێشەنگی ئەم دوو ڕێگایەی نەزانین، بێ‌گومان یەکێکە لەهەرە پیاوەبەرزەکانی ئەم دوو ڕێگایە.

**یەکەم:**

نوسینی سەرگوزەشت‌و چۆنیەتی خۆی، وە پیشان‌دانی بیروباوەڕی دەرونی، وەچەنوچۆنی ڕێرەوی ژیانی، تائەگاتە ئاکام.

**دوهەم:**

رونکردنەوەی ئەوەی کەشەریعەت وەتەسەووف لێك جیانین، وەتەسەووف بریتی‌یە لەڕۆحو لەحەقیقەتی شەریعەت، ئەمەش، هەم‌لەم‌کتێبەدا، وەهەم لەکتێبەکانی تریدا، بەتایبەت «احیاء علوم الدین» دەری بڕیوە.

لەبارەی روونکردنەوەی لێك‌جیانەبونی شەریعەت وە تەسەووف، چەن گەورەپیاوێکی تری ڕێگەی تەسەووف، وەکو «عبد الکریم قشیری» «٣٧٦ – ٤٦٥»

کۆچی خاوەنی کتێبی «الرسالة القشيرية في علم التصوف»، کە لەچاپدەری کتێبەکە، ئەڵێ «للامام العالم، الجامع بين الشريعة والحقيقة ...»، وە هەروەها «جنیدی بغدادی» کەلەساڵی «٢٩٧»کۆچی «٩١٠» زاینی‌دا فەوتی کردوە.

وە «ابو النصر السراج» خاوەنی کتێبی «اللمع» کەلەساڵی «٣٧٨» کۆچی‌دا لەدنیادەرچوە، کەدوکتۆر عبد الحليم وە طه عبد الباقي، لەچاپدەرانی ئەم کتێبە، سەبارەت بەم کتێبە ئەڵێن «اكبر موسوعة صوفية عرفها التاريخ» جا، ئەم چەن کەڵەمێردەو چەن گەورە پیاوێکی تری ئەم ڕێبازە کە بە نوسینی کتێبە بەنرخەکانیان ڕوونیان کردوەتەوە چۆن «شەریعەت وتەصەووفی ئیسلامی» هەریەکێکن وە جوێ نین لەیەك.

غەززالی وە هەروەها ئەم گەورە پیاوانەی تریش کە دەسیان بۆکێشان بەباشی ڕونیان کردوەتەوە کە شەریعەت ئەگەر بە «لەش»و«بەدەن» دابنرێت گیانی ئەوشەریعەتە، کە حەقیقەتی ئیسلامە، بریتی‌یە لە «تەصەووف» وەهەرکەسیش وای‌ئەزانێ ڕێی لێ ون بوە وەلەڕێ لای داوە.

ئیمام «ابو حامد محمد بن محمد»ی غەززالی، «٤٥٠ – ٥٠٥» کۆچی، بەشێکی گرنگ لەتەمەنی، سەرۆکی مەدرەسەی نیظامی بەغداد بوە، واتە، سەرۆکی گەورەترین ناوەندی زانست لەجیهانی ئاسراوی ئەودەمەدا، وە بەدەرس‌وتنەوەو دانانی پتر لە دوصەد کتێب خزمەتی زۆری بەئیسلام کردوە، وەئەگەر بمانەوێ سەبارەت بەگەورەیی ئەم پیاوە باس کەین، خۆی پێویستی بەنوسینی کتێبێکە، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان تەنها ئەوکتێبە چکۆلەیە کە هەم سەرگوزەشتی ژیانی خۆی تیانوسیوە، وەهەم چۆنیەتی گرتەبەری ڕێگەی تەصەووف، وەهەم باوەڕ دەربڕینێتی سەبارەت بەم ڕێبازەوە، جائەوەتا ئێوەو ئەوەش چەکیدەیێك لەکتێبی «المنقذ»

غەززالی لەسەرەتای کتێبەکەدا لەوەڵامی پرسیارکەرێك‌دا کە سەبارەت بە «زانیاری بەچەشنێکی گشتی» پرسیاری لێ کردوە ئەڵێ: من لەناوی گێجاوەی، دەستەکانو ڕێڕەوو ڕێبازو بوارەکانی زانیاری‌دا، ئازاری زۆرم کێشاوە بۆئەوەی بتوانم ڕێگایێکی ڕاست بدۆزمەوە، وەبتوانم خۆم لە نشێوی‌و لێتەو زەلکاوی شوێن‌کەوتنی «تقليد» دەربێنم، وەبگەمە ئەپۆلکەو بەرزایی «دیتن چاوپێکەوتن».

درێژە ئەدا بەباسو ئەڵێ: هێنان ئەمە بم نەگەیشتبوە بیست ساڵان هەتائێستە کە وام لەپەنجا ساڵدا، هەوڵم داوە بۆتێگەیشتن، وە داومە لەگێجاوی دەریای بێ بنی زانین، وەئەم تێکۆشانەشم تێکۆشانی ترسەزاوورانەو دڵەڕاوکێیانە نەبوە، بەڵکو تێکۆشانی نەترسانەبو، بەجۆرێك کەڕوم ئەنایە هەرتاریکاییێك پەلاماری هەموگێروگرفتێکیم ئەداو خۆم ئەخستە هەمو دەردی سەری یێکەوە، وە لەیەکە یەکەی باوەڕەکان «مەذهەب»ەکان ئەکۆڵیمەوە، وەئەمەویست نهێنی هەمویانم بۆدەرکەوێ، بۆئەوەی بەباشی تێ بگەم وە بزانم کامیان ڕێگایان ڕاستەو کامی چەوتە، تاوەکو خۆم لەڕێگا ڕاستەکەوە بڕۆم.

«**باطنی**»یێك نەبو سەرم دەر نەهاوردبێ لەباطنی، وە «**ظاهیری**»یێك نەبو تێ نەگەم لەبەرهەمی ئەم ظاهیری یەتەی ، فەلسەفییێك نەبو نەکۆڵمەوە لەفەلسەفەی، «**متکلم**»یك نەبو نەکۆشم بۆئەوەی سەردەربێرم لەباس کردنو لە«**موجادله**»ی، صوفییێك نەبو بەوردی هەوڵ نەدەم بۆ تێگەیشتن لەسەرچاوەی «**صفا**»ی، «**متعبد**»یك نەبو کونوقوژبنی ئاکامی پەرستشەکەی نەبشکێنم، زەندیقێکی پەك کەوتوم نەدی تێ نەکۆشم بۆئەوەی لەوەبگەم چی واتەوەندە ڕوی داوەتێ، وە ئەو زاورەی داوەبەو، کە لە خوانەترسێت و باکی نەبێت و بۆخۆی بێ خەم پاڵی لێ بداتەوە، **«باطنی و ظاهیری و هەموی ئەوانەی کەوتران هەریەکەی لەسەردەمانێکا مەدرەسەو ڕێگاو تولەڕێێك بون کەلەناوی ئیسلاما هاتونەدی وە دەوریان بوە» (نوسەر).**

غەززالی لەپاشان ئەڵێ، من ئەم کارانەم بۆیە هەرلەمناڵی یەوە ئەکرد چونکە تێ ئەکۆشام

بۆ بەدەست هێنانی ڕاستەقینەو کاکڵەی مەبەست، ئەمەش بەدەستی خۆم نەبو، خودا وای دروست کردبوم وە منیش کاری بشکنینو لێ کۆڵینەوەم ئەوەندە درێژە دابێ تاگەیشتمە ڕاستەقینەو، لەزەلکاوو لیتاوی «**تەقلید**» دەرچوم.

ئەڵێ: من لەدڵی خۆما ئەموت من ئەمەوێ لە کاکڵەی زانیاری بگەم وە بیدۆزمەوە، لێرەدابو بۆم دەرکەوت زانیاری باوەڕپێکراو، «**یەقینی**» بەشتێك ئەڵێن کەمرۆڤ بەچاوی خۆی بیبینێت و هەستی پێ بکات، جا کەزانین گەیشتە ئەم پلەیە ئیتر هیچ گومانی تیانامێنێت و دڵ ئوقرە ئەگرێت و ئۆخەی ئەکات، «**بەوەمەرجەی، ئەوکارە هەڵەی تیانەبێت**» هەڵە، وەکوئەوەی کەمێ بێت لەبەرچاوتەوە بەرد بکات بە زێڕ، یان گاڵۆکت بۆبکات بەمار، ئەمەیان بەچاو دیوتە ئەبێ باوەڕیشت پێی هەبێت،

بەڵام نابێ ئەگەر ئەوکەسە وتی، سێ زۆرترە لەحەوت، من بڵێم چونکە ئەم کەسە بەردی کردوە بەزێڕ وە گاڵۆکی کردۆتە بەمار، ئەبێ باوەڕیشی پێبکەم کە سێ زۆرترە لەحەوت...

نا.. لێرەدا نابێ هەڵەبکەین، بەڵکو هەر ئەبێ سەرمان سوڕبمێنێ لەوەی چۆن ئەوبەردەی کرد بەزێڕو گاڵۆکی کرد بەمار، وەهیچی تر.

بەڵام ئەوزانینەی کەخۆم بەدەستی بێنم، وەفێری ئەبم وەبیزانم، ئیتر لەوەدا گومانم نیە، چونکە زانینەکە هی خۆمەو خۆم بەدەستم هێناوە.

بۆم دەرکەوت هەرزانینێك نەگاتە ئەمپایەیە لەباوەڕ، ئەوە زانینی باوەڕپێنەکراوە، وە «یەقین نیە»، جامن بۆگەیشتن بەوزانینەو بەو باوەڕە، بەرلەهەموکەسێ، خۆم بشکنێ، سەیرم‌کرد من خۆم جگە لەزانیاریی هەست‌پێکراوو ئاشکرا، ئیتر لەوزانینە «یەقینی» یە بێبەرەم...

لەپاشان بەشێوەیێکی فەیلەسوفانە باسی چۆنیەتی تاقی‌کردنەوەی کلوامەیی «حەواس» «هەستپێکەرەکان» ئەکات کەچۆن یەکەیەکە لەگۆڕەپانی ئەم زانینەدا کۆڵو ناتەوانن وەهیچیان لەدەست نایێت، لەپاشان درێژە ئەدا بەباسو ئەڵێ، تاگەیشتمە ئەوەی وتم ئەوەتا پیغەمبەری گەورە درودی خوای لەسەر ئەفەرمێ، «ئەم خەڵکە ئیستە وەکونوستو وەهان، کاتێ کە مردن جالەوسا کە بێدار ئەبنەوە» بۆم ڕووندبویەوە وادیارە ناکرێ هەمو ئومێدێکی خۆمان بۆزانین وە تێگەیشتن بخەینە سەر توانایی «حواس».

من هەر بەمچەشنە لەخولیای گەیشتن بە «یەقین» دابوم وە لەتاوی دەروناءنەك بەزوان، هەمیشە لە وتوویرەو پرسیارو وەلامدابوم، تا لەکوتوپڕێکدا خوای گەورە چارەی بوناردم وە لەو نەخۆشیو ناسازیەیە ڕزگاربوم، وەبۆم دەرکەوت کە ئاوەزی مرۆڤ جێگای باوەڕەو، هەرئاوەزە کە ئەبێتە ڕێنیشاندەری مرۆڤ بۆخستەکاری توانایی دەرونی بۆگەیشتن بەهەوارگەی باوەری تەواو.

ئەمەش خۆبەدەستی خۆم نەبو بەڵکو بەنورێك بو کە خوا بەکەرەمی خۆی خستیە دورونەوە. غەززالی لەم بارەوە ئەڵێ، سەبارەت بە «شرح الصدر» لەپەیامبەری گەورەیان پرسی، فەرموی «نورێکە خوا ئەیخاتە دەرونەوە»، لەپاشان ئەڵێ مەبەستم لەم پێشەکیە ئەوەیە، مروف ئەبێ تێکۆشێت تائەگاتە هەوارگەی ئاوات.

ئەڵێ پاش ئەوەی خوا رزگاری کردم وەئەو ڕوناکیەی خستە دەرونمەوە، لێکم دایەوە، وە تێکۆشەرانی ڕێگەی زانیارم داتا بەچوار گرۆ.

یەکەم :  زانایانی «کەلام» ئەمانە خۆیان ئەڵێن خاوەنی بیروڕان وەخاوەن «تەزەروەن».

دووەهەم :   «باطنی»یەکان ئەوانیش باوەڕیان لەسەر ئەوەیە کە ڕێڕەوی «تەعلیم» واتەفێربون دروستە، وەسەرچاوەی زانیاری بەلای ئەوانەوە، «ئیمامی مەعصومە» کەئەبێ لەوەوە بەهرە وەرگرێت.

سێهەم :  «فەلسەفی»یەکان، کەلایانوایە ڕێڕەوی «مەنطیقو بورهان»یان گرتوتەبەر.

چوارەم: سۆفی یەکان ئەمانیش خۆیان بە نزیکانی خواو خاوەنی (موشاهەدە) واتە: (شت بینین بە دیدەی دەرون) وە (موکاشەفە) واتە: (پەردە لەسەر دیدەی دەرون لابراو) ئەزانن.

لەدڵی خۆما وتم ڕێگەی زانیاری لەمانە بەدەر نیە، کەواتە ئەبێ یەکەیەکە ئەم ڕێگایانە تاقی کەمەوە تابزانم چیم دەس ئەکەوێت.

لەزانیاری «کەلامەوە» دەستم پێ کرد، پاش بشکنینی ئەم زانیارییە وە لێکۆڵینەوەییکی ورد لەگۆشەو کەنارەکانی وەخوێندنەوەی هەموکتێبەکان، تەنانەت دانانی چەن کتێب لەم زانیارییەدا، بۆم دەرکەوت زانیارییکە ئەتوانێ بگات بەئامانجی خۆی، بەڵام ناتوانێ من بگەیێنێتە ئامانج و ئاوات، چونکە ئەمزانیارییە بۆپاراستنی ڕێڕەوی ئەهلی «سوننەت» دانراوە لەدەستی بیروڕای «بیدعەت» واتە پاراستنی دانەویلەی «دین» لەخەوش وخاڵی خەیاڵی پوچ، وە دانەی زیان باری تاڵ.

غەززالی پاش لێکۆڵینەوەوباسێکی زۆر، ئەڵێ من ناڵێم ئەم زانیارییە بەدەردی کەسی تری نەخواردوە بەڵکو ئەڵێم ئەو «یەقینەی» من ئەمەویست نەمتوانی لەڕێگەی زانیاری «کەلامەوە» بەدەستی بێرم.



بۆزانینی ئەم زانیاریەش قۆڵم لیٚهەڵماڵی وە هەرچەن کاتم گیرابو بە دەرس‌وتنەوەی سێصەد دەرس‌خوێنەوە، لەگەڵ ئەوەشا لە هەردەمێکا کاتێکم دەست کەوتایە، بیٚ‌ئەوەی پێویستم بەماموستا هەبێت کتێبی فەلسەفەم موتاڵە ئەکرد وە خوا بۆی‌کردم بتوانم بە هەموجۆریٚ لەم زانیاری‌یە بگەم، سەرنجم دا لەگەڵ ئەوەشا ڕێرەوی فەلسەفە زۆرن وە تولەڕێی زۆریشی لیٚ ئەبنەوە ، بەڵام ئەبنە سیٚ دەستەی سەرەکی، «دەهری»یەکان، «سورشتی یەکان»، «ئیلاهی»یەکان، دەهری‌یەکان لایان وایە جیهان هەروا کەئیستە هەیە هەربوەو هەرئەبیٚ وەگیان لەبەرانیش هەروابوون «گیان لەبەر لەتۆو، تۆو لەگیان‌لەبەر»، کە ئەمانە لە ڕوانگەی ئاینەوە، «زەندیق»ن، «ئەگریٚ بڵێین زەندیق ئەبینە، خوا نەناس، ملحد «نوسەر».

سورشتی‌یەکان، ئەوانەن کە سەبارەت بەهەمو جۆرە گیان‌لەبەرێك ئەکۆڵنەوە چ «ڕەوەك» چ «ڕووەك» «حەیوان‌ونەبات» ئەمانە ئەوەندە گیان‌لەبەر هەڵئەدرنو لەچۆنیەتی ژیانیان ئەکۆڵنەوە، بۆیان دەرئەکەوێت کە دامەزراندنی ئەم ژیانە ڕێکوپێکە بیٚ‌دامەزرێنەرو موهەندیس نابێت وەئەمە ئەبێتە هۆی باوەڕیان بەدروس‌کەرو هەڵسوڕێنەری جیهانو گیان‌داران، بەڵام ئەمانە بەهۆی زۆر چونە بنجوبناوانی مەبەستەوە، باوەڕیان دێتە سەرئەوەی زیندوبونەوەی مردوی دارزیوو پتورکاو لەگەڵی ئاوەزی ئەواندا ناگونجیٚ وەناڕواتە مێشکیانەوە لەش کەپتورکاو گیانی لیٚ‌دەرچو تازە جارێکی‌تر گیانی بچێتەوەبەر، جائەمانەش هەرچەن باوەڕیان بە دروس‌کەرێك «خالیق»هەیە، بەڵام باوەڕیان بە «دواڕۆژ» وەزیندوبونەوە نیە، لەبەرئەوە کە نەبەتەمای پاداشن وە نە لەسزای دواڕۆژ ئەترسن، جڵەوی نەفسی بۆشل‌ئەکەنو چۆنیان پیٚ‌خۆشە وا ئەژین، کەواتە ئەوانیش لای ئێمە هەر بە «زەندیق» دائەنرێن، چونکە موسوڵمان بەکەسیٚ‌ئەوتریٚ، باوەڕی بەخواو بەدواڕۆژ وە زیندوبونەوەی پاشی‌مەرگ هەبێت.

ئیلاهی یەکان، ئەمانەش لەفەیلەسوفەکانی دواترن وەکو «سوقرات» کە مامۆستای «ئیفلاتون» وە ئەویش مامۆستای ئەرەستۆیە، ئەرەستۆش ئەوکەسەیە کە «مەنطیق»

داناو زانیاریەکانی خستنە قالبێکی زانیارانەوە لەپاشان بەرپەرچی باوەڕەکانی ئیفلاتون‌و ئەرەستۆیشی دایەوە .

غەززالی لەپاشان لەبارەی ئەو زانیاری‌یانەوە کە فەلسەفە ئەیان‌گرێتەوە باس ئەکات‌و دەستەبەندی‌یان ئەکات، وە ئەڵێ **«شەش»** بەشن . **«ریاضیات، منطق، طبیعی، إلاهی، سیاسی، ئەخلاق.»** وە چەنو چۆنو کەڵکو زیانی، **«ماددی‌ومەعنەوی»** هەرکامیان بەجیا باس ئەکات، **«لەپاشان پیشانی ئەدات کە ئەم زانیاری‌یانەش، نەك تەنها ناتوانن مرۆڤ بگەیێننە هەوارگەی ئاوات‌و «یەقین»، بەڵکو بریَجار ئەبنە هۆی کزکردن‌و لاوازکردنی باوەڕیش»**، سەبارەت‌بە رێ‌ڕەوی **«تەعلیم»**، وە دڵەخورپێ‌کانی ئەم‌ڕێگایەش، ئەڵێ ، پاش‌ئەوەی لەلێکۆڵینەوەی فەلسەفەدا بۆم‌دەرکەوت کە ئاوەزی مرۆڤ توانای ئەوەی نیە لەهەرچی زانینە سەر دەرکات‌و هەمو شاراوەو نەناسراوێك بناسێت کەوتمە لێکۆڵینەوەو بشکنین، کتێبەکانی **«تەعلیمی»**یەکان، کە لایان‌وایە لەرێگەی **«ئیمامی‌مەعصومە»**وە ئەکرێ سەر لەهەمو نەناسراوو نەزانراوێك دەرکەیت، غەززالی، بەدوورودرێژی لەرێرەوو بیروباوەڕەکانی ئەمانیش ئەکۆڵێتەوە، وەبەڵگەی بەکارو بەکەڵك بۆ بەپەرج دانەوەیان دێرێت، وەرونی ئەکاتەوە کەبناغەی باوەڕی ئەمانە، لەهەمویان شل‌ترو لاوازترە، لەپاشان ئەڵێ لەزانینی ئەمانەش شتێکم دەس‌نەکەوت، کە دەردێ دەرمان کات، لەهەموی سەیرتر ئەوەیە ئەگەربلێیت، دەی ئەوئیمامە مەعصومەتان کامەتا تا زانینەکەی لی‌وەرگرین، دۆش‌دائەمێنن وە وەڵامیان‌نیە ؛ چونکە **«غائبە»** .

لەپاشان ئەڵێ، سەرم لەوکەسانە سوڕ ئەمێنێ باوەڕی بێتە سەرئەوەی کەئەلێ لای ماموستایێکی تایبەت فێری زانیاری بیت ؛ کەچی ماموستاکەش دیارنەبێتو غائب بێت ؛ باسەکە زۆربەردەوامە وەبەڵگەی زۆری پیشان‌داوە کەلەم کورتەباسەدا بۆمان ناگەرێتەوە .

۵

## ڕێگەی صۆفی‌یەکان :



غەززالی ئەڵێ کاتێ لە لێکۆڵینەوەی زانیاری‌یەکانی‌تر بومەوە، کەوتمە لێکۆڵینەوەی ڕێڕەوی «تەصەووف» وە بۆم دەرکەوت ئەمڕێگایە دوبەشە: هەم زانیاری‌یە وە هەم کردەوە، ئەوەی کەکردەوەیە بریتی‌یە لە بڕینی ڕێگەی «وەرزاندنی‌نەفس» وەپاك کردنەوەی لە هەمو ڕەوشێکی ناپەسەند، وەهەمو «صیفەتێکی» : «خدەیێکی» ناڕەواو ناپاك، تاوەکو دەرون «دڵ» بگاتە ڕادەیێك کەجگە لەخودا هیچی‌تری تیانەبێت: وە برازێنێتەوە بە «ذیکری الله»، یادی خوا.

جا کەزانیم ڕێگەی کردەوەکە ئەوەندە سەختە لەپێشا دەستم دایە ڕێگای زانینەکەی، کە لامزۆر ئاسان‌تربو، بەم جۆرە دەستم‌کردە خوێندنەوەی کتێبەکانیان وەکو «قوت القلوب» ی «أبي طالب المكي» وە کتێبەکانی «حارث المحاسبي» وەنوسراوە بەکەڵکەکانی «جنيد» وە «شبلي» وە «أبي يزيد البسطامي» خوایان لێ ڕازی بێت، بەم‌چەشنە لەهەرچی زانیاری خوێندنەوەی ئەم دەستەبێت تێ‌گەیشتم، وەئەوەی کەبکرێت لەڕێگەی خوێندنەوەوە بەدەست‌بێت بەدەستم‌هێنا، پاش‌ئەوە، بۆم دەرکەوت ئەوەی کەزانیاری ڕاستەقینەی ئەمانەبێت، ناکرێ لەڕێگەی خوێندن‌و دەرسەوە دەس‌کەوێت، بەڵکو بریتی‌یە لە «چەشتن» وە «حاڵ» وەگۆڕانی «صفات»، جا غەززالی بۆ نمونەی ئەم بەراوردەی خۆی ئەڵێت، بی‌گومان ماوەزۆرە لەنێوانی ئەوەیدا کەبزانین تەندروستی چۆنەو بەچی‌ئەڵێن: لەگەڵ‌ئەوەدا کەخۆمان تەندروست‌بین، یان، تێری بەچی ئەڵێن، لەگەڵ‌ئەوەدا کە خۆمان تێربین، یان ئەوەی، لەڕێگەی زانیاری پزشکی‌یەوە بزانین ڕادەی گەیشتنە پلەی سەرخۆشی لەڕوانگەی زانینەوە کامەتا، وەسەرخۆش بەکێ ئەڵێن، لەگەڵ ئەوەدا کە یەکێ‌خۆی سەرخۆش‌بێت چونکە «**سەرخۆش خۆی لەبارەی زانیاری سەرخۆش بونەوە، نەی‌خوێندوەو هیچ نازانێت‌و کەچی سەرخۆشیشە، بەڵام ئەوزانیارەی کەسەرخۆش‌نیە، ئەزانێ پلەی سەرخۆش‌بون کامەتاو، کەچی چۆنیەتەکەی نازانێ: «مەگەر خۆیشی سەرخۆش بێت**».

یان پزشکێکی نەخۆش کەزۆر باش ئەزانی تەندروستی بەچی ئەڵێن وەتەندروست کێ یە، کەچی خۆیشی نەخۆشە؛ هەربەمچەشنە ماوەزۆرە لەنێوانی ئەوەی دا کە ناوەڕۆکو مەرجو هۆکانی «زهد» بزانیت، لەگەڵ ئەوەیدا کە خۆت «زاهد» بیت، وەڕووت وەرگێڕانی لەسامانو پایەو پلەی دنیایی.

بەمچەشنە بۆمدەرکەوت صۆفی یەکان دارای «حالن» نەك خاوەنی گوفتار، یان بڵێین صوفیەتی حاڵوکردارە نەكوتەوگوفتار، منیش ئەوەی کەهی خوێندنەوەو زانین بو لێ بوبومەوە وەمابویەوە سەری بەدەستهێنانی ئەوەی کەلەرێگەی خوێندنو خوێندنەوەوە بەدەست نایێت بەڵکوبەسلوك «ڕێ گرتنەبەر» وەچەشتن، دەوق، ئەلێ دەس کەوێت، وەبۆم ڕوون بوبویەوە کە خۆشبەختی دوارۆژ، مەگەر بە «تەقوا»، وە جڵەوگرتنی «نەفس» لەئارەزودکانی، دەس کەوێت ئەمەش بەوە دەس ئەکەوێت، پەیوەندی دڵ ببریت لەئارەزوی دنیایی، واتە بێزاربون لە مەنزڵگەی لەخۆبایی بون، وەڕونانە مەنزڵگەی جاویدانی، وەڕونانە لای خوا، بەهەمو توانایێکەوە، وە ئەمەش بێگومان سەرناگرێ ئەگەر پشت هەڵنەکەی لەسامان بەیەکەوەنانو پایە بەدەستهێنان، وە ڕاکردن لەدەستی ئەوشتە دنیایی یانەی کەدڵیان پێوە ئەبەسترێ، وەمرۆڤ خەریك ئەکەن بەخۆیانەوە..

من کە ئەمانەم بۆڕون بویەوە ئاوڕێکم لەخۆمدایەوەو سرنجێکی خۆمدا، سەیرئەکەم کەخۆم ئاقورقوڕاگە چەقیوم لەم شتانەدا، سەیرمکرد گوایا چاکترین کارم دەرس وتنەوەیە، لێم کۆڵی یەوە ئەبینم من سەرگەرمی برێ زانیاری وەهام کە هیچ گرنگ نیەو کەڵکێکیشی بۆ دوارۆژم تیانیە، وەکاتێ لە «نیەتی» ئەم دەرس وتنەوەیەم، وردبومەوە دیم، مەبەستم بۆ ڕەزامەندی خوا نیە، بەڵکو بۆئەوەیە کە ناوبانگ و پایەو پلەو سامان بەدەس بێرم، جا لەشوێنێکا ئەمە باشترین کارم بێت، وای بەحاڵی کردەوەکانی ترم، !! لێرەدابو سەیرمکرد خۆم لە لێوارەی هەڵدێرگەو پەرتگەو سەرەو لێژەیێکادی کە ئەمکێشن بۆناوی ئاگر.

بەمچەشنەبو، بڕیارمدا، بەغدا بەجێ بێڵم وەسەری خۆم هەڵگرم، بەدورو درێژی باسی فەراهەمکردنی پێشەکی ئەم دەرچونە وەخۆدزینەوە لەخەلیفەو گەورەپیاوانی بەغدا ئەکات، پاشان ئەگاتە ئەوەی ئەڵێ، پاش بڕیاردان هەرچی ماڵوسامانم هەبو هەموم بەخشی یەوەو دەستم پێوەنا، وەبەشی ماڵومناڵیشم

لێ جیا کردەوە، ئەوەندەی کەپێی بژین، وەڕوم نایە «**شام**» نزیکەی دوساڵ لەوێ مامەوە وە بەوجۆرەی لەکتێبی صوفیەکانا خوێندبومەوە ڕۆیشتم لەگۆشەیێکا کە کەس نەمناسێ، دەستم کردە خواپەرستی، وەتێکۆشان، بۆ پاککردنەوەی «**نەفس**» «**دەرون**»: وە پالاوتنی دڵ بە «**ذیکری**» الله، وە زۆرجاریش ئەرۆیشتمە منارەکەی مزگەوتی شام، وە دەرگاکەیم لەسەری خۆم دائەخست؛ ماوەیێکیش چوم بو «**قدس**» وەلەمزگەوتی «**الأقصی**» دا سەرگەرمی هەمان ذیکرو فیکرو ڕیازەتو خۆپاڵاوتن بوم، پاشان ڕێ کەوتم بۆ مەککەومەدینە وەڕوم نایە حیجاز، پاش ماوەیێك سەرلەنوێ کەڵکەڵەی ماڵومناڵ کەوتەوە سەرم وەهاتمەوە بۆ دیدەنیان؛ بەلام ئیتر هەر بەکەنارەگیری مامەوە، وەسەرگەرمی کاری پاککردنەوەو پالاوتنی دڵودەرون بوم، غەززالی ئەڵێ ئەم حاڵی خۆپالاوتنەم دەساڵ درێژەی کێشا وەلەم ماوەدا ئەوەی کەئەمدی لەشتە نهێنیەکانی ئەم ڕێ ڕەوە، لە ژمارەو حیساب نایێت وەقەت باس ناکرێت، ئەڵێ:

ئەوەی بۆم ڕون بویەوە، ئەوەتە، بە یەقین صوفیەکان ڕێبواری ڕێگای ڕاستی خواویستی و خواپەرستین، بەتایبەت ڕەوشیان ڕەوشێکی ستایش کراوە، وەڕێگایان ڕاستترین ڕێگا وە ئەخلاقیان پاکترین ئەخلاقە، بەڵکو لە کانگەی دڵەوە ئەڵێم، ئەگەر ئاوەزو ژیری هەموی ژیران وە «**حیکمەتی**» هەموی «**حکما**» وە زانینی هەموی ئایین ناسەکانی ئیسلام، بکەیتەوە یەك و بیان خەیتەکار، ناتوانێ ڕێ ڕەوێ لە ڕێڕەوی ئەوان. چاکتر بدۆزێتەوەو پێشنیاری کات، چونکە هەمو هەڵسوڕنیشتێکی ئەوان لەنهێنی و ئاشکراییدا، لەنوری «**نبووەت**» وەرگیراوە، وەباشتر لەنوری «**نبووەت**» هیچ نورێك نیە، بۆ ڕوناککردنەوەی ڕێگەی خۆش بەختی.

بەکورتی بڵێین، مرۆڤ چی ئەتوانێ بڵێ دەربارەی، ڕێ ڕەوێك، کە یەکەم مەرجی ئەوڕێگایە پاککردنەوەبێت، پاککردنەوەی چی؟ پاککردنەوەی دەرون، لەچی؟ جگەلەخوا لەهەرچی شتە، کلیلی ئەم ڕێگایە چی یە؟ لێ بڕانی «**دڵە**» بۆ ذیکری خوا، بەویەڕی توانایی یەوە، دواپلەیشی چی یە «**فەنا**» بون لەیادی خوادا «**واتە خۆت لەیاد بچێتەوە وەتەنها یادی خوابکەیت**» بەلام ئەبێ ئەوەش بزانین لەکاتی بڕینی ئەوڕێگایەدا زۆر دەس کەوتی تر هەن، گومانی تیانیە کەدەستی ئەوڕێبوارە ئەکەون، کە لە پەردە لەسەر دیدەی دەرون هەڵگیران «**موکاشەفە**» و چاوپی کەوتن «**موشاهەدە**» وە دەس پێ ئەکات، تائەگاتە شتی زۆرگرنگ و سەرسوڕێنەر.

لەسەرەتای گرتنەبەری ڕێ‌ڕەوی تەصەووفدا، تەنانەت هەر لەکاتی بێداریش‌دا ڕێبوارانی ئەم ڕێگایە، چاویان ئەکەوێ بە فریشتەکان، وەبە ڕەوانی پاکی پەیامبەران، بەجۆرێك کە دەنگیان ئەبیسنو کەڵکیان لی‌وەرئەگرن، پاشان کەوردە وردە «حالی سالیك واتە ڕێبوار» پێش‌کەوت، ئەگاتە پایەوپلەو شوێنی وا، کە هیچ‌زوانێ توانایی باسی ئەوشتانەی نیە: چونکە وشەیێکی دەس‌ناکەوێت کەئەوشتانە بگەیێنێتو بۆ ئەو مەبەستانە دەست‌بدات، وە ئەگەر کەسێ بیەوێ ئەوشتانە باس‌کات. بێ‌گومان ئەکەوێتە هەڵەوە، وە بۆی ناکرێت، بۆچی؟ وەلاّم بۆنمونە....

یەکێ لەوشتانە، یان لەو پایانەی کە ڕێ‌بواری ڕێ‌ڕەوی تەصەووف پێی ئەگات پایەی «**قورب**»ە واتە نزیکی لەخوای‌گەورە، برێك لایان‌وایە ئەمە «**حولوله**» واتە دابەزینی ڕەوانی خۆشەویست لەناو لەشی ویستیاردا، برێك لایان‌وایە ئەم‌نزیکی‌یە «**ئیتتحاده**» واتە بەیەك‌بونی گیانی هەردولا، خۆشەویست و ویستیار «**خوداوبەنده**» برێك بەم حالی «**قورب**»ە ئەڵێن «**وصول**» واتە گەیشتنەلای خۆشەویست، یان «**وەحدەتی وجود**».

کەچی ئەمانەش هەموی هەڵەیەو هیچ کامی نیە، چونکی وشەیێك وە «**تەعبیرێ**» نیە بۆ پیشاندانی ئەو حاڵەتە، غەززالی ئەفەرمێ ئێمە باسی ئەم هەلاّنەمان لەکتێبی «**المقصد الأسنى**» دا کردوە، وەئەڵێ من‌خۆم سەبارەت بەم‌حالە ئەم‌شیعرە ئەڵێم، کەئەڵێ:

**(وكان ما كان مما لستُ اذكرُهُ**
**فظنّ خيراً ولاتسأل عن الخَبَرِ)**

بەلاّم من‌خۆم سەبارەت بەم‌باسە دەس‌ڕائەکێشم بۆپارچە شیعرێکی حەزرەتی شاهی نەقشبەندبهاءالدین محمد کە لەهەووەڵ شیعری سەرەتای **قەصیدە** کەدا ئەفەرمێ:

**لە عەینی خامۆشی و بێ‌دەنگی‌دا، خاوەن دنگو خاوەن گوفتارم، هەروەکو خەتی کتێب، خەتی نوسین.**

یان مورشید ، جگەئەوەی کە ڕێبەر وە ماموستا وەپزیشکی دەرونن ، بۆئەوەی مورید بگەیێننە پلەی یەقین ، خۆیان مەبەست و مەقصود نین ، بەڵکو مەبەست و مەقصود هەر خوای گەورەیە ، بەلاّم ڕێزلی گرتن و بەگوی کردن و خۆش ویستنی ماموستاو پزیشك کارێکی شیاوو پێ ویستە ، وە بەپێ ئەنجام دانی سپاردەو یاسای ڕێزگیری وەگوێڕادێری بۆ مورشید وە پیری تەریقەت ، هیچ کەس ناتوانێ بگاتە مرازو ئاوات ، وە ئەوەی کەبایزید فەرمویەتی هەرکەس پیرو ڕێبەرێکی نەبێ ، شەیتان ئەبێتە ڕێ بەری ، هەر بۆئەوەتە کە بۆرێگەی خواناسی ی ، چ ڕێگای شەرعی ظاهیر ، وەچ ڕێگەی نهێنی مەعنەوی ، ئەگەر ماموستاو ڕەهنمات نەبو ، وا شەیتان دەرفەتت تی ئەبات و ڕێگا وون ئەکەیت وەسەرت لێ ئەشێوێت ، ئەگینا بۆئەوەنیە کە ئەو مەلاوشێخە خۆیان بینە مرازو مەقصودو مەرامی صوفی یەکان ، بەڵکو ئەو ڕێبەرانە هۆو ئامێری خواناساندنن بەخوازیاران .

ئێمە لەپێرست کردنی پرسیارەکاندا ، پرسیاری چوارەمان ، بریتی یە لەوە ، کە **«تەسەووف بەچی دەست پی ئەکات وە پایانی کامەتا ؟»** لەوەلاّما ئەڵێین ، تەسووف بە تەوبەکردن ، واتە پاش گەز وەدەس هەڵگرتن لەخرابکاری ی ، دەس پی ئەکات ، ئەڵبەتە بەومەرجەی ئەو دەس هەڵگرتنە بۆهەمیشەبێت ، وە هەتاهەتایە ئەوکەسە نەگەرێتەوە سەر کەچرەوی ، پاش ئەم تەوبەکردنە ، ئەگەر تەوبەکە ، لەسەر دەستی مورشیدا نەبو وە هەر بەینی خۆتو خودای خۆت بو ، ئەوە بەردەوام ئەبیت لەسەر **«تقوا»** واتە خۆپاراستن لە هەمو خرابەیێك وەپەیرەوی کردن لە خواپەرستی بەهەمو مەعنایێك ، واتە ئەنجامی فەرزو سونەت وە زیادە نوێژەکان وەشەونوێژ وە **(ذیکر)** واتە ناوی خوابردن و یادی خوا کردن ، جا ، یان بەزوان یان بەدڵ ، یان بەهەردوکی ، وە تارادەیێك قورئان خوێندن ، دوری گرتن لەرەذائل واتەهەستی ناپەسندی دەرونی ، وە دوری گرتن لەئەنجام دانی ئەوهەستە ناپەسەندانە ، وە خەبات **«موجاهەدە»** بۆ زاڵ بون بەسەر هەستی ناپەسەندی دەرونا ، وە جی نشین کردنی هەستی پەسەند **«صیفاتی حەمیدە»** لەشوێنی ناپەسەندەکانا ، گرتنەبەری ڕەوشو کرداری باش لەگەڵ موسوڵمانانا ، بەڵکو لەگەڵی هەمو مرۆڤێکدا ، تەنانەت لەگەڵی هەمو گیان لەبەرێکدا ، تی کۆشان بۆ بەدەست هێنانی نانی حەلاّل وەماڵی حەلاّل ، وە بەخشینی ئەو نانو ماڵە حەلاّلە بەپێی فەرمانی شەرع ، واتە بەرلەوا تیرکردنی زکی خۆتو باوکودایکو ماڵوخێزانت لەپاشان بێ بەش نەکردنی ئەوانەی پێ ویستیان بەیارمەتی یە ، لەخزمو هاوسێو دورترو دورتر ، **«وەئەمانەش هەموی فەرمانی خودان بۆهەمو موسوڵمانێك»** .

بەردەوام بون لەسەری ئەم ڕەوشە پەسەندانە وەلەسەری ئەو خواپەرستی یە

بەربلاوە ، وەلەسەرچونی ئاڵەودەمەی خوا خۆی دەروی رەحمەتت لی ئەکاتەوەو دڵودەرونت بەڕووناکی ی خۆی رووناك ئەکاتەوەو ئایەتی «واتقوا اللّه ویعلمکم اللّه» ، یان «وَالذینَ جاهدوا فینا لنهدینّهُم سبلنا» ، یان «واسْجُدْ واقتَرِبْ» لەخۆت ودەرونتا هەست ئەکەیت یانئەوەتە خواخۆی رێگای نزیكبونەوەو مەنزڵبڕینت پیشانئەدات ، یان هیدایەتت ئەدات بۆلای ماموستاو رێبەرێك ، وەئەمە بۆزۆرکەس پێش هاتوە .

یانئەوەتە کە ئەم تەوبە کردنەت لە سەردەستی مورشیدو رێبەرێکا ئەنجام ئەدەیت ، کە ئیتر ئەو رێبەرە شارەزایە ، خۆی هەروەکو ماموستایێکی دڵسۆز کە وردە وردە بە «التدریج» دەرس بڵێتەوە بەشاگردی ، هەروا ئەبێتە رێ‌نماو ماموستات .

بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوماموستایە بەرلەهەموشتێ دەرسی ذیکر بەوشاگردە پیشان ئەدات ذیکری نهێنی ، یان ئاشکرا ، بۆ نمونە ذیکری نەقشبەندی‌یەکان ذیکری «خفی» واتەنهینی ، یان ، دەرونی‌یە ، وەذیکری قادری‌یەکان ، ذیکری «جلی»واتە ئاشکرایە ، کەهەردوکی هەر بەپشت‌بەستنە بەئایەتی قورئان ، وە هەردوجورەکەی لەقورئانا ئەمری پی‌کراوە ، هەروەکو کە ئەفەرمی «واذکُر رَبكَ فی نَفْسِكَ تَضَرّعاً وَخیفَةً...»سورەی ئەعراف «٢٠٤»یان کە لەمەقامی دوعاکردن ، واتەلەخواپارانەوەدا ئەفەرمی ، «اُدعوا رَبّکُم تَضَرّعاً وَخُفْیَةً»ئایەتی «٥٤»سورەی ئەعراف ، لەئایەتەکەدا ئەفەرمی (فی نَفْسِكَ)واتەلەدەرونا ناوی خوابەرە ، لیرەدا ئەفەرمی «وَخُفْیَةً»واتە بەپەنامەکی لەدەرونی‌خۆتا ناوی‌خوابەرە ، «الّذینَ آمَنو وَتَطْمَئِنَ قلوبُهُمْ بِذِکرِاللّه اَلابِذِکرِاللّه تَطْمَئِنُ القُلُوب» رعد «٢٧» «الذین یذکرون اللّه قیاما وقعودا وعلی جنوبهم ...» ال‌عمران (١٩١)کەواتە پەروەردەکردنی خوازیاری رێ‌رەوی تەسەووف بەیەکێ لەم دوو رەوشە دەس ئەکاتە ذیکر بە «نهینی ، یان بەئاشکرا» لەبناغەشا ، ئەم تەریقەتانە هەرلەمەوە سەرچاوە ئەگرن ، ئەمەش وەکو دوورەوشی تەدریس وایە کە هەریەکەی لەئیختراعی کەڵە پسپۆڕو ماموستایێکەوە هاتبیت ، کەلەجیهانی خویندنی مەکتەبو دانشگەی ئەمڕۆشدا زور بەرچاو ئەکەوێت ، یان خۆ لەرەوشی موعالەجە «دەرمان کردن» ، یان «عەمەلیات» دا هەیە ، مەبەست وەهەدەف وە ئامانج وەنیشانە ، هەر یەکێکە ، بەڵام لەرێگەی جوراو جورەوە بەپێی شارەزایی پسپۆڕو ماموستاکان ئەگۆڕرێت ، هەدەف هەر خواناسین وەخوا لەخۆرازی‌کردن وە

گەیشتن بەپلەی بەقای پاش فەنا وەمەلبەندی عەینول یەقینە ، بەڵام لەرێ رەوی جۆراو جۆرەوە ، وەکو کوردی خۆمان ئەڵێن هەموی ئەورێگایانە بو (بانە) ئەرۆن ، مەبەست گەیشتنە بە (بانە) ، جاهەریەکەی لە رێگاێکەوە کەلای وایە نزیکترە ، جا تەریقەتی نەقشبەندی جگە لەذیکرءرابیطەشی هەیە ، (رابیطە) لە وشەی «ربط»ی عەرەبیەوە هاتوە ، واتە پەیوەنددان وەپێکەوە بەستن ، لە ناوەرۆکدا هەوڵ و تی کۆشان بۆ پەیوەند دانی دلی موریدی تازەکارە بە خوای گەورەوە ئەمەش بەجورێك ئەبێت ، مورید خۆی هەوڵ بدات کەلەدەرونەوە خۆ ببەستیت بە مورشیدەوە ، بوچی ؟...

چونکو هەروەکو وتمان مورشیدی «**کامیل وە موکەمیل**» «**واتە هەم خوی پی گەیشتبێ وەهەم بتوانی خەلکیش پی بگەیینی**» ، دیارە ئاوا کەسێك پلەی بەقای پاش فەنای دەس کەوتوە ، کەسێکیش کەوابو دیارە لەدەرونەوە پەیوندە بە رۆحانیەتی رێبەری گەورەوە واتە حەزرەتی موحەممەد درودی خوای لەسەر ، بێ گومان رۆحی ئەویش بێ واسیطە پەیوەندە بەنورو لوطفی خوداوە ، هەروەکو وایری کارەباییێك هەریەکەی بەستراوە بەمەرکەزێکی بەهیزترەوە تا ئەگاتە سەرچاوەکەی ، وە ئەگەر بێتو گلۆپێ یان دینەمویێکی بجولێ ، بەبێ (**موحەووبلە**) بدرێت لەسەرچاوەی کارەبا کە ئەسوتێت وە خۆی بۆناگیرێت ، هەروا ئەو موریدە تازەکارەش هەم خۆی توانایی ئەوەی نیە خۆی یەکسەر لەدەرونەوە پەیوەند بدات بە رۆحانیەتی پەیامبەرەوە یان بەنوری خوداوە ، وەهەم شارەزایش نیە ، چۆن ئەوکارە بکات ، کەواتە لەرێگەی رەبطی دەرونی خۆیەوە بەدەرونی مورشیدیەوە پەیوەند لەگەلی سەرچاوەی نورا ، واتە خوای گەورەدا ئەکات ، وەئەو مورشیدە خۆی سەرچاوەی نورنیە بەڵکو وەکو موحەوویلە ، سەبەبو وەسیلەیە بۆنەقلی ئەونورە لەمەرکەزی بەرزەوە بولای خوازیاری تازەکار ، بە شێوەیێکی تریش ئەتوانین بڵێین هەروەکو لەرەوشی دەرس وتنەوەی کۆن دا ، مەلاگەورەکان دەرسیان ئەوتەوە بەموستەعید ، ئەویش بە لەخوی خوارتر ، هەتا ئەهاتە سەری ئەوکەسەی تازە دەست ئەکاتە ئەلفوبێ ، ئەویش هەربەوچەشنەیە ، جا چونکە شتەکە شتێکی مەعنەوی و روحی یە ، ناتوانم بەم جورە نەبێ باسی بکەم ، ئەگینا ئەمانەشتێکی ماددی بون باسمان کردن ، بۆ نزیك کردنەوەی بیری خوێنەر لەباسەکە.

کەواتە لەسەر رەوشی برێ لە تەریقەتەکان وەکو نەقشبەندی یەکان دوو جۆرە تی کۆشان هەیە بۆ تەزکیەی نەفس ، واتە پاك کردنەوەی دەرون ، یەکێکی ذیکری

خودایە، سا یان بەدەنگی بەرز یان بەنهێنی لەدەرونا، بەکێکیش یارمەتی خواستنە لەرۆحی مورشید کەئەبێتە پیوەند دانی رۆحی خۆت، یان دڵودەرونی خۆت بەدەرونی مورشیدەوە، لەورێگەوە پەیوەندداني دەرونە بەسەرچاوەی روناکیەوە. جا ئەو مورشیدەش، سا یان لەوکاتی رابیطەدایان وەکو لەپێشا وتمان بەهوی **(تەوەجەجوە)** **واتە روی دەرون تیکردنی مورشید بۆدەرونی مورید، هەزاران کاری سەیر لەگەڵ دڵا ئەکرێت بی‌ئەوەی گوێو زوان دەخالەتیان هەبێت. وە دەرون ئەبەسرێت بەجیهانی مەعنەویپاتەوە،وە هەزاران رازو نهێنی لە جیهانی مەعنەوی بۆمرۆڤ دەرئەکەوێت. حەزرەتی شێخ‌عوسمان سیراج الدینی نەقشبەندی، واتە شیخ‌عوسمانی (تەوێڵە)**، لەم بارەوە دوبەیتیێکی هەیە زور دل‌نەوازو بەجیێ، کەئەفەرمێ.

هەرجا کە مەنو دوست بەهەم باز رەسیدیم
ئەزنیش بەدئەندیش لەبێ خوێش گەزیدیم
بێ واسیطەیی گۆش‌و زەبان ئەز طەرەفێ دل
بسیار سوخەن بود کە گوفتیم‌و شەنیدیم

واتە هەرکاتێ یان لەهەرشوێنیکا من‌و خۆشەویستم گەیشتین بەیەك، لەترسی ئازاری باوەر ناپاکان لێوی خومان گەست، وە بەبێ ئەوەی کە گوێو زوان بەکار بیرین، هەر لەرێگەی دڵەوە، زۆر قسەوباسمانبو کە گوتمان وبیستمان. سەید عەبدول‌رەحیمی مەولەوی، کە زۆرتری شیعرەکانی لە سەرچاوەی تەسەووفەوە هەڵ ئەقولێن، هەرچی کەئەڵێ ساقی مەیم‌بدەرێ بیگومان هەر ئەم داخوازە مەعنەوییەتە، کە لەمورشیدی خۆی شێخ‌عوسمانی تەوێڵەی کردوە، وە ویستویە تی مورشیدەکەی لەدەرونەوە تەوەجەجوهی لیێبکات. مەولەوی لەیەکی لەشیعرەکانیا پاش باسی پێشەکییەك بۆ داخوازەکەی، ئەڵیت.

رۆ جە شەو فێشتەر زارو زەلیلم
ساقی! سا جامێ ئەمجار دەخیلم

پاشان ئەڵێت: —

ساقی سا دەخیل وە فەریادم ڕەس
وە ڕووی نازەوە جام گێرە وە دەس
دەور دەرە وە ناز چون هەردەجاران
پیم دە یەکمەنی سەباو ئێواران!

پاشان ئەڵێت: —

ساقی! ئامانەن نەشوو جە ویرت
وە فەریادم ڕەس تۆ بەشقی پیرت

تا دوایی شیعرەکە، .. مەولەوی لیرەدا لەپیری خۆی داوا ئەکات وە سوێندیشی ئەدات بەعیشقی پیری خۆی، پیری مورشیدەکەی. کە ئەوشەوە ئەوی لەبیر نەچێت وە بێبەهرەی نەکات لەبادەی مەحەبەت. بەیارمەتی خودا ئەگەر گەیشتینە سەرباسی کارکردی تەسەووف بۆسەر ئەدەب، بەتایبەت بۆسەری ئەدەبی کوردی، ئەم مەبەستانە، شی ی ئەکەینەوە، دیوانەکەی مەولەوی پڕیەتی لەتەسەووف هەروەکو دیوانی مەلای جەزیری، یان مەحوی، وەزۆرێك لەشاعیرانی کورددوبارە هەرلەبارەی ئەوەججوهو کارکردی مورشیدەوە بۆ پیی گەیاندنی مورید، شیعرێکی تری مەولەوی هەیە کەبۆ شێخ عوسمانی نوسیوە، لەشوێنێکیا باسی لاوازی بو بی هیزیی کشت و مەزرای دەرونی خۆی ئەکات بۆ مورشید، داوای یارمەتی لێ ئەکات. ئەڵێت،

حەیفەن تۆ میراو سەر جۆی بادە بی
وە هەرکەس وە قەد کەفاف دادە بی
من کشتم ڕوو زەرد هامفەردام بۆ
دانەم ڕوو سیای هامدەردام بۆ
سا هۆرکەر با بێ جۆجۆ جۆگەی مەی
وەسەر کشتمدا پەی پەی پەیاپەی
بەڵام پا شەرتە گەشێوە کەرۆ
چی ئاخرەوە داناوێ وەرۆ

مەولەوی ئەڵێ بە مورشیدەکەی، حەیفە تۆ میراوی سەرجۆگەی بادەی مەحەبەتی خودابیت، وە مەزراکەی من، لەناوی مەزرای هاوڕێ کانما، ڕوزەردو لاواز بێت، دە تۆخوا جۆگەی مەی هەڵکە بۆمەزراکەم بەڵکو لەم دوادوایی تەمەنەوە (داناوێ) بخوات، وەگەشەیێ بکات، داناو ئاخرین ئاوێکە کە ئەدرێت بەگەنم، بۆئەوەی کە دانەکەی پڕبێت و قەڵەو. لێرەدا هەرچەن تۆزێ لەمەبەست دور کەوتمەوە لەهەمان کاتیشا خۆی کرۆکی مەبەستەکەیە. کەواتە موریدی تازەکار، پاش تەوبە کردن، چ لەسەر دەستی مورشیدا بێت چ لەبەینی خۆیو خودای خۆیدابێت، دەس ئەکاتە ڕێگەبرین، وە یەکەم پلەی پاش تەوبە، دەس کردنە بەذیکر، یان بڕێ جار هەم ذیکریش وە هەم رابیطە: ئێمە لەئاییندەدا چۆنێتی ئەنجامدانی ئەم ذیکرو رابیطەیەش باس ئەکەین، واتە چۆن ذیکر بکات یان چۆن رابیطە بکات،

لەمەودوا، ڕێبواری ڕێگای تەسەووف، ئەبێ دەس بکاتە پاککردنەوەی دەرون وە ئەمەش بە خەبات کردن وە بەربەرەکانێ کردنە لەگەڵ خواستە ناپەسەندەکانی دەرونا، گرنگترین شتێك کە هەستی ناپاکی دەرون واتە هەستی **«النفس الامارة بالسوء»** چارە ئەکات، ڕیازەت کێشانە، کە پێی ئەوترێ، **«چلەکێشان»** یان **«خەلوەت»** یان ڕیازەت، کە لەناوەڕۆکا هەموی هەر یەکێکە، وەلەزۆری چەتری خەبات، واتەموجاهەدەدایە **«والَّذِينَ جاهَدوا فينا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنا»** یان هەروەکو وتمان، پەیامبەری گەورە درودی لەسەر کاتێ کە لە غەزوەیێك گەڕاونەتەوە، فەرمویانە لە جیهادی بچوك گەڕاینەوە، جا کاتی جیهادی گەورەیە، عەرزیان کرد جیهادی گەورە کامەتا؟ فەرموی جیهادە لەگەڵ نەفسا، جا ئەم موجاهەدە، تەسەووف، ڕێ‌ڕەوو ڕەوشی تایبەتی بۆداناوە، ئەویش کەنارەگیری یە لەخەڵك، وە تەرخان کردنی شوێنێکی بێ‌دەنگو چۆڵو پاکو پوختەیە، بۆئەوەی ئەو ڕیازەت کێشە لەوێدا شەووڕۆژ بداتەوە دەمی یەك و سەرگەرمی خواپەرستی بێت، جا ماوەی هەرجارە دانراوە بە چل ڕۆژ، هی واهەیە بە شوێنی یەکا چەن جارێك چلە ئەکێشێ، ئەویش بەپێی قەناعەت و متمانەی دڵی خۆی، یان بە بۆدیاری کردنی مورشیدەکەی ئەبێت، کە ئایا ئەم ڕاهێنان و پەروەردەکردنە تاکەی پێویست ئەبێ، هەروەکو پارێز وە دەرمان کردنی نەخۆشێك کە دوکتۆرەکەی ئەزانێت تاکەی پێویستە، یان بگرە خۆیشی هەستی لەش ساغی بکات و دەس لەدەرمان و پارێز هەڵگرێت، ئیتر ئەم

زەحمەت‌کێشانە وەنەبێ هەتاهەتایە پێویست بێت، بەڵکو بگرە ساڵێ یان دەساڵیش یان زیاتریش پێویست بکات جا ئەم چلەکێشانە بریتی‌یە لەبەرۆژوبون. وە بەربانگ کردنەوە بەشتێکی زۆرکەم وەکو پیاڵەیێ ئاوو چوار پێنج دانە خورما، یان بادام یان مێوژ وە بەردەوام بون لەسەری ذیکروفیکرو خواپەرستی ونوێژکردن سا یان بەجۆرێکەکە ئەوکەسە بیەوێ، وە یان زۆرتری لەسەردەستی مورشیدایە کە ئەوذیکرانەی بەپێی پێویست بۆدیاری بکات، هەروەکو دەرمانی دوکتورەکە.

ئەگەر بەبێ مورشیدیش بو «هەرچەن زۆر مەترسی‌دارە بەبێ‌مورشید چلەکێشان» وا هەرجۆرێ خوا بۆی‌کردو لە نوسراوەو کتێبا خوێندبویەوە بەوجۆرە چل‌ڕۆژ ئەباتە سەر، وە بێ‌گومان بێ‌بەهرە نابێت وە لەمەسائلی مەعنەوی شتی یەقینی بۆ دەرئەکەوێت، تاوردە وردە ڕێگای خۆی بەرەو ئاوانی بەرز، ئاوانی ڕوناك بونەوەی دەرون بەنوری حەق، ئەبڕێت. دیارە زۆر ذیکرکردن، ئەویش هەر بە دەستوری‌قورئانە وە هەروەکو لەمەوپێش باسمان‌کرد ذیکر لەقورئان دا هەم بۆ ناوی قورئان هاتوە «اِنّا نَحْنُ نَزَّلْنا الذِّكْرَ واِنّا لَهُ لَحافِظُون» حجرئایەی «٩» هەم بۆنوێژ هاتوە «یاایُّها الّذِینَ آمَنوا اِذا نودِیَ لِلصلاةِ من یومِ الجُمُعَةِ فَاسْعَوا اِلى ذِكْرِ اللهِ وذَروا البَیْعَ ذلكُمْ خیرٌ لَكُمْ اِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُون» سورەی جمعە ئایەی «٩» وەذیکر بۆ یادکردن وناوبردن‌و خوێندنیش هاتوە، وە «تأكید» کراوە لەسەر زۆری‌ی ذیکرو بەردەوام بون لەسەری، «فَوَیْلٌ لِلقاسِیَةِ قُلوبُهم مِنْ ذِكْرِ الله» «یاایُّها الّذِین آمَنوا لاتُلْهِكُمْ اَمْوالُكُمْ ولا اَوْلادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ الله» «واذْكُرْ رَبَّكَ كثیراً» «فاذكُرونی اَذْكُرْكُمْ» «یاایُّها الّذِین آمَنوا اذْكُروا اللهَ كثیراً» «الّذین یَذْكُرونَ اللهَ قِیاماً وقُعوداً وعلى جُنوبِهِمْ»، وە دەیان ئایەتی تر لەقورئان‌دا، کە لەموسوڵمانی ڕاستەقینە داوا ئەکات، بەنهێنی‌وئاشکرا بەشەووبەڕۆژ بەهەستان‌و پاڵکەوتن‌و دانیشتن، بەردەوام بێت لەسەری ناوی خوابردن‌و یادی‌خوا کردن و سەبارەت بەخوای گەورە گفتوگۆکردن، وە نمونەیێکی ئەو چلەکێشانەش لەئایەتی «٥١» سورەی «بەقەرە» دا دێتەدەست، کە خوای‌گەورە ئەفەرمێ «وَاِذْ واعَدْنا مُوسى اَرْبَعِینَ لَیْلَةً» کە موسی ڕۆیشتوە بۆکێوی «طور» بۆ ڕازونیاز لەگەڵ خودای خۆیا وە بۆوەرگرتنی «تەورات»، هەروەها مەبەستی چلەکێشان یەکێکە لەکارە ناسراوو دیاری‌یەکانی ئەهلی تەصەووف، وە بێ‌گومان چل‌ڕۆژ بەڕۆژوبون وە دورکەوتنەوە لە دەنگەدەنگو قەرەباڵغ، وەکەنارەگیری و زۆرزۆر کەم خواردن و شەووڕۆژ ناوی‌خوابردن و یادی خوا کردن، کارێکی زۆر ئەکاتە سەری دەرونی مرۆڤ، هەروەکو وتمان بگرە

ئەم کارەش چەن جارێك ئەنجام بدرێت یان هەر یەك جار بێت، بەڵام ئێکرا ئەوانەی کە ئەم ڕێگایە ئەدەنەبەر، لەپاشان لەهەموی ژیان دا ئیتر دوری ئەگرن لە زیادەڕەوی، واتە «ئیفراط وە تفریط» لە هەموشتێکا بۆنمونە هەروەکو لەوەوبەریش وتمان ئیتر هەڵپە ناکات بەشوێنی سامانو جاهو مەقامی دنیایی دا، لە خواردنا لە پۆشینا تەتانەت لەگوفتارا، لە دەنگ بەرزکردنەوەی قسەکردنا، ڕێگەی مامناوەندی ئەگرێتەبەر خوا لەقورئانا بەموسوڵمانان ئەفەرمێ «وَكَذٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً.....» ئایەی «١٤٣» سورەی نیساء.

مەردی گۆڕەپانی تەسەووف مەردانە لەسەر ڕێگەی خۆی وە لەسەر ذیکرو فیکری خۆی وە خواپەرستێکی ڕێکوپێك بەردەوام ئەبێت، وەپلەبەپلە ڕێگەی سەختی تەسەووف ئەبڕێت، ئەگاتە هەر مەقامێك چاوی لەهەوارگەو مەنزڵەکەی پێشی خۆیەتی، وە سەیری ئەو هەوارگەیانە ناکات کە جێی هێشتون، بەڵکو هەر بەرزەفڕیی ئەکات واتە «طموحە»، تائەگاتە پلەی بەقای پاش «فناء» لەوەولاش وەنەبێ هەموی وەك یەك بێت لەویشا هەر «ئیمتیاز» وەخەڵات وە دەسکەوتی مەعنەوی هەیە هەر مەگەر خودا خۆیو ئەو کەڵەمەردە خۆش بەختانە چەنلو چۆنی بزانن، ئیمامی غەززالی سەبارەت بەیەکێ لەم دەسکەوتو شادبونانەدا کە بەسەری خۆیا هاتوە ئەفەرمێ «وكانَ ما كانَ مِما لَسْتُ أذكُرُهُ فَظُنَّ خيراً وَلاتَسألُ عَنِ الخَبرِ» واتە لەوەی ڕوی‌دا ڕوی‌دا لەوجۆرەشتانەی کە لەگوتن نایێن تۆ هەر ظەنی خەیرت بێت ئیتر مەپرسە کە چۆن‌بو، لێرەدا بۆ ڕوون کردنەوە ئەکرێ بڵێین پلەو مەقامەکانی تەسەووفیش هەروەکو دەرس خوێندنی مەکتەبو دانشگەکان وایە، کە لە پۆلێکەوە بۆپۆلێکی باڵاتر ئەڕوات، ئەو ساڵە ئەکۆشێت بۆ وەرگرتنی شەهادەی ئەوپۆلە بەڵام پاش بەدەس هێنانی شەهادەکە قەت خۆی بەشاگردی ئەو کلاسە دانانێت وە سەرلەنوێ بۆ وەرگرتنی دانش‌نامەی پۆلی باڵاتر تێ‌ئەکۆشێت جا کە قوناغێك لە خوێندنی تەواوکرد بڵێین سەرەتایی بری تێ‌ئەئەکۆشێت بۆ ناوەندی لەپاشان بۆئانوی لەپاشان دانشگەو باڵاترو باڵاتر، کە دوکتورای گرت ئیتر دوا قوناغە بەڵام هەیشە بەوەش دانامرکێ سەرگەرمی لێکۆڵینەوەو موتاڵاکردن ونوسینەوە دەرس‌وتنەوەیە، وەهەر بۆ بەرزترو بەرزتر ئەڕوانێ، هەردولا هەر زانیارین ئەم جیهان ناسی‌یە ئەو خاوەنی جیهان ناسی‌یە، ئەم ناسینی جیهانی سورشتو بینراوو ئاشکراو پایان‌دارە، ئەوناسینی جیهانی دەرونو نهێنیو بێ‌پایانە، ئەم خوردو خۆراکی لەشەو ئەو خوردوخۆراکی ڕۆحە.

جارێواری شارێگەی تەسەووف پاش گەیشتن بەمراز، وە شادبونەوە بەجیهانی یەقینیتەواو وەدامرکانی دلْ بەنوری خوایگەورە، ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ ژیانی ساکاری خۆی،بەڵام ئەوساکە زۆری لەگەلْ جاران‌فەرقە،ئیستە خاوەن باوەڕێکە باوەری یەقینی،دڵی دامرکاوو دامەزراوە ئەوکاتە ئایەتی **«رِجالٌ لاتُلْهِیهِمْ تِجارةٌ ولابَیْعٌ عَنْ ذِکْرِ اللهِ»** بەسەریانا **«تەطبیق»** ئەبێت ئەگەر بەرەواڵەت قسە لەگەلْ خەڵك ئەکات، دڵی هەر لای خودایە بەڵکو دڵی هەر سەرگەرمی ذیکری **«لا اله الا الله»** یە ئەبنە **«اُولئكَ الَّذین اِمْتَحَنَ اللهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَقْوی»** جا هەروەکو وتمان پلەو مەقام هەن لەرێگەی قارەمانانی رێڕەوی تەسەووف‌دا ئەو پلەو مەقامانە هەریەکەی ناوونیشانی خۆیهەیە کە لەکاتی گەیشتن بەباسی مەقامەکان‌دا باسیان ئەکەین ، گەورەپیاوانی ئەمڕێگایە سەبارەت بەمەقامەکان باسیان کردوە برێکیان هەرباسی قۆناغە گەورە کانیان کردوە وەکو سەبارەت بەخوێندنی ئەمڕۆ بلێین سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئانوی وجامیعی بەڵام برێکیان پۆلەکانیشیان باس‌کردوە برێکیان تەنانەت لەرشتەو لقەکانیش دواون، لەبارەی **«رێگاکانی گەیشتن بەخواوە»** لە تازەترین کتێبی بەکەڵکو زانیارانەی تەسەووف‌دا کتێبی **«حقائق عن التصوف»** نوسینی عبد القادر عیسی کە بێگومان ئەویش لە سەرچاوەکان وەریگرتوە ئەڵێت **«طریق الوصول الی الله. التوبة، المحاسبة، الخوف، الرجاء، الصدق، الاخلاص، الصبر، الورع، الزهد، الرضا، التوکل، الشکر»** هەروەکووتم ئەمە ئیشارەو پەنجەکێشانێکە بەیارمەتیخودا لەپاشان بەوردیی باسیان ئەکەین بەڵام چونکە وتمان لەمباسەدا چۆنیەتی دەس‌پیکردنی رێڕەوی تەسەووف وەدواهاتنەکەی باس ئەکەین پەنجەیێکمان کێشا بۆ مەقامەکانیش .

لێرەدا ئەبێ روونی کەینەوە کە بەلای زۆربەی شارەزایانی تەسەووفەوە، مەقامی **«اِحْسان»** بالاترین پلەیێکە کەرێڕەوانی تەسەووف ئەیگەنێ، کەئەوەش بۆ ئەوکەسانە دەس ئەدات کە پلەی بەقای پاش فەنایان هێناوەتە دەست، ئەوەش بەوجۆرەیە کەپێغەمبە درودیخوایلەسەر ئەفەرمێ، **«الاِحْسانُ اَنْ تَعْبُدَ اللهَ کاَنَّكَ تَراهُ فَاِنْ لَمْ تَکُنْ تَراهُ فِاِنَّهُ یَراكَ»** برێکیان مەقامی **«تەوحید»** بەبالاترین مەقام دائەنێن، لاموایە ئەویش هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتوە، کە کەڵەمەردانی ئەمشارێگایەلەو کاتو ساتەدا باسیانکردوە، کە خۆیان لەوپایەدابوون، وەبرێکیتر بۆ مەقامی تەسەووف **«دەوائر یان داناوە وە ئەڵێن کە بیست دائرەیە لەدائرەی «عالەمیئیمکان»»**ەوە

دەس پێ ئەکات وە دواپلەکەی، دائرەی بیستەم «**اللاتعینیە**» یە، وە هەروەها (**ویلایەتی صوغری**) وە «**ویلایەتی کوبری**» ئەمانەش هەرناون بۆمەقام و پلەیێك کەرێبواری رێرەوی خواناسی پیائەروات و لەدەست کەوتی ئەوانە، کەواتە ئەم وردەکاری یە بۆ کاتی خۆی کاتی باسی مەقامات.

شتێکی زۆر گرنگی تریش سەبارەت بە گەیشتن بەخوا ئەوەتە؛ کە خوێنەر وای تێ ئەگات ئەمە گەیشتنی «**ذات**»ە بە «**ذات**»؛ واتە گەیشتنی ذاتی ئینسان بە ذاتی «**خالیق**»، چونکە ئەم باوەڕە ناشایستەیەو، بەڵکو کوفرە؛ ڕێگەی گەیشتن، ئەم ڕێگایانەیە کەوتمان وەکو تەوبە: موحاسەبە: خەوف، رەجاء... ئەمانە هەموی زانیارییێکی دەرونین، وە، بەذەوق، واتەچەشتنی دەروون هەست ئەکرین، نەك بە «**حەواسی خەمسە**»؛ چونکە هەروەکو وتمان ئەم گەیشتنە گەیشتنی چەشتنی دەرون وە هەست کردنی دەرونی یە.

ابن عطاء اللەی سکەندەری: کە یەکێکە لە گەورەپیاوانی رێرەوی تەسەووف لەایقاظ الهمم دا ئەڵێت «**وصولك الی الله، وصولك الی العلم به، والا فجل ربنا ان یتصل به شيء او یتصل هو بشيء**»، هەروەها ئیمامی غەززالی لە کتێبی، روض الطالبین دا ئەڵێت، «**معنی الوصول هو الرؤیة والمشاهدة بسر القلب في الدنیا، وبعین الرأس في الآخرة، فلیس معنی الوصول اتصال الذات بالذات، تعالی الله عن ذلك علوا کبیرا**». کەواتە تەصەووف بە تەوبەکردن دەس پێ ئەکات وە بەو مەقامانەدا تێ ئەپەڕێت تائەگاتە مەقامی «**بقاء**» لەوەلاش دەس کەوتی وەکو مەقامی (**احسان**) یان «**توحید**» یان «**قرب**» یان «**عبودیەت**»ی دەس ئەکەوێت، کە ئەم پایانە هی «**وەلی**» یە، واتە ئەوەی گەیشتە ئەومەقامەبەرزە؛ وەلی یێکە؛ کە مەقامەکەی مەقامی «**توحید**» ئەمانە ئەکرێ مورشیدبن ئەشکرێ ئیرشادنەکەن، یان پێیان نەسپێررابێ کەئیرشاد بکەن، بەڵام مورشیدی راستەقینەش، کەسێکە کە مەقامی بەقای پاش فەنای دەس کەوتبێ، هەم خۆی کامیل بێت هەم موکەمیل، واتە بتوانێ خەلکیش پێ بگەیێنێ، چونکە هەیە خۆی کامیلە، بەڵام ناتوانێ خەڵك پێ بگەیێنێ وەپایەی ماموستایەتی پێ نەدراوە واتە موکەمیل نیە. ئەمەبو سەرەتاو پایانی ڕێڕەوی تەسەووف.

«**ئێستە ئەم پرسیارەمان دێتە پێشەوە ئایا شتە بەکەڵکەکانی ئەم ڕێڕەوە لەڕوانگەی ئاین و کۆمەڵایەتیو ژیانی مرۆڤەوە چی یە؟**»

**«وه ئايا تەسەووف هيچ زيانێكی هەيە بۆ ئاينی ئیسلام، يان بۆ كۆمەلأيەتی وە ژيانی مرۆڤ» ؟.**

ئێمە كەوتمان صوفی ڕاستەقینە بەكەسێك ئەڵێین كە بە ئاشكراو ڕەواڵەت وە بەنهێنیو پەنامەكی پەیرەوی قورئانو سوننەت بێت، كەواتە ئەخلاقی صوفی ئەبێتە ئەخلاقی قورئانی، وە گوفتارو كرداری ئەبێتە گوفتارو كرداری موحەممەدی ی، كە بەڕاستی ئەو گوفتارو كردارەش، بەرزترین ڕەوشە بۆمرۆڤێكی تەواو، ئەوەندەی ڕەهنمایی، بۆچاكترژیانی مرۆڤ لەقورئانا هەیە، وەئەوەندە زاتنانەبەر بۆ چاكە كردن لەقورئانایە باوڕمەكە لەهیچ سەرمەشقێكی ئەخلاقی ی جیهاندا بەرچاو كەوێت، خوای گەورە بە پێغەمبەری ئیسلام ئەفەرموێ «**وَاِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظيمٍ**» واتە بەڕاستی تۆ خاوەنی ڕەوشو خوڵقێكی بەرزی؛ لەبارەی ڕەوشی بەرزەوە خوای گەورە لەئایەی (١٩٨) سورەی ئەعرافدا ئەفەرمێ بەپێغەمبەر درودی خوای لەسەر، (**خُذِ العَفْوَ وَامُرْ بالمَعْروفِ واعْرِضْ عَنِ الجاهلين**) سەیری ئەم ڕەوشە بەرزە، دوبارە خوا لە سورەی ال عمران ئایەی ١٥٩ دا ئەفەرمێ «**فَبِما رَحمةٍ مِنَ اللهِ لِنْتَ لَهُمْ، وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَليظَ القَلْبِ لانفضّوا مِنْ حَوْلِكَ. فَاعْفُ عَنْهُمْ واسْتَغْفِرْلَهُمْ وَشاوِرْهُم في الاَمْرِ، فَاِذا عَزَمْتَ فَتوَكَّلْ على اللهِ اِنَّ اللهَ يُحِبُّ المتوكّلين**» سەیری لەم تەنها ئایەتەدا چەن ڕەوشتی بەرزی تیایە، ئەرمونیانی ی؛

دووری گرتن لەتوڕەیی و دڵڕەقی، ستایش كردنی بەخشینو گوزەشت، تەنانەت لەخوایش داوای بەخشینی موسوڵمانان، فەرماندان بۆپرس كردنو ڕاوێژكردن بەموسوڵمانان تەنانەت با پێغەمبەریش بێت پاشان گرتنەبەری خوی تەوەككول بەخودا، واتە پشت بەستن بەخوا، جا ئەمانە تە ئەخلاقی موحەممەدی كەئەبێ پیاوی موسوڵمان پەیڕەوی لیوە بكات، خوا ئەفەرمێ «**قَدْ اَفْلَحَ المؤمنونَ الّذينَ هُمْ في صَلاتِهِمْ خاشِعونَ والذينَ هُمْ عَنِ اللّغْوِ مُعْرِضون**» یان لەئایەی حەفتاودوی سورەی فورقاندا كەئەفەرمێ «**والّذينَ لا يَشْهَدونَ الزّورَ واذا مَرّوا باللّغو مَرّوا كِراماً**» تعریفی ئەوموسوڵمانانە ئەكات بەدرۆ شاهیدی نادەن، وەئەگەر دوچاری قرەو قسەی ناشیرین بون خۆیانی تێ ناگەیێنن، وەپیاوانە بەلایا تێ ئەپەڕن.

یان لەسورەی قصص ئایەی (٥٥) دا ئەفەرمێ «**وَاِذا سَمِعوا اللّغو اَعْرَضوا عَنْهُ وَقالوا لَنا اَعمالُنا وَلَكُمْ اَعمالُكُمْ سَلامٌ عَلَيكُمْ لا نَبْتَغي الجاهلين**». وتیان، بە (**ذالنونی میصری**) كە

یەکێکە لەگەورە پیاوانی تەصەووف، کیٚ خەموخەفەتی لەهەموکەسیٚ زۆر ترە، وتی «ئەوانەی کەتوندخوو رەوش‌چەوتن» پێغەمبەر درودی خوای لەسەر ئەفەرمیٚ «السَّخيُّ قَريبٌ مِنَ اللهِ قَريبٌ مِنَ النّاسِ قَريبٌ مِنَ الجنَّةِ بعيدٌ مِنَ النّارِ، والبَخيلُ بَعيدٌ مِنَ اللهِ بَعيدٌ مِنَ النّاسِ بَعيدٌ مِنَ الجنةِ قريبٌ مِنَ النّارِ» هەروەهافەرمویەتی «الجاهِلُ السَّخيُّ اَحَبُّ الى اللهِ مِنَ العابِدِ البَخيلِ».

محمد بهاء الدين نەقشبەند، سەر زەنجیرەی نەقشبەندی، فەرمویەتی، ئەم ڕێگایەی ئێمە سەراسەری ئەدەبە. بیٚ‌گومان ئەم پەنجە راکێشانانە نمونەیێکی زۆر زۆر بچوکن لەوهەموە ئایەتو حەدیث‌و فەرمودەی گەورە پیاوانەی ڕێرەوی تەصەووف، وەئەگەر بێت‌و سەبارەت بەڕەوشی بەرزی پێغەمبەر درودی خوای‌لەسەر وە گەورەپیاوانی دین بنوسین، بەصەد کتێب دوایی نایێ، مەبەست ئەوەتە ڕەوشی ڕێبواری ڕێگەی تەسەووف، ڕەوشی قورئان‌و موحەممەدە، وەقەت لەو ڕەوشە بەرزتر وجودی‌نیە، جا ئایا ئەم‌ڕەوشە بەرزانە بەکەڵك نین؟

ئایا دەستور دان بە خوێندن، کە یەککەم ئایەتی قورئانە «اِقْرَأْ بِاسمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَقَ، خَلَقَ الاِنْسانَ مِنْ عَلَقٍ، اِقْرَأْ وَرَبُّكَ الاكرم الّذي علَّمَ بالقلمِ عَلَّمَ الانسانَ ما لَمْ يَعْلَمْ» ئایا ئەمە کەمە کە یەکەم دەستوری خوای‌گەورە لەئاینی‌پیرۆزی ئیسلاما دەستورە بۆخوێندن؟ یان کە پێغەمبەر درودی‌خوای لەسەر ئەفەرمیٚ، هەتاچین هەربرۆن بەشوێنی خوێندن‌دا، یان ئەفەرمیٚ هەموشتیٚ فێربن تەنانەت ، سیحر، یان ـ کە ئەفەرمیٚ هەر لە منداڵی‌یەوە هەتا مردن هەر خەریکی خوێندن‌بن، یان کەخوای گەورە ئەفەرمیٚ «هل يستوي الذين يعلمون والذين لايعلمون»؟

ئایا خۆێنەوارو نەخوێنەوار ئەبنەیەك؟ ئەڵیٚ فەرقیان وەکو فەرقی کوێرو چاوساغ وایە، مەبەست ئەوەیە بەلای‌ئیسلامەوە خوێندن سەرچاوەی خۆش‌بەختی‌یە وە موسڵمانان تەشویق ئەکات بۆ خوێنەواری وە ڕەوشی بەرز.

ئیسلام فەرمان‌ئەدا بەڕێزگرتن لەدایکوباوك، ئەڵیٚ ئێوە نانەوان و منداڵیٚ بون ئەوان ئێوەیان بەخێوکرد، ئێوەش لەکاتی نانەوانی ئەواندا بەزەییتان بێتەوە پیایاندا وە ئوف مەکەن بەدەسیانەوەو ڕێزیان لیٚ‌بگرن، وە فەرمان‌بەرداری‌ی دایکوباوکی خستوەتە ڕیزی فەرمان‌بردن لەخودا.

خوای گەورە لەچەن جێگادا فەرمان ئەدا بۆرێزگرتنی باوکو دایك وە لە سێ جێگادا ئەفەرمێ «**وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ**» وە ئەفەرمێ «**أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ**.»

ج رەوشێك هەیە لەم رەوشانە بەرزتر، خوا ئەفەرمێ خوا خۆشی لە لوت بەرزانو بەدەماران نایەت، ئەفەرمێ: ئاخرنێوە چیتان لەوخەڵکەی تر زیاترە، مەگەر لەوشاخانە گەورەترن یان زەوی تان شەق کردوە؟ بەکورتی رەوشێکی بەرز نیە خوا دەستوری پی نەدابێت وکارێکی ناشیرین نیە قەدەغەی نەکردبێت، جا سوفی یەکان، کە ئیمانیان ئیمانێکی یەقینی یە، دڵیان بەنوری خودا روناکە، وە هەمیشە وان لە پەیوەندیێکی دەرونی ی لەگەڵ خوای گەورەدا، بی گومان ئەبێ لەهەموکەسێ پاکترو چاکترو روناکتربن، چی هەیە لەوە باشترو بەرزتر، کەدەرونی مرۆڤ رازابێتە وە بەهەمو پێناسێك، واتە «**صیفەتێك**» ی پەسەند وە پاك کرابێتەوە لەهەمو رەوشێکی ناپەسەند، ئێمە زوتر وتمان پەیرەوی شەرع بەکەسێك ئەڵێن کە کردارێکی پێچەوانەی شەرع نەکات، بەڵام صۆفی بەکەسێك ئەڵێن تەنانەت خەیاڵی خرابەش بەدڵیا تێ نەپەرێ، ئەو کە غەرقە لەمەحەببەتی خودادا، ئەو کە بەهرەمەندو کامیابە لەئەنواری هەق، ئەو کە لەحظەیێك ناوی خوا لەدڵیا وون نابێت، ئەو کەشەیدای ئەوهەموە نیعمەتو بەرەکەتەیە کە رژاوە بەسەریاو، بەسەری وجودیا کەفەسەر ئەکات، ئیتر کەی ئەی پەرژێتە سەر خرابەو خرابەکردن، ئەو لەخۆشی ی دیداری ئەنواری خودای گەورە بەچاوی دەرون، تەنانەت خۆشی ی بەهەشتی لەبیر چوەتەوە، کەی ئەی پەرژێتە سەرئەوەی بەخیلی ی بەخەڵك ببات، بۆ سەروەت وسامانی ئەم حیبهانەو پایەو پلەی دنیایی، جا کەسێ کە حەسودی ی نەما، بەخیلیو مشت قوچاوی نەما، هەستی تۆڵەو کینەتۆزی نەما، نەفسی کوژرا، بەجۆرێك، نەك تەمابکاتە سامانی خەڵك بەڵکو سامانی خۆیشی بەهی خوداو مەخلوقی خودا بزانێت، تاوا کەسێك جگە لەچاکەو باشە بۆگەل چی تری لی ئەوەشێتەوە، سوفی دوژمنی عیلمی بێ عەمەلە، بەڵکو بەلای ئەوەوە عیلم ئەبێ عەمەلی لەگەڵ بێت، ئەگینا سودی زانین بە بێ کردەوە ئەبێتە چی؟

بەڵێ ئەمانەبون شتە بەکەڵکەکانی تەسەووف، تەسەووف کوورەیێکە خاك ئەکاتە زێر، خاموکاڵ لەکوورەی حەقیقەتدا قاڵ ئەکا ئەیکاتە گەوهەر، نەزان زانائەکات، ری گر ئەکاتە رێبواری رێگەی هەق، پاشان ئەیکاتە رێبەری رێگای

خواناسی ؛ چی هەیە لەوەچاتر کەسێك کە هیچ خراپەییکی لی نەوەشێتەوەو هەمو چاکەییکی لیّ بوەشێتەوە ، دیارە ئەمەش ، تەربیەت و پەروەردە کردنی ئەوێت ، تا مرۆڤ ببێتە مرۆڤی ڕاستەقینە ئەو مرۆڤەی کە ئەگەر جڵەوی نەفسی نەگیرێت ، بەهیچ شتیّ ڕازی نابێت ، مەگەر «العیاذ باللّه» بەخوابی ، !!!!

مەگەر فیرعەون داوای خوابی نەکرد ؟ مەگەر لەدرێژی مێژودا هەزارانی وەکو جەنگیزو هیتلەر نەهاتن ، کە مرۆڤ کوشتن و ئاوخواردنیان بەلاوە یەك بو ؟ ئایا ئەمانە هەمو مرۆڤ نەبون وە نەیان ئەزانی خودانین ، وەرۆژیّ ئەبیّ کەئەمرن وەئەبنە هیچ ؟ هەروا کەبون ، ئایا بۆ وابون ؟ چونکە هەستی مرۆڤ ویستی وە خواپەرستی ئەوانە پەروەردە نەکرابو وە گومڕا بوبون ، وە بوبونە گورگی هار ، کەواتە مرۆڤ ئەبیّ بەڕەوشی باش پەروەردە بکرێت تا ئەبێتە مرۆڤی ڕاستەقینە ، مرۆڤی چاك زۆرن ، وە لە هەمو هۆزو هەمو ڕێرەوو هەمو خولێکی مێژودا پیاوچاك زۆربوەو ، زۆریشە ، بەلاّم ، بەرزترینی ئەوانە صوفی یەکانن ، ئەویش لەبەر ئەوەتە باوەڕەکەیان یەقینی یە ، وە دەرونیان بەنوری خوای گەوە ڕوناکە ، وەکو فارس ئەڵێن :

**«محمد دیدەنو موسی شەنیدەن**
**شەنیدەن کەی بوەد مانەند دیدەن»**

واتە موحەممەد چاوی پی کەوت و موسی دەنگی بیست بیستن چۆن ئەبێتە چاوپی کەوتن . جامەبەست ئەوەتە ئیمانی صوفی ئیمانی شوهودی یە ، واتە چاوپی کەوتن ، واتە بەچاوی دەرون هەستی نوری خودا کردن ، وەئیمانی خاوەن باوەڕان ئیمانی عیلمی و ئیستیدلالی یە ، کەواتە بی گومان صوفی یەکان زۆرتر ئەبیّ لەخوا بترسن ، وەزورتریش خوایان خۆش بوێت ، وە زۆرتریش فەرمانبەری دەستورەکانی بن .

جابگرە هی وایش بێت پیاوچاك بێت ، تەنانەت باوەڕیشی بە هیچ نەبێت ، بەلاّم هەرگیز ئەو پیاوچاکی یە ناگاتە قولەپوپەی چاکی ، وە بی کەموکوری نابێت ، وە بەتەواوی لە هەوای نەفس پاك نابێتەوە ، هیچ نەبیّ ئەیانەویّ پێیان بڵێن پیاوچاك ، بەلاّم پیاوچاکی ی کە بۆخوابوو وا لەهەمو خەوشێك پاکەو بێگەردوخاکە . چونکە بۆخوای تەنهاو تاکە .

ئەوەی بەدرێژایی مێژوو لەرەوشی گەورەپیاوانی تەسەووفدا دەرکەوتوە ئەوەتەکە جوامێری و لەخوبوردن و بەخششو میهربانی و خزمەت بەخەڵك وەهەزاران خووخدەی باشی‌تر هی‌ئەوان‌بوە ، بەوممرجەی ئێمە رەوشی ، خۆبەشێخ زان «مُتَشَیِّخ» وە خۆبەصوفی‌زان «مُتَصَوِّف» نەکەینە هی ئەوان ، چونکە «کُلُّ نَفسٍ بِما کَسَبَتْ رَهینَة» هەموکەسێ سەبارەت بەکردەوەی خۆی لێی‌ئەپرسنەوە وەحیسابی لەگەڵ‌ئەکەن وە کردەوەی خۆی هی خۆیەتی نەك کردەوەی کەسوکاری،نە کردوەی باوکی حەزرەتی ئیبراهیم ، کەبت‌پەرست‌بو ، بوە هی ئیبراهیم کە پێغمبەربو ، وە نەکردوەی کوری‌نوح کە کافربو ، بوە هی نوح کەپێغەمبەربو ، وە نەکردەوەی ناشیرینی ژنی «لوط» بویە نوکول بۆ «لوط» کە پێغمبەری خودابو ، ئایا ئیستە رەوشی ئێمەی موسوڵمانانی ئەم زەمانە ، گوناهی ئاینی‌ئیسلامە ؟ ئایا دەستوری قورئان بەم جۆرەیە کە ئێمە ئەیکەین ؟ ئایا ئەکرێ بڵێین چونکە ئەم موسوڵمانانە ئاوا کەج‌رەفتارو نالەبارن ، کەواتە ئاینی ئیسلامیش ئاینێکی باش‌نیە ! ! ! ناء ، خرابەکە ئێمەین ، نەك ئاینەکە .

نمونەیێکی‌تری رەفتاری ناپەسەندی مرۆڤ ، رەفتاری ئەوە بەرانبەر بەقانون ، ئایا هەموکەسێ نازانێ ئەگەر دزی‌بکات قانون ئەیکاتە زیندانەوە ؟ بۆچی هی‌واهەیە گوێ ئەداتە قانون وە دزی ناکات ، هی‌وایش هەیە ، دەجاریش کراوەتە حەبس هێشتا هەر عار نایێت؟ خۆ هی‌وایش هەیە دەوڵەمەندیشەو دزیش ئەکات بەڵام دزی‌یەکان جۆراوجۆرن‌وەفەرقیان هەیە ، دوری بۆنەرۆین ، ئایا قانونی مرور «هاتوچۆ» بۆ قانجازی هەمولایێ نیە ؟ ئایا ئەگەر پەیرەوی لێوە بکەین لە صەدا هەشتای زیانی جادەو رێگاکان کەم ناکات ؟ دەی‌بۆ نایکەین ؟ چونکە «اِنَّ النَّفسَ لَاَمّارَةٌ بِالسّوء» کەواتە نەفس وەهەستی ناپەسەندی دەرون ئەبێ راست بکرێتەوە ، ئەبێ پاك بکرێتەوە ، ئەویش پێویستی بەموجاهەدەو تی‌کۆشان‌و لەخۆبوردن‌و زانیاری‌و ماموستایی هەیە ، بۆچی هەر سەبارەت بە هەڵ‌سونیشت وە شارسانیەتی ، فەرق زۆر زۆرە لەنێوانی گەلانی جیهان‌دا ؟ چونکە برێك پێش‌کەوتوترن ، یانێ خوێنەوارتر یانێ بەتەجرەبەتر ، یانێ تێکۆشتر ، جا بەرزترین پایەی پەروەردە ، پەروەردەی دەروونی‌یە ، سەرچاوەکە روون‌بو لای خوارو هەر رونە مەگەر بەزۆر لێڵی کەیت ؛ بەڵام سەرچاوە کە لێڵ‌بو هەتائەروات هەر لێڵە ، سەرچاوەی ژیانی مرۆڤ دڵ‌و دەرونیەتی ، دڵ‌و دەرون کە پاك کرایەوە ، کردەوەو رەفتاریش پاك وجوان ئەبێ ، تەسەووف هەوڵ ئەدا دەرون پاك کاتەوە لەهەمو

خەوشێ ، لەهەمو باوەڕێکی ناشیرینو ناپەسەند ، بەرادەیێك تاوای لێ دێت شایستەی ئەوە ئەبێت کە نوری خوای تیادا دابەزێت ، دڵێکیش بە نوری خودا روناك بو ، هیچ زیانێکی بۆمرۆڤ تیادا بەدی ناکرێت ، جا بێریە بەرچاوی خۆت ، من پاك ، تۆ پاك ، ئەو پاك ، ئەو پاك ، ئەم جیهانە ئەبێتە چۆن بەهەشتێك ، کەس ترسی دزی ، خەیانەت ، درۆ دووڕوویی ، بێ ناموسی ، نەبێت ، هەموی ، هەموکەسێ بەبرا بزانێت ، وە لەرێی خوادا ئامادەبێ بۆخزمەت بەئینسانو ئینسانیەت ، ئەوە چۆن جیهانێکە ؟

جاجیهانی تەسەووفی راستەقینە ئەوەیە ، وەهەر سوفی مەسلەکێك وانەبو ئەوە سوفی نیەو دەس برە ، ئەوەی بیەوێ خەڵك بکاتە بەندەو کۆیلەی خواستی خۆی هەرگیز بەوە ناوترێ سوفی ، یان شیخ ، یان قوطب ، بەڵکو دوشمنی دینە ، دوژمنی ئیمانو ئایینە ، دوژمنی مرۆڤە ، ئەوەش قۆڵی لێ هەڵکرد ، بۆخزمەتی خەڵك ، لە قانجازی خۆی بورد بۆسودی مەردوم ، بەتایبەت بۆ فەقیروهەژار ، ئەوەتە ئیسلامی دروستکار ، پێغەمبەر ئەفەرمێ «سَیِّدُ القَوْمِ خادِمُهُم» .

مەقامی (تەجرید وتەفرید) کە مەقامی ئەولیای گەورەو مورشیدە پایەبەرزەکانن ، لەبارەیانەوە ئەڵێن ، «التَّجْرِیدُ اَن لاٰ تَمْلُكَ ، والتَّفْرِیدُ اَنْ لاٰ تُمْلَكَ» و اتە (تەجرید) ئەوەتە خۆت بەخاوەنی هیچ سامانێکی دنیا نەزانیت ، ئەوەش هەتە بەهی خوای بزانیت ، وە تەفرید ئەوەتە ، کەس نەتوانێ بتکاتە بەندەی خۆی بەڵکو تەنها هەر بەندەی خوابیت هەروەها نەبیتە بەندەی سەروەتو سامانی دنیایی ..

پرسیاری هەشتەمان لەزنجیرە وتاری دوانزەهەم دا ئەڵێت ، «**رێڕەوی راستی تەسەووف کامە ، وەفەرق لەنێوانی صوفی وە موتەصەوویفدا چی یە ؟**»

هەروەکو لەدرێژایی باسەکەدا بۆمان دەرکەوت رێڕەوی راستی تەصەووف بریتی یە ، لە هەوڵو تێکۆشانێکی بێوچان ، لەرێگەی بەدەس هێنانی رەزامەندی خوادا ، ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوای گەورە مویەمو ، هەم بەئاشکراو بەرواڵەت وە هەم بەنهێنی و پەنامەکی ، هەروەها گرتنەبەری رێبازی تایبەتی خواپەرستی یێکە کە پێی ئەوترێ تەریقەت ، جا هەرکام لە تەریقەتەکان بێت ، هەدەف لەتەسەووف ، بەرلەهەموشتێ بەدەست هێنانی رەزامەندی خودایە ، وەرێگای راستیشی رێگایێکە

موبەمو لەگەڵ شەریعەت‌دا بگونجێت ، وە ئەمەش فەرمودەی هەموی گەورەپیاوانی ئەم ڕێبازەتە ، وە لام‌وایە پێویست بەناوبردنی کەس ناکات ، جا ئەگەر کەسێ لەم‌ڕەوشە لای‌دا ، بێ‌گومان گوم‌ڕایەو وێڵ ، وە ڕێ‌ڕەوی ڕاستەقینەی ونکردوە ، هەچ دەس‌کەوتێك ، وەکو بەدەس‌هێنانی مەقامەکان کە دەستی ڕێبواری ئەم‌ڕێبازە ئەکەوێت وا دەس‌کەوتێکەو خەڵاتی خوای‌گەورەیە ، ئەو مەقام‌و پایانە٭هەوارگەو مەنزڵی ڕێگەی ڕەزامەندی خوای‌گەورەن ، نەك ئەمەی کە خۆیان هەدەف‌بن ، بەڵکو ئەتوانن موژدەی پەیتاپەیتاو خۆشییەك بن ، کە دەستی ڕێبوار ئەکەون ؛ بۆئەوەی دڵنیاتربێت کە بەهەڵە نەچوەو ڕێگاکەی ڕێگاییکی دروستە ، کورنوش بردن بۆ کەعبە ، کورنوشە بۆ خاوەنی کەعبە ، نەك بۆکەعبە ، جا ئێمە کەئەڵێین ڕێ‌ڕەوی ڕاستی تەسەووف خواپەرستی‌یە بەلەش‌و بەڕۆح بەدەرو بەدەرون ؛ مەرجێکی هەیە ، ئەویش ئەوەتە کە سەرەڕای پەرستشی دەستور پێ‌دراوی شەرع ، خۆپاراستنو پەرستشی زیادەیشی هەبێت ؛ بەجۆرێك بگاتە رادەیێك کەتەنها چرکەیێك یادی خوای‌گەورە لەدڵی دەرنەچێ ؛ وە هەمیشە لەنێوانی «خەوف‌و رەجا» دا بێت ، کە ئەویش حاڵێکە لە ئەحواڵی تەسەووف ، واتە لەنێوانی (ترس‌وئومێد)ابێت ، ترس لەخوای‌گەورە ، ترسی ئەوەی کە بەوجۆرەی خوا شیاوی پەرستشە ئەم‌بەندەیە نەیتوانیبێت ئەو بپەرستێ ، وەشێوەی بەندەیی بەجێ‌هانیبێت ، هەروەها ئومید بە لوطفو کەرەمی خودا ، بەجۆرێك خوا ئەوەندە گەورەو بەخشەندەیە کە تەنانەت لە کەچ‌ڕەوان‌و گوناەبارانیش خۆش‌ئەبێت ، وە «اَرْحَمُ الرّاحمینە» ، «هوش دەردەم» کەیەکێکە لە یانزە مادەی ڕێ‌ڕەوی نەقشەبەندی‌یەکان ، بریتی‌یە لەوەی ، کە مرۆڤ لە هەمو هەناسەیێکا هۆشی بەلای خواوە بێت ، «دەم» واتە نەفەس ، «هەناسە» ، جا ئەوهۆشەیش بریتی‌یە لەوەی کەسوپاسی خوابکات بۆ هەمو هەناسەیێك ، بەڵێ صوفی ڕاستەقینە ئەوەتە تەنها چرکەیێك ، تەنها هەناسەیێك ، لەخوا غافڵ نەبێ ، وەسوپاسی خوایش بەجێ بێرێت ؛ بگرە ئەم‌کارە بەلای ئێمەوە نەشیاو بێت ، بەڵام بۆئەوانەی کە بونە ڕێبواری ئەو ڕێبازە ، ئەم‌کارە بەلایانەوە شیاوە ، چونکە ئەگەنە ڕادەیێك کە «جیسم» واتە لەش ، وە (ڕۆح) ، لەیەك‌کاتا هەریەکەی بەجیا سپاردەی خۆی ئەنجام ئەدات ، وە سەری لێ‌ناشێوێت ، زۆربەئاسانی ، مرۆڤێکی بەخواگەیشتو ، ئەتوانێ بەدەم وەدەس سەرگەرمی ئەنجامی کاری ڕۆژانەی بێ ، وە چرکەیێکیش دڵ‌ودەرونی

لەخوا غافلْ نەبێت . «رِجالٌ لاتُلْهِيهِمْ تِجارةٌ ولابَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ الله» «وَلاتُطِعْ مَنْ اَغْفَلْنا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنا واتَّبَع هَواه» «ياأَيُّها الَّذينَ آمَنوا ، لاتُلْهِكُم اَمْوالُكُمْ وَلااَوْلادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ الله» .

«الذينَ يَذكرونَ اللهَ قِياماً وَقعُوداً وَعَلى جُنُوبِهم ...» هەموی ئەم ئایەتانە پیشان دەری ئەوحاڵەتەن ، کەواتە ئەمەتە رێرەوی ڕاستی تەسەووف ، بەڵام سەبارەت بەنیوەی دووهەمی پرسیارەکە کە ئەڵێت «فەرق لەنێوانی صوفی و متصوف داچی یە» ؟

ئەبێ بڵێین ، ... لەمەوبەر باسمان کرد ، کە مورشیدی ڕاستەقینە بەکێ ئەڵێن ، کەواتە هەر لەو ڕوانگەیەوە ئەڵێین ، بۆمان دەرکەوت کە صوفی بەکێ ئەڵێن ، هەروەها لەبەشی سەرەتایی ئەم پرسیارەدا بۆمان دەرکەوت کە سوفی ڕاستەقینە بەکێ ئەڵێن ، بەڵام سەبارەت بە «مُتَصَوِّف» ئەبێ بڵێین «متصوف» بەوکەسانە ئەڵێن ، بەناو خۆیان بەپیاوی خودا دائەنێن ، وە بەناوکە فریان نیەبەسەری تەسەووفەوە ، موتەسەووف بەوکەسانە ئەڵێن کە جلوبەرگی شێخ ، یان سوفی و دەرویش ئەکەنە بەریان ، کردەوەی ڕەواڵەت وئاشکرایان وەکو کردەوی ئەوان وایە ، ڕەفتارو کرداری ظاهیری یان هەروەکو پیاوی خوای ڕاستەقینە وایە ، ئەوەی لە قاڵبی شێخیەتیدایە ، وا کردەوەی شێخانە ئەکات ، ئەوەش لە پۆشاکی صوفیەتی و دورویشی دایە ، کردەوەی ئەوان ئەکەن ، بەلام لەڕاستیەکەیا ، وە لەدەرونەوە مەبەستیان دەس بڕین و خۆهەڵکێشان و کەڵکی ناڕەوا وەرگرتنە لەوپۆشاك و کردارانەی ، کە وەکو «تەمثیل» لاسایی کردنەوە ، ئەنجامی ئەدەن ، بەدرۆ هایو هوی ئەکەن وە حالْ دێرن لەخۆیان ، یان شیخ نوماکانیان ، لاسایی شێخە گەورەو ڕاستەقینەکان ئەکەنەوە ، جا بەمانە ئەوترێ «موتەصەووف» وە «موتەشەییخ» ، واتە خۆبەصوفی کردو یان خۆبەشێخ کردو ، بێ گومان چاوی وردی ڕاست بینان وەترازوی شەریعەت ئەتوانێ ئەمانە لەیەك جیاکاتەوەو بیان دات لە سەنگی مەحەك ، زۆری وایش هەیە خۆیان ئەدەن لە شێتی ی ، کەپێیان ئەوترێ «مەجذوب» بەناوی «مەجذوب» ی ڕاستەقینە ، کە لەپاشان باسی ئەکەین ، بەلام زۆریان هەر فێری مفت خۆری و تەمەڵی بوون ، خۆیان کردوە بەسەرباری کۆمەڵ ، تەنانەت تەکلیفی شەرعی یان لەسەری خۆ لابردوە ، نە شێتێکن بڕۆنە شێت خانە ، وەنە ئەڕۆنە ژێری باری خواپەرستی ، یان کاروکاسبی ، خەڵکی ساویلکەیش لەخۆیانەوە کەشفو کەراماتیان بۆئەتاشن ، تەنانەت ئەگەر درۆیش بکەن و دەس بڕی ی بکەن ، ئەڵێن ئەوە بۆیە وائەکەن کەس نەیان ناسێت ، بێگومان

ناسینی ئەمانەش ئاسانە، چونکە ناسینی شێت شتێکی گرنگ نیە، وە یەکێ لەپێ ناسەکانی ئەوەتە قانجازو زیانی خۆی نەزانێت، وە ناسینی موسوڵمانیش ئەوەتە دەستورەکانی شەرع ئەنجام بدات، جائەگەر لەم دوحاڵە بەدەربون، واتە ئەویان ئەگەر بەشوێنی پارەوەرگرتن وزك لەوەراندنا رۆیشت شێت نیە، ئەمیشیان ئەگەر فەرمانی شەرعی پشت گوێ خست کەی ئەتوانێ خواپەرستی راستەقینە بێت.

کەواتە (**موتەصەووف**) وە (**موتەشەییخ**) بەوکەسانە ئەڵێن کە لەدڵەوە دەرونەوە نەکەوتونەتە شوێنی خواپەرستی، تەنها بەرواڵەت وەلاسایی کردنەوە بۆقانجازی خۆیان وەبۆدەسبرین وەخەڵك خەڵەتاندن، خۆیان ئەبەنە سەر شێوەی خواناسان و خواپەرستانی راستەقینە. وە جلوبەرگ و هەڵسونیشتێکی «**تەمثیلی**» وەلاسایی کردنەوەیان هەیەو هیچی تر.

پرسیاری دەهەم لەزنجیرە پرسیارەکانی وتاری دوانزەهەم دا ئەلێت: چۆن ئەگەین بە قۆناغی «**یەقین**» وەچەن ریگەو رەوش هەن بۆ «**سلوکی**» گرتنەبەری، ریگەی یەقین.

لەوەلامدا ئەڵێین گەیشتن بەپلەی یەقینی خواناسی ی بۆ رێبوارێکی موسوڵمانی ریگەی تەسەووف، تەنها لەریگەی «**تەزکیەی نەفسە**»وە واتە، پاك كردنەوەی دەرونەوە دەست ئەدات، پاك كردنەوەی دەرونیش، لەریگەی خواپەرستێکی گەرم، وە خۆرازاندنەوە بە پێناسی پەسەند، وە دوری ی گرتن لە پێناسی ناپەسەند وە بەردەوام بون لەسەری ذیکری خوای گەورە ئابا بەزوان یان بەدڵ، بە چاودێری مورشید، یان بەبێ مورشید، وە سەرەتای کار ئەبێ بە تەوبە دەس پێ بکات، وەمرۆڤ هەتاهەتایە ئەو تەوبەیە بیاتەرێگاوەو لەسەر ئەو ذیکرو پەرستشە گەرمەیە هەر بەردەوام بێت، تاخوا لەخۆی رازی ئەکات، خوایش کە لەیەکێ رازی بو نوری خۆی ئەخاتە دەرونیەوە، کە نوری خودایش لەدەرونا درەوشایەوە، رازی جیهانی مەعنەوی دەس ئەکاتە درەوشانەوەو دەرکەوتن، حاڵی دەرون وە پلەومەقامی مەعنەوی دەس ئەدەن، وە ئیتر دەرون خۆی هەموشتێکی بۆدەرئەکەوێ، بەو چاوی دەرونە ئەوترێ «**بەصیرەت**»، چاوی دەروون کەکرایەوەو پەردە لەسەری «**ئەسرار**»، لابرا، باوەر ئەبێتە باوەری «**عَيْنُ اليَقين**» مرۆڤ کەخۆی شتی بەچاوی خۆی دی، باوەرکوا لەوە گەورەترو ئاشکراتر. رێگەو رەوشەکانیش هەروەکو وتمان «**ذیکر**» ە بەزوان یان بەدڵ، بەتایبەت ذیکری «**الله**» یان «**لا اله الا الله**» کەپێشی ئەڵێن «**نفی وە**

لیسبات» لا اله (نەفی) الا الله «الباتە»، هەروەها «موراقەبە» ئەویش بریتی‌یە لەوەی بەدەستی بەدەس‌نوێژەوە لەشوێنێکی خاوێنو بێ‌دەنگا پاش پارانەوەو داوای لێبوردن «استغفر الله» کردن، روی دەرون ئەکەیتە بەر دەرگای‌خودا بۆماوەیێکی زۆر، واتە نابۆت‌بکرێت، سەعاتێ، یان دەسەعات، هەرچی‌بۆت‌کرا، وەزۆرکەس بەم‌چەشنە کەوتونەتە بەرکەرەمی خوداو نوری خوا لەدەرونیانا دەرەوشاوەتەوە. ئەبێ ئەوەش بزانین‌موراقەبە کە بریتی‌بێت لەوەی کە خوا بە چاودێری‌کەرو (ناظر) ی هەڵسونیشتی خۆت بزانی، ئەوە یەکێکە لەرفتارو رەوشی صۆفی‌یەکان، ئەمەشیان کە بەتایبەت دانیشیت وە لەدەرونەوە چاوەروانی کەرەم‌و بەخشەندەیی خوابیت، ئەوە تێکۆشانێکە بۆ بەرهەم وەرگرتن لە «موراقەبە» بەکورتی موراقەبە هەم ئەوەتە کە خوا بە «ناظر» ی هەمو کردەوەیێکت بزانی، وەهەم چاودێری کردن و پارانەوەیە بۆئەوەی بەر کەرەمی خوا بکەویت هەروەها پەروەردە بون بە دەستی مورشیدێکی «کامل وە مکمل»، واتە پێ گەیشتو وپێ گەیێنەر، بەراستی نەزەری مورشیدی کامیل کیمیایەو ئاوی حەیات، لەهەموی رێگاکان زوتر پیاو ئەگاتە مراز، چونکە مورشید (ئەت‌بات، بەلأم خۆت (ئەبێ بگەیت)، دیارە شارەزایێك یەکێ بیات تا پیاو خۆی رێگا بدۆزێتەوە فەرقی‌زۆرە.

یان، کەڵك وەرگرتنە لە هەموی ئەم رێگایانە، واتە هەم هەردوجۆری ذیکر، ئاشکراونهێنی وە (الله) وە (لا اله الا الله)، وموراقەبە، وە دەست دانە داوێنی مورشید، وە چونە خەڵوەت و چلەکێشان، بەکورتی لەیەکێ لەم رێگایانەوە یان برێك، یان لەهەمویانەوە، ئەکرێت مرۆڤ بە گەیشتنە پلەی (یەقین) شادبێت. پرسیاری یانزەو دوانزەو چواردەو شانزەو حەڤدەو هەژدەو نۆزدە کەبەشوێنی‌یەکدا دێن، بریتین لە.

«پاش گەیشتن بەپلەی یەقین خووخدەی مرۆڤ وە هەڵسونیشتی چی‌بەسەردێت؟»
«مرۆڤ لەم زانیاریە گرنگەدا گەیشتوەتە چ‌پلەیێك؟»
«بەپێرەوی نهێنی‌و ئاشکرا «ظاهیرو باطین» لەشەرع چۆن ئەکرێت؟»
«کردەوە بەرزەکانی صوفیەکان کامەنا وە ئەخلاق صوفی راستەقینە چۆنە؟»
«رێرەوی صوفیەکان بۆگەیشتن بەم ئاواتە چۆن‌بوە؟»
«ئایا رێبازەکان «طەریقەتە» کان لەیەك جیان؟ وە تەریقەت بەچی‌ئەڵێن؟»

**«ئایا شیخیەتی و ئیرشادکردن، یان، شێخ بون و مورید بون لەگەڵی تەسەووف دا هەر یەکێکن یان جیاوازن، وە چۆن؟»**

**«لە «اصطلاح» ی تەسەووف دا بەکێ ئەڵێن شیخ وە بەکێ ئەڵێن وەلی؟»**

جا چونکە ئەتوانم بڵێم لەدرێژایی باسەکەدا تارادەیێکی زۆر بەهەموی ئەم پرسیارانە وەڵام دراوەتەوە ئیتر پێویست نیە بەدورو درێژی وەڵامیان بدەینەوە وە نایش کرێ دەسیان لێ هەڵگرین بەڵکو هەریەکەی لە چەن دێڕێکا وەڵامیان ئەدەینەوە پرسیاری «سێزە» نەبێت، کەپرسیارە لەبارەی «پێناسە پەسەندەکان» «صفاتی حمیدە» وە پێناسە ناپەسەندەکان (**صفاتی رەذیلە**)، ئەوە بەجوێ وەڵامی ئەدەینەوە، ئەمەش دەقی وەڵامی پرسیارەکان.

بۆ وەڵامی پرسیاری یانزە ئەڵێین پاش گەیشتن بەپلەی یەقین ئیتر ئەوکەسە ئەبێتە پیاوێکی تر : یەکەم شت ئەوەتە «ریا» وە رودەربایسی لە خواپەرستیەکەیا نامێنێ، دوهەم، چونکە ئەزانێت خوای گەورە چاوی وا بەهەمو هەڵسونیشتنێکیەوە، ئیتر بەتەواوی ی دوری ی ئەگرێ لەهەرچی گوناهە : بەڵکو لە هەرچی رەفتاری ناشیرین و ناپەسەندە، ئایا ئەکرێ بەبەرچاوی خاوەن ماڵەوە دزی بکرێت ؟ ئەکرێ بەبەرچاوی خەڵکەوە بێ ناموسی ی بکرێت ؟ بەکورتی، هەم لەخۆشی ئەو بەهرەو بەراتەدا کە خوا ئەیداتە ئەو بەندەیە، وەهەم بەهۆی ئەوەوە چرکەیێك لەخودا «**غافل**» نیە، کردارو رەفتاری ئەوانەی کە ئەگەنە پلەی یەقین ئەبێتە کردارو رەفتاری «**موحەممەدی ی**» وە لەسوننەتی پەیامبەری گەورە پەیرەوی ئەکەن، وە هەروەکو لەپێشا وتمان، ئەگەر بەترازوی شەرع کێشانەیان کەن موێ سەرناکەن.

وەڵامی پرسیاری دوانزەش ئەوەتە مرۆڤ لەم زانیاریە گەورەیەدا ئەگاتە رادەیێك کە تەنها مەقامی پێغەمبەرەکان لەمەقامی ئەوان بالاترە، لەم جیهانە «**ناسوتی**» یەوە ئەگەنە جیهانی «**مەلەکوتی**» وە دەسیان ئەگاتە داوێنی جیهانی «**لاهوتی**»، واتە هەرچەن بەناو ئادەمی زادن بەلام لەناوکەدا، مەلاییك صیفەتن «**عَبْدِي كُنْ رَبَّانِياً تَقُلْ لِلشَّيْءِ كُنْ فَيَكُون**» بەڵێ مرۆڤ کە خوانەخواستە شوێنی شەیتان کەوت، ئەبێتە شەیتان صیفەت. شوێنی خوایش کەوت رەوشتی ئەبێتە رەوشتێکی خودایی وەخودا پەسەند، بەڵکو ئەبێتە «**رَبانی**»، جا کە گەیشتە ئەو پایە وپلەیە، ئیتر نە بۆ بەهەشت ئەکۆشێ وە

نه لەترسی دۆزەخدا خوائەپەرستێ ، بەڵکو هەر لەبەر ئەوەی خوا پێی خۆشە ، فەرمان بەردارە ، وەجگە ڕەزامەندیی خوا ، بیر لەهیچیتر ناکاتەوە . جا ئەو پایەبەرزانە جۆراوجۆرن ، مەقامی «ئیحسان» «ڕەضا» «تەفرید» «تەجرید» «تەوحید» «قورب» «عوبودییەت» وەزۆرئاشکرایە ئەم چەن‌شیعرەی حەزرەتی شیخ‌عومەری بیارە «ضیاء الدین» ئیشارەیە بۆلای ئەومەقامانە ، وەدەرئەکەوێ ، ئەوان لەو پایەبەرزە مەعنەوییانە بەهرەمەند بوبن . کەئەفەرمون .

فەقیهی مەدرەسەی «تەوحید»م ئەمڕۆ
فەریدی دائرەی «تەفرید»م ئەمڕۆ

لەپاشان ئەفەرموێ :
لە تەنزیها نیە هیچ‌کەس ڕەفیقم
چرای کاروانی ڕێی «تەمجید»م ئەمڕۆ

لەپاشان ئەفەرمێ :—
عەلاێق دەردی بێ‌دەرمانە «فەوزی»
ڕەئیسی عەسکەری «تەجرید»م ئەمڕۆ .

ئەمانە لەپایە هەرە بەرزەکانی تەصەووفن جا صوفیێك ئەکرێ فەرمانی ئیرشادی هەبێت وەئەکرێ هەر خەریکی خواپەرستی بێت ، ئەکرێ مورشیدبێت وە بەهەموی ئەم پایانەش نەگەیشتبێ ، جگە ئەمانەش پایەی : «غەوثیەت» یان «قوطبیەت» یان «ئەبدال» وە «ئەوتاد» وە هی‌تر . ئەمانەش وەکو پایەی «مەغور»ی دەوڵەت ، سپاردەیان لەسەرەو «لێ‌پرسراون» وە لەبازاری مەعنەویات دا سپاردەیان پێ‌سپێرراوە ، واتە هەم خاوەن‌مەقامن وە هەم «مأمور» کە ئەوەش خۆی پێویستی بە باسێکی تایبەتە ؛ بەڵام هەموی ئەمانە لە چوار چێوەی تەصەووفدا یەك ئەگرنەوە ، وە هەمویان ئەبێ وەلی‌بن وە لەپایەی «عین الیقین» تێ‌پەڕی‌بن ، وەهەمویان خواناس وخواخوازو موسوڵمانی ڕاستەقینەبن . لەوەڵامی پرسیاری چواردەهەم‌دا ، بۆ پەیرەوی‌ی نهێنی‌وئاشکرا لەشەرع ، ئەڵێم ئێمە ئەوەتا ئەبینین ؛ بەناو هەمومان موسوڵمانین واتە ئەوەی باوکودایکی موسوڵمان بێت خۆیەخۆ لەناوی سەرژمێری

خەڵکی وڵاتدا ناوی ئەویش بەموسوڵمان ئەنوسرێت ، هەروەکو هەمو ئاینێکی تریش کەئەوانیش هەروەهان ، بەڵام مرۆڤ کەتەمەنی گەیشتە پانزەساڵ ، سپێرراوی خودای لەسەرە، ئەگەر ئەنجامی‌دا وا بەندەیێکی فەرمانبەرەو ، ئەنجامیشی‌نەدا سەرکێشو لارێگرو گومرایە ، بە ئەنجام‌دانی فەرمانەکان ئەبێتە موسوڵمان بەڵام تا لەدڵا باوەری بەهێزنەبێ پێی ناوترێ «مؤمن» چونکە ئیمان باوەرە ، وەباوەریش بە زۆرەملێ ناچێتە دەرونەوە «لاإكراهَ في الدّين» «قُلْ لم تؤمِنوا ولكِنْ قولوا أسْلَمْنا ولمّا يدخُلِ الإيمانُ في قُلوبكم» ئایەتی (١٤) سورەی (حجرات) .

برێ لە خەڵکی دەوروپشتی (مكة) وتیان ئێمە ئیمانمان هاوردوە ، خوا ئەفەرمێ ، ئەی (مُحمّد) بڵێ ئێوە موسوڵمانن بەڵام هێشتا ئیمان لەدڵتانا دانەمەزراوە ، کەواتە ئیسلام جیایەو ئیمان ، واتە ، باوەر جیا ، ئیسلام کردەوەیە بەڵام ئیمان باوەرەو والەدەرونا «في قلوبكم» .

جا هەرکاتێ کردەوەی موسوڵمانانە وەئەنجامی سپاردەکان لەگەڵ باوەری دەرونا یەکی‌گرتەوە ئەوە موسوڵمانێکی «مؤمن» واتە خاوەن باوەرە . جگە ئەوەش شتێکی‌تر دێتە پێشەوە ، ئەویش «نیەّت» ، واتە قەصدی مرۆڤە ، چونکە بگرە هەرچەن ئیمانیش بێتەپاڵی ئیسلامەکەوە بەڵام چونکە باوەرەکە باوەرێکی عیلمی‌یە بگرە هێشتا جاری وا هەبێت «نەفس» دڵەراوکێ «وەسوەسە» بخاتە دەرونەوە وە پەرستشەکە تێکەڵی برێ هەستی ناڕەوا بکات ، وەکو «ریاء» روپامایی ، یان «عُجب» لەخۆرازی‌بون ، یان «کِبر» ، خۆ بەزل زانین ، یان برێ لەو پەرستشە بەغەفڵەت

ئەنجام‌بدرێ ، بۆ نمونە ، ئێمە زۆرجار ئەڵێین «لاحَوْلَ وَلاقوةَ الا بالله» ، بەڵام ئەم تەنها وشەیە ئەگەر بەباوەرەوە بوترێ هۆی خۆشبەختی ، وەهۆی دامەزراندنی ئیمانی مرۆڤە ، واتە ( هیچ هەوڵو کۆشش و توانایێك بەدەرد ناخوات ئەگەر ویستی خوای لەسەرنەبێ ) جائەگەر ئەم وشەیە بێتە باوەرێکی دەرونی‌ی وە لە سەرچاوەوە هەڵ‌قوڵێت ، وە بەراستیی مرۆڤ باوەری لەسەر ئەوەبێت کە هیچ هەوڵو تەقالایێك هیچ‌نیە ، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت ئەوە چەن‌گرنگە ؟ کەواتە ظاهیرو باطینی عیبادەت لەمەدا دەر ئەکەوێ ، هەروەها سەبارەت بە گوناەکردنیش هەر بەوجۆرەیە ، بۆنمونە ئەگەر کەسێ بیەوێ گوناهێك بکات مادام ئەو گوناهەی

نەکردێت ، شەرعەن لێ‌پرسراوە نیە ، وای‌دانێین چو بۆدزی ، کەوتەرێگا تا ئەوشوێنە ، بەلاّم لەرێ‌دا پەشیمان بووەوە ، یان لەنزیکی ئەوشوێنەدا لیّ‌ی کەوتە گومان ، وە دزی‌یەکەی سەری نەگرت ، مادام کە دزی‌یەکەی نەکردوە ، شەرعەن تاوان‌بار نیە ، بەلاّم کارکردی تەصەووف وەخواپەرستی‌ی ڕاستەقینە ئەوەتە ، وائەکات لەمرۆڤ کەهەرگیز خەیاڵی شتی ناشیرین نەکات‌و بیریشی لیّ‌نەکاتەوە ، پاکی لە باطنی گوناە «ئەوەتە» مرۆڤ لەدڵ‌و دەرونیشەوە پاك‌بێت وە لەدڵ‌و دەرونیشەوە موسوڵمان‌بێت ، لەم‌بارەوە لەسورەی ئەنعام ئایەتی (١٢٠)دا خوای‌گەورە ئەفەرمیّ ، «وَذَرُوا ظَاهِرَ الإثْمِ وَبَاطِنَهُ» ، واتە دەس لەگوناە هەڵ‌گرن ، چ‌ئەوەی ئاشکرایەو چ‌ئەوەشی کە نهێنی یە ، ئایەتی‌قورئان سەبارەت بەگوناهی نهێنی ، یان هەستی ناڕەوای‌دەرون ، زۆرزۆرن وەکو ئەوەی کەئەفەرمیّ .

«وَإنْ تُبْدُوا مافِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللهُ» «البقرة» «٢٨٤» ، «وَلَقَدْ خَلَقْنا الإنسانَ وَنَعلَمُ ماتُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أقْرَبُ إلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الوَرِيدِ» «ق» «١٦» . «قُلْ إنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الفَوَاحِشَ ماظَهَرَ مِنْهَا وَمابَطَنَ» «اعراف» «٣٣» «ولاتَقرَبوا الفَواحِشَ ماظَهَرَ مِنْها ومابَطَنَ» «انعام» «١٥١» .

وە دەیان ئایەتی‌تر ، کە هەمویان ئەوەئەگەیێنن ، ئەچاکەو ئەخراپە ، هەر ئەوەی ئاگیرڕێتەپێش‌چاو ، کە ئاشکرایەو بەرەواڵەتە ، بەڵکو «قەصد» وە «نیەت» ، وە باوەڕی دەرون حسیبە ، بەڵیّ ئەگەر نیازو ویستی‌دەرون پاك‌نەبو کردەوەی‌ڕواڵەت ئەبێتەچی ؟

، گرنگی‌ی ئەم‌کارە لەوەدایە ، هەستی دەرون ئەکریّ لەخەڵك بشارڕێتەوە ، چونکە کەس چوزانیّ خەڵك لەدەرونا بیرلەچی ئەکاتەوە ، ئایا حەسودە ، ئایا دووڕویە ، ئایا کینەجۆیە؟ مەر خوابزانێت ، کەواتە کەسیّ کە لەدەرونەوە دەستی لەوهەستە ناپەسەندانە هەڵگرت ، دیارە باوەڕی بەخوا هەیە بۆیە ئەکۆشێت ، تەنانەت بەخەیاڵیش خەیاڵی خراپەنەکات ، جا صۆفی‌ڕاستەقینە کە باوەڕەکەی ئەبێتە باوەڕێکی یەقینی‌ی ، دیارە ئەبیّ لەهەموکەس زیاتر لەخوابترسێت وە پارێزبکات ، وە دەرو دەرونی پاك‌بێت «جا ئەوەتە پەیڕەوی‌ی نهێنی‌و ئاشکرا ، واتە «ظاهیر وباطِن» ، لەشەرع» .

سەبارەت بەکردەوەی بەرزی صوفیەکان زۆرمان باس کرد وەهەر ئەو گوفتارانەی کەسەبارەت بەناساندنی صوفی وتەصەووف لەسەرەتای باسەکان وتمان هەرئەوە خۆی گەورەترین نمونەیە بۆ رەوشی بەرزی صوفی یەکان، ، دووبارەیش ئەڵێین یەکێ لەپایە بناغەییەکانی تەصەووف، «ایثارە» واتە لەخۆبوردن، یان قانجازی خەڵك خستنە بەری قانجازی خۆت، بۆنمونە ئەتوانین پەنجەراکێشین بۆ خەباتی شیخ محی الدین عەرەبی لەدژی «صەلیبی» یە داگیرکارەکان، هەروەها تێکۆشانو جیهادی شیخ «نەجم‌الدین کوبری» لەدژی مەغولەکان. جەنگیز کە گەمارۆی شاری «خوارەزم»ی دا پەیامی نارد بۆ شیخ نەجموددین کە ئەوو چەن‌هەزار کەسێك کە جوی‌یان ئەکاتەوە، ئەبەخشێنرێن، بەومەرجە ئەو لەشار بروانە دەرەوە. بەلاَم ئەم ذاتە گەورەیە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا وتی خۆمو ماڵومناڵم وەکو هەموی دانیشتوانی ئەم‌شارە واین، یان‌ئەوەتە دەس لەکوشتاری هەمو دانیشتوانی شار هەڵگرێت، یان گیانی ئێمە لەهی ئەم‌خەڵکە عەزیزتر نیە. جەنگیز بۆی‌نەکرا دەس‌بەرداری شارەکەبێت، پەلاماری شاری‌دا وە شیخ‌نەجمودین تا دواهەناسەی شەری‌کرد، وەبەدەستی داگیرکاران کوژرا.

ئەم‌رووداوە لەساڵی (٦١٨) کوچی‌دا روی‌داوە وە شێخ نەجموددین سەرزەنجیرەی تەریقەی «کوبرەوی»یە. ئەمانە نمونەبون هی‌خەباتی گەورەپیاوانی تەصەووف، هەروەها گەورەپیاوانی ئەم‌رێبازە هەمیشە دەس‌کراوەو بەخشندەبوون، هەمیشە خاوەنی گوزەشت‌و لێ‌بووردن‌بوون، قەت بۆ تەماعی دنیا دڵی کەسیان نەئێشاندوە. پەنای بێکەسان‌و هەتیوو لێ‌قەوماوان بوون، روخۆش‌و قسەخۆش‌و خۆش‌زمان بوون، زۆربەیان دانشمەندو دانش‌پەروەربون هەمیشە لایەنگری خوێندن و خوێنەواران بوون وە رێزیان لەعولەما گرتوە و زۆربەیان خاوەن قەڵەم‌و نوسەرو زاناو داناو ئەدیب‌و هونەروەر بوون، ئەدەبیاتی جیهان پڕیەتی لە شیعرو هونەری ئەو گەورەپیاوانە، شیعرو نوسینیان تامو مەزەیێکی تایبەتی هەیە، هۆنراوەیان نوری‌خودای لێ‌بەدی ئەکرێ، وە گەشە ئەدا بەباخچەی دەرونی خاوەن دلان، هەمیشە ناوبژی کەری هەمو چینەکانی گەلان بوون، هەر لە ئاژاوەی ناوخێزانێکەوە ناوبژی‌یان کردوە تائەگاتە سەری ئاژاوەی ناوی دەوڵەتان، یان دەوڵەتان‌و گەلان، وەلاپەرەی مێژوو پڕیەتی لەم باسو سەرگوزەشتانە، بۆنمونە ژیانی شێخ (عبیداللە)ی ئەحرار کە یەکێکە لەگەورە پیاوانی نەقشبەندی پڕیەتی لەم ناوجی کاری‌یە بەداخەوە

ئەوشتانەی کەمن خۆم بیستومە زۆرتری هی ئەوکارە بەرزانەیە کە قارەمانەکانیان باوباپیرانی خۆمن، وە ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایێ ئەبێتە خۆ هەڵ کێشان، بەشی کتێبی سەرگوزەشتم ئەنوسی، جا هەر بەم بەراوردە سەیری کردەوەو خذمەتی هەزاران گەورەپیاوی ئەم مەڵبەندە بکە.

بەراستی مێژوی جیهانی ئیسلام، ئەگەر ژیانی گەورەپیاوانی تەصەووفی لێ لابەی خەزێنەیێکی زۆرگەورەی لێ لابراوە، ئەبێ ئەوەش بزانین هەموی خاوەن مەذهەبەکان ئەوانیش هەر لە گەورەپیاوانی تەصەووفن وەهەمویان لاینگرو خوازیاری رێبازی راستەقینەی تەصەووفن، بەڵێ ئەمە بەشێکی زۆر زۆر کەمە لە رەوشە بەرزو پەسەندەکانی کەڵەمەردانی رێبازی تەصەووف.

سەبارەت بەپرسیاری شانزەهەم باسی رێرەوی صوفیەکان بۆگەیشتن بەئاوات، زوترکرا، وەئەبێتە دوبارەکاری.

لەوەلامی پرسیاری حەڤدەدا ئەڵێم، هەدەف وە ئاوات بۆهەموی تەریقەتەکان هەریەکێکە، واتە هەمویان تێ ئەکۆشن بۆئەنجامدانی فەرمانی خوا بە ئاشکراو بەنهێنی، وە بەهۆی هەستپێکەران واتە «حەواس» وە بە زوانو گیان، بەدەرو بەدەرون، بۆگەیشتن بەپلەی یەقین، بەپلەی ئیمانی تەواو، بەپلەی خواناسیی راستەقینە، کەواتە نیشانە «هەدەف»، یەکێکە، بەلام رێبازەکان جیان، واتە هەر سەرزەنجیرەیێك لە گەورەپیاوانی تەریقەتەکان وەکو «بایەزیدیبەسطامی، عبد القادر گیلانی، بهاء الدینی نەقشبەند، احمدی ریفاعی، عومەری سەهرەوەردی، نەجموددینی کوبری، ئەبولحەسەنی شاذلی، جلال الدینی رومی، وە هەروەها دەیان گەورەپیاوی رێبازی تەصەووف کە گەیشتونەتە پلەی ئەوەی ببنە سەرزنجیرە، هەرکامەی رێرەو وە رەوشێکی تایبەتیان داناوە بۆ پەیرەوانی خۆیان، وە رچەیان بۆکوتاون تا لەهەوارگەی «فەنا» تێیان پەڕاندون وە گەیاندونیانەتە مەنزڵی «بەقا»، وە هەرکامەی ذیکرو فیکرێکی تایبەتی خۆیان هەیە، وە هەمویشی هەروا لە چوارچێوەی ئیسلامی راستەقینەو ذیکری خوای گەورەدا، کەواتە هەدەف یەکێکە بەلام رچەو رێبازو ماموستاو دەلیلو رێپیشاندەران جیاوازن، وە هەمویشی هەر وا لەچوار چێوەی خواپەرستیی راستەقینەدا، بۆنمونە، پەیرەوانی حەزرەتی شیخ عبدالقادر لاینگری ذیکری جەلی، واتە دەنگیبەرز، وە پەیرەوانی بهاءالدین

نەقشبەند لاین گری ذیکری خەفی ، واتە ذیکری نهێنی ئەبن ، هەمویشیان بۆ تەزکیەو پاك کردنەوەی دەرون ئەکۆشن لە هەستی ناپەسەند ، وە ئەوشوێنانەی لەدەرونا ئەبێ پاك کرێنەوە پێیان ئەوترێ (لطائف)، لەطائیف شوێن و مەڵبەندێکن لەدەرونا ، ئەکرێ بەرابەریان بگرین لەگەڵی «حەواس»ی پێنج لانەدا ، چۆن ئەمان هۆی هەستی دەرەوەی مرۆڤن ، ئەوانیش هۆی هەستی دەرونی مرۆڤن ، جا بەیارمەتی خوا لە چوارچێوەی ناساندن و لێکۆڵینەوەی رێبازی نەقشبەندی دا سەبارەت بە (لەطائف) ، وە هەموی ئەوشتانەی کە لەبازاری ئەم تەریقەتەدا مامەڵەو ئاڵوگوریان پێ ئەکرێت بەوردی باس ئەکەم.

سەبارەت بە وەڵامی پرسیاری هەژدە ، ئەڵێم ، بەڵێ شیخیەتی وەئیرشادکردن ، یان شێخ بون وە موریدبون ، لەگەڵ تەسەووف دا هەریەکێکە ، بەڵام بەیەك مەرج ، بەومەرجەی شێخ یەتی راستەقینەو موریدیەتی ، یان دەرویشایەتی راستەقینەبێت ، ئێمە وا بەدرێژی باسی بازاری تەسەووفمان کرد وەباسی هەدەفی تەسەووفمان کرد ئەگەر دیتان ئەوشێخ وموریدە ، یان ئەوشێخ ودەرویشە بەراستی سەرگەرمی خواپەرستین وە هەدەفیان خواناسی یە ، بێگومان ئەوە ناوەرۆك وکاکڵەو کرۆکی تەسەوفە ، ئەگەریش مەبەست مەبەستێکی دنیایی و ئاغەو نۆکەری و فەرمان دەری و فەرمان بەری یە ئەوە تەصەووف لەمانە بێزارو بەری یە ، کردەوەیان بەترازوی شەرع ، بەترازوی ویجدان و عەقڵ و مەنطیق کێشانەکە ، ئەگەر رێك دەرهات ، وا تەصەووفە ، ئەگەریش سەری کرد وادەس برینە .

بەکورتی ، ئیرشاد وەشێخ یەتی کردن ، ئیرشادە بۆ خواناسی لەرێبازی تەصەووفەوە ، ئەگەروابو وا پربەپێستی خۆیەتی ، وە ناووناوکە کەوتونەیەك ، ئەگینا تەصەووف لەوان بێزارە ، وە وشەی مورید ، لە موریدی ی خوداوە هاتوە «الطالب الی الله» نەك موریدی شێخ بێت ، ئەبێ موریدی خودا بێت ، وەشێخ ماموستاو رێ بەروسەروەرێکە بۆ پیشان دانی ئەورێگە بەکەڵکە ، وە شارەزاو بەڵەدێکە کە مروڤی ناشارەزا رانمایی ئەکات ، تا ئەیگەیێنێتە ئاوات و مراز ، کەواتە ئیرشادی مەشایخ لەبناغەدا هەرهەمان ئیرشادی تەصەووفە.

لەوەڵامی پرسیاری نۆزدەدا ئەڵێم ، لە«ئیصطیلاح» ی تەصەووف دا بەکەسێ ئەڵێن شێخ ، کەئیرشادبکات ، وە زوتر مەرجەکانی مورشیدمان باس کرد ، وەیەکێ

لەمەرجەکانی ئەوەتە، وەلی بێت، بەڵکو خاوەنی «**ویلایەتی کوبری**» بێت، وەگەیشتبێتە پلەی «**بەقا**» ی پاش فەنا، ئەم جۆرە گەورەپیاوانە، ئەگەر ڕوخسەتی ڕێنمایی و ماموستایی دەرونیان بەلای مورشیدێکی گەورەوە پێدرا، وا ئەبنە مورشید بەلاّم ویلایەت دەس کەوتێکە هەر لەسەرەتای تەسەووفەوە دەس ئەکەوێت، جا ویلایەت پایەی هەیە، ویلایەتی (**صوغری**) ویلایەتی «**کوبری**» ویلایەتی «**علیا**» کە هەریەکەی بۆ دەستەیێك لە خۆشەویستانی خوایە، هەروەکو لەپێشاوتمان زوتریش

نوسیومانە کە مەولەوی ئەفەرمێ
وەلی کەسێکە عارفٌ باللە
ماأمکن لەذات لەصیفات ئاگاه
بیکێشن بەسەنگ هەرسێ تەقوادا
بەترازوی شەرع موێ لانادا

کەواتە وەلی بەو موسوڵمانە پاك و هوشیارو خواپەرستە پارێزکارە ئەڵێن، کە لە ذاتو صیفاتی خوا، بەپێی توانایی خۆی ئاگاداربێت، وە خاوەنی هەرسێ تەقوا کە بێت، واتە خۆی بپارێزێت لە کوفر لە گوناه، لە هەڵپەکردن وخۆکوشتن بۆماڵی دنیا. ئەمە لای کەمەکەیەتی ئائەگاتە گەورەترین پایە کە ویلایەتی عولیایە وە پەیامبەرانی ئەگەنێ، وە ویلایەتی خاصة هەرهی پەیامبەری گەورەیە وەدەستی هیچ مرۆڤێکی ناگانێ.

بەکورتی هەموشێخێکی ئیرشاد ئەبێ گەیشتبێتە پلەی «**ویلایەتی کوبری**» بەلاّم هەمو وەلییێك ناتوانێ ببێتە مورشید.

واتە هەمو مورشیدێکی ڕاستەقینە وەلییە، بەلاّم هەمو وەلییێك ناتوانێ ببێتە مورشید چونکە وەکو وتمان مورشید مەرجی تریشی هەن کەئەبێ ئەومەرجانەشی تیابێت تابتوانێ ئیرشاد بکات.

زۆرجار سەبارەت بە «**صیفاتی حەمیدە وە صیفاتی رەذیلە**» واتە پێناسە پەسەندەکان و پێناسە ناپەسەندەکانی مرۆڤ باسمان کرد، وەوتمان مرۆڤی سۆفی مەسلەك تێئەکوشێت پێناسە ناپەسەندەکانی بگۆڕێت بە پێناسی پەسەند، تا ئەوپێناسە پەسەندانە ئەبنە خووخدەی مرۆڤ وەئیتر ناچێتەوە سەر خدەی نارەواو ناشیرین، بەڵکو ئەبێتە دژی هەمو ڕەوشێکی ناشیرینو چەوت، گومانی تیانیە هەروا

بەگاڵتە ناکرێت کە مرۆڤ ڕەگوڕیشەی حەسوودی‌ی لەدەرونی خۆیا هەڵکەنێ ، چونکە ئەو پێناسە بوەتە خدەو بەرەگو ڕیشەی دەرونا چوەتە خوارەوە ، حەسودی‌ی بریتی‌یە لەوەی مرۆڤ حەزبکات بەوەی کە نیعمەتی مرۆڤێکی‌تر لاچێت ، واتە حەزکردن بە «**زەوالی نیعمەت لەخەلکی‌تر**» ئەوە حەسودی‌یە ، وە ئەمەش پێناسێکی ناپەسەندە ، بێ‌ئەوەی بەخۆمان بزانین بوەتە خووخدە بۆمان ، وەحەز لەسەر کەوتنو پێشکەوتنو خۆش بەختی‌ی خەڵکی‌تر ناکەین ، وە ئەمانەوێ هەرچی خۆشی‌و چاکە بۆخومانی تەرخان‌کەین ، واتە زۆربەی ئادەمی‌زاد ، نەك تەنها هەرپێی خۆشە خۆی لەهەمو کەس جوانتر ، دەوڵەمەندتر ، دەنگ‌خۆشتر ، خوێنەوارتر ، وە بەدەسەڵات‌تر بێت ، بەڵکو حەزیش ئەکات کەس نەگات بەقولەپێ‌یا ، وە ئەو کەسەیش کە لەشتێکا لەو زیاترە ، لێی داماڵرێت وە موحتاجی ئەم‌بێت ، ئەم پێناسەئەگەر ماوەی بدرێتێ مرۆڤ ئەگەیێنیتە ڕادەی ئەوەی ئەربوێ‌بلوێت داوای خوایی بۆخۆی ، وە کزی‌و بەندەیی‌و لاوازی بۆخەلکی‌تر بکات ، بێگومان مرۆڤ لەم پێناسە ناپەسەندانەدا هەست بەپێناسەکانی خۆی ناکات ، وە هەر عەیبی خەڵکی لەبەرچاوە ، جا (**تەسووف**) تێ‌ئەکۆشێت کە ڕیشەی ئەم‌پێناسانە لە دلودەرونی مرۆڤ‌دا هەڵکێشێت ، جائەمە چۆن‌ئەکرێت ؟ دیارە بە «**موجاهەدە**» واتە خەبات لەدژی هەستە ناپەسەندەکانی «**نەفس**» کە بەپێی ئایینی ئیسلام ، هەروا کە «**جیهاد**» لەدژی کوفروکافران فەرزە هەروایش (**جیهاد**) لەدژی ویستەناپەسەندەکانی دەرونیش فەرزە هەروا کەزوتریش وتمان ، جارێك کە پێغەمبەری گەورە درودی خوای لەسەر لەجیهادیك گەڕانەوە ، فەرمویان لە جیهادی «**ئەصغەر**» واتە بچوك ، گەڕاینەوە ، جا نۆرەی جیهادی «**ئەکبەر**»ە عەرزیان‌کرد جیهادی ئەکبەر کامەتا ئەی پێغەمبەری‌گەورە ، فەرموی جیهادە لەگەل نەفسا ، واتە لەگەڵ دەرخواستی نارەوای دەرونا ، بێگومان بەربەرەکانی‌و خەبات لەدژی خواستی نارەوای دەرون زۆر گرانە چونکە هەروا بەگاڵتە سەرناگرێت .

جابەپێی ڕێ‌ڕەوی تەسەووف ، وەبەپێی دەرمانێك کەتەسەووف بۆ ڕیشەکەن‌کردنی ئەو دەردانەی دەرون دای‌ناوە ، بەرلەهەموشتێ مرۆڤ ئەبێ دەردەکان بناسێت ، واتە بەژیانی خۆیا بچێتەوەو دەوری‌بکاتەوە ، تا یەکە یەکە نەخۆشی‌و عەیبەکانی دیاری ئەکات ، هەروکو وتمان مەسەلەن تێ‌فکرێت بزانێت ، خۆی هەستی خۆبەزل‌زانینی هەیە ، هەستی ناوی‌خەڵك‌بردن «**غەیبەت**» کردنی

هەیە ، هەستی «حەسودی» واتە حەزنەکردن بە سەرکەوتنی خەڵك وە حەزکردن بەدواکەوتنیانی هەیە ، وەهەزاران دەردی تر کەئیستە بریکیان دەستیشان ئەکەین ، جا کە ئەودەردانەی ناسین ، یەکەم هەنگاو بۆچارەکردنیان ، بەر لەهەموشتێك (تەوبە) کردنە ، واتە بریارێکی پیاوانە دان ، بۆ دەس هەلگرتن لەهەموی ئەو خرابی‌یانە ، وە بریاردان لەسەری ئەوەی نەگەرێتەوە بۆسەریان ، دیارە هەروەکو وتمان یەکەم هەنگاوی تەسەووفیش هەر ئەم (تەوبە) کردنەیە وە یەکەم «مەقام» واتە پلەوپایەی تەسەووفیش پایەی «تەوبە» یە ، جا پاش ناسینی دەردەکان واتە پێناسە ناشیرینەکان ، وەبریاردان لەسەری دەس لیّ هەڵگرتنیان ، قوناغی جیّ‌نشین کردنی پێناسە جوانو بەکەڵکەکان دێتە پێشەوە ، واتە ، تەنها ئەوەنیە ، (بۆنمونە) خۆت لەدەستی مشت‌قوچاوی‌و چنۆکی رزگار کەیت ، بەڵکو ئەبیّ خۆیشت لەسەری بەخشەندەیی رابێریت بەجۆریّ لەگەلّ چارەکردنی هەرنەخۆشییەکی دەروونی‌دا بکۆشیت بۆئەوەی پێناسە چاکەکەی پێچەوانەی ئەو ، لەدەرونتا جیّ‌گیر کەیت ،

دیارە ئەم‌کارە زۆرگرنگو سەختە وەپێویستی بە تێکوشانێکی زۆر وە (موحاسەبە) وە پیاچونەوەی رەوشو کردار ئەبێت ، وەئەبیّ مروّڤ دان‌بنیّ بەوەدا کە ئەوپێناسە نارەوایەی هەیە وە ئەیەویّ خۆیی لەدەست رزگارکات ، وە پێناسی چاك وەپەسەند بکاتە جیّ‌نشینی ، جا لەگەلّ ئەم تێکۆشانەشدا ، دەرمانێکی بەکەڵك کە پێویستە بۆ دەرمانی ئەم دەردانە ، گرتنەبەری رێگای بخواناسییەکی تەواوە ، وە هەروەها بەردەوام‌بون لەسەری «ذیکر» ئەوانەی خۆیان خاوەن «نور» ن وەدڵیان روناك بوەتەوە ، هەرئەوان باش‌ئەزانن ئەو ذیکرە چ دەرمانێکی گرنگە بۆچارەی پێناسی خراب وەناشیرین کەلەدەرون‌دا جیّ‌گیربوە ، ناوی خوای گەورە بردن چ بەزوان وە چ بەدلّ هەروەکو ئاگربەردەیتە خەرمانی درکودال ، ئاوا دەرون لەخەوشی هەستە ناپەسەندەکان پاك ئەکاتەوە ، بەلیّ بەم‌چەشنە زۆری پی‌ناچیّ هەروەکو کە نەخۆشێك بەهۆی دەرمانی بەکەڵکوباش چارە ئەکرێت ، یان ، باغوبێستانێك لەدرکو هەرێزو گیای زیان‌بار بژارئەکرێت وە هەروەکو خانوو ناومالێك کە لەخەوشوخالّو تەپوتۆز پاك ئەکریتەوە وە شتەبەکەلکەکان لەو باخو مالەدا گەشە ئەکەنو دەرئەکەون ، هەربەوچەشنە دەرونی سۆفی راستەقینە لە خەوشی پێناسە ناشیرینو ناپەسەندەکان پاك‌ئەبێتەوەو ، وەکو درەختێکی باش‌بەخێو کراوو بژارکراوو

ئاودراو، دەس ئەکاتە بەرهەم دان، وە میوەگرتن، وە خاوەنەکەی ئەحەسێتەوە، دیارە ئەوەش بەبێ ڕەنجو تەقەلا نابێت.

ئیستە بزانین «**پێناسی ناپەسەند**» کە ئەبێ لەدەرونا ڕیشەکەن کرێن کامەن، وە ئەو پێناسە پەسەندو چاکانەی کەئەبێ ببنە جێ‌نشینی ئەوان کامەن.

۵



١ - «حەسەد» پی ناخۆشی ،خۆشی خەڵك ، وەحەزکردن بەنیاچونی نیعمەتێك کە خوابەخەڵکی داوە .
٢ - «ریا» روپامایی کردن ، وە خواپەرستی بەرەواڵەت بۆئافەرین کردنی خەڵك وە هەڵخەڵەتاندنیان . «ولایُشْرِكْ بِعبادَةِ رَبِّهِ اَحَداً» .
٣ - «کِبْر» خۆت لەخەڵکی تر بەباشتر و گەورەتر زانینە ،
٤ - «عوجب» لەخۆبایی بون وەخۆپەسەندی ی .
٥ - «نِفاق» دوورووی کردن وە خەڵك لەیەك هەڵنانو یەك نەبونی زوانو دڵ .
٦ - «بُخْل» مشت قوچاوی و چنوکی «رەزیلی» .
٧ - «کِذْب» ، درۆزنی ی ، وەدرۆکردن .
٨ - «غەیبەت» لەپشت ملە ناوی خەڵك بردن بەشتێك کەئەگەر لەروودا باسی کەیت ئەوکەسە پێی ناخۆش بێت .
٩ - «خەیانەت» تەماع کردنە شتێك کەدرابێتەدەست، جا ئەوشتە چ قسەیێکی نهێنی بێت یان گیان دار یان بێ گیانێك بێت .
١٠ - «بێ وەفایی» چاکە لەبەرچاونەبون یان جەزای چاکە بەخراپەدانەوە .
١١ - «غورور» چاوسوربون وەبێ باکی لەکاتی دەسەڵاتداری دا .
١٢ - «جاه تەڵەبی ی» تێ کۆشانی نارەوا بۆ بەدەس هێنانی پایەوپلەی دنیایی وە دانەمرکان بەومەقامەی کەهەتە .
١٣ - «بێرەحمی ی» بەزەیی نەهاتنەوە بە خەڵکا .
١٤ - «تەظاهور» وەکو ریا وایە، بەڵام ئەم زۆرتری بۆکاروباری دنیایی یە، وەئەو بوعیبادەت ، «بۆ نمونە» کاری چاك کردن نەك بۆچاکەکردن بەڵکو بۆئەوەی پێی بڵێن پیاوچاکە «لەبجامی کاری رەوا، بو گەیشتن، بە دەس کەوتی نارەوا» .
١٥ - (وەقاحەت) بێ شەرمی وە بێ ئابرویی .

١٦ – «ئەنەفقور» لەخۆبۆ رق لەخەڵکە وە بەکەسێ ناڵێ چاك «وەدان بەهیچ چاکەیێکا نانێت .
١٧ – (جەزای چاکە بەخراپە) ئەویش هەروا بەناوەکەیادیارە.
١٨ – (طولی ئەمەل) بیرنەکردنەوە لەمردن، وە وابزانیت لەمردنا ئەکەوێتە پاشی هەمو کەسێك.
١٩ – (ترس نۆکی) دژی ئازادیی و شەجاعەت.
٢٠ – (بێ باوەری ی) خەڵك وەکوخۆت زانین، وە باوەربەکەس نەکردن. بەدگومانی ی ، دڵپیسی ی.
٢١ – (غەزەب) تورەیی وەزووهەڵچون (عەسەبی ی)
٢٢ – (قینەبەری) لەرق خەڵکا زیانێ لەخۆتو لەخەڵك دان.
٢٣ – (خەدەی تۆڵە کردنەوە) چاوپۆشی نەکردنو لەهەڵەی خەڵك نەبوردن، وەنەبەخشین. وەنەبونی گوزەشت.
٢٤ – (بێ قەولی ی) بایەخ بۆبەڵین دانەنان ، واتە وەفابە وەعدە نەکردن.
٢٥ – (قەطعی صیلەی رەحم) دوری گرتن لەخزموکەسوکار، بەتایبەت، باوکو دایکو براوخۆشکو ژنومندالێ. وەخزمی نزیك.
٢٦ – (شەیدایی ماڵوسامان) ئەوەئاشکرایە. (حرص) پارەکۆکردنەوە.
٢٧ – (هەڵەوەری و زۆروتن) یان (لەغو).
٢٨ – (نەمیمە) قصەی ئەم بۆئەو گێرانەوە، وەخەڵك بەگژی یەکادان.
٢٩ – (انتقاد) رەخنەگیری ، کەبرێ کەس لەباتی ئەوەی بۆعەیبی خۆیان بگەرێن وەچارەی کەن، هەمیشە رەخنە لەهەموشتێ وەهەمو کارێ وەهەمورەفتارێ ئەگرن .
٣٠ – (اِستکبار) فەضلی خۆدان بەسەری خەڵکی ترا ، ئەتوانین بڵێین لەگەڵ (تەکەبور)دا یەك ریشەن.
٣١ – (کوفری نیعمەت) بەبەشی خوا نارازی بون «لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ».
٣٢ – (حُبُّ الذّات) (خودخواهی ی) (خوویستی ی)
٣٣ – (تۆمەت لەموڵەودان) اتهام، کە لەگەڵی ، (انتقاد) وە (غەیبەت)دا لەیەکەوە نزیکن .

٣٤ – (لەجاجەت) ، واتە تەسلیمی حەق نەبون وەخۆبەدەستەوە نەدان لەبەرابەری
هەقوراستیدا.
٣٥ – (ساردوسری لەسەر خواپەرستی) وە کەم شەوقی بۆ عیبادەت.
٣٦ – (تەمەللوق) چاپلوسی ، وە بە خەلکا هەلدان (مەدحی درۆ).
٣٧ – (اصرار لەسەر گوناه) لێرەدا ئەبێ بلێم گوناه خۆی گوناهە ، وەگوناەکار تاوانبارە ، بەلام فەرق هەیە لەنێوانی کەسێکا کە بکەوێتە ناوی گوناهێکەوەو دلەتەپەی پێبکەوێتەو پەشیمانیی رووی تێکا ، لەگەل ئەو کەسانەدا کە (إصْرار) یان لەسەر گوناه بێت ، وەکوئەوەی «نەظەر» حەرامە ، بەلام ئەگەر بەهەلەو رێکەوتبو بەدەستی خۆت نیە ، جا کەدوبارەو سێبارەت کردەوە ئەوە تاوانە وە ئەبێتە (إصْرار) کە هەرگیز شێوەی پیاوچاکاننیە ئەمانە بەشێك بون لە (صیفاتی رەزیلە) یان پێناسی ناپەسەند.

بەرانبەر بەهەریەکێ لەمکردەوە ناپەسەندانە ، کردەوەی شیرینو پەسەند هەیە ، وەکو ئەمکردەوانەی خوارەوە.

١ – (پێخۆش بونی خۆشیو سەرکەوتنی خەلك) وە بیر کردنەوە لەوەی کەحەسودی جگە لەزیان بۆخۆت سودیکی نیە ، وە خوا خۆی چاك ئەزانێت ، وە هەمو شتێ بەنۆرەیەو هەموکارێ کاتو ساتی خۆی بۆدانراوە. ئەلبەتە ئەگەر حەزبەوە بکەیت ، تۆیش ئاوا لە نیعمەتیخوا بەرخورداربیت ، ئەوە (غیبطە) یە وە خراپنیە ، بەلام پێخۆش بونی (زەوالی نیعمەت) لەخەلکیتر ، ئەوە خرابە وەخوا لە سورەی «نساء» ئایەتی (٥٤)دا ، ئەفەرمێ «أَمْ يَحْسُدونَ النّاسَ عَلى ما آتاهمُ اللّهُ مِنْ فَضْلِهِ».

واتە بۆچی حەسودیئەبەن بەپێغەمبەر ؟ یان،ئەوەتا حەسودی ئەبەن بەپێغەمبەر ،کەئەو حەسودییە شتێکی ناپەسەندە.

٢ – خواپەرستی هەر لەبەر ئەنجامدانی دەستوری خودا وە چاکەکردن لەبەرئەوەی کە چاکە چاکەو خوایش پێیخۆشە.

٣ - (تەواضُع) وە خۆبەزل نەزانین، وەلێك دانەوەی ئەوەی هەمومان بەندەی خواین وەهەمومان لەئادەمین «كُلُّكُمْ مِنْ آدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُراب» «إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللّهِ اتقاكم»

٤ – **(خۆبەکەمزانین)** وەسەیری عەیبو کەمو کوڕی خۆکردن، بەهەمو بارێکا.

٥ – **(خەیرخواهی)** وە خەڵك ئاشتکردنەوە.

٦ – **(بەخشەندەیی)** وەمشتکراوەیی.

٧ – **(راستگۆیی)**، وە درۆنەکردن.

٨ – لەپشتملە چاکەی خەڵك گوتن.

٩ – **(ئەمینداری‌ی)**وە خەیانەت لەئەمانەت نەکردن.

١٠ – **(وەفاداری‌ی)**وەچاکە لەبەرچاوبون.

١١ – **(لەخواترسی‌ی)** وە لە تۆڵەی خواترسان.

١٢ – **(رازی‌بون وەدامرکان بەبەشی‌خوا)** وە دوری‌گرتن لەوەی کەخەڵك بکەیتە پەیژە بۆسەرکەوتنی خۆت، دوری‌گرتن لەوەی کەلەسەر حیسابی خەڵك بگەیت بەپایە، وە باوەڕلەسەرئەوەی کە ئەبێ بە تێکۆشانی رەوا مافی‌خۆت بێرێتەدەست، واتە بەورادەیە کە زانستو ئامادەیی‌و کارناسی‌و تواناییت هەڵئەگرێت، نەك لەتوانایی‌و زانستی خەڵك بۆسودی خۆت کەڵك‌وەرگریت.

١٣ – **(خاوەن بەزەیی)**وەبەتەنگی بیچارەو لێ‌قەوماوان وە بێ‌دەسەڵاتانەوەبون، وە خەمی‌خەڵك خواردن.

١٤ – **(چاکەلەبەرچاکە کردن)** نەك بۆ خۆهەڵکێشان لەناوی خەڵکا، واتە بۆ «**تەظاهور**» نەبێ: هەر لەدەرونەوە ئەوچاکە کردنە سەرچاوە بگرێت واتە «**إخلاص**».

١٥ – **(شەرمو حەیا کردن)** وە خاترگرتن وە لەڕوی‌خەڵکا دامان، (نەك ئامادەبون بۆ ماف‌فەوتان)بەڵکو برێ‌جار دەس لەبرێ مافی بچوك هەڵگرتن، وە بایی‌دانان بۆ دۆستی‌و برایی‌و گەورەو بچوکی.

١٦ – **(خۆش‌ویستن)** وە دڵ‌فراوانی‌و میهرەبانی.

١٧ – ئەدەب کردن، وە گەورەو بچوك‌ڤامین، وە حەیا کردن لەخواو لەبەندەکانی.

١٨ – **(جەزای چاکە بەچاکە)** ئەنانەت برێ‌جار جەزای خراپەی بەهەڵەکراوو، لەرێی نەفامیوەکراو، وە هی‌لەخۆت بچوکتر، بەچاکەدانەوە.

**(لەبەرچاوبونی مردن)** وە لەشوێنەواری لەمێژین وردبونەوەو هەروەکو کە لەزۆرشوێنی قورئان‌دا خوای‌گەورە سەرگوزەشتی وەکو فیرعەون،قەومی عاد،

قەومی نوح وە ثمود،قەومی لوط،ئەگێڕێتەوە کەئێمە لەوجۆرە سەرگوزەشتانە عیبرەت وەرگرین وە لەخۆمان بایی نەبین . پێ‌هاتن بەوەی کەمردن ، هەروا کەهەمیشە لەهەمو کەسێکی ترەوە نزیکە ؛ لەتۆیشەوە نزیکە ، نەك لات‌وابێت ئەبێ خەڵك بمرێت بەڵام‌تۆ هەر پایەداربیت.
بەکورتی ئەوەندە نەروی بەپیری دنیاوە وابزانیتە مردنت بۆنیە، بەڵکو رۆیشتنی خۆیشت لە پێش‌چاوبێت ؛ هەروا کەمەرگی دوژمنانت بەلاوە نزیکە.

٢٠ – (**شەجاعەت**) وەباوەر لەسەرئەوەی ، ئەوەی خوانەیکات ناکرێت ، وە مرۆڤ نابێ بەرانبەر بەناهەق وەستەم دەم‌بقوچێنێ ، بەڵکو ئەبێ تەنها لەخوابترسێت وە تەنها بوهەقو حەقیقەت سەرلەبەربێت.

٢١ – (**نابێ مرۆڤ دڵ‌پیسو ناباوەر بێت**) هەرچەند کە ساوێلکەیی‌و دەبەنگیش ناپەسەندە ، بەڵام بێ‌باوەری‌و دڵ‌پیسیش هەرناپەسەندە ، خوائەفەرمێ «**إنَّ بعضَ الظَّنِّ إثمٌ**» واتە بڕێ‌جار بەدگومانی‌ی گوناهە . هەروەها ئەفەرمێ «**یا أیُّها الَّذِین آمَنوا ، إنْ جائَکُمْ فاسِقٌ بِنَبأٍ فَتَبَیَّنوا ، أنْ تُصیبوا قَوْماً بِجَهالَةٍ فَتُصْبِحوا علی ما فَعَلْتُمْ نادِمین**» سورەی (**حُجرات**) ئایەتی (٦).
کەوابو بەدگومانی‌و ناباوەری خراپە هەروەهاش بڕێ‌جار خۆش‌باوەریش هەرباش‌نیە، بەتایبەت سەبارەت بە «**فاسق**» واتە موسوڵمانی کەچ‌ڕەفتارو باوەڕدانەمەزراو .

٢٢ – (**ئارامی‌و لەسەرخۆیی**) وە دووری‌گرتن لە توڕەیی‌و دڵی‌خەڵك‌ئیشاندن، چونکە زۆرجار توڕەیی کاری‌وائەکات کەلەودوا پەشیمانی هیچ کەڵکی نابێت ، کەواتە بەرگری‌کردن لەتوڕەیی شتێکی‌پەسەندە وەخۆگرتن‌و بەسەری‌خۆدا زاڵ‌بون کارێکی پەسەندو پێناسێکی شیاوو باشە.

٢٣ – (**رقەبەری نەکردن**) وە گوزەشت‌و لێ‌بوردن وە چاوپۆشی وە زیان‌لەخۆنەدان لەرقی ئەمونەو .

٢٤ – (**بەخشین وە لێ‌بوردن**) ، چونکە تۆڵەکردنەوە هەمیشە، تۆڵەکردنەوەی‌تری بەشوێنەوەیە ، وە هەتاهەتایە لەکۆڵی مرۆڤ نابێتەوە ، ئەمە بەو مانایە نیە کەدەس لەماڵی‌خۆتو مافی‌خۆت هەڵگری بەڵکو خوای‌گەورە لەئایەتی (٤٥) سورەی مائدەدا ئەفەرمێ «**انَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالعَیْنَ بِالعَیْنِ**» بەڵام سەبارەت

بەکوشتنەوەی قاتیل لەئایەتی (١٧٨) سورەی (البقرة) دا ئەفەرمێ «... كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصاصُ فِي الْقَتْلَى ، الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنْثَى بِالأُنْثَى ، فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسانٍ...» کەواتە باوەکو مرۆڤ خاوەن مافیش بێت ، وە تۆڵەکردنەوە هەقی خۆی بێت ، بەخشینەکە لای خوا پەسەندترە . وەسوفی مەسلەکیش کە بەشوێنی چاکترا ئەگەرێ ئەبێ لەهەستی ناپەسەندی تۆڵەسەندنەوە دەس هەڵگری ، تەنانەت تابۆی ئەکرێ ئەگەر لە مافی خۆیشی ، نەك مافی «وەرەسە» وخەڵکی تر- چاوپۆش بێت پەسەندترە. کەواتە «عَفْو» لەپێناسە زۆر پەسەندەکانە.

٢٥ - «بەردەوام بونو سوربون لەسەر بەڵێن» ، ئەم هەستە ، یەکێکە لەگەورەترین پێناسە پەسەندەکان ، وەهەر کەسێ بەڵێنی نەبو بەپیاوی پیاوانە دانانرێت ، جائەگەر رێبواری رێگەی تەسەووف بو ، ئەوە باشتر ئەبێ لەسەر بەڵێنی خۆی بروات .

٢٦ - (دیدەن کردن) ، وسەرلێدانو بەدەمی خزمو کەسو کارەوەبون ، واتە «صیلەی رەحم» یەکێکە لەو پێناسە چاکانەی کەرێبواری رێرەوی تەسەووف ئەکۆشێت بۆئەوەی لەدڵودەرونی خۆیا سەقامگیری کات .

٢٧ - ئیمە زوتر وتمان کە (زوهد) یەکێکە لەپایە بناغەییەکانی رێرەوی تەسەووف زوهدیش پێچەوانەی هەوڵوتێکۆشانە بۆ کۆکردنەوەو پێکەوەنانی سامان ، بێگومان کاسبیو سەرمایەی حەڵاڵ بەدەست‌هێنان کارێکی باشە بەڵام «اِنْهِماك» واتە خۆپڕوکاندن بۆ بەدەس هێنانی سامان ، دژی رەوشی صوفی یەکانە وە «زوهد» دەرمانێکە بۆلەناوبردنی هەستی «اِنهِماك».

٢٨ - (کەم گوتن) وە خۆتێ‌هەڵ نەقوڵتاندنی شتێك کەراستەوخۆ پەیوەندی بەمرۆڤەوە نەبێت ، رەوشی پەسەندی سوفی یەکانە ، ئەوان ئەڵێن تا پرسیارت لێ‌نەکراوە مەڵێ ، کەپرسیارت لێ‌کرا بەئەندازەی پێویست بڵێ ، چونکە کەم وێژی ، وەبێ‌دەنگیو بێ‌رەنگی ، لەرەوشەبەرزەکانی خواناسانە ، بەڵام هەڵەوەریو زۆربڵی‌یی «لەغو» رەوشێکی ناپەسەندەو لە قورئانیشا نەفرینی‌لی‌کراوە. وەستایش کراوە لەوانەی خۆیانی لێ لائەدەن «قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ».

٢٩ - (قسەی ئەم ، لای‌ئەونەکردن) وە خۆهەڵ نەقوڵتاندنە کاروباری خەڵك ، یەکێکی تر لەپێناسە پەسەندەکانە.

٣٠ - هەروا کەرەخنەگیری‌ی هۆی دڵئازاری‌یە، بێ‌گومان سەرنەنانە سەری خەڵك، هۆی بێ‌دەردی‌سەری‌و سەرسوکی‌یە، رەخنەی دڵسۆزانەو دروس‌کەر «النّقدُ البنّاء» بەکەڵکە، بەوشەرتە، بۆ «تظاهر» وە خۆهەڵکێشان وە خۆپیشان‌دان نەبێت، وە بەومەرجەی بەپێی دابورەوشی خۆی بێت، بەڵام رەخنەگرتن وە «اِعْتِراض»‌ ەکلای ڕێبوارانی ریێڕەوی تەسەووف، ناپەسەندەو، دورەپەرێزی لی‌ئەکەن.

٣١ - چەندە بەزۆر خۆسەپاندن بەسەری خەڵکا ناشیرینە، ئەوەندەش خۆبەکەم زانین بەڵکو خۆبە هیچ زانین بەلای سوفیانەوە پەسەندە، بەتایبەت بەرانبەر بە گەورەیی خوای گەورە، ئەوان ئەڵێن گەورەیی هەربۆخوا چاکە، ئێمە بەندەپێکین هەرچەندەش خاوەن دەسەلات بین، دیسان هەر رۆژێ تیائەچین، دیسان هەر بەندەپێکین کە بەرانبەر بەچزەی مێشولەو گازی‌مێشێك ئەپەشۆکێین کەواتە «ئیستیکبار» بۆبەندە نەهاتوە وە کەسێ سەرەتای خاك‌بێتو پایانی هەر خاك، خۆ بناسێت باشترە تاخۆی لێ‌بگۆرریت.

٣٢ - **(شوکری نیعمەت)** خوا لە سورەی ئیبراهیم ئایەتی (٧) دائەفەرمێ «**لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ، وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ**».

٣٣ - **(نوکرانی ذات)** یان ایثار. بەوە ئەڵێن دەست لەقانجاز وەیان ئاسایشی خۆی هەڵگرێت لەرێی خۆش‌بەخت کردنی خەڵکو دابین کردنی خۆش بەختی‌و کامەرانی‌و قانجازی خەڵکا، ئەم خۆبەخت کردنو دەس لەخۆشی خۆهەڵگرتنە یەکێکە لەپێناسە پەسەندو تایبەکانی پەیرەوانی تەسەووف، خوای‌گەورە لەئایەی (٩) سورەی «حەشر» دا ئەفەرمێ «**وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ**» خوای‌گەورە لە تەعریفی ئەنصارا، یان‌بری لە موهاجیرین‌دا کە یارمەتی براموسوڵمانە بێ‌دەسەلاتەکانی خۆیانیان داوە. ئەفەرمێ. «**هەرچەن خۆیان ئیحتیاجیان‌بو بەوشتانە وەپێویستیان‌بو پی‌یان لەگەڵ ئەوەشا فەضلی برادینی یەکانیان ئەدا بەسەری خۆیاندا**».

٣٤ - **(دیفاع لە حەق)** یەکێ لەهەستە پەسەندەکانی دەرون ئەوەتە، دیفاع لەهەق بێتە جی‌نشێنی تۆمەت لەمولەودانو خەڵك‌تاوان بارکردن.

٣٥ - خۆبەدەستەوەدان وەتەسلیم‌بون بەرانبەر بەهەق وەبە**(واقیعیەت)**.

٣٦ - گەرمو گوری‌و شەوق لەسەری خواپەرستی.

٣٧ – **(واقع بینی)** هەق‌دان بەگوفتارو کرداری خەڵك بەوجۆرەی کەهەڵ ئەگرێ ئەزیادو نەکەم.

وەنەبێ ئەمانە هەموی پێناسە پەسەندو ناپەسەندەکان بن، بەڵکو زۆر شتی‌ترهەن ئەگەر بێتو بیان ژمێرین لەژمارە نایێن. بۆنمونە **«پاکی‌ی دەرون وەناپاکی‌ی»** مرۆڤ دڵپاك بەهەموجۆرێ ئەکرێ دڵی‌بێریتەجێ بەلاّم چ بکەی لە ناپاك؟ **«حەیاداری‌ی»** ، بێ‌حەیایی» بێ **«ئیعتیادی»** بەرانبەر بە **«تەوەککول»** دڵەتەپەو دڵەورکێ جەزەع بەرانبەر بە **«صەبر»**.

دڵ ئیشاندنی خەڵك ، دڵنەوایی خەڵك، **«تەقواەو»** پارێزکاری ، نەپرسینەوە لەحەرامو حەلاڵ، چاکەکردن لەگەڵ خەڵك ، خراپەکردن، بەشێوەیێکی گشتی‌ی ئەمانە بەشێکی هەرە دیاری‌و گەورەی ئەو هەستە دەرونی‌و پێناسانەن کە مرۆڤی خواناسی راستەقینە ئەبێ تێکۆشێ بۆلابردنو داماڵینوەراماڵینی ناپەسەندەکان، لەدڵو دەرون‌داو جێ‌نشین کردنی پێناسە پەسەندەکان لەجێگای ئەواندا، جا ئەومەردەی کە خوابۆی بکات سەرکەویت، وە ئەم ئەرکە گرنگە بیاتەرێگاوەو ئەو خذمەتەگەورەیەی بۆگیانی خۆی لێ‌بوەشێتەوە، وە لەولایشەوە لەرێگەی ذیکرو فیکرو پەرستشو سلوکی رێبازی تەریقەتو ڕیازەتی پێویستی **«جیسمی وروحی»** یەوە، دڵودەرون، وە **«لەطائفە»**کانی پاکو **«نورانی»** و روونالك کاتەوە، وا ئەبێتە مەردی دینو دنیا، بەناو **(بەشەرە)** بەلاّم لەهەقیقەتدا مەلاێکەیەو لە خۆشەویستانی خوایە. ئەگەر ئەمەشی بۆنەکرا خۆ هەروا بەمفتە نابێتە مەردی مەیدانی تەسەووف.

ئەمە بو، بەکورتی، بامی **«صفاتی حمیدە»** وە **«صفاتی رەذیلە»** واتە پێناسی چاکو رەواو پەسەند، وە پی‌ناسی نارەواو ناپەسەند، لە روانگەی تەصەووفی ئیسلامی یەوە.

۵



یەکەم : سەرچاوەی وشەی «صۆفی» لەچی‌یەوە هاتوە ،

دووهەم «مەقام‌وەحاڵ» لەڕوانگەی تەسەووفەوە بەچی‌ئەڵێن .

«صۆفی» .

وشەی صۆفی هەر لەصەدەی یەکەمی کۆچی‌یەوە کەوتوەتە ناوەوە : «حَسَن البصري» کەخۆی یەکێکە لە گەورەپیاوانی زانیاری‌ی ئیسلامی‌ی وە تەسەووف، وە لەساڵانی «٢١ - ١١٠» کۆچی‌دا، واتە «٦٤٢ - ٧٢٨» م دا ژیاوە ئەڵێت .

لەکاتی تەوافی کەعبەدا چاوم‌دەوت بە سوفییێك دەستم‌برد وەخەرجی‌یێکم دایێ، بەڵام لێی وەرنەگرتم ، وە گوتی من‌خۆم چوار «دانیق»م پی‌یە وە ئەوە بەشی خەرجیم ئەکات «دانیق شەش‌یەکی دیرهەمێکە»، «نوسەر» .

هەروەها «سُفیان الثوري» کەئەویش یەکێکە لە گەورەپیاوانی زانیاری‌ی «حەدیث‌و کەلام‌و تەسەووف» وە لەنێوانی ساڵانی «٧١٥ - ٧٧٨» م وە «٩٧ - ١٦١»ك ژیاوە ئەڵێ «ئەگەر ئەبوهاشمی صوفی نەبوایێ، فەقت بۆم ڕوون‌نەئەبویەوە کە ((ریا)) چی‌یەوچۆنە» واتە ئەو بۆی ڕوون‌کردوەتەوە، کە وابو ناوی «صوفی» هەر لەسەرەتای ئیسلامەوە بوە، وە بەوپیاوچاکانە وتراوە کە ڕێگای «زوهد» وە پارێزکاری‌و خواپەرستی‌ی ڕاستەقینەیان گرتوەتەبەر .

بەڵام سەبارەت بەوەی کەبۆچی بەم‌خواپەرستە پارێزکارو زاهیدانە وتراوە «صوفی» وە ئەم‌وشەیە لەکوێوە هاتوە ئەڵێم ، ..... بەرلەهەموشتێ ئەبێ بزانین ئەم‌جۆرەناوانە وەکو ناوی منداڵێك‌نیە هەرکە لەدایك‌بو دایکوباوکی دانیشن وە ناوی بنێن بەڵکو هەروەکو کەزانیاری‌ی قورئان‌خوێندن پەیدابوە وردە وردە ناوی قورئانی خوێنەکان نراوەو پی‌یان وتراوە «قُرّاء» یان ئەوانەی کەحەدیسیان کۆکردوەتەوە بە «مُحَدِّث» ناویان‌دەرکردوە، یان«فەقیە» وەبەم‌جۆرە،یان وەکوپیشەو زانیاری‌یە تازەکانی ئەم‌چەرخە کە هەرشتێکی تازە ئەدۆزرێتەوە ناوی پیشەو خاوەن پیشەکەیان ناوەو ناوی میکانیك‌و کارەبایی، وە ئەبارەچی هاتوەتە ناوانەوە، وە دەستەیێك

دانەنیشتون تاناوی کارناسی کارەبا بنێن «**کارەبایی**» جا هەربەوجۆرەش بە شارەزای ڕێگەی شەرع وتراوە «**فەقیە**» وە بەوەی کەئەڕوا حەج ئەکات، وتراوە «**حاجی**» بەوانەش کە لە کاروباری خواپەرستی دا شێوەی شەونەخەوتن و شەونوێژکردن وە خواپەرستی گەرم وە لەگۆشەیێکەوە بەکاروباری خواپەرستی یەوە سەرگەرم بون وەخۆنەپڕوکاندن بۆماڵی دنیاەوە باقی شێوەی خواپەرستی ڕاستەقینەی «**زاهیرو باتین**» یان گرتوەتەبەرەوە خواپەرستیەکەیان، هەروا کەبەکردەوە ئەنجامداوە هەروایش لەدڵەوە خۆیان داوەتە دەستی خوا، واتە «**تَوَکّل**» وە پەرەستشیان لە «**ریا**» پاك کردوەتەوە وەسەرگەرمی ذیکرو فیکر بوون بەمانەش وتراوە «**صوفی**»، هەرچەن ناوی تریشیان لێنراوە، وەکو «**زُهّاد، فُقَراء، غُرباء، اَلشِّکَفْتِیة، الجوعیّة**» ئەمە بۆچی بوە چونکە صوفیەکان خاوەنی هەموی ئەم پێناسانە بوون پشتیان لەدنیا هەڵکردوە کەواتە زاهیدن، ماڵ وسامانیان پێکەوە نەناوە ئەر ماڵیشیان بوبێت بەهی خوایان زانیوە، وە خۆیان بەموحتاجی خوا زانیوە پێیان وتراوە «**فەقیر**»، هەمیشە جیهانگەردیی یان کردوە پێیان وتراوە «**غورەباء**» لە ئەشکەوت وبن بەردەکانا سەرگەرمی خواپەرستی بوون بۆئەوەی کە دوربن لە هەراومەزات وقاڵەوسمر، پێیان وتراوە «**شکەفتیە**» واتە ئەشکەوت نشین، ئەوەندەیان نەخواردوە کەتێربن، پێیان وتراوە «**جوعیّة**»، وەزۆرتری پۆشاك و سیپاڵیان لەخوری بوە واتە «**صوف**»، پێیان وتراوە «**صوفی**»، وە چونکە زاهید یان عابید یان غەریب یان فەقیر بگرە هەرکامەی پێناس بۆیێت بۆیەشێك لەحاڵ و ئەحواڵی «**صوفی**» کەواتە کام وشە توانیبێتی بەسەری ئەوانی ترا زاڵ بێت، وە هەمویان بگرێتەوە، ئەوە ماوەتەوە ئەویش بریتی یە لەجلوبەرگوسپاڵ، بێگومان هەموی ئەمانە لەبارەی جلوبەرگەوە کۆشیون بەرگی سادەترو لێ زەرقوبەرق تر بکەنە بەر، کەئەویش هەر سپاڵی خوری ی بوە، کە بەعەرەبی بوەتە «**صوف**»؛ وەوشەی صوفی ی بوەتە ناوێکی هەمیشەیی بۆهەمو سۆفی مەسلەکێك چونکە هەموی ئەوانە لەو بەرگەدا بەشداربون جا ئایا بەراستی «**صوف**»، واتە خوری، پۆشاکی بێ عینوانی و بێدەماری بو؟ «**ئەبوموسای ئەشعەری**» کە لە «**٦٥٧**» م دا فەوتی کردوە وە لە یارانی پەیامبەرە لەمەدحی پێغەمبەری گەورەدا درودی خوای لەسەر ئەڵێت، ئەوەندە بێدەماربو پۆشاکی خوری ئەکردەبەری وەسواری «**گوێدرێژ**» ئەبو، «**حَسَن البَصري**» ئەڵێت من چاوم کەوتوە بە حەفتا کەس لەوانەی کە لەشەڕی بەدردا، بەشداری یان کردبوو هەمویان لیباسی خوری یان ئەکردەبەر.

وە لەهەموی سەرچاوەکانا ئاشکرایە کە ئەصحابی «**صفّە**» واتە ئەصحابە زۆر خواپەرستە بێنەواکان، پۆشاکیان هەر خوری بوە، هەروەها زۆرجار لەشیعری مەدحی خواپەرستانا هاتوە کە لەبەربێدەماریی خۆیان، هەر لیباسی خوری یان کردوەتەبەر

یان لەزەمی دەس برەکانا هاتوە، وەوتراوە کە پۆشاکی خوری ئەکەنەبەر بۆئەوەی بڵێن ئێمە زاهید وەخواپەرستین، کەواتە، زۆر ئاشکرایە کە پۆشاکی صوف پۆشاکی بێ‌دەماریو دوری‌گرتن لەزەرقوبەرقی دنیابوە بۆیە بوەتە ناوێکی هەمیشەیی بۆ رێبوارانی رێگەی تەسەووف .

بێ‌گومان برێ لە رۆژهەڵات ناسان، یان لێ‌کۆڵەران بیریان لەوەش کردوەتەوە کەبگرە ئەم‌ناوە لە وشەی «**صفاء**» یان «**لەصحابی صففە**» یان «**سوفیای**» یۆنانی یەوە هاتبێ، واتە حیکمەت، کە بە یونانی‌ی بەحیکمەت ئەڵێن «**سوفیا**»، بەڵام لەپاش لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی زۆر بەتایبەت لەروانگەی ری‌زوانەوە، روون‌بوەتەوە کە دروست‌ترین باوەڕ، هەرئەوەتە کە ناوی «**صوفی**» بۆیە بوەتە هی رێبوارانی ئەم‌رێگایە چونکە پۆشاکی «**صوف**» پۆشاکێك‌بوە هەرلەمێژینەوە براوە بەباڵای ئەوکەسانەدا کەبونەتە خاوەنی ئەم‌خدەیە، وە سەرچاوە گەورەکانی تەسەووف، ئاخرەکەی هەر هاتونە ئەوە سەری‌ئەم‌باوەرەی کەوشەی تەسەووف هەرئەگەرێتەوە بۆسەری پۆشینی لیباسی خوری، بەتایبەت لەروانگەی ری‌زوان‌و ئاڵوگۆڕی وشەوە، نە صەفا وە نە صەففە وەنە صوفیا، نابنەصوفی؛ هەروەها زوانی یۆنانی، پاش‌ئەوەی کەوشەی صوفی؛ بوە بەباوو ناسراوە؛ بەصەدەیێك، جا لەناوی ئیسلاما ئەم‌زمانە ناسراوەو گوێزراوە بەعەرەبی، زۆرتری «**ئەبوریحانی بیرونی**» «٣٦٢ – ٤٤٠ ك» «٩٧٣ - ١٠٤٨م»، ئەم‌باوەرەی هەبوە، بەڵام زۆرتری سەرچاوەکان وەکوکتێبی «**اللمع**» هی «**ابو نصر سراج**» کەلە «٣٧٨» کۆچی دا کۆچی کردوە، هەروەها ئائەگاتە سەری **دوکتور زەکی موبارەك** لەچەرخی خۆمانایە، هەمویان لەسەری ئەوباوەرەن کە سەرچاوەی ئەم‌ناوە ، هەرئەگەرێتەوە بۆسەری لەبەرکردنی پۆشاکی هەژارانەی خوری، کە ئائەم دوایە پۆشاکی هەژاران وبێ‌دەماران هەرلەخوری‌بوە، وە دوری‌یان‌گرتوە لەپۆشاکی حەریرو رەنگاورەنگ، ئەگەربڵێم سەبارەت بەم ناونانە، شتەکە براوەتەوە نەبراوەتەوە بەڵام ئەمەیان هەم لاین‌گری‌زۆرەو، هەم لەهەمویشی زیاتر هەڵ‌ئەگرێت، بەتایبەت لەروانگەی «**قەواعیدی زمانەوە**» بەتایبەت هەرلەبەرئەوەش کە بەناوبانگە پۆشاکی پێغەمبەران زۆربەی هەرخوری‌بوە.

وە من‌خۆیشم هەر لەسەرئەوباوەڕەم کە سەرچاوەی ناوبردنی ری‌رەوانی رێگەی تەسەووف، هەر لەوشەی صوفەوەهاتوە، سەیرترلەهەموی ئەوەتە فارسەکان بە صوفی‌یان وتوە «**پەشمینەپوش**» واتە «**پەژم**» «**خوری**» پۆش، واتە ووشەی صوفەکەیان بەپەشم داناوە، وەحافظ زۆرجار لەشیعرەکانیا بەصوفی‌یەکان ئەڵێت «**پەشمینەپۆش**» .

(**پشمینه‌پوش**) تندخو ازعشق نشنیده‌ست بو
از مستیش رمزی بگو تا ترك هوشیاری کند

جگە لەناوی مەقام، ناوی دەرەجاتیش لەقورئاندا هاتوە، کەئەویش هەرئەکرێت بەمەقامی دانێین، لەسورەی ئەنفال ئایاتی دوو تا چوار، خوای گەورەئەفەرمێ، «إنّما المؤمنونَ الّذينَ إذا ذُكِرَ اللهُ وَجِلَتْ قلوبهم، وَإذا تُلِيَتْ عَلَيهِم آياتُه زادَتهُمْ إيماناً وَعَلى رَبِّهم يَتَوكّلون، الّذين يُقيمونَ الصّلاةَ وَمِمّا رَزَقناهُم يُنفِقون، اولئكَ هُم المؤمنونَ حقاً «لَهُمْ دَرَجاتٌ عِندَ رَبِّهم» وَمَغفِرةٌ وَرِزقٌ كَريم».

لەم‌ئایەدا، یەکەم، دەرئەکەوێ کەباوەر، واتە «ئیمان» سێ پێ‌ناسی هەیە، گوفتار وە ئیعترافی زمانی ی، کەناوبردنی خودایە (ذكر الله)، باوەر، کە «وَجِلَتْ قلوبهم» بێت کردەوەکەش هەم بەلەنجامی نوێژ، وەهەم بەبەخشەندەگی، «يقيمون الصلاة ومما رزقناهم ينفقون» پاشان دێتەسەری باسەکەی خومان واتە مەقام وەدەرەجەیێك کەخوا ئەیداتە بەندەی سەربەرێ و بەندەیی فام، کەئەفەرمێ «اولئك هُمُ المؤمنون حقاً، لهم دَرَجاتٌ عِندَ ربهم، ومغفرة ورزق كريم» هەم پایەوپلەو هەم‌بەخشینی گوناهانی لەوەوپێش وەهەم رۆزیی حەڵاڵ، هەروەهاخوای گەورە ئەفەرمێ، (نَرفَعُ دَرَجاتٍ مَنْ نَشاءُ)، سورەی «ئەنعام» ئایەی (٨٣) سەبارەت‌بەحەزرەتی ئیبراهیم.

وەلەسورەی یوسفیش‌دا سەبارەت بە حەزرەتی یوسف کە خوا پلەی بەرزکردوەتەوە بەسەری براکانیا، لەئایەی (٧٦) دا هەرئەفەرمێ (نَرفَعُ دَرجاتٍ مَنْ نَشاءُ)، وە هەم‌دیسان دەربارەی یوسف ئەفەرمێ «ذلِكَ فَضْلُ الله يُؤتيهِ مَنْ يَشاء».

ئەم‌لوطفەی خوای گەورە سەبارەت بەم دوپەیامبەرە، وە بەرانبەر بەهەمو پەیامبەرەکانی تریش، مەبەستێکمان لەتەسەوفدا بۆروون‌ئەکاتەوە، ئەویش مەبەستی مورید وە مورادە، لە رێرەوی تەسەووف دا ئەڵێن دوجۆر رێبوارهەیە مورید وەموراد، مورید ئەوکەسانەن بەرەنجی خۆیان پێ‌ئەگەن، وە موراد ئەوانەن کە خوائەیەوێ پێش‌یان‌خات، واتە هەڵبژاردەن هەروەکو پەیامبەران، کەبرێکیان هەر زکماکی بەپەیامبەری هاتونەدونیاوە، وەکو حەزرەتی عیسی، یان‌وەکو حەزرەتی یوسف، بەکورتی ئەوەتە پێگەیشتنیان هی رەنج‌وخواپەرستی نیە، بەڵکو هەرلەبناغەدا خودای گەورە هەڵی بژاردوون هەروەکو سەبارەت بەیوسف فەرموی «ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء»، هەر لەنێوانی ئەوپەیامبەرە هەڵبژێراوانەشا، فەرق‌هەیە هەروەکو کەئەفەرمێ، «تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنا بَعْضَهم على بَعضٍ، مِنْهُمْ مَن كَلَّمَ اللهَ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجاتٍ...» (٢٥٣) البقرە.

پایەوپلەکانی مەقامی تەصەووفیش هەرئەڕۆنەوە سەری ئەم سەرچاوەڕونەی قورئان، مەبەستـلێرەدا ئەوەتە کە پایەوپلەی نزیك‌بونەوە لەخوای‌گەورە، زۆرە، تەنانەت‌لەناوی پەیامبەرانیشدا بریکیان پایەی‌تایبەتیان هەیە، بەلاَم لەروانگەی تەسەووفەوە هەروەکو‌وتمان «مەقام» بەپلەوپایەی ڕێبواری ڕێگەی تەسەووف ئەوترێ، وەزۆربەی خاوەن پلەو پایەکان خۆیان ئەم مەقامانەیان، بە (دە) مەقام داناوە، بەلاَم هی‌وایش‌هەیە هەریەکێ لەومەقامانەشی کردوەتە (دە) قۆناغ کە ئەبنە (صەد) قوناغ، وەکو «شیخ الاسلام عبد اللە‌ی ئەنصاری هەرەوی» «٣٩٦ - ٤٨١» ك، (١٠٠٩ - ١٠٨٩)م کە لەکتێبی «منازل السائرین» دا، مەقامەکانی کردونەتە (دە) بەشەوە، وەئەموانیشی هەریەکەی کردونەتە دەپلە کەلەئاکامدا ئەبنە (صەد) مەقام..

هی‌وایش‌هەیە ئەوصەدەشی هەریەکی کردوەتە دەقۆناغی‌ترکەئەکاتە هەزارقۆناغ هەروەکو کەابی‌بکرالکتانی کەهاو چەرخی‌جونەیدە وە یەکێکە لەگەورەپیاوانی ڕێگەی تەصەووف ئەڵێت «ان بین العبد والحق الف مقام من نور وظلمة»، ابوالمواهب عبد الوهاب کەبەناوبانگە بەئیمامی (شەعرانی) کە ٩٧٣ م لەقاهرەدا دواکۆچی‌کردوە، لەکتێبی «الیواقیت والجواهر»دا ئەڵێت، ئەبێ‌مرۆڤ «٢٤٩٩٩٩» پلەی ڕۆحیی ببڕێت تائەگاتە مەقامی «مونفەریدین».

هەروەها «حەکیم‌الترمذی محمد ابن علی» کە لە (٣٢٠) ك دا لەجیهان دەرچوە بەجۆرێکی‌تر ناوی مەقامات ئەبات، واتە بۆهەرجۆرە ڕێبوارێکی ڕێگەی خواپەرستی مەقامێك دائەنێ، وەئەیان کاتە چواربەشەوە مەقامی‌صادیقین، مەقامی صیدیقین، مەقامی موقەررەبین، مەقامی مونفەریدین، جائەمە وای لێ دێت لەفلاَن‌پلەوە تافلاَن‌پلە هی‌صادیقینە، لەوەلا تافلاَن شوێن هی موقەررەبینە،... هتد...

وەشێخی‌ئیشراق سەهرەوەردی حەڵەب (١١٩٠ -م) ئەیان‌کاتە پێنج‌پلە کەئاخرپلەی ئەبێتە مەقامی «تەوحید»، کە لەودوا ڕێبوار ئەگاتە «نورالانوار» کەدواپلەی گەورەپیاوانی ئەم‌ڕێگاتە وەکەم‌کەس لەگەورەپیاوانی گەیشتونێ.

بەلاَم «شیخ‌سیراجی‌طوسی» لەکتێبی اللمع دا، ئەڵیت، مەقام بەوچۆنیەتەئەڵێن کەبەندەیێکی‌خودا لەلایێ‌خوداوە خەلاَتی ئەکرێت، وەکو مەقامی صابیرەکان، مەقامی موتەوەککلین، هەرکاتێ یەکێ لەم‌مەقامانە بویە خەلاَتی کەسێك لەوەدا

ئەمێنێتەوە تائەوکاتەی خوابیەوێ پلەیێکی بالآتری بداتێ وەلەوپلەوە بڕواتە پلەبالآکە، وەئەمباوەڕە باوەڕی بەشێ‌هەرەزۆری ڕێبوارانی ئەمڕێگاتە.

جائەگەر من بمەوێ یەکەیەکەی ئەم‌مەقامانە ڕوون‌کەمەوە ئەبێ کتێبێکی وەکوکتێبە (١١٦) لاپەرەییەکەی شیخ عبد الله‌ی‌هەرەوی کەباسمان‌کرد، یان‌کتێبێکی وەکو کتێبە حەوصەد لاپەرەییەکەی «ابنُ القیّم الجوزیه» «٦٩١ - ٧٥١»ك واتە «مدارج السالکین» بنوسم، بەلآم بەیارمەتی خودا، هەول‌ئەدەم بۆڕوون‌کردنەوەی ئەو «١٠» مەقامەی کەلەهەمویان بەناوبانگترن، وە لەڕاستیدا بناغەو سەرچاوەی هەمومەقامەکانن.

مەبەستێکی تریش کەلە باسی‌مەقامەوە نزیکە، بەلْکو هەردوێکەوە ناوئەبرێن، مەبەستی «حال»ە، ئەویش چونکە لەگەڵی ووشەی «مقام» دا وەکو دوانە، وان، وە لێك جوێ‌نابنەوە، ناچارین بەرلەباس‌کردنی ئەو «١٠» مەقامە باسێکیش لەووشەی «حال» بکەین، حال‌و مەقام هەرچەن ناویان پێکەوە دێت، وەبرێ‌کەسیش لای‌وایە هەر یەك شت بن، ڕاستیەکەی ئەوەتە کەلەیەك جوێن، وەهەریەکەی بۆخۆی شتێکە.

حال، بەوجۆنیەتانەئەوترێ کەبەسەری‌ڕێبوار، واتە «سالیك» ی‌ڕێگەی تەصەووف‌دا دێن، جیاکردنەوەی حال لەمەقام لەوەدایە، حال خۆی‌دێت بێ‌ئەوەی بەدەستی‌ڕێبواربێت، واتە «خودادادە» یە، جا، یان نوروبەرەکەتە، یان جۆنیەتێکی تایبەتە کە خۆی‌دێتو خۆیشی‌ئەڕوات، برێ‌جار تەنهاچرکەیێك دەوامی هەیە، جاری‌وایش‌هەیە دەوامدارترە، جاری‌وایش‌هەیە نیشتەجێ ئەبێت، جائەگەر حال، سەقامگیربو وەمایەوە، وائەبێتە مەقام، هەر لەسەرچاوەی پێشودا سەبارەت بە بەشەکانی حال ئەڵێت، «المحبّة، الغیرة، الشّوق، القلَق، العَطَش، الوَجْد، الدّهش، الهیَان، البرق، الذّوق» ئەمانە هەموی حالن، ئیمامی غەزالی لەکتێبی «المنقذ من الضلال» دا باسی‌ئەوەئەکات کە لەسەرەتای دەسکردنە سلوکی ڕێگەی تەسەووف‌دا برێ‌جار نوورێك لەدلی‌مرۆڤدا ئەدرەوشێتەوە وەخێرا ناپەیدائەبێت، هەتاوەکو چەن‌جارێك، کەهەرجارەی زیاترئەمێنێتەوە تائاخرەکەی سەقامگیرئەبێت، برێکی‌تر لەشارەزایانی ئەم‌ڕێگایە حالەتی (صفا، سرور، غەیبە، موکاشەفە، موشاهەدە، موعاینە، قەبض، بەسط، سوکر، صەحو)، ئەمانەیان بە (حال) داناوە لەڕاستیدا ئەم‌جۆنیەتانە هەمویان بۆصوفی دەس‌ئەدەن، وە هەریەکەی خۆی پێناس وجیهانێکی (مەعنەوی)

خۆیان هەیە، لەکتێبی (الرسالة القشیریة)دا ابوالقاسم عبد الكريم بن هوازن القشيري لەمبارەوە زۆری نوسیوە. وەلەزوانی گەورەپیاوانێکی وەکو شیخ معروف الكرخي، وەسری سقطی، وە جونەیدیشەوە زورشتی گێراوەتەوە، جاتەلێت: «الاحوالُ مواهب، والمقامات مكاسب» «الاحوال، الحزن، الالم، السرور وغيرها».

یان ئەڵێت «الأحوال تأتي من عين الجود، والمقام يحصل ببذل المجهود» هەروەها «جونەیدی بەغدادی»کە لە(٢٩٧) ك (٩١٠)م لەدونیادەرچوە، ئەفەرمێ «الحال نازلة تنزل بالعبد في الحين، فيحل بالقلب، فيصفو الوقت في حال الصوفي ويزول»بەمجۆرە چۆنیەتی حاڵ ومەقام روون بویەوە، بەلاّم لەگەڵ ئەمەشا سەیرئەکەین بریێجار بیروڕای ڕێبوارانی ئەمڕێگایە سەبارەت بە حاڵ ومەقام لەیەك جوێن، واتە بریکیان حاڵێك لەوحالآنە بەمەقام دائەنێن، بریکی تریان بەحاڵی ئەزانن، بەلاّم شارەزایانیان، سەبارەت بەمدوباوەڕی یە، ئەڵێن، بەڵێ حاڵی واهەیە لەپێشا حاڵە، بەلاّم ئەمێنێتەوەو سەقامگیرئەبێت و ناروات، وەمادام کەمایەوە ئیتر ئەوە حاڵ نیە وەمەقامە، جاهەرئەوەتە بوەتەهۆی ئەودووباوەڕی یە.

دوو چۆنیەت، یان دووپایە هەن، کەوان لەرێگەی ڕێبوارانی تەسەووف دا سەبارەت بەوانیش بەپێویست ئەزانم هەرئیستە باس بکەم چونکە چۆنیەتی ئەوانیش لەباسی حاڵ ومەقامەوە نزیکە، ئەو دوچۆنیەتەش بریتین لە «تەلوین» وە «تەمکین» کە ڕێبواری ڕێڕەوی تەسەووف لەمدوحاڵەتەش بەهرەمەندو بەرخوردارئەبێت جا سەبارەت بەمانیش وتراوە کەتەلوین، حاڵە، وەتەمکین مەقامە، تەلوین، ناوی خۆی وابەخۆیەوە واتە «گۆڕانی ڕەنگ»، کە ئەبێتە گۆڕانی حاڵی سۆفی لەحاڵێکەوە بۆحاڵێکی تر، ئەبولقاسمی قوشەیری کەناومان برد ئەڵێت، (التلوينُ صفةُ أرباب الأحوال، والتمكين صفة اهل الحقائق، فما دامَ العبدُ في الطّريقِ فهوَ صاحبُ تلوين، لأنه يرتقي من حال الى حال، وينتقل من وصف الى وصف، ويخرج من مرحل ويحصل في مَرْبَعٍ، فإذا وصل تمكّن»
ئەڵێت. (شیعر)

مازلتُ انزلُ في ودادكَ منزلاً
تتحيّرُ الألبابُ دونَ نزولِهِ.

ئەڵێت (صاحبُ التلوينِ ابداً في الزّيادة وصاحبُ التمكينِ وَصَل ثم اتّصَلَ ، وإمارَةُ إنَّهُ اتّصَلَ ، إنَّهُ بالكليّة عَنْ كليتِهِ بَطَلَ) ، لەپاشان هەر قوشەیری سەبارەت بەناساندنی «نەفەس» کەئەویش حاڵەتێکە لەحاڵاتی تەصەووف وەلەکوردی خۆماندا زۆرجار بەکاربراوە ، کەئەڵێن فلانکەس دەمونەفەسی باشە ، یان»هانام بەو دەمو نەفەستە ، ئەڵێت ،

(النَفَسُ ترويح القلوب بِلَطائِفِ الغيوب ، وصاحبُ الأنفاسِ أرقّ وأصفى من صاحب الأحوال ، فكان صاحب الوقت مبتدئا وصاحب الأنفاس منتهيا وصاحب الأحوال بينهما)

فالأحوال وسائط والأنفاس نهاية الترقي ، فالأوقات لصاحب القلوب والاحوال لأرباب الارواح ، والانفاس لأهل السرائر»لێرەدا پێم باشە بڵێم «أبن الوقت وصاحب الوقت» ئەوانیش لەتەصەووفدا هاتوون «ابن الوقت» جۆرێکە لە «تەلوین» واتە زووزوو ئەگۆرێت وە قوشەیری لێرەدا مەبەستی ئەوەیانە چونکە ئەڵێ «فكان صاحب الوقت مبتدئا» بەلام صاحب الوقت بەو وەلیە ، وەبەوگەورەپیاوە ئەوترێ کەپایەی لەهەموپایەکان گەورەترە کەبگرە «قطبی» زەمانی خۆی بێت . «ابن الوقت» هی سەرەتایە بەلام «صاحب الوقت» هی دواپلەیە .

لەپاشان ئەڵێت (وقالوا أفضلُ العبادات عَدُّ الأنفاس) لێرەدا ئەلێ بڵێم «هۆش دەردەم» کەیەکێکە لە «یانزە» پایەی سلوکی رێگەی نەقشبەندییەکان ، هەرئەم «عَدُّ الأنفاس» ، واتەهەناسەژمێری ، یان یەك هەناسە لەخودا غافل نەبونەتە .

بەم جۆرە ئێستە ئەتوانین حاڵ ومەقامی صوفییەکان لەیەك جوێ کەینەوەو بیان ناسین ، بەلام هەروەکو لەپێشاگوتم ، باسی یەکەیەکەی هەرحاڵ ومەقامێك بێگومان پێویستی بەنوسینی کتێبێك ئەبێت ، ئومێدەوارم ، خۆم، یان هەر خوێنەوارێکی تری شارەزای کورد ، بتوانین ئەم ئەرکە بەرینەرێگاوە تا ئاوا کتێبێك بخرێتە کتێبخانەکانەوە ، ئەویش بۆرووون کردنەوەیێکی زیاتری خـــاوەن دڵانی خودا پێ داوان .

«مەقامەکان» :

| | |
|---|---|
| ١ – تەوبە ، | «توبه» |
| ٢ – ئینابە ، | «إنابه» |
| ٣ – زوهد ، | «زهد» |
| ٤ – قەناعەت ، | «قناعة» |
| ٥ – وەرع | «ورع» |
| ٦ – صەبر ، | «صبر» |
| ٧ – شوکور ، | «شكر» |
| ٨ – تەوەککول ، | «توكل» |
| ٩ – تەسلیم ، | «تسليم» |
| ١٠ – رەزا ، | «رضا» |
| ١١ – موحاسەبە ، | «محاسبه» |
| ١٢ – خەوف‌ورەجا | «خوف ورجاء» |
| ١٣ – فەقر ، | «فقر» |
| ١٤ – صیدق | «صدق» |
| ١٥ – موراقەبە | «مراقبه» |
| ١٦ – ئیحسان | «احسان» |
| ١٧ – قورب | «قرب» |
| ١٨ – ئیخلاص | «اخلاص» |
| ١٩ – فەنا | «فنا» |
| ٢٠ – بەقا | «بقاء» |
| ٢١ – تەوحید | «توحيد» |
| ٢٢ – تەجرید | «تجريد» |
| ٢٣ – تەفرید | «تفريد» |
| ٢٤ – تەنزیە | «تنزيه» |
| ٢٥ – عوبودی‌یەت | «عبودية» |

ئارامگەی بەهائوددین وا لەگۆشەی باخێکی پڕ لەدرەختی گەورەی توو قەیسی داوە هەردوو لاکەی مزگەوتە وەخەڵك دێن بۆزیارەتی.

ئەلوفسین چەن وێنەیێکی گرتوە لەو ئارامگەیە بەیارمەتی خودا ئێمەش لەمکتێبەدا چاپیان ئەکەین.

هەروەهالەهەمان کتێباەلێت، ئارمینیوس وامبری کە ئەویش رۆژ هەلاًت ناسێکی مەجەری یە «A. WAMBEY، ۱۸۳۲ – ۱۹۱۳» کەئەویش هەر لەصەدەی نۆزدەدا چوەتە بوخارا ئەویش ئەڵێ هەمیشەو بەردەوام خەڵکێکی زۆر تەنانەت لە چینەوە دێن بۆزیارەتی مەرقەدی بەهائوددین نەقشبەند، وە بوخارایی یەکان دابیان وایە رۆژانی چوار شەممە دێن بۆزیارەت وە خەڵکێکی زۆر هەر شەو تابەیانی لەنزیکی مەرقەدا سەرگەرمی نوێژ وە خوداپەرستین، وە لە تەنشتی مەرقەدا مزگەوتو خانەقاو موسافیر خانەیشی تیایە. لە کتێبی الحدائق الوردیة وە لەکتێبی الانوار القدسیه دا کە روو نوسێکە لەحەدائق، ئەڵێ کاتێ کە بەهائوددین لەدنیا دەرچو لەباغێکی خۆیا نێژرا وە هەر دەس بەجێ ئارامگەیێکی زۆر بەشکۆ بەسەری گۆرەکەیەوە وە مزگەوتێکی گەورەش لە تەنشتیدا دروس کرا وە پادشایانو گەورە پیاوانی ئەو مەڵبەندە مەوقوفاتێکی زۆریان تەرخان کرد بۆ بەرێوە بردنی مێوانو زیارەت کەرانی ئارامگەو مزگەوتەکە.

نوسەرو توێژەری کتێبی قودسی یە ئەڵێ بەهائوددینی نەقشبەند جگە لە ریسالەی قودسی یە چەن ریسالەیێکی تریشی هەیە کە لە کتێبخانە کانی جیهاندا پارێزراون وەکو الاوراد البهائیه وە «اوْارد صَغیر» ئەوراد ئەلبەهائییە»شەرحی زۆری جیاجیای لەسەرنوسراوە، هەروەها ریسالەی (**الواردات**) ە کە نوسخەیێکی لە کتێبخانەی ئەیاصوفیە دا هەیە، هەروەها کتێبی «**دلیل العاشقین**»، لە تەصەووف دا وە «**حیاتنامە**» کە پەندو ئامۆژگاری یە.

**ووشەی نەقشبەند:**

سەبارەت بە ووشەی نەقشبەند زۆر باس کراوە. لەپێشا ئەبێ بڵێم ئەم ووشەیە نەقشبەندە، نەك نەقشبەندی، نەقشبەندی بۆ ئێمە مانانەوە یێ کەی هی نیسبەتە.

ئەم ووشەیە فارسی یە واتە ئەوکەسەی کە نەقش ئەکات «**پێناسێکی مورەککەبی فاعیلی**» یە، وەکو بڵێین وێنە گەر، نەقش زۆر تری بۆ هەڵ کەندنە لەسەری بەردودار، بەڵام ئیستە بەوکەسانەی بەدەست وێنە ئەکێشن ئەڵێن (**نەققاش**) ووشەی نەقش بەتەنها عەرەبی یە وەبۆ شت نەخش‌ونیگار کردن هاتوە بەڵام بەهۆی پاش‌بەندی (**بەند**) **ەوە ووشەیێکی فارسی لیٚ دروس کراوە، رەنگ گەر، وێنەگر، شت هەڵکەن**. «**العِلْمُ فِي الصِّغرَ كالنَّقْشِ عَلى الحَجَر**». جا ئەگەر بەهاتوددین، ناوەکەی «**نەقشبەندی**» بوابیٚ ئەمانگوت بگرە باو باپیری نەققاش بوبن، سەرگوزەشتی باپیریشی روونا کە، خۆیشی ئەوەتا لەروژێکەوە چاوی کردوەتەوە هەر سەرگەرمی گرتنە بەری رێبازی تەصەووف بوە.

کەواتە هەر، بۆچونە مەعنەویی یەکە دروستە، واتە بەهاتوددین نەققاشی دەرون بوە وە نەقشی (**الله**) ی لەدەرونی خۆیو موریدەکانیا چەسپاندوە وە ئەوەتا ریٚ رەوەکەشی سەیر ئەکەین هەموی کۆششە بۆ ئەوەی مەذکور کە خوابێت هەمیشە لەدەرونا بێت، شاعیرێکی نەقشبەندی ئەڵێت.

ایْ برادَرْ دَرْ طريقِ نقشبند
ذِكْرِ حَقْرا دَرْ دِلِ خودْ نەقشْ بَندْ

واتە، ئەی برادەری رێگەی نەقشبەند ذیکری هەق لەدەرونی خۆتا نەخش‌بکە، هەڵی کەنە. برێك گوتویانە نەقشبەند دیٚیێکە لە بوخارا، وە بە هاتوددین خەڵکی ئەویٚیە، ئەوە هەر زۆر لە ئاوەزەوە دوورە، یەکەم گوندی وا نەبوەو نیە، دووهەم ژیانی ئەو روناکەو دیارە لەکویٚ لەدایك بوە، سیٚهەم ئەگەر گوندی وا هەبوابیٚ ئەبوابیٚ بەهاتوددین ناوی نەقشبەندی بوابیٚ نەك نەقشبەند.

کەواتە هەر ئەوەتە کەرەوشی ذیکری نهێنی رەواج داوە کەئەبێتە هۆی بەردەوام بونی (**مەذکور**) یان «**موسەمما**» لەدەرونا وە لە دەرونا نەقش ئەبەستیٚ.

مەبەستێکی‌تر هەیە پێویستم زانی‌ی روونی کەمەوە ئەویش ئەوەتە یەکیٚ لە ناوەکانی شاهی نەقشبەند «**محمد بهاء الدين الأُوَيْسى البُخاري**» یە، بوخاری، روونا کە واتە خەڵکی بوخارایە، بەڵام ئووەیسی چی‌یە؟ گوایا برێك گوتویانە هی ئەوەتە

ڕەوشی ئەو لە تەصەووفدا وەکو ڕەوشی «**وەیسی‌قەرەنی**» بوە. نوسەری کتێبی (**تاریخ تصوف درکردستان**) سەبارەت بە ڕوون کردنەوەی واتای ئەم ووشەیە، قامکی ڕاکێشاوە بۆکتێبی «**تاریخ السلیمانیه**». گوایا لەم مێژووەدا وا نوسراوە.

ڕاستەکەی ئەوەتە ئەو مەشایخانەی کە لەلایێ ڕۆحانی‌یەتی مەشایخانی فەوت کردووەوە،یان مەشایخێکی دور دەستەوە کەنەتوانن بەخزمەتیان بگەن، پەروەردە کرابن، بەوانە ئەڵێن (**ئووەیسی**)، واتە هەروا کە حەزرەتی وەیس نەبو بە نەصیبی کە بەخزمەتی پێغەمبەر بگات وە هەر لەدورەوە موسوڵمان بو وە لەبەرەکەتی ڕۆحانی‌یەتی حەزرەت بەهرەمەندو بەرخورداربو، هەروا ئەو مەشایخەیش ئەکرێ لەنورو بەرەکەتی گەورە پیاوێك بەرخوردار بێت، بائەو گەورە پیاوەش فەوتی کردبێت یان لەو کەسەوە دوور بێت.

جا چونکە شاهی نەقشبەند زۆرجار فەرمویەتی وە لە سەر گوزەشتەکانی ژیانیشیا نوسراوە کە ڕۆحانی‌یەتی (**خواجە عەبدول خالیق غەجدەوانی**) پەروەردەی کردووە،وە ئەمیرکولال هەروەکو باسمان کرد تا ئەو شوێنەی بۆی کرا پەروەردەی کرد وە لەوەولا خواجە عەبدول خالیق گەیاندویەتە ئەو مەقامە بەرزە، کەواتە «**ئووەیسی مەشرەب**» ە وە بەو بونەوە پێی ئەڵێن، «**بەهائوددین ئەل ئووەیسی**».

هەر لەبەری ئەمەیشە، کە ئەڵێن شاهی نەقشبەند زەنجیرەکەی بە (**دە**) واسیطە ئەگاتە پێغەمبەر، چونکە بەینی ئەو وە غەجدەوایی لائەبەن کە بریتین لە ئەمیرکولال، سەمماسی، عەلی رامتینی، مەحمودی ئەنجیر فەغنەوی، عاریفی ڕیوگەری، ئەم هەموو پیرە دەست بەدەست ئەکەونە نێوانی (بهاء الدین) وە غەجدەوانی جا کە مادام ڕۆحانی‌یەتی غەجدەوانی بەهائوددینی پەروەردە کردبێت یەکسەر غەجدەوانی ی ئەبێتە مورشیدی بەهائوددین جا ئەمەتە مەقامی ئووەیسی، ئەم مەقامی ئووەیسی‌یە وە نەبێ تەنها هی بەهائوددین بوبێت بەڵکو سەبارەت بە شێخ حەسەنی خەرقانیش هەروایە، وە مەشهورە کە ڕۆحانی‌یەتی بایەزیدی بەسطامی ی پەروەردەی کردوە شێخ حەسەن لە «**٤٢٥**» ك دا فەوتی کردووەو. بایەزید لە «**٢٦١**»ك دا.

هەروەها مەشهورە کە بایەزید پەروەردە کراوی ڕۆحانیەتی ئیمام جەعفەری صادیقە کە لە «**١٤٨**» ك دا فەوتی کردوە.

تەنانەت بڕێك لایان وایە دوو بایەزید هەن، یەکێکیان لەڕۆژگاری ئیمام جەعفەرا بوبێت، مەبەستی من ڕوون کردنەوەی ئەم وشەی «**ئووەیسی**» یەتە، ئەگینا ئەو گەورە پیاوانە مەبەستیان ئەوەبوە ڕوبکەنە خوا خوایش لەهەمو شوێنێ حازرە وەخۆی بەندەی خۆی هیدایەت ئەدات «**واتقوا الله ویعلمکم الله**» **ئەو پیرانەش کۆتایی یان نەکردوە کەسێ مورشیدێکی وەکو ئەمیر کولال بلێت ئەوەی کە زانیم وە توانیم دریغم نەکرد وە تۆم لەپێستی بەشەری بەت دەرکرد، پاشان خۆی ئەتوانێ ڕێگای خۆی دیاری کات، وە لای خوایش هیچی پێ ناچێت کە ڕۆحی گەورە پیاوێك بکاتە مەئموری پەروەردە کردنی گەورە پیاوێکی تر، یەکێکی تر لەو گەورە پیاوانەی کە شاهی نەقشبەند پێی گەیاندن خواجە یەعقوبی چەرخی بو کە لەساڵی (٨٥١)** دا لەدنیا دەرچوە، ئەویش شابازێکی ڕێگای هیدایەت وە ئیرشاد بوە وە صەدان تێکۆشەری ئەو ڕێبازەی گەیاندوەتە مراز.

کورتە فەرمودە کانی شاهی نەقشبەند، هەم لەبارەی ئیشارات و ئەسراری تەریقەتەوە وەهەم لەبارەی ڕێنمایی و ئیرشادەوە بۆئەوە دەست ئەدات دنیایێکی پێ ڕوون بکرێتەوە.

ئەوەی بیەوێ زیاتر لەم ڕێبازی نەقشبەندی یە بگات وە گەورە پیاوەکانی باشتر بناسێت ئەتوانێ سەیری ئەم کتێبانە بکات.

١ – کتێبی قودسیە کە کەلیماتی بەهائەددینی نەقشبەندە وە ئەحمەدی طاهیری عیراقی، بەزمانی فارسی لەچاپی داوە، باشی ی ئەم کتێبە ئەوەتە دەست نیشان ئەکات بۆ زۆر سەرچاوەی تر.
٢ – ڕیسالەکانی تری شاهی نەقشبەند کە چەنلاپەرەیێ لەمەوبەر ناومان بردون.
٣ – مەکتوباتی ئیمامی ڕەببانی کە زۆرگرنگ وقوڵە.
٤ – نەفەحات ئەل ئونس ی؛ جامی.
٥ – ڕەشەحات عەین‌ول حەیات، «**فخر الدین علي کاشفي**»
٦ – «**انیس الطالبین وعدة السالکین**» ئارشیفی میللی هیند.
٧ – الحدیقه الندّیه في آداب الطریقة النقشبندیة. محمد بن سلیمان البغدادي لەمیصر چاپ‌کراوە.
٨ – حبیب السیر (**خواندمیر**)
٩ – مناهج‌السیر «**ابو الحسن زید المجددي**» (**١٩٥٧**)م لەدهلی لەچاپ دراوە.

١٠ – المواهب السرمدية في مناقب النقشبندية
١١ – تنوير القلوب في معاملة علام الغيوب هەردوكی هی شیخ محمد امین الکردی یه.
١٢ – الحدائق الوردية في اجلاء النقشبندية نوسینی عبد المجيد الخانی.
١٣ – الانوار القدسية في مناقب السادة النقشبندية هی محمد الرخاوی یه؛ كه رِوونوسێكه له (**الحدائق**).
١٤ – اسرار التوحيد في مقامات الشيخ ابو سعيد.
١٥ – رياض المشتاقين نوسینی مەلاحامیدی بێسارانی خەلیفەی شیخ عوسمان سیراجوددین، دەستخەتەو بەفارسی نوسراوە.

نوسەری کتێبی قودسی یه ئەڵێ بەداخەوە ئەوەی سەبارەت بە نەقشبەندی نوسراوە زۆرتری وا لە کتێبخانەکانی ئەوروپاو ئەمریکادا، ناوی رِۆژهەلاّت ناسێك ئەبات ئەڵێ جوانە مەرگێ بوە کە ناوی «**ماریژان موله**» بوە، ئەڵێ ئەم لاوە زۆر لەبارەی نەقشبەندییەوە کۆڵیویەتەوەو نوسیویەتی ئەڵێ لەساڵی (**١٩٦٣**) م دا لە گۆڤاری موطالەعاتی ئیسلامی لەپاریس‌دا سەبارەت بە لێکۆڵینەوەکانی ئەو لاوە مەبەستێك لە چاپ دراوە هەمو شتێکی تیا باس کراوە (.REVUEDES ETUDESISLAMIQUES) من بۆیە ناوی ئەم‌کتێبانەو ئەم مەبەستانەم نوسی ی شایەد لە ئایندەدا جوانەکانمان غیرەت بیانگرێ وە لەو نوسراوانە کەڵك وەرگرن، وە زۆرێك لە نهێنی یه کانیش رِوون کەنەوە.

جارێکی تریش ئەڵێم ئەو کتێبە تازەی قودسی یه نوسینی ئەحمەدی طاهیری عیراقی، لەبارەی ناوبردنی سەرچاوە دیاری کردنەوە سەبارەت بەنەقشبەندیی باشترین مەصدەرە.



# پێشەکی

مەبەست لە نووسینی ئەم بەشە لەگەڵی کتێبی «**تەصەووف چی یە**» دا بێگومان ، چەن شتێ بوو .

یەکەم ئەوەی بڵێم تەصەووف یەکێکە لە هۆ گەورەکانی دەولەمەند کردنی ئەدەبی ئیسلام وە فەرهەنگیی ئیسلامی ی ، چونکو ئەگەر تەصەووف نەبوایە ، ئەم هەموو شۆرە لەکوێ ئەبوو ؟ عیشق هەر عیشقی مەجازی بوو گۆرانی گوتن بەقەدو باڵای ئەو جوانانەدا کە ماوەیەکی سنووردار دڵی مرۆڤ بەخۆیانەوە سەرگەرم ئەکەن وە زۆرجار پاش نیشتنەوەی ئاگری ئارەزووەیان هاتنی پیریی و ، ناشیرین بوونی شێوە ، ئەو ئەوینەش رووەو کزی چوە ، زۆر جاریش ئەو دڵدارانە پاش بەیەکگەیشتن لێك جیا بوونەتەوەو هەریەکێ بە لایەکا چوە .

جا ئەوە لەکوێ و ئەم عیشقە ئەبەدی و پیرۆزە لەکوێ ، کە پیری ، گەشتری ئەکاتەوەو مردن گەرمتری ئەکات ، وە تام و چێژو ، مەزەی ، هەتا دێت زیاتر ئەبێ .

بەکورتی ی ، تەصەووف ، بویە زاخاو دەرو ، جەلا دەری ئیستیعدادو دەروونی خاوەن دڵان ، وە صەدانی وەکو حەللاجی بردە بەر پەت وەقەنارەو ، کەچی تاهات شۆری عیشقیان گەرمتربوو ، هەروەها پیریی ئەو ئاگرە گەشتر ئەکات و خامۆشی ناکات .

ئەوەتە صەدان وەکو رابیعەو ، أبن الفارض و محی الدین عەرەبی و عەبدولقادری گەیلانی و ... لە ناوی عەرەبا ، هەروەها عەططارو سەنائی و مەولانای رۆمی لەناوی فارسەکاندا گەیاندە قەلە پۆپەی شیعری تەصەووف ، وە گەنجینەی ئەدەبی عەرەبی و فارسی پڕکرد لە گەوهەری گرانمایە . جا هەرچەن ، بەشی ئەدەبی کوردیی ، تا ئەورادەیە نەبوە ، بەڵام بێ بەشیش نەبوە تا رادەیەکی زۆر ، هەم موصطەلەحاتی عەرەبی و فارسیی تەصەووفی هاوردە ناوی ئەدەبی کوردی ، هەم برێ موصطەلەحاتی تازە داتاشراو ، هەم برێ لەو موصطەلەحاتە کراونەتە کوردی وە

تائێستەش وان بەسەری زارەوەو ، بەسەری نووکی قەڵەمی نووسەرانەوە . شایەد برێ جار ئەوکەسەی ئەو ووشانە بەکار دێرێ نەزانێ ئەگەر تەصەووف نەبوایە ، ئەو ووشەیە نەئەبوو .

هەرواکە رەوشتی پاك ، وەکو دەس پاکی ی‌و ، چاوپاکی ی ، وەکو ئەدەب ، وەفا ، ئیخلاص ، زوهد ، وە قەناعەت ، وە زۆر خدەی باشیشی رەواج پێ دابێت . جا ئەم باسە هەرچەن خۆی بەشێ نی‌یە لە رێرەوی تەصەووف ، بەڵام بەرهەمێکە لەبەرهەمەکانی ، کەوابوو بە پێویستم زانی ، بەکورتی ، پەنجەیەکی بۆ راکێشم .

بێ‌گومان شیعر هەست دەربرینە ، سەبارەت بەو شتانەی ، کە خاوەن شیعر تیایانا ئەژیت ، ئەوەی لە دەشت‌و صەحرادا ئەژیت شوێنەپێی ژیانی دەشت نشینان ئەوەی لە شاخ‌وکێوا ئەژیت شوێنە واری سوروشتی کێو نشینان یان هەرجۆرە ژیان‌و هەڵسونیشتنێك کە باوبێت ، ئەوشتانە لەشیعری نووسەرا بەدی ئەکرێن ، سا ، یان پیاهەڵدانە ، یان لۆمەو ، توانجە یان هەر جۆرە هەست دەربرینێ .

هەرواش لە هەروڵاتێ ، یان هەر پلەو قۆناغێکی مێژوودا ، برێ‌شت ئەبن بەباو ، وەکو شانازی کردن بە هۆزو تایفەی خۆوە ، توانج گرتن وە سەرزەنش کردنی هۆزەکانی تر ، وەکو بەر لەئیسلام ، لە جەزیرەی عەرەبیدا ، یان مەدح‌کردن و پیاهەڵدانی خەلیفەو سولطان‌و ئەمیرەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا لە سەرەتای ئیسلام بەم‌لاوە ، یان وەکو باسی جوانی ی ئافرەت‌و سوروشت وە هەمو جوانی‌یەك بەدرێژایی مێژوو . یان وەکو باسی رابواردن‌و مەی‌خواردن‌و هەموجۆرە شتێك لەو سەردەمەدا باوبێت ، یان وەکو شیعری سیاسی کەئێستا بوەتە باو وە هەوڵ ئەدەن سەردەمی دەس پێ‌کردن‌و ئاڵا هەڵگری پەیدا بکەن وە تەنانەت توانج ئەگرنە ئەوانەی لەم سەردەمەدا خۆیانی لێ لابدەن ، جا هەر بەم جۆرەش پاش ئەوەی رێرەوی تەصەووف ، بەناوی رێرەوێکی تایبەتی خواپەرستی ی جی‌گیر بوو ، ئەدەبی تایبەتی تەصەووف کەوتە گروگاڵ‌و وردە وردە جێگەی خۆی کردەوە .

بێ‌گومان شیعر بەهرەیەو ، شتێکی خوا داوە وە کەس ناتوانێ بەزۆر ببێتە شاعیر ، جا بەو بۆنەوە خۆ هەموو صۆفیەکیش نەیتوانیوە شیعر بڵێ ، باوەکو ئەوێش هەروەکو هاوکارو هاو ذەوقەکەی خۆی خاوەنی حاڵ‌و وەجد‌و مەقاماتی تەصەووفیش

بوبێت ، هەروا کە هەموو شاعیرێ نەیتوانیوە صوفی بێت‌و خۆی بخاتە ریزی شاعیرە صۆفییە کانەوە ، بۆچی ؟ چونکە لەو جیهانەی ئەوان ناشارەزا وە بێگانە بووە .

کەوابوو ئەدەبی صۆفی ، هەروەکو هەموو ئەدەبێکی تر ، بەشی شیعری هەیەو پەخشان‌و تەئلیف ، واتە کتێب دانان‌و ، کاغەز نووسین‌و هی‌تر وە لە ناوی ئەمانەشا هەبوە لەهیچکام لەم بەهرەو هونەرانەدا دەستی نەبوە ، هەیش بوە لەیەکێ یان لە هەموویانا بەهرەمەند بوە .

جا ، صوفیە عەرەبەکان وە هەروەها فارسەکان یان تورك‌و موسوڵمانە کانی‌تر هەر لە مێژەوە لەم مەیدانەدا هەنگاویان ناوەو ، هەروەکو وتمان صەدانی وەکو رابیعەی عەدەوییە (١٣٥ی‌ك) ، حەللاج‌و ابن الفارض‌و محی الدین عەرەبی‌و عبد القادر گیلانی ، خۆیان نواندوە .

هەر وەکو لەناوی فارسەکانا مەولانا جلال الدین رۆمی ، سنائی ، فرید الدین عطار ، جامی ، حافظ .. وە زۆری‌تر گەنجینەی ئەدەبی تەصەووفیان پڕترو ، دەوڵەمەندتر کردوە .

بێ‌گومان صۆفیە کوردەکانیش یەکێ بوون لەم بەشانە ، بەڵام بەداخەوە کەلێنێکی گەورە کە لە کۆشکی ئەدەبیاتی تەصەووفی ئێمەدا هەیە ، ئەوەتە : تا ، دە قەرنیش کە لە ئیسلام تێ پەڕیوە ، بەو جۆرەی بشێ زمانی کوردی بۆ خوێندنەوەو ، نووسین بەکار نەبراوە ، وە گەورە پیاوانی تەصەووف بەهۆی گرەویدەیی یان بەزمانی قورئان ، هەوڵیان نەداوە بە زمانی خۆیان بنوسن ، بەتایبەت کیانێکی ئەوتۆی دامەزراوو بەردەوامیان نەبوە تاوەکو بیر لەوخاڵەش بکەنەوە هەرچەند باباطاهیر (٤١٠ك - ١٠١٠م) ، تەقریبەن بە شاعیرێکی صۆفی کورد دائەنرێت بەڵام زمانەکەی ئەویش هی بەشێکی کەم بوە لەکوردەکان وە لەنزیکی عەجەمەکانا ، ژیاوە وە لەم ماوەیەدا زۆر دەس‌کاریی شیعرەکانیشی کراوە وە زۆر لەووشە ڕەسەنەکانی لابراون‌و گۆڕاونەتە سەری شێوەی فارسی .

بەکورتی‌ی هەوڵی زۆر دراوە بۆ بەفارسی کردنی شیعرەکانی ، وە تارادیەکی زۆریش ئەو هەوڵە سەری گرتووەو سەر ئەشێوێنێ لە توێژەران ، لەگەڵ ئەوەشا هێمان هەر شێوەی لۆڕی‌یەکە ، چێژی ناوی شیعرەکانی باباطاهیرە ، پاشان جەزیری‌و خانی‌و فەقێ تەیران‌و زۆری‌تر ئەبینین کە بۆنی تەصەووف لەشیعرەکانیانا ، دەماغی خاوەن ذەوقان ئەبزوێنێ‌و ، ئارامی‌ی ئەداتە ویجدانیان . لێرەدایە دووبارە بەداخەوە

سەیر ئەکەین لەوەدەمەدا کە وردە وردە لەم دواییەدا لەناوی ئەردەڵانەکان زمانی هەورامی ئەیەوێ ببێتە زمانی ئەدەب وەپیرەکانی هەورامانیش ئەیکەنە زمانی تەصەووف ووتا رادەیێکی زۆر لەناوی هۆزە تیژرەوە ئایینی یەکان ، وەکو عەلیاللەهییە کانا جیێی خۆی ئەکاتەوەوداثەمەزرێتەو چامەی ئایینی ی پێ ئەوترێ ، شێوەی سۆرانی بەهۆی دەسەڵاتی بابانەکانەوە دێتە مەیدانەوەو خۆی دەرئەخات وە بەرلەوانیش مەلای جزیری‌و خانی‌و فەقێ‌تەیران وە هاوچەرخە کانیان ، ئەمانەش گەشە ئەدەن بەشێوەی کرمانجی ، بەتایبەت لەمەیدانی تەصەووفدا ، قارەمانێکی وەکو جزیری خودنمایی ئەکات وەئیتر زمانە کوردی یە کان کەم کەم هەروەکو ئێستە هەن ، ئەکەونە گەشە کردن‌و خۆپیشاندان‌و جیێی خۆ کردنەوە .

بەداخەوە رۆژ بەرۆژ کەفوکوڵی تەصەووفیش لەناوی کوردەکانا روو ئەکاتە نشێوی‌و لاواز بوون ، دیارە ئەو لاوازی یەش بەو جۆرە نەبووە ،

هەر لە کوتوپرێکا چرای تەصەووف بکوژێتەوە ، بەڵام تازمانەکە وای لێ‌هاتوە ، کتێبێکی پێ بنووسرێت وە گەورە پیاوانی مەیدانی زانیاری سڵیی لێ‌نەکەن‌و لەوە نەترسن ئەوەی ئەینوس لە موستەوایەکی جیهانیدا بەرقەرار ئەمێنێتەوە .

ئیتر تەصەووف دەس ئەکاتە کزی‌و نشێوی ، تەنانەت ئەتوانین حاڵەتێکی **«موخەزرەمی»** لەشیعری برێ لەو شاعیرانەدا ببینین ، کەهەمّ بەعەرەبی وە فارسی شیعریان گوتوە ، هەم بە کوردی ، بەتایبەت لەناوی هەرە گەورە پیاوانی تەصەووفدا ، وەکو حەزرەتی مەولانا خالید ، مەولەوی مەحوی وەزوتر جزیری وەلەپاشان شێخ‌عومەری بیارە ، لەکاتێکا شاعیرە دەس رۆشتوەکانی ئەو خانەدانە وەکو حاجی شیخ عبد الرحمن **«وەفا ، یان ، بولوەفا»** برای شیخ عومەر کە شیعرە فارسی یەکانی شان ئەدات لەشانی بەرزترین شیعری شاعیرە صوفی یەکانی فارس ، کەچی شیعری کوردیی نەبوە .

تا ئەوەی لەم صەدەیەدا ئەبینین شاعیرە کوردەکان چ غەیرە صۆفی وەکو نالی ، یان ، صۆفی وەکو مەولەوی مەحوی لەسۆرانی‌و هەورامی‌دا ، دەس ئەکەنە شیعر بەزمانی خۆ گوتن ، بەڵام لەکرمانجی‌دا ، جزیری‌و فەقێ‌تەیران ، زوتر پێشی ئەوان کەوتون .

جا بەم بۆنەوە ، هەروەکو وتم ، کاتێ کە نووسین بە کوردیی کەم‌کەم دەس ئەکاتە گەشە کردن ، لەو لایشەو بازاڕی تەصەووف کە بەهاتنی مەولانا خالید لە

لایەکەوە ، وە بە هاتنی شیخ مارفی نۆدێ بۆسلێمانی لەولاوە گەیشتبوە قولەپۆپەی بڵاوبوونەوەو پەرەسەندن ، کەم‌کەم دەس ئەکاتە پاشەکشێ ، جا بەو بۆنەوە سەیر ئەکەین تەمەنی شیعری تەصەووفی کوردی زۆر کورتە وە ئەو جۆرەی کە بشێ عومرێکی دریژو بەرهەم داری نەبووە ، وە وەکو رۆلەیەکی زیرەکی خوێنەوارد دێتە پێش‌چاو کە زوو جوانەمەرگ بێت‌و بیێتە داخ بۆ دایك‌و باوك‌و کەس‌و کارەکەی .

بێریە پێش‌چاو ئەگەر مەولانا خالید وە نەقشبەندی‌یەکان وە هەروا بەرزنجی‌یەکان خۆیان‌و نەتەوەو موریدو قوتابیەکانیا بەکوردیی شیعری تەصەووفیان ینووسیایە ، هەر تەنهائەوە خۆی چۆن بازاری شیعری تەصەووفی پر ئەکرد لە کاڵاو کووتاڵ‌و شتی بەنرخ‌و رەنگاورەنگ ، بەڵام گوناهی کەس نی‌یە ، هەر سەردەمەو بابەتی خۆی داخۆ پاش چەن صەدەیەك گلەیی چ بابەتێك لەئێمەش بکرێت کە ئێستە لەبیری ئێمەدا نی‌یەو ریێمان لی‌ی نەکەوتوە .

شایەت بۆ زۆرشت لەم بابەتانەی کەئێستا باوە ، گاڵتەمان پێبکەن‌و توانجو تانەمان تی‌بگرن ، یان دەس خۆشمان بکەن .

بەکورتی‌ی لەگەڵی ئەم هەمووە کەم‌تەمەنیەی‌شیعری تەصەووفی کوردی‌یەدا ، من بۆم ناکرێ لەهەموو گۆشەو کونجو کەلەبەرێکی ئەم مەبەستە بکۆڵمەوە ، چونکی نووسینەکەی من تەنها ناساندی مەبەستەکەیە ، بەناوی بەشێك لە کتێبەکەم «تەصەووف‌چی‌یە» ، جا مادام ، تەصەووف ، یان بەکار بردنی موصطەلەحاتی تەصەووف لە زمانی کوردی‌دا ، بەتایبەت شیعری کوردیدا جۆرە پێوەندێکی بە باسەکەمەوە هەیە ناچاربووم چەن سەرچاوە یەکی شیعری کوردی وەکو «نموونە» هەڵبژێرم کە بریتی بێت لە دیوانی جزیری‌و مەولەوی‌و مەحوی ، وە شیعرەکانی شێخ عومەری بیارە ، تابزانم تا چ‌رادەیە شوێنەواری تەصەووفیان تیایە ، کە ئەوەتا بەچەشنێکی گشتیی دەسیان بۆ رائەکێشم .

بەڵام توێژینەوەی تایبەتیان لەروانگەی تەصەووفەوە پێویستیی بەتێکۆشانێکی تایبەتە ، بەتایبەت دیوانی جزیریی مەزن ، کە لەمەو پاش کەمێ چەن‌و چۆنی هەرکامیان لەروانگەی تەصەووفەوە عەرز ئەکەم ، وە ئێوەی خوێنەواری کوردیش پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبەی من ، وە هەروەها دەس نیشان کردنی ئەو هەموە سەرچاوانە ، بەڵکو بتوانن بە رەنجێکی زۆرو تێکۆشانی پیاوانە ، هەرکامەی لە گۆشەیەکەوە لە شوێنەوارەکان بکۆڵنەوەو شتی تازەش لەکەلەپوری شاراوە دەرخەن .

لێرەدا ، بۆ بەراوردێك ئەڵێم گەورە پیاوێکی وەکو غەززالی «٤٥٠ - ٥٠٥ کوچی»، لە کتێبی «المنقذ من الضلال» دا ، لەکاتێکا دەس‌نشان ئەکات بۆ ئەو کتێبەسەر چاوانەی تەصەووف ، کە خوێندونیەتەوە سەیر ئەکەین ئەویش هەر ئەم سەرچاوانەی خوێندونەتەوە کەئێستا لەبەردەستی ئێوەدان وە منیش کەڵکم لێ وەر گرتون ، ئەویش تەصەووفی لەو سەرچاوانەوەوەرگرتوە ؛ وەکو ، قوتُ القلوب ، اللُّمع،ریسالەی قوشەیری ، هتد .. بێگومان ئەوکاتە بۆ ئەو ، سەرچاوە هەر ئەوانە بوە ؛ بەڵام ئێستا هەم ئەوانەش هەیەو هەم سەرچاوەی زۆری‌تریش .

جا سەرچاوەی تەصەووف ، هەر لەپایانی صەدەی دووهەمی کۆچی‌یەوە بەزمانی عەرەبی ، بەشێوەی کتێب لە بەردەستا بوە ، ئەوانەش یەکێکن لەم سەرچاوانەی کەمن وە هەمو نووسەرێکی تریش تائێستەش بەهرەیان لێ وەر ئەگرن .

بەڵام سەبارەت بەزمانی کوردی ، ئەوەتا ئەم کتێبەی من ؛ ئەبێتە یەکەم کتێبێکی لە چاپ دراوی هەمو لایەن گری تەصەووف ، مەبەست ئەوەتە سەیر کەن لەم بارەیەوە چەندە جێ‌ماوین !!!!!.

مەبەستم ئەوە نی‌یە لە زانیاری‌یە کەیدا جێ ماوین ؛ چونکە هەروەکو وتم ، گەورە پیاوانی تەصەووفی کورد هەروەکو بۆ بابەتی تریش باو نەبوە بۆ تەصەووفیش باو نەبوە ؛ بەکوردی کتێب ، یان شیعر بنوسن ، بەڵکو بەعەرەبی‌و فارسی نوسیویانەو زۆریش نوسراوە .

چەن‌و چۆنی نوسینی شیعرو ئەدەب وەکتێبی تەصەووفی نوسەرانی کورد ئەویش هەر باسێکی ترە ئەمێنێتەوەبۆ برایەکی تر کە بەیارمەتی خوا لە داهاتوودا ؛ رووی کاتەوە ، کە کوردان بە عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی‌ی وە شایەت زمانی‌تریش لەبارەی تەصەووفەوە چی‌یان نووسیوەو ، چ بەرهەمێکیان بوە .

هەروەکو گوتم ، من شیعرەکانی :

١ - جزیری ، ئاخری صەدەی دەهەمی کۆچی‌ی ، واتە «١٠٠٠» ك .

٢ - مەولەوی ، «١٢٢١ - ١٣٠٠ ك» .

٣ - مەحوی «١٨٣٢ - ١٩٠٦» .

٤ - «شێخ عومەر»م‌خوێندنەوە «١٢٥٥ - ١٣١٨ ك» .

وە بۆم دەرکەوت جزیری بەڕاستی شاعیرێکی صۆفی‌یەو خۆیشی گەیشتوەتە مەقامی کەمالْ لە تەصەووفدا ، وەهەمووی دیوانەکە ، یان لە صەدا ، نەوەدی دیوانەکەی تەصەووفە ، سا یان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ تەصەووفە ، یان پاش لێ‌وردبوونەوەی دەر ئەکەوێ باس لە تەصەووف ئەکات ، نەك ڕاستەوخۆ ، بەڵام دیارە باس باسی تەصەووفە ، یان عیشقی مەجازی‌یە ، کە سەری لەتەصەووفەوە دەرچوە ئەمانەش بە دوو جۆرە ، یان لەئاکامی خوێندنەوەدا بۆت ڕوون ئەبێتەوە ، ئەم کەڵەمەردە شێوەیی لە سلوك‌و ڕێڕەوی تەصەووفت بۆ ڕوون ئەکاتەوە پێ ناوبردن لە تەصەووف ،یان هەر بەناو،ناوی تەصەووف ئەبات وە موصطەلەحەکانی ئەکاتە کار ، بەجۆرێك ، کە لەپاشان ئەینوسم .

## مەلای جزیری

**جا سەبارەت بە جزیری مەزن ئەڵێم.**

**١ – ئەوەی بۆم دەرکەوت وە زۆر ڕوونە ئەدەبی صۆفی‌یەکانی ئێران، وەکو حافظو جامی، شوێنەواریان بە ڕووناکی‌ی لە شیعرەکانی جزیری دا دیارە.**

**٢ – موصطەلەحاتەکانی زۆرتری موصطەلەحاتی تەصەووفێکن کە حافظ بەکاری هێناون کە هەروا ئەمیش بەکاری بردوون.**

**٣ – خۆیشی پێی دێت کە گەیشتوەتە کەمال بەلآم شتی‌واش بە دەستەوە نی‌یە کە** (**کامیل‌و موکەمیل**) بووبێت، واتە خانەقاو تەکیەو خەلیفەی بووبێت‌و ئیرشادی‌کردبێت، وەکو مەولانا خالید، یان هەروەکو لە مێژووی ژیانی شێخ‌عومەر وە لەشیعرەکانیا بەدی ئەکرێت.

بەلآم وایش نی‌یە وەکو مەولەوی‌و مەحوی بە دەمی خۆیان سەبارەت بە پێ نەگەیشتووی‌و موحتاج بەمورشید بوون، لە ووتەکانیا بەدی بکرێت، وە لەکاتی باسی هەرکامەدا لەروانگەی تێ‌گەیشتنو هەڵسەنگاندنی خۆمەوە دەس‌نیشان ئەکەم بۆ پایەی هەرکامەیان.

کەواتە رادەو پلە هەیە بۆ شیعری تەصەووف، مەولانای رۆمی (**١٢٠٧ - ١٢٧٣م**) سەر هەڵقەو دامەزرێنەری رێرەوێکی تایبەتی تەصەووفە کە تەریقەتی مەولەوی‌یە....

جا کەسێ پایەی مەعنەوی وابێت کە نموونەی ئەو لەم جیهانەدا نەگاتە بیست سی کەسێ وەخۆی رێبازی تایبەتی تەصەووفی هەبێت وەشاعیرو مەلاچاکیش بێت بێ‌گومان رەمزو کینایەو ئیشاراتی زۆرگرنگ‌و نەناسراوو نهێنی لە شیعرەکانیا بەدی ئەکرێت، هەر وەکو لەشیعری محی الدین عەرەبی‌دا رموزاتی بە جۆرێکی‌تر هەیە کە سەر لە ناشارەزایان ئەشێوێنێ کە بیریان بۆ شتی وەکو وەحدەتی وجوود ئەروات.

یان لەشیعرەکانی شێخ‌عبدالقادری گەیلانیدا کە شابازی ئاسمانی تەصەووفە، خۆی واپیشان ئەدات ناشارەزایان ئەڵێن ئەمە ئەگەر وابێ، دەسەڵاتی بۆ خوا نەهێشتوەتەوە، لەکاتیکا خۆی بەبەندەیەکی زارو موحتاجی قاپی هەق زانیوە، وە پیاوی راستەقینەی خوا بوە، مەبەستم ئەوەتە شیعرەکانی جزیری، هەرچەن هی صۆفی‌یەکی کامیلە، بەلام دیارە کە لە سنووری خۆی بەولاوە نەچوە.

بەلام بەراستی من بۆم دەرکەوت گەورەپیاوێکی تەصەووفە، هەروەها بۆیشم دەرکەوت هەروەکو برێك بۆی چوون، راستە لە عیشقی مەجازی‌یەوە چوە بۆعیشقی حەقیقی، وە ئەوەش زۆرجار لە تەصەووف‌دا روو ئەدات.

ئێمە لەمەوپێش گوتمان، مورید هەیەو موراد هەیە. وە بۆ هەردولا هەیە لەعیشقی مەجازی‌یەوە بگەنە حەقیقی، وە جەزیری لەشیعرەکانی خۆیا شتی‌وای درکاندوە، وەکو ئەوەی کە ئەڵێ.

**عاشق کیێە هانی ژ مەجازی‌بە حەقیقەت**

**صورەت نەشناسی‌و بەمەعنی نە فەناگرت**

**تەنها نە لەمن لامیعی حوسناتە شەفەق‌دا**

**عالەم بەخۆ وی حوسن‌و جەمالی دە خوداگرت**

من گومانم نیە سەر زەنجیرەی تەریقەتە کان هەمویان موراد بوون.

موریدیش دوجۆرن هەیە لەعیشقی مەجازی‌یەوە ئەروات، واتە ئەوینی ئافرەتێك، وای لێ‌ئەکات ئەکەوێتە سەری ئەو لێك دانەوەیە. ئەم جوانی‌یە خودا داویە بەو ئافرەتە، وە هەموو جوانییێك هەر خودا ئەیدات، وردە وردە عاشقی ئەم سەرچاوەی جوانی‌یە ئەبێت کە خودایە،وە روو ئەکاتە عیشقی حەقیقی.

برێکیش دەست ئەکاتە خوا پەرستیو پارێزکاریی و ذیکرو فیکر تا وردە وردە نووری خودا لە دەروونیاندا ئەدرەوشێتەوە.

ئەبێ ئەوەش بزانین ئەوانەی کە بەتەواوی پیٚگەیشتن، وە تەواویی لەطائفیان پاك بووەوە هەرچەن بەرەوالّەت جیسمانین بەلاّم بۆ کارناسانی خۆی ئاشکرایە ئەبنە پارچەیێك لەنوور.

ئەتوانم بۆنمونە دەست‌نیشان بکەم بۆ شیعری برێ لەو عاشقە حەقیقی و مەجازی‌یانە. حافظ ئەڵێت:

الایا ایها الساقی ادر کاسا وناولها

که عشق ئاسان نمود اول ولی افتاد مشکلها

واتە عیشق لەپێشا خۆی ئاسان‌پیشان‌دا بەلاّم لەپاشان پڕبوو لە دەردی سەر، کەواتە لە عیشقە ئاسانە کەوە کەعیشقی مەجازی‌یە دەستی پیٚ کردوە، وە چوە بۆ حەقیقی‌یەکە کە سەختە

بەلاّم شیخ عبد الرحمن کوڕی شیخی‌سیراجەدین ئەڵێت.

عَجَب دَرْ مَنْ‌یَزِیدِ عشق عاشق ازچەرو گفتە

کە عشق ئاسان نمود اول ولی افتاد مشکلها ؟!!

«وفا» عین صفای من شُدەستو باز می‌گوید

الا یاایها الساقی ادر کاساً وناولها.

ئەڵیٚ سەرم سڕماوە چۆن عاشق لە مەزادی عیشقا گوتویەتی، عیشق لەپێشا خۆی ئاسان پیشان‌داو کەچی لەپاشان پڕی‌بو لە دەردی سەری، واتە، ئەبیٚ عاشق حەزبکات لەو دەردی سەری‌یە.

جا ئەڵیٚ، «وەفا» ئەوەتا خۆی یەك پارچە بوەتە صەفای مەی، واتە ئەوەندە مەستی عیشقە، خۆی بوەتە مەی کەچی هەر ئەڵیٚ.

الا یاایها الساقی ادر کاساً وناولها.

ئەگەر لەیادتان بیٚت لەباسی مەقامی بەقای پاشی فەنادا گوتمان

گەورە پیاوانی تەصەووف ئەڵێن ئەوەی «فەنای» تیٚپەرکرد، تازە ئیتر ناگەرێتەوە دواوە، واتە بۆ هەتاهەتایە خۆشەویستی خوایەوە ئەکەونە داخواز لە خوای گەورە،

خوایش نازیان‌ئه‌کێشیێ، هه‌رچی داوابکه‌ن ئه‌یان‌داتیێ، ئه‌وان هه‌ر چی‌یان‌بوه داویانه به‌هه‌ق، دیاره هه‌قیش له‌وان سه‌خی‌تره، هه‌رچی‌یان‌بویێ ئه‌یان‌داتیێ.

جا ئه‌وه‌تا شێخ عبد الرحمن ئه‌ڵێ باوه‌کو من بووم به یه‌کپارچه مه‌ی، هه‌ر ئه‌ڵێم ساقی بۆم تێکه جا ئه‌و مه‌یه، مه‌قام بێ‌یان،ده‌ردی سه‌ر، وه‌کو ئه‌ڵێن ئێش‌بێ،یان، نۆش،مادام لای خۆشه‌ویسته‌وه‌یه هه‌ر خۆشه.

ئه‌ویش مه‌قام پاش‌مه‌قام وه‌لوطف پاش‌لوطف، ئه‌ی‌رژێنێ به‌سه‌ریانا.

نموونه‌یه‌کی تری شیعرێکی جه‌لال‌الدین رۆمی‌یه که‌ئه‌ڵێ **(عشق اَوَّلْ سَرکَشْ‌و خونین بُوَدْ)** واته عیشق هه‌ر له سه‌ره‌تاوه سه‌رکێش‌و خوێناوی‌یه، واته، وه‌کو عیشقه‌که‌ی حافظ نی‌یه له مه‌جازی یه‌وه ده‌ستی پی‌کردبێت که شتێکی ئاره‌زوی نه‌فسی‌و شه‌هوانی بێت.

هه‌ر له‌م باره‌وه له ریساله‌ی قوشه‌یری‌دا ئه‌ڵێ یه‌حیای کوری مه‌عازی رازی «**٢٥٨ ك - ٨٧٤** ز» نوسی‌ی بۆ بایه‌زیدی به‌سطامی «**٢٦١ ك ٨٧٧** ز»، ئه‌ڵێ لای ئێمه ئه‌وه‌ی پێکێك له‌شه‌رابی مه‌حه‌به‌ت بخواته‌وه به‌عومری تینوی نابێت، بایه‌زید له وه‌ڵاما ئه‌ڵێ زۆر سه‌رم سوڕماوه له ناته‌وانی‌یو لاوازیی حاڵت، لێره لای ئێمه هی‌واهه‌یه ئاوی هه‌رچی ده‌ریاکانه هه‌مووی هه‌ڵ‌ئه‌لوشیێتو، هێشتا هه‌ر داوای ئاو ئه‌کات.

هه‌روه‌ها برێ له‌شاعیره صۆفی‌یه‌کان وتوویانه.

عَجِبْتُ لِمَنْ يقولُ : ذَكَرْتُ رَبِّي
فَهل انْسى فاذكر ما نسيت؟
شَرِبتُ الحبَّ كاساً بعد كاس.
فما نَفِدَ الشرابُ ولا رويتُ.

به‌کورتی ئه‌م باسی شه‌رابی عیشقه که له‌شیعری صوفی‌دا هاتوه ده‌ریایێکی بێ‌پایانه، قوشه‌یری ئه‌ڵێت **(غه‌یبه)، واته بێ‌حاڵی‌و بێ‌هۆشی‌ی،که‌م‌ترو سوك‌تره له‌سوکر، واته مه‌ستی، چونکه مه‌ستی، به به‌ره‌که‌ت‌و «وارید»** یێکی زۆر به‌هێز نه‌بێت ده‌ست نادات، ئه‌ڵێ ئه‌گه‌ر «**غه‌یبه**» له خه‌وف‌و ره‌جاوه سه‌رچاوه بگرێت، مه‌ستی،جگه بۆ خاوه‌ن وه‌جده‌کان نه‌بێ ده‌ست نادات. ئه‌مه ده‌ست‌نیشانه بۆ ئه‌م‌باسی مه‌ستی‌و مه‌یی ته‌صه‌ووفه.

لە کتێبی «الرّمز الشعری عند الصوفیە» دا، کەساڵی - ١٩٨٣ - بۆ سێ‌هەم‌جار لە چاپ دراوەتەوە، دوکتور عاطف جودت نصر، بەدرێژی لەم بارەوە باسی کردوە.

ئەوەی کتێبی «ترجمان الاشواق»ی محی الدین عەرەبی بخوێنێتەوە، جا ئەزانێ ئەم گەورە پیاوانە مەبەستیان لە بەکاربردنی ئەم ووشە نەناسراوانە چی‌بووە، وە بەئاسانی‌ی بۆی دەرئەکەوێ مەبەست چی‌یە. «جزیری» زۆر جار لەشیعرەکانیا باسی جوانان ئەکات وە زۆرجاریش بەناوی ئافرەت باسی ئەو جوانانە ئەکات، کەچی ئەڵێت من بە سەگی بەری دەرگات قوبوڵ‌کە ئایا عەقڵ ئەیگرێ «جزیری» بەکچێ بڵێت بە سەگی بەری دەرگات وەرم‌گرە؟!.

ئەمە هی ئەوەتە کە عیشقە حەقیقی‌یە کەی لەو شێوەو قیافەدا تەصەوور ئەکات، یان کە باسی مەیو سەرخۆشی ئەکات،ئایا مەی‌و سەرخۆشی لەگەڵی جزیری عالیمو خوداپەرستا ئەگونجێ؟!.

دیارە ئەو مەیە شەرابی حەقیقەتە کە لە شیعری شاعیرانی عەرەبی وەکو ابن الفارض وە فارسی وەکو حافظ وە هەموی ئەوانی تردا ئەبینرێت.

بەداخەوە شتێ‌هەیەکەقەت روون‌نابێتەوە، ئەویش‌زەنجیرەی مێژووی‌شیعرەکانی «جزیری‌یە» تابزانین‌کام شیعری‌هی‌جوانی‌ی‌و، کامی‌هی‌پیری‌و، کامی‌هی‌سەرەتای‌دەس پی‌کردنی‌تەصەووف‌و، کامی‌هی کاتی‌کامڵ‌بوونیەتی، مەگەرسابەسەلیقەی خۆمان‌بۆی‌بچین ئەویش ناکرێ بەشتێکی دروست‌وبێ چەن‌وچۆن وەرگیرێت.

من لەشیعری «خانی‌ی» ی نەکۆڵیومەتەوە، بەڵام‌بەوجۆرەی دوکتۆر عیزەدین موستەفابۆی‌چوە، (احمدی‌خانی - شاعراً ومفکرا فیلسوفا ومتصوفا).

موصطەلەحاتی تەصەووف لەشیعرەکانیاهەیە، بەڵام‌ئەمەناتوانێ دەری خات‌کەپیرو قەلەندەرێکی تەصەووف بوە بەڵکویشان ئەدات دوورنەبوە لەوجیهانەو، شارەزایی‌هەبوە، جائایاخۆی‌خاوەن دەسەڵات‌بوە؟ هەروا فەقێ تەیرانو، ئەوانی‌تریش.

مەبەست ئەوەتە ئەوەی شارەزاییی لە موصطەلەحاتی تەصەووف دا نەبێ لەو شیعرانە ناگات وەئێستا ئێوە ئەگەر لەتەصەووف هەر ئەم کتێبەی بەر دەستیشتان هەبێت، زۆرشتی‌ی لی‌تێ‌ئەگەن.

بەلاَم بەداخەوە سەبارەت بە جزیری چونکە موصطەلەحاتی فارسیشی زۆر کردوەتەکار، شتی وای هەیە ئێمە باسمان نەکردوە، دەس نیشان بۆ برێکی ئەکەم..

هەر وەکو گوتم مرۆڤ کتێبێکی وەکو (ترجمان الاشواق) نەخوێنێتەوە کە محی الدین عەرەبی خۆی شەرحی لەسەری شیعری خۆی کردوە، نازانێ ئەو هەرەگەورە پیاوانە مەبەستیان لەو ووشە نەئاسراوانەو، لەو رەمزو، ئیشارانە، چی بووە؟.

مەلای جزیری جگە ئەوەش ئەکرێ بەئالاَ هەڵگری شیعری تەصەووفی کوردی دابنرێت، نازانم چۆن بوە بە ئالاَهەڵگری شیعری کلاسیکیش دانەنراوە!!.

چونکە کام کەرەسەی پێویست بۆ کۆشکی شیعری کلاسێك هەیە مەلا دروستکردنی ئەم کۆشکە گەورەیەدا بەکاری نەهێنابێ؟

بەراستی ی ئەگەر بێتو من موصطەلەحاتە صوفی یە بەکارهاوردوەکانی جزیری لێرەدا بنوسمەوە مەگەر دیوانەکەی بنوسمەوە، چونکە بەدەگمەن قەسیدەیێك ئەدۆزیتەوە لەو بەرهەمە بێ بەش بێت، سا یان زۆر یان کەم.

سەبارەت بە بەکارهێنانی موصطەلەحاتی تەصەووفی فارسیش هەم هەموی ئەوانەی سەبارەت بەجزیری نوسیویانە، وەکو زفنگیو هەژار موکوریانی هەروەها جزیری خۆیشی پیشانی ئەدەن کە حافظو، سەعدیو، جامی ی، کاریان کردوەتە سەری جزیری وە لە شیعرەکانیا بەئاشکرا باسیان ئەکات.

سەبارەت بە موصطەلەحاتی حافظ سەیرئەکەین ئەم موصطەلەحاتە بەکاربراون.

خەرقەی زەرق، خەراباتی موغان، مەدەدو رۆحی (فیض القدس) پیری موغان، موهیمی غەیبی ی، میحرابی دوعا «لەباتی ئەبرو» صوفی خەلوەت نشین، پیری عیشق، خانەی خەممار، موغ بەچە، مەی فرۆش، خەرابات، طامات، قولزم دەری مەیخانە جام، شاهید، جامی جیهانبین، جامی جەم جەمو، ئەسکەندەر، مولکی عیشق، خەرقە، جەذبەی دڵ، عاشق سوختە، سیاەچردە، پیری طەریق، خسروخوبان، ئەطوارعیشقو مەستی ی، عەیبی رەندان مەکە، سەرچەشمەی ئاوی حەیوانی حەقیقەت، مەسئەلەگۆ، وە هی تر، شایەد ئێستە برێ لەم ووشانە بۆ ئێوە ناسراو بن، بەلاَم کاتێ ئەبینین ساڵهای ساڵ بەر لەجزیری تەنانەت بەر لەشاعیرو صۆفی یە فارسەکانی تریش حافظ یەکەم کەسە زۆرێك لەم موصطەلەحاتەی خستوەتە جیهانی شیعرەوەو جیهانی تەصەووفەوە، دەرئەکەوێ ئەوەی پاش ئەو بەکاری بردبێت لەوەوە

وەری گرتوە هەروەکو موصطەلەحاتی عەرەبی تەصەووف هەرکەسەو کەرەسەیێکی لیٚ زیادکردوە تابوەتە ئەم جیهانە بەربڵاوەی ئیستە. جزیری زۆرێك لەو موصطەلەحاتەی کردونەتە کوردی،یان خۆی شتی تازەی بەکوردی گوتوە،ئەویش لەویدا ئەبێتە پێشەنگ.

جزیری بریٚجار دەق بەدەق شیعری حافظی هاوردوە وەکردویە بەکوردی، حافظ «٧٢٦ - ٧٩٢ ك». جزیری ئەڵێت.

عەنقا نەشکارا کەسە داڤان تو چین‌ڤەر
داڤا کۆ لەعەنقا تۆ ڤەدی بادی هەواگرت.

ئەڵیٚ باڵداری عەنقا «**باڵندەیێکی خەیاڵییە**»، کەس ناتوانیٚ بیخاتە داوی خۆیەوەو بیٚ‌گرێت کەواتە داوەکەت لابە، چونکە هـ‌حت دەست‌نا کەویٚ. دیوانی «**زفنگی**».

**حافظ دەق بەدەق ئەم‌شیعرە، گوتویەتی.**

**برو این‌دام برمرغ دگرنه**
**که عنقارا بلنداست ئاشیانه**
**برۆ ئەو داوەت بنێرەوە بۆباڵدارێکی‌تر**
**چونکە عەنقا هیلانە بەرزەو بەتۆ ناگیرێت**

**جەزیری هەر لەو پارچە شیعرەدا ئەڵێت.**

**ئەو کەبکی خەرامان کو دکوزی لی قەبوهات**
**شاهین قەضایی بەتەغافول ژخوە راگرت**

**حافظ گوتویەتی:**

**دیدی آن قهقهۀ کبك خرامان حافظ**
**که زسر پنجۀ شاهین قضا غافل بود!**

**واتای هەردو شیعرەکە ئەوەتە چاوت لەوکەوە جوانەبو بۆخۆی ئەی‌خوێند، وە ئاگای لە تەقدیر نەبو، کەچی شاهینی قەزا لە کوتوپڕا دای بەسەریاو بردی.**

**جزیری ئەڵیٚ:**

**شەربەتا وی جاموطاسی یارکو تیٚ‌بێت ئینعیکاس**
**بێت مەژی فەیضەك ژکاسیٚ ئابی‌حەیوان ئەوبخویە**

حافظ ئەڵێ:

ما درپیاله عکس رخ یار دیده‌ایم
أی بی‌خبر ز لذّت شُربِ مُدام ما

مەبەست لەهەردو شیعر ئەوەتە ئەم شەرابەی ئێمە شەرابێکە کەوینەی روەقی یاری تێدایە کەواتە جگە خۆمان کەس نازانێ چ جۆرە بادەیێکە.

مەلا ئەڵێ:

تۆ بنێ ماهی نەوو دەستی قەضایی هەی‌هەی
نە لەزەرعی فەلەکی بەلکە لعومری مە ب داس

حافظ ئەڵی:

مزرع سبز فلك دیدم‌و داس مه نو
یادم ازکشته خویش ئامدو هنگام درو

جزیری ئەڵێ:

مەست‌و هۆشیار هەمە کەچ کولەهن رەقص‌وسەماتین
ئەز نەزانم چ نەسەق کەیفە نەزانم چ شەرابە

حافظ گوتویە:

چه ره بود این‌که زد در پرده مطرب
که می‌رقصند باهم مست‌و هوشیار

مەبەستم ئەوەتە جزیری بەرادەیێك شارەزایی هەبوە لەتەصەووف‌دا هەروا کە موصطەلەحاتی عەرەبی تەصەووفی بەکار بردوە هەروەهایش موصطەلەحاتی فارسیشی بەکار هانیوە، کەواتە لەهەردولا شارەزابوە.

جا هەرچەن فەریدەدینی عەتتار وجەلالەددینی رومی «مەولەوی» ئەکەونە پێشی حافظ‌و جامی‌ی، بەڵام موصطەلەحاتی حافظ بۆ شارەزایانی خۆی ئەکرێت لەوانی‌تر جوێ بکرێتەوە، کەبریتین لەمانەی جزیری بەکاری بردون، بێگومان جزیری پاش دان‌نان بە گەورەیی حافظ‌دا ئەڵێ «ئێوەی کورد» کە من‌تان هەم چ پێویستتانە بەحافظ.

گەر لوئلوئی مەنثور ژ نەظمی تۆ دخوازی
وەرە شیعری مەلی بینە،تە ب شیرازێ چحاجەت

بەشێوەیێکی تێکرایی موصطەلەحاتی هەمە جۆرەی تەصەووف لەدیوانی جزیری‌دا هەر دوایی نایێت وە هەموی چەندین جار دوبارە کراونەتەوە.

وەکو شیخ، زاهید، صۆفی، وەحدەتی وجود، وەحدەتی موطلەق، جەبەرووت، موشاهەدە، رەفعی حیجاب، ویرد، ئەوراد، مورشید، سولوك، ویلایەت، ژەنگی دڵ، قیدەم حودوث، تەنزیە، قەلب، لامیع، شاهی موڵکی دڵبەری، جاذیبە، ئیرشاد، عاریف، فەنا، بەقا، ساقی، ئەزەل، قەدەح، بادە، مەدەد، فەیض، جەوهەر، عونصور، **(استقص)**، ئیشراق، حال، قال، پەرهێزی‌دڵ، تەقوا، لائح، مورید، موراد، هاوهو، کەشف‌و شوهود لاهوت، ئەسرار، ئەنوار، ئیمەی دەرویش، «**مەدەدرویشان**» عیلمی ئەهلی‌حاڵ، جەلال، جەمال، مەحو، ناروجەذبە، خەلوە، شەککو یەقین، ذیکر، مەقاماتی طەریق.

ئەمانەو دەیان موصطەلەحی‌تر، ئەمە جگە ئەو شێوانەی کە تێکرای شێوەکە دەست کێشانە بۆمەقامیٚ یان حاڵیٚ لەحاڵ‌و مەقامی تەصەووف.

من لێرەدا سەبارەت بەو موصطەلەحاتە نامەویٚ پەنجە راکێشم بۆلاپەرەو شوێنی یەکە یەکەی ئەمانە چونکە هەرکامەیان دەیان‌جار دووبارە کراونەتەوە دووهەم ئەم نووسینەی من توێژینەوە لەشیعری تەصەووفی جزیری نی‌یە، تەنها مەبەست ئەوەتە بڵێم بەم ناوو نیشانانە، تەصەووف کاری کردوەتە سەری شیعری کوردیی کە لەوانە شیعری جزیری‌و ئەوانی ترە وە بۆ نمونەش ئەوەتا بریٚ لەو شیعرانەی کە دیارە باس باسی تەصەووفە.

مەلای جزیری لەم هۆنراوەدا زۆرباش پیشان ئەدات کەچۆن بەهۆی «**تەوەججوە**» وە یارمەتی مەعنەوی مورشیدیەوە گەیشتوەتە مرازو ژەنگی دڵی پاك بوەتەوەو ئەو دڵە مسەی ئەو،بەهۆی نەظەری مورشیدیەوە کە وەکو ئیکسیر وایە بوەتە زێری پاك، «**ووشەی ئیکسیر لەبازاری تەصەووف دا هەمیشە بەواتای لوطفی مورشید بەکاربراوە**).

ئیکسیر گوایا ماددەیێکی کیمیائی‌یە کە ئەگەر بیدەی لەمس ئەیکات بەزێر. جا ئەڵیٚ:

قەلبیٚ مە شوبهی زێر ژ فەیضاتە جەلا گرت
ما رووو سیەهو صیفر صیفەت رەنگی صەفا گرت

ئەڵێ : دڵی ئێمە کە وەکو مسی ژەنگاویی بو، واتە بەهۆی گوناهەوە ژەنگ گرتبوی، **«کَلاَّ بَلْ رانَ عَلَى قُلوبِهِم» «١٤» «المطففين»**. ئەودڵەم بەهۆی ئاوردانەوە، **«تەوەججوە»** ی تۆوە بویە زێڕی پاك.

واتە دڵی منی رووڕەش بەهۆی فەیضی بەرەکەتی تۆوە بویە زێڕ.
تەشبیه ب جەدوەل مە دنیڤ ئاتەشی عیشقێ
دلێ قەڵبی حەقیقەت بت‌و ئیکسیری هەما گرت

ئەڵێ، وەکو جۆگەلەیێکی ناوی ئاگر وام، یان ئەڵێ وەکو پرگارێکی ناوی ئاگری عیشق وام، ئەم ئاگری عیشقە وای سوتاندومو تواندومیەتەوە کە گۆڕاومی، بەجۆرێ کە حەقیقەتە پێشوەکەی گۆڕیوم وە کردومیەتە شتێکی‌تر، واتە بوینەتە مەردی مەیدانی خودا ناسی‌ی، وە حەقیقەتە قەڵبە دەرد نەخواردوەکەی جارانم بوەتە حەقیقەتێکی بەکەڵك وە دەردبخۆر.

بێگومان ئاگر زۆرجار قەلبی ماددە ئەکات بەشتێکی تازە، بەجۆرێ کەئیتر ناگەڕێتەوە بۆ حاڵەکەی لەوەو پێش، وەکو ئەوەی کە دار ئەکات بە خەڵووز یان بە ئاگر کە هەرگیز نابێتەوە بەدار.

جا، مەلا، خۆ بە لەشولار هەر هەمان مەلایە ئەوەی کە گۆڕاوە بێ‌گومان حەقیقەتە مەعنەویی‌یەکەیەتی، بەچی‌گۆڕاوە؟ بە ئاگری عیشق کە وەکو ئیکسیر وایە، ئەگەر بیدەی لەمس ئەیکات بەزێڕ.

بو بەچی ؟ بو بە زێڕی پاڵاوتەکراوی پاك ، تەصەووف چی‌یە لەمەزیاتر ، ەصەووف ئەوەتە دەروون لەپێناسی ناپەسەند پاك ئەکاتەوە وە ئەی‌ڕازێنێتەوە بە ێناسی پەسەند ، ئەم کارە کەی ئەکرێت ؟ پاش سوتان لە ئاگری عیشقی خوادا . ەڵێ :

سالیك کی‌یە هاتی ژمەجازیی ب حەقیقەت
صورەت نەشناسی‌یو بەمەعنی نەفەناگرت

ڕاتە ، ئەو ڕێبواری ڕیگەی تەصەووفە کێیە لەعیشقی مەجازی یەوە گەیشتبی ەعیشقی حەقیقی ، وە لە هەموشتێکی ئەم جیهانی تەصەووفە تێنەگەیشتبێت وە لە صورەت‌و مەعنای مرۆڤ نەگەیشتبێت وە نەگەیشتبێتە فەنا .

واته هەرکەسێ لەسلوکی ڕێگای تەصەووف دا واتە ڕیگای عیشقی خودایی دا لەعیشقی مەجازی یەوە هاتبێ بۆ حەقیقی ی لە هەموشتێ ئەگات هەم لە ڕەواڵەت «**صورەت**» وە هەم لەنهێنی ی «**مەعنا**» ، وە ئەیشگاتە فەنا ، کە لەپاش هەموی ئەو پایانە دێت .

زفنگی و هەژاریش بۆی چوون ، هەر یەکەی بەجۆرێ بەلاّم هەموی لەیەکەوە نزیکەو تی'ی گەیشتون .

تەنها نەلێن لامیعی حوسناتە شەفەق دا

عالەم بخوە وێ حوسن و جەمالێ دخوە داگرت

ئەڵێ وەنەبێ ئەم ڕوناکی ی جوانی ی تۆیە تەنها لە دەرونی مندا درەوشابێتەوە بەڵکو هەرچی جوانی ی وا لەم جیهانەدا هەموی لە جوانی ی تۆوە یەو ، لە ڕووناکی ی تۆوە دنیا ڕوناکە .

تەیغونْ ددەستی تە زەهی دەوڵەت و ئیقبالێ

سوێسکە ، یانْ هەر باڵدارێکی بێ ئازارو بێدەست ، مادام بکەوێتە ناوی داوی تۆوەو بگاتە دەستی تۆ ئەوە شانسێکی گەورەیە ، بەجۆرێك ئەبێتە «**هوما**» یێك بۆخۆی .

هوما : باڵندەیێکە کە بەرەمزی پیرۆزی و خۆش بەختی دای ئەنێن .

ئەمەش هەر دەست نیشانە بۆئەوەی مورشید ئەتوانێ مورید بگورێت وە خاوێنی کاتەوە هەروەکو لەباسی ئیکسیرەکەدا گوتمان ، لێرەشا ئەڵێ سوێسکەی زەبون ئەگەر بکەوێتە داوی تۆوە ئەبێتە هوما .

ووشەی قەلب و قەڵب و ئەمانەش جیناسەو ووردەکاری شیعری یشی تیایە .

جانێ خوە مەکر دانەیی داڤا کو ڤە دایی

ئاهو صیفەت ئەو پی'حەسیا ڕاهی خەطا گرت

ئەڵێ : منیش ئامادەبوم گیانی خۆم بدەم ، بەو مەرجە ببمە نێچیری تۆ ، واتە ، بۆ ئەوەی وەکو باڵندە بێچارەکە ، کە لەداوی تۆدا بوبویە هوما ، منیش ئاوا ئامادەبوم گیانم بخەمە مەترسی یەوەو بکەومە داوتەوە ، بەلاّم بەو نیازەت زانی و لات داو بۆی دەرچوی . واتە چۆن ئاسکێك لە داویك سلّ بکات ئەو لەم دانەی منە کە گیانم بێت سلی کرد .

عەنقا نەشکارا کەسە داڤان تۆ بچین ڤەر
داڤا کو لعەنقا توڤەدی بادی هەوا گرت

ئەڵێ : تۆ بە هەڵەدا چویت کە ویستوتە گیانی خۆت بدەیت بەو مەرجەی ئەوت دەست کەوێ ، ئەو وەکو عەنقا وایە هەروا بەگاڵتە نابێت بەداوەوە واتە ، گیان هەر هیچ نیە بۆ گەیشتن بەو مرازەو بەو سەعادەتە کە بریتی یە لە گۆرانی **(ماهی یەت)** وە لابردنی بەشی حەیوانی ی ئینسان ، وە دەرخستنی بەشە ئینسانی یەکەی وە بونی بە مرۆڤێکی رۆحانی و مەلائکی ی. ئەڵێ:

هەرکەس سەحەری طالبی تشتەك ب چەمەن هات
هن سوسن و هن سونبول و هن زولفی دوتاگرت

واتە ، ئەو خەڵکەی سبەینێ زوو روبان کردە ناوی باغ و چەمەن ، هەرکامەی خوازیاری شتێ بون ، هەرکەسەو شانسی خۆی ، هی وای بو گوڵی دەست کەوت و هی وایشی بو خاوەن گوڵ ، کە فەرقیان زۆرە .

ئەمەش هەر ئەچێتەوە سەری باسی داوەکە واتە مەیلی خودا خۆیەتی ، هەموی هەر ئەرۆن بۆباغ بۆ بەهرەمەندبون لە بەرهەمە جۆراو جۆرە کانی ، کەچی هی وایان هەیە زوڵفی یاری دێ بەدەستەوەو هەتا هەتایە کامەرانە ، هی وایش هەیە تەنها گوڵێکی دەست کەوت ئەبێت کە هەر تاوێکەو ئەبڕێتەوە . «**ذلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يشاء**» .

جا ئەڵێ : سەحەرێکیان منیش وەکو ئەم خەڵکە چومە ناوی باغ بەهەزار ئارەزووەوە .

دەستی مە سەحەر گرت و برین سەیری حەبیبی
فی الحال رەقیبی ژ حەسەد لەرزەووتا گرت .

ئەڵێ ، من لە خوشبەختە کانم چونکە کاتێ چومە ناوی باغ ، خۆشەویست هات و دەستی گرتم و بردمی بۆ گەڕان بەوناوی باغەدا رەقیبیش هەر کە ئەمەی دی ئەوەندەی پێ ناخۆش بو دوچاری تاولەرز بو .

لێرەدا دوو مەبەست هەیە ئەمەوێ دەسیان بۆ راکێشم یەکێکی سەبارەت بە ووشەی «**رەقیب**» کە زۆر جار لەشیعری کۆنی فارسیداو هەروا لە شیعری کوردیشا هاتوە ، زۆرکەس وای تێ ئەگات رەقیب ئەوکەسەتە ، ئەویش وەکو تۆ خوازیاری

ئەو یارەو ئەو جوانەیە ، جا چونکە لە تەکی تۆدا رقەبەریٚ ئەکات ، دوشمنی تۆیە ، لەکاتێکا شتەکە وا نیە ، بەڵکو ئەوەتە، جاران،بەتایبەت لەناوی میرزادەو شازادەو گەورە ماڵەکاندا باوبوە کە کەسێکیان کردوەتە ، **(مەغور)** پیٚ سپێرراوی چاودێری کردنو پاراستنی کچان تەنانەت هی کورانیش ، **«لەلە»** یش هەر شتێکە لەو بابەتە ، کە هەم ئاگای لەو کیژانە بوە وە هەم فێری رەوشی بەرزی کردون وە هەم لە کاتی مەترسیدا گیانی پاراستوون، جا ئەم چاودێری کارانە زۆرجار بونەتە موی لوتی کیژان وە رێگەی جموجوڵیان لیٚبریون ، جاری وایش بوە لەرێگەی ئەوانەوە سکالاٚی خۆش ویستن وە ئەوین دراوە بە خۆشەویستان ، جا ئەگەر ئەو **«موراقیب»ە** ناوچاو درژو بەد رەفتار بو بێت وا بوەتە کوسپ بۆ هەمو جموجوڵێکی ئەو کیژانە .

کەواتە ئەم رەقیبە لە چاودێری کردنەوە هاتوە نەك لە مونافەسەو رقەبەریٚ کردنەوە .

لێرەدا مەبەستی جزیری نەمر،لە رەقیب نەفسو شەیتان،وە یان هەستی پێچەوانەی خودا پەرستیو خوداناسی‌یە ، مەبەست لە هەموی ئەم باسە ئەوەتە جزیری پیشان ئەدات خۆی موراد بوە ، لەبەرئەوە خۆشەویست خۆی فەیضی رژاندوە بەسەریا واتە نوری خودا تەجەللای کردوە لەدڵیاو ئەکسیری داوە لە مسی دەرونی ، وە لەکاتێکا ئەم عاشقێکی مەجازیی بوە خودا خۆی ئەمی راکێشاوە بۆناوی عیشقی حەقیقی .

شیعری پاش ئەویش هەر ئەوە ئەگەیێنیٚ ئەڵیٚ ، چاوت لیٚبو ئەو کەوە بیٚچارە کە ئاگای لەم دنیایە نەبو وە بۆخۆی قاقای لیٚئەداو رای ئەبواردو سەرگەرمی عیشقی مەجازیی بو ، چۆن شاهینی قەدەر هاتو فراندیو بردی .

لەولاوە گوێی هی‌واهەیە گیانی ئەکاتە دانە بۆئەوەی بێن شکاری بکەن وە ببەن ...!!!! بۆچی ..؟ چونکە ئەوەی ئەو یارە شکاری بکات لە تەیهو ، واتە ، سوێسکەوە ئەبێتە هوما،کەچی یار وەکو ئاسکی رەمیدە ئەدا بەلایاو نایەویٚو شکاری ناکات باوەکو ئامادەیش بێت گیانی پێش کەش کات ، بەڵاٚم کەیار خۆی ویستی،باوەکو ئەم هەر بەتەمایش نەبوە دێت قۆڵیٚ ئەکا بە قوڵیاو ئەیبات ، چاودێری کەریش باهەر شەق بەرێت .

تەشبیهێکی تری ئەوەتە ئەڵیٚ ، ئەو کەوە باوەکو ئاگای لەهیچ نەبو خۆی بۆ تیاچون ئامادە نەکردبو،لەولای لابەلاوە شاهین هاتو بە ئارەزوی خۆی شکاری

کرد ، مەبەستی ئەوەتە بلێ مادام کەوتبێتە داوی ئەو خۆشەویستە خۆشبەختەو هوما مانەندە ، ئەمەش دەست نیشانە بۆ ئەودڵە بێهەوالانەی کە ئاگایان لەدنیا نیەو شکار ئەکرێن وە گرفتاری ئەوینێك ئەبن کە هەرگیز بیریان لێ نەکردوەتەوە جا ئایا ئەوینی مەجازیی ، یان حەقیقی ی .

ئەوەتا ئەڵێ :

لەو کەبکی خەرامان کو د کۆزێ ل قەبوهات
شاهینی قەضایێ ب تەغافول ژ خوە راگرت
زینهارکەسی دەست ببت ئەرقەمی سەروێ
بێ عیشوەیی لەعلان نە ب تەسلیم ژهاگرت

ئەڵێ ، خۆ ئەمە بەزۆر نیە «زینهار» ئامان صەد ئامان ، نەکەی ئەوەندە بێئەدەب بیت بتەوێ بەبێ ئیجازەو بەبێ ویستی خۆشەویست دەست ببەی بۆ دوو پەلکەی یار ، لەولاوە گوتمان ، ئەرۆنە ناوی باخ هیوای هەیە زولفی یار دێت بەدەستیەوە بەلام خۆیشی گوتی یارخۆی بەئارەزوی خۆی هاتو قوڵی کرد بەقوڵا ، جا ئەڵێ ئەمە بەزۆر نابێت وە نابێ لە مەیدانی ئەدەب برۆیتە دەرەوە وە وابزانیت خۆت ئەتوانی بگەیت بە مراز ، نە بەداوانانەوەو گیان بەخشینە ، وە نە بەزۆرە بەڵکو بە ئەدەب کردن ، وە رەویەو رەوش زانینە ، جا ئەڵێ ئەگەر بەبێپرس وە بەتەرکی ئەدەب دەستبەریت بۆ پەلکەی ئەو بالا سەروە ، ئەو پەلکانەی وەکو ماری ژەهراویی ئەدەن بە دەستتەوەو سەرو گیانیشت تیائەچێت ، لێرەدا رێبوار ئەڵێ ، باشە چارە چییە ؟ ئامادەبوم گیانم بکەم بەدانەو بیخەمە سەری رێگای ئەو ، نەیخواردو بەلایا تێپەری ، چومە باغیش لای لێنەکردمەوە ، خۆیشم دەستبەرم وەکومار بدات بەدەستمەوە ، کەواتە چارەم چیبێت ؟ ئایا دەست هەڵگرم ؟ .

ئەڵێ ... ناء ... بەڵکو تۆ هەر لەسەری ئەدەبو تێکۆشانو هەوڵی خۆت بەردەوامبەو صەبر بکەرە پیشەی خۆت ، ئەوەی صەبری کرد ، هەرچەن صەبر تاڵە بەلام بەرهەمەکەی شیرینەو رۆژێ ئەبێت بەمرازبگات ، زووتر گوتمان صەبر یەکێکە لە قۆناغە هەرە گەورەکانی تەصەووف هەرکەس بەو قۆناغەدا تێنەپەرێ لەبازاری تەصەووفدا هیچی بەهیچ نابێت ، مەگەر موارد وە مەجذوب بێت .

ئەمەش دەست راکێشانە بۆ مەقامی صەبر ، وە مەبەستی ئەوەتە بڵێت ئەی موریدێك کەتۆ وەکومن موارد نەبویت کەیار خۆی دەست کات بەقۆلتاو بتبات ،

تۆیش ئەگەر لەسەری موریدی‌یەکەت بەردەوام بویت وە صەبرت کرد ئاخرەکەی تۆیش ئەگەیتە مراز .

حافظ ، سەبارەت بەم بەرهەمی صەبر کردنە دوو شیعری جوانی‌هەیە ، ئەڵێ :

آنکه رُخسار تُرا رنگِ گلو نسرین داد
صبرو آرام تَوانَدْ بمَنِ مسکین داد

واتە ، ئەوەی ئەو ڕومەتە جوانەی داوە بەتۆ ئەتوانێ صەبرو ئارامیش بداتە منی بیچارە .

یان ئەڵێ :

این همه شَهدوشَکَرِکزْ سُخَنَم می‌ریزد
اَجرِ صبری‌است که زان شاخ نباتم دادند .

ئەڵێ ، ئەم هەموە شەهدو شەکرەی کە لەوتاری من ئەڕژێت ، پاداشی صەبرێکە ئالەو نەباتە دراومەتێ .

ئەمانەش هەر تەصەووفەو هەر هەمان قۆناغی صەبرە .

جەزیری مەزنیش چەن شیعرێك لە ئاخرا ئەفەرمێ .

شیعراتە مەلا سیحری شەکەر ڕێژە بە موعجیز
زانم ژ لەبی لەعل ، تە ، ئەڤ لەفظ ئەداکرد .

واتە ، مەلا ئەم شەکرەی کە لەشیعری سیحراویی تۆ ئەبارێت ، هی خۆت‌نیە ، یان لەخۆتەوە نیە بەڵکو هی ئەو لێوە ئالأنەی یارە کە لەزمانی تۆوە هەڵ‌ئەوەرێن ، هەروەکو حافظ گوتی ، هی‌خۆم نیەو هی ئەو نەباتەیە .

لێرەدا هەردوکیان ئەڵێن خودا ئێمەی هانیوەتە گوفتار وە بەهۆی لوطف‌و فەیضی خوایی‌یەوە ، ئاوا گۆڕاوین وە بنیادەمەکەی جاران نین ، بەڵکو بوینەتە زێری پاكو بوینەتە شەکرو هەمو شیرینی‌و جوانی‌یێکمان دەست کەوتوە .

ئەم جۆرە شیعرانەی جزیری بابەتێکن لەتەکی ئەوەشا یەکپارچە تەصەووفە ، ڕاستەوخۆ باسی تەصەووف ناکات بەڵکو بەئیشارەو بە کینایە ئەی‌گەیێنێ ، بەلأم بۆ شارەزایان زۆرباش ڕوونە کە تەصەووفە ، هەروا کەتۆزێ شیمان کردەوە .

ئیستە دەست ئەکێشین بۆ برێ لەو شیعرانە کە ڕاستەوخۆ تەصەووفە ، وەکو :

پیری موغان ژ شیشەیێ دامە سەفینەکێ مەیێ
شوکری خودێ کو قولزمەك من ژخوەرا قەبالەکر .
خضری بەمزو موعجیزێ مەستیمە دی ددینگزی
هات پیالەیێك ددەست ئەشکەرە صەد پیالەکر .

پیری تەریقەت لە شیشەیێکا واتە لەدڵی خۆی جامێکی گەورە کە بەئەندازەی گەمی‌یێك ئەبو شەرابی عیشقی خۆی دەرخوارد دام .

واتە پیری تەریقەت روی دڵی تێ‌کردم وە دەرونمی پڕکرد لە نورو بەرەکەت ، کەواتە شوکور بۆ خودا کە منیش توانیم بەشی‌خۆم وەرگرم ، بەشێك ئەوەندە زۆرە کە بەقەدەری دەریایێکە ، واتە منیش بومە خاوەنی مەڵبەندو دەریا .

شیعری دووەمی ئەڵێت ، ئەو خضرە خاوەن رەمزو موعجیزەیە کەدی من وا مەستی بادەی پیری تەریقەتم وە ڕمەتە خاوەنی دەریاو مەڵبەند ، ئەویش نەك پیاڵەیێك صەد پیاڵەی بۆ تێ‌کردم .

بێ‌گومان ئەگەر مەبەست لەپیری پێشو مورشید بێت مەبەست لەم خضرە پێغەمبەرە ، درودی خوای‌لەسەر واتە ئەویش بە بچوکی خۆی وەری گرتم .

هەروەکو لە پێشا گوتم ئەگەر بێتو بەوردیێ لەدیوانی جەزیریێ بکۆڵینەوە باوڕم وایە تاکە قەصیدەیێك پەیدا ناکەین ئیشارەیێکی بۆ تەصەووف تیانەبێت قەصیدەی وایشی هەیە وەکو ئەمەی کەپاش ئەم چەند ووشەیە دێت سەرپاك فەلسەفەی وجودەو تەوحیدەو تەصەووفە . وەکو کە ئەڵێت .

هێ دبەر (**قالوبلی**) بێ بەڵکو ئەڤ عالەم نەبو
چەرخو دەوراندەوری گەردون گونبەدی مینا نەبو .

واتە ، هێشتا ئەم جیهانە دروس نەکرابو ، یان بەر لە بەدی‌هاتنی ئەم‌جیهانە وە بەر لە قالوابلی ، واتە بەر لەدروس‌بونی ئەرواح کە خوا لێ‌یانی پرسی (**اَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قالوابَلیٰ**) ، ئەوانیش گوتیان (**بَلَیٰ**) ، واتە بەرێ‌والله تۆ رەبی ئێمەی . (**اَعراف**) (**١٧١**) .

عەرش‌و کورسی‌ی هێژ دمەخفی‌بون دکەنزا قودرەتێ
حوسنی حەق بو ئستوائی لامعا عشقێ هەبو .

واتە هێشتا عەرش‌وکورسی لەپشتی پەردەی غەیبەوە بون ، بەلاّم جوانی‌ی هەق وە تیشکی عیشقی حەقیقی‌ی ئەوکاتەش هەربوەو وەکو ئیستە وابوە .

نەهتبون حوکمی صیفاتان ئەو ژذاتی «لَمْ یَزَلْ»
عاشق‌و مەعشوق یەك‌بون شەمع‌و هەم پەروانەبو .

جوانی‌و ئەوین قەدیمن وە لێك جویٚ نەبون بەلاّم پاش بەدی‌هاتنی ئەم‌جیهانە ، واتە «**حادیث**» ئەوانیش کە پەیوەندیان پەیدا کرد بە حەوادیثەوە ، واتە ، تازە بەدی‌هاتەکانەوە ، ناچار لێك جویٚ بونەوە وەئەمەش ویستی‌خودابو .

یەك د ذاتی سور شرینان بۆ جەمال‌و حوسن‌و سور
یەك د قەلبیٚ ئەهلی‌دلٚ نارو جەلال‌و جەذبە بو .

ئەلٚیٚ جا پاش دەرکەوتنی جیهان وە پاش ئەوەی ئەو صیفەتانە لێك جویٚ بونەوە ، جوانی‌یەکە بویە هی جوانان وە لەواندا درەوشایەوە ، وە عیشق‌و ئەوین‌و خۆشەویستیش بویە ئاگرو (**جەذبە**) و کەوتە دلٚی ئەوین‌داران‌و عاشقانەوە .

عاشق‌ومەعشوق «**الحق**» هەردو مرئاتی یەکن
لەو د ئەصلیٚ جەمع دا ئەصلی قەدیم ئاینەبو .

کەواتە ئەم عاشق‌ومەعشوقە کە لە بناغەدا هەردوکی یەکی‌بوەو لێك جویٚ نەبوە ئیستەش ئاوێنەن بۆیەکتر ، لەمدا ئەو بەدی ئەکەیت وە لەودا ئەم ، واتە ، ئەو پەیوەندەیان هەر نەپچراوەو ئیستەش وەکو ئاوێنەن بۆ یەکتر .
پاش ئەم چەن‌شیعرە دێتەوە سەری تەصەووف وە ئەوەی کە گوتی پێشەکی‌بو بۆئەوەی بلٚیٚ .

جەذبەئو سەیراسلوکی بیٚ مەحەببەت نابتن
جەهدەیا بیٚ عشق‌وحوب چەندی کوکر بیٚ فەیدەبو .

ئەلٚی ، سەیروسلوکی تەریقەت ، واتە ریٚ گرتنە بەری ریٚگای خوا پەرستی‌ی بەبیٚ عیشق‌و پەیوەندی رۆحی‌ی سەرناگرێت ، ئەوەی بیەویٚ ئەم ریٚگایە بداتەبەر ئەبیٚ وەکو عاشقێکی دلٚ‌لەدەس‌داو بێت ئەگینا هیچی بەهیچ نابێت ، «**دیارە عاشق ئەبێتە خەبات‌کارێك ئامادەیە سەرو مالٚی خۆی لەرێی گەیشتن بەخۆشەویستا دانیٚ**» .

سالکین عشق یەکایەك حەوجە نین از دبیم
جامەیا پیری طەریق سەر ژنك شەهزادە بو

پیێ ناویێ من باسی یەکایەکی ئەوهەموە گەورە پیاوانەی تەریقەت بکەم چونکە شتەکە لەدرێژایی رۆژگارا ئەوەندە تاقی کراوەتەوە بوەتە بەدیهی و ئاشکرا .

کەواتە پیری تەریقەت ، (خەرقە) کە خەلاتێکە مورشید ئەیدات بەوکەسەی ئیتر ئەویش ئەگاتە پایەی ئیرشاد،ئەوخەلاتە هەروا لەخۆرایی نایداتە خەلك ، بێگومان تا ، وایان لیێ نەهاتبێ شیاوی ئەو خەلاتو ئیجازەیە بن ئەو مورشیدەیش ئیجازەیان نادات ، بەتایبەت خەلات لای سەروەرەوە واتەشازادەوە دێت مەبەستی ئەوەتە شتەکە خودایی یەو لای پێغەمبەرە وە خەلات دێت ، وەروخسەت ئەدرێت .

رەنگ‌ورەنك ئەهلی مەقاماتی طەریقیێ چۆنە سەیر
هن جەلال‌و هن‌جەمال‌و سەرمەیان ئەڤ بادەبو

ئەوانەی رێبواری رێگەی تەصەووفن هەریەکەی بەجۆریێ مەقاماتی تەریقەتیان بری‌و چونەسەر بۆسەری لوتکەی ئاوات ، ئەلیێ برێك لە بواری جەلال وەبریێ لە بواری جەمالەوە رۆیشتن ، لەبەشی موصطەلەحاتدا گوتمان ئەوانەی ئەگەنە فەنا،یان وان حالی جەلال‌دا یان جەمال‌دا،ئەوانەی لە رێبازی جەمالەوە خوا رێگای پیشان داون کە برۆن بۆمەنزلی بەقاەوا بەئاسانی ی ئەگەنە بەقا ، بەلام ئەوانەیان لەرێگای جەلالەوە ریێیان دراوە زۆریان هەر لەفەنادا ئەمێننەوە یان ماوەی مانەوەیان زۆرەو هۆشێکیان بەلای خۆیان‌و دنیاوە نامێنیێ وە لەفەنای هەق‌دا غەرقن ، جا ئەوانەن بریێجار سەبارەت بەوشتانەی کە خۆیان تیایا ئەژین شتی‌وا لە ئەسرارو نهێنی یەکان دیێ بەدەمیان‌دا برێك بەشێت ئەیان‌دەنە قەلەم وەبریێ بەکافریان ئەزانن وەکو مەنصوری حەللاج‌و ذاالنونی میصری‌و بایەزیدی بەسطامی و زۆری تر ، لەکاتێکا ئەو لەوکاتەدا هۆشێکی بەخۆیەوە نیەو ئەو شتەی ئەیلیێ وەکو ئەوەی لەزمانی خۆشەویست دەرچیێ وە زمانی خۆی نەبێت ئاوایە ، برێکیشی ئەسوتیێو بەرگە ناگریێ ، جا ، جزیریی ئەلێت بریێ لەرێگەی جەلالەوەو برێك لەرێگەی جەمالەوە ئەرۆن بۆ بەقا ، وە سەرمایەی هەردو لایشیان یەك سەرمایەیە ، کە بریتی یە لە بادەی مەحەبەت .

ئیتر ئەوەیان خودا خۆی ئەیزانیێ بۆچی برێکی لەجەمالەوە ئەروات وبرێکی لە جەلالەوە.

ئێك ژوان پەروانەبو سوهت‌و فغانەك ژی نەهات
ئێك ژوان تەشبیهی گۆیینیێ ب ئاەو نالەبو

ئەڵێ دەستەیێك لەو عاشقانە،سوتاو دەنگی لێ‌وە نەهات ، واتە کورانە سوتاو گەیشتە مراز ، فەنابون سوتانە،سوتانی پێناسی ئینسانی‌ی ئەو کەسەیە کە ئیتر هەتا هەتایە ناگەڕێتەوە سەری ئەوپێناسانە ، نەفسی ئەممارە فانی ئەبێت وە پێناسە مەلەکوتی‌و خودا پەسەندەکانی ئەمێنێتەوە واتە (باقی باللە) واتە جگە فەرمان بەرداری هیچی نامێنێ .

بەلام دەستەکەی‌تر ئەوانەی لە جەلالەوە ڕۆیشتون ئەو فانی‌یە عاشقانەن کە هەر لەمەڵبەندی فەنادا ئەسوتێن‌و ئەبرژێن وە وەکو باڵداری ناوی‌داو هەر پەلەفرێ ئەکەن ، ئەوانە وەکو باڵندەی «گۆیین» ئەبێ هەربناڵن ، واتە ، هەر شەطەح بڵێن .

وادیارە گۆیین تاق‌تاق‌کەرە یان ئەوجۆرە بوومەتە کە شەو تابەیانی ئەناڵێنێ وە هوم هوم ئەکات .

بەلام ئێمە بۆ ناڵین ، ئەڵێین وەکو کۆتر ئەناڵێنێ .

ئاورێن ئەسوەد عیونان عاقلان سەودا دکن
گەزمەیا عاشق ڤـدلێ کەفتی ژ چەهڤێن شەهلەبو

ئەڵێ ، ئاگری چاورەشان عاقڵ شێت ئەکەن ، واتە ئاگر بەرئەدەنە گیانی عاشق ، بێگومان مەبەستی ئەو مورشیدەکەی خۆیەتی .

پاشان ئەڵێ ئەو تیرەش کە ئەدات لە دڵی عاشق هی نەرگس‌چاوانە ، لێرەدا ئەبێ بڵێم پێوەندی مورید بە مورشیدەوە وای لێ‌دێت ، ئەوموریدە مورشیدەکەی خۆی بە جوانترین وە کامیل‌ترین ئینسانێك ئەزانێت کە بەرخوردارە لە هەرچی پێناسی باش‌و پەسەندە ، لێرەدایە فەنای مورید لەمورشیدا پەیدا ئەبێت ، واتە خۆی لە یاد ئەچێتەوە وە تەنها مورشیدی لەیادە وە زۆرجار وای لێ‌دێت ، ئەو موریدە خۆی بە مورشیدەکەی خۆی ئەزانێت ، هەروەکو لە قوناغی فەنا فی‌اللە دا دەست ئەدات .

بەلام ئەم فەنا فی‌الشیخ ە لە قۆناغی سەرەتایی سلوك دا دەست ئەدات بە پێچەوانەی فەنای حەقیقی‌ی ، کەوا لەدوا قۆناغەکانی سلوك‌دا . ئەوانەی کە لە قۆناغی فەنای خوادا ئەمرن ، یان بەرگەی ئەوعیشقە ناگرن‌و تیائەچن، ئەوەتە شەهیدی عیشق ، کە زۆرجار لە شیعری صۆفی‌یەکانا ئەبینرێ وە لەبازاری تەصەووفدا بەناوی شەهیدی عیشق ناو نراون وە پایەیان بەرزە .

پاشان ئەڵێت .

عاشق و مەعشوق دا واصل ب یەك بن بێ حجاب
مەحو بوو (**بالذات**) عاشق لەو دعشقێ پەردەبو

ئەو لەپێشا باسی فەناو بەقای کرد ، جا ئەڵێ ، لە بەقادا عاشق بەچی باقی یە واتە چی لاماوەتەوە ؟ هەر تەنها خودا ، کەواتە عاشق و مەعشوق هەروەکو لە ئەزەل دا جویێ نەبون وە حادیث واتە جیهانی دروس کراو جوێی کردنەوە وە بونە ئاوێنە بۆ یەکتر ،ئیستە کە عاشق سەرلەنوێ خۆی لەو دنیا ماددی یە پاك کردەوە شایستەیی ئەوەی پەیدا کردوە بتوانێ سەرلەنوێ بێ پەردە بە چاوی دڵ نوری خودا ببینێ وە لەناوی دەرونی خۆیا هەستی بکات چونکە لەوەو پێش ویستو خواستی نەفسانی و شەهوانی و شەیتانی بوبونە پەردە ، ئیستە بە خەبات و تێ کۆشانی ئەو رێبوارە ئەوانە هەموی سوتان وە تیاچون ،کەواتە پەردەکە لابراوەو نوری خودا لەدەرونی ئەو خۆش بەختەدا درەوشاوەتەوە هەروەکو پێغەمبەر درودی خودای لەسەر فەرمویەتی «**قَلْبُ المؤمِنِ عَرْشُ الرَّحمن**» .

ئەڵێ ، مادام عاشق پێناسی نەفسانی ی خۆیی نەهێشت ئیتر پەردەیێ نەماوە،وە هەمیشە لە دەرونی خۆیا هەستی نوری خودا ئەکات ، وە خۆیشی ئەبێتە پارچەیێك لەنوور .

ئەڵێ :

لەو دعشقێ دا فەنابو تابیێت باقی ب دوست
عاشق فانی نەبو واصل ، حەتا باقی نەبو

ئەڵێ ، ئەو لەوعیشقەدا بۆیە تیاچو بۆئەوەی ئیتر لە تەکی دۆستا بمێنێتەوەو جاویدان بێت ، وە لەناوەڕۆکا ئەو تیاچونە خۆی زیندو بونەوەیە،بەشە ماددیی و نەفسی یەکەی تیائەچێت وە بەشە رۆحی و مەعنەوی یەکەی جاویدان ئەبێت زوتر گوتمان ئەوەی لە پلەی فەنا تێپەری تازە ناگەرێتەوە بۆسەری کرداری ناشیرین و ناپەسەند،وەکو ئەڵێن (**بمرە بۆژیان**) ئەمە مردنی نەفسە بۆژیانی رۆح،مردنی خدەی حەیوانیی ئینسانە ، بۆ ژیانەوەی خدەی مەلەکوتی و رەببانی .

جا ئەڵێ عاشق وەنەبێ تەنها بە گەیشتنە پلەی فەنا ئیتر پێی گەیشتبێ ناء ، بەڵکو ئەبێ لە فەنایش تێ پەڕێو بگاتە بەقا .

ئەڵێ عاشق فانی تەنها بەفەنا نەگەیشتوەتە مراز ، بەڵکو ئەبێ بگاتە مەنزلی بەقایش جا گەیشتوەتە مراز .

نوقطەێ علم‌وسەوادێ حەرف‌و نەقشی عالەمی
سەر ددن مەعنایەکێ ئەصلی سەوادی نوقطەبو

لێرەدا دەست ئەکێشێتەوە بۆ فەلسەفەی وجود وە ئەصلی وجود ، ئەڵێ هەرچی زانیاری‌و هەرچی ئەم نەقش‌و نیگارەی دنیایە وە هەرچی جوانی‌و بونە هەموی یەك واتای هەیە ئەویش ئەوەتە کە هەموی لەیەك خاڵ‌و لەیەك سەرچاوەوە هەڵ ئەقوڵێت وە لەیەك نوقطەوە دێت کە بریتی‌یە لە ذاتی هەق خۆی وەئەو خۆیەتی کە ئەم هەموە جوانی‌و نەقش‌و نیگارو خەلائقەی هاوردوەتە بازاری وجودەوەو دروسی کردون وە هەموی لەیەك خاڵەوە هاتونەدی .

هەر یەکەو ، دێ یەك بمبنێت ئەووەڵ‌و ئاخریەکە
(لاجرم) نابێ دووێ نێ‌دێ بمبنێت هەر هەبو

واتە ، خوا یەکێکەو بەڕاستی‌ی خوایش هەر ئەبێ یەکێ بێت چونکە کەبونە دوو ئیتر ئەوە خودا نی‌یە ، هەروەکو خودا خۆی لە قورئانا لەسورەی «ئەنبیا» (٢٢) دا ئەفەرمێ ، (لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا) واتە ئەگەر جگە الله خوایێکی‌تر هەبوایە دنیا وا نەئەما فاسیدئەبوو تێك‌ئەچو .
جا مەلایش ئەڵێ خوا هەر یەکەو ئەبێ یەکیش بێت ئەووەڵ‌و ئاخر هەرئەوە وەخودا (واجب الوجودە) وە ئەم جیهانە بەبێ خاوەن‌و رێك‌خەرو بەرێوەبەر هەرگیز نەئەهاتەدی وە دەوامی نەئەبو .

هەرچ دەعوایێ دعشق‌دا «مەلی» ثابت کری
عەینی دەعوایێ د (نفس الامر) دیسا شەهدەبو

ئەڵێ ئەم‌شتانەی مەلا رونی کردنەوەو باسی کردن لەشتە نهێنی‌یەکانی عیشق،روون کردنەوەو سەلماندنی پی‌ناوێ چونکە لەراستیدا شتەکە خۆی هەروایەو راستەقینەیە ، بەلام شتێ‌هەیە ئەوەی چاوی دەرونی کرابێتەوە وا بەئاسانی‌ی ئەیبینێ‌و ئەیزانێ ، ئەوەش ژەنگ رووی دەرونی گرت وا چاوی دەرونی بەسراوەو هیچی لێ نازانێت .
**«بەراستی من سوپاسی خوا قەت تەواو ناکەم»** .

یەکەم : بۆئەوەی خستمیە سەری ئەم ڕێگایە ، کە ، کەڵکەڵەی لێکۆڵینەوەی تەصەووفی خستە سەرم ، وە لەمجیهانە شیرین‌و بەرینەدا چاوم کرایەوە .

دووهەم : بۆئەوەی بەهۆی لێکۆڵینەوەی ئەم بەشە ئەدەبی‌یەوە ، جزیریم ناسی‌و دیوانەکەیم بشکنی ، بەڕاستی جزیری ئەگەر هی ئێمە نەبواێ ئیستە لەجیهاندا پلەوپایەیێکی تری هەبوو ئیستەش سوپاس بۆ ئەوانەی هەر یەکەی لە ڕوانگەیێکەوە لەم دیوانە کۆڵیونەتەوەو چاپیان کردوە .

بەڕاستی ئەگەر بەشێوەیێکی صۆفی‌یانەو بەتەواوی لەهەمو دیوانەکە بکۆڵرێتەوە لامۆایە چەن بەرابەری دیوانەکە توێژینەوە ئەبات . خۆزگە بۆ شارەزائێکی چابوکو بەتین‌و دڵسۆز ئەم کارەی بکردایێ .

مەلا زۆرجار باسی بادەو خۆشەویست‌و مەستی‌ی ئەکات زۆر جار بەناوی «**تولە**» واتە ، سەگ ، ناوی خۆی ئەبات ، دیارە ئەمانە ڕەمزە ، مەبەست لەساقی مورشیدە ، مەبەست لەبادە ئەو نوروبەرەکەتەیە کە لە مورشیدەوە یان ڕاستەوخۆ لەلایەنی خوداوە دەستی بەندە ئەکەوێت بڕێکی دەست کێشانە بۆحاڵ وەکو ووشەی سوکور،یان بۆ مەقام،وەکو باسی فەناو بەقاو مەحوو ئەو جۆرە شتانەی لەو مامەلەی تەصەووفەدا دێتە ڕێگای ڕێبوار .
وەکو ئەم چەند دێڕەی کە ئەڵێ .

بادە مە نوشی ژدەست چومەژخو مامە مەست
قەطرە بە بەحری گها بەحر ب عەینی خۆما
گوش بە عامی مەدە تەرکی مودامی مەدە
أكثرهم في غمى اغلبهم في عمى .
حەرف ژیەك بونە فەصل گەرببەری وان ب ئەصل
حەرف دبێت یەك خەتەك کونەما نوقطە نەما .
وەحدەتی موطلەق مەلا ، نورە دقەلبان جەلا
زۆر دقی مەسئەلی ئەهلی دڵان شوبهەما

لێرەدا ، بادەو مەستی‌و قەطرەو بەحرو خەت‌و حەرف‌و نوقطەو وەحدەتی موطلەق‌و نورو قەلب‌و جەلاو شوبهەمان لە مەسئەلەدا وە ئەهلی‌دڵان ، هەموی

موصطەلەحاتی تەصەووفە وەپەنجە ڕاکێشانە بۆلای تەصەووف وە ئەو خوێنەوارەی باش لەتەصەووف نەگات بەباشی لە مەبەستەکەش ناگات .

ئەڵێ :

صوفی‌نی خەلوەنشین بێنە سجود
هەردو برهێن تەنە میحرابێ دوعا
عەرضی کێ‌دێ بکرم صورەتی حال
کە تویی قیبلەیی ئەربابی دوعا
ژ دوعائێ قەدەحەك دەردەستە
هەر سەحەر مەستی مەیی نابی دوعا
گولێ ئیقبالێ ژ گولزارێ قەبول
م چنیبو د شەکەر خوابی دوعا

لەئاخرا ئەڵێت :

ژ ئەزەل یەك جهەتی‌ی دایە «مەلی»، هەر مە ئیخلاصە ژ ئەسبابی دوعا لێرەدا ، صۆفی ، خەلوەنشین، میحرابی‌دوعا ، صورەتی‌حالێ ، قیبلەی ئەربابی دوعا ، قەدەح ، شەکەر خوابی دوعا ، یەك‌جیهەتی‌ی ئەزەلی‌ی، ئیخلاص ، ئەمانە هەمویان پەنجەڕاکێشانە بۆ موصطەلەحات وە ڕەوشی تەصەووف ، وە زۆرێك لەم موصطەلەحانە زووتر حافظ بەکاری بردون ، وە خوی زۆر لەو موصطەلەحانەی کردونەتە کوردی‌و ئەدەبی کوردیی پێ دەوڵەمەند کردوە .

ئەگەر من بمەوێ پەنجە ڕاکێشم بۆ هەموی ئەو شیعرانەی جزیریی کە تەصەووفیان تیایە مەگەر قامك ڕاکێشم بۆ هەموی دیوانەکە .

کەواتە وا هەر بەگوزەر پەنجە ڕائەکێشم بۆ ئەو شوێنانەی گومانی تیانیە ، باس‌باسی تەصەووف ، یان فەلسەفەی تەصەووف ، یان فەلسەفەی وجود ، وە تەوحید وە ئەوجۆرە مەبەستە گرنگانەیە .

بەپێی دیوانەکەی زفنگی‌ی .

لاپەرەی ٥٩ تا ئاخری قەصیدەکە . کە سەرەتای قەصیدەکە ئەڵێ .

دەستی قودرەت کو هلاڤیت ژ بەژناتە نیقاب .

لاپەڕەی ٦٦ تائاخری قەصیدەکە . سەرەتاکەی ئەڵێت .

للهالحمد ، ژیاریٚ مە د دەست جامە لەبالەب

ژ لەبێ نوشی پەیاپەی ددلٚئیلهامە لەبالەب .

جگەئەوە ئەم پارچە هۆنراوەیە هەموی صوفیەتی یە ئەوەش دەرئەخات کەمەلا موراد بوە ، ئەوەش لێرەدایە کە ئەڵیٚ .

قەدەحەك تازە ژ عیشقیٚ د «ئەزەل» دامە،حەکیمی

ژ دنوشین هەیوەهەی هیٚ ب خوە جامامە لەبالەب

بەراستیی ئەم پارچە هۆنراوەیەی مەلا ، لەڕوانگەی صوفیەتییەوە یەجگار بەرزە پڕیەتی لە موصطەلەحات .

بەتایبەت لەنزیکی دوا هێنان بە قەصیدەکەدا کەئەڵیٚ .

تە دزانم تە دبینم کەتوئی نوری وجودی

«الله الله» ژ چ نورە د سەرایامە لەبالەب

لێرەدا مەلا بۆی دەرکەوتوە وجود ، واتە ، هەستیی ، یان بوون هەموی نوری خودای تیا ئەدرەشێتەوە ، واتە ، ئەو تیشکە نەبوایێ وجودێك نەدەبو هەستکەریٚ نەبو تا هەستبکات بە هەستیی وە هەموشتیٚ نەناسراوو داپۆشراو بو .

بەڵام لێرەدا هەستی نورێکی تایبەت ئەکات لەناویماڵی خۆیا ، بەڵام ئایا مەبەستی جزیریی خانو بوە ؟ .

مەبەستی جزیریی لەو خانووە دەرونی خۆیەتی وە بەر لەجزیریش زۆر جار ، «سەرا» واتە خانوو ، بۆ دڵ بەکار براوە ، یان وشەی وێرانەو ، وێرانەماڵ ، مەولەویش هەرشتێکی وای هەیە کەباسی سەردانی پیریخۆی ئەکات لەدەرونی ، وەئەڵیٚ .

غەیری تۆ ئازیز لەم زەمانەدا

کیٚ بیٚ گوزەرکات بەم وێرانەدا

بەڵیٚ ، بۆ خودا پییٚداوان، دڵ مەنزڵو مەڵبەندی نوری خودایە ، ووشەی نور لەقورئاندا زۆرجار هاتوە وە واتای زۆری هەیە وە باسمان کردوە .

لێرەدا ئەتوانین سەبارەت بەو شیعرەی جزیریی دەس نیشانی ئەو ئایەتە بکەین کە ئەفەرمیٚ «اللهُ نورُ السَّماواتِ وَالأرضِ» سورەی نور ، ئایەتی «٣٥» یان ئەو حەدیثەی کەئەفەرمیٚ «قلب المؤمن عرش الرحمان» لە لاپەڕەی ١٠٥ دا ئەڵیٚ .

عەقدی ئیحرامی دعشقیدا کو پیری عیشق بەست
. دی چ غەم گەر خەرقی رەهنی خانەیی خەممار بت

ئیحرامی عیشق ، پیری عیشق ، رەهنی خەرقە لای پیری مەی‌فرۆش ، هەموی تەصەووفەو ، موصطەلەحاتی حافظە ، زۆر جاریش حافظ لەشیعرەکانیا بە بارمتەدانانی خەرقەی خۆی لە مەیخانەدا شانازیی کردوە ئەمانەش هەموی ئیشاراتو کینایاتی تەصەووفە .

لام وایە ئەمە مشتێ بێت لەخەروار وە گوڵێ بێت لەگوڵزار،کە بەسە بۆئەوەی بتوانین بڵێین ، بەراستی پیری جەزیر سەرهەڵقەی رەندانو سەرقافڵەی قەلەندەران وە ئاڵاهەڵگری شیعری تەصەووفی کوردیی وە سەرکاروانی شیعری کلاسیکی کوردیی وە تاکە سوارەی مەیدانێکە کەم سوارچاك ئەتوانێ ئەسپی هونەری تیا تاوبدات .

لێکۆڵینەوەی دیوانی جزیری ئەوەی بۆمن دەرخست لەناوی شاعیرە کوردە کاندا ، ئەوانەی بەکوردیی شیعریان نوسیوە، تەنها جزیریی ئەتوانێ شاعیرێکی تەصەووفی تەواو بێت، واتە هەموی دیوانەکەی،لەگەڵی ئەوەشا بەهەمو هونەرێکی شیعریی رازاوەتەوە،لەهەمان کاتا سەرتاسەری دیوانەکەی تامو مەزەو چێژی گیان بەخشو بۆنی خۆشی تەصەووفی لێ نابڕێت ، وە هیچی کەم نیە لە دیوانی شاعیرە صوفی‌یەکانی نەتەوەکانی دەوروبەری خۆی .

دووهەمی ئەوەتە بڵێم ئەگەر بێتو تەصەووف لە دیوانەکەی لابەرین وەکو ئەوەتە گیان دەرکەین لە لەشی گیان لەبەرێك ، بەم جۆرە بۆمان دەرئەکەوێ تەصەووف تاچ‌رادەیێ کاری کردوەتە سەری ئەدەبی کوردیی ، وە تا چ رادەیێك دەوڵەمەندو بەپێزی کردوەو بەرزی کردوەتەوە ، بۆئەوەی بی‌گەیێنێتە شوێنی شیاوی خۆی.

# سید عبد الرحیم «مەلەوی»
## «١٢٢١ - ١٣٠٠» ك

مەولەوی گومانی تیانیە صوفی مەسلەك بە ، چونکە موریدی شیخ عوسمان سیراجوددین بوە ؛ مەولەوی جگەئەوەی کە ... کش ... اتی زۆری بوە ، لە عەقائد وە عیلمی کەلام ...
«اَلْفَضیلَە» کە زیاترە لە سی٘هەزار شیعری عەرەبی ، وە (الع...
لەدوو هەزارو چوارصەد شیعری کوردی پیشاندەری هێزی سیحری زانیاری مەولەوین ، وانەزانن ئەم دووکتێبە هەروا شیعری سادەن بەڵکو خوینەواری ئەویت لە عەقائدو کەلامدا لێیان تێ٘بگات ، بەلاّم بەراستی‌ی جەنابی مامۆستا مەلا کەریم هەروەکو کە هەمیشە هۆی خیرو بەرەکەت بوە وە خذمەتی کردوە بە زانیاری لە هەمو رووییکەوە ، هەردوکی شەرح کردون ؛ فەضیلەکەی چاپ کراوەو مەرضی‌یەکەش لەژێری چاپایە .

لەتەکی ئەم هەموە پەیوەندەی مەولەوی بە عیلمو ت سەووفو مەشائخەوە ، لەگەڵ ئەوەشا ناتوانم بڵێم مەولەوی شاعیرێکی صوفی بوە ، واتە ، گیانی خۆی تەرخان کردبێت بۆ تەصەووف ، چونکە نەخۆی گەیشتوەتە پایەی کەمالێك کە بەناوی رێبەر وە مورشیدێك بناسرێت ، وە نە شیعرەکانیشی بەوجۆرەن کە هەر صۆفیەتی بێت ، یان بڵێم هەر باسێکی کردوە بردویەتەوە سەری تەصەووف وەکو مەلای جزیری ، بەڵکو لە موناسەبات هەروا کە بۆ پیری خۆی شێخ عوسمان نامەی نوسیوەو باسی صۆفیەتیی تێدایەو دیارە لە زانیاری تەصەووفدا شارەزایە ، هەروایش بۆ دۆستانی دنیایی خۆی شیعری نوسیوەو بەتەواوی دور کەوتوەتەوە لەدنیای صۆفی‌گەری .

شیعرەکانی مەولەوی هەرگیز ئەوە ناگەیێنن کە خۆی لە گۆرەپانی تەصەووفدا گەیشتبێتە مراز وە لەبەهرەی صۆفیەتی‌دا کەفەرێژ ئەکات،بەڵکو شیعرەکانی هەمیشە پیشاندەری ئەوەن کە مەولەوی دەسەوداوێنی مورشیدەکەیەتی کە لوطفی لەگەڵ بکات ، وە قەت ناتوانێ٘ خۆی بە خاوەن دەسەلاّت دابنێ٘ ، واتە ، وەکو مەلای

جەزیری وابێت ، کە لەگەڵی ئەوەشا حافظی خۆش ویستوە کەچی ئەڵێ من ئیتر شاگرد نیم بەڵکو قارەمانو قەڵەندەرم ، وە ئەی کورد تۆ کە منت هەیە ئیتر ئیحتیاجت نیە بە حافظی شیرازی .

کتێبەکانی تری مەولەوی هەرچەن هەموی ستایشی خودایەو تێکۆشانە بۆدامەزراندنی ئایین وە بتەو کردنەوەی باوەری ئیسلامی ی ، وە هەرچەن لەوانیشدا لاین گری ئەکات لەتەصەووف وە بە دەرمانی دامەزرانی باوەری ئەزانێت ، لەگەڵی ئەوەشا تەصەووف نیە ، چونکی شیعری ئایینی جیایە ، باسی تەصەووف خۆی باسێکی جیاوازە لەناوی چوار چێوەی ئایینداً . بۆ نمونە لە تەصەووف‌دا باس باسی حاڵو مەقامو موشاهەدەو موکاشەفەو ئەنوارو ئەسرارو فەناو بەقاو مەستی‌و مەحوو صەحوو ئەوجۆرە شتانەیە .

مەبەستم ئەوەتە بڵێم مەولەوی هەرچەن هەم مەلاچاكبوەو هەم موریدو خەلیفەی شێخ عوسمان لەگەڵ ئەوەشا بۆخۆی جیهانێکی جیاوازی هەیە کە نە لەجیهانە تەواو صوفی‌یەکەی جزیری ئەچێت وەنە لەجیهانی **(مەحوی)** .

مەولەوی بۆخۆی دنیایێکی فەقیرانەو گوندنشینانەو بەڵکو دەوار نشینانەیشی هەیە ، مەولەوی زەگوریشەی تێك‌ئالاوە لەگەڵی جوانی ی سورشت‌دا هەرچی هەوارگەی جوانی ناوچەی هەورامانو تاوگۆزیو کوردوستانی سۆرانە هەموی دیوە لەتەکی خێڵەکاندا گەرمیانو کوێستانی کردوە ، شاعیری سوروشتەو پەروەردەی دەستی سوروشت ، سوروشتی جوانو بێوێنەی کوردوستانی رەنگین .

لێرەدا بە خوێنەواران ئەڵێم ، ئەی‌خوێنەواری بەرێز، لاموایە ئەوەی بە بەهاران ، بە هاوینان بە پاییزانو زستانان‌دا ، گوندەکانو شاخو داخو دەشت‌و دەرو جەنگەڵەکانی کوردستان نەگەرابێ ، شەو لەو هەوارانەدا رۆژی نەکردبێتەوەو لەسەری لوتکەی شاخەکانەوە چاوی بە شەبەق نەکرابێتەوەو قاسپەی‌کەوو جریوەی چۆلەکەی کوێستان لەخەو هەڵی نەستاندبێ ، بەشەوا بۆنی شەوبۆی کوێستان ، زاخاوی مێشکی نەدابێت ، ئەو گیا بۆن خۆشانەی نەکردبێتە سەرینی ژێری سەری ، بەرۆژا لەداوێنی بەفراودا گوێی شل نەکردبێ بۆ نەغمەی ئاوو هەزاران جۆر دەنگی پەلەوەرو گیان‌لەبەر ، بەسەر لوتکەی هەرەبەرزی شاخە هەرە بەرزەکانەوە ، گیای **(بەرزەڵنگی)** دەست‌کە نەگرتبێ وە پڕ بەهەردوو سیەکانی ئەو بۆنەی هەڵ نەمژیبێ ،

گیای چنوورو لۆو سورەهەلاڵەی نەکردبێتە باقەو نەیخستبنە تەنشتی باقەی هەلاڵە برەم (**شلێرە**) بەدەستی خۆی ، قارچك (**کارگ**) و پیچكو کاشمەو کەرەسو بەناو بەرەزاو شنگو هالەکۆکو ریواسو تەرلەژەرەژانو چوزەبەنای نەکەندبێت وە نەیخواردبێت وە تامومەزەی هەموی نەکردبێت ، لە لارەسێبەری ئێوارانو دەمەو بەیانانداا لە سێبەری کاوو سەختی کوێستانانەدا ، شیرین‌خەوی نەکردبێت ، وە شنەی پای‌کاوان ماندوبی لە لەش دەرنەکردبێتو نەی حەساندبێتەوە بلوێری شوانەی هەردەویڵ ئاورشێنی رۆحی نەکردبێت ، باورکەن زۆر دوورە لەئینصاف ، ئەگەر بیەوێ سەبارەت بە جوانی‌ی سوروشتی کوردستان بدوێو شیعربنوسێ ، چونکە هەرچی بڵێو هەرچی بنوسێ هەر ناتەواوەو دەست هەڵبەس .

ئەوەی من‌گوتم تەنها باسی هەردو چیای چۆڵ‌بوو ، جا وەرە سەیری ژیانی ناوی باخو ناوی کشت‌گەو مەزرا ، ژیانی خیوەت نشینان ، ژیانی گوندنشینان ، بەتاڵو شیرینیەوە بە خۆشو ناخوشیەوە ، نوستنی سەری خەرمانانو چەرداخی کشت‌وکاڵ ، وەرە سەیری جوانیی پاییزی باخ‌ودەشت ، سەیری گەردەلولی بەفری کوێستانانو ژیانی ئەو گوند نشینانەی شەش‌مانگ لەسالا لەگەڵی بەفرو سەرمادا هاودەمو هاوەڵن وەرەسەیری هەزاران جۆر گەرانو ژیانی تایبەتی کاروکاسبی گوندنشینان ، هەزاران خۆشی راوو شکاری گیان‌دارانی جۆراو جۆر ، وە صەدان دیمەنی جۆراوجۆری ئەوجۆرە ژیانانەی کە زۆربەی شارنشینان لێیان دوورن .

مەبەستم ئەوەتە،ئەوەی بیەوێ ، ئەوەی ئەینوسێ ، وە ئەەی بەیادگار لەخۆی جیی دێلی ، دەست هەڵبەستو بێ‌گیانو بێ‌رەونەق نەبێ ، ئەبێ هەوڵ‌بدات لەژیانی خەڵکی ولاتی خۆی ، وە لە هەمو بەشەکانی ژیانا بەشداریی بکات ، تاوەکو ئەوەی ئەینوسی هەروەکو نوسینەکانی مەولەویی جاویدان ، وە پڕ لە کاکڵەو گەوهەربێ .

مەولەویی زۆرباش لەهەموی ئەم ژیانانەو صەدان جۆری ژیانی‌تر شارەزابوە ، وە گیانی لەگەڵی سوروشتی ولاتەکەیا هەڵشێلراوەو تیك هەڵچوە ، لەبەری ئەوە هیچ پارچە شیعرێکی نیە شوێنەوارێکی جوانی‌ی سوروشتی تیا بەدی نەکەیت ، ئەمە بەشێکی ژیانە تایبەتەکەی مەولەوی بو،جگە ئەمە ، مەولەویی پەیوەندێکی بەربلاوی بەخەڵکەوە بوە ، وە لەگەڵی دۆستو ئاشنادا بە زمانی هۆنراوەو شیرین‌کاریی ئەدەب دواوە ، بەناوچەکەدا زۆر گەراوەو زوو زوو دیدەنی کردوە لە دۆستەکانی .

شین ئەکات بۆ کۆچی ناسراوان وە ئەیان لاوێنێتەوە ، شیعرەکانی هۆی دڵدانەوەی لەشوێن جێ‌ماوانی کۆچ کردوانە ، هەروا کە لەشیوەنی دۆستاندا بەشدارێی کردوە ، لەشادێی ئەوانیشا بەشداربوە وە بەشیعری جوان وای پیشان‌داوە وەکو ئەوەی خۆی لەناوی زەماوەندەکەدا بوبێت وایە ، مەولەوێی جگە لەوە پەیوەندی گەرمی بوە لەتەکی مورشیدی خۆیا شێخ‌عوسمان سیراجوددین ، لەتەکی مورشید زادەکانیشیا پیوەندی گەرمی بوە وە شیعری بۆ نوسیون تەنانەت لە دەرونیشەوە خۆی‌داوە بەدەستیانەوە وە ئەم نزیکی‌یە هەم لەهۆنراوەکانیا وە هەم لە تەئلیفەکانیا بەدی ئەکرێت .

لە پێشەکی‌ی عەقیدەکەیا ئەڵێ‌ : یارمەتی مەعنەوێی حاجی شێخ عەبدولرەحمان ئەو ورەیە دامی‌ بتوانم روو بنێمە ئاوا کارێکی گرنگ .

هەروا پاش فەوتی شێخ عوسمان بوەتە موریدی شێخ بەهائوددین ، لێرەدا لەتەکی مەحوێی‌دا ئەبنە هاومورید ، جگە ئەودوبرایە پەیوەندێکی رۆحی‌ی گەرمی لەتەکی شێخ‌عومەر ضیائوددین دا بوە کە برای باوك‌ودایکی‌ی شێخ بەهائوددینە ، وە بەتەمەن بچوکتربوە لە شێخ بەهائوددین .

لە پێشەکی‌ی «**الفضیلە**» دا ئەڵێ‌ : شێخ بەهائوددین ئەمری پێ‌کردم کە ئەم کتێبە دانێم .

مەولەوێی پاش فەوتی شێخ بەهائوددین دووساڵ‌ ماوە وە پەیوەندی لەتەکی شێخ عومەردا هەر بەردەوام‌بوە ، بەڵام لەوکاتەدا چاوی کوێربوە وەئیتر گلوگوێزی پیروموریدێی نەماوە .

مەولەوێی جگە ئەم دووجیهانە ، واتە دنیای سوروشت وە دنیای مەعنەوی‌یات ، پەیوەندێکی گەرمی لەگەڵی دووجۆرە خەڵکی‌ترا هەبوە .

دەسەیێکیان دۆست‌و رەفیق‌و هاوشان‌و هاو پایەی خۆی بون وەکو ئەحمەدبەگی کۆماسی‌و شێخ مۆمنی سازانی‌و شێخ حەسەنی‌سازانی‌و شێخ یۆسفی نۆسمەیی‌و شێخ‌عەبدوڵلای داخی‌و شێخ عەزیزی جانەوەرەیی‌و ئەحمەد پریسی‌و مەلا عەبدولرەحیمی نجارو دەیان دۆستی‌تر کە بەداخەوە ناویان نازانین .

جگە ئەو دۆستە هاو مەشرەبانەی خۆی ، وە لەوانیش زیاتر پەیوەندێکی گەرمی لەگەڵی بەگزادە جافەکانا بوە ، ئەوان رێزیان لەمەولەوێی گرتوە ئەویش رێزێکی زۆری ئەوانی لابوە ، بێگومان ، هۆزی تاوگۆزی لەژێری چەتری فەرمانرەوائی

جاف‌دا ژیاون . مەولەویش ئەو مافە بۆ میرەکانی جاف قایل‌بوە ، مەقامی ئەدەبی‌و مەلاچاکی‌ی مەولەوی بوەتە هۆی ئەوەی زۆرتر تێکەڵ بێت لەگەڵیانداو تەنانەت لەتەکی ژنە شاعیرەکانی جافەکاندا شیعریان بۆ یەکتر نوسیوە ، هەروەها هەرکاتێ گەورەیێکی جاف کۆچی کردوە مەولەوی شینی بۆکردوە ئەو شیعرەی هەر لەپێش چاودایە کە لەکۆچی قادربەگی کەیخسرەوبەگ‌دا نوسیویەتی کە لە گۆرستانی سەیید خەلیلدا نێژراوە وە داوا لەخاوەن مەقامەکە ئەکات کە ئاگای لە قادربەگ بێت ، وەئەڵێ .

یاخەلیل ئامان کێ عادەت کەردەن
تۆشە وەدەرگای کەریمان بەردەن

ئەوەتا مەحمود پاشای جاف کەشکۆڵەکەی خۆی بەشیعری مەولەوی رازاندوەتەوە .

ئەمانە جگە ئەو هەموە مەلاو فەقی‌یانەتە کە ڕەوشە جوان‌و قسەخۆشەکانی مەولەوی ڕای کێشاون بۆلای خۆی .

کەواتە ژیانی مەولەوی ژیانێکی هەمەڕەنگەو **(ڕەنگین‌کەوان)** ، مانەندە .

وە لەهەموی دیاری‌تر لەشیعری مەولەوی‌دا شوێنەواری جوانی‌ی سوروشتی کوردوستانە .

ئیستە دێینە سەری ئەوبەشەی کە تەصەووف کاری کردوەتە سەری شیعرەکانی مەولەوی وە کەمیش نیە .

لە یەکەم پارچە هۆنراوەدا کە بە **«ئیمشەو تەنیانێ جەسەی زەبونم»** دەست پێ ئەکات وە باسی خەم‌و پەژارەی خۆی ئەکات ئەگاتە ئەوەی ئەڵێت .

ساقی ساجامێ ئەمجار دەخیلم .

وە داوای بادە ئەکات لەساقی‌و ئەڵێ

بدەر پێم نۆش‌کەم چون هەردە جاران .

پاشان داوای سازو سەمتورو چەنگ ئەکات وە ئەڵێ شیعری خۆم بەم سازانەوە بۆبڵێن ، دوبارە لەساقی ئەپاڕێتەوە کە مەولەوی لەیاد نەچێت وەئەڵێ .

ساقی ئامانەن نەشو جەویرت
وە فەریادم ڕەس تۆ بەشتی پیرت

دیارە مەولەوی پیاوی ساقی‌و سازو دەفی مەجازیی نەبوە شەراب خۆرو شەراب خوازیش نەبوە ؛ بەتایبەت ساقی سوێند ئەدات بە عیشقی پیری ، واتە مورشیدە کەی ؛ بێگومان ئەم جۆرە شیعرانە چ لە عەرەبی‌و فارسیدا چ لەکوردیی‌شا مەبەست هەر شەرابی مەعنەوی‌یەو ساقیش مورشیدەو مەستیش هەمان سوکری تەصەووفە کە باس کرا .

ئەم جۆرە شیعرانە تەصەووفێکن ؛ لەعەینی ئەوەدا وان لە پەردەدا وان لەعەینی ئاشکرایی‌دا ئەویش بەو بۆنەوەیە کە خاوەنەکەی ناسراوەو دیارە ئەهلی ئەو کارانە نیە کەواتە ئاشکرایە مەبەستیشی چی‌بوە .

لە لاپەرەکانی (**٣١ - ٣٢**) دا ، کە ئەڵێ

ئەی گردمەوجودیێ جەتۆ گرت مایە .

لە شیعرەکانی جەزیری‌و مەحوی ئەچێت کە بۆنی وەحدەتی وجود ئەدات ، وە ئەوەندە لەگەڵی شیعرەکانی جزیری‌دا لەیەك ئەچن باوەرم هاتوەتە سەری ئەوەی مەولەویی شیعرەکانی جزیریی خوێندوەتەوە ، ئەمەش نەك هەر سەبارەت بەم مەبەستەی ئیستە ، بەڵکو بۆ وردەکارییێك کە لە شیعرەکانی فەضیلەدا هەیە ؛ بۆنمونە ، مەلای جزیریی ئەڵێت .

ژ سیررا لامەکان واجب تەنەززول کرد ئیمکانی
فاین العلم این العین واین الاین اذ لااین

مەولەویی ئەڵێت

مَتی مَتی ؟ حتیّ اَنی عَلَیِّهِ
مِنْ اَیْنٍ اَیْنُ ینتمی الیه

لە بارەیێکی ترەوە مەحویی ئەڵێ .

غەیری وەحدەت لەوجودا نیە ، کەثرەت وەهمە
سادە تیکراری یەکە مەنشەئی ئەوهامی عەدەد

جزیریی ئەڵێ .

یەکبو ئەلیف یە نوقطەکر یەك شکلی‌دی لیٚ زێدە کر
هەردەم پەیاپەی صفرەکر بالاٚ ببالاٚ ڕوتبەدا

له رووێکی ترەوە مەولەوی ئەڵێ .
پەنهان بێ تەنها وەحدەت مەوج مەوەرد
پەی شناسای ظهورێوەش کەرد

جزیری ئەڵێت ،
بەحرا وجودی جوشی هات نورێك تەنەززول بو ژ ذات
هاتن تەعەیون تێك صیفات ئەشیا ظهور عیلمی یەدا

دیارە بیرو باوەری عەقائدی ئیسلامی ی بەتایبەت لەزانیاری کەلام دا هەر لەمێژەوە لەناوی موسوڵمانان دا باوبوە ، وە هەر کامەی بەجۆری تێکۆشاون ، بەدەلیلی عەقڵی و نەقڵی ی ، وجودی خوای گەورەو **(واجب الوجودی)** یەتی ئەو بسەلمێنن وەنەبێ دەستکردی جزیری یان مەولەوی بێت مەبەستم تارادەیێك لەیەکچونی دارشتنی وتەکانە ، بەتایبەت ئەگەر هەموی گوتنەکانی هەردولایان بەرانبەر بگرین ، دیارە ئەوەش لەوزەی ئەم نوسینەی ئیستەی من بەدەرە،بەلآم بۆیە خستمە بەری چاو بۆئەوەی بزانرێ ، شایەد کەسێ پەیدابوو وە ئەمکارەو ئەم بەراوردەی کرد .

هەر لەم قەصیدەیەی مەولەوی دا ووشەکانی وەحدەت ، ناسووت ، جەمال ، جەلال ، فەنا ، بەکاربراوە .

له لاپەرەی **(٣٩)** دا ئەڵێ ئەم شادی یەی من هی بادەی وەصڵی تۆیە ، کەواتە تۆ هەر لەم بادەی وەصلەم بۆتێکە با لەطائفەکانم هەمویان زیندو بنەوە ، جا ئەڵێ .
ساپێمدەر دەی دەی ، پەی پەی ، نەو مەی مەی
لەطائف مەردەم یەکسەر بکەر حەی

له لاپەرەی **(٤٨)** دا قەصیدەیێکی بۆ مورشید وە مورشیدزادەی خۆی شێخ بەهائوددین نوسیوە ، ئەڵێ .
ساقی ئینە بەزم وەصڵی یارانەن
چەرخیچ هەرئەوچەرخ هەردە جارانەن
دەورێ دەر وە بەزم وە پیاڵەوە
ژەنگی دڵ وەزاخ مەی بماڵەوە

جامیٚمان جەدەس تۆ هەم سەندەبۆ
فرصەتەن نەصیو نەك نەمەندە بۆ

ئەڵێ ، ساقی ئەمە بەزمی وەصڵی یارانە کەواتە خولێك بدەو جامێکمان بۆتێکە لەو مەیەی کە ژەنگی دڵ لائەبات ، «واتە رەین» لائەبات .

(**کلا بل ران علی قلوبهم ماکانوا یکسبون**) ، (**مطففین ١٤**) جا ئەڵێ نەکا عومر بەدەمیەوە نەمابێ ، با لەخذمەتی تۆیشا ئەی تازە مورشید بەرەکەتێکمان پی گەیشتێ هەروا کە لەباوکتەوە پێمان گەیشتوە .

لەلاپەرەی «**٦١ – ٦٤**» لەتەکی خوای خۆیا رازونیاز ئەکات وە داوای لێبوردنی لێ ئەکات ، لەم قەصیدەشا ووشەی تەصەووف زۆر بەکارئەبات ، وەکو . هەوای نەفس ، چەن تەزبێحێکی ذیکر ، رێگەی حەقیقەت ، مەحبوبی حەقیقی ی ، مەوطینی ئەصلی ی ، هەوای مەجازیی ، کیبرونیاز ، وە زۆر شتی تر .

لە لاپەرەی (**٦٧**) دا شیوەن بۆ چۆڵبونی ماوای ئازیزەکەی ئەکات ، مەولەوی هاتوتە سەیری هەواری چۆڵی یاران ، لەکاتی باسی ئەوشتانەدا گوایا کاتی خۆی لەو هەوارانەدا بون وەئیستە نەماون ، ئەڵێ پەرەی گوڵی مەعاریف وەریوەتە سەری گڵ ، چەمەن لەسۆزی بولبولێ چۆڵە ، کوا ئەو نەزەرەی پیرم لێرەداو کوا هەڵقەی ذیکری «**خەق**» ، واتە ذیکری نهێنی نەقشبەندی یەکان ، کوا نالەی هەزار رەنگی صۆفی یەکان ... هتد .

لە لاپەرەی حەفتادا باسی وەلوەلەی دەفی شای دەروێشان وە جۆشی سەمتوری گۆرانی ی بێژان ئەکات ، ئەڵێ ، ئەمانە سازکەن بەڵکو تۆوی ئارەزوی دڵ بەئاوی بارانی چاو سەوزکەمەوە وە بەئاهی هەناسەم سەرلەبەیان گوڵی رووی ئازیز بپشکوێنم . هەر لەپاش ئەمە سەرلەنوێ لەم پارچە شیعرەیشا هەر داوای دەفی دەروێشی ئەکات ، ئەڵێ ، دەروێش بەم دەفەت هەم پەندی خەڵك دادەو هەم لۆمەو سەرزەنشی من بکە ، بڵێ دەهەستە ، شەو دەست لەخەو هەڵگرەو دەست بکەرە خواپەرستی ، چونکە تەنها ئەوانەی کە بێدارن وە وان لە خواپەرستیدا ئەکەونە بەری پەرتەوی تەجەللای هەق ، چونکە تەجەللا بۆ نوستوان وە غافڵان نیە بۆ دڵ بێدارانە ، ئەڵێ شایەد ئەمشەو نوری خودا درەوشایەوەو تۆ نوستبوی وە لێ ی

مەحرومو بێبەش بویت وە هەتا هەتایە بویە داخ بۆت . ئەم باسەی مەولەویش لەوێوە سەرچاوەی گرتوە . کە ئەڵێت .

واچە هەی دڵەی ئەبلەی بێخەبەر
هۆرێز ساتێ تەرك خاوی‌شیرین کەر
نەوا میهمان‌بۆ تۆ نەوینی کەس
خەفەت‌بۆ پەرێت تا ئاخرنەفەس

لە لاپەڕەی «٧٣ - ٧٦» ستایشی مەرحومی شێخ حەسەنی مەولاناوا ئەکات کە یەکێکە لەپیرانی تەریقەتی قادری ، وە لەساڵی «١١٣٦ك» دا ، فەوتی کردوە «**دیوانی‌مەولەوی ماموستامەلاکەریم**» ، موصطەلەحاتی تەصەووفی زۆری تیایە ، مەولەوی زۆر لە موصطەلەحاتی گوڕیوەتە سەری شێوەی هەوارمی .

ئەڵێ :

بولبولی گوڵشەنێ بێ ‌نامونەنگی‌ی
تەزەروی سەرچلێ باغچەی بێرەنگی‌ی
نوختەی ئینتیهای دائیرەی تەمام
نەی ، دەسی نەی‌چی ، توتی دیای‌جام
یانەی‌دلێ وەفەیض رای‌مەولا ناوا
تەواری تەرلان ، لانێ مەولاناوا

واتە ، ئەی بولبولی گوڵشەنی (**بێناوی**) ، صوفیەتی خۆی بێناوی‌یەو ، (**بێرەنگی**)یە . ئەی باڵندەی باغچەی (**بێرەنگی‌ی**) واتە ئەی ئەوکەسەی بەشوێنی ناوبانگ‌و زەرق‌وبەرقی دنیادا نەگەراوی .

ئەی نوختەی پایانی تەواوی دائرەکان ؛ لەبەشی ڕێبازی نەقشبەندی‌دا ، باسی ئەو دائرانەم کردوە ، بەدائیرەی ئیمکان دەست پێ ئەکات وە بە لاتەعینی تەواو ئەبێت .ئەی ئەوکەسەی کە وەکو بلوێری دەستی نەی‌چی وەهای ، هەم خۆت داوەتە دەستی بلوێرژەن ، واتە دەستی خاوەنت ، بەکورتی‌ی خۆت تەسلیمی خوداکردوە ، کە تەسلیم پایەیێکی تەصەووفە ، واتایێکی تری ئەوەتە ، وەکو کە بلوێر ئاورشێن‌کەری هەست‌و ڕەوانە ، تۆیش ئاوا کارئەکەیتە سەری دەروون ، وە نەفەسی خودایيت تێدایە ، وە وەکو توتی‌ی لەئاوێنەدا سەیری خۆی ئەکات تۆش ئاوا هەم عەیبی خۆتت لەبەرچاوەو هەم ئاگات لەپشتی سەری خۆتەو خاوەن کەشفی .

ئەی ئەوکەسەی کە ماڵی دەرونت بە فەیضی خودا سواغ دراوەو بریسکەی دێ ، وە هەروەکو «**بازی**» تەرلان ، لە گوندی «**مەولاناوا**» دا لانەت کردوە .

سەبارەت بەشیعری یەکەمی مەولەوی کەئەڵێ

بولبولی گوڵشەن بێ نامو نەنگی
تەزەروی سەرچڵ باغچەی بێ رەنگی .

مەولانا جەلالوددین شیعرێکی هەیە پڕ بەپێستی ئەم موصطەلەحەیە کە ئەڵێ ،

عشقهایی کز پی رنگی بود
عشق نبود عاقبت ننگی بود

ئەڵێ ئەو عیشقانەی کەبۆ بەدەست هێنانی رەنگێ بێت ، واتە بۆئەوە بێت پێی بڵێن صۆفی ، یان شێخ یان پیاوچاك ، یان هەرجۆرە دەستکەوتێکی دنیایی ، ئەوە عیشق نیە وە ئاخرەکەی نەنگیو ئابرو چونە ، جابۆیە مەولەوی بەشێخ حەسەن ئەڵێت

مەلی سەرچڵی باغی بێرەنگی .

هەروەها موصطەلەحاتی تریشی تیایە .

لێرەدا مەبەستێك هەیە بەپێویستی ئەزانم بینوسم ، ئەویش ئەوەتە ، جەنابی مامۆستا مەلا کەریم لای‌وایە برێ ووشەی هەورامی «**نی ی**» ئیضافەی نیە ، لەبەری ئەوە لە دیوانەکەدا نەینوسیون ، هەروەکو لەم شیعرانەدا کە لەباتی ئەوەی بنوسێ (**بولبولی گوڵشەن**» نوسیویە «**بولبول گوڵشەن**» یان لەباتی «**نەی دەسی نەی‌چی**» نوسیویەتی : نەی دەس نەی‌چی یان لەباتی «**تەواری تەرلان**» نوسیویە «**تەوار تەرلان**» .

من بە چەن بەڵگەیێك لام‌وایە جگە لەو شوێنانەدا کە بەهاوردنی ئەو نی یە کێشی شیعرەکە تێك بچێت ، ئەگینا هاوردنی ئەو نی‌یە جوانترەو هەقی خۆیشیەتی . بەڵگەکانیشم ئەمەنە .

یەکەم من خۆم هەورامیم وە هەمو شوێنێکی هەورامان گەراوم لەون ، تەخت ، دزڵی ، ژاوەرۆ ، هەمویشیان ئامۆشۆی بیارەیان کردوە ، هیچکام بەبێ ئیضافە قسە ناکەن جارجار (**واوی**) ئیضافە جار جارەیش (**نی ی**) ئیضافە بەکار دێرن . واوەکەیش بەم جۆرەیە (**نەیەو دەسو نەیچی**) (**بلبلو گوڵشەنی**) (**تەوارەو تەرلانی**) .

ـێینەوە سەری باسەکەی خۆمان. لەلاپەرەی «٩٣» دا، لە بارەی جەلال وە تەجەللاوە باسی کردوە وە پیشان ئەدات، حاڵەتی جەلال حاڵەتی تورەیی و قەهرە

«**سەیری ووشەی جەلال بکەن هەرلەم کتێبەدا**»، جا ئەڵێ «**بسم الله**» تۆ کەوای لە جەلال دا دە بەدەرە بەری تیرەکانت.

لە لاپەرەکانی «**٩٤ تا ٩٦**» دا، سەرلەنوێ باسی دەفـو ساقی و مەی و نەی و ئاهەنگ و موطریب ئەکات، بەلاّم ئەمانە ئامادە ئەکات بۆ رۆیشتن بۆزیارەتی حەزرەتی غەوث لە بەغدا، وە ووشەی خوشوع وە دوعایش بەکار ئەبات کەهەموی بابەتی صۆفیەتی و ووشەی بەکاربراوی صۆفیەتی یە.

مەولەویی لە لاپەرەی «**١٠٥**» بەولاوە سەبارەت بەپیریی باس ئەکات وە ناسك کارێکی زۆری بەکار بردوە، ئەڵێ، ناوچاوانم ئارەزوی زیارەتی ئەژنۆم ئەکات وەئەمەش کرنوش بردنە بۆ جەنابی پیریی.

بەکورتی ئەیباتەوە سەری ئەوەی کەئیتر وادەی تۆبەی یەکجاریی یە، وە باسی سەرکەشی یەکانی خۆی ئەکات وەئەڵێ ئەمانە هەموی هی سەرچڵی و لاویی بون وەئیتر وادەی تۆبەمە، خودایا تۆیش ئەم تەوبەمە لیٚ قوبولٚ کەیت.

وتمان تۆبەش یەکێکە لەمەقامەکانی تەصەووف. لەلاپەرەی «**١١٩**» بەولاوە لە نامەیێکدا بۆ شێخ موحەممەد جەسیم ناو، سکالاّ لە دەستی دووریی ئەو ئەکات وە ئەڵێ، جیهانی زانیاریی بیٚخاوەنەو مەدرەسەکان چۆڵن. لەم نامەیەدا موصطەلەحانێکی زۆری صۆفی‌گەریی بەکاربردوەو بریٚ یاسای تەصەووفیشی هاوردوەتە ناوەوە.

وەکو تەقدیس، تەمجید، تەوحید، «**كشف الغطا**» هەرچەند لێرەدا ناوی کتێبێکە بەلاّم حاڵەتێکیشە کە بەسەری دڵی ریٚبواردا دێت وەشتی پشت‌پەردەی پیشان ئەدەن، وە پاشان باسی تەسلیم ئەکات، واتە رازی‌بون بە تەقدیری خودا، کە مەقامی تەسلیم یەکێکە لەمەقامە بالاّکانی صۆفیەتی ی، ئەڵێ:

هەر شێری جەشیر شێران شیر وەردەن
گەردەن پەی زەنجیر تەقدیر کەچ کەردەن

**«تەوبە» :**

هەروەکو وتمان ، مەقام هەیەو حالْ هەیە ، مەقام بەوچۆنیەتە بەردەوامە ئەڵێن ڕێبواری ڕێگەی تەصەووف تیا ئەمێنێتەوە تا هەرکاتێ خوای گەورە بیەوێت ، وە ئەوکەسە «استعداد» وە «قابلیەت» ی هەڵگرێت بۆ مەقامێکی بالأتر ، هەروەکو چۆنیەتی ئیستەی کاربەی سپێرراوو فەرمانبەری میری کە لە پایەیێکەوە «تەرفیع» ئەکەن بۆ پایەیێکی باڵاتر ، حاڵیش ، خۆشیو ناخۆشییێك ، وەیان گەرمیو ڕووناکیو بەرەکەتێکە ، زوو تێپەڕ ، دێتو ئەچێت وە ڕێبوار خۆی هەستی ئەکات ، ئەویش ئەکرێت «تەشبیهی کەین» بە پاداش ، وەیان «تەشویق» وە ئافەرینێك ، وەیان ، دڵخۆش‌کردنێکی زوانیی ، یان ماددیی ، کە لەگەڵ کاربەدەستێکی میریدا ئەکرێت ، کە ئەو شتە خۆی پایەو پلە نیە ، بەڵام ، ئەکرێ موژدەییێك وە دڵخۆشییێك بێت بۆ ئەو کاربەدەستە ، لەئاکامدا لەو دڵ خۆش کردنو ئافەرین‌کردنانەوە بۆی دەرکەوێت ، کە میری لێی ڕازییەو ، وائەوەدا پایەی بالأتری بدرێتێ .

جاوتمان مەقام زۆرن ، بەڵام ، دەمەقام هەن ، ئەکرێ بڵێین وەکو بنجو ڕیشە ، وەیان ساق درەختێکن هەمو مەقامەکانیتر ئەبنە لقو پۆپیان ، ئەگەر بێتو باوەڕی هەمو پیاوە گەورەکانی ڕێگەی تەسەووفیش بگرینەپێش‌چاو ، کەبڕێك لە حاڵەکانیان بەمەقام ناساندوە ، مەقامە بەناوبانگەکان لەپانزە مەقامیش زیاترن وائیستە یەکەیەکەی ئەو دەپانزە مەقامانەتان «بەوچەشنەی ئەوگەورەپیاوانە خۆیان وتویانە» پێ‌ئەناسێنین ، وە باسیان ئەکەین .

پێشەنگی هەمو مەقامەکان ، مەقامی «تەوبە» یە ، بێگومان ، هەر مەقامەی خۆی شوێنەوارو (صەلاحیەتو) چوارچێوەیێکی هەیە ، مەگەر ئەو کەسە خۆی هەستی‌پێ‌بکات کە وا لە مەقامەکەدا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هەر ئەو گەورە پیاوانە خۆیان ، بڕیجار بڕێ شتیان درکاندوە ، سا یان بە نووسین وە یان بە گوتن ، ئەوانەمان بەدەستەوەیەو ، هەروەها «ظاهیری‌شەرعی» ئەوشتەش ، لەگەڵی ئایاتی قورئانی‌یێکدا کە لەوبارەوە هاتون .

بەباوەڕی گەورەپیاوانی ڕێگەی تەصەووف ، «تەوبە» ئەبێتە پەشیمان بونەوەو دەس هەڵگرتن لەکاری دژی فەرمانی خودا ، بەپێی دەستوری قورئان تەوبە فەرزە

لەسەری هەمو موسوڵمانێك، لە سورەی نوردا، خوا ئەفەرمێ. «وتوبوا الی اللهِ جَمیعاً ایُّها المؤمنونَ لَعلّکُمْ تُفْلِحون» کەوابو لەسەری هەمو موسوڵمانێکە تەوبە بکات، چۆن تەوبەیێك؟ «یاأیُّها الّذینَ آمنوا توبوا الی اللهِ توبةً نصوحاً» بەکورتی ی، نەصوح ئەبێتە تەوبەیێکی بێگەڕانەوە، تەوبەیێك لەکانگای دەرونەوە هەڵقوڵێت وە لەپەشیمانییێکی راستەقینەوە سەرچاوەبگرێت، واتە ئەبێ تۆلەدڵ‌ودەرونەوە بگۆرێیت تاخوایش یارمەتیت بدات، هەروەکو کەئەفەرمێ «اِنَّ اللهَ لایُغَیِّرُ مابِقَومٍ حتّی یُغَیِّروا ما بِأَنفُسِهِمْ»، «ئەبوطالیب ئەلمەککی» «۳۷۸»ك لەکتێبی «قوت القلوب» دا «۳۰» لاپەرە هەر لەسەری باسی‌تەوبە چوەجا چۆن دیارە کە تەوبە فەرزە ئەوە ئایەت بۆ ئەنجامدانی کە لە پێشا وتمان، کەواتە بوە فەرز، ئەی‌ئەگەر تەوبە نەکەین؟ ئەوەتا لەسورەی حوجورات ئایەتی «۱۱» دا ئەفەرمێ«وَمَنْ لَمْ یَتُبْ فاولئكَ هُمُ الظالمون» کەواتە تەوبەنەکەر، بەپێی دەستوری قورئان «ظالم» و لەزومرەی ستەمکاران دائەنرێت»هەر بەپێی‌ئایەت خوای‌گەورە هەم تەوبە قوبوڵ ئەکات وەهەم گوناهی تەوبەکاریش ئەبەخشێت جونکە ئەفەرمێ «ان اللهَ یُحِبُّ التوّابین» وە من لەوەوپێش لەکاتی‌باسی‌ئەوەدا کە تەصەووف رێرەویکی ئیسلامییە هەموی ئەوئایەتانەم نوسیون وەپێویستی بەدوبارەکردن نیە، جا بزانین گەورەپیاوانی تەصەووف تەوبە چۆن باس‌ئەکەن، وە بەلایانەوە تەوبە چۆنەو چەندپلەی هەیە، ئەم‌گەورەپیاوانە ئەڵێن، تەوبە بناغەی هەمو حاڵ‌و مەقامێکە وەهەرچی حاڵ‌و مەقامە کە باس ئەکرێت بەهۆەو ئاکامو ئەنجامی تەوبەن، زەوی چ دەورێك ئەبینێ لە دروس‌کردنی خانوو بەرەدا، کە بە بێ زەوی خانوو ناکرێتەوە، تەوبەش بۆ حاڵ‌و مەقام واتە، چونکە بە بێ تەوبە هیچ حاڵ‌و مەقامێك دەس‌ناکەوێت، جا تەوبە سێ‌پلەی هەیە.

۱ - «تەوبە» : «وانّی لَغَفارٌ لِمَنْ تابَ وآمَنَ وعَمِلَ صالحاً» «غافرُ الذّنب قابِلُ التّوب»
۲ - «انابە» : «وجاء بقلب منیب».
۳ - «أوبە» : «نعم العبد انه اوّاب».

تەوبە، خۆی بەشێوەیێکی تێکڕایی، دەس‌هەڵگرتنە،بە شێوەیێکی ئاشکراو نهێنی لەهەرچی موخالەفەی شەرعە»واتە هەرچی خوایێ‌ناخۆشە وەدەس‌پێکردن، وئەنجامدانی هەرچی خودایێ خۆشە بەپێی شەرع بە ئاشکراو نهێنی.

جا هەروەکو وتم سیٚ پلە دانروە بۆ ئەم پەشیمانی یە، ئەوکەسەی تەوبەکەی لەترسی «عەذاب»، واتە ئازاری خودا، وە بۆ وەرگرتنی پاداشی خۆشی ی ئەم دنیا وەیان بەهەشت، لەودنیادابو، ئەوە «تەوبە»ی کردوە. وە «تائب»ە ئەوکەسەش، هەرلەبەرشەرم لەخودا، وەلەبەرئەوەی خودا چاوی لەکردەوەکانیەتی، وە لە هەموشتێکی ئاگاداره تەوبەی کرد ئەوە «مونیب» کەوتوەتەبەشی «إنابه» وە ئەوکەسەش، کەهەر لەبەر دان نان بەعەظەمەتی خوادایە کەنزیکی خراپەناکەوێتو، هەموچاکەیێکیشی لیٚ ئەوەشێتەوە، ئەوە کەوتوەتە بەشی «تەوبە» وە بە «اَوّاب» ناوبراوە.

جاصوفی یەکان باسێکی تریشیان هاوردوەتە ناوەوە لەبارەی ئەوەوە کە مرۆڤ ئەبیٚ لە چ شتێك تەوبەکات، قوشەیری «٤٦٥» ك، لەزوانی ذوالنون میصریەوە کەیەکێکە لەگەورەپیاوانی تەصەووف ئەلێت: تەوبەی خەلّك بریاردانە بۆ دەس هەلٚگرتن لە گوناەکردن، بەلّام تەوبەی پیاوچاکان، ئەوەتە دەس لە «غەفلەت» هەلٚگرن، واتە بکۆشن بۆ ئەوەی، هەرگیز، وەبۆ تاقە چرکەیێکیش، خوایان لەبیرنەچێت.

«عبد الله التميمي» کە یەکێکە لە گەورەپیاوانی تەصەووف، ئەلێت، ماوە زۆرە، لەنێوانی تەوبەیێکو تەوبەییکی ترا، برێ کەس، بریارئەدەن دەست هەلٚگرن لە گوناە، هی وایش هەیە بریارئەدات دەست هەلٚگرێت لە هەلەو لە «غەفلەت»، بەلّام هی وایش هەیە، تەوبە ئەکات لەوەی کە چاوی لەچاکەی خۆی ئەبێت، واتە ئەکۆشێت لە پەرستشو چاکەکانی خۆی ورد نەبێتەوە، وە بەهیچیان دانێت.

«سَهْل ابن عبد الله» «٨١٨ – ٨٩٦»م، ئەلێت، تەوبە ئەوەتە، گوناهانی خۆت لەبیرنەبەریەوە.

واتە هەمیشە گوناهی خۆت لەپێش چاوبێت، بۆ ئەوەی بکۆشیت بەچاکەو پەرستش، تۆلەی بکەیتەوە.

بەلّام «جونەید» ئەلێت، تەوبە ئەوەتە گوناهانت لەبیربچێتەوە، جا ئەوەی «سەهل» بۆ صوفی تازەکارە کە چاوی لە کردەوەی ناشیرینی پێشویەتی و، بەگەرمیش سەرگەرمی پەرستشە، بەلّام ئەمەی «جونەید» کە ئەلێت گوناهانت لەبیربچنەوە، واتە، ئەوەندە غەرقی خواپەرستی بیت، نەك هەر گوناە تەنانەت خۆیشت

لەبیربچێتەوە جانەمەش هی پێگەیشتوانو گەورەپیاوانی ئەو ڕێگاتە، ئەوەش ئەگەیێنێت تازە مادام تەوبە تەوبە بێت، خوا، گوناهکاری بەخشیوەو ئیتر یادکردنی ناوێت بەڵام «رُوَیْمْ ابن اَحْمَد» هاوچەرخی جونەید ئەو، باوەڕێکی تری هەیە، ئەوئەڵێت، ئەبێ تەوبە بکەیت، لە «تەوبە» جانەموتارە، ئەگەر ظاهیرو ڕواڵەتەکەی سەیرکەین، پێچەوانەی شەرعە، چونکە وتمان تەوبە فەرزە دەی چۆن تەوبە بکەین لە فەرز ؟ وەکو ئەوەتە تەوبە بکەین لەنوێژ، بەڵام، مەبەستی «رویم» سوفیانەیە ئەڵێ نابێ هەرچاوت لە تەوبەکەت بێت، وە بیکەیتە ورکە بۆخۆت، وە وا بزانیتە، کارێکی گرنگت ئەنجامداوە، ئەوە وەسوەسەی شەیتانە بۆئەوەتە لە خودا غافڵت کات بەڵکو ئەبێ تەوبە بکەی لەو باسی تەوبەیە، وە لە پاداشی چاکی ی تەوبە وەلەوەی کەتۆ ئەم کارەت ئەنجامداوە، جا تەوبە لەخەیاڵی تەوبە بکەو، هەر سەرگەرمی خواپەرستی ی بە.

بەمچەشنە بۆمان هەیە بڵێین، تەوبە سنورو دیوارو بڕگەیێکە، لە نێوانی ژیانی پێش تەوبەکردن،واتە پێش پەشیمانبونەوە لە کردەوەی ناپەسەندەوە ژیانی تازەی دوای تەوبە کردن، ژیانی خواپەرستیو بەپێی فەرمانی شەرع جوڵانە وە.

ئەیش توانین، چەن مەرجێکی بۆ دانێین، وەکو ئەوەی پەشیمانبونەوەو شەرمەزاری یەلە کردەوەی لەوەپێش، وەلە سەرکەشی کردنو لاریگرتن لە فەرمانی خودای گەورە،لەپاشان بڕیاردانە لەسەری نەگەڕانەوە بۆلای ئەو کردەوە چەوتانە، سێهەم، دەس بەجێ دەستکردنە بە پەیڕەویکردن، بە دڵو بە گیان، لە فەرمانی خودا، بە باشترین شێوە،وە تەوبەش،هەروەکو قامکان بۆکێشا سێ پلەی سەرەتایی و ناوەندی و پایانی ی هەیە کە بریتین لە تەوبە،ئینابە،ئەوبە،ئەوەی لە ترسی سزاو بۆپاداش پاشەگەز بو ئەوە خاوەنی تەوبەیە،ئەوەش لەبەر شەرمەزاری خۆی، وە لەبەر ئەوەی کەخوا بە حاضر ئەزانێت، وە ڕوی نیە گوناه بکات وە دەس لە خراپە هەڵئەگری وە تەوبە ئەکات،ئەوەش خاوەنی «ئینابە» یە،ئەوەش، هەر لەبەر ئەوەی بەندەی خودایەو، لەخۆشەویستی ی خودادا تەوبەئەکات و چاوی نە لەپاداشی بەهەشتو نەلەسزای جەهەننەمە ئەوەش خاوەنی «ئەوبە» یە: وئایەتی «نِعْمَ العَبْدُ اِنَّهُ اَوَّاب» بۆئەوجۆرەبەندانەیە، کەخوا دەربارەی بڕێ لەپەیامبەرەکان فەرمویانە، «سەرەڕای هەموی ئەمانەش» تەوبە مەقامێکی گەورەی گەورەپیاوانی شارێگای تەصەووفە، وەخەڵاتو بەراتی تایبەت وپێناسو شوێنەواری خۆی هەیە،

کەمەگەر هەرخوا بیزانێت‌و ئەوبەندە سەربەرزو خوشبەختانەی کە ئەو خەڵاتە ئەکرێن، «**شیخ الاسلام عبد الله الانصاري الهروی**» «٣٩٦ – ٤٨١» ك، لەکتێبی «**منازل السائرین**» دا ئەڵێت، «**ولایَتِمُّ مقام التوبة، الا بالانتهاء الی التوبة مما دون الحق ثم رؤیة علة تلك التوبة، ثم التوبة من رؤیة تلك العلة**» واتە مەقامی تەوبە بەتەواوی نەبوەتە هی کەسێك، مەگەر ئەوکەسەی گەیشتبێتە ئەوەی، جگە خودا تەوبەی لەهەموشتێ کردبێت واتە دەستی لەهەمو وەسیلەو هەموشتێ بەردابێت، وە تەنها دەستی بەخواوە گرتبێت، لەپاشان دەستیشی هەڵگرتبێ لە هۆی تەوبەکردنەکە، کە گوناەکردن بێت، یان تەنانەت وجودو هەستی‌و بوونی خۆیشی، لەپاشان تەنانەت ئەو هۆیەشی لەبیربردبێتەوە، ئەبێتەچی ...؟.... ئەبێتە ئەوەی مەقامی‌تەوبە لەبیربردنەوەو، لەیادچونەوەی هەموشتێك جگەذاتی خودا، ئەمە خۆی «**فنای‌نەفس وەبەقا بەخودایە**» جابۆیە وتراوە مەقامی‌تەوبە، چونکە هەربریتی نیە لە بجران لە خرابەو بەسران بە چاکەوە، بەڵکو دواپلەکەی ئاوای لێ‌دێت کەوترا.

«**ابنُ القیمّ الجوزیة**» «٦٩١ – ٧٥١» ك کەلەکتێبی «**مَدارِجُ السالکین**» دا شەرحی لە «**مَنازِلُ السّائِرین**» کردوە، سەبارەت بەشەرحی ئەم‌مەقامە، وە مەقامەکانی ترەکتێبێکی هەزار لاپەڕیی هەیە جا سەبارەت بە مەقامی «**تەوبە**» ئەڵێت «**والذي ساقَهُم الی ذلك سلوك وادی الفناء فی الشُّهود، فلایَشْهَدُ مع الحقِ سَیًّا، ولاوسیلة ولارسما البتة**» لەپاشان ئەڵێ «**ونحنُ لاننکرُ ذوقَ هذا المقام، وأنّ السالك ینتهي الیه ویجد له حلاوةً ووجدا ولذة لایجدها لغیره البتة، وأنّما یُطالبُ اربابه والمشمرون الیه بأمر وراءه وهو أن هذا هو الکمال، وهو أکمل من حال من شهد افعاله وراها ورأی تفاصیلها مشاهدا لها صادرة عنه بمشیئة الله وارادته ومعونته فَشَهِدَ عبودیته، مع شهود معبوده، ولم یَغِبْ فی شهود العبودیةِ عن المعبود، ولابِشُهودِ المعبود عن العبودیّةِ، فکلاهما ناقص، والکمال أن تَشْهَدَ العبودیةَ، حاصِلةً بمنّة المعبود وفضله ومشیئته، فیجتمع لك الشهودان، فأن غبت بأحدهما عن الآخر فالمقام مقام توبة، وهل الغیبة عن العبودیة الاهضم لها ...؟**».

بەکورتی ناوەرۆکەکەی هەرئەچێتەوە سەر باسی تەوبە لەتەوبەکردن، واتە، فەنابونی بەندە، لە ذاتی هەق‌دا، وە بەقاومانەوەی ذاتی‌هەق، جا ئەڵێ، ئەوەی ئەو گەورەپیاوانی رێگەی تەصەووفەی خستوەتە سەری ئەم مەبەستە، ئەم گرتنەبەری رێگەی فەناتە، ئاواتی گەیشتن بە «**شهودە**» (**شوهود**، واتەدیتن،

وەدەستکردنی نوری حەق ، بەچاوی بەصیرەت ، بە چاوی دەرون) ئەڵێ ، بۆ بەدەستهێنانی خۆشیی شوهودە،وا ئەم خەڵکە شیوی فەنای داوەتەبەرو ئەو ڕێگایە ئەپێوێ ، جا هاتو ئەوان گەیشتن بەو ئاواتە ، (فلا يشهد مع الحق سببا) ئیتر سەبەب‌و وەسیلەیێك نابینرێت ، وە پێویستی بە دەلیل نیە چونکە گەیشتوەتە «مەدلول» «ولا وسيلة ولارسماً ، البتة» بەهیچ جۆرێ پێویست بەهیچ وەسیلەیێك نامێنێ . (وەسیلەبۆپێش لەشوهودە ، کەبوبەعَينُ‌اليقين وەسیلەی بۆچی‌یە ؟) جائەلێ ، خۆئێمە «اِنکاری» ذەوق ، واتە چەشتنو مەزەکردنی ، ئەو مەقامە ناکەین ، وە لێمان ڕوونە ڕێبواری تەسەووفی نەگاتێ ، وە شیرینی‌و خۆشیەکەی ئەچەشێ ، لەذەت‌و خۆشێیکی‌وەها کەلەهیچ شتێکی‌ترا نابینێ ، بەلام ئەوکەسانەی کەخوازیاری ئەم ذەوقەن ، وەئەوانەی کەقولیان بۆی‌کردوەبەلادا ، ئەوان ، بەمە ڕازی‌نابن‌و دانامرکێن ، وەبۆ لەوەبالاترەکەی ئەکۆشن ، کە بریتی‌یە لە «کەمال» واتە «دوایلەی خواناسی‌ی» ، وە ئەو حاڵە تەواوترو بەرزترە ، بەلای ئەوانەوە ، کە پێی‌ئەگەن‌و ئەیزانن ، وە بە باشی‌ی چەندو چۆنیەتیەکەیان ، بەدرێژی بۆدەرکەوتوەو ، بە چاوی خۆیان دیویانە ، ئەو چەن‌و چۆنەی کە بەپێی خواستی خودا خۆی‌و بە یارمەتی‌و ویستی‌ئەو ، ڕووئەدات ، «لەبارەی حاڵی‌ئەو کەسانەوە ئەڵێت» بەندەگی خۆی لەگەڵ خودایی‌و پەرستراویی ئەودا ، پێکەوە هەست ئەکات ، وە لەوکاتەشا ، هەرگیز بەندەیی خۆی ، بەرانبەر بەو پەرستراوە ، لەیادناچێت ، وە هەروها بە چاوپێ‌کەوتنی پەرستراو ، لەوکاتەدا کە ئەو بەندەیێکەو وا لە لەذەتو خۆشی چاوپی‌کەوتنا ، هەرگیز ئەم‌نزیکی‌یە نابێتەهۆی لەیادبردنەوەی گەورەیی خودا ، هەروەهاش نابێتەهۆی لەیادبردنەوەی بەندەیی‌و بچوکی‌ی‌خۆی . بەلام لەڕوانگەی مەقامی «کەمال»ەوە ، هێشتا ئەم‌حاڵەش هەر کەمال نیەو ، کەموکوری‌ی تیایە ، بەڵکو کەمال ئەوەتە ، ئەو بەندەیە هەر لەوکاتەدا بزانێت کە ئەم بەندەیی‌یەو ئەم نزیکی‌یە بە «فەضل‌و کەرەم‌و ویست‌و خواستی خوا خۆی پەیدابوە» واتە «بەئازایی بەندە نیەو بە فەضلی خودایە» ، خودا ئەفەرمێ «قل لاتمنوا عليّ إسلامكم ، بل الله يمنّ عليكم أن هَداكم للايمان (حجرات) ، هەروەها ئەفەرمێ «وهو الّذي يقبلُ التوبةَ عَنْ عبادِه ، ويعفو عَنِ السّيئات» ، بەڵێ کەمال ، ئەوەتە کەبەندە زۆرباش بزانێت ئەم پایەی بەندەیی‌یە ، لە(فەضل‌و) کەرەمی خاوەن بەندەکەوە ، واتە خوای گەورەوە ، دەستکەوتوە ، جائەگەر ئەم خۆشەویستی‌و پی‌زانینە گەیشتە ڕادەیێك خۆت لەیادچوەوە ، تەنها خودات لەیادابو ، جا بەو مەقامە ئەڵێن ، مەقامی «تەوبە» ئایا ئەم خۆلەیادچونەوە ، ئەوە ناگەیێنێت کە ئیتر تەوبەو گوناهو بەهەشت‌و جەهەننەم‌و هەموشتێك لەیادچوەتەوە . وە هەر خوا ماوەتەوەو فەضلو کەرەمی ..؟

بەم‌چەشنە دیمان تەوبە ، لەروانگەی شەرعەوە ، ئەوەتە ، لەسەری هەمو موسولمانێکە تەوبە بکات ، واتە : دەس‌هەلگری لەخیلافی‌شەرع ، وەقەرزو قولەی خەلك بداتەوە وە بەردەوام بێت لەسەری خواپەرستی‌و چاکەکردن ، بەلام لەروانگەی تەسەووفەوە ، هەم ئەم مەرجانەیشی هەیەو ، هەم لەوە زیاتریش ، بەلکو چاکەو پەرستشەکە ئەگەیێنێتە کاریێ وای لی‌ئەکات هەول‌و تێکوشانێکی بەردەوام‌بدات بو گەیشتن بە مەقامی «عین الیقین» ، وە ئیمانی کامیل ، وە ناسینی خوا بەبێ پەنابردن بە دەلیل ، چونکەئاشکرایە «مدلول» کە خودایە ، ئەگەر بەچەشنێکی ذەوق ، وەموشاهەدەی بەصیرەت ناسراو هەست‌کرا ، ئەوبەندەیە ، ئەبێتە یەکێ لە بەندە خوش‌بەخت‌و خواناسەکان ، خواناسینێکی وەها ، هیچ‌هویێك وە هیچ نەفس‌و شەیتانێك ، وەهیچ لارێگرو خوانەناسێك ، وە هیچ نوسراوەو باوەرێکی «ئیلحادیی» ناتوانێ کاری تێ‌کات ، وە بو چرکەیێك لەخودا دوری‌خاتەوە .

ئەوساکە ئەوجورە حالە خواپیی‌داوەیە ئەبێتە مەقامێك کەپێی ئەلێن «تەوبە» وە یەکێکە لە مەقامە هەرەگەورەکانی تەسەووف .

---

**إنابە** :-

---

لای بریێ لەگەورەپیاوانی رێ‌رەوی تەصەووف ، بەتایبەت لای نەقشبەندی‌یەکان ، «**اینابە**» یەکێکە لە مەقامەکان ، ئەوکەسەش خاوەنی «إنابە» بێت پێی‌ئەوترێ «**مونیب**» ، بێ‌گومان لەزوربەی کتێبەکانی تەصەووف‌دا ووشەی «**انابە**» هاتوە ، بەلام لێرەدا مەبەستم «**مقامە**» ، کەبرێکیان لەکاتی پێرست کردنی مەقامەکانا ، ناوی مەقامی إنابەیان هانیوەو بریکێشیان ناویان نەهانیوە ، بونمونە (**شیخ عبداللەی‌دهلوی**) کە مورشیدی مەولاناخالیدی نەقشبەندی‌یە لەکتێبی «**ایضاح الطریق**»دا یەکەم مەقام بەمەقامی تەوبە ناوئەبات ، وە دوهەم مەقام بەمەقامی «**إنابە**» دائەنێت .

لەکتێبی «**مُعْجَم مُصْطَلَحات الصّوفیه**» دا ، ئەلێ ، ئینابە بریتی‌یە لەگەرانەوە لە «**غەفلەتەوە** ، **بوذیکر**» واتە گەرانەوە لە حالەتی لەیادبردنەوەی خودا ، بوسەری حالەتی یادکردنەوەو ناوبردنی خودا ، هەروەها ، ئەلێت دەست‌هەلگرتنە لەهەموشتێ ،

وەگەرانەوە بۆلای خودا ، ئەڵێت ، مونیب ، بەوکەسە ئەڵێن ، جگە خودا پەنایێکی تر وەکەسێکی تر شك نەبات پەنای بۆبەرێت و ، بگەرێتەوە بۆلای خودا ، **«خۆیشیان بەوانەی دەس لەخرابە هەڵئەگرن و ئەگەرێنەوە بۆلای خودا ، هەرئەڵێین ، فلانەکەس گەڕاوەتەوە»** واتە لەخرابەوە گەڕاوەتەوە بۆچاکە ، لەگومرایی و وێڵی و سەرگەردانی یەوە بۆسەری ڕێگای ڕاست ، لەلای خەڵقەوە بۆلای خالیق ، جا ئەم گەڕانەوەیە کاتێ صوفی یانەیە ، جۆرێك بگەرێتەوە ، خۆی لەبیر بچێتەوە وەهەر خودای لەیادبێت .

هەر لەم کتێبەدا ئەڵێت ، ئەڵێن ئینابەی بەندە سێ جۆرە ، ئینابە بەنەفس ، بە دڵ ، بەڕۆح ، ئینابەی نەفس ، ئەوەتە تەرخانی کات بۆخذمەتی خودا ، واتە ئەنجامدانی هەرچی سپاردەیە ، ئینابەی دڵ ئەوەتە ، جگەخوا هیچی تری تیانەیێڵێ واتە ، تەرخانکردنی دڵ بۆیادی خودا ، وەگسلك دانی لەهەرچی شتی ترە ، ئینابەی ڕۆحیش ، بەردەوام بونە لەسەری **«ذیکر»** واتە ، ناوی خودا بردن و یادی خودا کردن بەجۆرێك نەپەرژێتەوە سەرهیچی تر وەپەنا نەبات بەکەسی تر ، وەکەس نەکاتە هاوشانی خودا لەدەرونا .

**سیخ عومەری سەهرەوەردیش «٥٣٩ - ٦٣٢»ك** ، لەکتێبی ، **«عوارف المعارف»**دا پێناسی ئینابە هەربەوجۆرە باس ئەکات کەباسمان کرد ، هەروەها ، ئەڵێت ، مونیب ، بەوکەسە ئەوترێ کە گەڕابێتەوە لەهەرچی شتێ سەرگەرمی کا بەخۆیەوەو خودای لەبیرباتەوە ، بۆلای خودا خۆی ، هەروەها ئەڵێت **«مونیب»** کەسێکە کە جگە خوا کەس شك نەبات ، واتە هیچ کەس بەکەسی خۆی نەزانێت خوانەبێت ، لەپاشان ئەڵێت ئەوەی پێویستە بۆدامەزراندنی **«ئینابە»** ئەوەتە ئەوکەسە مەقامی تەوبەی بڕیبێت ، تەوبەش دانامەزرێت تاوەکو **«موجاهەدە»** خەبات وتێ کۆشانی بەندە ، خەباتێکی دامەزراو نەبێت ، خەباتیش ، بەبێ بەدەس هێنانی پلەی **«صەبر»** دەست ناکەوێت .

**«شیخ عبدالله الأنصاری الهروی» (٣٩٦ - ٤٨١)** ك ، ئەویش سەبارەت بەئینابە ، لەپێشا دەس بۆئەم ئایەتە ڕائەکێشی کەئەفەرمێ **«وَأَنیبوا إِلی رَبِّکم»** جا ئایەتەکە ئەڵێت **«وأَنیبوا إلی رَبِّکم وَأَسْلِموا لَه مِنْ قَبلِ أَن یأتیکُمْ العذابُ ثم لاتُنْصَرون»** (زمر) «٥٤» واتە بگەرێنەوە بۆلای خوا وە لەخوداپەرستی دا ئیخلاصتان هەبێت ، بەرلەوەی کاتی سزادان بگات و هیچ کارێکتان لەدەستنەیێت ، جائەڵێت .

(ئینابە) سێ شتە .

گەڕانەوە بۆلای خودا بەنیازی ڕێ چاك گرتنەبەر وەبۆ چاكبوون ، وە

عوززرهێنانەوە بۆلەوەوبەرت ، گەڕانەوە بۆلای خودا بەشێوەی وەفا ، وە بەردەوام بونیش لەسەری ئەو وەفایە ،

گەڕانەوەی دەس بەجێ ، وەلەدەرونەوە ، وەبۆ وەلامی نەوداوا کردنەی کەخودا ئەفەرمێ «وأنيبوا» ... هتد ..

## زوهد :

یەکێکە لەمەقامەکانی تەصەووف . ووشەی زوهد تەنها جارێك لەقورئانا لەسورەتی یوسف دا هاتوە کەئەویش پەیوەندێکی بەمزوهدەوەنیە «وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ» زوهد ، بەرەوالەت ئەتوانین بلێین : چاوتێری و بەکەمڕازی بونە «الزُّهْد : الشَّيْءُ القليل» وە بە بەشی خۆ دامرکان ، وە خۆنەپروکاندنە بۆ بەدەست هێنانی سەرمایەو سامان ، ئەیش توانین بلێین بایەی دانەنانە بۆدنیا ، وە دەس هەڵگرتن و پشت گوێ خستنی دنیایە ، نەك هەرسامانو سەرمایە ، بەڵکو مەقامو مەنصەبیش ، یان هەوڵدان بۆئەوەی ناوت بەچاك دەرچێت ؛ زوهد ، بەبێ خۆش ویستنی فوقر ، واتە «هەژاری» وە بەبێ ؛ بە بەشی خۆدامرکان واتە «قەناعەت» ، رێك ناکەوێت ، جا ، گەورەپیاوانی رێڕەوی تەسەووف زۆرباسیان لەبارەی زوهدەوە کردوە ، وە «زاهید» . یەکێکە لەوێناسانەی ، کەئەبێ لەمرۆڤێکی صوفیدا هەبێت ، ئیستە ئێمە ، ئەگەڕێینەوە بۆ سەرەتای ئەم خدەیە لەئیسلاما ، تەنانەت بەرلەئیسلامیش ....... ؛ هەروەها ئەروانین بزانین گەورەپیاوانی تەسەووف سەبارەت بەم مەقامە چی ئەفەرمون .

ئەوەی لە لێکۆڵینەوەی کتێبە مێژوییەکانی تەصەووف دا ڕوونی ئەکاتەوە ، ئەوەمان بۆدەرئەخات کە پشت لەدنیاهەڵکردن و کەنارەگیری و خۆدوورخستنەوە لەکێشەکێشی ماڵوسامان پێکەوەنان ... ؛ بەرلەئیسلامیش لەناوی عەرەبەکانا هەربوە ؛ هەروەها لە ئایینەکانیشا ، وەکو ئاینی عیسایی یەکان ، هەرباوبوە ، وە لەسەرەتای هاتنی ئیسلام دا ، کەسانێکی وەکو «وەرەقەبن نوفل» وە «سەطیح» وە «قەس بن

ساعده»: وەزۆری‌تربون، بەتایبەت لە «ئەحناف»، واتە پەیرەوانی حەزرەتی ئیبراهیم، باوانگەورەی پێغەمبەری خۆمان: درودی‌خودایان لەسەر، زۆرکەس بون، کە «زاهید» بون، زاهید: بەو واتایەی کەوتمان، کەم تەماعی‌و کەنارەگیری‌و خۆنەپڕوکاندن بۆسامان‌و پلەوپایە: لەناوی یارانی پەیامبەریشدا؛ بڕێك بەزاهید ناسراون، وەکو، «بیلال» «ابوذر» وە «سەلمان»، وەئەصحابی صەففە، وەزۆری‌تر، بێ‌گومان لەقورئاندا، ئایەت زۆرە بۆئەوەی، هەرچەن دنیاخۆشەو خۆشیی حەلاڵیش، ناپەسەندنیە، بەڵام لەگەڵ‌ئەوەشا، خۆشیی ئەودنیا زۆرترو بەردەوام‌ترو بەکەڵك‌ترە، وەکوئەوەی کەئەفەرمێ «یاأیُّها النّاسُ إنَّ وَعْدَ اللهِ حَقٌّ فَلا تَغُرَّنَّکُمُ الحیاةُ الدُّنیا ولایَغُرَّنَّکُمْ بِاللهِ الغَرورُ — (فاطر) «٥»، یان «وَماهَذِهِ الحیاةُ الدُّنیا اِلاّ لَهْوٌ وَلَعِبٌ، وانَّ الدّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الحَیَوانُ لَوْکانوا یَعْلَمون» (العنکبوت) (٦٤)، «المالُ وَالبَنونَ زِینَةُ الحیاةِ الدُّنیا وَالباقیاتُ الصّالِحاتُ خَیْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَواباً وَخَیْرٌ أملاً»، الکهف، (٤٦)، وەزۆرئایەی تریش، هەروەها حەدیثی‌پێغەمبەر درودی خوای‌لەسەر، سەبارەت بە بێ‌بایخی دنیا زۆرە؛ «هەروەکوگوتم فەرمودەیش بۆکاروکاسبی حەلاڵ زۆرە» بەلام، زوهد ئەوەناگەیێنێ کە بێکاردانیشیت بەڵکو ئەوەتە... هەم دڵت نەکەیتە جێگەی ئاوات‌و خوزگەی سەرمایە وەهەم دەس‌کەوتەکەت حەڵاڵ بێت وە هەم بەکەمیش ڕازی‌بیت وە ناشوکورنەبی: جا لەپاش زەمانی‌پەیامبەر زۆرێك لەگەورەپیاوان، بە «زاهید»، ناوبانگیان دەرکردوە وەکو (حسن البصری) کە لە (١١٠) ك، وەفاتی‌کردوە لەپاشان (ئیبراهیم بن‌ئەدهەم) کە (١٦١) ك وەفاتی‌کردوە داوود الطائی (١٦٥) ك، وە فەضیل‌بن عەیاض، (١٨٧)ك، وەشەقیق ئەلبەلخی (١٩٤) ك، وەزۆری‌تریش پێغەمبەری‌گەورە، سەبارەت بەزوهد، ئەفەرمێ، «اِزْهَدْ فی الدُّنیا یُحِبَّكَ اللهُ، وَازْهَدْ فی ما فی أیْدی النّاسِ یُحِبّوكَ»، (ابن‌ماجه)، حەزرەتی‌عەلی ئەفەرمێ «الزُّهْدُ أنْ لاتُبالی مَنْ أکَلَ الدُّنیا مِنْ مُؤمِنٍ أوْ کافِرٍ».

جونەیدی‌بەغدادی ئەڵێت «الزُّهْدُ اِسْتِصْغارُ الدُّنیا وَمَحْوُ آثارِها مِنَ القَلْبِ»، ئەبوسولەیمانی دارانی، ئەڵێت «الزهد ترك مایشغل عن الله»

سری‌سەقطی ئەڵێت «لایَطیبُ عیشُ الزّاهد إذا اشْتَغَلَ عَنْ نَفْسِهِ ولا یَطیبُ عَیْشُ العارِفِ إذا اشْتَغَلَ بِنَفسه» یحی بن معاذ ئەڵیت، (لایبلغُ احدٌ حقیقةَ الزّهد حتّی یکون فیه ثلاث خصالٍ، عَمَلٌ بلا علاقه، وقولٌ بلا طمع، وَعِزٌّ بلا ریاسه).

«بشرالحافی» ئەڵێت «الزّهدُ مُلكٌ لايسكنُ إلاّ في قلبٍ مُخلٍ».

هەم دیسان «سری‌سەقطی» ئەڵێت «الزّهدُ، اَنْ لاتاخذُ مِنْ اَحدٍ شیئا، ولاتسل أحداً شَیئاً، ولایَکُنْ مَعَك وَتُعطی مِنهُ اَحداً شیئاً».

هەمیسان (جونەید) ئەڵێت، «الزّهد خلوّ الایدی مِنَ الاَملاك، والقلوب من التّبّع»، ئەگەر بێتو هەرچی گەورەپیاوانی ڕێگەی تەصەووف وتویانەسەبارەت بەزوهد بینوسین، خۆی ئەبێتە، کتیبێك بەناوی «زوهد»، بەڵام ئەوەی کەدەستگیرمان ئەبێت، ئەوەتە، زوهد باوەڕێکە والەناوی‌دەرونا، تەنانەت تەنها بەکردەوەش دەست‌ناکەوێت، وەکوعیبادەت وایە، بۆچی نوێژ ئەگەر بەئیمانەوە نەبێت، وە لەقەناعەتی دەرونەوە، بۆیەرستش نەکرێت، کەی نوێژی ڕاستەقینەیە، بۆنمونە، بگرە بۆ ڕیابی‌وڕوپامابی بێت، بۆئەوەبێت خەڵك بەچاکی بزانن‌و باوەڕی پی‌بکەن.

جا لەم‌بارەوە، ئیمامی غەززالی باسێکی درێژی هەیە لەکتێبی (إحیاءُ العلوم دا)، ئەڵێ ئەوەی ڕقیەتی لەدنیا، هۆشوبیری وابەلای ئەو ڕق‌لی‌بونەوە، ئەوەش دنیای خۆش‌ویست هۆشی وابەلای ئەو خۆش‌ویستنەوە، زوهدئەوەتە، تۆ هۆشت تەنها بەلای خواوە بێت، ئەمەش، هەروەکو تەوبە لەتەوبەکردنەکە، ئەبێتە، زوهد لەزوهد.

پاش لێك‌دانەوەی وتاری پێغەمبەری گەورە، وەگەورەپیاوانی ڕێگەی تەصەووف، ڕوون ئەبێتەوە زوهد ئەوەتە، خوشەویستی دونیاو بەدەس هاتەکانی دونیا لەهەموجۆرێکی، سەرمایە، مەقام، مەنصەب، لەدڵ‌دەرکرێت، چونکە بەلای ڕێبوارانی تەصەووفەوە، دڵ‌ودەرون تەنهاجێگەی خۆشەویستی خودایە وهیچی‌تر، هەروەکو لەپێشاوتمان، ئەوەی بیەوی نوری‌خودا ﷻ دڵیا جی‌نشین بێت، ئەبێ لەهەموخەوشی‌ پاکی کاتەوە، یەکێ لەوخەوشانە، خۆش‌ویستنی سەرمایەو سامان‌و مەقامە، بەڵام تێکۆشان بۆبەدەست‌هێنانی نانی‌حەڵاڵ، ئەوە پیویستە، واتە سەرمایەی حەڵاڵ بێرە دەست، بەلام دڵی‌پێوەمەبەستە، هەروەها، لەهەژاری عەیبوعارت نەبێت، چونکە یەکێ لەپایەکانی زوهد، هەژاری‌یە، لەکورتەی باسەکەدا ئەڵێین، زوهد لەڕوانگەی تەصەووفەوە، هەروا کە کردوەو باوەڕێکی پەسەندە، هەروایش پایەو مەقامێکە، کەبەشوێنی پایەومەقامی (تەوبە) دا، دێت، وەسوفیەکان، لەڕوانگەیێکی تایبەتەوە سەیری (زوهد) ئەکەن، هەروەکو، کە (اِبنُ

جا ئەم خۆپاراستنە تەنها بۆ شت خواردن نیە، بەڵکو بۆ گوتن وە هەڵسوڕانیشتیشە، وە لەهەموی گرنگتر، خۆتێ هەڵنەقوڵاندنە لەهەر کارێکا کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەتۆوە نیە، هەروەها وەرەع ئەوەتە شتێك کە لەصەداصەد نەیزانیتو دانشمەندو زانانەبیت تیایا، وەڵامی نەدەیتەوە بەڵکو ڕێکوڕاست بڵێیت من ئەم شتە نازانم، نەوەکو دەمارت ڕێگەت نەداتو بەنەزانی بنیشیتەمل وەببیتە کەوچکی هەموشلەیێك، سەبارەت بەم کارە، پێغەمبەری گەورە درودی خودای لەسەر ئەفەرمێ، «**مِنْ حُسْنِ إسلامِ المَرْءِ، تَرْكُهُ مالا يعْنيه**»، هەروەها ئەفەرمێ «**مِلاكُ دينكُمْ الورع**»، هەروەها ئەفەرمێ بە ئەبوهورەیرە «**كُنْ وَرِعاً تكُنْ اعبَدَ النّاس**» هەروەها ئەفەرمێ «**دَعْ مايُرِيبُكَ إلى مالا يُرِيبُكَ**»، ئەبو بەکری صیددیق ئەفەرمێ «**كُنّا نَدَعَ سبعين بابا مِنَ الحلال مَخافَةَ اَنْ نَقَعَ في بابٍ مِنَ الحرام**»، جورجانی لەکتێبی تەعریفاتدا ئەڵێت «**وەرع خۆپاراستنە لەشتی گومانلێکراو لەترسی ئەوەدا دوچاری شتی حەرام نەبیت**».

کتێبی معجم مصطلحات الصوفية، لەباسی وەرەعدا ئەڵێت، «**وەرع ئەوەتە مرۆڤ هەرگیز لەڕاست زیاتر هیچ نەڵێت چ پێی خۆش بێت وە چ پێی ناخۆش بێت**» هەروەها ئەڵێت، ئەوانەی ئەهلی وەرعن سێ دەستەن دەستەی یەکەمیان ئەوانەن خۆیان ئەپارێزن لەشتی گومانلێکراو، گومانلێکراویش ئەوەتە کە ئەکەوێتە نێوانی حەڵاڵی تەواو وە حەرامی تەواو، نەئەمەونەئەو، دەستەی دوهەمیش ئەوانەن هەرشتێ کەدڵیان بۆی لێنەداو پێی خۆش نەبو پارێزی لێ ئەکەن، بەڵام ئەوجۆرە کەسانەش، کەسانێکن ئەوەندە لەخوداوە نزیکن کە گەیشتونەتە ئاوامەقامێك، کەدڵیان بۆ حەرام لێناداتو بێزارەلێی، دەستەی سێهەمیش ئەوکەسانەن کە بە «**عاریف**» ناوئەبرین وەگەیشتونەتە دواپلەی بەندەیی و خوداپەرستیی، وەئەوانە پارێزئەکەن لەهەرچی شتێك کەغافڵیان کات لەخودا وەبیان پەشۆکێنێ بەخۆیەوە، وەئەوەش دواپلەی وەرعە. ئیبراهیم بن ئەدهەم ئەڵێت، وەرع دەس هەڵگرتنە لەهەرچی شتی گومانلێکراوە وەلەهەرچی شتێك کەپەیوەندی ڕاستەوخۆی بەتۆوەنەبێت، وە لە «**فزولی**» کردن، واتە خۆهەڵقوڵاندنە کاری خەڵك، شیخ مەعروفی کەرخی، ئەڵێت «**وەرع ئەوەتە زمانت بپارێزیت لەپیاهەڵدانو ستایش کردن، هەروەها لێ پارێزیت لەناوونوتکەنان بەخەڵکەوەو ناوی خەڵك بەخراپ بردن**».

کەوابو وەرع بوە سێ بەشەوە بۆسێ دەستە، وە بەچەشنێکی گشتیی، خۆپاراستنە لەهەموشتێکی گومانلێکراو لەترسی ئەوەدا دوچاری حەرام نەبیت،

لەم بارەوە پێغەمبەر درودی خودای لەسەر ئەفەرمێ «إنَّ الحلالَ بيّنٌ وإنّ الحرام بيّن وبينهما امورٌ مشتبهات لا يَعلَمُهُنَّ كثيرٌ من الناس، فمَن اتّقى الشُّبهات فقَدْ اِستَبرأ لدينه وعِرْضه، ومَنْ وَقَع في الشّبهات وَقَع في الحرام، كالراعي يرعى حول الحمى يوشك ان يرتع فيه، ألاَ وَانّ لِكلّ مَلْك حِمىً ألاَ وَانّ حِمىَ الله محارمُه» «صحيح البخاري».

سوفیانی ئەوری ئەڵێت «هیچ شتێك لەوەرع ئاسانترنیە ئەویش ئەوەتە هەرچی کەدودڵ بوی لێی مەیکەو دەستی لێ هەڵگرە» کەواتە ئەم مەقامی وەرعەی کەصوفیەکان ئەیکەنە پیشەو خدەی خۆیان، سەرچاوەکەی، لەخوخدەو فەرمایشو دەستوری پێغەمبەری گەورەوە هاتوە وەصوفیەکان موبەمو پەیرەوی لێ ئەکەن، تائەبێتە خووخدەبۆیان، وە کەبویە خووخدە، ئەبێتە مەقامێك لەمەقامەکانیان.

وەصوفیە ڕاستەقینە پێ گەیشتوەکان وەرعیان ئەگاتە ڕادەیێك، تەنانەت لەپیشان دانو دەربرینی کەشفوکەرامات پارێزئەکەنو خۆیان لائەدەن،واتە لەهەمان کاتا کە خاوەن کەرامەتن وەخوای گەورە برێ شتیان بۆروون ئەکاتەوەو ئەیخاتەپێش چاویان ئەوان لەترسی ئەوەی مەبادا ببێتە هۆی غووروری نەفس وەخۆهەڵ کێشان نای درکێنن، هەرلەم بارەوە گەورەپیاوانی تەصەووف ئەفەرمون «لا كَرامةَ اِلاّ لِحِكمَة»، واتە ئەگەر زەرورەتو حیکمەتێك نەبێت پێویستی بەپیشان دانی کەرامەت نیە، وەهەرکەسێك پێی خۆش بێت کەراماتێك کەخودا بەوی پیشان داوە خێرادەری برێت یان پێی خۆش بێت خەڵك باسی کەراماتەکەی بکەن، ئەوە فری بەسەری شارێگەی تەصەووفەوە نیە.

«ئەبوطالب المكي» لەقوت القلوب دا ئەڵێت، قال بعض الصّوفية «مَنْ اَحَبَّ اَنْ يعرِفَ وَرْعَهُ غير الله تعالى فَلَيسَ مِنَ الله في شيء».

بەڵێ (وەرع) خۆپاراستنە لەگوناه،لەشتی گومان کراو لەحەلاڵ بونیا، لەوەی بەزمان بەکردەوە ئەگەر کارێ ئەنجام دەیت، باکاری چاکەیش بێت، جگە بۆرەزای خوا بۆهیچی تربێت. ئەوکەسەی کەلەدڵ ودەرونەوە وای لێهات ئەوپێناسانەی کەوتمان لەدڵ ودەرونیا هاتەدی وەبویە، خووخدەی، واگەیشتوەتە مەقامی (وەرع).

**«قەناعەت»**

لەکتێبی «مُعْجَم مُصطلحات الصّوفيةدا» ئەڵێت. قەناعەت بریتی یە لەدامرکانو

رازی‌بون، بەرادەیێك ، لە خواردەمەنی کەهەرئەوەندەبێت ژیانی پێ‌بروات بەرێگاوە، «والەبەرگری‌بکات‌لەبرسیەتی»، هەروەها دامرکان بەشتێکی کەم لەپۆشاك‌و زێرەخەرو زەخیرەی‌مال، وەئەوەتە کە فەضلی کەم بدەیت بەسەری زۆرا.

هەرلەم‌کتێبەدا ئەگێرێتەوە ئەڵێت، پێغەمبەری‌گەورە درودی‌خوای‌لەسەر ئاموژگاری ئەبوهورەیرەی کرد فەرموی، ئەگەربرسیەتی زۆری‌بۆهانیت کولێرەیێك و گۆزەیێك ئاو پەیدا کەو خوای‌ئەکرد دنیاوێران‌ئەبو.

هەروەها پێغەمبەر فەرمویەتی «القناعةُ کنزٌ لا یَفنی» واتە قەناعەت گەنجێکە هەرگیز دوایی‌نایێت. «ابو عبد الله خفیف» ئەڵێت، قەناعەت ئەوەتە، نەرۆی بەشوێنی ئەوەیدا کە خۆت‌نیتە، وەدامرکێیت بەوەی کەخۆت هەتە.

(محمد بن علي الترمزي)، ئەڵێت «القناعة رضا النفس بما قسم لها من الرزق»، واتەقەناعەت‌ئەوەتە نەفس‌رازی‌بێت بەو بەشەی‌کەخواداویەتی.

لەروانگەی تەصەووفیشەوە برێك لە گەورەپیاوانی ئەم‌رێگەیە، وەکو قوشەیری، قەناعەتی‌بەمەقام داناوە، برێکیشیان ئەڵێن، پلەیێ «قەناعەت» بۆمەقامی «رەزا» وەکو «وەرع»، واتە بۆمەقامی «زوهد»، واتە، «قەناعەت»، خۆی‌مەقام‌نیە، مەقامی «رەزا» یش بەبێ‌گەیشتنە پلەی «قەناعەت» دەست‌نادات، گۆیا (وەرع) یش مەقام‌نیە بەڵکو پێشەکیە بۆمەقامی (زوهد) وەزوهد، بەبێ (وەرع)، دەست‌نادات.

لەپاشان ئەڵێن، قەناعەت دژی حیرصە، حیرص بریتی‌یە لەخۆپروکاندن‌و شەونانەسەری‌رۆژو، رۆژنانەسەری‌شەو بۆمال‌وسامان‌پێکەوەنان، قەناعەتیش دژی ئەوەتە، واتە دامرکان بەوبەشەی خوداائەیدات، وە تێکۆشان بەرادەیێکی‌پێویست، بۆبەرێوەچونی‌ژیان، بێگومان رێ‌رەوی، رێگەی تەسەووف، بەتایبەت ئەوانەی بگەنە مەقامی «ویلایەت»، ئەبێ «قانع» بن وە قەناعەت لەدڵ‌ودەرونیاندا جێگەی کردبێتەوە ئەگینا پەیرەوی‌یان نەکردوە لەسونەتی پەیامبەری گەورە ئەوەش پەیرەوی نەکا لەکرداروگوفتاری (محمد) درودی‌خودای لەسەر چۆن‌ئەکرێ وەلێ‌بێت.

ئەوەش بۆتێمە دەرکەوتوە، ئەوەتە، دەوڵەمەندی‌و سامان‌داری رێگاییکە دوایی نایێت، ئەوەی هەزاری‌هەیە سەیرئەکا هەیە ملیۆنی‌هەیە، ئەوەش ملیۆنی‌هەیە سەیرئەکا هەیە دەملیۆن‌و صەدملیۆن، هتد...، وەسامان هەرگیز دوایلەی‌نیە،

جائەگەر قەناعەتت بو، وا هەرلەسەرەتاوە دڵت رەحەتە، قەناعەتیش نەبو؛ وا تارۆژی مردن هەر خەموخەفەتی زۆرترو زۆرترتەو کاتێکیش ئەزانیت رۆیشتی وەهەموی بەجی ما، جابویە گوتراوە «**فقیرٌ کلّ ذی حرصٍ غنیٌّ کلّ مَنْ یَقْنَعْ**» ئەوەی هەر هەڵپەیەتی، بۆساما‌ن پێکەوەنان، ئەوەهەژارەو پێدەس، بەڵام ئەوەی قانع بو ئەوە دوڵەمەندەو بەدەسەڵات.

**صەبر:**

صەبر، ئەبێتە رازی‌بون وە خۆگرتن بەرانبەر بە موصیبەت وەبەلا، بێگومان هەرواگاڵتەنیە، مرۆڤ بتوانێ لەکاتی لێ‌قەومان‌و بەلاو، نەهات‌و موصیبەتدا بەبەشی‌خوا رازی‌بێت‌و هیچ پێی ناخۆش نەبێت‌و پێی تێك‌نەچێ وەبڵێ «**هەرچی لای‌خواوەهات خۆش‌هات**»، بەڵام گەورەپیاوانی تەصەووف ئەگەنە ئەوپایەو لەوە بالاتریش، وەوایان‌لێ‌دێت، فەرق بەلاو نیعمەتیان بەلاوە نامێنی؛ ئەڵێن هەردوکی خەلاتی‌خودایە، بەرانبەری بەلا هیچ‌تێك‌ناچن، وە ئەوبارەگرانە بەوپەری رووخۆشی‌یەوە هەڵ‌ئەگرن، بەرانبەر بەنیعمەتیش ئەوپەری پێزانین‌وسوپاس ئەنجام‌ئەدەن با ئەو نیعمەتە زۆریش بچوك‌بێت.

غەززالی لە (ئیحیا)دا وە (ابو طالب المکی) لە **قوت القلوب**)دا بە درێژی لەسەری باسی ئەم مەقامە رۆیشتوون، هەروەها عەبدولقادرعیسی لە کتێبی (**حقائق عن التصوف**) دا، خوای‌تەعالا لەزۆرشوێنی قورئاندا ستایشی‌کردوە لەوکەسانەی کە صەبر ئەکەنەپیشەیان.

ئەفەرمی «**اِنَّمَا یُوَفّی الصّابرون اَجْرَهُمْ بِغَیْرِ حِساب**» ئەفەرمێ «**اولئِكَ یُؤتَوْنَ اَجْرَهُمْ مرّتین بِما صَبَروا**»، ئەفەرمێ «**واصْبِروا اِنّ اللهَ مَعَ الصّابرین**»، لەسورەی والعصردا، ئەفەرمێ «**والعَصْرِ اِنّ الاِنسانَ لفی خُسْرٍ اِلاّ الّذینَ آمَنوا وَعَمِلو الصّالحاتِ وتواصوا بالحَقّ وتواصـــوا بالصّبر**» واتە ئەوانە زیان‌ناکەن وەسەرکەوتون کەخاوەن ئیمان‌و کردەوەی‌چاك‌و

لاین‌گیری هەقو خاوەن‌صەبرن «صەبروتەقوا» زۆرجار لەقورئانا پێکەوە هاتون «ومن یتق ویصبر» (وان تصبروا وتتقوا فان ذلك من عزم الامور) «والصابرین في البأساء والضراء وحین الباس اولئك الذین صدقوا واولئك هـــم المتقون» ئەم مەقامە بۆیەگەورەیە چونکە هەربۆخودایە وەلەبەر ئەوەکەمرۆڤ خۆی‌ئەگرێت لەکاتی‌موصیبەتداولەکورە دەرناچێت زوربەی گەورەپیاوانی رێگەی‌تەصەووف لەسەری‌ئەوەن کەمەقامی صەبر گەورەترە لە مەقامی‌شوکور ئەڵێن، صەبرحاڵێکە بەرانبەر بە بەڵاو موصیبەت، بەڵام شوکور حاڵێکە بەرانبەر بەنیعمەت، وەدیارە هەڵگرتنی‌باری بەڵا سەخت‌ترە تائەنجام‌دانی سپاردەی سوپاس، لەبەرئەوەتە خوای‌تەعالا هەم ئەفەرمێ «اولئكَ یُؤتَوْنَ اَجْرُهُمْ مَرَّتَیْنِ بِمَا صَبَرُوا» بەڵام، بەرانبەربەشوکور نەی‌فەرمووە (مرّتین)

هەروەها ئەفەرمێ، «اِنَّمَا یُوَفّیَ الصـــــــــابرون اجْرَهُمْ بغیر حساب»، لەلایێکی‌ترەوە، خوای‌تەعالا سەبارەت بەشوکور، بەندەکانی خۆی، کەدایکوباوکی بەش‌داریان ئەکات وە ئەفەرمێ «اَنِ اشْكُرْ لی وَلوالدَیْكَ»، بەڵام بۆصەبر کەس ناکاتە شەریك وەئەفەرمێ «ولِرَبِّكَ فاصبِرْ»، یان «واصْبِرْ لِحُكْمْ رَبِّكَ»هەروەها یەکێکی‌تر لەگەورەیی مەقامی‌صەبر ئەوەتە کە مەقامی پێغەمبەرە ئولول‌عەزمەکانە کەئەفەرمێ «فاصْبِرْ کَمَا صَبر اولو العَزْمِ مِنَ الرّسُل» بەکورتیی، لەزیاتر لە نەوەد شوێندا لەقورئاندا خوای‌گەورە ستایشی لەبەندەی صابر، وە لە خەدەو رەوشی صەبرکردوە، وەفەرمانی داوە بەوەی کەبەندەکانی صەبر بکەنەپیشەیان، عطاء، لە ابن العباس، ئەگێرێتەوە، ئەڵێت پێغەمبەر درودی‌خودای لەسەر، رابورد بەلای دەستەیێك لەیاراندا کە حەزرەتی عومەریشیان تیابو، فەرموی ئایا ئێوە بەراستی خاوەن ئیمانن،؟، کەس وەڵامی نەدایەوە عومەر فەرموی بەڵێ ئەی‌پیامبەری‌خودا، پێغەمبەر فەرموی بەچیپیا دیارە، عومەر عەرزی کرد، لەکاتی‌خۆشی‌و نیعمەتدا سوپاسی خودائەکەین، وەلەکاتی بەڵادا صەبر ئەکەین، وەرازین بەقەزاوقەدەر، پێغەمبەر فەرموی بەخوداقەسەم راستەئێوە خاوەن ئیمانن.

«ابو طالب المكی» لەقوت القلوب‌دا ئەڵێ، جاری‌واهەیە کە صەبرو شوکور هەدوکیان بەشێوەی «حاڵ» خەڵاتی بەندە ئەکرێن، وە جاری‌وایش‌هەیە، مەقامن، کاتی‌واش‌هەیە مرۆڤ خاوەنی مەقامی صەبرەو خاوەنی حاڵی شوکور بەجارێکا،

ئەویان بەحالْ ئەمیان بەمەقام. کاتی وایش ئەبێت خاوەنی مەقامی شوکرەو خاوەنی حالْی صەبریشە، ئەویش بەهرەیێکی خوداییە، «**ذلكَ فَضْلُ اللهِ يؤتيهِ مَنْ يَشاء**» هەروەها ئەڵێت. «**الصّابر العارِف افضل من الشاكِرِ العارف**» ئەمەش بۆچی‌یە. چونکە صەبر هی حالەتی هەژاری‌و بی‌دەسەڵاتی‌یە وەشوکور هی حالەتی دەوڵەمەندی‌و دەسەلاتداری‌یە، وەحالەتی هەژاری بەلای خوداوە لەهی دەولەمندی پەسەندترە. جائەڵێت ئەگەربێتو فەزڵی شوکور بدەین بەسەری صەبردا وەکوئەوەتە فەزڵی دەوڵەمەندی بدەین بەسەری هەژاری‌دا،وەئەمەش لەگەلْ ڕێرەوی تەسەووف‌دا ناگونجێت، بی‌گومان گەورەپیاوانی ڕێ‌ڕەوی‌تەصەووف ئەبنە خاوەنی ئەم‌مەقامە پەسەندە، وەگەورەترین سودی ئەم‌مەقامە سەرلی‌نەشێوانو تێك‌نەچونە بەرانبەر بەرووداوی سەختونالەبار، وەئەوگەورەپیاوانە کەپێناسی صەبر ئەبێتە خوو خدەیان، هیچ‌رووداوێکی سەخت شپرزەیان ناکات‌و سەریان‌لی‌ناشێوێنێت وە وایان‌لی‌دێت نەلەسەرکەوتنا لەخۆبایی‌ئەبن وەنە لەگرفتاری‌دا ئەپەشۆکێن وەیەك‌ڕەنگ‌و یەك‌دەنگ دامەزراوو پایەدارن.

سەبارەت بەناساندنی‌مەقامی صەبر، ذوالنون المصری، ئەڵێت «**الصَّبْرُ هو التّباعُد عَنِ المخالفات، والسّكون عِنْدَ تُجرّع غُصص البليّة. واظهار الغِنىَ عِنْدَ حُلولِ الفَقْرِ بساحة المعيشه**»

وە جورجانی لەشەرحی ریاض الصالحین‌دا ئەڵێت، «**الصّبر هو ترك الشّكوى من اَلَمِ البلوى لِغَيْرِ الله**».

---

## شوکور:

---

شوکور، واتە سوپاس کردنو ڕەزامەندی پیشان‌دان وە پی‌هاتن‌و باس‌کردنی نیعمەتەکانی خودا. هەرچەن کە نیعمەتێکی زۆرکەمو بچوکیش‌بێت، ئەم‌وشەیە حەمدو سەنایش ئەگرێتەوە. حەمد هەروەکوشوکور: سوپاس‌وڕەزامەندی پیشان‌دانە: سەنایش ستایش‌کردنە.

شوکور یەکێکی‌ترە لەمەقامەکانی تەسەووف، هەروەکو سەبارەت بەمەقامەکانی تریش‌وتمان هەموی ئەم پێناسانە لەقورئان، یان لەگوفتارو کرداری پەیامبەری

گەورەوە هاتون وە بوئەوە هاتون کە موسوڵمانان پەیرەوی‌یان لێ‌بکەن، بەڵام تەصەووف ئەم پەیرەوی‌یانە ئەگەیێنێتەرادەیێك کەبینەخوو خدەیێکی هەمیشەیی و زۆرگەرمو بەتینی مرۆڤی موسوڵمان، جا کەبویە خدە، بەرهەمی مەعنەوی تایبەتی خۆی هەیە کە صۆفی خۆی هەستی‌پێ ئەکات و دەرون و رەوانی لەززەتی لێ‌ئەبات، لەقورئاندا ئایەتی‌زۆر سەبارەت بە شوکور هاتوە وەخوا خۆیشی ئەوێناسەی بۆخۆی داناوە، ئەویش بەرانبەر بەکردەوەی چاکی بەندەکانی خۆی، وەکوئەوەی کە لەسورەی (البقرە) ئایەتی (١٥٨) ئەفەرمێ «وَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْراً فَإِنَّ اللهَ شاكِرٌ عَلِيمٌ» هەروەها لەسورەی (النساء) ئایەی (١٤٧) دا ئەفەرمێ «وكانَ اللهُ شاكراً عليماً».

خوای گەورە داوای لەبەندەکانی کردوە کە سوپاسی‌بکەن وەئەفەرمێ «اِعْمَلُوا آلَ داوودَ شُكْراً وقليلٌ مِنْ عِبادِيَ الشَّكُور» (السباء) (١٣) یان کەئەفەرمێ «فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ، واشكروا لي ولاتَكْفُرُون» خودای‌گەورە پاداشی بەرزو بێ‌پایانی داناوە بۆئەوکەسانەی کەسوپاسگوزارن وەبەبەشی خوارازین، وەئەفەرمێ «وَسَنَجْزِي الشّاكِرِين». وەئەفەرمێ «لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ» سورەی ئیبراهیم ئایەی (٧).

خودای‌گەورە پاش‌ئەوەی روونی‌ئەکاتەوە کە هەم پێی‌خۆشە شوکری‌بکەین وەهەم جەزای چاکەی ئەو شوکرەمان ئەداتەوە: ئەفەرمێ: شوکوربکەن بۆخۆتانی‌ئەکەن نەیشی‌کەن خۆتان زیان ئەکەن، وەئەفەرمێ «وَمَنْ يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ» (القمر) باش پێمانی‌ئەسەلمێنێ کەهەرچی‌نیعمەتە لە ئازایی ئێمەوەنیە وە لەلوطفوکەرەمی خوداوەیە، بەتایبەت، نیعمەتی ئیمان‌وئیسلام کەئەفەرمێ «وَلَكِنَّ اللهَ حَبَّبَ اِلَيْكُمُ الايمانَ وَزَيَّنَهُ في قُلُوبِكُم» حجرات «٧» ئەمە نیعمەتێکە گەورە، لەپاشان سەبارەت بەونیعمەتە ئەفەرمێ، «فَضْلاً مِنَ اللهِ وَنِعْمَةً» : واتەئەمە گەورەییوچاکەیێکەو نیعمەتێکە کەخوا لەگەڵ موسوڵمانی کردوە، لەپاشان لەئایەی (١٧) ئەم‌سورەتەدا، ئەفەرمێ، «يَمُنُّونَ عَلَيْكَ اَنْ اَسْلَموا» واتە منەت‌ئەنێن بەسەرتا، ئەڵێن ئێمەئیسلام‌بوین، «قُلْ لاتَمُنُّوا عَلَيَّ اِسْلامَكُمْ»، ئێوە منەتم بەسەرا مەنێن کەبونەتە موسوڵمان، «بَلِ اللهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هداكُم لِلايمانِ اِنْ كُنْتُم صادِقين» ئەگەر ئێوە راست‌ئەکەن موسوڵمانن، کەواتە خوامنەت‌ئەنێ بەسەرتانا کەهیدایەتی‌داون بۆ موسوڵمان‌بون.

خودائەفەرمێ «وَلولا فَضْلُ اللهِ عَلَيكُمْ وَرَحْمَتُهُ ما زَكَىٰ مِنكُم مِنْ اَحَدٍ اَبداً» نور (٢١).

هەروەها ئەفەرمیٚ «**وَما بِكُمْ مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنَ الله**»سورەتی **(نەحل)** «٥٣»، وەلەسورەی والضّحی دا ئەفەرمیٚ «**وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ**» واتە ئەبێ پیی بێیت وە ئیعتیراف بکەیت بەنیعمەتی خودا، نەك خۆتی لیٚ ویٚل کەیت وەدەم بنوقیٚنی، جا خوای گەورە هەم ئەفەرمیٚ هەموی ئەم نیعمەتانە هی خودایە وەلەسەری بەندەیشە بۆهەمویان ستایش بکات، وەهەم ستایشی ئەوبەندانەی ئەکات کەسوپاسیان کردوە وپیٚی هاتون بەنیعمەتەکانی، بەم بۆنەوە، سەبارەت بە حەزرەتی ئیبراهیم لەسورەی **(نەحل)**، ئایەتی **(١٢٠)** و**(١٢١)** دا، ئەفەرمیٚ «**لَمْ يَكُ مِنَ المشركينَ، شاكراً لأنْعُمِه**». واتە هەم موشریك نەبو هەم سوپاس گوزاربو، وەسەبارەت بەحەزرەتی نوح ئەفەرمیٚ «**إنَّهُ كانَ عبداً شَكوراً**». جاڵایا ئەم شوکرە لە ڕوانگەی زمانەوە چی یە وە لەڕوانگەی تەسەووفەوە چی یە؟.

لەڕوانگەی زمانەوە وتمان پیی هاتن و سوپاس کردنە، بەرانبەر بەکردەوەیێکی چاك کە لەگەڵی ئینساندا کرابیٚت، «**عرفان الجميل**»، بەڵام، لەڕوانگەی تەصەووفەوە شتەکە قوڵترە ئەویش ئەوەتە، هەم بەزمان وەهەم بەلەش وەهەم بەدلٚ سوپاس بکەیت، تەصەووف ئەڵیٚت، بۆهەمو نیعمەتیٚ سوپاسی تایبەت هەیە، وەتەنهاوئەوەنیە بەدەم بلٚییت خودایا شوکور، وەتەواو، بەڵکو شوکری زمان ئەوەتە ذیکری پیی بکەیت، وە خراپی پیی نەڵییت، شوکری لەش ئەوەتە، پەرەستشی پیی بکەیت وەگوناهی پیٚنەکەیت، کاسبی حەلاڵی پیی بکەیت وە بەشوێنی حەراما هەنگاویٚ هەڵنەگریت، سوپاسی دلٚ ئەوەتە ذیکری خودای پیی بکەیت، ئەوەتە جگە لەخودا ڕیٚگەی هیچی تری تیانەکەیتەوە، هەروەها شوکری سامان و سەرمایە ئەوەتە، لەڕیٚگەی خودادا خەرجی کەیت، وەنەیکەیتە گەنج و نەقدینەو لەبانکابیمریٚنی. صوفی یەکان ئەڵین، یەکەم ووشەی قورئان، حەمدوسەنای خودایە کەسورەی «**الحمد**» ە وە وخودا ئیٚمە ریٚنمونی ئەکات کە سوپاسی بکەین وە دان بنیٚین بە «**صیفەتە**» کانیا، وەکو «**الرحمن**، **الرحيم مالك يوم الدين**»، گەورەترین نیعمەت بەلای صوفی یەوە، واتە بەلای موسڵمانی ڕاستەقینەوە، نیعمەتی «**ئیسلامە**»، چونکە تۆخۆت ئاگات لەهیچ نەبوە وە داوات نەکردوە وەخودا هەر بەلوطفی خۆی بەئیسلام دروستی کردویت وە هیدایەتی داوی بۆئیسلام.

هەروەها بەلای گەورەپیاوانی ڕیٚڕەوی تەسەووفەوە شاکربون خۆی پیٚویستی

بە شوکرە ، چونکە ئەوە خۆی گەورەترین نیعمەتە ، واتە نیعمەتی شاکربون بۆچی؟ چونکە ، ئەوەی شوکرئەکات خودا خەیرو بەرەکەت و نوورو رەحمەتی زیادئەکات «لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ» ، **تۆیش کەخوا خستویتیە سەری ئەو ریگەچاك وقانجازە؟ هەرئەوەخۆی نیعمەتە وەئەبێ شوکری لەسەربکەیت.**

صوفیەکان ئەڵێن ، باشترین ذیکر لاالەالااللە یە ، وەباشترین ستایش الحمدللەیە ، قوشەیری ئەڵی ، شوکری لەش ئەوەتە ئەندامەکانت تەنها بۆریگەی رەزامەندی خودا بەکار بێرت ، وە دڵیشت جگە لە ذیکرو ناسینی خودا بەهیچ مەشغوڵ نەکەیت ، وە زمانیشت جگەستایشی‌خودا بەکاری نەبەیت ، وە دڵیشت جگە لەذیکرو ناسینی خودا بەکاری‌نەبەیت ، وەسەرمایەشت بۆئەوەبێت لەریگەی چاکەو خذمەتی موسوڵمانانندا خەرجی‌کەیت .

(**ابو طالب المكى**) ئەڵێت ، سەرەتای شوکور ئەوەتە دان‌بەوەدابنێیت هەرچی‌نیعمەتە هەموی‌هی‌خودایە . لەکتێبی (**مدارج السالكين دا**) ، ئەڵێت ، قال السيّد(**شوکورئەوەتە** ئەوەی خودادایە بە بەندە وەکو (**حەواسەکان**) هەموی بۆئەوانە بکاتەکار کەخودا بۆئەوانەی دروس کردوون .)(**ابو عثمان**) کەیەکێکە لەسوفیەکان ، ئەڵێت «**شُكْرُ العامّةِ على المَطْعَمِ والمَلْبَسِ ، وشُكْرُ الخواصِّ على مايَرِدُ عَلى قُلُوبِهِمْ مِنَ المَعانى**» واتە شوکری موسوڵمانان بۆخۆراك و پۆشاکێکە کەخودا ئەیان‌داتێ ، بەلأم‌شوکری پیاوچاکان بۆئەو مەعنەویاتەیە کەخوا ئەیرژێنێتە دەرونیانەوە؟جا ئەومەعنەویاتە ئەومەقامە بەرزانەن ، کەیەکێ لەوانە مەقامی شوکورە ، وەهەرکەس کەخودا ئەو خەلأتەی‌کرد ساتێك لەسوپاس وشوکرانەی‌خودا غافڵ‌نیە ، وەخۆی ئەگەرێت‌کە شتێ بدۆزێتەوە تاشوکرانەی لەسەربکات . بۆئەوەی کەخودائەونیعمەتەی زیادکات بەتایبەت نیعمەتی بەصیرەتی دەرون وەپایەی یەقینی خۆی .

••

## تَوَکُّل :

یەکێکی تر لەمەقامەکانی تەصەووف «تەوەککولە»، هەروەکو وتمان مەقام بەپایەوپلەی بەندە ئەڵێن بەلای خوداوە، جاصوفی یەکان بایەخێکی زۆریان، بۆ «تەوەککول» داناوە.

لەابراهیم الخواص، کەیەکێکە لەگەورەپیاوانی تەصەووف پرسی یان، تەصەووف تۆی گەیاندەچی؟ لەوەلاّما وتی گەیاندمیە «تەوەککول».

تەوەککول، واتە یەکێك کردنە وەکیل وەنوێنەرەیان چارەنوسی خۆدانەدەستی کەسێك، بێگومان، لیرەدا، مەبەست ئەوەتە، بەهۆی خواپەرستیو لەخواترسیو خواناسی یەوە، مرۆڤ بگاتە ئەوقەناعەتەی کەچارەنوسی هەردوجیهانی خۆی، بداتە دەستی خودا، وەجگەلەخودا پشت بەهیچێکی تر نەبەستێت،دیارە هەروا بەسادە مرۆڤ وای لیّنایەت باوەری بێتە سەر ئەوەی کەچارەنووسی خۆی لەژیانا بداتەدەستی خودا، وەخۆی هەروەکو مردوی بەردەستی مردوشۆر، یان هەروەکو نەخۆشی بەردەستی دوکتۆر بداتە دەستی خودا، وەهەموجۆرە ورکەو دودڵیو وەسوەسەیێك لەدەرون دەرکات.

خوای گەورە لەقورئانی پیروزدا ئەفەرمێ (وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ فَهُوَ حَسْبُهُ) سورەی (الطلاق) ئایەی (٣)، واتە ئەوەی پشت بەخوا ببەستێ یان کاری خۆی بداتەدەستی خودا، خوداخۆی ئەبێتە پشتیوانی یان چارەسەرکەری کاروباری، جا خوداخۆی بۆمان دەرئەخات کە تەوەککول، کردەوەی خاوەن باوەرانی راستەقینە واتە مؤمنانە، کەئەفەرمێ «وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ»سورەی ئبراهیم ئایەی «١١» وەدەستورو فەرمانیش ئەدات بەخاوەن باوەران، کەببنە خاوەن تەوەککولیش، کە ئەفەرمێ «وَعَلَى اللهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ» سورەی مائدە «٢٣» ئاکامی ئەم تەوەککولەش ئەوەتە، مرۆڤ ئەبێتە خۆشەویستی خودا کەئەفەرمێ «إِنَّ اللهَ يُحِبُّ المتوكلين» سورەی (آل عمران) (١٥٩).

بەلاّم ئایا تەوەککول، چۆنە؟ بەمچەشنەبێت کەوتمان ئەبێ مرۆڤ کاروکاسبی نەکات، هەرپشت بەخودابەبەستێت، هەروەها نەرواتەلای دوکتور، بۆچارەسەری نەخۆشی، بلێ خودا چاکم ئەکاتەوە، ؟ ناء.... ،

نەشەریعەتی ئیسلامی ، وەنەفەرمودەورەفتاری پێغەمبەر وەنەکردەوەی سوفی یەکان ، هیچکامی وادەستورنادەن ، بەڵکو بەلای هەموانەوە تەوەککول ، باوەڕێکەو والەدەرونا ، تۆ ئەبێ هەوڵبدەیت باورەکەت چاك کەیت... ، چۆن؟... ، تۆ کەنەخۆش کەوتی پێویستی پەنابەریتە بەر «**ئەسباب**» ئامێر ، واتە دوکتۆرو دەرمان ، بەلاّم ، باوەڕت لەسەر ئەوەنەبێت کە «**شفاء**» ، واتە چاكبونەوت بەدەستی دوکتورە ، بەڵکو ئەبێ داوای شیفا لەخودابکەیت ، ئەوەی لەدەستی تۆدێت ئەیکەی ، وەباوەڕت لەسەرئەوەبێت «**شیفا**» ئەبێ خودا بیدات . هەروەها بۆکاروکاسبیو کشتوکاڵ تۆ هەوڵ ئەدەیت بەڵام باوەڕت لەسەر ئەوەبێت «**رازق**» ، وەرۆزیدەر هەرخودایە ، ئەگەر وانەبوایێ ئەبوایێ هەرچی هاوکارە ، وەکویەك دەرامەدیان بوایێ ، یان ، هەرچی پزیشکە خۆیان نەخۆش نەکەوتایێن ، یان ، هەموکەسێ بە فلاّن دەرمان لەفیسارەنەخۆشی چاك بوایێتەوە ، جا کەباوەڕت هاتەسەری ئەوەی رۆزی دەرو پارێزەرو شیفادەر ، هەرخودایە ئەوکاتەش تۆ سەرنویشتو چارەسەرت ئەدەیتەدەستی خودا ، نەبەهیچ کۆسپێك پەکت ئەکەوێت ، وە نەبەهیچ دەسکەوتێك لەخۆتبایی ئەبیت .

ئێمە زۆرجار بەدەم ئەڵێین بسم الله ، توکّلتُ عَلَى الله ، وَلاحَوْلَ وَلاقوّةَ الاّ بالله ، بەلاّم ئەگەرباش لەواتای ئەم وشانە وردبینەوە ، وەباوەڕمان پێیان هەبێت ، هەرئەوە خۆی بەسە ، بۆئەوەی بەڕاستیی خواناس بین ، وە خاوەن باوەڕ ، وەصوفی بین . ووشەی بەناویخودا ، واتە کارەکەم بەناوی خوداوە دەس پیئەکەم ، ئەمەخۆی ، خۆناسینە بەناوی بەندەیێك وە (**الله**) ناسینە بەناوی خودای خۆت «**توکلتُ على الله**» ، واتە پشتم هەر بەخودا بەستوەو سەرنویشتیخۆم داوەتە دەستیئەو .

«**ولاحول ولاقوة الا بالله**» ، هیچ هەوڵو تێکۆشانو هێزێك ، بە بێ ویستیخودا ، هیچەو شتیلیناوەشێتەوە . شارەزایانی ڕێگەی ، تەصەووف سیپلەیان ، بۆتەوەککول داناوە ، سەرەتایی ، ئەویش وەکو کەسێکە کەهەرچی کاروباریخۆیەتی ، دابێتیە دەستی نوێنەرێکی دلسۆزو بەرەحموبەویجدانی خۆی .

مامناوەندییەکان ، ئەوانیش ، وەکو منداڵێکن ساوا ، کەهەرچییانبوێت هەرپەنا بۆدایکیان ئەبەن ، وەجگەلەو هۆگری کەس نین ، وەبەتەمای کەسیش نابن . دواپلە : ئەوانیش کەسانێکن کە وەکونەخۆش ، لەبەردەستیپزشکابێت ، خۆیداوەتە

دەستی ئەوپزیشکە لەشی هەڵئەدرێ گورچیلەی ئەبرێ هەرچی ئەکات نەخۆشەکە خۆی داوەتە دەستی، ئەوانیش بەوجۆرەن. کەواتە خاوەن تەوەککول، بەوەئەڵێن پەنائەباتە ئەسباب، بەلاَم لەدەرونیشەوە باوەری لەسەرئەوەتە ئەم ئامێرانە، بەبێ‌خواستی‌خودا، نەئەتوانن زیانی پێ‌بگەیێنن نەقانجاز.

(ابن عجیبە) کەیەکێکە لەگەورەپیاوانی تەصەووف، ئەڵێت، «**تەوەککول، بریتیە لەباوەری دەرون، بەخودا، بەجۆرێك مرۆڤ وای‌لێ‌بێت، پشت بەهیچ‌شتێك نەبەستێ بە خوا نەبێت، وە بۆ هەموو کارێکی پشت بە خوا ببەستێت، خۆی بداتە دەستی‌خودا، لەسەر ئەو باوەرە بێت کە خوا زانایەو خەبەرداره لەهەموشتێك، وەباوەری لەسەرئەوەبێت کە کاری خۆی ئەگەر بە دەستی‌خودابدات لەوەجێگەی متمانەترە کە بەدەستی خۆیەوەبێت.**

**قوشەیری، خوای‌لێ‌خۆش‌بێت، ئەڵێت، جێگای تەوەککول، والەدڵا، وەهەوڵ‌وتێکۆشان هیچ دژیو پێچەوانەیێکی نیە لەگەڵ تەوەککولێکا کە لەدەرونا جێ‌گیربوە، مەرج هەرئەوەتە باوەری‌مرۆڤ لەسەرئەوەبێت هاتونەهات بەدەستی‌خودایە»**.

«ترمزی» حەدیثێك ئەگێرێتەوە، عەرەبێك دێتە خذمەتی پێغەمبەر درودی‌خودای‌لەسەر ئەلێ، ئەی‌پەیامبەری‌خودا وشترەکەم هەروا، تەوەککول بەخودا بەرەڵلاَ کردوە، ئایا هەروا وازی‌لێ‌بێرم، ؟ فەرموی..... نا،... بیبەسەرەوە لەپاشان تەوەککولت ببێت. قوشەیری ئەڵێت، تەوەککول، باورهاوردنە بەوەی کەبەدەستی‌خودایە، وە دڵ‌نەبەستن بەوەی کەبەدەستی مەخلوقە، (**ئەبوعەلی‌دەققاق**) ئەڵێت، (**تەوەککول**)پێناسی خاوەن‌باوەران (**مؤمنین**) ە وە (**تەسلیم**)، ، پێناسی ئەولیایە، وە (**تەفویض**)، کاری «**مُوَحِّدِین**» ە «**سَهْلُ بْنِ عَبْدُ اللهِ**»، ئەڵێت، خاوەن تەوەککول، سێ سپاردەی لەسەرە، نە داوای‌هیچ لەهیچ‌کەسێ‌بکات، وە نەدەس‌بنێت‌بەروی‌ئەوەوە شتێکی بۆدیرێت، وە نەهیچ‌شتێك پاشەکەوت کات‌و بێخاتە لاوە بۆدوارۆژ.

بەکورتی قانجازی تەوەککول ئەوەتە، مرۆڤ هەمیشەدڵنیایە، وەلەدڵەخورپەی هەمو پێش‌هاتێك ئەکەوێت، ئەزانێ خوا چاوی‌لێ‌یەتی وەلەحاڵی ئاگادارە، خۆی‌رازقە خۆی شیفابەخشە، خۆی حافیزوپارێزەرە«**أَرْحَمُ الرَّاحِمِين**» ە لەخۆی بۆخۆی دڵسۆزترو دەس‌رۆیشتوترو زاناترو تەواناترە، ئەوەی ئەو نەیەوێ ناکرێت وەئەوەی بیەوێ‌کراوە، کەواتە پەنا ئەبا بەئەسباب، بەلاَم دڵ‌وباوەری ناداتە ئەسباب ئەزانێ ئامێر نیە کارئەکات، بەڵکو خودا خاوەنی ئەوو ئامێرەکانیشە.

بەراستی تەوەککول ، گەورەترین هۆی دڵخۆشیو دڵدامەزراویو ئازایی‌و چاونەترسی‌یە ، مرۆڤ خۆی لای کەس سوك ناکات ، چونکە هیچ کەس بەخاوەنی ئایندەو خۆشبەختیو سەرکەوتنی خۆی دانانێت وەجگە لەخوانەبێ باکی لەکەس نیە ، وە جگە بەخودانەبێت ئومیدی بەکەس نیە . لەوانە نابێت ، کە هەر تاییك گرتی ، خێرا دەستەپاچەبێت چونکە ئەزانێت شیفاومردن هەربەدەستی خودایە ، ئەوەش ئەو نەیویست ناکرێت ؛ وەمرۆڤ وای لێدێت هەر لە بەرئەوەی فەرمان لەدەستوری خوداو لەشەرع بیات ، دەستئەداتە ئامێری هەرکارێك ، واتە بەظاهیروئاشکرا دەستئەداتە ئامێر ، بەلاَم لەدەرونا هەرپشتی بەخوابەستوەو . داوای هیچیش لەخواناکات چونکە مادام خۆیداوەتە دەستی‌خودا ، خودا خۆی چی چاك بێت بۆئەو خۆی ئەیزانێت وە کامڕێگەو کامپێش هات باشە ئەو ئەیزانێت کەواتە داوای چی لەخودابکات ، کەخۆی‌نەزانێت چی باشەبۆی ، وەبۆچی خۆی نەداتە دەستی ئەوکەسەی کەلەخۆی دڵسۆزترە بۆی ، وزاناو تەوانایشە .

لێرەدایە بەپێویستی‌ئەزانم قامك ڕاکێشم بۆ ئەو دوشیعرەی خۆم ، کەلەپێشەکی دیوانی شیعرەکانما نوسیومە کەلەگەڵ ئەمحاڵەدا باش ڕێك‌ئەکەوێت وەدوایی بێرم‌بەباسی تەوەککول .

**«لەگەڵی خودای خۆمدا»**

**«بەغەیری لوتفی تۆ قەت طالبی گەنج‌و گوهەر نابم»**
**«کەلوتفت‌بو نیەفەرق گەدابم یاوەکو شابم»**

**«نەزانم کامە باشەبۆم ئیتر داوا لەتۆ چی‌بکەم»**
**«کەوابو کامەباشەبۆم خوا وابێ خوا وابم»**

---

**تەسلیم :**

---

یەکێکی‌تر لەمەقامەکانی تەصەووف مەقامی تەسلیمە ، لەکتێبی (**مُعجَم مصطلحاتِ الصّوفیة**)دا نوسینی د . عبد المنعم کەلە(١٤٠٠)ك‌دا چاپ‌کراوە .

ئەڵێت ، «التسليم الانقياد لأمر الله تعالى وترك الاعتراض فيما لايلائم وقيل هو الثبات عند نزول البلاء من غير تغيير فى الظاهر والباطن» .

کەوابو «تەسلیم» خۆدانەدەستی خودایەو دەس هەڵگرتن لەرەخنەگرتن لەهەرچی ئەوەی دێت بەسەرتاو ئەیبینیت و ، لەوەئەکات کەبەقانجازی تۆنەبێت ، یان ، نەگۆڕانە لەدەرو لەدەروندا لەکاتی دووچاربونی کۆسپو نەهاتی دا .

«شيخ الاسلام ، عبدالله أنصارى هروى» لەکتێبی «منازل السالکین» دا باسی مەقامی تەسلیم ئەکات ، وەسیٚ پلەی بۆداەنێت .

لەقورئاندا لەئایەتی (٢٢) سورەتی ئەحزاب دا ، ووشەی تەسلیم هاتوە ، کەئەڵێ ، (وَلَمَّا رَأَى المؤمنونَ الأحْزابَ قالوا هذا ماوَعَدَنا اللهُ وَرَسولُهُ وصَدَقَ اللهُ ورسولُه ، وَمازادَهُمْ إلاّ ايماناً وتَسْليماً) .

لێرەدا زۆرباش دیارە کەتەسلیم ، واتە چارەنوسی خۆسپاردن بەخودا ، پاش ئیمان دێت ، وە تەسلیم ئەوەتە ئادەمیزاد خۆی ئەداتە دەستی ئەوشتە ، یان ئەوکەسەی باوەڕی پیٚ هانیوە .

بۆنمونە ، ئەڵێن ئیشی پزشك چاككردنەوەو دەرمانكردنی نەخۆشە ، پاش پەیدابونی ئەم باوەڕەتە ، لەدەرونا مرۆڤ وا لیٚ ئەکات ، خۆی بخاتە بەردەستی پزیشك وەهەرچی ئەوئەیکات ئەم بەلایەوە پەسەندەو ، چەنەبەحەنەی لەگەڵ ناکات ، تەنانەت ، ئامادەیە ، پزیشك بیٚ هۆشی خاتو زکی هەڵدرێت ، جائەوە تەسلیم بونە بەپزشك وەچارەنوسی خۆدانە دەستی ئەو دوکتۆرە .

لەکتێبی (قوت القلوب)دا ، لەزمانی سری سەقطی یەوە ئەڵێت ، ثلاثة ، يستبين بهن اليقين ، «القيام بالحق فى مواطن الهلكة ، والتسليم لأمر الله عند نزول البلاء ، والرضاء بالقضاء عند زوال النعمة» واتە سیٚ شت هەن کە خاوەن باوەری تەواو ، یان باوەری تەواو ، واتە یەقینیان ، پیٚ ئەناسرێت ، ئەنجامدانی سپاردەی هەق لە کاتی تیاچون وەمەترسی دا ، واتە ، بامەترسی تیاچون وەفەوتانیشی هەبێت ئەوکەسە هەر ، لایەنگری ی هەق ئەکات ، هەروەها چارەنوسی خۆت دانە دەستی خودا لەکاتی دوچاربونی بەلادا ، وەرازی بون بەوەی کەخوائەیکات و خوا کردویەتی لەکاتی لەدەستدانی نیعمەتدا .

واتە ، بازیانیکیش بکەیت وەئەوەی هەتە لەدەستی بدەیت ، هەرڕازی بیت بەوەی کەخوا کردویەتی .

لەکتێبی «قوت القلوب» دا ، لەکاتی باسی «تەوەککول»دا زۆرجار باسی (تەسلیم) دێرێتە گۆری ، وە پەیوەندیان ئەدابەیەکەوە ، بۆنمونە ، لەشوێنێکا باسی سیٚ جۆر

لەتەوەککول ئەکات ، ئەڵێت ، هەیە هەرلەبەر گەورەیی و عەزەمەتی خودا تەوەککولی هەیە بەخودا ، واتە ، بۆچاوەدێری پاداش وترس و خۆشەویستی ی نیە ، هەیشە لەبەر خۆشەویستی خودایە ، واتە ، خوای خۆش ئەوێت ، لەبەرئەوە تەوەککولی بەخودا هەیە ، هی وایش هەیە ، لەبەرئەوەتە خۆی بەخودا (تەسلیم) کردوە ، کە هەم بەتەمای پاداشەو هەم لەسزائەترسێ .

جائەڵێ جۆری تەوەککول لەبەرعەزەمەت ، لەهەموی گرنگ‌ترو باڵاترە ، لەشوێنێکی‌ترا ئەڵێت ، مرۆڤ کە نەزانێت چی‌باشەبۆخۆی ، چۆن خۆی‌بێتەسەرپشك ، شایەد ئەوەی هەڵی ئەبژێرێت ، بەزیانی‌بێت ، وەئەوەی خۆی‌لێ لائەدات ، بەقازانجی‌بێت .

خوائەفەرمێ «كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ ، وَاللهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاتَعْلَمُونَ» (البقرة) کەواتە تەسلیم‌بون بۆفەرمانی خاوەن‌فەرمان ، کەخوای‌گەورەیە ، وەرەزابون بەبەشی ئەو دابەش‌کەرە پێویستە .

هەر لەشوێنێکی‌تری ئەم‌کتێبەدا ئەڵێت ، وأعلى التوّكل ، التّوكلُ عليه في الاستسلام للأحكام .

بەکورتی لەزۆرشوێنی ئەم‌کتێبەدا سەبارەت بە ، «تەسلیم» باس‌ئەکات ، بەڵام بەجیاوازی باسی‌تەسلیم وەکومەقامێکی جیاواز ناکات ، هەروەها «ئەبونەصر» سەرراج ، لەکتێبی «اللمع» دا ، لەکاتی لێك‌دانەوەی «عیلمی‌ظاهیر وە عیلمی‌باطین» دا ، ئەڵێت عیلمی ظاهیری‌شەرعی ، دەستوراتی عیبادەتە بەظاهیر ، بەلاّم عیلمی‌باطین ، پەرستشی دەرونی‌یە ، وەکو مەقامەکان‌و حاڵەکان .

وە «٣٤»ناو لەناوی حاڵ‌و مەقام باس‌ئەکات ، بەبێ جیاکردنەوەیان لەیەك ، کە کامی‌حاڵەو کامی‌مەقام ، جا یەکێ لەوناوانە «تەسلیمە» ، بەڵام لەکاتی راڤەو لی‌کۆڵینەوەدا ، تەنها لەحەوت‌مەقام لەمەقامەکان‌و یانزەحاڵ لەحاڵەکان ئەکۆڵێتەوە ، لەکتێبی نەقشبەندی‌یەکانا وەکو «مەکتوباتی ئیمامی‌رەببانی» واتەشیخ‌ئەحمەدی فاروقی ، کە بەناوی «مُجَدّدالألف‌الثانی» بەناوبانگەوە لە (٩٧١) لەلەدایك‌بوە وە لە «١٠٣٤»دا کۆچی‌کردوە ، یان لەکتێبی «ایضاحُ الطّریق» کەهی «شیخ‌عبدالله»ی دهلوی مورشیدی مەولاناخالیدی نەقشبەندی‌یە وە لەساڵی «١١٥٨» لەدا لەدایك‌بوە وەلە «١٢٤٠»لەدا ، دواکۆچی‌کردوە ، لەوکتێبانەدا هەمویان ئەڵێن ئەبێ رێبواری رێگەی تەصەووف لەو دەمەقامە تێپەرێت ، جا ئەگاتە مراز ، وە مەقامی (تەسلیم) یەکێکە لەومەقامانەی کەناویان‌بردون ، هەروەها مەلاحامیدی بێسارانی کەلەدەوروبەری (١٢٢٥)لە لەدایك‌بوەو لەدەوروبەری (١٣١٠)لە لەدێ «بیارە»

لەدونیادەرچوە ، ئەویش هەم لەزمانی ئەوانەوە ، وەهەمخۆیشی مەقامی «**تەسلیم**» بەیەکێ لەو دە مەقامانە دائەنێت ، کەئەبێ ڕێبواری ڕێگەی تەصەووف بیانبڕێت تابگاتە مراز ، لەکتێبی «**قُدسِیّە**»دا ، کەبریتی یە لەفەرمودەکانی شاهی نەقشبەند واتە (**محمدبن محمد**) بهاءالدین البخاری(**نەقشبەند**) ، کەلە گوندی «**قەصری عاریفان**» ، لەنزیکی شاری بوخارادا ، لەسالی (**٧١٧**)کدا هاتوەتەجیهانەوە لەسالی (**٧٩١**) کۆچی دا ، هەرلەوگوندەدا دواکۆچی کردوە ، وەنوسەری کتێب یەکێکە لەجێ نشینەبەناوبانگەکانی شاهی نقشبند ، بەناوی «**محمدپارسا**» کە لەسالی(**٨٢٢**) ك کۆچی کردوە ، لەمکتێبەشا ، چەنجارێك سەبارەت بەمەقامی تەسلیم باس ئەکات ، وەلەشوێنێکا ئەڵێت ، تەسلیمی ڕێبواری ڕێگەی تەصەووف ، لەپێشا تەسلیمبونە بەمورشید ، بەوجۆرەی ، ڕێبوار واتە «**مورید**» چارەنوسی خۆی ئەداتە دەستی مورشید ، هەرچی مورشیدبیکات بەلایمورید‌ەوە پەسەندو خۆشە ، ئەگەر هاتو ڕێبوار بەمحاڵەتە ڕاهات ، وە پایەیبەرزبوەو ەو بویە خاوەن مەقام،جا کاتی ئەوە ئەگات ، کەهەستونیستو چارەنوسی دینودنیای خۆی ئەداتە دەستیخوای گەورە ، وەکاتێ کەئەوحاڵەتە بویە خووخدەی ، وەهەستوبیرو باوەڕی لەسەری ئەو چارەنوس بەدەستیخواسپاردنە دامەزرا ، ئەوساکە بوەتە خاوەنی مەقامێکی گەورەی خوداپەرستیو بەندەیخودا بەناوی مەقامی «**تەسلیم**» .

«**الرِّضا**»

لەکتێبی «**اللمع**»دا ، ئەڵێت ، ڕەزا مەقامێکی پیرۆزە ، لەکتێبی «**رسالة القشيرية**»دا ئەڵێت ، صوفییەکانی عیراقو خوراسان سەبارەت بە ڕەزا هاوباوەڕ نەبون، خوراسانیەکان بە مەقام دایان ئەنا ، وەئەیانگوت ڕەزا پایانی مەقامی تەوەککوڵە ، مەقام بونیش ئەوە ئەگرێتەوە ، کەمرۆڤ ، بەرەنجی خۆی دەستی کەوێت ، بەلاَم عیراقیەکان ، باوەڕیان لەسەری ئەوە بوە کە ڕەزا یەکێکە لە ئەحواڵ ، وە بەهۆی تێکۆشانی بەندەوە نایێتەدەست ، بەڵکو چۆنیەتێکە کەخۆی دێتە دڵودەرونەوە هەروەکو حاڵەکانی تر

قوشەیری خۆی ئەڵێت ئەکرێ ئەم دوباوەڕە پێکەوە کۆ کەینەوە وەبڵێین ، سەرەتای ڕەزا مەقامە ، وە بەهۆی کۆششی بەندەوە دەستئەکەوێ ، بەڵام

دواپلەکانی ئەگاتە رادەیێك هەر بەخشش خودایی یە وە دەستکەوتی بەندە نیە ، بەکورتی ی ، رەزا بریتی یە لەرەزامەندی و پی خۆش بون وە دلخۆش بون لەئاکامی کارێك ، رەزامەندی خودا لەبەندە ئەوەتە لەکردەوەی رازی بێت ، بەوبونەوە نورو بەرەکەت و پاداشی رەزامەندی خۆی برێژێت بەسەریا ، رەزامەندی بەندەیش ئەوەتە ، هەرچی بەسەرا دێت لەخۆشوناخۆش چوون لای خواوە هاتوە خۆش بێت ، جگەلەگوناەکردن و لەری لادان ، چونکە ئەوە سەرکێشی یە لەفەرمانی خودا ، لێرەدا مەبەست لەرازی بون لەخۆشی و ناخۆشی هەژاری و دەولەمەندی یە تەنانەت ئەبێ کوس کەوتن ، وەمندال پەیدابون جەوروئازارو پاداشی بەلاوە یەکسان بێت ، بێگومان لەم بارەوە بیروباوەری زۆر پیشاندراوە ، وەهەر گەورەپیاوێك بەپێی حال ومەقام وەچۆنی یێك کەبۆخۆی دەستی داوە لێکی داوەتەوە ، تەنانەت لێك دراوەتەوە ئایا ئەکرێ ئەم باوەرانە پێچەوانەبن لەگەل دەستوری شەرع دا ؟

خوای گەورە سەبارەت بەپاداشی بەندەکانی خۆی ، بە ئەهلی بەهەشت ئەفەرمی «رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ» ، بەهۆی کردەوەی چاکیانەوە ، خودا لی یان رازی بوە ، وە ئەم پاداشەگەورەیەی داونەتەوە ئەوانیش بەرانبەر بەم پاداشەگەورەیە ، «وَرَضُوا عَنْهُ» ، ئەوانیش لەخودا رازی بون ، بێگومان ، ئەم ئاکامە هی کردەوەی ئەم جیهانەتە ، بەندەی سەربەفەرمان و بەندەگی قام خاوەنەکەی لێی رازی ئەبێت ، بێگومان ، یەکێ لەم قامینە ، وەلەم بەندەیی ئەنجامدانە ، رەزامەندی یە بەجەورو بەچاکەی سەروەر ، مادام ئەم دەمی بە نارەزایی نەکردەوە ، وە گەردەن کەچ بو خودای لی رازی ئەبێت لیێشی رازی بو پاداشی چاك و گەورەی ئەداتەوە کەسێ کەبەجەوریش رازی بوبێت ئیستە بەم پاداشە گەورە چۆن رازی ترنیە ،؟ کەواتە ، ئەبێتە «رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ ، وَرَضُوا عَنْهُ ، ذٰلِكَ الفَوْزُ العَظِيمِ» (مائدة) «۱۱۹» ، کەواتە ئەوبەندە خواپەرستە مەقامی رەزای دەس کەوتوە کە خودای گەورە ، بەناوی فەوزی عەظیم ناوی ئەبات واتە ، سەرکەوتنێکی زۆرگرنگ .

یان ئەفەرمێ «وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْرِى نَفْسَهُ ابتِغاءَ مَرْضاتِ اللهِ» (البقرة) «۲۰۷» ، یَشْرِی ، واتە ئەیفرۆشێت واتە دای ئەنێت ، وەدەستی لێ هەل ئەگرێت ، واتە ، ئەفەرمێ هی واهەیە لەرێگەی بەدەس هێنانی رەزامەندی خودادا تەنانەت دەست لەخۆیشی هەل ئەگرێت .

جا ئەمەیان بۆبەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودایە ، کەئاکامی ئەویش هەروەکو وتمان ئەبێتەهۆی بەدی هاتنی ڕەزامەندی بەندە ، رَضِیَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ، **«شیخ سەرراج»** لەکتێبی **«اللمع»**دا ئەڵێت ڕەزا ئەوەتە کەبەندە خۆی بداتە دەستی خودا وەکو خۆمان ئەڵێین **«هەرچی لای خوداوەهات خۆش هات»** .

**(جونەید)** ئەڵێت ، ڕەزا ، لەدەست دانی ویستی بەندەیە . **(قەناد)** ، ئەڵێت ، ڕەزا ڕازی بونی بەندە بە قەزاوقەدەری تاڵە ، واتە زۆرناخۆش .

لە ڕیسالەی قوشەیری دا ئەڵێت ، ڕەزا ، دەرکردنی هەمو نەگەویستی وکینەیێکە لەدەرونا ، بەجۆرێك دەرون وای لێ بێت جگەخۆشی و سرورو ڕەزامەندی هیچی تری تیانەبێت **«ابن الخفیف»** ، ئەڵێت ، ڕەزا ، دامرکانی دەرونە بەهەمو فەرمانێکی خودا ، وە ڕێك کەوتن ، قایل بونی دەرونە بەهەرچی شتێ خودا بیەوێت .

**«ابن عطا»** ئەڵێت ، ڕەزا بریتی یە لەدامرکانی دەرون بەویستی **«قەدیم»**ی ، خودا ، چونکی ئەوەی خوداخۆی هەرلەئەزەلەوە **(لەمێژەوە)** ، هەڵی بژاردوە بۆبەندە هەرئەوە چاکە ، وەنابێ بەندە بەو هەڵبژاردنەی خودا نارازی بێت . خوا خۆی ئەفەرمێ ، **«وَعَسی اَنْ تَکْرَهوا شیئاً وَهوَ خیرٌ لکم ، وَعَسی اَنْ تُحِبّوا شیئاً وَهُو شَرٌلَکُم»** یان ئەفەرمێ ، **«فَعَسَی اَنْ تَکْرَهوا شَیْئاً وَیَجْعَلَ اللهُ فیهِ خَیراً کثیراً»** (۱۹) «نساء» .

بەکورتی دێینەسەری ئەوەی بڵێین ، ڕەزا مەقامێکی زۆرگەورەی دەرونی یە ، کە پاش پاك کردنەوەی دەرون لەهەموخەوشێك ، وەرەنجوتێکۆشانێکی زۆر بۆئەم پاك کردنەوە ، وەرازاندنەوەی دەرون بەهەمو پێناسێکی باش و پەسەند ، دەستی مەردی ئەو گورەپانە ئەکەوێت ، لای زۆربەی گەورەپیاوانی تەسەووف ، وەکو **«قوشەیری»** وە **«سەرراج»** وە **«شیخ عومەری سەهرەوەردی»** مەقامی ڕەزا بەگەورەترین ، وە بەدواپلەی مەقامەکان دانراوە ، وەپاش باسی مەقامی ڕەزا ئیتر دوای دێرن بەباسی مەقام ، وەدەس ئەکەنە باسی حاڵ .

ئەم گەورەپیاوانە ئەڵێن ، مەقامی ڕەزا ، لەمەقامی صەبر گەورەترە ، بۆچی ، چونکە ئەم مەقامە کاتێکە مرۆڤ گەیشتوەتە پایەیێکی مەعنەوی ئەوتۆ کەهەرچی خودا ڕازی کات ئەو پێی خۆشە تەنانەت بەسەرهاتی ناخۆشی ژیانیش ، وە ئەو ناخۆشیانەش هەر بەزەردەخەنەوە سرنج ئەدات ، وەبەخێروبەرەکەتی ئەزانێت ،

تەنانەت مەرگیش ، بۆنمونە . بیلالی‌حەبەشی خودای لی‌ڕازی‌بێت لەکاتی سەرەمەرگدا پێی‌ئەکەنی‌و خۆشحالّ بو . وەئەیوت «**ئۆخەیش کەئەمرم . وەسبەی ئەڕۆمە خزمەتی پێغەمبەرو هەمو خۆشەویستەکانی‌تر**» .

هەروەها پێغەمبەری‌گەورە درودی‌خودای‌لەسەر زۆرجار ئامۆژگاری هاوری‌یانی خۆی کردوە ، بەگرتنەبەری ڕەوشی ڕازی‌بون بەقەزای‌خودا ، (**ئەبوعەلی دەققاق**) فەرمودەییەکی دەربارەی ڕەزا هەیە لاموایە زۆربەجێیە کەئەفەرمی «**لَیْسَ الرِّضا أنْ لاتُحِسَّ بِالبَلاءِ . انَّمَا الرِّضا أنْ لاتعترِضَ عَلى حُكْمِ القَضاءِ**» واتە ڕەزا ئەوەنیە هەربەڵایێکت بێ‌بەسەرا هەستی‌پی‌نەکەیت وە بەخۆت نەزانیت ، بەڵکو ئەوەتە ڕازی‌بیت وەرەخنەنەگریت ، وەکو ئەونەخۆشەی کە هەست‌ئەکات بەئێشی دەرزی یان چەقۆی «**عەمەلیات**» ، بەلام ڕازیشەو پێی‌خۆشە چونکە هی‌دوکتۆرێکە ئەیەوی چارەی نەخۆشی‌یەکەی بکات .

لەمانە تی‌پەڕین ، ئەوەی دەرونی پڕبێت لەخۆشەویستی‌ی‌خودا ئیتر چۆن‌ئەتوانی نارازی بێت لەوەی کەخودا ویستویەتی .

ئەم ڕەزامەندی‌یەش ئەوەناگەیێنی ، بەندە هەوڵ‌نەدات بۆئەوەی خودا بەلای لی‌دورخاتەوە بەڵکو بۆئەوەتە ئەگەر دوچاری بەلابو ناشوکری نەکات‌و نارازی نەبێت ئەگینا خودا ئەفەرمی ، «**اُدْعُونِي اَسْتَجِبْ لَكُمْ**» سورەی «**غافر**» «**٦٠**» ، یان ئەفەرمی ، «**هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الاَرْضَ ذَلولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ**» «**الملك**» (**١٥**) .

کەواتە بۆت‌هەیە داوابکەیت لەخوا دوچاری بەلات نەکات ، بۆت‌هەیە هەوڵی ژیان‌و کاسبی بدەیت ، وە ئەم‌ڕەزامەندی‌یە نابی لەسنوری شەرع تێپەرێت ، واتە ، دیفاع لەماڵ‌و ناموسی خۆت نەکەیت ، هەرکەس هەرچیت لی‌ئەکات‌بیکات ، نا ، ... بەڵکو بۆ ڕەزامەندی لە بەسەرهاتە ، وەرەخنەنەگرتن لەفەرمانی‌خودا لەگەڵ تێکۆشاندا بۆئەنجامدانی هەرچی خودا پێی‌خۆشە وە دەس‌هەڵگرتن لەهەرچی خودا پێی‌ناخۆشە ، وە هاوردنەپێش‌چاوی ئەوەی کە دەردی‌سەرو بەلای خودا هی نەگەویسی‌نیە ، وەژیانی پێغەمبەری خۆشەویست ، گەورەترین بەڵگەیە بۆمان ، بەتایبەت ، کاتی سەیرئەکەین ئەو ئەروات بۆ بانگ‌کردنی خەڵك بۆلای ئاینی ئیسلام ، کەچی خەڵکی «**طائف**» ، بەجۆری ئەیدەنە بەری‌بەرد ، کە قاچی خوێناوی ئەبێت ، یان ئەوەی کە قاسمی کوری فەوتی‌کرد وە حەزرەتی حەمزە ،

وەصەدان کەس لەیارانی بەدەستی (**موشریك**)ەکان کوژران. جا ئەگەڵی هەموی ئەمانەشا ئەوەتە لە ڕۆژەکەی طائف‌دا ئەفەرمێ «**إنْ لَمْ تَكُنْ ساخِطاً عَلَيَّ فَلا اُبالي**» ئەی‌خودا هەرتۆ رقت لەمن‌نەکەوتبێ ئیترمن گوێ نادەم.

لەکۆتاییدا ئەڵێم رەزا، یەکێکە لەگەورەترین مەقامەکانی تەصەووف، کە مەقامی خاوەنی «**ویلایەتی‌کوبرا**» یە، واتە، وەلی‌یە هەرەگەورەکان وە دواپلەی پاك‌کردنەوەی نەفسە، کە بە نەفسی «**لوّامە**»دەس‌پی‌ئەکات، پاشان «**مُلهِمَه**» پاشان «**مُطمَئِنّە**»جا «**راضِیَە**» و لەئاخرا «**مَرضِیە**» کە لەباسی «**نەفس**» دا باس‌کراوە.

وە خوائەفەرمێ «**یاأَیَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ارْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً**» «**الفجر**»، وە ئەمەش هەر دەست‌کێشانێکە بۆلای ئەوانەی ئەگەنە ئەم مەقامەی کەلێرە لەم‌جیهانەدا «**نەفسیان**»، واتە بەهەمو گیانێکیانەوە فەرمان‌بەردار بوون وە بەفەرمانی خودا دڵ‌خۆش‌ۆ رازی‌بون، لەپاشان لەو جیهانیش‌دا بەپاداشی، رازی‌کران، وەرازی لی‌بونی خودا بەرخوردارو بەهرەمەند ئەبن. جا گەورەپیاوانی شارێی تەصەووف، پاش ئەم مەقامە ئیتر لەوحاڵانە بەهرەمەندئەبن کەخودا ئەیەوێت وە هەرڕۆژەی بە نیعمەتێك بەرخورداریان ئەکاتو هەرکاتە دەرونیان بەکەرەمێك وە بەئاوی رەحمەتێك گەشە پی‌ئەداتو دەماغیان بەبۆنێك خۆش‌ئەکات، کەمەگەر هەرخودا خۆی‌و ئەوبەندە تێکۆشەرە خەبات‌کارە پارێزکارانەی لەچەندوچۆنی تی‌بگەن. لەکتێبی مُعجَم‌مصطلحات الصوفیەدا، پلەی رەزا ئەکاتە چوار بەشەوە، (**رەزای**) (**مُحسِنین**) «**شُهداء**» «**صدّیقین**» «**مُقرّبین**»، جائەڵی رەزای موقەررەبین ئەوپایەتە کەپێی ئەڵێن «**الرَّجوعُ مِنَ الخَلقِ الی الحقّ**»، ئەبێ ئەوەش‌بڵێم ئەم‌پێناسە، بۆ صۆفی، بەچەشنێکی گشتی هاتوە، کەئەڵێ صوفی بەکەسێ ئەڵێن، لای خەڵك بەرئەدات وە ئەگەرێتەوە بۆلای «**خالیق**».

---

### «موحاسەبە»

---

ئەمەوێ بیرمەوەیاد، وتمان برێ لەگەورەپیاوانی تەصەووف مەقامی‌وا هەیە بەحاڵی دائەنێن یان برێ مەقام بەحاڵ، وەبرێکیان لایان وایە زۆربەی مەقامەکان لەسەرەتادا حاڵن، واتە شتێکی دانەمەزراوو دانەمرکاون،تا کەم‌کەم لەدەرونا ئەو

وزعە کەبویە شتێکی دامەزراو ئەوە مەقامە، مەبەستم ئەوەتە برێك حاڵو مەقامیش هەیە، برێکیان هەر باسیان نەکردوە، وە بەلایا تێ‌پەڕیبون. وەکوئەوەی بەبەشێك لەومەقامە دای‌نێن، وەکو (إنابە) بیکەنە قۆناغێك لەتەوبە، هەروەها سەبارەت بەموحاسەبە، کە کارێکە، تەنها بۆ قۆناغێك پێویست‌نیە بەڵکو بۆهەموی تەمەن پێویستە، بزانین موحاسەبە چی‌یە، وەبۆچی‌پێویستە، موحاسەبە، بریتی‌یە لەلۆمەکردنو سەرزەنش‌کردنی «**نەفس**»، وە گومان‌کردنو دودڵی‌ی، لەنەفس، وەبریتی‌یە لە پیاچونەوە بەکردەوەی ڕۆژانەدا بۆئەوەی بزانین ئایا لەماوەی ئەو شەوو ڕۆژەداەیان بەیانی‌تانیوەڕۆ، ئیمە تاچ‌ڕادە خوداپەرستیمان‌کردوەو بەدەستوری خودا جوڵاوینەتەوە، وە لەخوداغافل‌نەبوبین، هەروەها بزانین چەن هەڵەو چەن غەفڵەت وە خودانەخواستە چەن گوناهمان بوە، بۆئەوەی ئیتر هەڵەنەکەین وەدەرومان لەسەری‌کردەوەی چاك دامەزرێت، وەئەم ڕەوشە بۆسۆفی زۆرپێویستە وەئەبێتە هۆی سەرکەوتنی، بەڵام ئەگەر پەیرەوی لەم‌ڕەوشەنەکات، کاتێ‌بەخۆی‌ئەزانێت کارلەکارترازاوەو زۆر دوا کەوتوە، پایەی موحاسەبە بەسەری بەدگومانی‌و بێ‌باوەری بەنەفس دائەمەزرێ، وەلەسەری ئایەتی «**إنَّ النفس لأمّارةٌ بالسّوء**» «**یوسف**»، جا مادام نەفس‌واتە هەستی دەرونی مرۆڤ‌ڕوەو چەوتی‌و گومراهی بڕوات. پێویستە کە مرۆڤ هەگیز جڵەوی بۆشل‌نەکاتو زووزوو سەیری بەرپێی‌خۆی‌بکات نەکا نەفسی هەڵی دێرێت وەملی‌بشکێنێت.

جاجگە ئەو ئاگادارکردنەی نەفسی سەرکێش، ئەبێ بەنامەی ئەعمالی نەفسیشا بڕۆینەوە بزانین هەروا کە نەمان‌هێشتوە خراپەبکات، ئایاچاکەی‌چی‌بوە، وە چ تۆشەیێکی چاکەی بەدەست‌هێناوە، هەروەکو کەخودای‌گەورە لەسورەی‌حەشر ئایەی (١٨) دائەفەرمێ: «**یاأیها الّذین آمنوا، اتّقوا الله ولتنظرنفسٌ ماقدّمت لغدٍ، واتّقوا الله إنّ الله خبیرٌ بما تعملون**»، کەواتە مرۆڤی خاوەن باوەر، هەم‌ئەبێ لەخودا بترسێت وە هەم‌ئەبێ لەکردەوەی خویشی بکۆڵیتەوە بزانی چ تۆشەیێکی ئامادەکردوە بۆدوارۆژی. وەئەبێ بزانێت، باخۆیشی لەکردەوەی خۆی نەکۆڵێتەوە «**إنّ الله خبیرٌ بما تعملون**»، خوائاگای لەهەموی‌هەیە. گەورەپیاوانی تەسەووف ئەڵێن، ئەوەی ئەمرۆی باشترنەبێ لەدوێنی‌ی ئەوە زیانی‌لێ‌کەوتوە، ئەوەش هەمیشە لەزیادکردنانەبێ ئەوە خۆی: کەم‌کردنو کورت‌هاوردنە، هەروەها بەردەوام‌بوون لەسەری‌کار ئەوەخۆی زیادکردنە.

کەوابو پەروەردەکردنی نەفس لەسەر لۆمەی‌خۆی، وەدودڵی‌و باوەڕپی‌نەکردنی وەپیاچونەوە بەکردارو گوفتاری ڕۆژانەدا، مرۆڤ ئەپاڵێوی‌و قاڵی ئەکات، وە وردە وردە وای‌لی‌ئەکات، عەیبی‌لی‌ئەبڕێت، وەصوفیەکان لەم‌ڕەوشەدا دەستی باڵایان هەیە، وەخەباتی سوفیەکان لەم ڕەوشەدا ئەبێتە هوی پایەبوڵەندیو نزیك‌بونەوەیان لەخودای‌گەورە وە پێش‌کەوتنیان لەڕی‌ڕەوی تەصەووفدا.

**«خەوف وە رەجا»**

کتێبێکی تەصەووف نابینرێت مەگەر بەدەگمەن، کە باسی خەوفو ڕەجای تیانەبێت، وە ئەم دوناوەش بەشوێنی یەکدا دێن، زۆربەیان بەمەقام ناویان بردون وە برێکیشیان بەحاڵ، بۆنمونە، دووکەس لە گەورەپیاوانی تەصەووف کە هاوچەرخیش بوون، وە خاوەنی دووکتێبی سەرچاوەی تەصەووفن، یەکێکیان، (ابی طالب المکی)، کەلە (٣٨٦) ك دا ئەم‌دنیایە بەجێ هیشتوە، وەخاونی کتێبی «**قوت القلوب**»ە کە لەسەرچاوە هەرەگەورەکانی تەصەووفە ئەویشیان (**عبدالله بن‌علی السراج**)ە کە لە (٣٧٨)ك دا، دواکۆچی کردوە، ئەبوطالیب بەناوی مەقام باسی خەوف وەرەجا دەکات، وە عبدالله سراج بەناوی حاڵ باسیان‌ئەکات، هەروەکو زوتریش باسمان‌کرد زۆرجار مەقامێك لەپێشا ئەکرێ حاڵ‌بێت، ئەگەرسەقامگیربو ئەبێتە مەقام، جا ئەو دو باوەڕی‌یە لەوەدا دێتەدی، ئەگینا هەردوکیان‌هەروەها، هەموی گەورەپیاوانی تەصەووفەکانی کەباسی چۆنیەتی خەوفو ڕەجا ئەکەن،...، قامك ئەکێشن بۆ لای ئایەتو حەدیثەکان، هەمووی هەر یەك شتەو یەك چۆنیەتە.

هەرچەن هەروەکو وتمان، ئەم‌دوناوە وەکو دوانە، هەمیشەپێکەوە دێن، بەڵام هەریەکەی بۆخۆی شتێکەو لێك‌جوێن، وا لەپێشا باسی خەەوف ئەکەین، وەلەگەڵ زۆربەی گەورەپیاوانی ئەم ڕێبازەدا، ئێمەش بەناوی مەقام ناوی‌ئەبەین.

## مەقامی خەوف:

خەوف کوردی‌یەکەی ئەبێتەترس، وەخەوفو رەجا، ئەبێتە ترس‌وئومید، سەرچاوەی ئەم چۆنیەتەی کەئەبێ لەدەرونی هەمو موسڵمانێکا جێ گیربێت وە بۆصوفی‌یەکان ببێتە خووخدە، لەقورئان وسوننەت وحەدیثەوە سەرچاوەی گرتوە، سەبارەت بەهەردو حاڵەکەی، خوای‌گەورەوە ئەفەرمێ «وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ» (إسراء)(٥٧)، واتە ئومیدیان بە بەخشندەیی خودا هەیە، وە مەترسییان لەسزادانی هەیە، یان ئەفەرمێ «يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً»، ئەپارێنەوە لەخودا هەم لەترساو هەم بۆ دەسکەوت‌وپاداش، سجدە «١٦» هەروەها لەسورەی (انبیاء) ئایەی (٩٠) دا، ئەفەرمێ «إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ، وَيَدْعُونَنَا رَغَباً وَرَهَباً وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ»، واتە ئەو پەیامبەرانەی ناومان‌بردن ئەپارانەوە، وە روویان ئەهانی بۆمان هەم بەئومێدی رەحمەت وەهەم لەترسی‌سزا، کەواتە، باسی ترس‌وئومێدی بەندە، دەربارەی خودای گەورە، زۆرجار لەقورئان‌دا باس‌کراوە، وەستایش کراوە لەهەردووحاڵەکەی، واتە مرۆڤ هەم ئەبێ لە خوا بترسێت، وە هەم ئەبێ ئومێدیشی بەبەخشندەیی هەبێت، وەنابێ لەرەحمەتی خودا نائومێدبێت، چونکە خوا ئەفەرمێ «لاتَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ الله، إِنَّ اللهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً، إِنَّهُ هُوَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ» زُمر «٥٣»، بەڵام ئایا ئەوئومیدە خۆی بەسەوە؟ئیتر ئادەمی‌زاد ئەبێ بێخەم پاڵی لێ‌بداتەوە؟ هەرگیز، ئەوە کاری شیاو نیە بەڵکو موسڵمان ئەبێ ئەوەندەی ئومێدی هەیە دە ئەوەندەش ترسی هەبێت، وەبەراستی‌ی ترسی صوفیەکان لەهەموکەس زیاترە، چونکە بەراستی عالیمو دانشمەندی راستەقینە ئەوانن کە جگە لەکەسبی عیلم‌ودانشی ئاشکرایی‌و بەرواڵەت، خاوەنی زانستی مەعنەوی‌و دەرونین، وەئەگەر ئیمان‌و باوەری عالیمان‌و دانشمەندان باوەرێکی زانایانەیە واتە «عِلْمُ اليَقِين»، باوەری سوفی‌یە خواناسەکان «عَيْنُ اليَقِين» بەڵکو، «حَقُّ اليَقِين» ە، جائەوەتە ترسەکەی ئەوانیش لەهەموترسێ زیاترە، کە خوا ئەفەرمێ «إِنَّمَا يَخْشَى اللهَ مِنْ عِبادِهِ العُلَمَاءُ»، واتە لە ناوی بەندەکانی خودادا، عالیمەکان، لەهەمویان زیاتر لەخودا ئەترسن، جائەمە بۆچی‌یە؟ چونکی بەراستی‌ی خودا ئەناسن وە خاوەن یەقینن، ئەبێ ئەوەش بزان کە پێش‌رەوو سەرقافڵەی ئەم‌دانشمەندە لەخواترسانە، پێغەمبەری گەورەیە، درودی خودای لەسەر،

کەسەرەڕای ئەو هەموو مەقامەگەورەیەش، لەهەموکەسیّ زیاتر لەخودا ترساوەو، لەهەموکەسیش زیاتر پارێزی کردوە لە هەڵە وە لە هەموو هاوڕێکانی زیاتر خوداپەرستی ی کردوە. هەر بەم بۆنەوەیە کەئەفەرمیّ «شَیَّبَتْنِی هود وَاَخَوَاتُها» واتە سورەی (**هود**) وەسورەتەکانی تری کەوەکو ئەون، منیان پیرکردوە، کەبریتی بن لەسورەتەکانی «**واقیعە**، **واذا الشمس**، **وعَمّ**» بۆچی؟ چونکە ئەوەندە باسی هەرەشەی خوداوەندیان تیایە، هەروەها باسی غەزەبی خودا، کەلەهۆزە گومراکانی گرتوە، وەکو هۆزەکانی عادو ثمود، جا لە جێگاێێك ئەوهەرەشلنە، پێغەمبەری گەورەیان پیرکردبیّ، ئەبیّ ئێمە چۆن لەخۆمان نەترسین.

جا لەبەرئەوەتە هەردو حاڵەتە کەی‌پێکەوە پێوستە، هەم ترس هەم‌ئومید، (**سهل بن عبد الله**)، کەیەکێکە لەگەورەپیاوانی تەصەووف، ئەڵێت خەوف‌و رجاء وەکو نێرو میّ وەهان ئەگەر پێکەوەنەبن، بەرهەمیان نابێت، بەڵام کەپێکەوەبون، تەقوایان لیّ‌ئەبێت، تەقوایش بۆئاخرەکەی، باوەری تەواو، واتە (**یەقینی**) لیّ‌پەیدائەبێت، خوای‌گەورە لەزۆرشوێنی قورئاندا لەبەندەکانی ئەخوازیّ، وەیان دەستوریان‌ئەداتیّ، کەلەخودابترسن، بۆنمونە، ئەفەرمیّ «**وَخافونِ إنْ كُنْتُمْ مؤمنين**»، آل عمران (**١٧٥**)، ئەگەرراست خاوەن‌ئیمانن ئەبیّ لەمن‌بترسن، هەروەها ئەفەرمیّ «**فإيّايَ فَارْهَبُون**» نحل (**٥١**) (**وَإيّايَ فَارْهَبُون**) بقرة «**٤٠**».

یان ئەفەرمیّ «**وَفِي نُسْخَتِهَا هُدىً ورحمةً للّذين هُم لِرَبِّهِم يَرْهَبُون**» أعراف (**١٥٤**)، وەپێغەمبەر (**د**) ئەفەرمیّ (**أنا أخْوَفُكُم لِلّه تَعالى**). لە، کتێبی «**مُعجَم مُصطلحات الصّوفيه**» دا، ئەڵێت، (**خەوف**) بریتی‌یە لەشەرم‌کردن لەگوناەکردن، وەلەوشتانەی کەخوا پێی‌ناخۆشە،

هەروەها لەوتاری صوفیەکانا هاتوە ئەڵێت، ئەبیّ مرۆڤ لەنەفسی‌خۆیشی بترسێت، نەکا هەلیّ‌دێرێت بەڵکو ئەبیّ لەخۆی زیاتربترسێت تا لەدوژمنی،

هەروەها ئەڵێن، ئەوەی ئەبیّ لێی‌بترسێت تەنها خودایە، وەجگەخودا هیچ‌کەس شایستەی لیّ‌ترسان نیە، ئەمەش بەو واتایەتە، ئەگەر مرۆڤ هاتو بەراستی لەخودا ترسا، ئیتربۆچی لەکەسی‌تر بترسێت، چونکە ئەو پەنای‌بردوە بەخودا، ئەوەیش پەنای‌برد بەخوا لەکەس ناترسیّ بەڵکو خەڵك لەوئەترسن. هەروەکو خودائەفەرمیّ «**فَلا تَخافوهُمْ وَخافونِ إنْ كُنْتُمْ مؤمنين**» آل عمران (**١٧٥**).

جا نیشانەی ئەم لەخواترسانە چی یە؟ خۆ هەر وابەدەم ناکرێت کابرابڵێت من لە خودائەترسم، گەورەپیاوانی تەصەووف ئەڵێن لەخوداترسان، بەفرمێسك رژاندن نیە، بەڵکو ئەوەتە کەمرۆڤ دەست لەگوناەو لەخراپەبکێشێت، چونکە ئەوەی بە راست لەخوداترسا، چۆن سەرپێچی ئەکات لەفەرمانی خودا، وەهەرئەم خۆلادان لەگوناهەتە کەمرۆڤ ئەبات بۆلای وەرع، واتە حەلاڵ وحەرام لێك دانەوە، لەپاشان بۆلای تەقوا واتە پارێزگاری لەهەرچی خرابەیە وەئەنجامدانی هەرچی چاکەیە لەروانگەی ئیسلامەوە. کەواتە لەخواترسان وائەکات لەمرۆڤ پارێز بکات لەهەرچی شتی گومان لی کراوە لەبەر خاتری فەرمانی خودایێك کە لە بونی ئەوو لەخوداوەندیی ئەوداهیچ گومانێك نیە.

بەم چەشنە ئەبینین صوفیەکان بەجۆرێك ترسی خودا لەدڵیاندا جی گیرئەبێت کەئەبێتە رەوشێکی هەمیشەیی، وەهەرئەوەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کەتەنها چرکەیێك لەترسی خودا غافل نەبن، وەئەو حاڵەتە ئەبێتە مەقامێك بۆیان، وەئەبێتە هەوێنێك کە رۆحوگیانیانی پێ ئەگیرسێت، ئەبوسلیمانی دارانی، ئەڵێت **«هەردڵی کەترسی لی دورکەوتەوەو ئەوێران ئەبێت»** **«ابنُ عَجيبَة»** کەیەکێکە لەکەڵەمەردانی رێگەی تەصەووف، ئەڵێت، **(خەوف)** سێ پلەی هەیە، پلەی سەرەتایی، ئەوموسوڵمانانەن کە لەترسی سزاءیان، لەدەست دانی پاداشە، ئەترسن لەخودا.

پلەی ناوەندی ئەوانەن لەترسی گلەیی خوداو لەدەست دانی نزیکی خودایە کەئەترسن، بەلام ترسی گەورەپیاوان لەوەتە بەبی ئەدەب دانرێن، وەلەدیداری خودا بەچاوی بەصیرەت لەم جیهان، وەچاوی سەر لەوجیهاندا بی بەش و ناکام بن، (کتێبی) **«معراج التشوّف الى حقائق التصوّف»**.

بەلام هەروەکو وتم ئەم ترسە ئومێدیشی تێکەڵ ئەبێت وەئەبێتە **(خەوف ورەجا)** و وجیهانێکی مەعنەوی لی دەردێت کەمەگەر هەرئەوانە بزانن چەندە مەزن و بەتامە کە بەخەباتی مەردانەیان توانیویانە بگەنە ئەوپایە بەرزە مەعنەوی یە، بەجۆرێك کەخوالەبارەیانەوە بفەرمێ **«يَرْجونَ رَحْمَتَهُ وَيَخافونَ عَذابَه»** بۆتێگەیشتنی زۆرتر لەم بارەوە، ئەتوانن سەیری کتێبی قوت القلوب، وەرسالەی قوشەیری وإحیاء عُلوم الدّینی غەززالی، وصەدان کتێبی تری تەصووف بکەن.

لەکاتی باسی خەوف دا قامکمان کێشا بۆ رجایش، وە گوتم هەمیشە ئەم دوناوە

پێکەوە دێن، واتە ترس وئومێد، مەرجی باوەڕ بۆهەرموسوڵمانێك ئەوەتە کە هەم لەخوابترسێت وەهەم ئومێدی بە بەخشندەیی و کەرەمی خودا هەبێت، هەروەکو ئەفەرمێ «وَيَرْجونَ رَحْمَتَهُ وَيَخافونَ عَذابَهُ» اسراء (٥٧) یان ئەفەرمێ «تَتَجافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ المَضاجِعِ يَدْعونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً» (سجده) (١٦) لەم دوئایەتەدا دە رئەکەوێت چۆن هەردوو حاڵەکە پێویستە (يَرْجونَ رَحْمَتَهُ) ئومێدیان هەیە بەرەحمەتی خودا،ويَخافون عذابه، وەئەترسن لەسزای خودا، هەروەها ئەفەرمێ (خَوْفاً وطَمَعاً) لەترسی سزای، وەبەئومیدی بەخشندەیی، یان بەئومێدی رزامەندیی،بەئومێدی نزیك بونەوە لەخودا، زۆرجار گەورەپیاوانی تەصەووف خەوفورەجا، واتە، ترس و ئومیدیان بەدووباڵ لێك داوەتەوە بۆئیمان، ئەگەر بەم دوباڵەنەبێ ئیمان ناتەواوە، وئەمەش ئەوە ئەگەیێنێت ئەبێ ئەم دوباڵەشی وەکو دولای ترازو رێك بن وەسەرنەکەن.

ئێمە باسی «خەوف» واتەترس لەخودامان کرد، کەواتە ئەبێ باسی ئومیدەکەیش بکەین، بەکەم، ئەوەتە «قُلْ يا عِبادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ. لاتَقْنَطوا مِنْ رَحْمَةِ الله. إنَّ اللهَ يَغْفِرُ الذُّنوبَ جَميعاً. إنَّهُ هُوَ الغَفورُ الرَّحيمُ»، (زُمَر) (٥٣).

واتە ئەی محمد، بڵی بەوبەندانەی کە گوناهی زۆریان کردوەو جڵەوی نەفسیان بەرداوە، بڵێ هیوابڕاو مەبن لە رەحمەتی خودا، بڵێ خوا هەموگوناهێك ئەبەخشێ وەخودا بەخشندەیەو میهرەبانە.

یان ئەفەرمێ «إنَّ الَّذينَ آمَنوا والَّذينَ هاجَروا وَجاهَدوا في سَبيلِ الله اولئكَ يَرْجونَ رَحمةَ اللهِ واللهُ غَفورٌ رَحيمٌ» (بقرة) (٢١٨) (اولئكَ يَرْجُونَ رَحمةَ الله)، ئەوانە رجایان کردوە، داوایان کردوە، ئومێدەواربون بەخودا، کەخوارەحمیان پێ بکات، خوایان بەخشێت. خوایش بەخشندیەو میهرەبان، لەکتێبی «حقائق عن التصوف»دا ئەڵێت رجا، جیایە لە تەمەنێی، واتەئومێدەواربون، وە ڕجاکردن جیایە، لەئاوات خواستن، چونکە ڕجائەوەتە، ئەوەی لە دەستی دێت لەخوداپەرستی ئەیکات. وە داوائەکات لەخودا کە(قوبوڵی کات)، واتە وەری گرێت، بەڵام ئاوات هیچ کارێ ئەنجام نادات خەبات ناکات، سەرەڕای ئەوەش پاداشی لەخودا ئەوێت.

بەم بونەوەیە خودا ئەڵێت، ئومێدەواربون بەخۆڕایی نابێت، ئەبێ ئەوەی لەسەرتەبیکەیت وەئومێدەواربیت خودا لێت وەرگرێت، وەکو کەئەفەرمێ «فَمَنْ كانَ يَرْجو لِقاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صالِحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبادَةِ رَبِّهِ أَحَداً» «الكهف» (١١٠).

بەم بۆنەوەیە ڕێبوارانی ڕێگەی تەصەووف ، ئەوەندە بیر لەم دووحاڵەتە ئەکەنەوەو هۆشی پێ ئەدەن تائەبێتە خووخدە بۆیان ، وەئەڵێن ئەو بەندەیەی بیەوێ ڕێگەی تەصەووف بگرێتە پێش ئەبێ خاوەنی ترسو ئومیدبێت ، نەئەوەندە ترسەکەی زاڵ بێت بەسەری ئومیدا ، کەهیوابربێت ، وەئومێدی نەمێنێت بەکەرەم و بەخشندەیی خودا ، نە ئومێدو رجاکەیشی بگەیێتە رادەیێك ، ترسی نەمێنێت و جڵەوی نەفسی بۆشل کات بەجۆرێ کەنەفسی گومرا بێت و لە هەڵەتێك هەنێ دێرێت .

بەڵکوئەبێ بەدوباڵی خەوف و رەجا بدات لەشەقەی باڵ و خۆی بگەیێنیتە سەری کێوی یەقین ، وە رەزامەندی خوا بێرێتە دەست .

---

## «فقر»

---

یەکێکی تر لەپلەوپایەکانی تەصەووف ، «فوقر»ە یان «فەقر» ، (فەقر) واتە ، هەژاریی وە بێ دەسەڵاتی و نەبوونی ، ئەم کردەوەیەش ، بریتی یە لەوەی کەمرۆڤ چونکە بەندەی خودایە نابێ عاری بێت لەهەژاریی ، بەڵام ئەم هەژاری یە ، بەو واتایە دێت کە بەندە ، دەربارەی خوای گەورە ، خۆی بەهەژار بزانێت ، وەچۆن ، هەژارێکی تر ، چاوەروانی دەستی دەوڵەمەند ، وە بەخشەندەکانە ، ئەمیش ئابەوچەشنە ، چاوەروانی کەرەمی خوابێت ، وەخۆی بەموحتاجی دەرگای هەق بزانێت ، باوەکو خاوەنی سەرمایەش بێت وە ئەمەخۆی دان نانو پێ هاتنە ، بەوەی کە خوای گەورە لەسورەی فاطر ئایەی (١٥)دا ئەفەرمێ : «**یاأیُّها النّاس أنتُمْ الفُقَراءُ إلی الله واللهُ هُوَ الغَنِیُّ الحَمید**» ، یان ئەفەرمێ «**واللهُ الغَنیّ وأنتُمُ الفُقَراء**» (٣٨) (محمّد) .

کەواتە ئەوەی بەرانبەری خوای گەورە خۆی بەهەژارو بێ دەسەڵات و خوازیار وە «**موحتاج**» نەزانێ ، بەپێچەوانەی فەرمانی قورئان هەستاوە ، دووهەمی ، عارنەهاتنە لەهەژاریی واتە کۆششت بۆژیان بۆئەوەنەبێت هەژاریی و نەبونی بەعەیب وعار بزانیت ، وەبۆ دەوڵەمەندبون تێکۆشیت ، تا لەم نەنگە رزگاربیت بەڵکو تێکۆشینت

بۆدابین‌کردنی ژیان‌بێت جا ئەم خدەیە ، لەرێی مەنطق و عەقلێشەوە زۆر پەسەندە ، وەئەوەتا ، قانونەکانی ئەم‌چەرخەش ، کە دەست‌کردی دەستی ئادەمی‌زادو بەرهەمی هۆش‌و بیری مرۆڤە ، تێدەکۆشن کەسامان وەسەرمایە ، بەچەشنێکی هاوبەشی‌و دادگەرانە دابەش‌کرێت ، چونکە لەڕاستەقینەو واقیعیەت‌دا هەمومان بەندەی‌خواین ، وەبەلای خوداوە کەس لەکەس زیاترنیە ، جگە بەخواپەرستی‌و پارێزکاری نەبێت ، «إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ» ، وەنافەرمێ «أَغْنَاكُمْ» ، واتە بەرێزترینی بەندەکان بەلای‌خوداوە خواپەرست‌ترین وەخۆپارێزترینی‌ئەوانە ، نەك‌بفەرمێ دەوڵەمەندترینی ئەوانە ، وەئەوەی فەضلێکی هەبێت ، خواداویەتێ ، وەخوای‌گەورە بەفەضل ناوی ناوە ، نەك «ئەکرەم» ، واتە بەرێزتربێت ، هەروا ئەکرێ کەسێ لەکەسێ دەنگ‌خۆش‌تر ، یان جوانتر بێت ، ئەکرێ دەوڵەمەندتر یان ئەولادی زۆرتربێت ، کەواتە ، نابێ مرۆڤ ، بەم فەضلەبنازێ بەچەشنێك خۆی هەڵکێشێت وەفیزبکات بەسەری ئەوانی‌ترا ، بەڵکو ئەبێ سوپاسی خودای لەسەربکات‌و تێ‌کۆشێت تائەو فەضلە بەئارایش وەزێوەری تەقواو خواپەرستی بێتەوە ، ئەبێ جوانی ، یان دەسەڵات وە دەوڵەمەندیەکەی ، بەهەژاری بۆدەرگای‌خودا ، وەبەشوکرانەی خوا برازێنێتەوە ، تاوەکو ، هەتا هەتایە ، لەونیعمەتانە بەرخورداربێت ، نەك بەفیزو دەمارو لوت‌بەرزی‌و فەضل‌فرۆشی ، ناشیرینی‌کات ، وە کارێکی لی‌بکات خەڵك قیزی لێی‌بشێوێتەوە .

جا ، سەرچاوەی هەژاری تەصەووف لێرەوە ، وەلەو ئایەتە پیرۆزەوە ، سەرچاوە ئەگرێت ، وە صوفی‌یەکان هەرگیز تێ‌ناکۆشن بۆسامان پێکەوەنان ، وەئەگەر خودایش سامانی دانێ هەرخۆیان بەهەژارو نەدار ، دائەنێن بەم‌دەست کاسبی‌حەڵال ئەکەن ، بەودەست لەکارو کردەوەی چاك‌و بەکەڵکا خەرجی ئەکەن ، ئەگەر دەستیان دەوڵەمەندبێت دڵیان هەژارە ئەگەر رزق‌حەڵال بێت‌بەپیریانەوە ، دەری‌ناکەن بەڵام نازۆن بەپیری دەوڵەمەندی‌یەوە ، بەڵکو هەژاری‌یان لاپەسەندترە ، تادەوڵەمەندی ، هەروەکو کە پیغەمبەری گەورە ئەفەرمێ «الفقرفخری» یەکێ لەناوی خواپەرستە زاهیدەکان ، لە سەرەتای‌ئیسلام‌دا ، واتە صوفی مەسلەکەکان ، «فوقەرا» بوە ، ئەمەش هی‌ئەوەبو بەشوێنی سامانا نەئەگەڕان ، وەئەگەر کارو کاسبی‌یێکیان هەبوایێ ، بەم‌دەس ئەهاتەدەستیان وەبەودەست خەرجیان‌ئەکرد .

لەکتێبی «مُعجَم مُصْطلَحات الصّوفیه»دا ، ئەڵێت ، «الفقْرُمَقامٌ شریف . وَسُمّیَ الصّوفیةُ فُقَراءَ لِتَخلّیهِمْ عَنِ الأَملاكِ ، وَحقیقَتُهُ اَنْ لایَسْتَغْنِیَ العَبْدُ الاّ بالله ورسمه عَدَم الأسباب كُلّها ، والفَقیرُ نَعتُهُ السّكون عِنْد العدم ، والبَذْلُ والأیثار عِنْدَ الوُجود» واته ، بۆیه بەصوفی یەکان ، گوتراوە «فوقەراء» چونکە نەکۆشاون بۆئەوەی ببنەخاوەنی ماڵ‌وسامان وەبەڕاستی ، بەندە نابێ هانا بوکەسێ‌بەرێت بۆخوانەبێت ، وەنابێ تەنانەت بەشوێنی سەبەبیشابگەرێت بۆدەوڵەمەندبون ، وسەرمایە بەدەست‌هێنان . فەقیر ئەگەر نەیبو بۆخۆی دامرکێت ، ئەگەریش هەی‌بو . ببەخشێت ، وەلەخۆی‌بگرێتەوە بۆخەڵك ، واتەقانجازی خەڵك بخاتە پێشی خۆیەوە .

لە ریسالەی قوشەیری‌دا سەبارەت بەناساندی (فەقیر) ، هاتوە ، ئەلێت ، فەقیرئەوەتە نێنی خۆی‌بپارێزێت وە قەرزەکانی‌خۆی ئەنجام‌بدات . «ئەبوبەکرئەلمیصری» ئەڵێت . فەقیر بەوەئەڵێن خاوەنی ماڵ‌وسامان نەبێت . وحەزیشی‌لێ‌نەکات ، «أباعبدالله‌الحصری» ئەڵێت ، «أبو جعفر الحداد»م ، دی ، بیست‌ساڵ لەسەری‌یەك ، ئیشی‌ئەکرد رۆژی‌بەدینارێك ، وە بەرۆژویش‌بو ، وەهەمورۆژێ ئەوەی دەستی‌ئەکەوت ئەیبەخشی‌یەوە بەسەری هەژاراندا .

بەراستی ئەم سەرگوزەشتانە ئەوەندەزۆرن لەنوسین نایێن ، کورتەکەی ئەوەتە ، صوفی‌مەسلەکان دژی کاسبی حەڵاڵ نین ، بەڵام دژی ماڵ پێکەوەنانن ، وەهەرکام‌توانییان ئەم پێناسە بکەنەخدەیان واپایەی (فَقْر)یان دەست‌کەوتوە ، ئەم‌کردەوەیەش لەدەستوری قورئان ، وە رەفتاری پێغەمبەرەوە سەرچاوە ئەگرێت .

خوای‌گەورە لەسورەی تەوبە ، ئایەتەکانی «٣٤ ، ٣٥» دا ، ئەفەرمێ ، «والّذینَ یَكْنِزونَ الذَّهَبَ والفِضَّةَ وَلاٰیُنْفِقونَها فی سَبیلِ الله ، فَبَشِّرهُمْ بِعَذابٍ اَلیم ، .. یَومَ یُحْمیٰ عَلَیها فی نارِ جَهَنّم . فَتُكْوی بِها جِباهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهورُهُمْ ، هذا ماكَنَزتُمْ لأنْفُسِكُمْ فَذوقُوا ماكُنْتُمْ تَكْنِزونَ .»

ئەوانەی زێروزیو، واتە دراوو سەرمایە کوئەکەنەوەو لەرێی خوادا خەرجی ناکەن ، واتە بەشی هەژارانی لێ‌نادەن ، موژدەی عەزابێکی سەختیان بدەرێ ، .. رۆژێك ئەبێ ئەو دراوو زێروزیوانە بەئاگری جەهەننەم سورئەکرێنەوەو ناوچاوانو لەشوپشتی خاوەنەکەیانی پێ داخ ئەکرێت‌و پێ‌یان ئەڵێن ، دەبخۆن ئەوە سزای پارە کۆکردنەوە کەتان .

هەروەها خوائەفەرمێ، «تِلْكَ الدّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُها لِلَّذينَ لايُريدونَ عُلُوّاً في الأرْضِ وَلافَساداً وَالعاقِبَةُ لِلْمُتَّقينَ **(قصص)**(٨٣)، دوارۆژی سەرفرازی لەبەهەشتاو لەوجیهان دا بۆئەوکەسانەیە، کەبەشوێنی گەورەبون،وەلەخەڵك زیاتربون، وەبەخاوەن ماڵ و مەقامی بەرزبونا، ناگەڕێن، وەدوری ئەگرن لەفەساد،وەدوارۆژو سەوکەوتن بۆ پارێزکارانە. پێغەمبەری گەورە ئەفەرمێ «**اللّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدَ قوتاً**»، خودایا داوات لێ ئەکەم، ڕۆزی خانەدانی موحەممەد، بکەیتە «**قوت**»، واتە «**ژیوار**» واتە هەرئەوەندەیان هەبێت، پێی بژێن و لێیان نەمێنێتەوە، کەئەبێتە ئەو **(فەقرە)**ی کەباسی ئەکەین.

هەروەها ئەفەرمێ، «**حُبُّ الدُّنْيا رَأْسُ كُلِّ خَطيئَةٍ**»واتە خۆش‌ویستنی دنیا سەرچاوەی هەمو هەڵەیێکە، جا ئەم ئامۆژگاری‌یانەتە، بونەتە سەرچاوەی ئەوەی گەورەپیاوانی ڕێبازی تەصەووف، هەژاری‌یان بەلاوە خۆشتربێت، وەئەگەریش هاتو خودا پێی‌دان، یان میرات و کەلەپورێکیان بۆگەڕایەوە، یان خاوەن دەسەڵاتێك یارمەتی دان، یان بەڕەنجی شانی خۆیان دەست‌کەوتیان هاتەدەست، دڵی پێوە نابەستن وە لەرێگەی خوادا خەرجی ماڵومنداڵ و، هەژارو لێ‌قەوماوی ئەکەن وەقەت دەوڵەمەن‌بون ناکەنە ئامانج، وە لەکاتی بێ‌دەسەڵاتیشا جگە لەخوا، پەنا بۆکەس نابەن.

دوایی باس بەم‌حەدیثە دێرین، کە لەپەندێکا پێغەمبەری گەورە بەیارانی خۆی فەرموە.

«**طوبى لِمَنْ شَغَلَهُ عَيْبُهُ عَنْ عُيوبِ النّاسِ وَأَنْفَقَ الفَضْلَ مِنْ مالِهِ، وَأَمْسَكَ الفَضْلَ مِنْ قَوْلِهِ**».

خۆش‌بەختن ئەوکەسانەی لەباتی‌ئەوەی بۆعەیبی خەڵك بگەرێن، عەیبی‌خۆیان دێرنە پێش‌چاو، ئەوەی لەخواردنی خۆیان زیادە ئەیبەخشن **(واتە سامان کۆناکەنەوەو سەرمایە پێکەوە نانێن)**

وەجگەلەقسەیێك کەناچار هەرئەبێ بوترێت، ئیتر زیادە گۆیی نەکــــا، واتەسەرمایە کۆنەکاتەوە بەلکوخەرجی‌کات، بەڵام قسەراگرێت وزۆربڵێ‌نەبێت.

## «صِدْق»

یەکێکی تر لەمەقامە هەرە بەرزەکانی تەصەووف کەهی ئەوانەتەخاوەنی **«ولایەتی کوبْرێ»**ن مەقامی صیدقە، **«صیدق»**واتە ڕاستی ی **«صادق»**. ڕاستگۆ وەڕاست وێژ.

شارەزایانی ڕێگەی تەصەووف وەهەروەها زانا ئاینی یەکان، زۆر لەم وشەیە کۆڵیونەتەوە وەڕاڤەی زۆریان لەسەر نوسیوە، لەکتێبی **«معجم مصطلحات الصوفیه»** دا ئەڵێ، **«هُوَ اِستواءُ السِّرِ والعَلانِیَة، وَذلكَ بِالاِستِقامَةِ مَعَ الله تعالى ظاهِراً وباطناً، وتِلْكَ الاِسْتِقامَةُ بِاَنْ لایَخْطُرُ بِبالِهِ اِلاّ الله، فَمَنْ اِتَّصَفَ بِهذا الوَصْف، اَیْ اِستَوی عِنْدَهُ الجَهْرَ والسِّر، وَتَرِكَ مُلاحَظَةَ الخَلْقِ بِدوامِ مُشاهَدةِ الحَقِ یُسَمّی صِدّیقاً»**.

**واتە، ڕاستگۆیی بریتی یە لەڕاست ویستانی نهێنی و ئاشکرای مرۆڤ ڕاست ویستانی لەگەڵی خودای خۆیا بە دەرو بەدەرون، بەنهێنی و بەئاشکرا، وەهەرکەسە وای لی هات کەنهێنی وئاشکرای وەکو یەکی لێ هات وەلەبەرئەوەی کەهەمیشە خوای خۆی لەپێش چاوە ئیتر هەرخوای مەبەستە، جا کەوای لی هات پێی ئەوتری «صدّیق»** واتە ڕاستگۆ.

**«صِدّیقیّة»** صیددیقیەش گەورەترین پایە یێکە کە وەلی یەکان ئەیگەنێ واتە، لەخواری پیغەمبەری یەتییەوە، صیددیقیەتە، وەژوورتر لەصیددیق پێغەمبەرییە، بەپێی نوسینی سەرچاوەی پێشو، ئەم مەقامە بەسەری شەش پایەوە دامەزراوە، ئیسلام، ئیمان، صەلاح، ئیحسان، شەهادە، مەعریفە، وەئەمەش کرۆکی مەقامی **«مَنْ عَرَفَ نَفْسَهُفَقَدْ عَرَفَ رَبَّهُ»** یە، وە هەرکەس گەیشتبێتە ئەم مەقامە، لەسێ پلەی زانیاریی وەباوەڕ، واتە **«علم الیقین، عین الیقین، حق الیقین»** تێ پەڕیوە. وە صیددیق لەڕوانگەی تەصەووفەوە، بەکەسێ ئەوتری کە نهێنی باوەری بوئاشکرا بوبێت، وەبە ڕوناکیی یەقین، خوای گەورە ئەوشتانەی لە نهێنی یەکانی خۆی بۆئاشکرا کردبێت کە بەلای خەڵکی ترەوە نهێنی و داپۆشراوو نەزانراون. ووشەی صیدق ووشەیێکە دژی ووشەی **«کذب»** واتە **«درۆ»** وە **(نیفاق)**، واتە دوو ڕوویی، وە لای هەرکەسێك وەهەردەستەیێك یەك مەبەست بەچەند جۆر گێرانەوە.

ڕاستی، هەرچەند ووشەیێکەو، بەزمانادێت، بەڵام ئەبێ هەم بەگوفتار هەم بەکردار وەهەم بەدەرون واتەبەدڵ وەویستی دەرونیش ئەنجامبدرێت، بۆنمونە، من بەڵێن

بدەم بۆکارێك کاتێ «صادیق»، واتە ڕاستوێژەیان ڕاست کردارم، کەئەوبەڵێنەم ئێبرمەدی، وەپەیڕەوی لێ ئەکەم، ئەگینا، بەڵێنەکەم درۆبو، خوایگەورە لەقورئانا بەزۆری باسی (صِدْق) (صادِقْ) (صِدّیق)ی کردوە، وە ستایشی خاوەنی صیدقی کردوە، هەروەها برێ مەبەستی تریشی خستوەتە تەنشتی صیدق، وەباسی کردوە. وەکو «مدخل الصّدق، مخرج الصّدق، ومقعد الصّدق، ولسان الصّدق، وقدم الصّدق».

ئەفەرمێ «وَقُلْ رَبِّ اَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ» «وَاَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ»، بەزوانی حەزرەتی ئیبراهیمەوە ئەفەرمێ «وَاجْعَلْ لی لِسانَ صِدْقٍ فِي الآخَرِين» یان ئەفەرمێ «وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنو اَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِم» یان ئەفەرمێ «اِنَّ المُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهرٍ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ» ئەمە خۆی هەرئەم مەقامەتە کەئێمە باسی ئەکەین.

خوای گەورە «صیدق»، واتەراستیی، بەپێناسیی بەندە خۆشەویستو هەڵبژێرراوەکانی دائەنێت، لەسورەی بەقەرە «۱۷۷» دائەفەمێ «اولئكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَاولئكَ هُمُ المُتَّقون»، لەسورەی زمر «۳۳» دا ئەفەرمێ «والَّذی جاءَ بالصِّدْقِ وَصَدَقَ بِهِ اولئكَ هُمُ المُتَّقون» لەپاشان لەستایشی زۆرگەورەی ڕاستگۆیاندا لەسورەیحوجورات «۱۵» دائەفەرمێ «اِنَّما المومنونَ الَّذِينَ آمَنوا باللهِ وَرَسولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتابوا. وَجاهَدوا بِاَمْوالِهِمْ وَاَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ الله. اولئِكَ هُمُ الصّادِقون».

واتە ئەوموسوڵمانانە کە خاوەنی ئەوهەموە پێناسە باشانە بن، واتە خاوەن باوەڕبەخوداو بەپەیامبەربن وەلەباوەڕەکەیانا دودڵنەبن، وەبەماڵ وبەگیانیان خەباتبکەن لەڕێگەیخوادا، ئەوانە «صادقن» بەڕاستی خەباتێکی زۆری ئەوێت تا مرۆڤ وای لێ بێت شایستەبی ئەوە پەیدابکات کەخەڵاتی، صەداقەت وەرگرێت. لەسورەی، حەشردا ئایەتی (۸) ئەفەرمێ «وَيَنْصُرُونَ اللهَ وَرَسُولَه، اولئكَ هُمُ الصّادِقون» هەروەهالەسورەی آلی عمران ئایەتی (۱۷) دا، لەکاتی پێڕستکردنی پێناسەکانی خۆشەویستانی خوادا ئەفەرمێ، «الصّابرين والصّادقين والقانِتين والمنفقين والمُستغفرين بِالأسْحار».

گوتمان، صیدق ڕاستییە وصادق ڕاستگۆیە، بەلام «صیددیق»، بەکەسێ ئەوترێ کەڕاستیو ڕاستگۆیی بوبێتەپیشەی، وەبەمانە ئەوترێ، خاوەنی مەقامی صیدق، لەموسوڵمانانداء بەر لەهەموان حەزرەتی ئەبوبەکر بویە خاوەنی ئەم

پایە بەرزەیە، ئەبێ ئەوەش بزانین کە پێغەمبەرانیش کەپایەیان لەم پایەیە باڵاترە خاوەنی ئەم پایەیەش بون. هەروەکو کەخوای گەورە لەسورەی مەریەم ئایەتی (٤١) ئەفەرمێ «واذكُرْ في الكتابِ ابراهيمَ انّه كان صِدّيقاً نبيا» و «واذكُرْ في الكتابِ ادْريسَ انّه كانَ صدّيقاً نبيّاً» ئایەی (٥٦) هەمان سورە وە «يوسُفُ ايها الصّديقُ» لەسورەی یوسف ئایەی (٤٦) دا. هەروەها لەسورەی یاسیندا ئەفەرمێ «هذا ماوَعَدَ الرّحمٰن وصَدَقَ المُرسَلون»، یان لەسورەتی مائدەدا سەبارەت بەدایکی حەزرەتی عیسی ئەفەرمێ «وامّه صِدّيقة»، هەروەها لەسورەی نیساءدا سەبارەت بەخۆشەویستانی خۆی ئەفەرمێ.

«وَمَنْ يُطِع اللهَ والرّسولَ فاولئكَ مَعَ الذينَ انْعمَ الله عَليهِمْ مِنَ النبيّينَ والصّديقينَ والشّهداء والصّالحينَ وَحَسُنَ اولئكَ رَفيقا». لێرەدا سەیرئەکەین «صِدّيقين» پاش (ئەنبیا) وەپێش شُهدا ناویان هاتوە، هەروەها لەسورەی حەدیدا (١٩)، کەئەفەرمێ «والّذينَ آمَنوا بالله وَرُسُلِهِ اولئكَ هُمُ الصّديقونَ والشّهداء عِنْدَ رَبِّهِم لَهُمْ اَجرُهُمْ ونورُهُمْ».

**لێرەشا هەر لەپێشی شوهەدادا ناویان هاتوە وەئەڵێ هەمپاداشیان هەیە وهەم «نوور».**

مەبەست ئەوەتە ئەم مەقامە مەقامێکی زۆر گەورەو پیرۆزە، وەپاش خەبات و پەرستش و راستی و دروستی، وە تێپەربون لەهەزاران ئازمون وەهەڵسەنگاندن جائەبێتە خەڵاتی خودا پێ‌داوان.

چونکە هەروەکووتمان، خۆ تەنها هەر بەڕەواڵەت راستگوێی رووت نابێتە هۆی گەیشتن بەپلەی صەداقەت، بەڵکو ئەبێ مرۆڤ لەکانگەی دەرونیشەوە هەستی پاك بێت، وەخواستی پیرۆز، دووروەکان (موناڧیقەکان) لەزەمانی پێغەمبەردا ئەهاتن وەئەیانگوت بەراستی توپێغەمبەری، بەڵام ئایائەکرێ بەمانە بوترێ صادیق چونکە قسەی راستیان کردوە؟ دیارە، ناوترێ، بۆچی چونکە لەدەرونەوە باوەریان بە وتەکەی خۆیان نەبوە، وە دوو رویی یان کردوە، جابۆیە خودا بەپێغەمبەری گەورە ئەفەرمێ «إذا جاءَكَ المنافقونَ قالوا نَشْهَدُ انّكَ لَرسولُ الله، والله يَعْلَمُ انّكَ لَرسولُه والله يَشْهَدُ انّ المنافقينَ لَكاذِبونَ»، بەڵێ وتەکەی ئەوان راست بو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا درۆزن بون، چونکە زوان و دەرونیان یەکی نەبو.

جا ئەم پێناسە بەرزەیە لەپێناسەکانی خودای گەورەشە، بۆیە ئەکرێت، بەمرۆڤێکی خواناسی راستەقینە بڵێین، رەوشتی خودایی هەیە، خوای گەورە لەسورەی نیسادا ئەفەرمێ «وَمَنْ اَصْدَقُ مِنَ الله حَديثاً؟!»، یان ئەفەرمێ «وَمَنْ اصدَقُ مِنَ

**الله قيلاً﴾»** يان كەلەسورەی ئەحزاب دا ئەفەرمیٚ «**قالوا هذا ماوَعَدنا الله ورَسُوله وَصَدَقَ الله وَرَسوله**» .

خوای‌گەورە ئەفەرمیٚ من نزیکم لەراستگۆیان ئێوەش لەوانەوە نزیك‌بن ، وەنزیکی‌یان‌لیٚ‌بکەن ، بیٚ‌گومان ئەم‌نزیکی‌یە بۆئێمەقانجازی تیایە بۆیە خودائەفەرمیٚ نزیکی بکەن لە «**صادقین**» ، خوائەفەرمیٚ «**یاأَیُّهَا الَّذینَ آمَنوا ، اتَّقوا الله وکونوا مَعَ الصّادِقین**» ،کەواتە ئێمەش پێویستە نزیکی‌یان لیٚ‌بکەین ، بەلٚکوئێمەش بتوانین بکەوینە سەری ریٚگای‌ئەوان‌و لەو نیعمەتە بەهرەوەر بین ، لەکتێبی«حەقائق عن التصوف‌دا»لەزمانی عەبلامە (**ابنُ أبی شەریف**)ەوە ئەلٚیٚت ، «**صوفی‌یەکان ئەلٚێن «صیدق» ، ئەوەتە نهیٚنی‌و ئاشکرا ، وە دەروودەرونی مرۆڤ ، وەکویەك وابێت ، بەچەشنێك ئەحوالٚی بەندە کردەوەی ئەوبەندەیە نەخاتەدرۆوە ، وەکردەوەشی ئەحوالٚی دەرونی‌ئەو نەخاتە درۆوە** » .

بەکورتی ئەگەر ریٚبواری ریٚگەی‌تەسەووف ، خۆی بەپێناسی «**صیدق**» رازاندەوە ، وەدەرو دەرون‌و گوفتارو کرداری هەموی‌وەکویەك راست‌وبیٚ‌درۆ بو ئەوە ئەتوانیٚ خێراو زوو بگاتە پایە بەرزەکانی (**ئیمان**) ، چونکە بەراستی ، «**صیدق**» ، هێزێکی یارمەتی‌دەرو پال‌پێوەنەرە بۆپێش‌کەوتن لەم‌ریٚبازەدا ، وەپێناسێکی پێویستە بۆهەمو مەقامێکی ریٚبازی گەیشتنە خوای‌گەورە .

مرۆڤ ئەبیٚ لە بەربەرکانیٚ‌کردنی خۆیدا لەگەلٚ هەستیٚ ناپاکی دەرون‌و دلٚەراوکیٚ‌یێکا کەشەیتان ئەیخاتە دەرون،راست‌بێت .

لەدەرکردنی خۆشەویستی‌ی دنیاو دەس‌کەوتە دنیایی‌یەکان لەدەرونا راست‌بێت .

لەتێکۆشاندا بۆ بەدەست‌هێنانی زانیاری وەراست کردنەوەی کردەوە چەوتەکانی راست‌بێت .

بەکورتی ، لەهەموهەنگاوێکی ژیانیا لەگەلٚی خواداراست‌بێت‌و خودای لەپێش‌چاوبێت ، ئەگەر توانیی وابکات‌و وا بێت وائەتوانیٚ رەزامەندیی خوابێرێتە دەست‌و لەزومرەی «**صیددیقین**» بێت ، ئەگەریش بۆی‌نەکرا ، وا پەکی‌کەوتوەو هەرگیز بەدرۆو چەوتی ناگاتە هیچ هەوارگەو پلەیێکی خوداناسی ، «**شیخ مەعروفی‌کەرخی**» ئەفەرمیٚ «**ماأکثَرَ الصّالحین وَأَقَلَّ الصّادِقینَ فی الصّالِحین**» ، واتە «**صالح**»

وەخواپەرست زۆرن ، بەلاّم لەناوی ئەواندا **(صادیق)** کەمە ، پێغەمبەری گەورە ئەفەرمێ ، **«دَعْ مایُرِیبُکَ اِلی مالا یُرِیبُکَ فَاِنَّ الصِّدق طُمَأنینةٌ والکذبُ رِیبَةٌ»** شتی گومان لێکراو دەس لیّ هەڵگرە بۆشتیَ گومان لیّ نەکراوو ، راستودروست ، جائەبیّ بزانیت کە **«صیدق»** گومان لیّ نەکراوودڵنیایی یە ، وەدرۆیش گومان لێکراوە . هەروەها ئەفەرمێ **«آیةُ المُنافِق ثلاث . اِذا حَدّثَ کَذَبَ واذا وَعَدَ اَخلَفَ واِذا ائتمِن خانَ»** .

عەلامەتو نیشانەی **«مونافیق»** سیّ شتە ، ئەگەر قسەی کرد درۆئەکات ئەگەر بەڵێنیدا بیّ قەولیی ئەکات وەئەگەر ئەمانەتێکت لادانا ، خەیانەتی لیّ ئەکات ، کەواتەصادیق ئەبیّ پێچەوانەی مونافیق بێت واتە درۆنەکات خیلافی بەڵێنی نەکات وەخەیانەت لەئەمانەت نەکات .

کەواتە راستی یەکێکە لەگەورەترین پێناسی رێبوارانی رێگەی تەسەووف وەئەوەندە لەراستیدا ئەکوڵێن ، تاراستی ئەبێتە خدەیان ، وە چۆن راستیی بەپێویست ئەزانن بۆگوفتاریان هەروا بەپێویستیشی ئەزانن بۆکردارو ئەحواڵیان ، ابن قیِّم الجوزیّة ، لەکتێبی مَدارِجُ السّالکین دا وەهەروەها **(أحمد الشرباصی)** ، لەأخلاقُ القران دا ، زۆر لەسەری باسی **(صیدق)** وە مەقامی **«صیدیقین»** رۆیشتون ، هەروەها قوشەیری لە ریسالەکەیدا ، وە عبد القادر عیسی لەکتێبی **(حقائق عن التصوف)** دا ، بەدرێژی باسی ئەم مەقامەیان کردوە ، وە هەروەها غەززالی لە **«احیاءُ علوم الدّین دا»** ، وەهەموویان لەسەری ئەوباوەرەن ، کەپاش مەقامی ئەنبیا مەقامی **«صیدیقینە»** .

لەکۆتایی باس دا ، قامك بۆ فەرمودەیێکی جونەید رائەکێشم کەئەفەرمێ **«حَقیقةُ الصِّدقْ اَنْ تَصُدّقَ فی مَواطِنَ لایُنْجیكَ مِنْها اِلاّ الکِذْب»** واتە ، کاکڵەی راستیی ئەوەتە ، لەکاتێکا راست بڵێیت ئەگیرت کردبێت ، وەجگە لەدرۆ هیچ شتێك رزگارت نەکات ، حالێرەشا هەرئەبیّ راست بڵێیت وەئەمەتە راستیی راستەقینە .

---

**«مراقبة»** :

---

موراقەبە یەکێکە لەو وشانەی کە لەناوی صوفی یەکانا باوە ، بریّ لەگەورەپیاوانی رێبازی تەصەووف موراقەبەیان بەیەکیّ لەحاڵەکان داناوە ، شیخ سەرراج لەکتێبی

«اللمع»دا ئەڵێت «المُراقَبَةُ حالٌ شريف»، هەروەها، هەم‌ئەو، وە هەم «ئەبولقاسمی قوشەیری»، پەنجەیان بۆئەم ئایەتە ڕاکێشاوە، «وكانَ اللهُ عَلى كُلِّ شَيْءٍ رَقيباً» ئەحزاب (٥٢).

موراقەبە بریتی‌یە لەوەی کە ڕێبوارانی ڕێبازی تەصەووف هەمیشە بیرلەوە ئەکەنەوە کە خودای گەورە، «موراقەبە»یان ئەکات، واتە خوای‌گەورە هەڵسونیشت‌و کردەوەی بەندەکانی‌خۆی ئەگرێتە ژێری چاودێری، هەروەکو ئەفەرمێ «أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْواهُمْ، وَأَنَّ اللهَ عَلاّمُ الغُيوبِ»؟ تەوبە (٧٨)، واتەئایا نازانن کەخودای‌گەورە ئاگاداره لەهەمو نهێنی‌یکیان وەهەروەها لەهەموچپەو سرکەیێکیان وەخوا ئاگای لەهەموشتێکی نادیاری‌و شاراوەیە؟ ئەم‌گرتنەژێرچاودێری‌یە لەزۆرشوێنی قورئان‌دا بەصەراحەت هاتوە، هەروەها مەبەستی مەلائکەی سەری‌شانیش، بەلاّم ئێمە چونکو هەموشتێ بەپێی ئاوەزو زانیاری‌و تێ‌گەیشتنی خۆمان لێك‌ئەدەینەوە، ناتوانین بزانین مەلائکە چۆنەو چۆن‌ئاگایان لەهەڵسونیشتی‌ئێمەیە، کەچی ئەگەر بڵێن مانگە دەست‌کردەکان ئەتوانن لەهەزاران‌کیلومەتر دوری‌یەوە بچوکترین‌شت ببینن، خێرا باوەرمان هەیە، بۆچی؟ چونکەشتەکە ماددی‌یەو لەپێش‌چاوە. هەرچەن خۆیشمان نایزانین ئەم‌کارە چۆن ئەنجام ئەدرێت، یان هەرجۆرە کارێکی جاسوسی‌و چاودێری ئەلکتریکی‌و ئەلکترونیکی‌و لێك‌دانەوەی کامپیوتر، کە هەموی ئەمانەش دەست‌کردی خۆمانن، دەست‌کردی ئادەمی‌زادن بەلاّم لەوەدا کۆڵین باوەڕمان بێت بەوەی ئەوکەسەی کەمنی دروس‌کردوە. منێك کەئەم هەموە شتانە دروس‌ئەکەم، بتوانێ بەوجۆرەی بیەوێت من‌بگرێتە بەرچاودێری‌و ئاگای لەهەڵسونیشتم بێت.

بەلاّم سوفیەکان، شەووڕۆژ لەحاڵی موراقەبەدان، واتە باوەریان لەسەرئەوەتە خوای‌گەورە ئاگای لە هەمو هەنگاوو هەموکردارو گوفتارێکی ئەوانە، ئایا کەسێك لەسەرئەوباوەڕەبو، کە والەژێری چاودێری‌دا، ئەتوانێ هەنگاوێکی لار بنێت، وە وتەیێکی ناشیرین بێت بەدەمیا؟ لەسورەی (زُخْرُف) (٨٠)دا خوای‌گەورە ئەفەرمێ «أَمْ يَحْسَبُونَ أَنّا لاَنَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْواهُمْ؟ ... بَلَى وَرُسُلُنا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ» هەروەها، لەسورەی (الملك) (١٣)دا ئەفەرمێ، «وَأَسِرّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَليمٌ بِذاتِ الصُّدُورِ». وە لەسورەی (بەقەرە) (٢٣٥) دا ئەفەرمێ «وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ يَعْلَمُ ما في أَنْفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ غَفورٌ حَليمٌ».

واتە ئەبێ بزانن ئەنانەت ئەو خەیاڵەو ئەوشتەش وا لەدەروناتانا ، خودا ئەیزانێت ، کەواتە لەخودا بترسن . لەپاشان دڵخۆشیان ئەکات . وەئەفەرمێ ئەگەر واتان لێهات ، بونە خاوەنی ئەمخدەیە ، خودا بۆکردەوەی لەوەپێشتان بەخشندەو میهرەبانە .

یان ئەفەرمێ «**أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى**» (العلق) (١٤) .

یان فەرمویانە ، بەهارون‌وبەموسی درودی‌خوایان لەسەر ، «**قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى**» (طه) (٤٦) .

هەروەها دوبارە سەبارەت بەو مەلائیکانەی کەچاودێری کردنی بەندەکانیان پێ سپێرراوە ، ئەفەرمێ ، «**وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ كِرَامًا كَاتِبِينَ ، يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ**» سورەی «**إنفطار**» . ئایەتی لەمچەشنە زۆرزۆرە بەڵام گرنگ ئەوەتە ئێمە پەیرەوی‌یان لێ‌بکەین ، جا صۆفی‌مەسلەکان لەحاڵی موراقەبەدا . ئەبێ موبەمو پەیرەوی بکەن لەم رێنمونی‌یانە ، وە بیان‌کەنە پێناس‌و خدەی خۆیان ، بێگومان مرۆڤ کەوای لێهات لەهەمو لارێ‌و بەدکاری‌یێك دەست هەڵئەگرێ ، وە گەردەن کەچ ئەکات بۆ فەرمانی خودا ، وەبەم چەشنە حاڵی «قورب» ی ، بۆ دەست‌ئەدات . کەبریتی‌یە لەنزیکی خوای‌گەورە ، برێ لەگەورەپیاوانی تەصەووف لایان‌وایە حاڵی‌موراقەبە پاش مەقامی «رەضا» دەست ئەدات . برێکیشیان‌لایان وایە پاش مەقامی «**ئیحسان**» دەست‌ئەدات ، بێ‌گومان هەردوکی ئەکرێت . وەئەکرێت لەپێش ، یان‌لەپاشی مەقامەکانی تریشەوە دەست‌بدات . بێگومان هەرکام لەوانە ، ئەوباوەرەی دەرخستوە کە بەسەری‌خۆیا هاتوە ، بەتایبەت ئەگەر «**موراقەبە**»بە حاڵ دانرا ، وەهەروەکو گوتمان حاڵیش خودا دادەیە ، کەواتە ئەکرێت ، لەگەڵی مەقامەکانا دەست‌بدا ، وە هەروەکو وتمان خۆیشی پێشەنگێکە ، بۆ حاڵی «**قورب**» کە لەپاشا باسی ئەکەین .

بەڵام ئایا ئەم موراقەبەیە چۆن ئەکرێت وە چ ئاکامێکی هەیە ؟ وەئایا هەر ئەمحاڵەتەیە کەوتمان یامنا؟ .

بەلای نەقشبەندی‌یەکانەوە ، موراقەبە خۆی رەوش‌و «**سلوکێکە**» ، بۆپێگەیشتن . بێ‌گومان بەدەستوری مورشید ، چونکە مورشید وەکو پزشك بۆهەر نەخۆشێك دەرمانێ دائەنێت کەخۆی بۆئەو نەخۆشەی بەچاك‌بزانێت ، یان وەکو ماموستا ، ئەزانێت شاگردەکانی ئیستیعدادیان چەندە وەهەرکامەی لەچ جۆرە زانیاری‌یێکدا خودا بەهرەی داوەتێ . ئەویش رێنمایی ئەکات بۆلای ئەوجۆرە

زانیاری‌یە ، وە دڵ‌گەرمو دڵ‌خۆشی ئەکات بۆفێربونی ، یان وەکوموهەندیسێك کەهەرشتەی بۆجی‌و شوێنی‌خۆی دانێت ، جائەگەر مورشید دەست‌نەکەوت مرۆڤ ناچار ڕێگە ئەگرێتەبەر ، سابەڵکو خودا خۆی کەچارەسازە ، چارەیێکی بۆبکات .

جا ئەوجۆرە موراقەبەیە ، بریتی‌یە لە وەی کەمرۆڤ تەوبەکردوی ڕێبواری ڕێگەی تەسەووف ، لەشوێنێکی پاك وبێ‌دەنگا بەدەستی بەدەست‌نوێژەوە روەو قیبلە دانیشێت ، پاش‌ئەوەی بەهەمو گیانێکیەوە لەسەر ئەوباوەرەتە کەخوا ئاگای لەهەمو حاڵێکیەتی ، وە هەناسەیێك نادات خوای‌گەورە ئاگای لێ‌نەبێت ، لەم‌حاڵەدا لەدڵەوە لەخودا ئەپاڕێتەوە کەنورو بەرەکەتی‌خۆی برژێنێت بەسەریا وەهیدایەتی بدات ، وەئاگادارو ڕێ‌نومای بێت ، کەلەم‌ڕێگەیەدا سەرکەوێت ، بەکورتی‌ی هەم خوا بەئاگادار زانین ، وەهەم چاوەڕوانی کردنی نورو کەرەمی خودا ؛ بەتایبەت ئەگەر لەوکاتەشا قورئان بخوێنرێت چاکترە .

جا زۆرکەس هەن هەر لەرێگەی موراقەبەوە ئەگەنە ئەوپەڕی ئاوات .

گەورەپیاوانی ڕێ‌رەوی تەسەووف سەبارەت بەحاڵی موراقەبە زۆر یان فەرموە ، بەڵام کاکڵەی مەبەست ئەوەتە ، ئەوەی خوای بەچاودێری‌کەری گوفتارو کرداری خۆی بزانێت ، قەت رووی‌نابێت بەپێچەوانەی دەستوری خوای‌گەورە هەنگاوێ‌بنێت ، ئایا ئەکرێ لەبەرچاوی خەڵکەوە کارێ‌بکەیت دژایەتی بێت لەگەڵی ئەوخەڵکەدا ؟ یان کردەوەیێك‌بکەیت کەبەلایانەوە شورەیی بێت ، یان‌بەبەرچاوی خاوەن‌ماڵەوە دزی‌بکەیت ؟ .

دەی‌من کەباوەڕم لەسەری ئەوەبێت خوای‌گەورە ئاگای لەگوفتارو کردار ، وەئاگای لەهەستی دەرونمە ، چۆن بڕۆم بەپێچەوانەی خواستی ئەوەوە هەڵسوڕێم ، ؟ جا مرۆڤ ئەرخودا بۆی کردو وای‌لێ‌هات ، بێ‌گومان هەڵسونیشتی نهێنی‌و ئاشکرای جوت‌ئەبن لەگەڵ فەرمانی خوادا ، وەئەوەی خودا پیی‌خۆش‌بێت وائەکات ، ئەوەیش خوا نەیویست نای‌کات ، وەئەمە خۆی گەورەترین خەڵات‌و دەست‌کەوتە بۆهەرموسوڵمانێك ، وەئەوانەی ڕێبواری‌ڕێگەن بەرهەمەکەیان دەست‌ئەکەوێت ، وەبەهرەی وایان دەس‌ئەکەوێت ، بەخەیاڵی کەسانەهاتبێت .

••

واته هەر مەردێ بادەی مەعنەویی لەدەستی پیرانی تەریقەت نوشیبێ، کەوەکو شێر وان، گەردەنی کەچ کردوە بۆ تەقدیری خودا وە ڕەزایە بەقەزا. وە خوێ تەسلیم کردوە. بەڵام مەولەویی ئەم باسی رەزابونی بە پێش هاتەی بۆکردوە؟. بۆئەوەتە لەپێشا باسی لەکوێربونی خۆی کردوەو ئەڵێ چاوم نابینێ تا موطالەعە بکەم. ئەوەتا کتێبەکان بێ‌نازن وە ئیتر ئەو مەولەوی یەی. بە چەپوڕاستا نامەی بۆ ڕۆمو عەجەم ئەچو، ئەوەتا پەکی کەوتوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا کێ ئەتوانێ «مل‌ملان» بکات لەتەکی شێری تەقدیرا، بەڵکو ئەوەی بەڕاستی ی پیاوەو پەروەردە کراوی دەستی مەردانە، ئەبێ ڕازی‌بێت بە ویستی خوداو ناشوکریی نەکات، وە ئەڵێ هەرچی لەلای خۆشەویستەوە هات خۆشە.

ئەڵێ جگە ئەمەش کەمن بەم بەشەی خودا ڕازیم، خۆ ئەگەر بێتو خودا کەرەمی بێت وە دیدەی دەروونم ڕوون کاتەوە خۆ ئەوە نوری عەلانورە، نەك تەنها بە کوێری‌یەکە ڕازیم. بەڵکو پێشم خۆشە، جا ئەڵێ.

دیدەی‌سەر ئەرشی دیدەی سیرر کافین
ئێد دای مونافین ئەو دەوای شافین

دیدەی سەر ئەکەر بروات مادام دیدەی سیرر ڕووناك بێت بەسە، چونکە دیدەی سەر شایەد ببێتە هۆی دوچاربونی گوناه خۆ دیدەی سیرر هەرهی دیدنی نوری خودایەو هۆی کامەرانی یە، لێرەدا مەبەست لەسیرر، هەروەکو لەباسی لەطائف‌دا، بەتایبەت لەبەشی نەقشبەندی کتێبەکەدا، بە درێژی باسم کردوە. لەطیفەیێکە لە لەطائفی دەرون، ئەگەر هاتو پاك بویەوەو ڕووناك بوەوە وەکو چاو وایە ئەویش هەستی پێ ئەکرێت، وە ئەوانەی کە خۆیان ئازمونیان کردوە ئەزانن شتێکی شیاوو ئاشکرایە.

دوبارەی هەر سەبارەت بەم دو دیدەیە واتە دیدەی دڵ وە دیدەی سەر ئەڵێ.

ئێد وەظیفەی گڵ ئەو لەطیفەی دڵ
ئەو چون مەنزڵەن. ئێد بێ‌چون مەنزل
ئەو بەقاش نیەن فەناش تاقی‌یەن
ئێد عەطای تاقی‌و، باقی‌و لاقی‌یەن

ئەڵێ چاوی سەر هی جیهانی خاکی‌یە، واتە جیهانی ماددە «**گڵ**» بەڵام ئەو هی دنیای مەعنەوی‌یاتە، زوتریش گوتمان لەطائف هی عالەمی (**ئەمر**) ن وە لەشی مرۆڤ هی عالەمی خەلقە ئەڵێ چاوی‌سەر وەکو مەنزڵ وەخانو وایە، بەتایبەت کاتێ کە خەڵك سەیری یەکتر ئەکەن وێنەی ئەوەی بەرابەری وا لە ناوی چاویا، جائەڵێ چاوی‌سەر وەکو خانو وایە بەڵام چاوی دەرون کەبریتی‌یە لەدڵ «**بێ‌چون‌مەنزلە**»، بێ‌چون، واتە خودا، چونکە خودا بێ‌مانەندە، «**لیس کمثله شیئ**» ئایەتەو زوتر دیاری‌مان کردوە، ئەڵێ دڵ مادام پاكبو بەرێزترە، بۆچی؟ چونکە جێگای خودای بێ‌مانەندە، زوتریش چەن جارێ نوسیمان «**قلب المؤمن عرش الرحمن**» (**حەدیث**)، واتە دڵی خواپەرستانی راستەقینە مەنزڵی خودایە، ئەڵی چاوی ماددی نامێنێتەوەو رۆژێ ئەبێ تیائەچی بەڵام چاوی دەرون کە کرایەوە خەڵاتێکی بەردەوامو نەبراوەیە. لێرەشا، باسی سیرر، لەطائف، بەقا، فەنا، وە زۆر شتی تەصەووف تیایە.

هەروەکو ئەزانین مەولەوی لە دوایی تەمەنیا چاوی کوێر بوە، جا بەم‌جۆرە دڵێ خۆشی خۆی داوەتەوە، ئەگینا خۆیشی زانیویە چاو چ نیعمەتێکە وە لەسەرەتای باسەکەدا تێر خۆی لاواندوەتەوە، بەڵام بڵێ‌چی کەخودا نەیداکەواتە باشترین شت رەزابونە بەقەزا وە صەبرکردن بەرانبەر بە روداوی سەخت، ئەگینا لای‌خوا هیچی پێ‌ناچی هەم چاوی سەر ساغ‌بێت و هەم چاوی دەرون رووناك.
مەولەوی زۆر جاری تریش داخی خواردوە بۆ ئەو چاو لەدەست دانەی وە خۆی لاواندوەتەوە.
مەبەستێکی‌تر لەم هۆنراوەدا بەدی ئەکرێت ئەوەتە وادیارە لەو دوا دوایی عومرەیشا بەو جۆرەی کەبشێ مەولەوی لە رێبازی تەصەووف‌دا بەمراز نەگەیشتوە، چونکە ئەو تەزکی‌یەی قەلبە سەرەتای کاری صۆفیەتی‌یە، دووهەم ئەگەر بەمراز بگەیشتایێ ئەیوت شوکور ئەوەتا چاوی دەرونم روونە باچاوی سەرم هەرنەبێ. ئەمەش لەوەدا دەرئەکەوێ کە ئەڵێ ئەگەر بێت‌و هەوری لوطفی خودا بباریێ بەسەری دەرونا ئەم خەمەم لەبیر ئەباتەوە، شیعرەکە بەکوردی، ئەبێتە.

باریێ ئەگەرهەور ئەلطافی باری
بۆ مەدەد کاری بەدڵدا باری
دیدەی سەر ئەرچو دیدەی دڵ کافی
ئەم دای مونافی ئەو دەوای‌شافی

مەولەوی لە قەصیدەیێکا کە سەرەتاکەی ئەڵێ **«چەرخ هەرئەو چەرخەن تائاوەردو بەرد»** لەکاتی باسی بێ‌بەقایی رۆژگاردا ئەڵێ، کاتێکت زانی نۆرەی مەرگی ئێمەش هات، جا لە مورشیدەکەی ئەپارێتەوەو ئەڵێ، مادام وایەو چونکە منیش وا ئاخری تەمەنمە.

بەقوربانت‌بم ساقی بگەرە فریام لەم سەرچاوەیەی کە تۆکراوێتە میراوی وە دابەشی ئەکەیت بەسەری خاوەن کشتەکاندا وە هەرکەسەی بەوجۆرەی هەڵ‌بگرێت بەشی ئەدەیت، ئاگات لە منیش بێت چونکە کشتەکەم هەم تینویەتی وە هەم دوادوایی یەتی، بەڵکو فریای کەوی داناوێکی بدەیتێ، جا **(داناو)** بەو ئاخر ئاوە ئەڵێن کە ئەدرێت بەدەغڵ، لەکاتێکایە شیرەی پڕکردوەتەوەو خەریکی گەیشتنەو پاشان نۆرەی دروێنەیە.

دیارە ئەوەی لە تەصەووف دا پێ‌گەیشتبێت ئیتر پێویستی بەمورشید وە یارمەتی مورشید نامێنێ وە بۆخۆی ئەبێتە ئوستادو رێبەر، بەڵام ئەوەتا مەولەوی پەنا بەمورشید ئەباتو ئەڵێ.

حەیفەن تۆ میراو سەرجۆی بادە بی
وە هەرکەس وقەد کەفاف دادەبی
من کشتم روزەرد هام فەردانم‌بۆ
دانەم روسیای هام دەردانم بۆ
ئەرصەد کشتەکەم ئاخر کارشەن
هەفتەکەی ئاخر نۆ وەهارشەن
ساهۆرکەر بابێ جۆجۆ جوگەی مەی
وە سەر کشتمدا پەی‌پەی پەیاپەی
بەڵکیم ئینە خوان گەشێوە کەرۆ
چی ئاخرەوە داناوێ وەرۆ

دەقی ئەم شیعرانە تۆزێ لەگەڵی دیوانەکەی مامۆستا مەلا کەریمدا فەرقی هەیە کە کاتی خۆی ئەم قەصیدەیەم لەرووی نوسخەیێکی دەستخەتەوە نوسیوەتەوە.

لەم شیعرانەدا مەولەویی ئەیەوێ بە «**مەی**» ئاوی مەزرای روحی بدرێت نەك بەئاو، ئەڵێ جۆجۆ جۆگەی مەی، وە هەرچەن بە مورشیدەکەی ئەڵێ میراو، بەلاّم ئەڵێ میراوی سەرجۆی بادە، هەروەها کشتی روزەردو دانەی روسیا ئەمانەش مەبەست شتێکی مەعنەویی یە، بەراستیی جوانی رازاندوەتەوەو باش مەبەستەکەی گەیاندوە.

لە لاپەرەی (**٢٥٦**) دا، باسی پارچە بلورێك ئەکات کە سەرگوزەشتی خۆیی گێراوتەوە بۆ مەولەوی کە چۆن پارچە بەردێکی بێنرخو بێقابیل بوە بەلاّم پاش ئەوەی خراوەتە کورەوەو سورکراوەتەوەو پاڵێوراوەو تڵپو شتە خراپەکانی لێ لابراوە، ئەوەتا بوەتە ئەو بلورەی کە ئەدرەوشێتەوەو بوەتە هاودەمو هاونشینی گەورەپیاوان وە بوەتە گوڵی مەجلیس.

زۆرێك لە گەورە پیاوانی تەصەووف رایان گەیاندوە کە ئەم پایەوپلەی مەعنەویی وە گەیشتن بە پلەی «**عين اليقين**» ە، هەروا گاڵتە نیە وە رەنجی ئەوێت، مەولانا جەلالوددینی رومی، ئەڵێ:

حاصلِ عُمْرَمْ سه سُخن بیش نیست.
خام بُدَمْ پُخته شُدَمْ سوختم.

ئەڵێ، ئاکامی تەمەنم لە سێ ووشە زیاتر نیە، ئەویش ئەوەتە کاڵ بوم، یان خام بوم، برژام، یان پێگەیشتم، وە سوتام، (**کاڵیی، برژان، سوتان**) مەبەست ئەوەتە گەنج بەبێ رەنج دەست ناکەوێ، لێرەدا هەرچەن موصطەلەحات بەکار نەبراوە بەلاّم پیشان ئەدات کە کورەی سلوكو دژکاری لەتەکی داخوازی ناپەسەندی نەفس وە بەردەوام بون لەسەری خوا پەرستیو ذیکرو شەونوێژو راسترەویی، پیاوی خامو ناکامڵ وە بێکەڵك ئەکاتە پیاوێکی پیاوانەی بەکەڵكو بەدەردخواردو.

جا مەولەویی بەخۆی ئەڵێت، ئەڵێ ئەی «**مەعدومی**»، ئەگەر تۆیش وەکو یارانت رەنج نەکێشی وە پێ‌نەنێیت بەسەری وجودی خۆتا واتە «**نكران الذات**» وە خەبات «**موجاهەدە**» نەکەیت، چۆن ئەگەیتە پایەی هاوری پێ گەیشتوەکانت.

ئەڵێ ئەوەی دوبارە لە دایك نەبێتەوە هەرگیز ناگاتە خۆشبەختیی‌و کامەرانیی.

ئەم دوبارە لە دایك بونەش قەلەپۆیەی تەصەووفە، واتە، ئەم وجودەی ئیستەی فەنا ئەبێت وە وجودی تازەی دێتەوە کایە، کە ئەبێتە، بەقای پاش فەنا، واتە ژینی سەرلەنوێ یان مانەوەی هەتا هەتایە. واتە مەرگی، ژیانی ماددی، یان ژیانی حەیوانیو شەهوانیو نەفسانیی، وە بەدنیا هاتنی، ژیانی مەعنەویو رۆحیی.

لە لاپەڕەی (٢٦٤) بەولاوە نامەیە بۆ خزمەتی مورشیدی خۆی واتە شێخ عوسمان سیراجوددین، کە بەناوی حەکیمی دەرد، ئاودێری سەوزەی ئارەزو، زانا بەهەمو رازونیاز، مورشیدی میراو سەرجۆی بادەی لەیل، دەستگیری ڕێگای هاتو نەهات، جڵەوکێشی ذەوق، بەزمئارای مەجلیس، ناوی ئەبات وە داوای یارمەتیی لێ ئەکات وە لێیداوا ئەکات کە لای پێغەمبەر درودی خودای لەسەر، تکایبۆبکات شایەد ڕۆژی قیامەت ڕوزەرد نەبێت.

وە ئەو ناوانەو ئەو بانگەوازانە هەموی کەرەسەی بەکاربراوی تەصەووفن، وە هونەری مەولەویی لەوەدایە کردونیەتە خۆماڵیی.

لە لاپەڕەی (٢٩٨) بەولاوە نامەیێکی ترە بۆ شێخی سیراجوددین، کە یەکپارچە تەصەووفە، وە باسی مەقاماتەو موصطەلەحاتە.

ئەڵێ، ئەی شێخە دەوڵەمەندەکە لە بەهرەی سەرمەدیی دا، ئەیجێگەو ماوای جیلوەی حەقیقەتی موحەممەدیی، ئەی ئەوکەسەی کە لەشەو هەوارگەی فەنا تێپەڕیوی وە لە هەردەی بەقادا مەنزڵت گرتوەو بەیەکجاریی بارت لێخستوە، مەبەستی ئەوەتە فەنا تەنها بۆ پشودانەو بەقا بۆ مانەوەی هەمیشەییە، ئەی ئەوکەسەی خودا تۆی کردوەتە خاوەنی پێناسی مورشیدیو ڕێبەرایەتی وە هەروەها نوری خۆیشی لە دەرونتا جێگیر کردوە وە بەنوری خۆی خەلاتی کردویی، ئەی جێنشینو نوێنەری پێغەمبەر، ئەو پێغەمبەرەی کەخودا لەشەوی میعراج دا پێی فەرمو **(ادن)** واتە نزیکتر بەرەوە، ئەی ئەوکەسەی کە شارەزای هەر حەوت قۆناغە ڕێگاکانی گەیشتن بەخودای.

ئەوەی شیاوی گوتنە سەبارەت بەم حەوت «**طەور**»یان حەوت شاری عیشق،یان حەوت مەقامە،زۆر باس کراوە، هەروکو لەباسی مەقاماتدا باسمکردوە، برێك لە گەورەە پیاوان وەکو «**سەرراج**» لەکتێبی «**اللمع**» دا مەقامەکانی بە حەوت مەقام داناوە، تەوبە، وەرع، زوهد، فەقر، صەبر، تەوککول، رەضا. مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی لەشیعرێکا لە ستایشی عەططار دا ئەڵێ:

هفت شهر عشق‌را عطار گشت
ما هنوز أندر خم يك كوچه‌ایم

واته عه‌تتار هه‌ر حه‌وت شاره‌كه‌ی عیشق گه‌را كه‌چی ئێمه هێشتا هه‌ر واین له پێچی كۆڵانێكا، فه‌ریدوددینی عه‌تتار له (**٥٨٦**) ك، دا، له‌دنیا ده‌رچوه. له‌كتێبی (**التصوف وفريدالدين العطار**) دا، نوسینی (**د. عبد الوهاب عزام**) كه له‌ساڵی «**١٣٦٤ك ١٩٤٥م**» دا، له‌چاپ دراوه، له زمانی عه‌تتاره‌وه باسی ئه‌م حه‌وت وادی‌یه ئه‌كات كه‌بریتین له.

١- وادی الطَّلَب
٢- وادی العشق
٣- وادی المَعْرِفه
٤- وادی الاستغفار
٥- وادی التَّوحید
٦- وادی الحیره
٧- وادی الفقر و الفناء

عه‌تتار، له كتێبی «**منطق الطیر**» دا، ئه‌ڵێ هه‌ركه‌سێ ئه‌م حه‌وت شیوه‌ی بری،ئه‌وه له فه‌نا تێ په‌ریوه، به‌وردی‌و به‌دورو درێژی باسی هه‌ر كامه له‌و مه‌قامانه‌ش ئه‌كات. كه‌خۆی جیهانێكی به‌رینی ته‌صه‌ووفه. جه‌نابی ماموستا مه‌لا كه‌ریم له لێك‌دانه‌وه‌ی ئه‌وه‌دا كه مه‌وله‌وی به‌شێخی سیراجه‌ددین ئه‌ڵێ.

(**بەڵەد نەسارای ئەطواری هەفتە**)، به‌كورتیی په‌نجه‌یێكی كێشاوه بۆ ئه‌و حه‌وت جۆره ته‌زكی‌یه‌ی ذه‌رونه‌ی كه له یاسای نه‌قشبه‌ندی یه‌كانا هه‌یه، كه بریتین له، له‌طیفه‌ی قه‌لب، رۆح، سیر، خه‌وفی ئه‌خفا، له‌عالەمی ئه‌مر، وه له‌طیفه‌ی نه‌فسی وه له‌طیفه‌ی (**قالب**) یان له‌ش، كه له چوار عونصور پێك‌هاتوه، گوتمان چوارعونصوریش بریتین له، ئاوو، ئاگرو، خاك‌و هه‌وا.

جا پێنج له‌طیفه‌ی ئه‌مر وه دوو له‌طیفه‌ی خه‌لق ئه‌وه بویه هه‌ر حه‌وت هه‌نگاو یان هه‌رحه‌وت طه‌وری رێگا برینی سلوك، برێكیش له گه‌وره پیاوانی صۆفی‌گه‌ری وتویانه ته‌ریقه‌ت بریتی‌یه له برینی دوو هه‌نگاو مه‌به‌ستیان ئه‌م دوو جیهانی خه‌لق‌و ئه‌مره‌یه، هه‌رچه‌ند ئه‌وه‌ش وتراوه «**خُطْوَتانِ وَقَدْ وَصَلْتَ**» به‌ڵام ئه‌مه‌یان بۆ برینی دوو

قۆناغی «**فەنا**»یە هەروەکو شاهی نەقشبەند فەرمویەتی ، هەرچەند گوتویانە فەنا جۆری زۆرە ، بەلاَم هەموی جۆرەکانی لەم دووبەشەدا کۆ ئەبنەوە ، یەکێ فەنای لەشی طەبیعی و ماددی «**لەشی ظولمانی**» وە یەکێ فەنای لەشی رۆحی و نورانی .

ئەم دوانەش هەر ئەبنەوە بە عالەمی خەلق و ئەمرەکەی کە باسمان کردن . جا ئایا ئەو بۆچونەی جەنابی مامۆستا بێت، یان حەوت مەقامەکەی سەرراج یان حەوت شاری عیشقەکەی عەتتار ، مەولەوی روو ئەکاتە پیری خۆیو ئەلێت ، ئەی ئەوکەسەی کە شارەزای دەشتی هەرحەوت ئەطوارەکەی ، پاشان ئەلێ : ئەی واسیطەی رێگەی نێوانی دوومەنزڵی «**عیلموعەین**» ، واتە ، تۆ خەڵك لەباوەری ، «**عیلم الیقین**» ە وە ئەبەی بۆ «**عین الیقین**» ، واتە لەئیمانی «**تەقلیدی**» یەوە ئەیان بەی بۆ ئیمانی «**یەقینی**» ، ئەلێ تۆ خاوەنی هەردو باڵی خودا پەرستییت ، کە عیلمی ظاهرەو عیلمی دەرون ، بێگومان هەرکەسێ خاوەنی ئەم دوو زانیاری یە بێت خۆش بەختە وە خاوەنی دوو نورە ، واتە «**ذوالنورین**» ە ، جا ئەو ئەلێ بەشێخ عوسمان ذولنورەین ، واتە وەکو خەلیفەی ئیسلام عوسمانی ذولنورەین ، ئەلێ ئەی ئەو پیرەی کە پاك بوی تەوە لە گەردی ناسوتی ی ، واتە لە دنیای ماددەو طەبیعەت دوری ، وە گەیشتویتە مەنزڵی مەلەکوتی ی ، ئەلێ ئەی ئەوکەسەی دڵی بەنەوای جەبەروتی ی خودا،واتە بەهێزی و تەوانایی خودا ئاوەدان بوەتەوە ، ئەی ئەوکەسەی تێراوی لە سەرچاوەی سەراوی لاهوتی ی ، زوتر باسی لاهوت و جەبەروت و ناسوتم کردوە ، ئەی ئەوکەسەی بە لەش لای ئێمەی وە بەرۆح لای خودای ، ئەمە ئەبێتە «**الخلوه في الجلوه**» ، کە لە بەشی نەقشبەندی دا باسم کردوە ، وە دائرەی جیهانی مەعنەوی یەت لەتۆدا کۆ بوەتەوە ، یان ، ئەلێ هەموداائرەکانت بشکنیوەو تەواوت کردون ، «**سەیری دائرەکان بکەن لەبەشی نەقشبەندی**» دا .

پاشان ئەلێ ئەی ئەوکەسەی لە «**تەلوین**» تێ پەریوی وە لەسایەی «**تەمکین**» دا حەساویتەوە ، تەلوین پایەی رێرەوانەو تەمکین پایەی دامەزراوان و پێگەیشتوانە ، پاشان ئەلێ ، خودا رەوانت شادکات ئامین .

مەولەوی پاشی ئەم هەموە پێشەکی یە ، جا ئەلێ بەمورشیدەکەی ، نامەکەت گەیشت وە دڵ و دیدەی روون کردەوە.... هەتاد.... لێرەدا چەن مەبەستێك روون ئەبنەوە .

یەکەم : هەروەکو لەپێشا گوتمان ، دەرئەکەوێ تاج رادەیێك تەصەووف

کاری کردوەتە سەری ئەدەبی کوردیی، وە تاج رادەبێ ئەم ئەدەبەی دەوڵەمەند کردوەو رازاندویەتەوە دیارە ئەگەر تەصەووف نەبوایی ئەم هەموە شۆرو حاڵەو ئەم هەموە ناسك‌كاری یەش نەئەبو.

دووهەم:

بۆمان دەرئەکەویٚ یەکیٚ ئەوتریٚ مورشید، یەکەسیٚ ئەوتریٚ خاوەنی ئەو پێناسانە بێت کە مەولەوی هەڵی‌داون بەراستی‌ی کەسێکی وەکو شێخ‌عوسمان ئەگەر ئاوا نەبوایێ، چۆن عەللامەکانی رۆژگاری خۆی وەکو مەولەوی، مەلاحامیدی بێسارانی‌ی، مەلاعوسمانی باڵخی، مەلای‌نودشی وە صەدان لە گەورە پیاوانی ئەو دەمە رێگای هەورامانیان ئەدایە بەرو هەڵقەی ئیرادەتی ئەو پیرەیان ئەکردە گویٚ، لەکاتێکا ئەمانە هەرکەسەی لە مەڵبەندی خۆیاندا کەڵەمەردو دانشمەندو هەڵکەوتوی ناوچەکە بون، حەزرەتی سیراجوددین وەنەبیٚ لەکەسبی دانشی ظاهیری دا گەیشتبێتە پایەی مەلاچاکی‌ی، بەلاٚم ئەوەی گەیشتە مەقامی ویلایەت خودا خۆی چاوی دەرونی روون ئەکاتەوە، مەبەستم ئەوەتە بڵێم خۆ مەولەویی خۆی موریدبوەو بەڵکو لە خەلیفە بەناوبانگە کانی شێخ‌عوسمان بوە وە لەعالمە بەناوبانگەکانی ئەو رۆژگارە بوە بەلاٚم چونکە لەدەرونەوە نەگەیشتوەتە پلەی کەمال، پاشی شێخ‌عوسمان بوەتە موریدی شێخ بەهائوددینی کوری شێخ‌عوسمان، وە لەو کاتەشا هەر پێی دێت، جگە موریدێك نەبیٚ ئیتر نەگەیشتوەتە پلەی کەمال.

سیٚهەم:

لەم قەصیدەیەدا زۆرێك لە موصطەلەحاتی صۆفی‌گەری باس‌کراوە، کە سوپاس بۆخودا من زوتر هەمویانم لەکتێبەکەدا باس‌کردوە، لەگەڵی ئەوەشا لێرەشا هەر قامکێکم بۆ راکێشاون.

مەولەویی لەزۆر شوێنی ترا بەپێی موناسەبات باسی مەقام وە حاڵەکانی هاوردوەتە ناوەوە، وەکو ووشەی جەمال، جەلال، خەوف رەجا، عیشق، مەی‌و بادەو زۆرشتی‌تر، بەلاٚم ئیتر خۆ ناکریٚ هەمویان دەس‌نیشان کەین هەر ئەوەی کە گرنگ بو بەرادەی پێویست باسمان کردن.

هەروەکو ئەزانین زۆری‌تر لەشاعیرە کوردەکان کەم‌وزۆر شوێنەواری صۆفیەتی‌ی لە شیعرەکانیاندا بەدی ئەکرێت، داخۆ چەندەش شیعری جوان‌و هەستی پاکی

دەرونی شاعیرە کانمان بەهۆی نەنوسرانەوە، یان بەهۆی تیاچونەوە لەدەست دەرچوین.

ئەوەتا هەروەکو ماموستا مەلا کەریم باسی کردوە مەولەوی ماڵی سوتاوەو هەرچی بوە هەموی تیاچوە، ئیستە ئێمە قەدری نیعمەتی چاپ و کتێب خانەی میری و غەیرە میری گەورەی جیهان نازانین، هەروەها قەدری چیمەنتۆو ئاسن و پاکوتەمیزی و داودەرمانی فەوتاندنی مشك و گیانلەبەر نازانین، چونکە مەگەر هەرخوا بزانێ لە رابوردودا دڵۆپەی باران و مشك و نەبونی کتێب خانەی رێك و پێك وچاپخانە، ئەمانە چەندین سەرمایەی گران بایی یان لەدەست دەرکردوین.

جا تالآنی خێڵ و عەشرەتەکان وە پەلامار بردنە سەری یەکی هۆزەکان وە شەرە گەورەکانی ناوچەکە ئەمانەش با بوەستێ کە ئەمانەش ملیۆنها گەوهەری شەوچرای نایابی ئەدەب و زانیاری یان فەوتاندوە.

مەغۆلەکان ئەوەندە کتێب یان هەڵرژاندە «**دیجلە**» کەرەنگی ئاوی ئەم شەطە گەورەیە رەش هەڵگەراوە، کتێبێك ئیستە وا لە کتێب خانەی «**شێخ عەبدولقادری گەیلانی**» دا خاوەنەکەی لەسەری نوسیوە ئەم کتێبەم لەناوی ئاوی دیجلەدا لەشوێنێکا دەرهانی. ئەوەندە کتێبیان هەڵرژاندبو وەکو دورگەیێکی لێ هاتبو وە ئەم کتێبە کەوتبوە وشکی ی، ئێستەش شوێنەمای تۆزێ تەربونی پێوە دیارە.

ئەوکتێبە ئیستەش هەیە، ئەتوانن سەیری کەن. بەڵێ بەداخەوە سەرمایەی زۆری زانیاری و هونەرو ئەدەبی ئێمەیش و جیهانیش بەو هۆیانەوە تیاچون لەگەڵی ئەوەشا ئەگەر هەوڵ بدرێت وە دڵسۆزی بکرێت لام وایە لەزۆر کونوقوژبنا لەناوی ماڵان و کتێب خانەکاندا وە لە پەراوێزی کتێبەکاندا هەروەها لەکتێب خانەکانی ئەمریکاو ئەوروپادا یان لەمیصرو تورکی یەدا ئەگەر کەسێ بێت بگەرێ بەشوێنی شوێنەوارە کانماندا شتی نایابی زۆر ئەدۆزرێتەوە، ئەو کارانە سپاردەیێکی پیرۆزو گرنگن کەوا بەئەستۆی خوێنەوارە لاوو بەتینەکانمانەوە کە لە ئایندەدا ئەو ئاواتە بێرنەدی.

۵۰۹

## «مەحوی»
## مەلا موحەممەدی کوڕی مەلاعوسمانی باڵخی، «١٨٣٢ ١٩٠٦»م.

وەکو ئەزانن بۆ پەیبردن بە کارکردی تەصەووف لە ئەدەبی کوردی دا. بۆهەر شێوەیێك شاعیرێکم هەڵ بژاردوە.

جەزیری بۆ کرمانجی ی ژوروو، مەولەوی بۆ هەورامی: مەحوی بۆ کرمانجی خوارو

شیخ عومەر ضیائوددینیش بە ناوی مورشید وە پیرێکی بەناوبانگی تەریقەت کە شاعیریش بوە.

سەبارەت بەژیانی مەحوی لاموایە ئەوەی دەربارەی ژیانی ئەو لەپێشەکیی دیوانەکەیا. ئەوەی جەنابی مامۆستا مەلا کەریم وە کاکەحەمەی کوڕی مامۆستا. کە ئەوانیش بیروباوەڕی نوسەرەکانی تریان لەپایانی دیوانەکەدا باس کردوە وا لە خوێنەر ئەکات تارادەیێك لە ژیانی مەحوی شتێکی لێ حالی بێت.

مەبەستی من لەم نوسینەدا تەنها ڕوون کردنەوەی پەیوەندی نێوانی مەحوی خۆیو تەصەووفە. هەروەها، تەصەووف تا چ ڕادەێی لە شیعری مەحوی دا ئەدرەوشێتەوەو هەستی پێ ئەکرێت.

یەکەم :

سەبارەت بە شەخصی مەحوی خۆی ئەوەی بۆ هەموانی ڕوونە، مەحوی مەلاچاك بوە وە لەناوی خێزانێکی صوفی مەسەلەکو ئایینی دا چاوی کردوەتەوەو ژیاوەو، هەم مەلاو مەلازادەیە هەم خۆیو باوکی گرەویدەو دڵبەستەی تەصەووف بون.

بەڵام ئایا مەحوی تا چ ڕادەێی لە مەیدانی تەصەووفدا پێش کەوتوە ئەمەیان هەم لە سەرگوزەشتی ژیانیا نوسراوە وە ئەوەی بۆ یەکێکی وەکو من بەوجۆرەی مەحوی خۆی لە شیعرەکانیا دەرکاندویەتی، دەرئەکەوێ، مەحوی نەگەیشتوەتە پایەی کەمالی تەریقەت، کە بریتی بێت لە ئیرشادی موطلەق، بەو جۆرەی لە ئیصطیلاحی صوفیەکانداهەیە.

هەروەکو بەناوبانگەو هەروایش کەهەمو نوسیویانە، مەحوی خەلیفەیێ بوە لە خەلیفەکانی شێخ بەهائوددینی کوری شێخ عوسمانی نەقشبەندیی، لە ناوی شارەزایانی ئەم بازارەدا خەلیفە بۆ نوێنەری شێخ بەکار ئەبرێت، وە بەو کەسەی کە لە جێگای شێخدا دائەنیشێ ئەڵێن جێ‌نشین وە جێ‌گەدار وە بەو کەسەش کە لەرێبازی تەریقەتدا پی‌گەیشتبێ، روخسەتی ئیرشادی موطلەقی ئەدرێتێ وە پێی ئەڵێن مورشید.

جا خەلیفەیش تا خەلیفە فەرقی هەیە، خەلیفە هەیە روخسەتی ئەدرێت تەنها بۆئەوەی بە نوێنەرایەتی مورشید تەعلیمی تەریقەت بکات، وە کوئەڵێن تەوبەی مورید دائەدات، وەکو ئەوەی کەسێك ئەیەوێ رێگەی تەصەووف بگرێتە بەر ئەگەر دەستی نەگەیشتە شێخ یان وائەبێ شێخ خۆی حازرە بەڵام ئەینێرێتە لای خەلیفە کە تەعلیمی بکات، جا ئەو موریدە تازەکارە ئەرواتە لای خەلیفە وە **(تەمەسسوك)** ئەکات واتە ئەبێتە پەیرەو، ئەو خەلیفەیەش بە نوێنەرایەتی شێخ بەر لە هەموشتێ تەوبەی ئەوکەسە دائەدات واتە رێ‌نمایی ئەکات کە یەکەم هەنگاو هەڵگرێ،کەبریتی‌یە لە تەوبە کردنو پەشیمان بونەوە لە کردەوەی ناپەسەندی لەوەو پێش وە پەیمان‌دان بۆ گرتنەبەری رێگەی باش‌و پەسەندی‌لەوەو پێش، پاشان یەکەم دەرسی تەریقەتی پی‌ئەڵێ، وە ئەڵێ تەریقەت چی‌یەو هەدەفی چی‌یەو لەمەولا ئەبێ چی‌بکات وە رەوشی ذیکر یان رابیطە یان موراقەبەو خەتمو تەهلیلەو هەمو جۆرە خواپەرستی‌یێکی پیشان‌ئەدات وە ئەڵێ، وا من لە وەکالەتی فلان شێخەوە تۆم قوبوڵ‌کردی، ئەویش ئەڵێ وامنیش ئەو شێخەم بە مورشیدو مامۆستای خۆم قوبوڵ کرد وە بومە موریدو شاگردی.

بێگومان ئەوەی ئەکرێتە خەلیفە، خۆی، قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی تەواو کردوەو تارادەیێ لە تەصەووفدا چاوی کراوەتەوە، یەکێ لەسپاردەی هەمو خەلیفەکان ئەوەتە پرسیار، یان سکاڵای موریدەکان چ لەبارەی کاروباری سلوك وە پێش‌کەوتنی کاری دەرونیەوە بێت، یان هەر کارێکی‌تر، بی‌گەیێنێتە مورشید وە وڵامیان بۆ وەرگرێتەوە، بەکورتی‌ی واسیطەی نێوانی ماموستاو شاگردە وە لەهەردولایان نزیکە.

دوهەم:

خەلیفەیش هەیە لەوەش باڵاترە، واتە ئیجازە ئەدرێت بە نوێنەرایەتی شێخ «**تەوجەجوە**» بکات، واتە رووی دڵ بکاتە دەرونی موریدو،یارمەتی لە رۆحی مورشید

وەرگرێت وە دڵی موریدی پێ پاكو ڕووناك کاتەوە وە ئەگەر دەردێکی دەروونی ی هەیە چارەی کات.

گرنگ ئەوەتە ئەم کارتێکردنو دەس‌کاری‌یە هەم مورید هەستی پی‌ئەکات کە، چی بۆکراوە هەم خەلیفە، خۆ ئەگەر ئەو تەوەججوهە مورشید خۆی بی‌کات بە هێزو پێزترو بەکەڵك ترو بەکارترە.

**قۆناغی سی‌هەم:**

ئەم قۆناغە، بەدەگمەن وە لە دەیان هەزار خەبات‌کارو گیان فیدا کارا یەکێکی ئەیگاتێ، پایەی روخسەتی جیابونەوە لە مورشیدە، واتە مورید لە مەقامی فەنا تێ‌پەڕیوەو گەیشتوەتە بەقا، وە لەو گورەپانەشا تا ئەوەی خودا کردبێتیە نەصیب پێش‌کەوتبێ وە بۆخۆی بوبێتە مەردی مەیدان جا ئەوە ئیتر ئیجازەی ئیرشادی موطلەق ئەدرێتێ وە ئەبێتە مورشید وە ماموستاو ڕێبەر.

هەروەکو لە کتێبەکەشا نوسیومە مورشیدیش دوو جۆرن هەیە کاملەو هەیشە کامیلو موکەممیلە، کامیل ئەوەتە خۆی گەیشتوەتە بەقا بەڵام توانایی ئیرشاد واتە مامۆستایی‌و دەرس گوتنەوەو ڕێبەرایەتی نیە، بەڵام کاملی موکەممیل ئەوەتە هەم خۆی پی‌گەیشتوەو هەم ئەتوانێ شاگردو مورید ڕێبەری بکاتو بیان گەیێنێتە لوتکەی مراز، جا، ئا بەو جۆرە ئیجازەیە ئەڵێن ئیجازەی ئیرشادی موطلەق بۆ نمونە هەروەکو چۆن مەولاناخالید لەلایەن شێخ عەبدوڵلای دیهلەوی یەوە ئیجازەی درابو یان بەو جۆرەی کە مەولانا خالید ئیجازەی شێخ عوسمانی تەوێڵەو بریێ لە گەورە پیاوانی تری داوە، جا ئەوانەی گەیشتنە ئەو مەقامە ئیتر پی‌یان ناوترێ خەلیفە، بەڵکو ئەبنە مورشید، تەنانەت ئەگەریش پی‌یان بگوترێ خەلیفە واتایێکی تری هەیە، وە بەواتای جی‌نشینو جێگەدارە، وە جگە ئەوەش خۆ هەر تەنها گوتنو نوسینەکە نیە، بەڵکو لە کردەوەی ئەو کەسەشا هەست ئەکرێ، چونکە ئیتر ئەوکەسە خۆی دەست ئەکاتە ئیرشادو خەڵك پێ ئەگەیێنێو ئەبێتە خاوەنی موریدو خەلیفەو کەراماتو تەئثیراتی مەعنەوی، ئەم جۆرانە بێ‌گومان وان لەمەقامی بەقادا جا لەوەو دوا خۆی‌و بەختی خۆی تاکوێ بروات وە لەدەریای مەعنەوی‌یات دا چی دەست‌کەوێت، ئەوەیان مەگەر خۆیانو خودای خۆیان بیزانن.

لەناوی ئەم پایە بەرزانەش دا هەوڵ ئەکەوێ ئەوەندە پایەبەرزە خۆی ئەبێتە سەر زنجیرەی تەریقەتێك وە ئەبێتە عەبدولقادری گەیلانیی یان ئەبێتە بەهائوددینی نەقشبەند یان ئەحمەدی ریفاعیو مەولانای رۆمیو عومەری سەهرەوەردیو غەززالیو عەرەبیو ئەوانی تر.

ئیستە دێینەوە سەری باسی مەحوی وە ئەڵێم مەحوی بەهۆی مەقامێکی عیلمییەوە کە بویەتی، وە بەبۆنەی ئەوەوە کە باوکێشی خەلیفەی شێخ عوسمان بوە بێگومان خەلیفەیێکی ماقولو خاوەن مەقامبوە: بەڵام مورشید نەبوە، چونکە هەم خۆی شتی وای نەگوتوە، هەم هەروەکو گوتمان ئەگەر مورشید بوایێ شیخەکەی، واتە حەزرەتی بەهائوددین ئیجازەی ئیرشادی ئەدایێ، هەم خۆی ئیرشادی ئەکردو ئەویش خەلیفەو موریدی ئەبو وە شوێنی دیاربو وە هەم مەحوی خۆی بەدەمی خۆی هاواری بێ کەسیو بێ دەسی ئەکات لە گۆرەپانی تەصەووف دا، هەروەکو کە ئەڵێ:

چبکەم نەئەوکەسەم کە کەسم بێ لەلا بەکەس
خۆشم نەگەیمە ئەوکەسە ئەو من بکا بەکەس

هەروەها ئەڵێ:

لە ناکەس کارییا خاکم بەسەر رۆیی بەبا عومرم
خوا تۆ بمژێنە تا لەبەر قاپی کەسێ ئەمرم
بە ضایع چو لە «**مالا یعنی**» یا وەقتم هەمو، یەعنی
دەبێ وەقتێ لە «**بوالوقت**» ی بخوازم دا تیابمرم

یان کەئەڵێ:

کەدایەی خاکت ئاخر هەردەبێ بگرێتە باوەش خۆی
بکە خاکێ بەسەرخۆتا لە قاپی «**بو ترابێ**» زوو
بەتایی عەکسی ئەو دیدارە دڵ سوتا موزەککایە
کەتانت راگرە سازوبە جیلوەی ماهتابێ زوو
دەنی طەبعیی بەجارێ عالەمی داگرت ئەوا «**مەحوی**»
درەنگە ئیلتیجابە بەر رەنی عالی جەنابێ زوو

هەروەها لەچەن شوێنێکی تری ئەم دیوانەشا، مەحوی سکاڵای بێدەسەڵاتیو بەمراز نەگەیشتن ئەکات: واتە، نەئێمە بەڵگەیێکمان بەدەستەوەیە مەحوی گەیشتبێتە پایەی

کەمالی تەصەووف، نەخۆیشی شتیٖ‌وای گوتوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەبینین شەیدایە بە شوێنیٖ کەسێکا کە دەستی بگرێت وە بیگەیێنێتە مراز.

ئەوەی بە دەستمانەوەیە ئەوەتە مەحویی یەکێکە لەخەلیفەکانی شێخی بەهائوددین. وە خۆیشی داخیەتی کە بۆی نەکراوە بگاتە ئەو شوێنەی ئەبوایٖ بیگاتیٖ.

ئەم چەن شیعرە، بێگومان زۆر رووناکن وە پێویستی بە لێك‌دانەوە نیە، جگە ئەو موصطەلەحانەی کە بەکاری بردوون، وەکو «**بول‌وەقت**» یان «**بوتوراب**»، هەرچەن لە بەشی موصطەلەحاتا باسیان کراوە. لێرەشا ئەڵێم بولوەقت ئەبێتە مورشیدی پایەبەرز، واتە خاوەنی کات‌و چەرخی خۆیەتی. بەڵام «**ئیبن‌ولوەقت**» بە مورید، وەبەو رێبوارانە ئەڵێن، رۆڵەی کاتن نەك خاوەنی کات. واتە هەردەمەی وان لە کات ومەقامێکاو، دانەمەزراوون. وان لە گۆڕان‌و پێش‌کەوتنا، لەم پلە بۆ ئەوپلە جا ئەمە هەروەکو تەمکین وە تەلوین وایە، خاوەنی تەمکین ئەو گەورە پیاوانەن کە پیٖ گەیشتونو دامەزراون وە خاوەنی ویلایەتن، بەڵام خاوەنی تەلوین هەروەکو ئیبن‌ول‌وەقت وا لە گوراناو جاریٖ رێگا ئەبڕێت‌و نەگەیشتوەتە مەنزڵ. جا (**مەحویی**) ئاواتی خواستوە بۆ، بولوەقتیٖ کە فریای کەوێت، هەروا کە ویستویەتی پەنابەرێتە بەر قاپی بوترابێك، بوتوراب واتە خاوەن ئاستان، یان گەورە پیاوانی تەصەووف، یان، حەزرەتی عەلی، کە سەرزنجیرەی رەیبازەکانی تەصەووفە.

جالێرەدا مەبەستێك لە ژیانی مەحوییدا هەیە سرنجی راکێشاوم، وە نەیشم دیوە هیچ‌کام لە توێژەرانی ژیانی مەحویی باسی لێوە بکەن ئەویش ئەوەتە هەروەکو دیمان مەحویی سکاڵا لەدەستی بیٖ‌کەسی‌ی ئەکات، وە بۆکەسیٖ ئەگەڕیٖ دەستی بگرێت، جا، کەسیٖ مورشیدێکی وەکو شێخی بەهائوددینی هەبێت چۆن ئەم سکاڵایە ئەکات؟، لێرەدایە بۆمان دەرئەکەویٖ ئەم سکاڵاو هاوارە هی ئەو ماوەیەتە کە مەحویی مورشیدەکەی لەدەست‌داوە، وە لەدەست‌دانی مورشیدە کە (**فەراغ**) واتە بچڕان‌و بۆشاییێکی گەورەی خستوەتە ژیانی مەحوییەوە، وە ئەم ماوەیەش کەم نیە بەڵکو خۆی عومرێکە. ئەم ماوەیە بیستوشەش ساڵە شێخی بەهائوددین لەساڵی «**١٢٩٨**» ك دا لە دنیا دەرچوە وە مەحویی لەساڵی «**١٣٢٤**» ك دا لێرەدایە ئەپرسین کەواتە چۆن‌بوە مەحویی ئەم هەموە ماوەیە بەبیٖ مورشید ماوەتەوە؟

بۆ وەلاَم دانەوەی ئەم پرسیارە ئەبێ چەن ساڵێ بگەڕێینە دواوە.

سەیر ئەکەین مەحوی مەلاچاکەو پێگەیشتوەو خەتیبی مزگەوتی ئیمامی ئەعظەمە لەبەغدادا، وە لاموانیە لەم کاتەدا سەرگەرمی صۆفیەتی ی بوبێت، بەڵکو سەرگەرمی ئەو دانشەبوە کە پێویستی مەلاچاکێك بوە.

مەلای کورە مەلایەو خوێن گەرمەو بەبۆنەی خۆیو باوکیشیەوە رێز لێ گیراو. ئەگەریش سەرگەرمی صوفیەتی بوایێ بێگومان پاش تەواوکردنی مەلایەتی، یان ئەچو بۆهەورامان بۆ خزمەتی شێخی بەهائوددین، یان لای باوکی دەستی ئەکردە سلوك، بەلاَم ئەم مەلا گەنجە بەناوبانگە کە ئیستە لەشارەکەی خۆیا ئەندامی دادگایەو موچەخۆری میری‌یەو لەجیهانی صۆفیەتیو مەلایەتی تۆزێ دورە، لەساڵی «**١٨٦٨**» م دا باوکی لەدنیا دەر ئەچێت، بەلاَم مەحوی بەهۆی مەلاچاکیو لیاقەتەوە ئەبێتە جێ‌نشینی باوکی وە دەست‌ئەکاتە «**تەدریس**» لەم لایشەوە شێخ بەهائوددین بۆ حورمەت لێ‌گرتن وەبۆ چۆڵ نەبونی شوێنەکەی مەلاعوسمان، وە هەروەها بۆ سەرپەرشتی ی موریدەکانی، مەحوی ئەنێتە جێگای باوکی لە تەریقەتیشا، بەلاَم جێ‌نشینی ی تەریقەتەکە وەکو مەلایی‌کە نیە سەبارەت بە کاروباری مەلایی‌یەکە مەحوی ئامادەیی بوە، خۆی مەلابوە، بەلاَم تەریقەتەکە پێویستی بە سلوك وە تەزکی‌یەی دەرون وە رەنجی بێ‌شمارە، لەولایشەوە دەرس‌وتنەوەو ئەرکی ماڵ کەوتوە بەسەری مەحوی‌دا، لەئاوا حاڵێکا بێ‌گومان مەحوی هەر ئەوەندەی پێ‌کراوە کە کاروباری خانەقاو ئەرکی ماڵ بباتە رێگاوە، بەم جۆرە دەر ئەکەوێ بەوجۆرەی بشێ مەحوی نەیپەرژاوەتە لای صوفیەتەکەوە، جا تا تۆزێ دامەزراوەو تۆزێ چوەتە ساڵەوەو کەوتوەتە بیری‌ئەوی سلوك بکات مورشیدەکەی لەدنیا دەرئەچێت، لەم کاتەدا تەمەنی نزیکەی پەنجاساڵێك بوە وە ئیتر بێ‌مورشید ئەمێنێتەوە لەولایشەوە جێ‌نشینی شێخی بەهائەددین کەشێخ حیسامەدینی کوری بوە، لەتەمەنی بیست ساڵ‌دا بوە، بگرە مەحوی مەلاچاکی پەنجا ساڵە نەیتوانیبێ دڵی‌خۆی رازی کات بەوەی ببێتە موریدێکی شەیدای شێخ‌حیسامەدین ، لاموایە هەر ئەوەی پێ‌کرابێ بێ‌وەفایی نەکات وە پەیوەندی دۆستی ی لەگەڵ نەبڕێت، هەروەها لام وایە ئەم قەصیدەیەشی سەبارەت بە جێ‌نشینی ی شێخ حیسامەدین لەجێگەی شێخی بەهائەددینا نوسیبێ کە ئەڵێ:

دڵی بردم بەشۆخی ی، دولبەرێکی تازە، سەر لەنوێ
موبارەك بێ لەدڵ، سەودایێکی کەی، کەوتە سەر، لەنوێ
کەچ ئەبرو دیدەئاهو شۆرشیین‌خو فیتنەجو تورکێ
خورۆش و شۆروشینی خستە ناو ئەهلی نەظەر لەنوێ
لەئاخرا ئەڵێ .
بەشێوەی شکلی‌شیرینی وەکو کاکۆڵی موشکینی
پەشێوی کردوە ئەحواڵی مەحوی دەربەدەر لەنوێ

لێرەدا مەبەستێکی گرنگ هەیە کە شیاوی باسە ، ئەویش ئەوەتە لەم خولی بێ‌مورشیدی و دڵتەنگی ی مەحوی‌یەدا ، شێخ عومەر ضیائوددین ، برای باوکودایکی ی شیخ بەهائوددین ، ئیرشادی کردوە ، وە بەشاهیدی هەموی گەورەپیاوانی ئەودەمە وە هەموی مەلاچاکانی ئەورۆژگارە ، هەروەها بەشایەتی کەسێکی وەکو کاك ئەحمەدی شێخ و مەلاقادری بیارەو هەزاران دانشمەندو خوداناسی ئەو رۆژگارە ، هەڵکەوتوترین مەردی مەیدانی تەصەووف لە خانەدانی شێخ سیراجەددینا ، حەزرەتی شێخ‌عومەر بوە ، وەبە «**صاحب الوقت**» وە «**مجدد القرن**» دانراوە ، واتە خاوەن دەسەڵاتی مەعنەوی وە تازەکەرەوەی صەدەی پانزەهەمی کۆچی ی بوە ، صەدان موریدی وەکو «**شیخ محمد امین الکردي**» لەمیصر وە شیخ «**قاسم القیسي**» لە بەغدا ئەڵقەی ئیرادەتی ئەوذاتەیان کردوەتە گوێ ، وە ئەوەتا ریزی ناوی برێ لە خەلیفەکانی ئەم ذاتە ، هەم یادی مەردانی دوو ، وەهەم لە بنەماڵەکاندا جەنابی ماموستا مەلا کەریم ناوی نوسیون .

ئەڵێم سەیر ئەوەتە چۆن‌بوە جەنابی مەحوی ، لەکاتێکا ئەو هەموە سکاڵایە لەدەستی حاڵی پەرێشانی خۆی کردوە ، چۆن خۆی نەگەیاندوەتە بیارەو لەو سەرچاوەی تەصەووفە بەهرەمەندبێت ؟ جا لام وایە هۆی ئەم کارە چەن شتێ بوبێت ، لام واتە پەیوەندی مەحەبەتی شێخ بەهائوددین جۆرێ بوبێت نەیتوانیبێ لەدڵی دەرکات ، موریدیش تا بەتەواوی پەیوەندی دەرونی لەگەڵ مورشیدی پێشودا نەبرێت ، لەمورشیدی تازەی بەهرەمەند نابێت .

دووهەم ، دورنیە تەعەصعوب ئەوکارەی کردبێ . سێ‌هەم بگرە لاینی موریدەکانیشی لەپێش‌چاو گرتبێ ، چونکە ئەو تەنها خۆی حسێب نەبوە ، شایەت ئەگەر ئەوکارەی بکردایێ هەم خزمەکانی دەردی سەریان بۆ دروس بکردایە ،

هەروا کە جارجار سکاڵای کردوە لەدەسیان ، هەم ئاژاوەو دوو دەستەیی بکەوتایێتە ناوی صوفی یەکانەوە .

بەکورتی ی هەرچی بوەو هەر جۆر بوە ، مەحوی ماوەی «٢٤» ساڵ هەستی تەنهایی و بێ دەسەڵاتیی کردوە ، وە ئەم حاڵەشی لە شیعرەکانیا بەئاسانی ی هەست ئەکرێت .

دیوانەکەی مەحوی هەروەکو کە پەنجەی بۆ ڕائەکێشین وە دیاریی ئەکەین پڕیەتی لەشوێنە دەستی تەصەووف ، وە بۆنی خۆشی ئەوجیهانە ئەدات لەدەماغی خاوەن دڵان وە ئەوانن ئەتوانن هەستی ئەوبۆنە خۆشەو ئەو نورو بەرەکەتە بکەن ، لەگەڵی ئەوەشا باوەری من لەسەری ئەوەتە مەحوی شاعیرێکی صۆفی بەو مەعنایە نی یە هەمو هەست وئەستێکی خۆی تەرخان کردبێ هەر بۆ تەصەووف وەکو «**ابن الفارض**» یان جەلالەدینی ڕۆمی یان مەلای جزیری ، بەڵکو شاعیرێکی زۆر بەدەسەڵاتی گۆرەپانی هونەری شیعرەو دیوانەکەی ڕازاوەتەوە بەهەمو جۆرە هۆنەرو مەبەستێك، وە تەصەووفیش کاکە بەشانەی خۆیی بۆدانراوە .

سەبارەت بەموصطەلەحاتی تەصەووف سەیر ئەکەین هەم موصطەلەحاتی عەرەبیی بەکاربردوە هەم موصطەلەحاتی فارسێ ، وەبرێ جاریش لەو موصطەلەحانەی گوڕیوەتە سەری زمانی کوردیی . لە لاپەرەی «٣» دا ووشەی ناخودا وە باخودا ، ی بەکارهێناوە .

لەم بەحری فیتنە بەڵکی نەجاتت بدا خودا
داوێنی باخودا بگرە بەردە ناخودا

لێرەدا دڵ گەرم کردنی مرۆڤ بۆئەوەی داوێنی باخودایێك ، پیاوی خودایێك بگرێ بەڵکو لە دەریای ئاشوبی ئەم جیهانە ڕزگار بێت ئەوە خوێ تەصەووفە ، تەصەووف پاڵ بە ئینسانەوە ئەنێت بۆ بەدەست هێنانی مورشید .

لە لاپەرەی «٥» دا ئەڵێ .

تازوڵمەتی وجودە ، تەریکی لە نوری عیشق
سێبەر نەما هەتاوە کە مەحوی نەما خودا

ئەمەش تەصەووفێکی ئاشکرایە ، هەم لە بەکاربردنی موصطەلەحاتی زوڵمەتی وجود ، نوری عیشق ، هەم لە مەفهومەکەدا ، چونکە ئەوە ئەگەیێنێ ، تاوەکو ئەم وجودە ناسوتی یە ماوە واتە تاحاڵەتی ماددە پەرستی و شوێن کەوتنی داخوازی

ناپەسەندی نەفس بمێنێ ئەوە نەفسی ئەوکەسە پاك نەبوەتەوە ، بەڵام ئەوکەسەی توانیی تاریکیی وجود ، واتە تاریکیی خۆ ویستیو خۆ بەزل زانیی لابردەوە نوکرانی ذاتی کردە پیشە،واتە بویە خاوەنی «ایثار» ، وا لەروناکیی نوری خودا «**نوری عیشق**» بەهرەمەند ئەبێت .

ئەڵێ ئەمانە نەما ئەوە سێبەر نەماوە سێبەر هیچییە ؟ هی ماددەیە ، کە سێبەر نەما ، دیارە هەتاوە ، کە وجود ، واتە لەشی نەفسانیو حەیوانیی نەما ئەوە «**فەنا**» بوە لەذاتی خودادا ، واتە خۆی لەبیرچوەتەوە وە هەستە ناپەسەندەکانیشی توڕداوە ، چی لەبیرە ؟ خودا .

واتە ئەگەر مەحوبی توانیی خۆی وە وجودە ناسوتیو هەستە حەیوانی یەکەی نەفسی ئەممارەی خۆی توڕدات ؛ ئیتر ئەوکاتە هەر خودای لەیادەو هیچی تری لەیادنیە ؛ تەنانەت خۆیشی .

هەر لەو لاپەرەیەدا گوم بوانی چۆڵی مەحەبەتی خودا،ئیصطیلاحی عەرەبیو فارسییە کە ئەم گۆڕیویەتە سەری کوردی .

لە لاپەرەی شەش‌دا ، سۆزی عیشق ، جەلالی خەیاڵی ئەوم لەدڵێ ، هەم موصطەلەح هەم مەفهومەکەش تەصەووفە وەکو گوتمان «**قلب المؤمن عرش الرحمان**» حەدیثە .

جا ئەڵێ ئەمە وەکو ئەوە وایە ئاسمانێك لەناوی دانە کونجی‌یێك دا جیی ببێتەوە ، دیارە بەرەواڵەت شتیوا ناگونجێ ، بەڵام لەگەڵی ئەوەشا تیکۆشانی صۆفی بۆ گەیشتن بەو ئاواتەیەرۆژێ بێتە پێشەوە دەرونی ئەو شایستەیی ئەوە پەیدا بکات کە نوری خودای تیا بدرەوشێتەوە .

لەلاپەرەی (۷) دا ، موصطەلەحی «**کاری دڵتوێنەوە**» بەکار دێرێت «**بەس کاری دڵتوینەوە مەحوبی لەپێشتە**» موصطەلەحێکە کردویە بەکوردی ، لەناوی صۆفی مەسلەکاندا موجاهەدە ، واتە خەبات مەشهورە ، مەبەست ئەوەتە پەیرەوی کردنی موبەمو لە قورئان و سوننەت ، هەروا گاڵتە نیە ، هەر ئەوەتە ئەڵێن ، صیراطی موستەقیم ، واتە ڕێگەی ڕاستی ئیسلامیی گرتنەبەر ، لە موباریك‌ترو لەئەڵماس تیژترە ، وە هەر لەبەر سەختیی ئەوڕێگاتە کە ئەگەر هیدایەتی خودا لەپاڵا نەبێت سەر ناگرێت ، «**اهدنا الصراط المستقیم**» سورەی (حەمد) .

زۆر جار لەباوکم بەرەحمەت بێ ، بیستومە ئەیفەرمو رۆڵە ، ئەوەی بیەوێ لەم ڕێگایەدا بەهرەیێکی دەست کەوێ ، ئەبێ خوێنی خۆی بکات بەئاو ، کە کینایەبو لە رەنجو خەباتی بەردەوام .

لە لاپەرەی «٨»دا ئەڵێ .

هەتاهەق ناصیرە هەر هەقە مەنظور
وەکو مەنصور ئەگەر بمکەن بەدارا
نەگەیمە ئەو جوانەو گەیمە پیری‌ی
مەدەد یاپیری پیرانی بوخارا

باسی مەنصوری حەللاج وە هەقگوێی مەنصور ، هەروەها ووشەی پیر ، کە بۆ مورشیدە ، وە پیری‌پیرانی بوخارا کە شاهی نەقشبەندە ، وە ووشەی شێخ وزاهیدو عیشق کە لەم پارچە شیعرەدا هاتون ، هەموی پەنجە ڕاکێشانە بۆ تەصەووف .

پاشان باسی «**بولوەفا**» ئەکات ، بێ‌گومان مەبەستی مەحوێی حاجی شیخ‌عەبدولرەحمانی شاعیرە کوری شێخ‌عوسمانی تەوێڵە کە نازناوی لەشیعردا بولوەفایە .

وا بەناوبانگە شێخ عەبدولرەحمان مورادبوە ، وە لە هەرسێ براکەی تری لەتەریقەتا ، دەس رۆیشتوتر بوە ، بەڵام لەتەمەنی «**٣٤**» ساڵیدا لەساڵی «**١٢٨٥**» ك دا لە دنیا دەرچوە .

لە لاپەرەی «**١٣** - **١٦**» دا ووشەی تەصەووفی زۆری بەکار هێناوە ، ئەڵێ .

کە هەڵگرسا لەنوری بادە شەمعی حوسنی جانانە
نەچێتە سەر طەریقەی حەزرەتی پەروانە، دڵ چبکا ؟

یان لە پایانی غەزەلەکەدا کە ئەڵێ .

لە هەرجێ‌یێك هەڵێ خورشیدی عیشقی گوڵ‌روخان مەحوێ
ئەگەر عەقڵی بێ ، لەوجێگە ئاونگی عەقڵ چبکا

ووشەکانی ، نوری بادە ، تەریقەی حەزرەتی پەروانە، خورشیدی عیشقی گوڵ‌روخان ، هەمویان ، موصطەلەحاتی تەصەووفن ، لێرەدا ئەبێ بڵێین ، خۆ موصطەلەحاتی تەصەووف ئەوە ناگەیێنێ ، ئەو وشانە لە وتوو‌یژی ترا بەکار نابرێن ، زمان هەر زمانە ، بۆنمونە ، صەبر ، تەوەککول ، یان عیشق یان بادە یان دڵ ، یان بەقا، فەنا ، لەطیفە وە ئەوانی تریش ، هەموی بەکار ئەبرێن ، بەڵام لێرەدا

شێوەیێکی تایبەت پەیدا ئەکەن وە ئەخرێنە قاڵبێکی ترەوە کە بۆ کارناسی خۆی دیارە : حەب وە حوبوب ، لای پزیشک شتێکەو لای خاوەن کشتوکاڵ شتێکە ، دەرزی ، لای پزیشک شتێکەو لای خەیات واتایێکی تری هەیە .

بەراستی لەوردەکاری شیعرو ووشەئارایی و نازک کاریدا ، مەحوی دەستێکی باڵای هەیە وکو ئەڵێ ... «**هەر بەخۆی ئەکەوێ**» .

لە لاپەرەی (١٦) دا ووشەی دەروێش ، سوبحە ، کەشفی تاریکی ی ، نوری عومر .

هەروەها لە لاپەرەی «١٨» دا ، جونون ، ئادابی عیشق دوبارە مەنصور وە «**أنا الحق**» ، هەموی موصطەلەحاتی تەصەووفە ، لەپایانی قەصیدەکەدا لەلاپەرەی «١٩»دا ئەڵێ .

دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێبەشە بێ‌داغی عیشق
مەحوی‌یا ، دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا
تێکرای شیعرەکە ، بەڵکو هەموی قەصیدەکە تەصەووفە .

مەحوی ئەڵێ دەرکی حەقیقەت ، واتە گەیشتن بە یەقینی خوداناسی ی ، وە حەقائقی مەعنەوی ، بەبێ گرتنەبەری ڕێگەی عیشقی خودا ، واتە ڕێگەی تەصەووف ، ڕێک ناکەوێت واتە دڵێ عیشقی تیانەبو ناتوانی دەرکی حەقیقەت بکات ، جا لێرەدا ، ئەڵێ ، داغی عیشق ، داغ ، یان داخ‌کردن بۆ زۆرشت باوبوە ، بۆ ئازاردان ، خەڵکیان داخ کردوە ، بۆچارەی نەخۆشی ، ئینسان‌و حەیوان ، داخ کراون ، وە لە هەموی باوتر چوارپێ‌و مەروماڵات ، داخ کراون بۆئەوەی دیاربێ خاوەن دارن ، وە خاوەنەکەیشیان دیاری‌یە .

مەشهورە ئەڵێ مەرگی فڵان داخی‌نا بەدڵمانا ، داخ بەدڵی کردین ، لێرەدا ، بۆخەفەتیش بەکار ئەبرێ ، یان ئەڵێن ، داغی دڵی (**لالە**) ، لالە ، مەبەست لە گوڵی شەقایقە ، ئەوە تا ، بنی پەرەی گوڵی شەقایق مۆرێکی ڕەشی پێوەیە ، ئەڵێ‌ی داخ کراوە . جا ئەڵێن ئەمە داخی عیشقە نراوە بە دەرونی شەقایق‌دا ، بەڵام لەبازاری تەصەووف‌دا ، داغی‌عیشق مەبەستە لەوەی ئەوکەسە عاشقی کەسێکە،وە ئەوە، ئەوکەسە دیاری کردوەو ئەو دڵەی داغ کردوە بۆ خۆی ، بەکورتی ی نیشانەی

مورشیدداری و بێمورشیدی‌یە ، دیارە ئەو کەسەش ماموستاو ڕێبەرو بەڵەدو شارەزا کەوتە پێشیەوە وا گومانی تیانیە کە ئەگاتە مراز .

مەحوی ئەڵێ» **دڵ لەئیدراکی حەقیقەت بێبەشە بێ داغی عیشق** »کەوابو ئەگەر دڵ ، داغی عیشقی پێوەبو لەئیدراکی حەقیقەت بێبەش نیەو چاوی کراوەتەوەو بینایی هەیەو کەشفی حیجابی بۆ بوەو خاوەنی موشاهەدەو بینینە .

«**مەحوی‌یا ، دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکات**» واتە بەچاوی دڵ..هەرکەس خۆی بەدانا ئەزانێ ئەبێ هەوڵ بدات چاوی دڵی بکرێتەوە ئەگینا شێت‌و بێعەقڵێش ، تەنانەت ، حەیوانیش چاوی سەری هەیەو شت ئەبینی ، کەواتە بەصەر،یان چاوی سەر،هەموی تێدا بەشدارن ، ئەوە بەصیرەتە ، واتە چاوی دەرونە کە تەنهاهی دانایان وە گەورە پیاوانە ، کەواتە پیاو ئەوەتە بەچاوی دەروون ببینێ .

لە لاپەرەی «**٣٦**» دا ، ئەڵێ .

گەر عاشقی لە خونی جگر قومدە دەم مەدە

مەی‌خوارە خام کارە هەتا هاوو هو دەکا

ئەمەش هەر پەنجە ڕاکێشانە بۆ عیشقی حەقیقی وەتەصەووف ،

گەورەپیاوانی تەصەووف زۆرجار ئامۆژگاری موریدی تازەکار ئەکەن کە ئەگەر هاتو دڵگەرمی‌و نورو بەرەکەت دەستی‌دا ، ئەبێ خۆی بگرێت وە دەنگی لێ بەرز نەبێتەوە و نەگریت‌و هاوار نەکات ، ئەڵێن هەتا خۆی بگرێت وە هاوارنەکات بەهرەی زیاتری دەس ئەکەوێ ، ئەوەتا ئەوانەی پێ‌ئەگەن‌و ئەبنە مورشید،یان پیاو ماقوڵی ڕێباز ، ئارامی‌و لەسەرخۆیی یێکی تایبەتیان هەیە،جا نمونەکەی لە عیشقی مەجازی‌و مەستی مەجازی‌دا هاوردوە تەوە ئەڵێ ئەوەی تازە فێری مەی‌خواردن بوبێت بە تۆزێ مەی سەرخۆش ئەبێ، بەڵام ئەوەی لە مەی خواریدا دەوامی بو هەروا بەگاڵتە سەرخۆش نابێت .

لە یادتانە لەباسی بایەزیدی بەسطامی‌دا گوتمان لەوەڵامی ئەوکەسەدا کە گوتبوی ئێمە پێکێکمان خواردوەتەوە هەتاهەتایە مەستی‌کردوین ، بایەزیدگوتی ئێمە دەریایێك هەڵ ئەلوشین هێشتا هەر تینومانەو تێراو نابین .

لە لاپەرەی (٣٤) دا هەمیسان باسی مەنصور وە ذاالنونی کردوە جەنابی ماموستا مەلاکەریم ئەڵێن مەبەست لە (ذاالنونی) پێغەمبەرە ، دیارە ئەوەش بۆچوونێکە،بەڵام

من لام‌وایه مادام باسی مەنصور کراوه کەصۆفییێکی لێقەوماوی دەستی صۆفی نەناسان‌بوه ، مەبەست لەم ذوالنونەیش ذوالنونی میصری‌یە کە سەرقافلەی تەصووفی میصره (٢٤٥ك) لە دنیا دەرچوه .

ئەویش هەروەکو حەللاج ئازار دراوەو زیندان کراوەو دەربەدەری زۆری کێشاوه .

لە لاپەرەی (٣٤ – ٣٥) دا ووشەی پیری موغان‌و ، موغ‌بەچه ، ڕێگەی طەلەب‌و مەولاناو داغ بەدڵ‌و جەرگ دا نانی ، کردوه کەهەموی موصطەلەحاتی تەصەووفە پیری موغان موغ‌بەچه لەووشە بەکاربراوەکانی خواجە حافظە ، پیری موغان لەبناغەدا بە سەرۆکی دینی‌ی زەردەشتی‌یەکان وه هەروەها بۆ خاوەن مەیخانەش بەکاربراوه ، موغبەچە واتە مەی‌گێڕ یان شاگردو بەردەستی پیری موغان .

بەلاَم لە تەصەووف‌دا مەبەست لەم پیرە پیری تەریقەتەو ئەو بادەیەش بادەی مەعنەوی‌یە کە بەهۆی مورشیدەوه ئەدرێتە ڕێبوارو مەستی ئەکات ، وه لام‌وایه مەبەستی مەحوی لە مەولانا لێرەدا جەلالودینی ڕۆمی بێت هەرچەن لەفارسیدا مەولانا بۆ مەلا بەکاربراوه بەلاَم لە ئەدەبی‌یاتدا زۆرتری بۆ جەلالوددین ڕومی وه برێ‌جار بۆ مەولانای جامی‌ی بەکاربراوه . ڕێگەی طەلەبیش ، هەمان سلوکی تەریقەتە . لە لاپەرەی (٥١)دا ، کە ئەڵێ : مەحەببەت مەذهەبت بێ وه مەیکەشی‌ی مەشرەبت‌بێ ، دیارە یەکێ لەناوەکانی ڕێ‌ڕەوی تەصەووف ڕێبازی مەحەببەتە باسی مەی‌کەشی‌و مەی‌خواردن و مەستی‌مان کرد .

لە لاپەرەی (٥٥) دا لەپایانی قەصیدەیێکا ئەڵێ .

دڵە عەرشی خودا مەحوی خەجاڵەت‌بە لەبەر غەفڵەت

کە بۆتە بوت‌کەدەی بێ بەرهەمەن یا دەیری بێ‌ڕاهیب

زوتریش وتمان ئاواتی صۆفی ئەوەتە دڵی ببێتە جێگەی نوری خودا وەیادی خودا لەدڵی دوور نەکەوێتەوه بەڵکو گوتمان دڵ دەبێتە جێگەی مەذکور واتە خودا یان (موسەمما) واتە خودا ، چونکە کاتێ نوری خودا لەدڵا درەوشایەوه ئیتر ذیکروئیسم پێویستی‌نیە ، خاوەن ناو خۆی حازره .

هەمیسان ئەو حەدیثەش دێتەوه یاد کەگوتمان «قلب المؤمن عرش الله»یان حەدیثێکی قودسی‌ی کە خودا ئەفەرمێ ئەرزو ئاسمانەکان جێگای منیان تیا نابێتەوه بەڵام دڵی بەندەی خاوەن باوەر جێگەی منی تیا بوەتەوه .

جا ، مەحوی گلەیی لەدڵی خۆی ئەکات ، ئەڵێ ئەیدڵ تۆ ئەبوایێ ئیستە جێگەی خودا بوایەیت کەچی تۆ خەجاڵەت ناتگرێ بویتە بوتخانەی بێ بوتو دەیری بێ‌راهیب ، واتە هەم چۆڵیت وەهەم وەکو مزگەوتیش قەدرت نیە کە پەرستگەی موسوڵمانانە ، وە ئەمەش هەموی دەردی غەفڵەتە ، لەباسی نەقشبەندیدا گوتمان تەواوی کۆششی صۆفیەکان بۆ ئەوەتە لەخودا غافڵ نەبن ، تەنانەت بۆ تاکە چرکەییکیش ، جا ئەڵێ حەیف نیە شوێنێك بکرێت ببێتە جێگەی خودا،ئیستە بووبێتە جیگەی غەفڵەت لەخودا ؟

لە لاپەرەی (٦٧) دا ئەڵێ .

لەناوا باسی تۆبەی تۆبو ئەمرۆ ئەی ستەمگەر شۆخ
بخە ئەم تۆبە پاشی کوشتنیمن تۆبیو پیرت

ووشەی تۆبەو تۆبەکردنو پیرو ئەمانە لەموصطەلەحاتی تەصەووفن ، ئەمە جگە لەجوانی‌ی جیناسەکانی شیعرەکە .

لە لاپەرەی (٧٠) دا ئەڵێ :
لەپێ حەرامە زرەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق
بی بەشێرو مەگەر ، هەڵگری لەدنیا دەست

ئەڵێ زەنجیری پیروزی عیشقی خودایی هەروا بەگاڵتە ناکرێتە پێ ، مەگەر ئەوکەسە ئەوەندە مەرد بێت دەست لەدنیا هەڵگرێت ، بێگومان شێر کە زنجیر کرا ئیتر هەرچەن بە لەش‌و قەوارە شێرە بەلاْم تازە دنیا بەوچی چونکە تازە بەسراوەتەوەو دەستی لەدنیا هەڵگرتوە ، جا واتە خۆ هەمو منالێ یان مرۆڤی بێ‌ورەو زەبون ناتوانێ نەفسی خۆی زنجیرکاتو دەس لە هەوەس‌و ئارەزوی دنیایی هەڵگرێت سامەگەر ئەوکەسە شێری مەیدان بێت تابتوانێ زنجیری موقەددەسی عیشق بخاتەپێی خۆی چونکە ئەوەی جیهانی تەصەووفی گرتە گەردەن ئیتر بە زەرق‌وبەرقی دنیا ناخلەتێ . بەراستی‌ی وردەکاریی زۆریشی تیایە .

لە لاپەرەی (٨٣) دا ئەڵێ .
مەحفوظی تۆ،روو لەخودایی،لەدێوو دەد
بۆ حیرزی تۆ دەبێتە زرێ نەسجی عەنکەبوت

لەسەرەتای تیپی دال دا ، غەزەلێکە لەسەرەتادا ئەڵێ «**دڵی سوتا بەحاڵی زاری طیفلی دڵمو چاری‌کرد**» بەڕاستی‌ی مەحوی‌ ئوستادی ئەدەبە. دەك گوڕت پڕ لەنور. لەدواییدا ئەڵێ:

دڵی بێ‌بارە مایەی کارە هەرکەس کاروباری خۆی
لە دونیادا مووەففەق‌بو بەدڵ تەفویضی باری کرد

ئەمەش دەست‌نیشانە بۆ مەقامی تەوککول. هەروەها کە ئەڵێ:

جونونی نەو ظوهورە مەحویا دێوانەگی‌ی مەنصوور
کەدێوانان هەمو مائیل بەبەرد ئەوەمەیلی داری‌کرد
لەگەڵ هەموی جوانی‌ی ووشەکاری‌و تەناسوبی نێوانی مەنصورو

جونون کە موراعاتی نەظیریشی پێ ئەڵێن ، شتەکە بەستراوە بەجیهانی تەصەووفەوە ، وەفەنای صۆفی وای‌کرد لەمەنصور.

هەر پاش ئەم غەزەلە ئەو غەزەلەیە کە ئەڵێ «**چ خەیاڵێکە لیقامی بەفەناچونی جەسەد**». واتە خەیاڵی خاوە تۆ بتەوێ بگەی بەخودا تا دەست لەخۆت هەڵ نەگری واتە ئەبێ لە من‌من وە خۆم‌خۆم دەست هەڵگری چونکە خۆپەرستی لەگەڵ خودا پەرستی‌دا رێك ناکەوێ . «أنانیّەت» وە «ئیثار» لە یەك دەرونا پێکەوە نایان کرێت ، وە ئەمەش خۆی کرۆکی تەصەووفە .

دوبارە باسی داغ‌و جێگە دەمی تێغ ئەکات کە ئەبێ بە دڵەوە بێت واتە شوێنە دەستی مورشیدی کامیل و موکەمیل. ئەڵێ ئەودڵەی بەداغی‌عیشق مۆر نەکرابێ لە دادگای عیشق‌دا ئەی دوڕێنی چونکە بەڵگەیێکی بێ مۆرو ئیمزای پێ‌یە .

پاشان دەست بۆ باسی وەحدەت ئەکێشێ ئەڵێ

غەیری وەحدەت لە وجودا نیە،کەثرەت وەهمە
سادە تیکراری یەکە مەنشەئی ئەوهامی عەدەد

مەبەستی مەحوی ئەوەتە سەرچاوەی وجودی ئەو جیهانە هەر خودا خۆیەتی هەروەکو ئەگەر یەك نەبوایێ هەزار وە میلیاریش نەدەبون ، ئەڵێ سەرچاوەی فەیضی وجود ئەو یەکەتە (أحد)ە وە هەموی لە خۆیەوەیە .

باسی وەحدەتی وجود زۆرکراوە هەر کەسەی بە بارێکا بۆی چوە بەڵام هەر بۆچونە ، نەك ساغ کردنەوەیێك کە هەتاهەتایە پایەدارو تەکان نەخواردو بێت ئەوەی صۆفیەکان خۆیان مەبەستیان بوە لەگوتنیا ، مەگەر خۆیان لێی تێ بگەن ، ئەوەتا کە کەوتوەتە دەمی فەلسەفەو ظاهیر بینانو زانایانی لە تەصەووف بێ هەواڵ، هەزارلق لێ ئەکەنەوە، ئەوەندەیان چڵ و پۆپی دەستهەڵبەست لێ کردوەتەوە ساق و لاسکە ئەصلیەکەیان وون کردوە .

بەراستیی بۆ چاوکرانەوە لە مەبەستی ئیشاراتی شاعیرە صۆفیەکان وەبڕێ لەرموزاتو شەطەحات خوێندنەوەی کتێبی «تَرْجمانُ الأَشْواق» ی شێخ موحی‌ددینی عەرەبی‌ی زۆر سودمەندە چونکە خۆی شەرحی لەسەری شیعری خۆی کردوە .

لەپاشان مەحوی خۆی ، خەمی ئەو باوەرە چەوتانەو ئەو ئەوهامانە ئەیگرێ وەئەترسێ لەوەی خەڵك ئەم باسی وەحدەتی ئەوەش بەوجۆرە وەحدەتی وجودە بزانن خێرا لائەکاتەوە بۆ سەری باسی تەوحیدو ئەڵێ .

مەحویا بابەسی‌بێت شیرکی تەشەبیوث بەمو بەو
بگرە بەس ، دامەنی تەوحیدی (هو الله أحد)

مەحوی ئەیەوێ بڵێت ، هەرچەن سەرچاوەی هەموی وجود تەنها ذاتی خودا خۆیەتی بەڵام ئەوخودایە ، خودایێکە لە هەموان جودایە تاكو تەنهایەو خالیقی ئەوانایە ، نە لەکەس بوەو نەکەسیشی لێ ئەبێت نەکەسیش ئەتوانێ بێتە هاوشانی «لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدْ» (سورەی ئیخلاص) .

لە لاپەرەی (١١٦) دا ئەڵێ .

«**بەردەری مەیکەدەیەو بەس لەوەلا نیمە مەلاذ**». بێگومان مەحوی،یان مەلای جزیری، یان مەولەوی،یان هەمو شێخ و مەلاو خودا ناسی،دژی مەی وە مەیکەدەیە ، کەوابو کاتێ کە لەمبارەوە باسی‌کرد ، دیارە مەبەست شەرابی عیشقی خودایی‌یە ، وە وەرگرتنی بەهرە لە ڕێبەرو مورشید،جا بەراستی‌ی حاڵەتی وا دەست ئەدات بۆ ئەو ڕێبوارانە ، هەر دەقی‌بەدەق لە سەرخۆشی‌ی ئەچێت وە ئەوکەسە هۆشی لە خۆی نیە ، کە بە زمانی ئەهلی سلوك هەر سوکری پی‌ئەڵێن ، وە لە موصطەلەحاتدا باسم کردوە .

لە لاپەرەی (١١٧) دا ئەڵێ .

شوکری هەق،بەردەری هەر فەقرە ئیقامەتگاهم
بەردەرو باری نەسولطانو نەشا نیمە مەلاذ
بەڵکە لەو ڕێیەوە من پەیبەمە عیمرانی بەقا
مەحویا غەیری خەراباتی فەنا نیمە مەلاذ

زوتر باسمان کردوە کە (فەقر) مەقامێکە لە مەقاماتی تەصەووف ، وە مەنزڵێکە لە ڕێگەی گەیشتن بە(فەنا) وە فەنایش مەنزڵێکە لە ڕێگەی گەیشتن بە مەڵبەندی (بەقا) ، هەروەها پێغەمبەر درودی خودای لەسەر ئەفەرمێ ، (**الفَقْرُ فَخْرِی**) جا مەحوی ئاواتی خواستوە کە بیانگاتێ. هەروەها خەرابات کە بەمەیخانە ئەڵێن ، موصطەلەحێکی تەصەووفە لەفارسیدا ، کە مەبەستی تەکیەو بارەگاو خانەقای پیرە .

لەلاپەرەی (١٣٥) دا ئەڵێ .

ببیە لەمن درەختی (منی ی) لەعنەتە بەری
یەعنی بکە لەکیبرو ئەنانیەت ئیحتیراز
هەرکەس تەکەللومی بە (أنا الخیرە) وەك بلیس
ئەمرو سبەی خیطابیە ، یاأیّها البراز)

تۆزێ لەمەوپێش گوتمان ئەنانیەت وە خۆپەرستی ی و تەکەببور لەو پێناسە ناپەسەندانەن کە صۆفی تێئەکۆشێ لەدەرونی خۆیا ڕیشەکەن یان کات ، هەروەها ئاشکرایە شەیتان بەهۆی ئەنانیەتەوە بو کەوتی (أنا خیر منه) واتە من لەئادەم چاکترم بەو بۆنەوە بو لەعنەتی لێکراو لە بەهەشت دەرکرا کەواتە درەختی (منی ی) واتە (ئەنانیەت) لەعنەتە بەری ئەمەرێکی نیە جگە نەفرین مەحوی لەروانگەی صۆفیەتی یەوە ئامۆژگاری ئەکات کە ئەبێ مرۆڤ خۆی لەکیبرو ئەنانیەت دورخاتەوە ، مەبەستم ئەوەتە بڵێم شیعرەکان لە سەرچاوەی تەصەووفەوە هەڵ قوڵیون.

لە لاپەرەی «٢٠٣» دا ، ئەڵێ .

بەبێ یارێ مەچۆرە مەعرەکەی ئەسفەندیاری نەفس
کە لەم مەیدانەدا هەر پیرەزالە ڕۆستەمی بێزاڵ

مەبەستی ئەوەتە بەبێ ڕەهنومایی‌و یارمەتی مورشید مرۆڤ خۆی تەنها ناتوانێ بڕواتە مەیدانی پاك كردنەوەی «**نەفس**» ، لە بەشی تەزكی‌یەی نەفس‌دا لە بەشی لەطائف‌دا لەباسی نەقشبەندی دا گوتمان پاك كردنەوەی نەفس لە هەموی لەطائفەكانی تر سەخت‌ترە ، جا لێرەدا مەحوی دەست بۆ ئەو مەبەستە ڕائەكێشی‌و ئەڵێ : پاككردنەوەی نەفس لەپێناسی ناپەسەند،هەروا بەگاڵتە ناكرێت وە ئەوەی یارو یامەتی‌دەری نەبێت ئەم‌كارەی بە تەنهایی بۆناكرێ ، وە بەبێ شارەزا ئەم ڕێگایەی بۆ نابڕرێت .

جا لێرەدا باسی شەری ڕۆستەم لەگەڵی ئەسفەندیاری پاڵەواندا كە ئەگەر زاڵ یارمەتی ڕۆستەمی نەدایێ دەرەقەتی ئەسفەندیار نەئەهات ، شیرین‌كاری‌و موراعاتی نەظیرو موناسەباتێكی جوانی شیعریشە كە لە چوارچێوەی كارەكەی من بەدەرە ، بەڵام بۆئێرە زۆر بەجێ‌و جوانە .

لە لاپەرەی «٢٠٨» دا ئەڵێ .

ڕێگەی هودا طەریقەتی عیشقە دە (**مەحویا**)
وەرن‌و پیابڕۆن و (**صَلّوا علی الرسول**)
هەر ئەم طەریقە بوو،بە هەموو صەحبی گرتیان
ڕۆیین پیا هەتا گەینە مەرتەبەی وصوول

بە ئاشكرا ئەڵێ
ئەم‌ڕێگەی تەصەووفە كە بە
ڕێگەی عیشق بەناوبانگە :

سەرچاوەكەی لە پێغەمبەرو یارانی‌یەوە هاتوە ، وە ئەوان لەم ڕێبازەوە گەیشتونەتە مراز . ئێوەش ئەگەر ئەتانەوێ بگەنە مراز ئەبێ ئەم ڕێگەی عیشقە بگرنەبەر : وە لەو ڕێبازی ئەوانەوە بڕۆن .

لە لاپەرەی «**٢٢٥**»دا ئەڵێ .

دەزانم بادی‌یەی عیشقە خەتەرناك ،
كەچی هەرچوم ئەگەر مام‌و ئەگەر چوم

تۆزێ لەمەوپێش گوتی ئەوەی بیەوێ بگاتە مراز ئەبێ ڕێگەی عیشق بگرێتەبەر ، سەرلەنوێ ئەڵێ وانەزانن ئەم ڕێگای عیشقە زۆر سوك و ئاسانە بەڵکو خەتەرناکە ، زوتریش هەرگوتی وەکو ئەوە وایە بڕۆیتە شەری ئەسفەندیاری پاڵەوان ، ئیستە ئەڵێ مادام ڕێگەی ڕزگاری و بەمراز گەیشتن هەر تەنها ئەم ڕێگایە بێت ، وامنیش دەست لەدەست و قەوەت لەخودا ڕۆیشتم ، باوەکو پڕ لە مەترسی یەو ، وەکو ئەڵێن لەمو باریکترو لە ئەڵیاس تیژترە ، بەڵام مادام ڕێگەی ڕاستە ، وا ڕۆیشتم .

لەلاپەرەی «٢٢٩»دا ، ئەڵێ :

لە حەفتا ئی پەرِیمو حەفتەیێك بۆدین و بۆدنیا
بە کاری خۆم و کاری کەس نەهاتم ، وەی چ بێکارەم
چ خۆش وەقتی بو ئەو وەقتەم لەگۆشەی بێکەسی دا بوم .
وەکو هایم لە دەشتی ناکەسیدا ئیستە ئاوارەم
نەشەیتان و نەدەوران و نەخزمانم بەمن ناکەن
ئەوەی نەفسی خەسیسم **(مەحویا) کردوویە دەربارەم**

**مەحوی سکاڵا لە دەستی نامورادی و بێکەڵکی خۆی ئەکات ، ئەمەش لە چ تەمەنێکا ؟ لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا ، وە لە کاتگای دڵەوە پێی دێت ،کە،لە نەبەردی نێوانی خۆی و نەفسی دا شکستی خواردوە بێگومان پێ هاتن بە کەم وکوری و بە هەڵەدا خۆی گەورەترین پیاوەتی یە ، وە لەدەستی هەمو مەردێك نایێت ، مەحوی سەبارەت بەم نامورادی خۆیە ، ئاوات بۆ ڕۆژگاری لاوی و بەر لەوەی بیێتە صۆفی ئەخوازێ ، چونکە ئەوەی مورشیدی نەبو بێکەسەو . ئەوەش دەستەو داوێنی مورشیدبو ئیتر کەس دارە ، جا ئاوات بۆ ڕۆژگاری بێ کەسیەکەی ئەخوازێ ، ئەڵێ ئەوسا بیانوم بێکەسی بو بەڵام ئیستە ئیتر گوناهی خۆمە کە نەم توانی بەسەری نەفسا زاڵ بم جا وادیارە زۆر گلەیشی لە خزمانی بوەو هەروا ، لەدەوران ، بەڵام ئاواتی گەورە بەشی نەفسی خۆیەتی ، بەڵێ «إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ» سورەی «یوسف» .**

مەبەستی ئێمە ئەوەتە ، شیعرەکان هەموی دەست نیشانە بۆ یاساو ڕەوشی صۆفی گەری .

لە لاپەرەی «٢٣٤»دا ئەڵێ .

دەرسی عیشقم هەرلەکن پەروانە یا بولبولێ بوە
بێ‌گەمێ یا نەی‌گەمێ هەر مەشقی ئوستادیێ دەکەم
کوشتنی ئەسفەندیاری نەفسە بەستەی رای‌پیر
گەر مەدەدکا یا نەکا لەوشاهە ئیمدادیێ دەکەم

عیشق‌و بولبول‌و پەروانەو ئوستادو نەفس‌و پیرو ئیمدادو مەدەدو شاو ، هەموی ئەمانە موصطەلەحاتی تەصەووفە ، سەرەرای ئەوە لێرەشا هەر هاواری لەدەستی ئەسفەندیاری نەفسە ، وە بەئاشکرا داوا لەپیرەکەی ئەکات ئەڵێ من خۆم ئەم نەفسەم بۆ چار ناکرێت وە ئەبێ تۆ یارمەتیم بدەیت ، وە بەناوی «**شاوە**» لە مورشیدەکەی ناو ئەبات ، ئەوە، هەم پیشان‌دەری بەرزیی پایەی مورشیدەکەیەتی ، وە هەم ئیخلاصی خۆی بۆ ئەومورشیدە .

هەر لەم بارەوە لە لاپەرەی «**٢٤٤**» دا ، ئەڵێ .

ئەم خەڵقە کە وا تێ‌گەییون گەیونە مەقصود
ریشگاوێکی مەحضە بەدەردی من‌وتۆ چون
بۆ جیلوەیی بێ‌چونی ، نیە قووەتی چونم
«**لاحَوْلَ وَلاقُوَّةَ**» ، کەمن حەولە بۆچون
بێ‌چونە عەدەم ، پەی بەسوراغی دەمی نابەی
فائز بیە بەم‌گەوهەرە ، لەوبەحرە ، بە رۆ چوون.

ئەڵێ : من هێزی رۆیشتن‌و رێگابرینم تیانیە بەورادەیەی کە بتوانم خۆم بگەیێنمە تیشکی بێ‌وێنەی هەق ، لەگەڵ ئەوەشا من هەوڵی خۆم ئەدەم وەئەوەی خوا نەیویست سەر ناگرێت .

هەمیسان بەخۆی ئەڵێت تا خۆت تیا نەبەیت وە نەفست فەنا نەبێت ناگەیتە ئاواتی ئاوی ژیانی ئەودەمە ، ئەگەر ئەتەوێ ئەومرواری‌و گەوهەرەت دەست کەوێت ئەبێ خۆت نوقم کەیت لە دەریای هەستی‌ی دا .

شیعرەکانی تری ئەم قەصیدەیە ئەوانیش هەر ئیشاراتی تەصەووفەو موصطەلەحاتی صوفیەتی‌یە ، وەکو فەنا، زاهید، صۆفی .

له لاپەرەی (٢٦٢) دا ستایشی ئەدەبکردن ئەکات وە ئەڵێ .

خودا بیدا ئەدەب «حِرْزُ الأمان» ێکە عەطی‌یەی رەب
چبو جەرگی بری غەیری ئەمەی نامەی دڕبی خوسرەو

ئەدەب سەرمەشقی تەصەووفە وە زۆرباسیان لێوەکردوە له لاپەرەی «٢٧٢»دا ووشەی سیاچەردەی بەکار هێناوە ، کە ئەبێتە رەش‌تاڵە ، ئەم ووشەیە لەپێشا حافظ ، پاشی ئەو مەلای جزیری ، وە ئیستەش مەحوی بەکاری هێناوە ، وە ئەڵێ .

ئەگەرچی من‌گەدام ئەو شا لەعورفی عیشقدا مەحوی
بەسە نیسبەت لەبەینا من سیابەخت ئەو سیاچەردە

له لاپەرەی «٢٨٤»دا ئەڵێ .

بەسەر دڵ‌دا له قاپی فەیضەوە دێ نەشئە پەی دەر پەی
چ غەمزەی دیدە مەخمورێکە ئەم‌شەو کون‌ئەکا سینە

ئیشارەیە بۆئەوەی ئەوشەوە مورشیدەکەی روی دڵی تێ‌کردوەو له فەیضو بەرەکەتی بەرخوردار بوە .

له لاپەرەی «٢٨٧» تەوە تا «٢٩٠» قەصیدەێکە هەموی تەصەووفە ، بەم شیعرە دەست پێ‌ئەکات .

دەوای ئەم نەفسە مەلعونەت ئەوێ هەردەردە وەك جیوە .
کە هلی کوشتن ئەو رۆحی مەحض ئەم جەوهەری زیوە .

جارێکی‌تر ، هەرسکاڵایە بەدەستی نەفسی نەکوژراوو چارنەکراوەوە ، ئەڵێ نەفس وەك جیوە وایە تا نەکوژرێ خێر ناداتەوە ، بەڵام کەکوژرا یەك‌پارچە ژیانە واتە رۆحێکی نایابو پاکە .

لەباقی شیعرەکانی‌ترا ناوی مەقاماتو حاڵو طەورو ، روحو جارێکی‌تر دێوی‌نەفس . وە هی‌تر ئەبات ، هەموی ئیشاراتو موصطەلەحاتی تەصەووفە . هەمیسان له لاپەرەی «٢٩١» دا ئەڵێ .

ئەمینی ، شێتیە (مەحوی) لەمەکری نەفسی ئەمارە
مەگەر ڕەحمی خوا دەمبەستی کا ئەم مارە ئەنگێوە

لە لاپەرەی (٣١٧) دا ئەڵێ .

کێوی غەم وادی جەفا طەیکردنە ، ئەشراطی عیشق
باکی هەورازو نشێوت کەیدەبی گەر ڕەهرەوی

پاش چەن دێری ئەڵێ .

باسی چبکەم ، بێکەرانە ، بەحری پڕتەشویری عیشق
تاقە قەترێکی فتوحاتە نمێکە مەثنەوی

ئەڵێ ئەگەر ڕاست تۆ ڕێ ڕەوی ڕێبازی عیشق ، واتە سالیکی ڕێبازی تەصەووفی ، نابێ خەمی دەردی سەرت هەبێت چونکە گەنجی گەیشتن بەخوداو بە باوەڕی «عین الیقین» هەروا ئاسانو بێرەنج دەست نادات .

جا ئەڵێ ئەم دەریای تەصەووفە دەریاییکی ئاڵۆزو بێکەنارە ئەوەتا بۆنمونە ، کتێبی «**فتوحات المكية**» ی «**شيخ محی الدين العربي**» نەیتوانیوە باسی دڵۆپێ لەو دەریایە بکات ، یان دیوانی مەثنەوی جەلالەدینی ڕۆمی نمێکە لەو دەریا ، ئەم دوکتێبە هەم دوورودرێژترین وە هەم سەختو پڕ ئیشارەو ڕەمزو کینایە ترینی کتێبی تەصەووفن ، محی الدين لە «٦٣٨» ك دا وە جەلالەدین لە (٦٠٤) ك دا ، لەدنیادەرچون ، باقی قەصیدەکە هەموی ڕموزو موصطەلەحاتو مەفهومی تەصەووفە .

لەلاپەرەی (٣٤٣) دا جارێکیتر هەر سکاڵای بەمراز نەگەیشتن دەکاتو ئەڵێ .

هەر گفتوگۆمە کەچی هەر دەڵێمو تێ ناگەم
هەر جوستوجۆمە کەچی هەر دەڕۆمو پێناگەم
چاوم ڕواوو گوشەیی ئەو ئەبر وەم نەدی
دڵ بو بە بەحری عولومو لە ئەلفوبێ ناگەم

لێرەدا ئەوە ئەگەیێنێ لە دانشی ظاهیریو شەرعیدا بوە بە بەحر بەلام لەدانشی مەعنەوییدا هێشتا لە ئەلفو بێ کەی نەگەیشتوە ، چونکە ئەم شەیدای موشاهەدەو

چاوپێ کەوتنە ، ئەوەتە ئەڵێ ئەو ئەبرۆمە نەدی ئەم خوازیاری «عين اليقين» بوە ، کە دەستی نەداوە ، بۆی .

لە لاپەرەی (٣٦١) دا ئەڵێ .

بکە سەیری فتوحات ، ئەر گەرەکتە تۆ فتوحی رۆح
کتێبی دڵ موتاڵا کردنە ، بروانە (مەکتوبات)

تۆزێ لەمەوپێش باسی کتێبی فتوحاتمان کرد ، کتێبی مەکتوباتی ئیمامی رەببانی ، ئەویش سێ بەرگە ، گرنگ ترین وە سەخت ترین کتێبی تەصەووفە ، لە رێبازی نەقشبەندیدا لام وایە ئەوەی بتوانێ بە تەواوی لە مەکتوبات بگات لەم پەرو ئەوپەری تەصەووف حاڵی بوە ، بەتایبەت لە رێبازی نەقشبەندییەکاندا .

خاوەنی ئەم کتێبە ئیمامی رەببانی شێخ ئەحمەدی موجەددیدە ، کە لەساڵی «١٠٣٤» ك دا لەدنیا دەرچوە .

بێگومان ئەمانەش هەر تەصەووفن .
لە لاپەرەی «٣٩٨»دا بەباشی ی باسی شێوەی گرتنەبەری رێبازی نەقشبەندی پیشان ئەداو ئەڵێ .

ئیخلاص ئەگەر بێ (فیها) گەرنەبێ دەبێ
کەسێ بکەی بەتەزکییەی ئەخلاق و نەفسی دون
وابەستەیە بەصوحبەتی کامیل ترێ لە خۆت
ذیکری دەوام و تابیعی سوننەی سەنییە بون
هەر ئەم خیصالەیە کە صەحابی کیرامی پێ
فائیز بەمەرتەبەی (رضي الله)وو (رضوا)ن
هەر بەم طەریقە پێ گەییون گەبونە خودا
ئەو ذاتە عاریفانە کەداناوو تێ گەیوون
روو کەینە ئەم طەریقە بە ئازانە مەش برا
تا کەی ئەسیری مەغلەطەی ئەفسانەوو فسون
رێگەی سەعادەتی ئەبەدیی تۆ لەسەر منە
بیدەم نیشان و دام ، لەسەرتۆ بەرێوە چون

تا ئاخری قەصیدەکە دڵگەرم کردنو ورە ئانە بەرە بۆ گرتنەبەری ڕێبازی تەصەووف لەسەری ڕێڕەوی نەقشبەندی‌یەکان ، شیعرەکان ئەوەندە رونن پێویست‌یان بە تویژینەوە نیە ، گرنگتریِن شت ئەوەتە ئەڵێ ، ئیخلاص ، تەزکی‌یەی نەفس . بونی مورشیدی کامیل ، وە بەردەوامبون لەسەری ذیکر ، ئەمانە مەرجن بۆ گەیشتن بەمراز .

لە لاپەرەی (٤٦١) بەولاوە تا (٤٦٧) مەدحی حەزرەتی مەولانا خالیدە کەئەویش باسی پێ‌ناوێت کە تەصەووفە .

بەم جۆرە سەیر ئەکەین مەحوی یەکێکە لە گەورە پیاوانی مەیدانی شیعری تەصەووفی کوردی ، هەروەها زۆریش روونە ئەوەی لەتەصەووف وموصطەلەحاتی شارەزا نەبێت ، ناتوانێ لەم گەنجینە گەورەیە تێبگات ، بەڵام لاموایە ، پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبەی بەردەست‌تان زۆرێك لە مەبەستەکانی ئەم دیوانەو کتێب‌و دیوانەکانی‌تری تەصەووف تێبگەن .

Ω

حەزرەتی شێخ عومەری بیارە کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدینە، ئەم ذاتە گەورەیە هەرچەن لە زەمانی باوکیا، هەروەکو شێخ بەهائەدین، برای باوکودایکی ی، شێخ عومەر. لە ئیجازە نامەکەی شێخ عومەردا نوسیویەتی، گەیشتوەتە پایەی ئیرشادی موطلەق، واتە بەقای پاش فەنا، لەگەڵ ئەوەشا پاش فەوتی باوکی. هەر پەیوەندی بچوکایەتی لەخزمەتی کاکیا نەبڕیوە، تا ئەو کاتەی کە حەزرەتی بەهائەدینیش ئیجازەی ئیرشادی داوە، وە لەدێی بیارەدا دەستی کردوەتە ئیرشاد، هەروا کە جەنابی مامۆستا مەلا کەریم لەهەمو تەئلیفێك دا کە باسی شێخ عومەر هاتبێتە پێشەوە، باسی کردوە. وە هەروەها کە شێخ موحەممەد ئەمین کوردیی، لە کتێبی «**المواهب السرمدیه**» دا نوسیویەتی، وە خۆی موریدی شێخ عومەر بوە، پاشان چوەتە قاهیرە وە لە ئەزهەرا بوەتە ئوستاد، وە طەریقەی نەقشبەندیی لە میصرا بڵاو کردوەتەوە. وە هەروەها کە مەلا حامیدی بێسارانی لەکتێبی «**ریاض المشتاقین**» وە مەلا مەحمودی باکی لەکتێبی «**نورالناظرین في مناقب ضیاء الدین**» دا نوسیویانە، هەرچەن هەرچوار کوڕەکەی حەزرەتی سیراجەدین، هەمو شابازی ڕێگەی تەریقەت بون. وە هەرچوار، واتە، شێخ موحەممەد بەهائەدین، حاجی شێخ عەبدولرەحمان «**وەفا**»، شێخ عومەر ضیائەدین، وە حاجی شێخ ئەحمەد، کامیل وە موکەممیل بون، وە هەرچەن حاجی شێخ عەبدولرەحمان دەسەڵاتی مەعنەوی لەرادە بەدەر بوە، لەگەڵی ئەوەشا حەزرەتی ضیائەدین، گوڵی سەرتەڵی هەمویانە، چونکە لە هەمویان زیاتر خزمەتی کردوە بەعولومی ئیسلامی وە تەریقەی نەقشبەندی.

هەرچەن ئەم شێخانی نەقشبەندی‌یە، لەناوی توێژەکانی مەردومدا، بەرلەهەموان، پەیوەندی ڕۆحی و ئیخلاصی ڕاستەقینەیان لەتەکی عولەمادا، لەپاشان لەتەکی هەژاراندا، پاشان لە تەکی چینەکانی تری خەڵکا بوە، بەڵام هیچکام لەو مەشایخانە بەشێوەیێکی ڕەسمی ی مەدرەسەیان دانەناوە کە لەسەری ئەرکی خۆیان مودەرریسی بۆ بێرن وە تا ئەوڕادەیە پەرەی بدەنێ بەو جۆرەی کە ضیائەددین

کردویەتی ، بەڵێ هەمویان خاوەن خانەقا بون وە خانەقاکانیان پڕی بوە لە مەلاچاك ، وە کورەکانی خۆیانو خەڵکی تریش دەرسیان بەلایانەوە خوێندوە ، بەلاّم حاڵەتی مەدرەسەیێکی سەربەخۆی نەبوە ،....تا ، زەمانی شێخی ضیائەدین ، جا ئەوذاتە بینای مەدرەسەی دروس کردوەو مودەررِیسی تایبەتی بۆهانیوە ، کە بریتی بێت لە مەلاقادری بیارە ، بەناوبانگ بە مەلای گەورە ، وە بۆئەوەی پیشانی بدات چۆن ئەبێ ریز بگیرێت لەعولەما ، کچی خۆیشی داوەتێ وە کردویە بە زاوای خۆی وە صەدان تەلەبەی خستوەتە بەردەستی ، یەکێکی تر ، لەکارە گرنگەکانی شێخ عومەر دروس کردنی نانەوەخانەی تایبەت بوە لەناوی خانەقادا ، کە شەوو رۆژ نانی تیا کراوەو بەخۆرایی دراوە بەخەڵك وەزۆر جار خۆی بەدەستی خۆی لەو فرنەدا نانی کردوەو فەقێو مەلاو صۆفیو هەژارانی ئەوناوە بردویانە .

وەکو شارەزایان ئاگادارن ئەوەی ئەو دەمە بۆخەڵك زۆر گرنگ بوە وە تاوەکو ئەم دوایی یەش ئێمە لەیادمانە ، گرنگترین ئاواتی هەر خێزانێك ئەوەبو کە «**ژەمەن**»ی هەبێت واتە ، بەشی تانوخشەی بەهار ، دەغڵ لەماڵیا هەبێت ئیتر پێخۆر هەبو باشەو ، نەبو ، نەبو ، سکالاّو ورکە هەرهی ژەمەنبو .

جا ، بۆ فەقێ ، گرنگ ترین شت ئەوەبو شوێنی نوستنی هەبێت کە بریتیبو لە مزگەوت یان حوجرەی فەقێ .

مامۆستاییك بیگرێتە خۆی کە دەرسی پێ بڵێت . خەڵکی گوندەکە برۆنە ژێری باری دابین کردنی ، نان ، ئەمەش بەوجۆرەبو ئێواران فەقێ ، ماڵەو ماڵ ئەگەرا «**راتو**» یان «**راتبە**» ی ئەکرد وە هەرماڵەی نانێکیان ئەدا ، یان زیاتر . کەواتە ئەر دێکە گەورە بوایە فەقێی زۆوتر ئەیانتوانی بمێننەوە بچوکیشی بوایێ واکەمتر . بە ئەندازەی نانەکان .

ئیتر پێ خۆر مەگەر بەدەگمەن دەستی بدایێ . کەواتە شوێنی نوستن ، مەلا بۆ دەرس گوتنەوە ، دابین بونی نان ، ئەمانە گرنگ ترین شتێبون کە بۆ خوێندنی فەقێکان پێویستبو .

مەبەستم لەم روون کردنەوە ، بۆ بەراوردی گرنگیی خزمەتی شێخ عومەربو بە عیلم وە عولەما ، شێخ عومەر هەروەکو گوتمان بەناوبانگترین مەلای ئەو دەورو بەرەی هانی ئەویەری ریزی لێگرت ژیانی دابین کرد نانەوە خانەیێکیشی دانا هەرکەس تا ئارەزوی لێیە بەخۆرایی کولێرە ببات ، هەرچەن خانەقاییکی گەورەیشی دروس کردبو بەلاّم بۆئەوەی فەقێکان بەئارامیو بەئاسایش سەرگەرمی خوێندن بن

پێنج شەش ژوری گەورەی بۆ فەقێکان دروس کردبو جگە ژوری تایبەتی مودەرریس بۆ دەرس گوتنەوە.

ئەمە جگە رازاندنەوەی کتێب خانە یێکی نایابو دەوڵەمەندو پڕ لە کتێبی باش. جا، لێکی دەرەوە بزانە ئاوا کارێ لەو کاتو سەر دەمەدا چ خزمەتێکی گەورە بوە بەزانیاریی، بێگومان بەئەندازەی دانشگەیێکی ئەم رۆژگارە خذمەتی کردوە.

هەر لەبەری ئەم خزمەتە گەورەتە کە لە زەمانی شێخ عومەر بەملاوە، کەمتر بنەماڵەی ئایینیی لە کوردەواریدا هەیە، پرشنگێکی خوێنەواریی «بیارە» ی بەر نەکەوتبی، سا یان راستەوخۆ لە بیارە خوێندویەتی، یان لای مەلایێك خوێندویەتی کە لە بیارە تەواوی کردوە، یان لای فەقێی ئەو مەلایانە.

ئەم خزمەت بەعولەماو گەرم بونی مەدرەسەیە هەم لەزەمانی شێخ نەجمەدینی کوڕی شێخ عومەر، وە هەم لە زەمانی شێخ عەلائەدینی کوڕی شێخ عومەردا، هەر بەردەوام بو، واتە تا سالی «١٩٥٤» ی، ز، وە وەزعی نانەوا خانەکەش، لە زەمانی باوکما کە من ئەمدی، گەرمتر نەبویێ کزتر نەبو، وە هەژاران، تەنانەت خەڵکی تری ناوی دێ هەرکەس ئارەزوی لێ بوایێ ئەهاتو کولێرەی خۆرایی وەر ئەگرت.

وە لە زەمانی شێخ عەلائەدینا، پاش فەوتی مەلا قادری بیارە لەساڵی «١٣٣٧» دا، کە ساڵێك لەپاشی فەوتی شێخ نەجمەدین بوە. شێخ عەلائەدین مودەریسی هەڵکەوتوی دڵخۆش کردون وە هاوردونیەتە بیارە بۆ تەدریس لەپێشا مەرحومی شێخ مەلا طاهای بالیسان کە عالمێکی بەناوبانگ بوە، پاشان جەنابی ماموستا مەلا کەریم، خودا دەس بگرێت بە تەمەنیەوە، پاشان جەنابی ماموستا شێخ موحەممەدی کوڕی شێخ مەلاطاهای بالیسانی، لەبیارەدا تەدریسیان کردوە.

---

بێگومان من مەبەستم نوسینی مێژو نیە، بەڵکو چونکە لە شیعرەکانی شێخ عومەر، بەناوی شیعری مورشیدێکی زۆر پایەبەرز، ناو ئەبەین، پێویست بو ئەو ذاتە بناسرێت، تاوەکو باشتر بایی شیعرەکانی بزانین، هەروەها هەر بۆ ئەو ناسینەو بۆ سەردەرکردنی ئیوە لە ئیجازەی ئیرشادی موطلەق، وە دانانی مورشید بەوەدا، کە ئەو ئیجازە دراوەئەگەیشتوەتە مەقامی بەقای پاش فەنا، لێرەدا ئەو ئیجازە نامەیەی کە بە شێخ عومەر دراوە، ئەویش چاپ ئەکەمو ئەیگۆڕمە سەری کوردیی، هەر وەکو

له بەشی نەقشبەندی‌یەکەدا زنجیرەی ئیجازەکانم چاپ کردوە، تا دەرکەوێ چۆن ئەم تەریقەتە دەس بەدەس هاتوە تا ئاخرمورشید، شێخ عومەر ضیائەدین له سالی (۱۳۱۸) ك دا له بیارەدا له دنیا دەرچوە وە له نزیکی خانەقاو مەدرەسەکەدا دەفن کراوە.

شێخ نەجمەدینی کوری «۱۲۸۰- ۱۳۳۷» ك وە شێخ عەلائەدینی کوری «۱۲۸۰-۱۳۷۳» ك لەم لاو لەولایەوە بە خاك سپێرراون. ئەم دوو کورەی شێخ‌عومەر هەردوکیان خاوەنی ئیجازەی ئیرشادی موطلەق‌بون لەلاینی باوکیانەوە. حەزرەتی ضیائەدین مەشهورە بەوەی، کە گەورەترین پیاوی تەصەووفی رۆژگاری خۆی بوە وە بەناوی موجەددیدی صەدەی چواردەهەمی کۆچی ناوبراوە.

ئەمذاتە بە کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی شیعری هەیە وە لەنوسینی پەخشانی فارسیدا بێ وێنەبوە، مەلامەحمودی باکی‌ی شیعرو نامەکانی کۆکردوەتەوە وە لە کتێبێکا بەناوی «**نورالناظرین**» کە دەستخەتەو فارسی‌یە، نوسیویەتی، جەنابی مامۆستا مەلا کەریمیش برێ لەوانەو برێکی‌تر لە شوێنەوارەکانی شێخ عومەری لە یادی مەردانی دوو دا، لەچاپ داوە، بەلأم هێشتا بەوجۆرەی کە بشێ نوسراوەکانی شێخ‌عومەر کۆنەکراونەتەوە.

زۆربەی شیعرەکانی شێخ عومەر تەصەووفن، بەتایبەت چەند قەصیدەیێکی کە عەرەبی‌یە، شارەزای تەصەووف وە زمانی عەرەبی ئەوێت تا لی‌یان تێ‌بگات، سەرەتای یەکێ لەقەصیدە عەرەبی‌یەکانی بەم جۆرە دەست پێ ئەکات.

قَدْلاحَ لِيَ الآنَ مِنَ اللَّوْحِ كتابي
مافَصَّلَ لي كُلَّ كِتابٍ وَخطابٍ

لەسەرەتای قەصیدەیێکی ترا ئەڵێ.

وَلَمْ أَرَ في الافاق مأوى خَلا الهوى
ونفسي به رَبَّتْ وفيه تَرَكَّتْ

ئێمە لێرەدا لەشیعری شێخ عومەر بەناوی شیعری مورشیدێکی زۆر بەدەسەلأت ئەکۆڵینەوە، هەرچەن زووتر گوتمان شیعرەکانی جزیری هی گەورە پیاوێکی تەصەووفە، بەلأم هەم شێوەی زمانەکە جیاوازە، هەم جزیری، نە لە شیعرەکانیا،

وەنە لەو نوسینانەدا کە لە بارەیەوە نوسرابون، بەڵگەیێکم نەدی بڵێ کە ئیرشادی کردبێت و خاوەن موریدو خەلیفەو خانەقا بوبێت، بەم جۆرە ئەتوانین بڵێین کامیل بوە بەڵام موکەممیل نەبوە، یان بڵێن لە فەنادا ماوەتەوەو نەچوەتە بەقا. مەگەر بەڵگەیێکی نوێمان دەست کەوێت.

بەڵام ئەوەتا سەبارەت بە شێخ عومەر، هەم بەڵگەی نوسراو وە هەم شایەتی زیندو هەیە بۆئەوەی کە تاقانەی رۆژگاری خۆی بوە، وە هەم شیعرەکانی زۆرباش دەری ئەخەن چ پایە بەرزێ بوە لەتەصەووفدا. وەکو دیمان مورید لەپیری خۆی داوای یارمەتی و بەرەکەت ئەکات وە بەدەستی نەفسی ئەممارەوە گیری کردوە، بەڵام مورشید لە خذمەتی پێغەمبەر وە لەحوزوری خودا داوای بەش ئەکات، یان سوپاسی ئەو بەشەی ئەکات کە وەری گرتوە. مورید لە کەموکوریی و بێدەسەڵاتی ئەدوێ بەڵام مورشید کەمالات لەگوفتاریا ئەدرەوشێتەوە.

بەداخەوە شیعرە کوردییەکانی شێخ عومەر ضیائەدین، کەمن، لەگەڵ ئەوەشا تەنها قەصیدەیێکیان، بەڵکو تەنها شیعرێکیشی بەسە بۆئەوەی بزانرێ چ پایەیێکی بەرزی مەعنەویی هەبوە، هەرچەن ئەوەی گەورە پیاوانی عیلم و تەصەووف سەبارەت بە پایە بەرزیی ئەم ذاتە پێی هاتبن زۆر زیاترە لەوەش کە خۆی فەرمویەتی.

ئەمەش نمونەیێکی شیعری کوردیی شێخ عومەر ضیائەدین.

لە نەشئەی فەیضی عیشقی فەخری عالەم دڵ موصەففایە
عەجەب باڵایە روتبەی عیشقم و نەفسم تەوەللایە

مەقامی عاریفان بێزەحمەت و رەنج و مەشەققەت دیم
لەزومرەی عاشقانم بۆیە عالەم لێم تەبەررایە

لە هەرچی رودەکەم وەك رۆژ عەیانە چی رموزاتە
«لەطائف» سەربەسەر موستەغریقی ذیکری هواللە یە

لە بامی عەرشەوە پەردەی حیجابم لادرا یەك سەر
رموزاتی حەقایق شوعلە بەخشە دڵ تەسەللایە

لە مەیخانەی حەقیقەت بومە ساقی‌ی مەجلیسی ڕەندان
لە حەلقەی دائرەی عوششاق لەبەس جێگەم موعەللایە

کەسێ شوغلی مەحەببەت بێ دەبێ وەصلی بەهەق تەحقیق
صەراحەت پێت دەڵێم خاڵی‌ی لەهەر نوکتەو موعەممایە

لە موژدەی ئەم خەلاتە خوا بەتۆی‌دا موذنیبی ڕوڕەش
دەبێ ڕۆح کەی فیدای شوبباکی ڕەوزەی ئەو شەهەنشایە

لام وایە زۆر بەباشی‌ی دیارە شاعیر چی ئەفەرمێ وە مەقامی چی‌بوە لەگەڵ ئەوەشا من لام وایە کاتێ کە قەصیدەی دوهەمی گوتوە، هەروا ئەو قەصیدە عەرەبی‌یەی کە سەر دێرە کەمان نوسی «**قدلاح لی الان**»، لەو کاتەدا پایەو مەقامی هێشتا لەمەی ئیستەش بەرزتربوە، لەم قەصیدەیەدا پیشان ئەدات گەیشتوەتە بەقای پاش فەنا، ئێمە زوتر گوتمان ئەوەی لەفەنا تێ پەڕی تازە هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆلای خرابە چونکە کانگەی ئەو لارێ گرتنە نەفسەکە نەفس فانی‌ی بو ئیتر ئەو کەسە قوتاربوە جا ئەوەتە شێخ عومەر ئەڵێ:

لەدەس تەزویری نەفس‌و مەکری شەیتانی لەعین دەرچوم، وەئەڵێ لەطائف هەموی سەرگەرمی ذیکری هواللە یە، هەروەها زۆرباش دەری ئەخات کە موراد بوە، بەوەدا کە ئەڵێ مەقامی عاریفان بێ زەحمەت‌و ڕەنج‌و مەشەققەت دیم، ئەڵێ بەڕاستی‌ی ڕوتبەی عیشقم بالایەو ئەڵێ، لەبانی عەرشەوە واتە بە خواستی خودا، پەردەی سەری چاوی بەصیرەتم لابراو هەرچی ڕموزات‌و ئیشاراتە هەمویم لەپێش‌چاو ڕوونە، وە دڵم‌شادو خۆشبەختەو بومەتە ساقی‌ی مەجلیسی ڕەندان ئەو ساقی‌یەی کەزوتر حافظ و هەروەها مەلای جزیری‌و مەولەوی‌و مەحوی و ڕێبوارانی ڕێگەی تەصەووف دەستەو داوێنی ئەبن وە هانای بۆدێرن کە بێ‌بەشیان نەکات. جا ئەم خەلاتە بەنرخ‌و بێ‌دەردی سەر بەدەست هاتوە، بە هی پێغەمبەری ئەزانێ درودی خودای لەسەر وە خۆی ئەکاتە قوربانی مەرقەدەکەی.

بەلام لەم قەصیدەیەدا کە ئیستە ئەینوسم هەموی موصطەلەحەکانی، هی ئەو مەقامانەن کە گەورە پیاوانی تەصەووف لەکاتی بەقادا دەسیان ئەکەوێت، وە هی

سەرقافڵەی سەرقافڵەکانە وە هی ئەوپەری پی‌گەیشتنی تەصەووفە، کە مەگەر کەسانێکی وەکو حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی یان بەهائەدینی نەقشبەند وە ئیمامی ڕەببانی شتی وایان درکاندبێ، کە ئەفەرمێ.

فەقیهی مەدرەسەی تەوحیدم ئەمرۆ
فەریدی دائرەی تەفریدم ئەمرۆ

ڕەزا نابم کە ئەغیار بێنە مەجلیس
کە چەوگانی قەضای تەبعیدم ئەمرۆ

نیە بۆئەو نیشانە تابناسرێ
بەخۆی من دافیعی تەردیدم ئەمرۆ

لە تەنزیها نیە هیچ‌کەس ڕەفیقم
چرای کاروان‌سەرای تەمجیدم ئەمرۆ

چلۆن‌کا حەمدی باقی عەبدی فانی
بەعیصیان ماوەرای تەحمیدم ئەمرۆ

عەلایق دەردی بێ‌دەرمانە (**فەوزی**)
ڕەئیس عەسکەری تەجریدم ئەمرۆ

من لە باسی موصطەلەحاتە کاندا باسی مەقامەکانی تەوحید تەفرید ، تەجرید وە تەنزیهم کردوە وە هەموی ئەم مەقامانە دەس‌کەوتی مەڵبەندی بەقایە . ئەم قەصیدەیە لە گەڵی ئەوەشا کە بەرزیی پایەی مەعنەویی شێخ عومەر ئەگەیێنێ ، وردەکارییێکی زۆر وە تەناسوب لەنێوانی مەبەستەکاندا دەرئەخات .

فەقیە ئەبێ مەدرەسەی هەبێت ئەڵێ فەقیهی مەدرەسەی تەوحیدم ، یان لەزانیاریی تەوحیدا فەقیهم ، هەروەها تاقانەی دائرەی تەفرید ، لێرەدا فەریدو تەفریدی خستوەتە یەك ، ئەوەی کە ئەڵێ چەوگانی دەستی تەقدیرم ، واتە وەکو

گاڵوکێك کە خاوەن گاڵوك خواستەکانی خۆی بەو ئەنجام ئەدات ئەمڕۆ ئەو گاڵوکی دەستی ئەقدیرە ، واتە دەستوری خوادای گەورە لەرێگەی ئەمەوە ئەنجام ئەدرێت .

ئەڵێ نیە بۆ ئەو نیشانە تا بناسرێ ، ئیشارەیە بۆ ئایەتی (**لیس کمثلەشی**) ئەڵێ شتی وانیە بڵێم خودا وەکو ئەوە وایە وە ناسینی عیلم وە ئیستیدلال وە تەقلید هیچکامی ناگاتە (**عین الیقین**) ئەڵێ ئەوەی بیەوێ بەشێوەی عەینول یەقین خوا بناسێت بائێتە لای‌من تا یەقینەکەی بکەمە عەینی‌ی ، وە کارێکی لی‌بێت بەچاوی بەصیرەت وە موکاشەفە شتی وا ببینێ ئیتر تەردیدو گومانی نەمێنێ ، «**بەخۆی من دافیعی تەردیدم ئەمڕۆ**» .

ئەڵێ لەم جیهانەدا لەمەقامی تەنزیهدا کەسم ناگاتێ وە هەروەکو چرا ، کاروانسەرای تەمجیدم ڕوناك کردوە .

ئەڵێ چۆن فانی ئەتوانێ سوپاسی باقی بەجێ بێرێت ، فانی ماوەیێك هەیەو تیائەچێ ، یان ئەتوانین بڵێین ئەو مەقامی فەنای بریبی کەی ئەتوانی حەمدی خودا تەواوکات ، ئەو خودا ، ئەم‌بەندە ، ئەو ئەزەلی‌وئەبەدی ئەم حادیث‌و فانی .

ئەڵێ گوناهو عوصیانیشم ئەوەندە زۆرە تەنانەت ڕوی حەمدو ئەنایشم نیە ، بۆچی ؟ .

چونکە تاوانبار ئەبێ سزا بدرێ ئیستە نەك هەر سزانەدراوە بەڵکو ... خەلاتیش کراوە ، کەواتە چۆن بتوانێ بەوجۆرەی کە بشێ حەمدی ئەوخودا میهرەبانە بکات .

عەلایق ، واتە دڵ بەستنەوە بە دنیاو دەس‌هاتە دنیایی‌یەکانەوە ، ئەڵێ ئەمە دەردێکی بێ‌دەرمانەو کەس ناتوانێ دڵی لە زەرق‌و بەرقی دنیا بپچرێ ، بەلام ئەو لێرەدا خۆش‌حاڵە کە فەرماندەی هەموی ئەوکەسانەتە کەدڵیان لەدنیا بەرداوە .

گوتمان یەکێ لە واتاکانی تەجرید ، خۆش‌ویستنی دەس‌کەوتی دنیایی لە دڵ دەرکردنە ، ئەڵێ من دنیام لەدڵ دەرکردوەو فەرماندەی لەشکەرێکم کە هەموی وەکومن دڵیان لە زەرق‌و بەرقی دنیا بەرداوە ، واتە خۆشەویستی‌ی دنیا نیە لە دڵیانا ئەگەر هەیە سەرزاری‌یە وە دڵیان تەنها جێگەی خۆش‌ویستنی خودایە .

جائەمە سەرەتایێ بو بۆ پیشان‌دانی ئەوەی کە تەصەووف تا چرادەیێك ئەدەبی زمانی کوردیی دەوڵەمەند کردوە .

ئومێدەوارم ئەم بەشە لە ئایندەدا خۆی ببێتە **(مەوضوع)** بۆ خوێنەواران و توێژەرانو روناك بیرەکانمان ، بەشکو بتوانن بەرهەمی گەیشتوترو بەتام‌ترو کامل‌تر پێش‌کەشی ئەدەبی کوردیی‌و فەرهەنگی کوردەواری بکەن .

هەرخۆش‌و سەرکەوتوبن بە خوام سپاردن



---

ئەمەش وێنەی ئەو ئیجازەنامەیە کە شێخ موحەممەد بەهائوددین بۆ شێخ عومەر ضیائوددینی برای نووسیوە :

---

ئەمە وێنەی ئیجازە نامەیێکە کە
شێخ موحەممەد بەهائوددین نوسیویەتی
بۆ شێخ عومەر ضیائوددینی برای .

بسمه سبحانه و تعالی

الحمد لله الذي انزل على عبده الكتاب، وهدى المؤمنين بارسال رسوله الكريم اليهم على طريق الحق والصواب. وصلى الله على سيدنا ومولانا حبيبه وخير خلقه محمد واله وصحبه الذين هم نجوم الهدى لأولى الألباب.

اما بعد، گزارش میرود ازانجا که فقیر بی‌بضاعت، باوجود عجز و تقصیر، حسب الأمر و اجازهء حضرت والد ماجد قدس سره، «مجاز و مأذون مطلق» در طریقهء علیهء نقشبندیه بوده و هستم، به أمر ظاهری و باطنیِ مشایخان کرام و اولیای عظام قدس الله اسرارهم بر سجادهء ارشاد نشسته‌ام. طالبان این نعمت عظمی و غواصان بحر توفیق از عشق این جواهر نفیسهء کبری که وصول به درجهء حق الیقین‌است، دست توسل به‌ذیل این خادم درویشان زده و میزنند، و باهریك به قدر استعداد خود معاملهء ظاهری و باطنی معمول شده و میشود، لاسیما برادر والاگهر، در دریای ارادت، مصباح زجاجهء سعادت، مرکز دائرهء صداقت، کوهء بصیرت، وقوهء بصر، عزیز الوجود خجسته سیر شیخ عمر حفظه الله الملك الاکبر است؛ که در عصر حضرت والد ماجد قدس سره مدت بر سلوك استقامت داشته و تهذیب اخلاق نموده، و استعدادا بر امثال و اقران خود بر مثال تفاوت شمس و سائر کواکب غالب گردیده «و الحمد لله شرف نعمت بقای بعد از فنا یافته» و مراتب و مقامات علیه‌را طی نموده، و به خلعت اجازهء حضرت ایشان و سائر مشایخان قدس سرهم بهره‌یاب گردیده.

علی هذا نظر رأفت و شفقت حضرت پیر در حق وی بمنّه کامل، و نسبت اخوّتش بافقیر به سه جهت حاصل‌است. یکی نسبی، و یکی حسبی، و یکی عهدی. فقیر نیز از کمال ادب‌و ارادت و صدق رضای خاطر عزیزش همواره مسرور

بوده. اگرچه قبول خاطر بزرگان زودتر شده بود، باز هم به نیابت مشایخان کرام قدس الله اسرارهم، محض اتمام داب سعادت ان عزیزرا از قبول نمودن مریدان و تعلیم طالبان و تبلیغ احکام شریعت و طریقت مجاز و مفوض نمودیم که بر وفق شریعت غرّای حضرت سید الانام علیه و علی اله الف صلاة و سلام و اداب طریقت مشایخان قدس الله اسرارهم به تربیت طالبان اوقاترا صرف نماید، و طالبان‌را از خلفا و مرید و محسوب و منسوب از صغار و کبار و ادنی و اعلی نیز وظیفهء عین‌است که حسن ادب و اطاعت اوامر و نواهی و قبول نصایح مشفقانه ان عزیزرا آویزهء گوش هوش داشته صحبت و شرف خدمتش غنیمت وقت خود شمرند، و از عجز ور نجش خاطرش بپرهیزند، چنانچه از زهر قاتل بپرهیزند، که رد و قبولش رد وقبول حقیر و حضرت پیر دستگیر و سائر مشایخ عظام و اولیای کرام‌است.

ز یك شاخیم اگر شیرین اگر تلخ

ز یك بزمیم اگر هشیار اگرمست

**(ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء، والله ذو الفضل العظيم. اللهم اجعله للمتقين اماما، ولاحول ولاقوة الا بالله العلي العظيم. وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه اجمعين. واخر دعوانا ان الحمد لله رب العاملين.)**

٥ ذی القعده ١٢٩٤ هـ

(جێگەی مۆری)

محمد العثمانی النقشبندي

فقیر در درون دل شیخ عمر سلمه الله در دنیا وعقبی قبول نمودم، بل در میان جان جای داده‌ایم. همین نوشته سنداست. حق سبحانه وتعالی قبول فرماید.

(ئیمزای)

محمد العثمانی

مەبەستی من لێرەدا دەست نیشانە بۆ ئەو مەقامی بەقای پاشی فەنایە، کە ئەو کەسەی نەیگاتێ ناتوانێ مورشیدی کامیل وە موکەممیل بێت.



**(بسمه سبحانه وتعالى)**

الحمد لله الذي انزل على عبده الكتاب وهدى المومنين بارسال رسوله الكريم اليهم على طريق الحق والصواب ، وصلى الله على سيدنا ومولانا حبيبه وخير خلقه محمد واله وصحبه الذين هم نجوم الهدى لاولى الالباب .

لەپاشان شایانی گوتنە بەهۆی ئەوەوە منی هەژارو بی‌سەرمایە ، سەرەرای هەمو ناتەوانییکم ، بەپێی ئەمری باوکی بەرێزم ، پایەی بەرزتر بێت ، لە رێبازی نەقشبەندی دا روخصەت و ئیجازە دراوم ، وە بە فەرمانی ئاشکراو نهێنی مەشایخانی پایەبەرز و ئەولیای گەورە پایەیان بەرزتربێت ، بە سەری سەججادەی ئیرشادەوە دانیشتوم ، خوازیارانی ئەو نیعمەتە گەورەیە ، وە مەلەوانانی دەریای سەرکەوتن ، لە خۆشی‌ی بەدەست هێنانی ئەو گەوهەرە گرانبەهایەدا ، کە بریتی‌یە لە گەیشتن بە پایەی «**حق الیقین**» ، دەستەو داوێنی ئەم خذمەت گوزاری دەرویشانە بوون وە ئەبن ، وە لەتەکی هەرکام لەواندا بەپێی ئیستیعدادی خۆیان مامەڵەی دەرو ذەرونی‌یان لەگەڵا کراوەو ئەکرێت ، بەتایبەت برای زۆر بەنرخ دوڕری دەریای ئیرادەت ، تیشکی چل‌چرای سەعادەت ، ناوەندی جەغزی ڕاستگۆیی ، دەلاقەی بەصیرەت وە نوری‌چاوان بەرێزو پاك‌رەوش (**شیخ عومەر**) ، خوای گەورە بی‌پارێزێت ، کە لەرۆژگاری باوکی سەروەرماندا ، ماوەیێکی دورو درێژ سەرگەرمی ری گرتنەبەر ، وە پەروەردەکردنی رەوشی خۆی‌بوە ، وە ئیستیعدادی ، بەپێی هاوەڵانی خۆی ، وەکو ماوە‌لەنێوانی هەتاوو ئەستێرەکانی ترا ئاوا بوە ، ئەوەندە ئامادەیی ئەم بالآتر بوە ، وە (**سوپاس بۆخوا سەربەرزبوە ، بە نیعمەتی بەقای پاشی فەنا**) ، وە مەقامە بەرزەکانی بریوە ، وە بەخەلاتی ئیجازەی باوکمان وە باقی‌ی مەشایخان بەهرەمەند بوە .

لەبەرئەمە ، سوپاس بۆخوا ، حەزرەتی پیر دەزبارەی ئەو نەزەری رەحم‌و شەفەقەتی هەبوە ، وە پەیوەندی لە تەکی منیشا لە سێ لاوە هەیە؛یەکێکی هی بنەماڵەیی‌و خانەوادەیی ، دوهەمی لەبارەی رەوش‌و ئەخلاقەوە ، سێهەمی پەیمانی تەریقەت ، «**کە هەردوکیان موریدی ، شیخ عوسمانی باوکیان بون**» ، هەرچەن هەروەکو گوتم ، گەورەپیاوانی تەریقەت قوبوڵیان کردوە لەگەڵ ئەوەشا ، بە نوێنەرایەتی‌ی مەشایخانی سەروەر خوا پایەیان بەرزترکات ، بۆ بتەو کردنەوەیێکی زیاتری دڵی خۆش‌بەختی‌ی ، منیش ئەو عەزیزەم ئیجازەدا ، کە مورید «خوازیار» پەروەردە

کات ، وه ویستیاران لەم ڕێبازەوە بگەیێنێتە مراز . وه لە ڕاگەیاندنی دەستوری شەریعەت وە تەریقەتدا سەربەخۆیە ، وە خۆی ئەتوانێ بەپێی شەریعەتی سەروەری هەمولایی ، هەزارسلاوی لەسەربێت ، وە بەپێی دابی ڕێبازی مەشایخان ، خوا پایە بەرزتریان کات ، خوازیاران پێ بگەیێنێ وە سەرگەرمی پەروەردە کردنیان بێت .

لەسەری هەموی خوازیاران ، چ خەلیفەکان وە چ موریدو مەحسوب و مەنسوب ، گەورەو بچوك ، تازەکارو پایەبەرز ، سپاردەییکی زۆرپێویستە کەرێزی لیْ بگرن ، وەفەرمودەکانی ، چ دەستور بە ئەنجام دانی کارێ بێت ، چ دەستور بە دورکەوتنەوە لەرفتارو گوفتارێ بێت ، بەگوێی بکەن ، وە ئاموژگاری یەکانی ئەو خۆشەویستە ، بکەنە گۆشەوارەی گوێی هۆش و بیریان ، خۆیان بەسەربەرز بزانن ئەگەر ، هەلی نزیك بونەوەو خزمەت کردنی ئەویان بۆ دەست بدات ، وەخۆیان لە دلْ ئیشاندنی ئەو بپارێزن ، بەوجۆرەی کە خۆیان لە زەهری کوشندە ئەپارێزن چونکە وەرگرتن ، یان دەرکردنی ئەو ، هەرکەسی وەرگرت یان دەری کرد ، وەرگرتن و دەرکردنی منی هەژارو حەزرەتی پیری دەستگیر **(واتە باوکی . حەزرەتی شێخ عوسمان)** وە باقی ی مەشایخانی پایە بەرز ، وەئەولیای بەرێزە .

لە یەك دارین ئەگەر شیرین بین یان تالْ
لەیەك کۆڕین چ وشیار بین و چ مەست

**«ذلك فضل الله يوتيه من يشاء والله ذو الفضل العظيم ، اللهم اجعله للمتقين اماما ، ولاحول ولا قوة الا بالله العلي العظيم . وصلى الله على سيدنا محمد واله وصحبه اجمعين ، واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين»** .

ذی القَعدة ١٢٩٤ هـ
جێگەی مۆر
محمد العثمانی النقشبندی



١ - القرآن الكريم
٢ - إبن العربي حياته ومذهبه .
آلين بلاليوس ، ترجمة د . عبد الرحمن بدوي
٣ - إحياء علوم الدين ، محمد بن محمد بن محمد الغزالي .
٤ - أخلاق القرآن ، د . أحمد الشرباصي .
٥ - الإسلام والتصوف ، نيكلسون ، الترجمة الفارسية .
٦ - أعلام الفلسفة العربية ، د . كمال اليازجي ، د . أنطوان كرم .
٧ - الأعلام ، الزركلي .
٨ - ألفاظ الصوفية ، د . حسن محمد الشرقاوي .
٩ - الأنوار القُدسية في مناقب السادات النقشبندية ، محمد محمد ماضي الرخاوي .
١٠ - الأنوار القدسية في معرفة القواعد الصوفية ، الامام عبد الوهاب الشعراني .
١١ - ايضاح الطريق ، الشاه عبد الله الدهلوي . (مخطوطة) .
١٢ - إيقاظ الهمم وشرح الحكم ، احمد بن محمد بن عجيبة .
١٣ - بين التصوف والحياة ، عبد الباري الندوي .
١٤ - تاريخ الفلسفة الاوربية ، يوسف كرم .
١٥ - تاريخ الفلسفه في الاسلام . ج . دي بور ، ترجمة محمد عبد الهادي ابو ريده .
١٦ - تاريخ الفلسفه العربية ، حنا الفاخوري ، د .خليل الجر .
١٧ - تاريخ الفكر العربي الى أيام ابن خلدون ، عمر فروخ .
١٨ - ترجمان الأشواق ، الشيخ محي الدين العربي .
١٩ - التصوف الإسلامي ، د . زكي مبارك .
٢٠ - التصوف الاسلامي ، من البداية حتى نهاية القرن الثاني ، د . عبد الرحمن بدوي .
٢١ - التصوف وفريد الدين العطار ، د . عبد الوهاب عزام .
٢٢ - التصوف عند المستشرقين ، د . محمد الشرباصي .
٢٣ - التصوف ، ابو عبد الرحمن السلمي .
٢٤ - تذكرة الأولياء ، فريد الدين العطار .
٢٥ - التعرف لمذهب أهل التصوف ، ابو بكر محمد الكلاباذي .
٢٦ - تفسير روح البيان ، اسماعيل حقي البروسوي .
٢٧ - تفسير الجلالين ، جلال الدين محمد ، جلال الدين عبد الرحمن .
٢٨ - تفسير نامي ، ماموستا ملا كريمي بياره .
٢٩ - تفسير راهنما ، زين العابدين راهنما ، فارسي .
٣٠ - تنوير القلوب ، محمد أمين الكردي .
٣١ - جواهر المعاني ، علي حرازم .
٣٢ - حقائق عن التصوف ، عبد القادر عيسى .
٣٣ - الحلاج موضوعاً ، د .كامل مصطفى الشيبي .
٣٤ - دراسات في الفلسفة الدينية والصوفية والعلمية ، د . عبد القادر محمود .
٣٥ - ديوان الحلاج . د . كامل مصطفى الشيبي .
٣٦ - دائرة المعارف الاسلامية ، ترجمة إبراهيم زكي خورشيد ، أحمد الشنتاوي ، د . عبد الحميد يونس .
٣٧ - رحلة الى الحق ، فاطمة اليشرطية .
٣٨ - الرسالة القشيرية ، عبد الكريم هوازن القشيري .

٣٩ - رسالة طب القلوب ، الشيخ علاء الدين الشيخ عمر ضياء الدين النقشبندي .
٤٠ - رسائل ابن العربي ، الشيخ محي الدين العربي .
٤١ - الرمز الشعري ، د . عاطف جودة نصر .
٤٢ - رياض المشتاقين ، ملا حامد البيساراني (مخطوطة) .
٤٣ - زبدة خلاصة التصوف ، الشيخ عز بن عبد السلام .
٤٤ - شرح الحكم العطائيه ، محمد بن ابراهيم النفري .
٤٥ - شطحات الصوفية ، عبد الرحمن بدوي .
٤٦ - صحيح مسلم ، حديث نبوي .
٤٧ - صحيح البخاري ، حديث نبوي .
٤٨ - طهارة القلوب والخضوع لعلام الغيوب ، عبد العزيز الدريني .
٤٩ - الطبقات الكبرى ، الإمام الشعراني .
٥٠ - عوارف المعارف ، الشيخ عمر السهروردي .
٥١ - الغنية ، الشيخ عبد القادر الكيلاني .
٥٢ - الفتوحات المكية ، الشيخ محي الدين العربي .
٥٣ - فصوص الحكم الشيخ محي الدين العربي .
٥٤ - الفلسفة الاخلاقية الافلوطينية عند مفكري الاسلامي د . ناجي التكريتي .
٥٥ - الفلسفة الصوفية في الاسلام . د .عبد القادر محمود .
٥٦ - فلسفه علمى و روش تحقيق. فيليسين شاله، ترجمة فارسى يحيى مهدوى.
٥٧ - الفتح الرباني والفيض الرحماني ، الشيخ عبد الغني النابلسي .
٥٨ - الفتح الربانى الشيخ عبد القادر الكيلاني .
٥٩ - الفهرست ، لابن النديم .
٦٠ - فرهنگ عميد ، فارسى .
٦١ - فرهنگ خيام ، فارسى .
٦٢ - قوت القلوب، أبو طالب المكي.
٦٣ - القدسية ، كلمات محمد بهاء الدين نقشبند .
٦٤ - القاموس ، فيروز آبادى .
٦٥ - قوانين حكم الاشراق ، جمال الدين محمد ابو المواهب .
٦٦ - القول الحقيق في رد من تفسق بأسم أهل الطريق ، الشيخ علاء الدين الشيخ عمر ضياء الدين النقشبندي .
٦٧ - اللمع ، أبو نصر سراج الطوسى .
٦٨ - مدخل الى الفلسفة . جون لويس ، ترجمة دار الحقيقة بيروت .
٦٩ - مقدمة إبن خلدون .
٧٠ - المدخل الى التصوف الاسلامي ، محمود ابو الفيض المنوفي .
٧١ - مدارج السالكين ، ابن قيم الجوزية .
٧٢ - المرشد الى آيات القرآن الكريم ، محمد فارس بركات .
٧٣ - مرصاد العباد من المبدء الى المعاد ، الشيخ نجم الدين الرازي .
٧٤ - معجم آيات القرآن الكريم ، د . حسين نصار بركات .
٧٥ - معرفة الله والمكزون السنجاري . د .أسعد أحمد .
٧٦ - مع الفيلسوف ، د .محمد ثابت الفندي .
٧٧ - المعجم الصوفي ، الدكتوره سعاد الحكيم .

٧٨ - معجم مصطلحات الصوفية ، د . عبد المنعم الحفني .
٧٩ - مصباح الهداية ومفتاح الكفاية ، عز الدين الكاشاني .
٨٠ - مفتاح الغيوب شرح رسالة طب القلوب ، الشيخ حسين الخالدي .
٨١ - مكتوبات الامام الرباني ، الشيخ احمد الفاروقي .
٨٢ - المنقذ من الضلال ، الامام محمد بن محمد بن محمد الغزالي .
٨٣ - منازل السائرين ، شيخ الاسلام الهروي .
٨٤ - المنجد ، لويس معلوف .
٨٥ - المواهب السرمديه في مناقب السادات النقشبندية ، محمد أمين الكردي .
٨٦ - نشأة الفلسفه الصوفية وتطورها ، د . عرفان عبد الحميد فتاح .
٨٧ - نشأة التصوف الاسلامي ، د . ابراهيم بسيوني .
٨٨ - نصوص ودروس ، (١٦) التصوف الاسلامي ، د . البير نصر نادر .
٨٩ - نعت البدايات وتوصيف النهايات ، محمد فاضل بن مامين .
٩٠ - نفحات الحق ، فاطمة اليشرطية .
٩١ - نور الناظرين ، ملا محمد باكي ، (مخطوطة)
٩٢ - وفيات الاعيان ، ابن خلكان .
٩٣ - الوصايا ، الشيخ محي الدين العربي .
٩٤ - يادداشتەكانی خۆم ، لەماوەی حەفدە ساڵدا .
٩٥ - نزيكەی ، بيست وردەكتێب وەسەرچاوەی‌تر .

- پێرست -

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ | بەشی شەشەم : موصطەلەحات . | ٣٢٩ |
| ١٩ | بەشی حەوتەم : | ٣٨٣ |
| | تەریقەی نەقشبەندی | ٤١٦ |
| | دالرەکان . * | |
| ٢٠ | باسی یانزە ووشە ، یان یانزە رەوشی «تەریقەی نەقشبەندی» . | |
| ٢١ | زەنجیرەی نەقشبەندی . | ٤٣٥ |
| ٢٢ | بۆچی وە لەکەیەوە ئەم رێبازە ناونراوە نەقشبەندی . | ٤٤١ |
| ٢٣ | ژیانی بەهائوددینی نەقشبەند . | ٤٤٧ |
| ٢٤ | بەشی هەشتەم : کاری تەسەووف لە ئەدەبی کوردیدا . | ٤٥٧ |
| ٢٥ | مەلای جەزیری | ٤٦٤ |
| ٢٦ | سید عبدالرحیم «مەولەوی» | ٤٨٩ |
| ٢٧ | مەحوی | ٥١٠ |
| ٢٨ | شێخ عومەری بیارە . ضیالەددین | ٥٣٥ |
| ٢٩ | سەر چاوەکان | ٥٥١ |
| ٣٠ | پێرست | ٥٥٥ |

## إحْسان :

ئیحسان یەکێکی ترە لەمەقاماتی تەصەووف ، ئیحسان لەڕوانگەی زمانی عەرەبی یەوە ، بەچاکەکردن ئەوترێ ، بەڵام لەقورئانا بەچەن واتایێك هاتوە ، چونکە چاکە ، لەڕوانگەیێکەوە ، بۆ ڕوانگەیێك فەرق ئەکات ، لەڕوانگەی دینی ئیسلامەوە ، نوێژکردن ئیحسانە ، صەلەوات‌دان لەسەری پێغەمبەر ئیحسانە ، کەبگرە لەڕوانگەیێکی دوور لەدینەوە ، یان غەیرە ئیسلامەوە ، ئەوجۆرە شتانە هیچ نەگیررێنە پێش چاو ، لە قورئاندا ، ئەفەرمێ «مَنْ جاءَ بِالحَسَنةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثالِها» ئەنعام (١٦٠) ئەفەرمێ «وَأَحْسِنوا اِنَّ اللهَ يُحِبُّ المُحْسِنِين» (بقرە) (١٩٥) وبِالْوالِدَيْنِ اِحْساناً» بەقەرە (٨٣) «والَّذينَ جاهدوا فينا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنا وَاِنَّ اللهَ لَمَعَ المُحْسِنين» (عنكبوت) (٦٩) «وأَحْسِنْ كَما أَحْسَنَ اللهُ إِليك» (قصص) (٧٧) «إِنَّ اللهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالاِحْسانِ وَاِيتاءِ ذِى القُرْبىٰ» (نەحل) (٩٠) «هَلْ جَزاءُ الاِحْسانِ اِلاّ الإِحْسان» (الرحمن) (٦٠) هەموی ئەم کردەوانە ، لەچوارچێوەی چاکەدا کۆبونەتەوە ، هەرچەن هەمویشی یەك‌جۆرنیە ، بەڵکو لەکاتی بشکنینی سەرچاوەی مەبەست و هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکاندا ، ئەبینین ، برێکی ، بەواتای بەخشەندەگی ، برێکی بەواتای نوێژ وە عیبادەت‌کردن ، یان خزمەتی دایکوباوك‌کردن ، وەچاکە کردن لەگەڵیان‌دا هاتوە ، بەڵام هەمویشیان بەدژی خراپە،دائەنرێن ، هەروەکو خودا خۆی بۆمانی ڕوون ئەکاتەوە کەئەفەرمێ «فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللهُ سَيِّئاتِهِمْ حَسَناتٍ» (فرقان) «٧٠» وَأَقِمِ الصَّلاةَ طَرَفَيِ النَّهارِ وَزُلَفاً مِنَ اللَّيلِ اِنَّ الحَسَناتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئاتِ» (هود) «١١٤» لێرەدا هەم دەرکەوت مەبەست لەحەسەنات نوێژە وەهەم دژی و پێچەوانەی (سَيِّئات) ە .

کەواتە وشەی ئیحسان لەڕوانگەی زوانەوە بەچاکە ئەڵێن ، وەلەڕوانگەی قورئانەوە بە زۆر کردەوەی پەسەند ئەڵێ ، کە بەخشندەگیش هەرلەوانە ، بەڵام ئایا لەڕوانگەی تەصەووفەوە مەبەست لەئیحسان چی یە؟

لەڕوانگەی تەصەووفەوە مەبەست ئەگەرێتەوە بۆسەری فەرمودەیێکی پێغەمبەر ، درودی خودای لەسەر ، کەلەوەڵامی حەزرەتی (جبرەئیل) دا ، فەرمویانە . لە سەرگوزەشتێکی ژیانی پیغەمبەردا ، هەیە ، جارێکیان جیبرەئیل ، لەشێوەی بەنی ئادەمێکا دێتە خدمەتی پێغەمبەر ، وەسەبارەت ، بەئیمان ، وەئیسلام ، وەئیحسان ، پرسیار ئەکات دیارە ئەم پرسیارەش بۆئەوەبوە ، ئەو خەڵکەی بەدەوری پێغەمبەری گەورەدایە ، لەم پرسیارو وەڵامە کەڵك وەرگرن ، وە

لەدین و ئایینەکەیان باشتر شارەزابن ،.. بەکورتی : دواپرسیاری جیبرەئیل ، پرسی «**ئیحسان**» بەچی ئەڵێن ، پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر ، فەرموی «**الاِحْسانُ اَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَراه ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فَإِنَّهُ يَراكَ**» جیبرەئیل فەرموی راستە ، جا کە هەستاو رۆیشت ، وە یارانی پێغەمبەر پرسیاریان کرد ، ئەم میوانە کێ بو ، ئێمە نەمان ناسی ، وەهیچیشی لەوەی نەئەکرد سەفەری بێت ، واتە تەپوتۆزاوی نەبو ، وەزۆر پاکوپوختەبو ، پێغەمبەر فەرموی ئەوە جیبرەئیل بو ، هاتبو تا ئایینی ئیسلامتان باشتر بۆروون کاتەوە ، ئیتر کەسیش ، نەیدی یەوەو ناپەیدابو ، ئەگەڕێینەوە سەری مەبەست ، سەبارەت بەوحەدیثە مەشهورە ، «**الاِحْسانُ اَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَراهُ ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فَإِنَّهُ يَراكَ**» ئیسلام کردەوی ظاهیر وە بەرواڵەتی موسوڵمانانە ، وەکو نوێژو رۆژو حەج وزەکات وەهەموپەرستشێك : ئیمان ، هەم باوەڕە کەوالەدەرونا ، وەهەم کردەوەکانە ، چونکە باوەڕت بو کردەوەکانیش ئەنجام ئەدەیت : بەڵام «**ئیحسان**» کرۆك و ناوەرۆکو کاکڵەی : یان بڵێین «**حەقیقەتی ئیمان**» وئیسلام ، هەردوکیانە ، ئیحسان ئەوەتە ئەو خواپەرستی یەت بەباشترین جۆر ، بەتەواوترین چەشن ، بەدڵ وبەگیان بەلای زیادەوە ، ئەنجامی دەیت ، دیارە ئەم جۆرە پەرەستشە کاتێ ئەنجام ئەدرێت مرۆڤ لەهەمو هەنگاوێکا ، بۆی روون بێت خوای گەورە چاوی لێ یەتی وەئەوکردەوەیە ، وە ئەوپەرەستشە ، هەربۆئەوی ئەنجام ئەدات و بوکەسی ترو بۆهیچی ترنا ... ئایا لەکاتی نوێژدا مرۆڤ ئەگەر دڵنیابێت ، کەوالەحوزوری خوادا وەزۆرباش دڵنیابێت خودا چاوی لێ یەتی و ، ئەمیش ئەم نوێژە بۆئەو ئەکات ، ئایا ئەمە ئەبێتە ئەوجۆرە نوێژەی : کە پەلەپەل بکرێت و بەنی ئادەم هوش وخەیاڵی بەهەزار لادا پرژو بڵاو ببێتەوە ؟ .

بێ گومان نوێژو پەرەستشێك ، بەراستی ی پەرەستشە ، کە لەپایەی ئیحسان دا ، ئەنجام درێت ، واتە ، لات وابێت ، تۆچاوت لەخودایە ، ودڵنیابیت ئەگەریش تۆ چاوت لەونیە ، خۆئەو بێ گومان چاوی لەتۆیە ، جائەو جۆرە نوێژو عیبادەتەیە کە «**خوشوعی**» تیایە ، وە خودای تەعالی ، ئەو خوداپەرستانە ، بە «**مُفْلِحْ**» ، واتە

سەرکەوتوو ، وەرزگاربوو ، ناو ئەبات ، وەئەفەرمێ «**قَدْ اَفْلَحَ المؤمنونَ ، الذينَ هُمْ في صَلاتِهِمْ خاشِعُون**» (**المؤمنون**) «٢» یان ئەفەرمێ : «**اَلَمْ يَأْنِ لِلَّذينَ آمَنوا ، اَنْ تَخْشَعَ قُلوبُهُمْ لِذِكْرِ الله ، وَما نَزَلَ مِنَ الحق..؟**» (١٦) **حديد.**

بەم چەشنە دەرکەوت ئەو موسوڵمانانەی کە نوێژو پەرستشەکانیان «**خوشوع**»ی تیایە ،

واتە، ئارامی و خۆبەبچوكزانینو دڵپاكیو لەخوا ترسان، ئەوانە، دەستەی ڕزگارە كانن، وە هەروەها دەركەوت، كەخوا پێی خۆشە پەرستش بە خوشوعەوە بێت

كەئەفەرمێ، «اَلَمْ یَاْنِ لِلَّذِینَ آمَنُوا، اَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُم» ئایا ئیتر كاتی ئەوە نەهاتوە ئەی موسوڵمانان كە لەدەرونەوە «خوشوع» پەیدا كەن.. بۆخوداپەرستی؟..

بەڵام ئەپرسین ئەم خوشوعە چۆن بەدەست دێت، دیارە بەوەی كە لەكاتی پەرەستش دا، خودا بە «حاضر وە ناظر» بزانیت، واتە زۆرباش باوڕت لەسەر ئەوەبێت، خودا لەهەمو شوێنێكا ئامادەیە ، وەچاوی لەهەمو كردەوەیێكە، كەئەمەش خۆی مەقامی ئیحسانە، جا كەبویتە خاوەنی ئەم مەقامە، بەرهەمو دەست هاتی ئەو مەقامەش وەرئەگری ئەویش. ئەوەتە هەرچی خواپەرستی تە، هەموی بەباشترین چەشن ئەنجامی ئەدەیت، وەبەوپەری خۆشیو دڵكراوەییو ڕەزامەندیو پاكوپوختەیی یەوە، وە بەبێ كەموكوری، كە ئەبێتە «خوشوع».

كەواتە بەرهەمو دەرامەدو دەستكەوتی (ئیحسان) ئەبێتە (خوشوع) لەعیبادەت دا، وەئەبێتە ئەوەی ئەو خوداپەرەستی یە، تەنها بۆخودا خۆی ئەنجام بدرێت، وبەرهەمو دەس كەوتی خوشوعیش، سەركەوتنو ڕزگاری یە «قَدْ اَفْلَحَ الْمُؤمِنُونَ الَّذِینَ هُمْ فِی صَلاتِهِمْ خاشِعُون» وەچی هەیە لەم مەقامە گەورەترو چاكتر، وە پێچەوانەكەی (ئیحسانیش) ئەبێتە، خوداپەرستی بێ كاكڵەو بێ حەقیقەت، وە بێ جەوهەر، كەئەمجۆرە دەس كەوتە بەرزانەی تیانیە، وەبگرە تیاچون وە فەوتانیشی تیابێت، وەسەری لەخوداپەرستی، پرلەڕیایی یەوە دەرچێت، وە خودانەخواستە ببێتە «شیرك» چونكە، خوداپەرەستی لەگەڵ ئەوەشا كەپەرەستشە ئەگەر لەصەداصەد

بۆخودانەبێت، ئەوە شەریك بۆخودا قەراردانە، كە خودائەفەرمێ «فَوَیْلٌ لِلْمُصَلِّینَ الَّذِینَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ ساهُون. الَّذِین هُمْ یُراؤن» (سورەی ماعون)، واتە جەهەننەم، یان سزای گەورە، بۆئەوانەی، كەلەنوێژا كەمتەرخەمی ی ئەكەن، یان نوێژو پەرستشەكانی تریان بۆ ڕیایی یە، واتە، بۆ خۆبەچاكپیشاندانە. كەواتە، هەرچەن لای خۆی نوێژی كردوە، كەچی نەك هەرنوێژەكەیشی لێ وەرناگیرێت، بەڵكو (وەیلیش) بۆئەوە، ئەمجۆرە نوێژە ئەبێتە پێچەوانەی (خوشوع)، جا ئەكرێ نوێژێكیش هەبێت بۆریایی نەبێت، بەڵام خوشوعی تیانیە، دیارە ئەویش ناگاتە خوداپەرستی ی

فەرمانبەردارن، وە نزیکی یێکی نارەزاییشە لەوبەندانەی کە لە خوداوە دوورن، یان کەچ ڕەفتارن، یان هیوایشیانهەیە تەنانەت باوەڕیشیان بەخودانیە.

مەبەست ئەوەتا بەندە هەرجۆربێت، خودا لەوەوەنزیکە، بەلام گرنگ ئەوەتە بەندە لەخوداوە نزیك بێت، سەبارەت بەتیکرالی نزیکی، خوا خۆی ئەفەرمیٚ «**وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسانَ وَنَعْلَمُ مَاتُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ**»ق(١٦).

واتە، ئێمە بەنیئادەممان دروس کردوە وەئاگادارین لەهەموو دڵەراوکەیێکی دەرونی ئەو، وە لەڕەگی وەریدی خۆی نزیکترین بەو، ئایا نزیکی ی لەمەنزیك تر هەیە؟.

سەبارەت بەوکەسانەش وانلەسەرەمەرگا، ئەفەرمیٚ بەوکەسانەی لەنزیکی مردوەکەوەن «**وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْكُمْ وَلٰكِنْ لَاتُبْصِرُونَ**»، «**واقعة**» (٨٥)، واتەئێمە لەئێوەنزیکترین لێی، بەلامئیوە ئاگادار لەو نزیکیو چۆنیەتەنین، وەنابینن.

بەڵام ئەم حاڵی قوربەی، کە لەتەسەووفدا هەیە، حاڵی نزیکی بەندەیە لەخودا بەهۆی خوداپەرستیو خودا ویستیو خەباتو تیٚکۆشانەوە، بەجۆرێك ئەگاتە رادەیێك ئەوبەندەیە زۆرجار خۆی لەیادئەچێتەوە وە هەرخودای لەیادە، کەئەبێتە «**فەنای نەفس**» وە «**بەقای خودا**» جائەوەتە، ئەمحاڵەتە ئەگاتە شوێنێکی وا باریکوناسك، کەخاوەنی ئەوحاڵە، تۆمەتی کوفریان لیٚئەدەن، وە حاڵەکەیان بەناوی (**حولول**) یان «**إتحاد**» یان «**وەحدەتی وجود**» ناو ئەبەن، شتەکەش هەرلەوەوە سەرچاوە ئەگرێت لەوحاڵی(**قوربە**)دا، ئەوکەسە سەبارەت بەحاڵەکەی خۆی، شتێك ئەڵێت، کە لەقاموسی ڕیٚزمانو گوفتاری ساکاری ئێمەدا ناگونجیٚ، وەبریٚجاریش لەچوارچێوەی شەرعیشدا جێگەی ناکرێتەوە، کەچی لە ڕاستەکەشیا، ئەوخاوەنحاڵە، کارێکی خیلافی نەکردوە، بەڵکو ئاگادارانە، یان نائاگا، لەبارەی ئەوچۆنیەتەوە شتیوا هاتوە بەدەمیا، کەقەت لەکاتی هۆشداریدا نایڵیٚ، وەبەگوناهی ئەزانێت، سەبارەت بەمحاڵەتی قوربە شاهینەقشبەند محمد بهاء الدین، لەقەصیدەیێکا شیعرێکی بەفارسی هەیە کەئەفەرمیٚ.

**ئەیزاهیدیٚ ظاهیربین ازقورب چەمیپورسی**
**ئودەرمەنو مەندەروەی چونبوو بەگولاب ئەندەر**

واتە ئەی زاهیدی ظاهیربین، تۆسەبارەت بە (قورب) چی لەمن پرسیار ئەکەیت.
ئەولەمنەوەو من لەوەوە ئەوەندە نزیکین وەکو بۆنی گولاّوو ئاوی گولاّو.

بی گومان بۆنەکە، لەئاوەکە جیایەو، هەرکامەی شتێکە بۆخۆی، وەئەوبۆنە جەوهەرێکە، کەچی لەعەینی کاتیشا تێکلاّوی ئاوەکەیە.

ئەگەر ئەمچۆنیەتە لەروانگەی قورئانیشەوە سەیرکەین خودا لەرەگی «وەرید» نزیکتربێت ئەونزیکی یە چۆنە؟ بی گومان ئەم نزیکی یە، نزیکی ی (عیلمی) خودایە، چونکە نزیکی ذات لەذاتەوە نیە، وەئەگەر وای بزانین کوفرە، بەلاّم ئەمجۆرە هەستانە، هەستی بەصیرەتە، واتە چاوی دەرون، نەك هەستی «پێنج حەواس»، بۆنمونە، نزیکی ی منداڵی کورپە لەدڵی دایكو باوکەوە، خۆمنداڵەکە ناچێتەدەرونەوە، بەلاّم خۆشەویستی وەخەمخۆری ئەو منداڵە، بەجۆرێ ئەچێتە کانگەی دەرونەوە، ئەگەرپەنجەیێکی گەرم بێت ئارام لەوباوکو دایکە هەلّ ئەگیرێت.

دەلیلی قورئانی ی بۆ ئەم جۆرە تێکوشانەش ئەوەتە، خودابەپێغەمبەر ئەفەرمێ، «وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ» (عَلَق) (١٩) کەواتە سوجدەبردن، واتەنوێژکردن، یەکێکە لەو هۆ بناغەییانەی کە بەندە، لەخودا نزیك ئەکاتەوە. هەروەها سەبارەت بەحەزرەتی موسی لەسورەی (مەریەم) ئایەی (٥٢) ئەفەرمێ «وَنَادَيْنَاهُ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا».

ئەفەرمێ «السَّابِقُونَ السَّابِقُونَ اولئكَ الْمُقَرَّبُونَ» بەلاّم ئایائێمە بەچی نزیك ئەبینەوە لەخوای گەورە؟.

هەروەکو لەپێشاوتم، ئەوەتا بەپێغەمبەر ئەفەرمێ «وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ». یان هەر بەپێغەمبەر ئەفەرمێ «وَمِنَ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ وَسَبِّحْهُ لَيْلاً طَوِيلاً» «الانسان» «٢٦» جا لەسورەی (سبأ) (٣٧) دا، ئەفەرمێ، «وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلَااولادُكُمْ بِالَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِنْدَنَا زُلْفَى، إِلاَّ مَنْ آمَنَ. وَعَمِلَ صالحًا فَأُولَئِكَ لَهُمْ جَزَاءِ الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا. وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ». ئەفەرمێ، وەنەبێ ماڵومنداڵتان بتوانێ ببێتە هۆی نزیك بونەوەتان لەخودا، بەڵکو باوەری دامەزراوو کردەوەی باشە کەنزیکتان ئەخاتەوە. وە ئەبێتە هۆی پاداشی چەن بەرابەرو جێگەی خۆش لەبەهەشتا. بەکورتی خوداپەرستی و کردەوەی باش، بەتایبەت نوێژی زۆرکردن، ئەبێتەهۆی حاڵەتی (قورب)، واتە،

ئەوپەڕی نزیکی ...وەگەورەترین مەقام ، واتە پایەو پلەی بەندە بەلای خوداوە «**مەقامی مەحمود**»ە کە هی پێغەمبەری گەورەیە درودی خوای لەسەر . خوای گەورە لەکاتی موژدەدانی ئەم مەقامەدا بەپێغەمبەر ئەفەرمێ : شەونوێژو نوێژی زیادە بکە بەڵکوخودا لەوجیهانا مەقامی مەحمودت خەلآت کات . «**وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ . نَافِلَةً لَكَ عَسَى اَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقاماً مَحْمُوداً**» (٧٩) (اسراء) .

جادەرباڕەی موسوڵمانان خوای گەورە لەحەدیثیکی قودسی دا ئەفەرمێ . «**مَنْ عادى لي وَلِياً فَقَدْ آذَنْتَهُ بالحَرْبِ ، وَماتقرَّبَ اِلىَّ عَبْدي بِشَيء اَحَبَّ اِليّ مما افترَضْتُ عَلَيْهِ . وَمايزال عَبدي يَتقرَّب اِليّ بالنّوافِلِ حتّى اَحبّهُ ، فَاِذا اَحبَبْتُهُ كنتُ سَمْعَهُ الّذي يَسْمَع به وَبَصَره الذي يَبْصِرُ بِهِ وَيَده الّتي يَبْطِشُ بها ... هتد .**» واتە هەرکەسێك دژایەتی بکات لەگەڵی

خۆشەویستانما خۆی حازرکات بۆشەڕ لەگەڵی منا . وە بەندەکانم . بەهیچ شتێك لەمن نزیك نابنەوە بەئەندازەی ، بەجی هێنانی فەرزەکان . بەندەکانی من بەئەنجام دانی زیادەنوێژ ئەوەندە لێم نزیك ئەبنەوە تا ئەبنە خۆشەویستم ، جا کەخۆشم ویستن ئیتر ئەبمە ئەو هەستی بیستنەیان کەپێی ئەبیسن ، وەئەوچاوەی کەپێی ئەبینن . وەئەودەستەی کەئەیخەنەکار .. هتد ... لێرەدا مەبەست ئەو وشەی نزیکی یەتە ، کە بەهۆی زیادەنوێژو خواپەرستی یەوە دەست ئەکەوێت . وەئەوکەسە ئەبێتە خۆشەویستی خودا ، بەرادەیێك دەسوچاووگوێی ئەو ، هێزێکی وایان تی ئەکەوێت ، وەکوئەوەی خواهێزێکی تایبەتی جیاوازی دابنێ ..

لەکۆتایی دا ئەڵێم «**قورب**» حاڵێکە هی گەورەپیاوانی ڕێبازی تەصەووف وەهی ئەوانەیە کە گەیشتونەتە مەقامی «**ویلایەتی کوبری**» ، وبریتی یە لەئەوپەڕی نزیکی بەندە لەخوای گەورە ، وەلەخۆشەویستی ی بەندە بەلای خوداوە ، وەخۆشەویستی ی خودا بەلای بەندەوە ، بەرادەیێك بری جار ، خاوەنی ئەم حاڵە خۆیو جیهانی لەیاد ئەچێتەوە . وەجگە لەو خۆشەویستیی خودایەو لەونزیکی یەی خۆی ئاگای لەهیچی تر نامێنێت «**ذَلِكَ فَضْلُ اللهِ يؤتِيهِ مَنْ يَشاءُ**» زۆرجار لەگەڵی ئەم وشەی «**قورب**»ەدا وشەی «**بوعد**» واتە : دووری هاتوە ، کەئەبێتە پێچەوانەی نزیکی لەخودا . وە (**بوعد**) واتە دوری ، هی ئەوکەسانەتە کە گومراهن وەلەخوداوە دورن . وەخودانەناسن ، بێ گومان ئەوەی وابو جێگەی جەهەننەمە وەدوژمنی خودایە .

## إخلاص :

یەکێکی تر لەمەقامەکانی تەصەووف ، مەقامی ئیخلاصە ، لێرەدا مەبەستێك هەیە شایەد نەم گوتبێت ئەویش ئەوەتە ، هەرکاتێ خووخدەی رێبواری رێگەی تەسەووف هاتەسەری هەرکام لەم حاڵەتانە ، وەئەم حاڵە بویە خووخدەی ، وا بوەتە خاوەنی ئەومەقامە ، واتەئەگەر حاڵەتی پەشیمانبونەوەی لەگوناه وەبەردەوامبونی لەسەرگوناەنەکردن ، بەوچەشنەی لێ هات کەلەباسی تەوبەدا باسمانکرد ، جائەکرێت ئەوکەسە بگاتە مەقامی تەوبە ، هەروەها دەربارەی زوهدو وەرع و صەبرو شوکرو ئەوانی تریش ، بەڵێ خاوەنی مەقامی زوهد کەسێکە هەرچی ئەوپێناسانەیە هەموی تیا بەدیهاتوەو بوەتە بەشێك لەخووخدەی ، پاشان یەکەیەکە خووخدەکانی بەهەولوخەباتو خواپەرستیو شەونەخونی ئەگۆرێنە سەری پێناسی مەقامەکان ، وەئەبێتە خاوەنی ئەو مەقامە ، وەکەسێ نەبوبێتە خاوەنی هەموپێناسێکی صەبر ، وا نەگەیشتوەتە مەقامەکەیشی ، ئەمە جگە ئەودەستکەوتە مەعنەویانەیە کە دەستی ئەکەوێت ، وەجگەخۆیوخودا نەبێت کەسیتر نازانی چیەو چۆنە .

لێرەدا باس باسی مەقامی ئیخلاصە ، واتە پەرستنی خودا هەر بۆخودا وە بەهەمو دڵێکەوە ، دوور لە خۆهەلکێشان وە خۆ بەچاك زانین ، مەبەست ئەوەتە جگە لەوەی کە ئەوکەسە موسوڵمانەو بەندەیێکی خاوەن باوەرە وە هەمو دەستورەکانی خوداو سونەتەکانی پەیامبەر ئەباتە رێگاوە ، جگە لەهەموی ئەمانەش ، ئەبێ پەرستشەکەی پاك بێت وە لەریایی دووربێت وەهەر بۆ رەزامەندی خودابێت ، تەنانەت ، هەروەکو رابیعەی عەدەویە ئەڵێت ، نەلەترسی جەهەنەم وە نەبۆ پاداشی بەهەشت بێت ، لێرەدا مەبەستێك هەیە روون کردنەوەی پێویستە ، ئەویش ئەوەتە ، نابێ واتێبگەین ئەم پیاوچاکانە لە جەهەنەم ناترسن وە بەهەشتیان ناوێت بەڵکو لەهەموکەسێ زیاتر لەجەهەنەم ئەترسن وە بە پاداشی بەهەشتیش سەربەرزن ، بەلام ، مەبەست ئەوەتە ، ئەمان ئەڵێن ئەگەر بەهەشتو جەهەنەمێکیش لەناوا نەبێت ، ئەوان ئەوەندە خودایان خۆش ئەوێت ، پێویست بەهەرەشەی جەهەنەم وپاداشی بەهەشت نیە ، ئەوانەش نەبوایێ هەر لەبەر خۆشەویستیی خودا ، وەلەبەر

عەزەمەتی خودا وەلەبەرئەوەی ، خۆیان بەبەندەی خودا ئەزانن ، هەر خودایان ئەپەرستو هەر گەردەنکەچی فەرمانی خودابون .

«ئەبولقاسم»ی قوشەیری ، ئەڵێت ، «ئیخلاص ئەوەتە پەرەستشەکەت تەنها هەربۆ خودابێت وەبۆ ئەوەبێت لەخودا نزیك بیتەوە ، نەبۆ ئەوەتبێ کە لەلای خەڵکەوە شتێکت دەس کەوێ نەبۆ ئەوەتبێت خەڵك ستایشت بکەن و خۆشیان بوێت وە بە پیاوچاکت بزانن ، یان بۆ هیچ بابەتێك لەم بابەتانە ، بەڵکو جگە لەنزیك بونەوە لەخودا هیچت لەدڵا نەبێت» بەکورتی پەرستش و کردەوەی چاکت بۆ خالیق بێت ، نەك بۆمەخلوق ، خوای گەورە لەسورەی زومەردا سێ جار فەرمان ئەدا ، بە پەیامبەری گەورە درودی خودای لەسەر کە لەخوداپەرستی دا موخلیص بێت ، ئەفەرمێ «قُلْ اِنّي اُمِرْتُ اَنْ اَعْبُدَ اللّٰهَ مُخْلِصاً لَهُ الدّين» «قُلِ اللّٰهَ اَعْبُدُ مُخْلِصاً لَهُ دِيني» «فَاعْبُدِ اللّٰهَ مُخْلِصاً لَهُ الدّين ، اَلاٰ لِلّٰهِ الدّينُ الْخالِصْ» هەروها لەسورەی «البيّنه»دا ، بە هەمومان فەرمان ئەدات کە پەرەستشە کانمان پاك وخاوێن و بێ ریاو روپامایی بێت «وَمٰا اُمِروا اِلاّ لِيَعْبُدُو اللّٰهَ مُخْلِصينَ لَهُ الدّين» .

خودای گەورە ئەو ریایی و رووپامایی یە ، بە هاوبەش دانان بۆخودا ، دای ئەنێت کە لەسورەی (الكهف) (١١٠) دا ئەفەرمێ «فَمَنْ كانَ يَرجو لِقاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صالِحاً وَلايُشْرِكْ بِعِبادَةِ رَبِّهِ اَحَداً» ئەوەی ئەیەوێ بەحوزوری خودای خۆی بگات، کردەوەی چاك بکات ، وەکەس نەکاتە هاوبەشی خودا لەپەرەستشەکانیا . کەواتە ریایی ، شەریك بۆخودا دانانە ، «موسلم» حەدیثێك ئەگێرێتەوە کەپێغەمبەر درودی خودای لەسەر فەرمویەتی «اِنَّ اللّٰهَ لايَنْظُرُ اِلى اَجْسامِكُمْ وَلا اِلى صُوَرِكُمْ وَلٰكِنْ يَنْظُرُ اِلى قُلوبِكُمْ» ، ئەمەش دەس نیشانە بۆئەو خوداپەرستی یانەی کەبەلەش ئەنجام ئەدرێن ، وەکو نوێژ ، یان حەج ، یان هەرچی تر کە بە لەش ئەنجام ئەدرێن ، جائەفەرمێ ، دڵ حسێبە ، ئایا ئەم خوداپەرەستی یە بۆئەوەتە خەڵك مەدحی بکەن ، خەڵك خۆشیان بوێت ، خەڵك بەچاکی بزانن ، یان هەر بۆرەزامەندی وە ئەنجامی فەرمانی خودا ئەنجامی داوە .؟

(اِبنُ عَجيبه) خوای لێ رازی بێت ، ئەڵێت ، ئیخلاص خاوەنی سێ پلەیە ، واتە موخلیصەکان سێ دەستەن . یەکەم خوداپەرستێکە کەلەودا موسڵمان چاوەروانی پاداشە ، وەکو لەش ساغی و رۆزی زۆری ئەم دنیا ، وە بەهەشت و حۆری ئەودونیا ، برێکی هەربۆ پاداشی ئەو دنیایە برێکیش کە هی بەندە خاوەن پایەکانە ئەوەتە بۆهیچ

پاداشێکی هەردوجیهاننیە بەڵکو بۆیە خودائەپەرستن بۆئەوەی سپاردەی بەندەیی خۆیان بەجی بێنن، وە لە خۆشەویستی‌ی خودادایەو ئارەزومەندبونی دیداری خودای گەورە لەوجیهاندا.

بەڵێ گەورەترین ئاواتی صوفیەکان ئەوەتە ئەوەندە تێکۆشن لەرێگەی ئیخلاصەوە بگەنە بەرزترین پلەوپایەی بەندەگی بەلای‌خوداوە، وەبۆئەوەی خوداپەرستن، بەئاواتی شادبون بەحوزوری‌هەق، بی‌ئەوەی پاداشێکی‌تریان مەبەست‌بێت. جائەگەر خوداپەرستی صوفیەکان بەم‌جۆرەنەبو ئەوە هەرگیز بەئاوات‌ناگەن‌و بەمەقامی «ئیخلاص»، شادنابن، گەورەپیاوانی ئەم‌رێبازە ئامۆژگاریی رێبوارانی رێبازی تەصەووف ئەکەن کەهۆشیان لەخۆیان‌بێت، ئەگینا نوچی‌ئەدەن‌و هەڵئەدێرێن وە رنجیان ئەدرێت بەئاوا، لەهەموی‌گرنگتر ئەوانیان لەدووشت ترساندوە.

یەکەم:

لەخۆرازی‌بون‌و لەخۆبایی‌بون بەوەی ئەم پەرستشەیان بەلاوە شتێکی عەجایب بێت‌و وابزانن کارێکی گەورەیان کردوەو خوا ئەبێ پاداشیان بداتەوە، چونکە لای گەورە پیاوانی تەصەووف، وایە هەرچاکەیێك لە مرۆڤ رووئەدات، ئەوە فەضلی خودایە وەئێمە ئەبێ سوپاسی خودا بکەین کە هیدایەت‌و یارمەتی داوین بۆئەنجام‌دانی ئەو کردارە چاکەو ئەو پەرستشە «وَلَوْلا فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مازَكَىٰ مِنكُمْ مِنْ أَحَدٍ» سورەی‌نور (٢١)، جائەگەر (مورید) بەوجۆرەی‌کرد، وەخۆی لەدەستی لەخۆبایی‌بون‌و لەخۆرازی‌بون رزگارکرد، وەخۆیی باش‌ناسی، وا خۆی لەنوچ‌دان‌و پی‌هەڵکەوتن‌و هەڵدێران رزگارکردوە.

دووهەم:

مەترسی‌دوهەم، چاوەروان‌بونی پاداشە بەرانبەر بەخوداپەرستی‌و کرەدوەی‌چاك، بەتایبەت پاداشی دنیایی، وەکو بەچاك‌ناوبانگ‌دەرکردن‌و دەوڵەمەندبون‌و بونەپیاوی‌گەورەو شێخ‌ومورشیدو ئەم‌جۆرەشتانە، یان بەتەمای بەدەست‌هێنانی

مەقامی مەعنەوی و کەشف و کەرامات، نابێ خواپەرستی بۆهیچ کام لەمانەبێ، چونکە وای لێ دێت ئەوکەسە خودای بۆخودایی و گەورەیی خودا نەپەرستوە، بەڵکو بۆدەست کەوتی دینیو دنیایی بوە، لەکتێبی (حقائق عن التصوف) دا، لەزمانی شیخ ئەرسەلانەوە ئەگێڕێتەوە ئەو هەمیشە لە ئاموژگاری یەکانیا، موریدەکان وەهەمو ڕێبوارانی ڕێگەی تەسەووف ئاگادارکردوەتەوە.

وەبەموانەی کەجگە ڕەزامەندی خودا ئاواتی تریان بوە ئەڵێت «**ئەی دیلی دەستی ئاواتوئارەزو ئەی دیلی دەستی پەرستش، ئەی دیلی دەستی مەقامات وکەشف و کەرامات، تۆ لەخوَت بایی بوییت**» لێرەدا ئەبێ بلێم، «**دیلی دەستی پەرستش، واتە چاوی هەر لەپەرستشەکەیو نوێژوڕوژوەکەیەتی وە بەشتێکی گرنگی دائەنێ وەهەر بەتەمایە دەستکەوتیان لێ بەدەست بێرێت**».

برێ لەم گەورەپیاوانە ئەڵێن، ئەم چاو لەمەقام بونە ئەوەی خرابە، ئەگەر مەقامەکەی هاوردە دەست. وەکوئەوەتە ئەو بۆ مەقام بەدەست هێنان خواپەرەستی کردبێت، ئیتر لەگەڵ بەدەست هێنانیا دڵی دائەمرکێت لەکاتێکا ئەو بۆخۆشەویستی وە بوعەزەمەتی خودا وەئەنجامی بەندەیی، خوای پەرسیوە، یان ئەوەتە مەقامەکە بەدەس نایێرێت وەهەر هەوڵی بۆئەدات، ئەمەش ئەوەئەگەێنێ لەباتی ئەوەی هەوڵ بدات، بوگەیشتن بەخودا هەوڵی داوە بۆگەیشتن بەمەقام، مەقام ئەبێتە غایەو مەقصود نەك خودا. جا لەبەرئەم وردەکاری یانەتە کە بونی مورشید وە ڕاهنما پێویستە، بۆئەوەی لەم ڕێگە سامناکەدا ماموستاو ڕێ نماینێکی هەبێت پلەبەپلە ڕانمایی بکات لەکوێوەبڕواتوچی بکات.

بەبونی مورشید یان نەبونی، دووشت پێویستە لەسەری ڕێبواری ڕێگەی ئەم جۆرە پەرستشە گەرموبەتینە، ئەویش ئەوەتە هەمیشە ڕێبوار چاوێکی لەعەیب و هەڵەو

کەموکوڕی یەکانی کردەوەکانی خۆی بێت، بۆئەوەی ئیتر هەڵەی تر نەکات، دووهەم، خوازیاری ئەم ڕێگایە، ئەبێ وردبێتەوە کەخوا چەن گەورەیەو، وەچۆن خاوەنی هەموی نیعمەتەکانەو چۆن ئێمەی بەندە هەرچی بکەین هێشتان ناتوانین سوپاسی ئەو هەموە نیعمەتانە بەجێ بێنین، هەروەکو خۆی ئەفەرمێ «**وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ**»، سورەی «**زومەر**» (**٦٧**) لەپایانا ئەڵێین، ئیخلاص: بریتی یە لەبژارو

پاك‌كردنه‌وه‌ی كرده‌وه‌كان وه‌په‌رستشه‌كان له‌هه‌رچی خه‌وشوخالْو دركودالْه، تابگه‌ینه ئه‌و ئاكامه‌ی خواپه‌رستیان، نه‌بۆ پاداشی خه‌لْك بێت كه لێیان رازی‌بن یان خذمه تمان بكه‌ن یان به‌چاكیان بزانن، منه‌ت، نه‌سه‌ری خه‌لْك بنێین نه‌سه‌ری خالیق، وه نه بۆ پاداش، به‌لْكو ئێمه خواپه‌رستیان ته‌نها بۆ ئه‌نجامدانی فه‌رمانی خودابێت وه‌بۆ. به‌جێ‌هێنانی شێوه‌ی به‌نده‌یی‌بێت، بێگومان خودای‌گه‌وره هیچی لا ونابێت، له‌هه‌موبه‌خشنده‌یێ به‌خشنده‌تره، وه‌له‌هه‌مو میهره‌بانێك میهره‌بانتره.

وه‌رێبوارانی راسته‌قینه‌ی رێبازی ته‌صه‌ووف په‌ره‌ستشه‌كه‌یان به‌م‌جۆره‌یه، وه‌له‌وكاته‌دا كه وان له‌م‌حالْه‌دا، مه‌قامیان گه‌یشتوه‌ته مه‌قامی ئیخلاص.

## فَنَا وَبَقَا:

فه‌ناوبه‌قا ده‌ریایێكی بێ‌كه‌نارو بێ‌بن‌و بێ‌پایانی زانیاریی ته‌صه‌ووفن، ئه‌م دوو به‌سه‌رهاته مه‌گه‌ر پیاوه هه‌ره گه‌وره‌كانی ته‌صه‌ووف باسیان له باره‌یه‌وه كردبێت، لام‌وایه زۆرتریشی له‌به‌ری‌ئه‌وه‌ته چونكه له‌دواپله‌ی ئه‌م‌رێبازه‌دا جا رێبوار ئه‌م‌چۆنیه‌ته‌ی به‌سه‌رادێت، له‌به‌رئه‌وه هه‌موكه‌سێ ناتوانێ له‌باره‌یانه‌وه باس‌بكات، به‌تایبه‌ت به‌وجۆره‌ی كه ئیمامی‌ره‌ببانی، له‌مه‌كتوباتدا ئه‌فه‌رمێ، هه‌رئه‌م فه‌نایه خۆی چه‌ن‌ئالْوگۆری تیایه‌و چه‌ن شێوو كه‌نده‌لانی تێ‌ئه‌كه‌وێت، وئاخره‌كه‌شی ده‌ریایێكی بێ‌پایانه، به‌وبۆنه‌وه برێ بیروباوه‌ری داونه‌ته دواوه، وه‌ئه‌لْێ، خاوه‌نی ئه‌وباوه‌رانه نه‌گه‌یشتونه‌ته پایانی‌مه‌نزل وه‌لایان‌وابوه فه‌ناهه‌رئه‌وه‌ته.

له‌كتێبی قودسیّه دا كه‌بریتی‌یه له‌فه‌رموده‌كانی شاهی نه‌قشبه‌ند وه خواجه‌موحه‌ممه‌دی پارسا نوسیویه‌تی، ئه‌لْێ یه‌كه‌م‌كه‌سێك كه‌له‌باره‌ی ئه‌م‌دوو (عیباره‌ته‌وه) واته به‌قاوفه‌ناوه، باسی‌كردوه شیخ‌أبوسعید احمدبن‌عیسی الخزّاز بوه كه‌له (٢٧٧ یان ٢٧٩) كۆچی‌دا دواكوچی‌كردوه.

له‌سه‌رچاوه‌كانی‌ترا من‌نه‌م‌دیوه هیچ‌كامی‌تر بلْێن یه‌كه‌م‌كه‌س كێ‌بوه له‌م‌باره‌وه باسی‌كردوه. به‌لام‌زۆریان‌فه‌رموده‌كانی خه‌رزازیان سه‌باره‌ت به‌فه‌ناوبه‌قا نوسیوه.

وادەرئەکەویٚ خەررازسەبارەت بەتەصەووف زۆری نوسیوەوەخاوەنی تەریقەتیش بوە وە دوکتۆر عیرفانیش باسیبریٚ سەرچاوەئەکات لایان وایەبایەزید زوتر باسی فەنای کردبیٚ بەلاٚم ئەوەی شیاوی وتنە ، بایەزید مەقامەکەی فەنابوە نەك ئەوەی بەنوسین خۆی سەبارەت بەفەنا شتی دەربڕی بێت وەکو باوەردەربرینەکەی خەرراز.

بەهەرحالٚ فەنا ، واتە فەوتان وتیاچون ، «کُلُّ مَنْ عَلَیْهَا فانٍ» وە بەقا ئەبێتە مانەوە «العاقِبَةُ خَیْرٌ وَاَبْقٰی»«ابن العربي» سەبارەت ، بەووشەی بەقا ئەلٚیٚ ، بەردەوامی ی وەدرێژەپی ٚدراوبی ، وەجاویدان بون ، ئەگەیێنیٚ ، کە لەمەفهومی ئەبەدی یەتەوە نزیکە ، بەلاٚم بەرانبەریش نیە لەگەلٚی ئەزەلی یەتدا (ئەزەلی یەت» واتە هەربوە «ئەبەدی یەت» هەرئەبیٚ .

جائەلٚیٚ ، بەرانبەرە لەگەلٚی «نەفاد» دا ، واتە تەواوبون و دوایی هاتن وەهیچی لیٚ نەمانەوە دا دیٚت . خوا ئەفەرمیٚ «وَما عِنْدَکُمْ یَنْفَدُ وما عِنْدَ اللهِ باقٍ» . کەواتە ، دەرئەکەویٚ بەقاو نەفاد لەعەرەبیدا لەدژی یەك دیٚن فەنایش تیاچونە ، نەك شوێنەما نەمانی تەواووکوژانەوە ، ئەوەش ئەمریٚت فانی یە بەلاٚم ئیسك وپروسکی ئەمێنیٚ .

لێرەدا بەوجۆرەی من خۆم بۆم روون بویەوە فەنا دوو بابەتە ، بابەتێکی ئەوەتە کەبەدەستی بەندەیە ، وەئایا بەندە لەسلوك و خۆپیٚگەیاندن و خۆوەرزاندن و نەفس کوشتنا ، تاچ رادەیێك زالٚ ئەبیٚ بەسەری فەناکردن و لەناوبردنی هەستەناپاك و ناشایستەو ناپەسەندەکانی دەرونی خۆیا ، وە بەقاکەشی بریتی یە لەوەی تاچ رادەیێك ئەتوانیٚ ، هەستی چاك وپەسەندوباش بکاتە جیٚ نشینی هەستە خرابەکان ، ئەمربەمەعروف و نەهی لەمونکەری ، تاچ رادەیێك پیٚگەیاندوەو بوەتە خووخدەی ، نەفس و شەیتانی تاچ رادەبیٚ دورخستوەتەوەو ویستی خودادۆستی ی و خواپەرستی ی لەدەرونا گەشە پیٚدابێت ، تاریکی ی تاچ رادەبیٚ لەدلٚی دورخستبێتەوەو روونا کی ی لەدلاٚ جیٚ گیرکردبێت ، چەن لەشەیتان دورکەوتوەتەوە چەندلەخوا نزیك بوەتەوە ، لەپاشان چەن خۆیو هەموی جیهان و هەموی ئەم چاك و خراپانەشی لەبیربردوەتەوەو ، خووخدەی داوەتەهەق ، بەجۆرێك مەحەبیەتی ذاتی هەق ، وەبێزاری و دەرچون لەخەلٚق ، وای لیٚ کردبێت هەرنەزانیٚ خۆی کێیەو چی یە ، وە جگە لەخودا هەموشتێکی ،تەنانەت ناوی خۆیشی ، لەیاد چوبێتەوە ، جا لەهەرکام لەوپێناسانەدا

گەیشتبێتە رادەیێك خراپەكانی لەصەداصەد نەمانێ، وەلەیادیچوبێتەوە، وا لەوپێناسەدا گەیشتوەتە پایەی فەنا، ; وەئەمی تریشیان كە لەدەرونا دایمەزراندوە، یان لەدەرونا ماوەتەوەو جێگیربوە «لەوشتەدا گەیشتوەتە بەقا، یان بڵێین ئەوشتە پەسەندەی گەیشتوەتە بەقا، ، ، ، ، ، داكۆكی بۆماڵ‌وسامان بەدەست هێنان، ئەوهەستەی گەیشتوەتە فەنا، وە بەهیچ‌جۆرێ ئارەزووی داكۆكیی نەماوە، لەبەرانبەرا قەناعەتی گەیشتوەتە ئەوپەڕی، بەجۆرێك لوقمەنانێكی بێت، بۆیێخۆر ناگەڕێ: وەهۆشی هەروالای خواپەرستی. كەواتە قەناعەتەكەی گەیشتوەتە بەقا واتە (**بەقایقەناعەت وەفەنایحیرص**). نمونەی دووهەمی فەناوبەقا بریتی‌یە لە مەقامە مەعنەوییەكەی، ئەم فەناوبەقایە «یان خەڵاتەو خوا دادەیە، نەك‌شتی‌بێت ڕێبوار بتوانێ بەدەستی‌بیرێت، وەكوئەوەی بڵێین ئەگەر ئەوەندە ذیكرت‌كرد یان ئەوەندەساڵ ڕیازەت كێشا، یان‌گەیشتیتە فلان مەقام، ئیتر بێگومان ئەگەیتە فەناو پاشانیش بەقا، بەم‌جۆرە نیە، بەڵكو زۆری واهەیە هەموی تەمەنیشی لەم ڕێگەدا بردوەتەسەرو ئەو حاڵەتانەشی بەسەرا نەهاتوە، یان هی‌واهەیە هەر لەحاڵی‌فەنادا ئەمێنێتەوەو بەقای بۆنایێت، هەروەكو شاهی‌نەقشبەند. ئەفەرمێ: چەندین‌شێوەی‌هەیە، هی‌واهەیە، لای‌وایە **فەنا** هەرئەوەتە: لەكاتێكا هێمان سەرەتای كارە. لەكاتی‌باسی كەمالیشدا وتم، لای شاهی‌نەقشبەندوایە: ئەوانەی كە كامیلن ئەگەر لەڕوانگەی جەلالەوە بەكەمال گەیشتبن، وا هەتاهەتایە هەرلەحاڵی فەنادا ئەمێننەوە، كاریشیان‌نابێ بەسەری پەروەردەكردنی مورید (**ڕێبوارە**) وە، وە لەدەریای (**حیرەت**)دا لەفەنادا جێ‌ئەگرن. مەبەست ئەوەتە ئەم بەقاوفەنایەیان، لای‌من جیاوازە لەو بەقاوفەناكە: چونكی‌لەوی‌ترا وەكو لە ریسالەی‌قوشەیری، یان، لە (**التعَرّفُ لِمَذْهَبِ اَهْلِ التَّصوف**) یان زۆرێك لەسەرچاوەكاندا باس‌ئەكات، ئەكرێت مرۆڤ لەیەك‌پێناسا فەناوبەقای بۆبێت، بۆنمونە لەریسالەدا ئەڵێ، «**وَمَنْ زَهَدَ فِي دُنياه بِقَلبِه يقَالُ فَنى عَنْ رَغبَتِه. فِاذِا فَنى عَنْ رَغْبَتِه فيها بَقى بِصِدْقِ انابَتِه. هتد**» جا ئەمە لەكوێ ئەوە لەكوێ كەحاڵەتی‌جۆراو جۆری مەعنەوی‌و كەشفی بەسەرابێت‌و هەمو «**حەظظێكی**»، واتەبەشێكی دەرونی‌و نەفسی لەم‌جیهانەدا نەمێنێ خۆیشی لەیادبچێت وەهەستوشوعوری لانەمێنی وەفەنابێت‌و هەرخودای‌لەیادبێت، لەپاشان، فەنا كەیشی وەخۆیشی لەیادبچێت، تەنهاخودای‌لەیادبێت، وەكو ئەوەی، كابرایێ چوبۆلای بایەزید وتی‌چیت‌ئەوێ، وتی هاتوم بۆلای بایەزید، وتی‌بایەزید كامە، بایەزید كێیە؟

منیش بۆی ئەگەڕێم. لەوکاتەدا ئەوبایەزیدیشی لەیادنەماوە، جابری شەطەحات، واتەقسەی بێمەعنا: یان کەس لێ‌حاڵی نەبو، یان خیلافی‌شەرع، لەزمانی ئەوکەسانە دێتەدەر ئەوانەی لەم حاڵانە ناشارەزان، بێ‌بەزەیی‌یانەو، نادادگەرانە، تاوان‌باریان ئەکەن بەکوفرو ئیلحاد، یان ئەڵێن تەصەووف حولول، یان **(اتحاد)** یان **(وەحدەتی‌وجود)** ی تیایە. لەکاتێکا کەهاتنەوە هۆش هەزار استغفار وپەشیمانی ئەکەن. ئەگەر بۆیان بگێڕنەوە کەشتی‌وایان گوتوە، جا لەبەری‌ئەوەتە ئەڵێن ڕێبواران هەمو لەخواداوائەکەن. فەنایان کەم بێت، هەرچەن فەنا بە**(مەرحەلەو)** قۆناغو هەوارگە دانراوەوبە «**تەلوین**». نەك‌بەمەنزڵ: بەڵام (بەقا)، مەنزڵەو جێگەی تەمکینە. هەروەکو مەولەوی بەشیحی سیرا جوددین ئەڵێ:

جە شەوهەوارگەی فەنا وپەردە
پای هەردەی بەقا باتاخگە کەردە

واتە ئەی‌ئەوکەسەی کە لەشەوهەوارگەی فەناتێپەڕبوی وەلەهەردی بەقادا مەنزڵت گرتوەو دامەزراوی. ئیستە ئەگەڕێینەوە سەرێ ڕیسالەی قودسیە بزانین شاهی نەقشبەند چی ئەفەرمێ. ئەفەرمێ گوتویانە فەنا بریتی‌یە لەدوایلەو دواقۆناغی (سَیْرٌ إلَى الله). (**واتەڕۆیشتن بۆگەیشتن بەحەق**)، وە بەقا بریتی‌یە لەسەرەتای دەس‌پێ‌کردنی «**سیرفي الله**». واتە گەیشتن بەمراز وەئیتر بەهرەمەندبون لەنوری حەق. وە بەرخورداربون لەوکەماڵات‌ودەس‌کەوتانەی کە لەو نزیکی‌یە، دەس ئەکەوێ.

لەپاشان ئەفەرمێ «**سَیْرٌ إلَى الله**» کاتێ تەواوئەبێت کە ڕێبور لەمەنبەند «**وەتەن**»ی هەمیشەیی خۆی. وەلەهەموبەشێکی ئادەمی‌زادی‌یەت. بێتەدەرەوەو، خۆی‌دامالێ. وە لەڕێبازی ئاواتدا ڕوبکاتە خواو، ڕوەو خودای‌خۆی کورانە ڕێگە ببڕێت. وە دەشتی زیندەگی. بەهەنگاوی ڕاستی شەق کات، تائەگاتە کەعبەی ئاوات. بۆڕوون‌کردنەوە ئەڵێم مەڵبەند، یان وەتەن بەجێ‌هێشتن، دەس‌نیشانە بۆئەوقاڵبی ماددی‌جیسمە کەگیانی‌تیایە، واتە بەهیچ‌جۆری هۆشی پاراستنی طەبیعی، یان‌پێوەندی طەبیعی بەخۆیەوە نەمێنێ، بۆنمونە. وەکوسەرخۆش، یان نوستو، لێرەدا ئەم‌شیعرە نوسراوە کەئەڵێ. «**إلَيْكَ يَامُنْيَتِي حَجِّي وَمُعْتَمَرِي، إذْ حَجَّ قَوْمٌ إلَى تُرْبٍ وَأحْجَارِ**» ئەڵێ: ئەم «**سير في الله**» واتە، ڕێگابڕین بەیارمەتی خودا. وە بەیارمەتی

نوری‌خودایە، پاش «**فنای مطلق**» کەبریتی‌یە لەفەنای «**صیفات وذات**» واتە فەنای «**پێناسەکانی مرۆڤ وە مرۆڤ خۆی**»، کاتێ دێتەدی‌کە «**وجودی‌حقانی**»، واتە وجودی ڕاستەقینە. یکەنەخەلاٚنی، تا بەو وجودە حەققانی‌یەی؛ بەرزبێتەوە بۆجیهانی ڕازانەوە بەپێناسە خودایی‌یەکان، وە ڕەوش هاتنەسەری ڕەوشی خودایی، «**واتە ڕەفتارو کرداری ئەبێتە ڕەفتارو کرداری خودایی**» خوا چۆنی پێ‌خۆشە وائەبێت، وەپێناسەکانی خوا، ئەوەی کەبۆ بەنی‌ئادەم دەس‌ئەدات لەودا ئەدرەوشێنەوە، جا ئەمەتەئەو پایەی کەخوا ئەفەرمێ «**بی‌یسمع وبی‌ینطق، وبی‌یبصر وبی‌یبطش، وبی‌یمشی، وبی‌یعقل**» لێرەدا ذات‌و صیفاتی فانی‌بوی ئەوکەسەی کەوالەحاڵی فەنادا، ئەمجارەیان لەناوی نوری هەق‌دا ئەدرەوشێتەوە وە «**تەصەووف جەذبەی هەق**»واتە بەکارگرتن وهەڵسوڕاندنی ئەو، وەراکێشان بۆلای خۆی واتە بۆلای خودایە زۆرئەسێنێ بەسەری دەرونی بەندەدا، ئەمەش وەکو ئاسنێك بخرێتە کورەیێك هەرچەن حاڵەتی ئاسنی خۆی لەدەست‌نەداوە وەهەرچەن نەیش‌بوەتە ئاگر، بەلاٚم، (**صیفەت**)، واتەپێناسی ئاگر کە سوتاندن‌بێت بوەتە هی‌ئەمیش، یان هەر چڵێ‌دار، لەکاتێکا کەدارە وە خاوەنی‌پێناسی خۆیەتی، کە کەوتە ناوی ئاگرەوە خۆی‌ئەبێتەئاگر، کە کوژاندتەوە نەدارەو نەئاگر، ئەمە هی‌جی‌بو؟ هی کارکردی ئاگرەکەیە لەودا، بەلاٚم فەرق لێرەدا ئەوەتە ئەم نزیکی‌یە نزیکی‌ی ماددی، یان نزیکی ذات لەذات «**واتە کەس لەکەس**»؛ نیە، بەڵکو، فەنایێکی مەعنەوی‌یە؛ کەنمونەی بچوکی فەنای دایکوباوك، یان خۆشەویستانێکی زۆرخۆشەویستە، کە لەخۆشەویستەکەدا، وای‌لی‌دێت ڕەوش‌وهەڵسونیشتیان وای‌لی‌دێت ئەوخۆشەویستە چی‌بکات، یان‌چی‌پی‌خۆشە، ئەمیش وا ئەکات، مەبەست لەوحاڵەتی فەنایەبو، بەلاٚم حاڵەتی ئاگر بۆسەری ئاسنی‌سارد کەئەیکات بە ئاسنی سورەوە بو، بەبی‌ئیرادەو ویستە «**لاارادی**» یە، چونکە خۆئاگر ویستی‌نیە، هەروەهائاسنەکەیش، بەلاٚم لێرەدا ئەم‌بەندەیە ویستی هەیە، ویستی‌ئەوەتە لەخوانزیك‌بێت، خوا لەخۆی ڕازی‌کات، فەرمانی‌خوا بەجی‌بێری، ئەفەرمێ، «**وَاسْجُدْ واقْتَرِبْ**»، لەکێ «**واقترب**»، خوا نەجیسمە نەمادە، نەذاتی‌ئەو جێوشوێن‌و شێوەی‌هەیە «**لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ**»، یان کەئەفەرمێ «**وَنَحْنُ اَقْرَبُ اِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الوَرِيدِ**»، کەواتەنزیکی‌هەیە، هەرچەن ماددی نیە، وەزۆرنزیکیش، کەبریتی‌بێت لەرەگی «**وەرید**». مەبەستم ئەوەتە، کاتێ سۆفیەکان ئەڵێن. فەناو نزیکی‌ی، وانەزانرێ ئەم نزیکی‌یە حاڵەتی ماددەیی هەیە، هەروەها نەوترێ چۆن، ئەو «**صیفاتانە**»، پێناسانەی

خودا خەلآتی بەندەئەکرێن، ئەمەوێ بڵێم وەکو ئاگرەکە، یان وەکو خۆشەویستی یەکە، یان، وەکو ڕووناکی، کەپێناسی هەتاوە بەلآم مانگ لەوەوە بەشی وەرگرتوە، خۆ نزیك تر ئاوێنە، چۆن لەتیشکی ڕۆژ بەهرە وەر ئەگرێ، بەڵام ئەم بەهرەوەرگرتنە، کەیە؟ کاتێ کەهیچ بەرگرێك لەنێوانا نەما، ئەگەر هەربویە مانگ و ڕۆژ خۆیان، خۆ کەئەرز کەوتەبەین، ئیتر ئەوپەیوەندە ئەپچرێ، شتی مەعنەویش، شتی مەعنەوی، ئەکەوێتەبەینی، کەسێکت زۆر خۆش بوێ، چوارجنێوت بداتێ، یان بەجۆرێ هەڵسێ، دژی ویستی تۆبێت، دڵت ئێشێ، دیارە کاتێ ئێمە نافەرمانی خودابکەین ئەوەئەبێتە «ڕەین»، واتەژەنگ، بەسەری دڵەوە، وە لە خوامان دورئەخاتەوە، کاتێ دڵ حەسەدو کینەو خۆبەزل زانین و ئەوجۆرە پێناسەناپەسەندانەی تیابو، ئەبنەهۆی دووری، پێچەوانەکەشی ئەبێتە هۆی نزیکی ی، وە ئاوێنەی دڵ لەشاراوەی دەرئەخات، وە لەژووری تاریك دێرێتیەدەرەوە، بۆبەری تیشکی هەتاو، ئەوهەتاوە کە لێی دا، ئەویش برێ لەپێناسەکانی هەتاوەکەی ئەبێتەبەش، لەکاتیکا هەتاو خۆی لەوی نەداوە بەڵکو پێناسی هەتاو، کەڕوناکی و گەرمی یە، لێ یان داوە، ئەگینا هەتاوەکە ملیونهاکیلومەتر لەوئاوێنەوە دوورە. هەموی ئەم ڕاڤەیە بۆئەوەبو وانەزانرێ ئەو فەنایە فەنای ذاتە لەذات دا، وە ئەونزیکی یە نزیکی لەشێك یان «جیسمیکە لەجیسمیکەوە» بەڵکو نزیکی یێکی مەعنەوی یە.

لێرەدا ئەڕۆینەوە سەری فەرمودەکانی، بەهائوددینی نەقشبەند، وتمان «تەصەرروفی جەذبەی هەق»، پەروباڵ ئەکێشێ بەسەری دەروونی بەندەدا، وەدەروونی ئەو ڕێبوارە پاك ئەکاتەوە لەهەرچی گومان و دودڵی و بیری ناشایستەیە، وەهەمو ئەوهەستانە فەنا ئەبن و ئەسوتێن، وەپێناسەکانی خودا خۆی لەدەروونی بەندەدا کارئەکەن، وەئەبنە خاوەن ماڵ، وە وای لێ ئەکەن ئەوکەسە هەرگیز لەخۆیەوە ناتوانێ کاروباری دەرونی خۆی هەڵسوڕێنی، واتە فەرمان ڕەوای دەرونی ئەو، ئیتر ئەوپێناسە تازانەن کەپێناسی خوداوەندن وە لەدەرونی ئەوبەندە پاك و خۆش بەختەدا، مەنزڵیان گرتوە، جا لەم کاتەدا هۆی ناسینی ڕاستودروستی ئەم فەنایە، ئەوەتە ئەو بەندەیە بەرێکوپێکی ی فەرمانەکانی خودا ئەنجام ئەدات وە خواخۆی ئەیپارێزێتو یارمەتی دەریەتی، وەئەگەر هاتو ئەوبەندەیە فەرمانەکانی خودای بەجێ نەهێنا، ئەوە هی نادروستیی ی فەناکەیەتی، لێرەدا، قامك ڕائەکێشێ بۆ فەرموودەیێکی ئەبووسەعیدی خەرراز کە فەرمویەتی «کُلّ بَاطِنٍ يُخَالِفُهُ ظَاهِرُهُ فَهُوَ بَاطِلٌ» واتە ئەوکە سەی لەدڵەوە هۆگری

خودایە، ئەبێ لە رەفتاریشا پەیرەوی لەدەرونی بکات. وەفەرمان بەرداربێت،
پاش برێ باس کردن سەبارەت بە وردەکاری یەکانی فەنا وە حاڵی جۆراوجۆری
سالیکەکان، کەبۆچی لەوحاڵەدا وائەبن وەلەوکاتەدا وایان بەسەردێ، کەنوسینیان
لێرەدا بەزیادەئەزانم، ئەفەرمێ، خاوەنی بەقاوفەناکان، پاش ئەوهەموە رەنج و
ماندوبونەی کەکێشاویانە، ئەگەنە دلنیایی ویجدان، وەسروری چاوپیکەوتن،
وەلەکانی ئەم بە مراز گەیشتنەشا، وان لەوپەری بێمورادیدا، واتە هیچ
داخوازێکی تریان نیە،... وەکو داخوازی **«مەقام وەکەرامات»**، بەڵکو لێرەدا خۆیان
لەدەرخواستی مەقام وکەرامات و ئەوجۆرەشتانە دوورئەخەنەوە، وە پارێزیان
لێ ئەکەن، وە بە بەدی هێنەری، پەردەو دیوار لەنێوانی خۆیان وخوادا، دایان ئەنێن،
وە **«مەشرەبی دڵ»**، واتە لەئارەزوی دڵدا هەرچی ئارەزوی **«جیسمی وروّحی»** یە واتە
ویستی لەشورەوان، هەموی تیائەچێت، وەگەیشتن بەپلەی فەنا نیشانەی گەیشتنە بە
**«حەقیقەتی مەحەبەتی ذاتی ی»**، لەپاشان ئەفەرمێ: فەنا خەلاتێکی تەواوە وەتایبەتی
خواخۆیەتی، وەسونەتی خوایی، واتە **«رەوالّی کاری هەمیشەیی خوا»** بەوجۆرەبوەو
بەوجۆرەیە، کە هەرگیز ئەوشتەی بەشێوەی خەلات دایبێتی بەبەندەکانی، لەوانی
ناسێنێتەوە، جا هەربەم بۆنەوەیە، وتراوە **«الفانی لایُرَدُّ الی اوصافِهِ»** واتە فانی ی
ناگەرێترێتەوە بۆسەری پێناسەکانی لەوەوپێشی، واتە، مادام خوا رزگاری کردوە
لەپێناسی ناشیرین وە ئەوپێناسانەی بەنوری خوداسوتاون وەتیاچون، تازە
زیندوبونەوەو گەرانەوەیان نیە، وەئەوبەندەیەی لەومەقامە تێپەری خوا
لەدنیاوقیامەتدا خۆش بەختی کردوە. هەر لەم بارەوە ذوالنونی میصری ئەفەرمێ. **«مارَجَعَ
مَنْ رَجَعَ الاّ مِنَ الطّریق، وَما وَصَل اِلَیْهِ اَحَدٌ فَرَجَع عَنْهُ»** واتەهیچ کەسێ پاشی فەنا
نەگەراوەتەوە بۆسەری پێناسی ناپەسەندی لەوەوپێشی، ئەگەر کەسێ گەرابێتەوە،
لەرێگەدا گەراوەتەوە «واتە، **ئەوشیوودۆڵ و بەرزوهەڵەتانەی، وتم شاهی نەقشبەند ئەفەرمێ
وانلەرێگەی ئەهلی فەنادا، وەئیامی رەبیانی لەمەکتوبات دا قامکیان بۆئەکێشی»** جائەلّی
ئەوەی لەرێدا لێی نەقەوماێ، وە گەیشتبێتەمەنزل، تازە گەرانەوەی بۆنیەو رزگاربوە.

جا سەبارەت بەم باسە، بەهائوددینی نەقشبەند ئەفەرمێ، **«وجودی فەنا بوو
هەرگیزناگەرێتەوە بۆ وجودی بەشەری یەت» «ئەولەشەی یان ئەوگیانەی، فەنای بەسەراهات،
تازە ناگەرێتەوە بۆچۆنیەتە ئادەمیزادیەتەکەی جارانی، ئەلّی، مەقامی (فەنای موطلەق)**،
هەرچەن خەلاتی خودایی یە، لەگەڵ ئەوەشا ئەم مەقامە بە **«تەدریج»** پلەبەپلە و،

ورده‌ورده، به‌پێی. به‌دیهاتنی مه‌رجه‌کانی دێته‌دی، وه‌مه‌رجی گه‌یشتن به **«فه‌نای موطله‌ق»** ئه‌وه‌ته، ئه‌وکه‌سه به‌هه‌مودڵ‌و تواناییێکیه‌وه رووبکاته خودا، رووکردنێك که له‌خۆشه‌ویستی‌ی ده‌رونی‌ی، وه‌دوری‌گرتن له‌هه‌رشتێ که‌خوا پێی‌ناخۆشه سه‌رچاوه بگرێت.

وه‌مه‌به‌ست له‌م فه‌نایه، فه‌نای لاینی ئاده‌می‌زادبونی ئه‌وکه‌سه، وه خووخده‌کانیه‌تی، وه ده‌رکه‌وتن‌و هه‌ڵهاتنی ده‌سه‌ڵاتی خوداوه‌ندی وه حه‌قیقه‌ته، **«لێره‌دا، ده‌س‌ڕائه‌کێشن بۆباسی سوربونه‌وه‌ی ئاسن که‌باسیان‌کرد»** ئه‌ڵێ ئاسن له‌گه‌ڵ‌ئه‌وه‌شا هه‌موشتێکی له‌ئاسنی‌ی نه‌که‌وتوه به‌ڵام چونکه له‌کوره‌دا سوربوه‌ته‌وه پێناسه‌کانی ئاگری وه‌رگرتوه، لێره‌دا ده‌س بۆئه‌م‌شیعره فارسی‌یه ڕائه‌کێشێ، که‌ئه‌ڵێ:

**تونونه‌شه‌وی وه‌لیکن‌ئه‌رجه‌هد کونی**
جای برسی که‌زتو توئی بدر خیزد

ئه‌ڵێ، به‌ڵی‌دیاره تۆبه‌نده‌یت، وه‌قه‌ت نابیته‌ئه‌و، به‌ڵام ئه‌گه‌ر تێ‌کۆشیت، تۆیش ئه‌بیته شتێ‌بۆخۆت.

جائه‌فه‌رمێ، ڕێگاو ده‌سه‌ڵات‌و بردی ئاوه‌زو زانیاریی، تا، که‌ناری ده‌ریای فه‌نا برئه‌کات، ئیتر له‌وه‌ولا، سه‌رسورمان‌و په‌رێشانی‌یه، سه‌یرئه‌وه‌ته، ئه‌م به‌هره‌و ئه‌م‌خه‌ڵاته دوایی نایێت، وه نه‌براوه‌یه، وه‌هه‌رده‌مه‌ی جۆره‌ده‌س‌که‌وت‌وپێش‌که‌وتنێکی هه‌یه، وه‌هه‌تاهه‌تایه هه‌ربه‌رده‌وامه، وه‌له‌وه‌ولای جگه بۆئه‌وکه‌سانه نه‌بێت که له‌و به‌هره به‌رخوردارن وه‌خۆیان ڕێبواری ئه‌وڕێگه‌ی خۆش‌به‌ختی‌به‌ن، بۆکه‌سی‌تر نه‌زانراوه‌و نازانرێ، وه‌باسیش‌ناکرێ.

ئه‌فه‌رمێ لێره‌دا سه‌ره‌تای چاوپی‌که‌وتنی جیهانی وه‌حده‌ت، وه وه‌حدانیه‌ت ده‌س‌پی‌ئه‌کات.

لێره‌شا برێ ورده‌کاری‌تر باس‌ئه‌که‌ن سه‌باره‌ت، به‌جیهانی وه‌حده‌ت وه‌وه‌حدانیه‌ت، که ئێمه له‌باسه‌که‌مان دوور ئه‌خاته‌وه، له‌به‌رئه‌وه به‌پێویستم نه‌زانی، له‌پاشان ئه‌فه‌رمێ، پاش‌گه‌یشتن به ده‌ره‌جه‌ی (**فنائی الله، وه بقابالله**)، وه‌نه‌بێ هیچ‌جۆره سپارده‌یێك له‌سه‌ری ئه‌وکه‌سه لابرێت، به‌ڵکو ئه‌وبه‌نده‌یه هه‌روه‌کو له‌وه‌وپێش ئه‌بێ سپارده ئایینی‌یه‌کانی به‌جی‌بێرێت.

ئه‌ڵێ ئیبراهیمی شه‌یبانی که له‌پیاوه‌گه‌وره‌کانه ئه‌فه‌رمێ، **«عِلْمُ الفَنَاءِ والبَقَاءِ يَدُورُ عَلَى إِخْلاصِ الوَحْدَانِيَّةِ، وَصِحَّةِ العُبُودِيَّةِ، وَمَاسِوى ذٰلِكَ مَغَالِيط وزندقة»** واته، زانیاری‌ی

بەقاوفەنا بەسەری ئیخلاصی خواناسیو خوابەیەکزانی وە ئەنجامدانی ڕەوشی بەندەگییەوە هەڵئەسوڕیٚ، هەرچی لەمە بەدەربو دەسبڕینو، زەندەقەیە جا وشەی فەنای فەنایش، لەکاتی باسی فەنادا دێتە پێشەوە، وە ئەڵێن ئەبێ ڕێبوار فەناکەشی فەناکات، وە لەیادی بەرێتەوەو تیایبات، لەمبارەوە ئەفەرمیٚ فەنایفەنایش ئەوەتە، هەروەکو «وجودیجیسمانی» فانیبوە، واتەهەستەجیسمانییەکانی مرۆڤ تیاچوون، وجودی ڕۆحانیشی فەنابێت، هەروەکو وتمان دەرخواستی ڕۆحانیشیٚ نەمێنیٚ، وەکوپێخۆشبونی مەقامی مەعنەوی، وەکەشفوکەرامەت، تەنانەت پاداشی بەهەشت، وەئەمدەرخواستە ڕۆحییانە، بۆئەوەی چاوپیٚکەوتنی جەلالیخودا وەکەشفی عەظەمەتی خوداوەندی بەسەریدڵودەرونا، دنیاوقیامەتی لەبیرباتەوە، ئەوکاتە پایەومەقامی مەعنەویش ئەبێتە هیچ بەلایەوە، عەقڵو نەفسیش فەنائەبن، جا ئەوکاتەیە کە فەناکەیشی فەنا ئەبێت، واتە هەستی لایئەوەش نامێنی، کەخۆیگەیشتوەتە مەقامیفەنا، وەئەممەقامە هۆیسەربەرزی یەو سەرەفرازی، جا هەرلەمکاتەدایە کەزمانی دێتەگوفتاری هەق وەلەشی وەکوخۆڵ ئەکەوێتە سەریزەوی، وەسەری بەندەگی ڕاستەقینە شۆڕئەکاتەوە، وەئەمفەنایە هەموی بریتییە لەسەرسورمانو وبێنیشانی، واتە «خۆبەهیچزانی».

لەشاهینەقشبەندیانپرسیوە، فەنا چەنجۆرە یان چەنبارە، ئەفەرمیٚ، فەنا تەنها دووجۆرە، هەرچەن وتراوە کەجۆری زۆرە، بەڵام، لەگەڵئەوەشا هەموی دێنەوە ژێری فەرمانو ناوی چوارچێوەی ئەمدووجۆرە.

یەکێکیان، فەنایە لە «وجودی تاریکی طەبیعی»، واتە ئەمهەستییە چاولیٚکراوەی کەلەپێشچاومانە، دوهەمی، فەنا، لە «وجودی روناکی روحانی» ئەمەش، نیشانەیە بۆئەوحەدیثەی کەئەفەرمیٚ «ان لله سبعین الف حجاب من نور وظلمة»، هەرچەن پەردەکان، یانشیوو شورەکانی ئەمڕێگایە، حەفتاهەزاریشبن، بەڵام وان لەدووچوارچێوەی ڕووناکیو تاریکیدا.

جا بریٚ لەگەورەپیاوان وە کەڵەمەردانی کۆڵنەدەر سەبارەت بەم دووپلەگەورەیە فەرمویانە. «خُطْوَتَانِ وَقَدْ وَصَلْتَ» تەنهادووهەنگاوە ئیترگەیشتویتەمەنزڵ، بەڵیٚ ئەوەی مەردبێت، وایە هەر دووهەنگاوەو ئەگات.

شاهی نەقشبەندیش ئەفەرمێ **«ئەم حیجابە بریتی‌یە لە وجودت، لای‌بە، وائگەیشتی،**
**«دَعْ نَفْسَكَ وَتَعالَ»**

ازتو تا دوست رە بسی نیست توی
در راەتو خاشاکو خسی نیست توی.

ئەڵێ ماوەی تۆ تادۆست **«واتەخودا»** ڕێگاینێکی زۆرنیە هەر تەنها خۆتی خۆت وەنەبێ درکودالێ بەسەری ڕێگاوەبێت هەرخۆتی خۆت **«خۆت لابەرە وارێگات پاككردەوەو گەیشتی»** کەبریتی‌یەلەم فەناکردنە. ئەڵێ، گەیشتنی **(خۆش‌ویست بە خۆشەویست) «موحیب بە مەحبوب»** کە دواقۆناغی حاڵەکانە، پاش ئەم فەناو بەقایە دەس ئەدات، وەبەرلەفەنا هەرگیز دەست نادات. هەروەها لەحاڵی فەنایشا **(وصول)** گەیشتن هەردەست نادات، بەڵام پاش فەنا وەپاش دامەرزان لەبەقادا، ئیتر خۆش‌ویست **«موحیب»** ئەگاتە ئاواتی **«وصول»**.

وجود، واتە هەستی موخیب، کە بەهۆی گەیشتن بەخوشەیست **(مەحبوب)** بەقای پەیداکردوە، **«واتە بوەتە خاوەنی مانەوە»** ئیتر بەرگەی زاڵ بونی **«تەجەللای هەق»** ئەگرێت، واتە نوری تەجەللای هەق نایسوتێنێ، بەڵکو گەشەیشی پی ئەکات‌و تینوتاوی تی‌ئەکەوێت.

کەواتە، هێزوتواناپی، بەمرازگەیشتوانی، دیتن **(موشاهەدە)**، ئەپارێزرێت‌و تیاناچێت، هەروەها تێکەڵی کردنی خەڵکیش کاریان تێناکات‌و نایان گۆڕێت، وە هیچ هۆیێکی ئەم جیهانە، ناتوانێ سەرگەرمی‌کا بەخۆیەوە، وەکارێکی لێ‌بکات کەپەیوەندی لەگەڵی خۆشەویست‌دا بپچڕێنێت، چونکە لەناوەرۆکدا هەموشتێ هەربەدەستی خۆیەتی، نە شوهودی‌هەق، واتە، دیتنی هەق **«بەچاوی‌دەرون»**، ئەبێتە هۆی ئەوەی، پەیوەندی لەگەڵی خەڵق‌بپچڕێت، وەکو ئەوکاتەی کە لەحاڵی فەنادابوە، وە نە تێکەڵی‌ی‌خەڵق ئەبێتە پەردەی نێوانی‌ئەوو خودا، وەکو ئەوکاتەی کە نەگەیشتبوە فەنا، بەڵکو هەرکام لەم‌دوانە، واتە هەم خەڵق وە هەم خالیق، لەمەقامی خۆیانا، وە بەش بەحاڵی‌خۆیان، ئەبینێ بێ‌ئەوەی ببنە پەردە بۆیەکتر، لێرەدا فەناوبەقای ئەوکەسە یەکیان گرتوەتەوە، لەفەنادا باقی‌یەو لەبەقادا فانی‌یە.

ئەفەرمیٚ جالەمەولا سەرکەوتن هەر دوابی نابیٚ ، وە بەم‌مەقامانە ئەلێن «سَیْرٌ فی اللە» واتە بەرخورداربون لەخودا ، وە ئەم‌پایە ئەوەندە بەرزە هەرچی مەقاماتی مەعنەوی لەوەوپێشە وەکو تەنهاقوناغێکی سەرەتابی ئەم‌مەقامەتە ، بەڵکو وەکو هیچ وایە ، «شیخ فەریدوددین عەتتار» کەنزیکەی (٦٠٠) ك لەدنیادەرچوە ، سەبارەت بەم‌مەقامە ئەفەرمیٚ .

اندرره‌حق جمله ادب بایدبود ، تاجان‌باقیست درطلب‌بایدبود،
دریکدم‌اگرهزاردریابکشی ، کم‌بایدکرد وخشك‌لب‌بایدبود،

واتەئەبیٚ‌ئەدەب‌بکەیتە پێشەت ، بۆبرینی‌ڕێگەی‌هەق ، وەهەتا گیانیشت‌تیایە ، لەسەری مرۆڤە ، لەتێکۆشان‌نەوەستی‌ئەگەر لەهەر دەمێکادەریاییك‌نوش‌کەیت ، ئەبیٚ بلێیت کەمەو ، دەمت‌وشك‌بێت .

مەبەست‌ئەوەتە «پاش‌گەیشتن‌بەو مەقامە» ئەوەی ئەدەب‌کردنەو داخوازکردن ، وە هەتا لەوبادەیە بۆت‌تێکەن ، هەربلێیت بابیٚ «ساقی‌بۆم‌تێکە .

حاجی شیخ عبد الرحمن نەقشبەندی ، کوری شیخ عثمان سیراج الدین ، کە ... کە لە کەڵەمەردانی گورەپانی تەصەووف ، وە شاعیرێکی بەرزە ، وەدیوانە ... یەکەی لە یادی مەردانی ژمارەدووی ماموستامەلا کەریم‌دا چاپ‌کراوە ، لەم‌بارەوە شیعرێکی‌هەیە کە ئاشکرایە دەس‌کێشانە بۆ ئەو مەقامە وەدیارە خۆی لەومەقامەدابوە ئەڵیٚ :

(عجب درمن‌یزیدعشق عاشق ازچەروگفتە،کەعشق آسان نموداول ولی‌افتاد مشکلها)؟
(وفا عین صفای‌می‌شداست وبازمی‌گوید،الا یا ایها الساقی ادر کاســـا وناولها)

ئەڵیٚ سەرم‌سورماوە لەوعاشقەی کەلەمەزانی‌عیشق‌دا هاواریەتی بەدەستی دەردی‌سەری‌عیشقەوە ، وە ئەڵی عیشق لەپێشا خۆی ئاسان پیشان‌ئەداو کەچی ، گرفتاریی‌زۆری بەشوێنەوەبو ، جائەڵیٚ منی‌عاشق ، بەپێچەوانەی ئەوعاشقەوە ، واتە حافظ ، ئەوەتە (وەفا) یەکپارچەو سەرتاپا بوە بەمەی ، لەگەڵ‌ئەوەشا هەر هاوارئەکەم ، ئەڵێم «اَلا یا اَیُّها السّاقی اَدِرْ کَاْسًا وَناوِلْها» واتە ئەی بادەگێرێکێکی کەم بۆتێکە ، جا ئەوە دەس‌ڕاکێشانە بۆمەقامی بەقای پاش‌فەنا ، کە بەندە لیٚ‌هاتوو هیمەت‌بوڵەندو کۆڵ‌نەدەرو خوا پیٚ‌داوەکان ، دەسیان‌کەوتوەو ، کەوتونەتە ناوی ئەوناز‌ونیعمەتە ، ساقی ئەلەست نازیان‌ئەکێشێتو بۆیان‌تیٚ‌ئەکات لەبادەی

مەحەببەت ، مەقامپاش مەقام وەرئەگرن ، لەگەڵ ئەوەشا هەموگیانیان هەر یادەی مەحەببەتە ، کەچی هەرئەڵێن ، «الا یا ایها الساقی ادر کاسا وناولها» لیرەدا دەس ئەکێشین بۆبری بیروباوەری تری گەورەپیاوانی تەصەووف سەبارەت بە (فەناوبەقا) ، لەکتێبی (التعرف)دا ، (تاج الاسلام کلا بادی) (٣٨٠ك / ٩٩٠م) ئەڵێ ،

الفناء ان یفنی العبد عن الحظوظ فلایکون له في شيء من ذلك حظ ، ویسقط عنه التمیز .

والبقاء الذي یعقبه ، «هو ان یفنی عماله ویبقی بما لله» ، ئەڵێ ، قال البعض ، ان یکون کل حرکاته موافقات الحق دون مخالفاته ، «فانیا عن المخالفات باقیا بالموافقات» واته ، فەنا بەوەئەڵێن ، ئەوبەندەیە لەهەرچی شتەو هەرچی بەشە دەستهەڵگرێت هەم لەعەقڵوهۆش هەم لەداخوازی دنیاوقیامەت لەهیچ شتێکا بەشی نەمێنی ، وە تەمیزی نەمێنی . واتە نەتوانێ قانجازو زەرەری دینیو دنیایی لێك بداتەوە .

بەقایش کەبەشوێنی ئەوادێت بریتی یەلەوەی ئەوەی هی خۆیەتی لەیادی بچێتەوە وەتەنهائەوەی بوخودایە ، لەیادی ئەوەدابێت .

یان هەرچی هەڵسانو دانیشتنیە هەموی بەوجۆرەبێ کەخوایێ خۆشە وە موخالەفەتی نەکات .

دەس لەهەمو کارێکی پێچەوانەی ئەمری خوا هەڵگرێت وە هەرچی خوا پێی خۆشە ئەنجامی دات .

ئەڵێ: یکون فانیاً عن اوصافِهِ باقیاً بأوصافِ الحق .

پێناسەکانی خۆی لەناوبەرێ وەپێناسەکانی خودای بمێنێتەوە . هەروەها ئەڵێت ، «فناءُ عن تعظیم ماسوی الله وبقاءُ في تعظیم الله» ، جگەخودا کەس بەگەورەنەزانێ وەتەنها خوابەگەورەبزانێ ، کتێبی «التعرف» ئەویش ، لەزوانی خەررازەوە ، ئەڵێ «الفناء هو ذهاب حظ العبد من الدنیا والاخرة .» جائەڵێ ، دەس هەڵگرتن لەبەشی دنیا دەس هەڵگرتنە لە هەموپاداشێکی دنیایی ، وەکو سامان یان مەقام وەپاداشی ئەودنیایش بریتی یە لە بەهەشتو ئەوجۆرەشتانە ، جائەبێ هۆشی هەربەلای خۆشەویستیی خوداو ڕەزامەندیی خوداوەبێت وە هەردوجیهان پشتگوێ بخات .

لەپاشان ئەڵێ «منهم من جعل هذه الاحوال کلّها واحدة وان اختلفت عباراتُها .» هی واهەیە هەموی ئەمحالانە واته ، ئەمحاڵە ذووجۆرو دووناوانە هەر بەیەك حاڵ

ئەزانێت ، فەناو بەقا ، جەمع و تەفرەقە ، غەیبەت و شوهود سوکروصەحو ، هەر بەیەکشت دائەنێ واتە فەنا بەقایەو جەمع تەفرەقەیەو غەیبە شوهودەو سوکور صەحوە .

لەپاشان ئەڵێ گەورەپیاوانی وەکوجونەیدو خەررازو نوری ، ئەڵێن ، ئەوانەی کەفەنایان تەواوکردو لێبونەوە تازە ناگەڕێنەوە بۆسەری حاڵی پێشی فەنا ، وەئەبنەپیاوێکی ترو جیهانێکی تریان هەیە ، واتە هەربەپاکیو بە نزیکی ئەمێننەوە ، دیمان شاهی نەقشبەندیش هەرلەسەری ئەوباوەرەبو .

قوشەیری ئەڵێ ، «الفناءُ سقوطُ الاوصاف المذمومةِ ، والبقاء ، قِيامُ الاوصافِ المحمودةِ .»

فەنا تیاچونی پێناسی ناپەسەندەو بەقا دامەزراندنی پێناسی پەسەندە .

لەکتێبی (مَدارجُ السالكين) دا زۆر بەدورودرێژی سەبارەت بە بەقاوفەنا باسی کردوە ، ئەم کتێبەخۆی بریتی یەلەباسی مەقامەکان لەبەرئەوە بەدرێژیو بەشێوەیێکی زانیارانە باسی کردوە ، ئەوەی بیەوێ لەم باسانە باش بگات ئەبێ سەیری کتێبەکانی (معجم ، ومصطلحات ، والفاظ) الصوفيه ، وە مدارج السالکين ومنازل السائرين ، ومعجم الصّوفی ئەلفاظی محی الدين عەرەبی بکات ، ئەمەش کورتەیێکی کورت لەباسەکەی (مدارج) ، ئەڵێ ئەبێ ئەوەی وەلیو عاریفە ، خاوەنی ئەم چوارپێناسەبێت ، کە لەچوار چێوەی وشەی فەرقو جەمع وە کەثرەت و وەحدەت دا کۆبونەتەوە .

ئەبێ فەرق بخەن لەنێوانی ئەوشتەی خواپێی خۆشەو اخوا پێی ناخۆشە ، وەفەرمان ئەدا بەکردنی ، فەرمان ئەدا بەنەکردنی ئەوانەی خۆشەویستی خودان ئەوانەش دوژمنی خودان ، وە ئەمەش بزانن ، خوا یەکێکەو پێناسەکانی زۆرن ، ئەوەش کەثرەتە لەوەحدەت دا .

جەمعی ئەو فەرقەش ئەوەتە بزانن هەموی ئەمانە وان لەژێری فەرمانی قەضاوقە دەری خواو ویستوئارەزوی ئەوا ، کەوابو ئەبێ ئەمانیش چی خواپێی خۆشە وابکەن وەلەچی بێزارەنەیکەن پاش باسێکی درێژ ، ئەڵێت دواپلەی خۆشەویستی بریتی یە لە یەک گرتنەوەی ویستی (موحیب) لەویستی «مەحبوب»دا ، وە فەنای «ئیرادە»ی «موحیب» لە ئیرادەی ، «مەحبوب»دا . ئەڵێ ئەم «اتحاد» واتە یەک گرتنەوەی

ویسته وەئەم فەنایە «فەناو اتحادی» خۆشەویسته تایبەتەکانە، ئەڵێ فەنای ئەمانە ئەو،ئە لەپەرستنی خۆشەویستا فانین وە بێزارن لەپەرستنی کەسی‌تر لەو ئەترسن ولەکەسی‌تر ناترسن ئومیدیان‌بەوەو لەوداوا ئەکەن ئومیدیان‌بەکەس نیەو لەکەس داواناکەن، پشتیان بەوبەستوەو بەکەسی‌تر، ئەوەی گەیشتە ئەم‌فەنایە ئیتر خۆش‌ویستن‌و رق‌لێ‌بون‌و لاین‌گیری‌و دوژمنی‌کردنی هەرلەبەری خوائەبێت، وەئاینی‌ئەو بەنهێنی‌و ئاشکرا هەربۆخودایەو بۆ پێغەمبەری خۆشەویست، وە خوا وپێغەمبەریان لەهەموکەسێ، تەنانەت لەعەزیزترین‌کەس خۆشتر‌ئەوێت.

کاکڵەی ئەم‌فەنایە فەنایە لەنەفسی‌خۆی لەرێگەی رەزامەندیی خوادا، وەئاکامی هەموی ئەمانە، ئەوەتە کە لا اله الا الله بەوپەری زانین‌وتێگەیشتنەوە بەکردەوەو بەقەصد بێرنەدی.

وە ناوەرۆکی ئەم (نەفی‌وئیسباتە)ی لا اله الا الله ئەوە خۆی بریتی‌یە لەفەناو بەقا چونکە بەوشەی لا اله، پەرستنی هەموشتێکی داوەتە دواوەو نەفیی کردوە وە بە وشەی الا الله خوایەتی خوای هێشتوەتەوەو بەقای خوای ناسیوە، وە بەم‌چەشنە هەر درێژەئەدات بەباس.

لە «ئەلفاظ الصوفیە»دا، زۆرشت‌ئەڵێ کە هەر لەوسەرچاوانەی وەرگرتوە، لەگەڵ‌ئەوەشائەڵێ.

فەناوبەقا، بەیەکترەوە بەسراون ئەمیان ئەویان تەواوئەکات. ئەڵێ ئەوەی دەستی لەزەرقوبەرقی دنیا هەڵگرت ئەوە فەنای دنیاکەیەتی کەواتە «لەوەلا بەراستی‌وهەق تیایائەژیت ئەوەش‌بەقاکەیەتی، ئەوەش هەقیقەت باڵی‌کێشابەسەریا و چاوی بەشوێنی کەسی‌ترو هیچی‌ترەوە نابێت، جێگەدار واتە بەدیل وەجێ‌نشینی‌بۆخودا دانانێ وەجگەخوا گوێ بەکەس‌نادات، کەواتە لەخەڵق فانی‌بوە وە بەهەق باقی‌یە.

لەکتێبی «معجم مصطلحات الصوفیە»دائەڵێ:

فەنا گۆرینەوەی پێناسی ئادەمی‌زادی‌یەتە، بەپێناسەکانی خودایی، بەوجۆرەی هەرکام لەپێناسە ناپەسەندەکان لائەبات پێناسێکی خودایی ئەکاتەجێ‌نشینی، تاوای‌لی‌دێت «یکونُ الحقَّ سَمْعَهُ وبَصَرُهُ، کما نَطَق بِهِ الحدیث» خوا ئەبێتە هێزی بیستن

وبینینی ئەو. وەکولەحەدیثی قودسی دایە، ئەڵێ نیشانەی دامەزرانی ئەمفەنایەش ئەوەتە، دەست هەڵگری لەهەڵمەتدان بەملاو بەولادا وەلەئومیدەواربون بەمو بەو بۆبەدەست هینانی قانجاز وەخۆپاراستن لەزیان، بەلکو ئەبێ جگەخوا پەنابۆکەس نەبەی وەداوالەکەس نەکەی ئەربەوجۆرەت لێهات وافەناکەت تەواوە. هەروەکو وتم باسەکە زۆردوورودرێژە، کورتەکەی ئەوەتە لەپێشا باسم کرد وادووجۆر فەناهەیە، یەکێکیان، خەلاتێکەو خوائەیدات ئەویش بریتی یە لەحاڵوئەحواڵێك کەبەسەری خاوەن مەقامەکەدا دێت مەگەر هەر خوا بیزانێت وەبرێ لەبارەیەوە باسمان کرد، دووهەمیش، تێکۆشانەکانی بەندەیە بۆئەوەی شایستەبی ئەومەقامە پەیداکات ئەویش بریتی یە لە خۆرازاندنەوە بەو هەموە پێناسانەی کەباس کران، ئەبی مرۆڤ ئەوهەموەپێناسە ناپەسەندانە فەناکات وەلایان بەرێ وە پێناسە پەسەندەکان بەدەست بیرێتو بیان هێڵێتەوە، بەقایان بداتێ، تاشایستەبی نزیکی ی لەخوا پەیدائەکات وەخودا لەپێشا لەهەوارگەی فەنادا ئەیکاتە میوان تاماوەیێك لەپاشان بۆهەتاهەتایە لەمەنزلی بەقادا جیگەوریگەی تایبەتی ئەداتی، وەبەناوی یەکێ لەخۆشەویستان لەمانومردنا لەونازونیعمەتو ریزوپایەیە بەرخوردار ئەبێت.

«ذلك فَضْلُ الله يُؤْتِيهِ مَنْ يَشاء».

## «تَوحِيد»

(**تەوحید**) لەروانگەی ئیسلامەوە بریتی یە لە خودا بەیەك ناسین، واتە ئەوکەسەی شیاوی پەرستشەو ئەبێ کورنوشی بۆبەریت، وە بەدیهێنەری گیان دارانو بێگیانەکانە وە بەدیهێنەری وێنەو کەونە هەموی، ئەوەی ئێمە عەقڵمان پێی بشکێتو ئەوەش لەوزەی ئاوەزی ئیمەدا نەبیت، بێ وێنەو بێ نمونەیە وەهەروەکو خۆی ئەفەرمێ «لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَئ»، «**تەوحید**» ئەوەتە بەزوان بڵێیت «**لااله الاالله**» وە بەدڵیش باوەرت لەسەری ئەوەبێت، کە، کەس خودانیەو شیاوی پەرستش نیە «**الله**» نەبێت، خودا خۆی فەرمان ئەدات وەئەفەرمی «**قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ اللهُ الصَّمَدُ. لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يولَد. وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أحَد**» لەبارەی خودای گەورەوە لەپیغەمبەر پرسیارکرا، جا، وەحی، «**سروش**» هاتەخوارەوە، وەئەمسورەتەی هانی بۆوەلامی ئەو پرسیارە.

بێ‌گومان «**تەوحید بەرانبەر، بەشیرك یان بەكوفر وە ئیلحاد هاتوە**». شیرك واتەهاوبەش بۆخودا دانان، سا، یان یەكێك یان دووسێ یان‌هەزار، كوفر دژ ی باوەڕە، كوفر داپۆشینی شتێ ڕاستە، كوفر بەنمەك‌حەرامی و نمەك‌نەناسی ی، واتە كوفری‌نیعمەتیش ئەوترێت. شیرك هاوبەش دانانە بۆخودا، وەكو ئەوانەی (**بوتە**)كانیان دائەنا بەشەریك بۆخودا، واتە ئەمان پەنایان‌ئەبرد بەوان، كەئەوانیش پەنا بەرن بەخودا یان، ڕیاپی‌كردن، لەخوداپەرستی‌دا، وەكو ئەوەی نوێژو چاكە بۆئەوەبكەی خەڵك بەچاكت بزانن، ئەوەخۆی شیركە، واتە شەریك بۆخودا دانانە، یان‌بری‌جار یارمەتی داواكردنی ڕاستەوخۆی لەپیرو مورشیدو پیاوچاكێكی زیندو یان مردو، ئەوەش هەرشیركە، وەكوئەوەی بڵێیت: ئەی‌پیاوچاك یان ئەی مەرقەدی فلان، فلان‌شتم لەتۆ ئەوێت: ئەمە ئەگەر بەونیازە بێت كەئەو پیاوچاكە: یان ئەو خاوەن مەرقەدە: كارەكەت بۆبكات، ئەوە هاوبەش بۆخودا دانانە، بەڵام ئەگەر بەو نیازەبێت ئەو بەندەیێكی خۆشەویستی خودایە: ئەویش داوات‌بۆبكات لەخودا ئەوەئەكرێت، لەگەڵ‌ئەوەشا ئەبێ باوەڕت‌لەسەری ئەوەبێت خودالەخۆیشتەوە نزیكە، ئەبێ ئەوەش‌بزانێ ئەوپیاوچاكە، یان ئەو خاوەن‌مەرقەدە گوناهی لەسەر نیە: چونكە ئەوچ‌بكات، كەتۆخۆت نەزانی: بەپێی فەرمانی خودا هەڵسوڕێت: شتەكە زوزناسكە، وەئەبێ لەكاتی زیارەتی پیاوچاكانی زیندو، یان مردودا: مرۆڤ زۆر هۆشیاربێت: تابەخۆڕایی نەبوبێتە موشریك وەئاگای لەخوێ نەبوبێت.

•

«**ئیلحاد**» خودا نەناسین‌و، دان بەوجودی خودادا نەنانە، وەزۆر، بەنی‌ئادەمی وا هەن لایان وایە، ئەم كەونە، وەئەم هەموە گیان‌دارانە: هەروا لەڕێگەی هەڵكەوتەوە • هاتونەتەدی: وە هەرلەخۆیەوە، ئەم جیهانەو ئەم‌كائناتە، هەڵ‌ئەسوڕێ: وە ڕێك‌خەرو هەڵسوڕێنەرێكی نیە، بەڵێ لەكاتێكا باوەڕناكات بەوەی بزمارێك، وەیان جەڕو جێگا جەڕیك، لەخۆیەوە بەرڕێكەوت دروس‌بێت، كەچی لای‌وایە خۆی وەبەدەنی‌خۆی: بەوهەموە دەسگا سەرسوڕێنەرەوە، هەرلەخۆیەوە بەهەڵكەوت، دروس‌بوە، بەڵێ ملیونها كەس ئابەم‌جۆرە سەرلی‌شێواون، وەئەڵێن، چۆن فرۆكە، یان تەلەفزیۆنیك لەخۆیەوە دروس ئەبێ، بەڵام لەم‌لایشەوە لایان‌وایە دروس‌كەری فرۆكەوتەلەفزیۆنەكە كەئادەمی‌زادە هەرلەخۆیەوە بەهەڵكەوت دروس‌ئەبێت، !!!!!

کەواتە، «تەوحید» بریتی‌یە لەپێهاتنی بەزوان وەبەباوەر بەوەی کەخودا یەکێکە، «لاالە الاالله» وە باوەریش لەسەری ناوەکانی‌خودا، وەکو رەحمان، رەحیم، صەمەد، خالیق، وە ۹۹ ناو هەن کەناوی خودان، هەروەها باوەرە بە «صیفات» ی خودا، واتە پێناسەکانی، کەبرێ لەو پێناسانە هەرهی‌خودا خویەتی، وەکەسی تیابەشدارنیە، وەکو «خالق، محُی، ممیت، مبدئ، معید، عالِمُ‌الغَیْب.» بەلام، پێناسی‌وای‌هەیە کەبەندەکانیشی تیایانا بەشدارن، بەڵام لەگەلْ ئەوەشا لەچۆنیەتی‌شتەکەدا فەرق‌هەیە، وەکو «رب الشئ» واتەخاوەنی‌شتێك، ئەڵبەت‌چۆنیەتی خاوەن بون، فەرق هەیە، ئەوجۆرەی خودا خاوەنی‌منە، من خاوەنی خانوەکەی خۆم نیم، من پاش‌ماوەیێك ئەمرم، وەخانوەکەم ئەبێتە هی واریث، بەڵام خودا نامرێ، وەهەتاهەتایە خاوەنی‌هەموشتێکە، چ‌ئەوشتە مابێت یان‌مردبێت، یان، کەریم، واتە سەخی کەناوی خودایە، وەپێناسیشەبۆی، وە مروڤ‌وایش‌هەیە کەریمە، بەڵام ئەم‌بەخشندەیی‌یە لەکوێ، وەئەو لەکوێ، پێناسی وایش‌هەیە هی‌بەندەیە کەخودا لەوجۆرە پێناسانە دورە، وەکوپێناسە ناپەسەندەکان، وەکوحەسودیی یان هەرکردەوەیێکی ناشیرین.

کەواتە «تەوحید» هەم دان‌نانە بەوجودی‌خالیق وەهەلْسورێنەری ئەم‌کائناتەدا، وەهەم ئەوەتە بە تاکوتەنهای بزانین، کەهەر خوی خاوەنی هەمو جیهانێکە وەهاوبەشی‌نیە، وەهەم خاوەنی پێناسی تایبەتی خۆیەتی، وەهەم هیچ‌شتیکی‌تر لەوێنەی ئەو نیەو نابێت.

لەقورئانی پیرۆزدا «ئایاتی‌تەوحید» زۆرن، لەکتێبی، «المعجم الصوفی» «د. سعاد حکیم» دا کەکتێبێکی هەزارو سێصەد لاپەرەیی‌یە، وەهەموی بریتی‌یە، لە «مصطلحات» ی، شیخ محی الدینی عەرەبی، لەم‌کتیبەدا لەباسی ووشەی، «تەوحیدا» «۳٦»، ئایەتی نوسیوە وەئەڵێت شیخ محی الدین ئەم سی‌وشەش‌ئایەتەی نوسیون وەتیایانا پیشانی‌داوە کەخودای‌گەورە لەسی‌وشەش داڕێژراودا، ووشەی تەوحیدی داڕێژاوە، کەهەریەکەیان بەجوری شێوەی تەوحید روون ئەکەنەوە، (شیخ محی الدین)، بۆهەرکامێ لەوتەوحیدانەش ناوێکی تایبەتی داناوە، کەنوسینەوەیان بەپیۆیست‌نازانم، ئایەتەکان بەم چەشنەن

١ «والهكم اله واحد لا اله الا هو الرحمن الرحيم»
٢ «الله لااله الا هو الحى القيوم»
٣ «ا. ل. م. الله لا اله الا هو الحى القيوم»
٤ «لا اله الا هو العزيز الحكيم»
٥ «شهدالله انه لا اله الا هو، والملائكة واولو العلم قائما بالقسط»
٦ «الله لا اله الا هو لِيَجْمَعَنَّكُمْ الى يوم القيامة»
٧ «ذلكم الله رَبُّكم لا اله الا هو خالق كل شئ فاعبدوه».
٨ «إتَّبِعْ ما اوحى اليك من ربك لا اله الا هو واعْرِضْ عَنِ المشركين»
٩ «لاَ اله الا هو يحُيي ويمُيت»
١٠ «وما أُمروا إلاّليَعْبُدوا الهاً وحدا لا اله الاهو سبحانه عما يُشرِكون»
١١ «فان تَوَلّوا فَقُلْ حَسْبِي اللهُ لا الهُ الاّ هوَ عَليهِ توكَّلْتُ وهو رَبُّ العرش العظيم»
١٢ «حتى اذا ادركه الغرق قال آمَنْتُ أنَّهُ لا اله الا الّذى آمَنَتْ به بنوا اسرائيل»
١٣ «فاعلموا انما انزل بعلم الله. وان لا اله الا هو فهل انتم مسلمون ؟»
١٤ «وهم يكفرون بالرَّحمان قلْ هو رَبِّيّ لا اله الاهو عَلَيْهِ توكّلْتُ واليه مَتابِ»
١٥ «اَنْ انذِروا اَنّهُ لااله الا اَنا فَاتّقونِ»
١٦ «إنهّ يعلم السِّرَّ وأَخْفى، اللهُ لااله الاهوَ له الاسماء الحسنى»
١٧ «وانا اخترتُك فاستمعْ لما يوُحىٰ إنَّنى اَنا اللهُ لا الهَ الاّ انا فاعبُدْنى».
١٨ «انما الهكم الله الذي لا اله الا هو وسع كل شئ علما»
١٩ «وما أرسلنا من قبلك من رسولٍ الا نوحى اليه اَنّهُ لا اله الاّ انا فاعبُدُونِ».
٢٠ - «وذا النون اذ ذَهَبَ مغاضباً فظنَّ ان لَنْ نَقْدِرَ عليهِ فنادَى في الظُلُمٰاتِ اَنْ لااله إلاّ أَنتَ سُبْحانَكَ اِنّى كُنْتُ مِنَ الظالمين».
٢١ - «فتعالى اللهُ الملكُ الحقّ لااله الا هو ربُّ العرشِ الكريم».
٢٢ - «لا اله الا هو رَبُّ العرشِ العَظيمِ».
٢٣ - «الله لا اله الا هو له الحمد فى الأُولىٰ والآخرة ولهُ الحُكْمُ واليهِ تُرْجَعون».
٢٤ - «ولاتَدْعُ مع الله الهاً آخرَ لا الهَ الا هُو كلُّ شيءٍ هالكٌ الاّ وَجْهَهُ».
٢٥ - «هل من خالق غيرُ الله يَرزُقُكُمْ مِنَ السماءِ والارضِ لا الهَ الاّ هُوَ».
٢٦ - «إنَّهم كانوا اذا قيل لهم لا اله الا الله يَستكْبِرون».
٢٧ - «ذلكمُ اللهُ رَبكُم له الملك لا اله الا هُوَ اليهِ المصير».

٢٨ — «شديدُ العقابِ ذى الطَّوْلِ لا اله الا هو اليه المصير» .
٢٩ — «ذلكمُ اللهُ ربكمْ خالقُ كل شيْ لا اله الا هُوَ فأنّى توفكون» .
٣٠ — «هو الحيّ لا اله الا هو فادعوه مخلصين له الدين الحمد لله رب العالمين» .
٣١ — «لا اله الا هو يحيي ويميتُ رَبُّكم وربُّ ابائِكُم الأولين» .
٣٢ — «فَاعْلَمْ انه لا اله الا الله واستغفر لِذَنْبِك وللمؤمنينَ والمؤمنات» .
٣٣ — «هو الله الذى لا اله الا هو عالِمُ الغَيْبِ والشّهادَةِ هو الرّحمن الرّحيم» .
٣٤ — «هو الله الذى لا اله الا هو الملكُ القُدّوس» .
٣٥ — «الله لا اله الا هو وَعلى اللهِ فَلْيَتَوكّلِ المؤمنون» .
٣٦ — «ربُّ المشرقِ والمغربِ لا اله الا هو فاتّخِذْهُ وكيلا» .

بەمچەشنە سەیرئەکەین قورئانی گەورە خۆی ئیلهام دەرو فەرماندەری «تەوحید»ە وە هەر قورئانە رێ پیشاندەرە بۆیەکتاناسی ی .

«تەوحید» دروشمی ئاینی ئیسلامە ، گەورەپیاوانی ئیسلام ورێبەرانی مەذهەبە سەرەکی یەکان وەکارناسانی زانیاری «کەلام» هەمویان تێکۆشاون بۆئەوەی ، یەکتاناسی ی ، ببەنەدەرونی موسوڵمانانەوە ، وە بەباشی ی لەپێناسەکان ولەناوەکانی خودا بکۆڵنەوەو راڤەی کەن ، تاهیچجۆرە پرسیارو ورکەو دودڵی یێك لەدەرونی مرۆڤی موسوڵماندا جێگەی نەبێتەوە .

ئێمەوتمان سەرەتاو سەرچاوەی «**تەوحید**» ووشەی «**لا الەالاالله**» یە ، واتە هیچ کەس خوداو پەروەردگارو شیاوی پەرستش نیە «**الله**» نەبێت ، تائێرەی ئەمباسە ، پەیوەندی بەهەمو موسوڵمانێکەوە هەیە ، بەڵام کاری سوفی یەکان ، وردەکاری یێکی تایبەتە ، هەر لەمووشەی تەوحیدەدا ، واتە لە «**لاالەالاالله**» چۆن ، وەبۆچی ؟ .

ئێمەوتمان بناغەی تەصەووف ، وەتێکۆشانو خەباتی تەصەووف ، بەردەوام بونە لەسەری (**ذیکر**) ، وە ئەمذیکرەش لێرەدا مەبەست گوتنی «**الله**» یان «**لاالەالاالله**» یە ، چونکە وتمان ذیکر بەمەعنای ، قورئان ، وەنوێژ ، ویادکردنیش ، هاتوە بەڵام ذیکری مەبەست ، لەتەصەووفدا هەمان «**الله**» واتە ناوی خودابردن ، وەیان «**لاالەالاالله**» واتە «**تەوحید**»ە .

وە لەدای تەسەووفدا بەمذیکری «**تەوحید**»ە ئەڵێن ، ذیکری «**نەفی وەئیسبات**» ،

واتە کەئەڵێ «لا الە» ئەمەنەفی ئەکات ، واتەهیچ خوداییێك نیە ، جا ، کەئەڵێ «الا اللە» ئەوە «إثبات»ە ، واتە ئیسباتی ئەکات تەنها «اللە» خودایە .

جا ئەم گوتنەش ، هەروا سادەنیە بەڵکو بەشێوەی تایبەتی خۆی ئەنجام ئەدرێت ، کە لەباسی ، ووشەی (ذیکر)دا بەدرێژی باسیئەکەم ، بەکورتی ئەبێ ، کەئەڵێ (إلە) ، تەواوی هۆش‌وبیروهەستی کۆکاتەوە ، سەری ئەوەی ، کە کەس شیاوی‌پەرستش‌نیە ، وەکەس هیچ‌بەدەس‌نیە ، وەکەس ، وجودی «ئەزەلی‌و ئەبەدی» نیە ، کەس خاوەنی‌پێناسی‌خودایی‌نیە ... هتد «الا اللە» جگە «اللە» ، ئەم‌وشەیە ، چ بەذیکری ئاشکراو بەزمان «ذیکری‌جەلی» ، وەچ‌بەذیکری دەروونی‌و پەنهانی وەلەدڵدا ، «ذیکری‌خەفی» ، هەزاران‌و هەزاران وەشایەد ملیۆنها وملیۆنها جار ئەوترێتەوە تائەگاتە رادەیێك ، رێبواری رێگەی تەصەووف ، فەنائەبێت ، کەپێی‌ئەڵێن ، «فەنای‌نەفی‌وئیسبات» ئەوەندە بیرلەوەئەکاتەوە کە هیچ‌شتێك‌نیە ، وەهەموشتێ شیاوی‌نەمان‌و فەوتان‌و تیاچونە «اللە» نەبێت ، ئەو نەبون‌وتیاچونە ، ئەبنە راستەقینە ، وە تەنها «اللە» ئەمێنێتەوە ، جا لەم کاتەدایە ، کە شتی‌سەیری نهێنی ، لەنهێنی‌یەکانی وجود «هەستی» وەلە «ئەسراری‌غەیب» ، وەلە بەهرەی خوداوەندی ، وەلەپایەی‌بەرز ، وە لەوشتەی کە لەنێوانی سوفی‌مەسلەکاندا بە(نور)وبەرەکەت ، وەخەڵاتی‌گەورەی خوداوەندی ناسراوە دەست‌ئەدات ، وەبرێ‌جار ، ئەوکەسانەی کەخۆیان ، ون‌ئەکەن ، وە بەهەموجۆرێ هیچ‌شوێنەوارێك لەخۆیانەوە ، هەست‌ناکەن ، تەنانەت شوێنەوار لەکەون‌و کائیناتیش هەست‌ناکەن ، هەر «اللە» بەو «اللە» لەبارەی ئەوحاڵەی خۆیانەوە برێ‌شت ئەڵێن ، کە بەلای ناشارەزایانەوە ، لایان‌وایە رێبواری رێگەی تەسەووف ، باوەری لەسەر(وەحدەتی وجود)یان (حلول) «اتحاد» ، لەکاتێکا هیچکامی‌نیە ، تەنها دەربڕینی ئەوحاڵی تیاچون‌و ون‌بونەیە ، واتە «فەنا» ، بەڵام پاشان رێبوار ئەگەرێتەوە «بۆسەری» حاڵەتی «بەقا» واتە مانەوەی خۆی ، یان «البقاءباللە» کە مانەوەی هەموشتێك بەسراوە بەخواستی‌خوداوە .

«ئیمامی‌رەببانی» . شیخ‌ئەحمەدی فاروقی کە بە ناوبانگە ، بە «موجەددید» ، واتە ، تازەکەرەوەی تەریقەت ، لەهەزارەی دوهەمدا ، «المجدد للألف الثانی» ، کەپاشی شاهی نەقشبەند «محمدبهاءالدین» ، گەورەترین مەردی مەیدانی تەصەووفە ، بەتایبەت لەتەریقەی نەقشبەندی‌دا ، لەکتێبەکانیا ، کە بەناوی «مەکتوباتی ئیمامی‌رەببانی» بەناوبانگە ، سەبارەت بەم‌حاڵەتی «فەنای‌تەوحید» ە ، بەوردیی‌باسی‌کردوە ، وە ئەو وردەکاری‌یە ، بۆکەسێ‌باشە کەبیەوێ ئەورێگایە بگرێتەبەر ، بەڵام‌ئێمە لێرەدا ، مەبەستمان ئەوەتە بزانین تەصەووف‌چی‌یە ،

نەك ئەوەی بزانین چۆن ببینە صۆفی ، کەواتە هەرئەوەندە بەسە ، کەبزانین **«تەوحید»** گەورەترین پایەی تەصەووفە وە هەموێش کەوتن و خوداناسی و بەهرەمەندێکی تەصەووف ، لەتەوحیدەوە سەرچاوە ئەگرێت ، لەرێ بازی تەوحیدناسیەوە ، بەچەشنێکی گشتی ی ئەڵێن ، **«لاالهالاالله»** تەوحیدی **«الوهیەتە»** ، واتە **«اله»** بەتاك وتەنهادانان ، وەئەوەی کە ئەڵێن کەس شیاوی پەرستش نیە وەکەس **(خالق)** وە **(هادی)** واتەری بەروری نوما نیە ، کەس رەحمان ورەحیم وە **(محی وممیت)** وهتد .... نیە واتە خاوەنی ئەوپێناس وناوانەنیە ، ئەمەش **«تەوحیدی ربوبیەتە»** ، واتە تەوحیدی خودایەتی **«خاوەنبون»** ، وەئەوەش کەبەندە خۆی بداتە دەستی خودا ، وەجگەئەو کەس نەپەرستێت ، وەتەوەککولی هەربەخوابێت و وخۆی تەسلیمی ئەوبکات ، وەجگەبۆنزیکی ی لەو ، وەپاریزگاری لەرێگەی ئەودا ، ئاوات و ئامانجێکی نەبێت ، ئەوەش **«تەوحیدی عوبودیەتە»** ، واتە تەوحیدی بەندەگی وبچوکی وغوڵامی خۆت بۆ خودا . ئەبێ ئەوەش بڵێم پێناسی گەورەپیاوانی تەصەووف بۆروونکردنەوەو ناساندنی **«تەوحید»** ، ئەوەندە زۆرە ، لەژمارەنایێ ، وەبۆخۆی پێویستی بەکتێبێکە ، بەڵام ئەبێ ئەوەش بڵێم ئەوناساندنەش هەوەکو ناساندنی تەصەووفەکەیە ، واتە هەرکامەی ئەوشتەی فەرمووە ، کەخۆی زانیویەتی ، وەبرێکی لەوزەی ناسینی ئێمەدا نیە ، تەنانەت گەورەترین عالیمو دانشمەندێك ، کەشارەزاییێکی تەواوی لەتەصەووفدا نەبێت لێی تێ ناگات ، ئەوەی من بۆم روون بویەوە ، ئیمامی رەببانی **«لەمەکتوباتدا»** لەهەمویان جوانتر وەروون تر کۆڵیویانەتەوە ، وە خویشیان ئەفەرمون ، برێك لەوگەورەپیاوانە نەگەیشتونەتە دواپلەی تەوحید ، لەبەری ئەوە ، هەر ئەوەندەیان فە، مووەکە لێیانزانیوە ، تەنانەت سەبارەت بە حەزرەتی شیخ محی الدین عەرەبیش ، هەروا ئەفەرمێ ، وە ئەفەرمێ من خۆیشم لەسەرەتادا ، وام بۆدەرئەکەوت ، وە وام ئەزانی ، ئەمە دواپلەی مەقامی تەوحیدە ، بەڵام ئیستە کە بەلوطفی خودا **(لەوپایە)** بەرزتربومەتەوە ، ئەزانم هەمخۆم ، لەوەوبەر بەهەڵەداچوم ، وەهەم زۆرێك لەگەورەپیاوانی تەصەووف ، کە تائەوپایە خودابەشی داون کەباسیان کردوە ، هەروەها هەم لەکتێبەکانی شیخ محی الدین وە هەم لەمەکتوباتیشدا ناوی چەن جۆرێك لەتەوحید ئەبەن ، وەکو **«تەوحیدی ارادی»** **«تەوحیدی شوهودی»** وەلەهەموی بەرزتر **«تەوحیدی وجودی»** ، کە ئیمامی رەببانی سەبارەت بەم تەوحیدەیانە ، کەزۆر وردەکاری ئەکات وە کەسێکی ئەوێت لێی تێ بگات .

تەجريد، ئەبێتە، روتاندنەوە داماڵین، شت پێوەنەهێشتن. تەفرید، بەتاك‌دانان، بەتاك‌زانین، «رَبِّ لا تَذَرْني فَرْداً وأَنْتَ خَيْرُ الوارِثين»«انبياء» ٨٩ بەلام لەروانگەی تەصەووفەوە، قۆناغ، یان چۆنیەتێکن کەبەسەری «**سالیك**»، ڕێبواری ڕێگەی تەصەووفدا دێن، ئەم قۆناغانە، وەکو تەوحید، تەنزیە، تەجرید، تەفرید، وەزۆرشتی تری لەمچەشنانە، هی ئەو وەلی‌یانەن، کە لەقۆناغی فەناتی‌پەڕیون، وەلەمەنزڵی بەقادا، جی‌گیربوون، وەهەردەمەی لەدەسکەوت‌و خەڵات‌و پایەبێك لەم‌پایەبەرزانە، لەلای‌خواوەخەلآت ئەکرێن، وەبەهۆی پاکی‌وبەندەگی‌خۆیانەوە دەسگیریان ئەبێت.

لەکتێبی (**مَدارِجُ السّالكين**) دا لەبەشی فەناو بەقادا، پەنجە بۆ تەجریدو تەفرید ڕائەکێشی وەئەڵێ: ئەم فەناوبەقایە، حەقیقەتی «**تەوحید**» ن، وحەقیقەتی «**بەراء وەولاء**» وە «**مەحووەئیسبات**» وە «**تەجریدوەتەفرید**»ە.

ئەڵێ «**فيتجرد عن عبادة ماسواه، ويفرده وحده بالعبادة، فالتجريد نفي والتفريد اثبات، ومجموعها التوحيد**».

ئەڵێ: ئەوبەندەیە خۆی دائەماڵێ لەپەرەستنی هەموشتێ جگەخوا، وەبەتەنها ئەوئەپەرستێ، کەوابو «**تەجرید**» لابردن‌و داماڵینە، واتە «**نەفی**» یە وە «**تەفرید**» ئیسباتە، لەویانا لائەبات‌و دەرئەکات‌و دائەماڵێ، واتەجگەلەپەرستنی‌خوا هەموشتێ دەرئەکات‌و دای‌ئەماڵێ، لەم‌یاندا کەتەفریدە «**ئیسبات**» ە واتە دامەزراندن‌و دامرکاندنی بەندەگی‌و پەرستنە بۆخوا، واتەدڵ‌و دەرون‌تەنها خوائەپەرستن وە ئەو بەتەنها کەسێك دائەنێن شیاوی‌پەرەستنە. لەشوێنێکی تری ئەم‌کتێبەدا باسێکی‌تری هەیە کە ئەویش هەر پەنجەراکێشانی تیایە بۆلای «**تەفرید**»، ئەوباسەش هەرلەبەشێکی تری باسی‌فەناو بەقادایە، ئیمە عەرەبیەکەی ئەنوسین بۆئەوەی ئێوە ئاگادارکەین لەپێشەکیەکەی، تائەگاتە سەری باسی تەفریدە کە کەپەیوەندی بەباسەکەمانەوەهەیە، ئەڵێ. «**وَانَّ اولى النّاسِ بالله ورُسُلِه وكُتُبِهِ ودينهِ، اَصْحابُ الفرقِ في الجَمْعِ، فيقومون بالفَرْقِ بَيْنَ ما يُحِبُّهُ الله ويُبْغِضُه، ويامُرُ بِهِ وَيَنْهى عَنْهُ، ويُواليه ويُعاديه عِلْماً**»

وشهُودا ً وارادةً وعَمَلا ً مع شهودهم الجمع، لذلك كله في قضائه وقدره ومشيئته الشاملة العامة. فيؤمنون بالحقيقة الدينية والكونية. ويعطون كل حقيقة حظها من العبادة.

فحظ الحقيقة الدينية، القيام بأمْره ونَهْيه، ومحبّة ما يحبّه، وكراهة ما يكرهه، وموالاة من والاه، ومعاداة من عاداه، واصل ذلك الحبُّ فيه والبُغْضُ فيه.

وحظ الحقيقه الكونية «إفرادُه» بالافتقار اليه، والاستعانة به، والتوكل عليه، والالتجاء اليه، (وافراده) بالسؤال والطلب والتذلل له، والخضوع والتحقق بانه ماشاء كان، ومالم يشأ لم يكن... ولا يَمْلُكُ اَحدٌ سواهُ لَهُمْ ضَرّاً ولا نَفْعاً ولا مَوتاً ولا حياةً ولانُشورا».

بەڵێ: بەم‌جۆرە سەبارەت بەبەشی «حەقیقەتی کەونی‌یە». لەخواپەرەستیدا پەنجە ئەکێشی بۆ ئەم‌باسی «تەفریدە». ئەڵێ، ئەبێ خوابەتەنها کەسێ دابنێ کەبەندەکان کەڵکیان لی‌بکەوێت، وەخۆیان بەرانبەری ئەو، بەهەژاردابنێن. وەداوای، یارمەتی لێ‌بکەن «ئەم‌کەڵك‌لی‌خستن‌وهەژاری‌یە. تەنهابۆ مادده. سەرمایە نیە. بۆ هەموجۆرە کەڵك لی‌کەوتنێکەو شیاوی داوای یارمەتی‌لی‌کردنێکە» ئەڵێ هەرئەوە، داوای‌یارمەتی‌لی‌ئەکرێ. پشتی‌پی‌ئەبەسرێ، پەنای‌بۆ ئەبرێ، داوای لێ ئەکرێ‌و وهەرئەوە شیاوی ئەوەتە، مرۆڤ‌خۆی‌بەرانبەری‌ئەو، بەزاروزەبون دانێت، وەئەبێ باوەری‌ئەوریبوارە لەسەری ئەوەبێت. ئەوەی‌ئەوویستی کراوەو، ئەوەیشی کەنەیویست ناکرێت، وەجگەئەو، کەس‌ناتوانێ زیانی‌بگەیێنێ‌و قانجازی‌بگەیێنێ‌وژیانی پی‌بەخشێتو، پاش‌مردنیش زیندوی‌کاتەوە، جائەمانە هەموی لەچوارچێوەی (تەفریدا) یە، ئەم، تەنها ئەو، تەنهائەوە، ئەبێتە تەفرید، تەنهائەو ئەتوانێ قانجازت‌دەست‌خات، تەنهائەو ئەتوانێ زیانت لی‌دات، تەنهائەوشیاوی‌پەرەستینە، هتد...

لەکتێبی «المعجم الصّوفي» دائەڵێ: «التفريدُ مرحلةٌ يَصِلُها السّالِكُ بَعْدَ التّجريدِ، فَاِذا جَرَّدَ السّالِكُ عَنْ قَلْبِهِ وَسِرِّهِ الكَوْنَ والسِّوى، افْرَدَ الواحدَ».

واتە، تەفرید قۆناغێکە کەرێبوار پاش تەجرید ئەیگاتێ، ئەگەر رێبوار هەموی ئەم‌جیهانە وەهەرچی، جگەخودایە، لەدڵ‌و دەرونی خۆی لای‌برد وەتوری‌دا، ئەوکاتە، ئەوتەنهاخودایەی بەتاك‌وتەنهادائاوە، «افرد الواحد». خوای بەتاك‌دائاوە. لەکتێبی «اللمع» دا، ئەڵێ، تەفرید بریتی‌یە لە بەتاك وتەنها دانانی خوا لەوەدا هەرئەوە کەدروس‌کران‌و تازەبابەتی یەتی بەسەرانەهاتوە، وەهەرئەویشە هەرگێزاوهەرگیز هەربوە، جابەم‌چەشنە راستەقینەی «فەردانیەت»، هاتوەتەدی.

هەرلەوکتێبەدا ئەڵێ، برێ لەگەورەپیاوانی تەصەووف وتویانە، **«لەناوی موسوڵمانانی خاوەنباوەردا «موحد»**، واتە خوابەیەکزانان، زۆرن، بەلاَم خوابەتاکزانان لەناوی **«مُوَحِّدین»**، دا، کەمن. ئەمەش دەقی وتنەکەیە **«الموحدون لله من المؤمنین کثیر، والمفردون من الموحِّدین قلیل»**.

**لەپاشانئەڵێ**، **(تەفرید)** بریتی‌یە لەوشتەنهێنییانەی، بۆرێبوارانی دەرونپاك دەرئەکەون، وەخوایەتی خوایان بەتەواوی بۆدەرئەخات، واتە بەودەرکەوتنە کەبۆدڵ دەرئەکەوێ، ئەڵێن، **«التجرد للقلوب»**، لەکتێبی **«معجم مصطلحات الصوفیە»** دائەڵێ، تەجرید بریتی‌یە لەپاك‌بونەوەی دڵودەرونی بەندە لەهەموشتێ، جگەلەخوا، واتە ئاشکراو دەرەوەی خۆی دامالّێ، لەهەرچی جۆرە داواکردنێکی ماددی‌هەیە، وەدەرونی‌خۆیشی دامالّێ لەهەرچی داواکردنێکی مەعنەوی‌هەیە. لەم‌جیهانە چاونەبڕێتەهیچ، وەئەویشی کەهەیە ئەگەر لەدەستی‌دا، داوای بژاردنەوەی‌نەکات، واتەبیرلەوە نەکاتەوە، خوا پاداشی‌بداتەوە نەلەم‌جیهانونەلەوجیهان، بەڵکو ئەوەیشی‌هەیە ئەگەرلەدەستی‌دا، یانئەو پەرەستنو کارەچاکانەیشی‌کەئەیکا، بۆپاداشی‌نەکا، نەلەم‌دنیاونەلەودنیا، وەداوای‌بژاردنەوەی لەخوانەکا، نە لەم‌دنیاو نەلەودنیا، بەڵکوهەرچی‌هەیە بەهی خوای‌بزانێت وەهەرچی‌ئەکا لەچاکەو بەندەگی‌و پەرەستین، هەربۆخوای‌بکات، نەك‌بۆهیچی‌تر، هەروەها لەکانگەی‌دڵەوە داخوازی مەقامو پاداش نەکات، وەئەوخەلاَتانەی کەئەکرێتو ئەومەقامانەی ئەیگاتێ، دڵیان‌نەداتێو هۆشی هەرلای‌خوابێت. ئەڵێ تەفریدیش ئەوەتە، خواپەرەستی‌یەکانی تەنها هەر بۆخوابێت، نەلەخۆی‌بای‌بێت، واتە بۆنەفسی‌خۆی کردبێت، وەنەبەتەمای سوپاسی خەڵك‌بێت، کە خەڵکی‌کردبێتە شەریکی‌خوا لەعیبادەتا، واتە نەخۆی‌ونەخەڵك نەکاتە هاوبەشی خواپەرەستی‌یەکەی، وەهەرتەنها بۆخوابێت، نەدڵی بەکەس‌بکرێتەوە، وە نەلەکەسیش دووری‌بگرێت‌وبترسێ، دڵی هەربەخوابکرێتەوەو، تەنهالەخوایش‌بترسێت. لەکتێبی **«الفاظ الصوفیە»** دا ئەڵێ.

خاوەنی **(تەفرید)** ئەوەتە والەگەڵی‌خوادا، پەنای هەربەخوایە، پەرەستنی‌هەربۆخوایە، هەرچی‌ئەکالەرێی خوادایە، ئەمەش هەڵوێستێکی **(فەرید)** ە، ئەویش ئەوەتە جگە خوا کەسی‌تری‌لەگەڵ‌نیە.

وه (تەجرید)، ئەوەتە بەهەموجۆرێ پشتلەجیهانو هەرچی لەجیهاندایە هەڵکات، وەگوێی نەداتێو چاوەروانی سەرمایەوپاداشی نەبێ، نەبوئیستەو نەبۆئاینده، «تەجریدی» ئەو بریتیە لەوەی کە لەکانگای دەرونەوە خۆی داماڵێ لەویستونەویستی ئەوحاڵو مەقامانەی کەهەیەتی، نەداوای هی تربکات، نەلەوەی کەهەیە ناسوپاسی ی بکات، ئەوەی خوابۆیئەکات وەخوائەیدا ئەوەیبەلاوە چاكبێتوبەوەدامرکێ.

ئەڵێ تەفرید بەتاكدانانی خوایەو، تەجرید داماڵینی دڵودەرونە لەداواکردن.

لەپاشان ئەڵێ، تەجریدو تەفریدو تەوحید هەموی وشەی جۆراوجۆرن بۆ یەكواتا، وەیەكمەعنا، ئەوەی ئەتوانێ لێکیان جوێ کاتەوە، ئەو خواپێداوو خەڵاتکراوانەن کەخوا لەمخەڵاتانە بەرخورداریان ئەکات.

لەدوایی دا ئەم لێكدانەوەیشە ئەنوسم کەلەزۆربەی کتێبەکاناهاتوە، ئەڵێن وتراوە «التَّفْرِيدُ أَنْ لاَ تُمْلَكَ. وَالتَّجرِيدُ أَنْ لاَ تَمْلِكَ» واتە، تەفریدئەوەتە، جگەخوا هیچ شتێکی تر نەتکاتە بەندەیخۆی، واتەبەندەی سامانو سەرمایەو پایەو مەقامی دینیو دنیایی نەبیت، تەنهابەندەیخوابیت.

وەتەجریدیش ئەوەتە هەوڵنەدەی ببیتەخاوەنی ماڵو مەقامی دینی یان دنیایی، وە داخوازی«خاوەنبون»لەدڵداماڵی، واتە ئەوەی هەتە بەهیخوایبزانی وەلەوریێبەدا خەرجیکەیت کەخواپێی خۆشە، وە قەت لەدڵاجێگەی نەکەیتەوە، دڵ جێگەی خۆشویستنی دنیاوقیامەت نیە، بەڵکو ئەبێ لەهەمو خوازو داخوازێ دایماڵی، جگە لە خۆشەویستیی خواو رەزامەندیی خوا هیچی تری تیانەیێلی.

---

**تنزيه:**

---

تەنزیە: – وشەیێکی عەرەبیيە، بەواتای دورخستنەوە،وە بە پاك پیشاندانی شت لەهەمو لەکەو عەیبێکە، لێرەدا مەبەست لەتەنزیهی خوایگەورەیە، بێگومان خوای گەورە پێیناوێئێمە لەعەیبدوریخەین، ئەوخۆی بێعەیبە بەڵکو دورخستنەوەی

نیسبەت دانی عەیب وکەموکوڕیی خوایش هەرکاریئێمەنیە، چونکە نیسبەت لێدانی عەیب وکەمایەتیش هەڵ ناگرێ، هەروەها تەنزیە، بەرانبەر تەشبیە دێت، کەئەمیش پەیوەندێکی بەباسەکەمانەوە هەیە، چونکە مەبەست ئەوەتە خوای گەورە تەشبیە بەهیچ شتێ ناکرێت «لَیْسَ کَمِثْلِهِ شَیْءٌ»، «شوری» «۱۱».

جا لەڕوانگەی تەصەووفەوە، شتەکە ناسکەو جیاوازی هەیە، لەم لێك دانەوەی زمانەوانی یە.

هەروەکو سەبارەت بەتەوحید، یان تەجریدو تەفرید، یان ووشەکانی تری بازاری تەصەووف، وتمان، ماوەهەیە لەنێوانی ئیمانێك وئیمانێکا، ئیمانی تەواو دامەزراو لەسەری (عین الیقین) و (حق الیقین)، تائیمانێکی دانەمەزراو، هەروا فەرق هەیە لەنێوانی تەوحیدی وەلی یێك و موسوڵمانێکی باش دانەمەزراودا، یان تەوەککول یان صەبر،.. لەڕوانگەی صوفیێك و کەسێکی ترەوە هتد... جا هەربەوجۆرەش تەنزیە کردن تاتەنزیەکردن، فەرقی هەیە، ئەگینا ئێمە هەرچۆن بیرکەینەوە خەڵك بێ دین بێت یان دین دار، خوا هەروەکو خۆی وایە، ئێمە دەستە دەستە دێین و ئەڕۆین، ئەو هەربەردەوامە، بوەو هەر ئەیش بێت صەدسالی پاش ئەمرۆ ئەمانەی کەهەین، تاقمان نەماوین، خوایش هەروەکوخۆی، خوایێکی ئەزەلی و ئەبەدی یە، بەلاٌم مەبەست لەم تەنزیهی تەصەووفە، دامەزراندنی ئەم باوەڕەتە لەکانگەی دەرونا، زۆرکەم لەنوسەرانی کتێبەکانی تەصەووف، خۆیان داوە لەم باسە، بەڕاستیش صوفیەکان بەدەگمەن باسیان کردوە، چونکە لەوەناچێت بریتی بێت لەحالێکی تایبەت، بەڵکو عەقیدەو باوڕێکە، کەئیمانی موسوڵمان بتەوترئەکاتەوە. کەوابو لێرەدا مەبەست ئەوەتە مرۆڤی دین دامەزراوو باوەڕتەواو ئەبێ لەکانگەی دڵەوە باوری لەسەری ئەوەبێ کەخوا لەئەزەلەوە هەربوە، ئەزەل وشەیێکە بەرانبەر بە ئەبەد، ئەزەل بۆ بێ سەرەتایی رابوردویە، ئەبەدیش بۆ بێ پایانی ی داهاتویە، باوەر کەلەسەری ئەوەبو خواهەربوە، کەواتە خوا مونەززەهە لە تازەبەدی هاتن (حادث) ئەمەبویە تەنزیە لە (حادِث)، خوا وەکو هیچ شتێ نیە وە هیچ شتێ نیە وەکو خوابێت، ئەمەتەنزیهە لەتەشبیە، وە ئەمەتە کە خواخۆی لەسورەی شوری ئایەتی یانزەدا ئەفەرمێ «لَیْسَ کَمِثْلِه شیء وَهُو السَّمیعُ العَلیم» هیچ شتێ نیە وێنەی ئەوبێت، وەئەو ئەبیسێتوزانایە، کەواتە تەصەوور ناکرێت، یان برێ لەموشریکەکانو ئەوانەی لەدژی پێغەمبەربون برێ پێناسیان بۆخوا

دائەنا، وەکو ئەوەی بلّێن، کوڕی هەیە، یان بلّێن، فەقیرە، یان هەرجۆرە شتیّ لەم بابەتانە، ئایەتی (١٨٠) صافات، هاتەخوارەوە «**سُبْحانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفونَ**»، واتە ئەی‌موحەممەد خوای‌تۆ خوایێکی بەرزە، وەدورە لەوپێناسانەی کە ئەوجۆرە کەسانە بۆی‌دائەنێن، واتە هاوسەرو هاوجۆرو هاوجینسی‌نیە، «**لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا اَحد**»، بەڵیّ عەلیم، واتەزانا، سەمیع‌بیستیار، بەصیر بینا،... هتد.. بەلاّم ئێمە هەرگیز نازانین ئەو زانایی‌و بیستن‌ودینەی خودا چۆن‌چۆنیە، وە ناتوانین تەصەووری بکەین، کەواتە ئەوەتەنزیهە، ئێمەتەنزیهی ئەکەین لەوەی بزانین چۆن ئەبیسێت‌وئەبینیّ، جا ئەم تەنزیەکردنە خۆ وەنەبیّ ئەگەر نەیکەین نابیّ، بەلاّم مەبەست دڵی‌خۆمان‌و باوەڕی خۆمانە، ئەبیّ لەو خەیالاّنە پاك‌بێتەوە، ئەگینا خوا پێویستی بەتەنزیهی ئێمەنیە، ئەوخۆی مونەززەهەو دوورە لەو جۆرە پێناسی ئێمەیە، کەواتە، تەنزیە دامەزرانی هەموی ئەم‌باوەڕانەیە لەدەرونی ڕێبواردا، هەروەها لەدڵ‌و دەرونی خۆتا دورخستنەوەی‌خودا لەهەرچی جۆرە پێناسێکی ئادەمی‌زادی‌یە، وە ئەو خۆی تاکوتەنهایە هەرلەقەدیمەوە هەرلەئەزەلەوە، بەناوو بەپێناس‌و بەذاتی خۆی، بەوجۆرەی کەخۆی ویستویەتی (**لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا اَحَد**). کەواتە ئێمە هەرگیز ناتوانین، ذات‌و پێناس‌و ناوەکانی‌خودا، بەوجۆرەی کەهەن بیان ناسین، سەبارەت بە ناوەکانیش، ئەوانەی کە هەر ناون وەکو اَللّه یان اِلٰه بەپێی عەقڵی خۆمان لێکیان ئەدەینەوە، ئەبێتە کەسێك کەشیاوی ئەوەتە بینە غولاّم‌و بەندەی، وە بی‌پەرەستین. رَبّ ئەوەتە خاوەنی ماڵ‌و گیان‌و ژیانمانە، یان پێناسی‌تری وەکو رەززاق‌و کەریم وسەمیع، ئەم جۆرە ناوانەشی ئەوەندەئەزانین کەریم، بۆ بەخشەندگی‌یەو رەززاق بۆ ڕۆزی بەخشینەو سەمیع بوبیستیاری‌یەو، بەم‌جۆرە، ئەگینا چەنوچۆنی نازانین، بەلاّم سەبارەت بە ذاتی‌خوا، وەئەوشتەی کە خاوەنی ئەم ناوو پیناسانەتە، هەرئەوەتە، ئەزانین راستە کەخاوەنی ئەم ناوو پێناسانەتە، باقی‌تری هەرئەوەتە کەخۆی فەرمویەتی، لَيْسَ كَمِثْلِه شَيْءٌ، وَسُبْحانَ اللّهِ عَمَّا يَصِفون وَسُبْحانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفون، کەواتە هیچ‌شتیّ وەکوئەونیە، وە ئەو دورە لەوپێناسانەی کە نەفامان‌و خوانەناسان بۆی دائەنێن، وە لەوپێناسانە «**مونەززەهە**» وەصوفی‌یە گەورەکان لەمەقامە هەرە بالاّکاندا، ئەم چۆنیەتەی کەباسمان‌کرد، لەدڵ‌ودەرون‌و، رەوانیان‌دا جی‌گیربوەو دامەزراوە، وە چۆنیەتی ئەم‌خەلاّتەو، بەرهەم‌و تام‌و چێژەکەی وە دەست‌کەوتە مەعنەوی‌یەکانی مەر هەرخۆیان بیزانن.

«**عوبودی‌یەت**»، کوردی‌یەکەی ئەبێتە بەندەیی، غولامی‌ی، کۆیلەیی، بەلام لەروانگەی تەصەووفەوە مەقامی گەورەپیاوان‌و ئەولیاکانە.

(**عوبودی‌یەت**)، بەرانبەری (**روبوبی‌یەت**) دێت، کەبریتی‌یە لەخوایەتی، یان، خاوەنیەتی.

بێگومان ئێمە هەموومان بەندەین، واتە عەبدی خوداین چ بەندەیێکی لارێ‌گرو چەوت، وە چ، بەندەیێکی راست‌وپاك‌و خواپەرست، بەندەیی وەکو بری پێناس‌نیە. بە هەلسان‌بەکاری جابێتە عەبد، وەکو «**مؤمن**»، خاوەن‌باوەر، ئەگەر باوەری نەبو مؤمن نیە، یان موسولمان ئەگەر ئاینی موسولمانیی قوبول‌نەکرد موسولمان نیە، کەچی عەبد بیەوێو نەیەوێ (**عەبدە**).

بەلام ئەم بەندەیی‌یەی کەئێمە سەبارەت‌بەو باس‌ئەکەین، قول‌تریشە لە تەنها موسولمان‌بون‌و باوەر هاوردن، بەلکو لەروانگەی تەصەووفەوە مەقامێکی هەرەبەرزە، چونکە تەنهابەندەیی رووت نیە، بەلکو هەستانە بەسپاردەی بەندەیی، بەوجۆرەی کەخوایی‌خۆشە.

لەروانگەی زمانەوانی‌یەوە ئەو وشانەی کە لە (**عەبد**)ەوە سەرچاوە ئەگرن واتە، لەخێزانی ووشەی (**عەبد**)ەوە، جیائەبنەوە وەکو، عیباد، عابد،ئەعبود، نەعبود، هتد.. لە دووصەد وشە زیاتریان، لەقورئانی پیروزدا هاتوە.

عوبودی‌یەت، کە مەقام، وەیان، پلەیێکە کە پیاوە پێ‌گەیشتوە گەورەکانی تەصەووف ئەگەنێ، هەمو حال‌و مەقامەکانی تریش ئەگرێتەبەر، چونکە هەمویان لەچوارچێوەی بەندەیی‌و خواپەرەستیدا کۆئەبنەوە، ئەوەی خاوەنی زوهدە، یان تەوەککول، یان خاوەنی باوەرە، بێگومان هەم ئەبێ بەندەبێت وە هەم بەجی‌هێنەری نەریتی بەندەیی، واتە «**عیبادەت**». بەلام ئایا ئەوەی خاوەنی عوبودی‌یەتە کێ‌یە؟، وە ئەم عوبودی‌یەتە چەن‌جۆرە یان چەن‌پلەیە؟.

یەکەم‌شت سەیرئەکەین خوای‌گەورە کەناوی مەقامی پێغەمبەرەکان ئەبات وەرەزامەندیی سەبارەت بەوان پیشان‌ئەدات بەووشەی «**نِعْمَ العَبْدْ**» دەست پێ‌ئەکات، واتە (**چاکترین بەندە**)، جا ئەوچاکترینە، بریتی‌یە لەعوبودی‌یەت، یان

کەسەبارەت بە پێغەمبەری گەورە کە باس ئەکات، ئەفەرمێ «**سُبْحانَ الّذي أَسْرَى بِعَبْدِهِ**» (١٧) (١) یان ئەفەرمێ «فَأَوْحىٰ إلى عَبْدِهِ ما أَوْحى» (٥٣) (١٠) «**أنْزَلَ عَلى عَبْدِهِ الكتابَ**»، (١٨) (١)، وە زۆرشوێنی تر کە بەعەبد ناوی (**محمد**) ئەبات، دروودی خوای لەسەر، یان کەسەبارەت بە ئەیوب وەسولەیمان ناوئەبات، «**نِعْمَ العَبْدُ إنّهُ أوّابٌ**» «ئەفەرمێ، وەهەروەها سەبارەت بەزۆریك لەپێغەمبەرەکان».

ئەمانە هەموی پێشاندەری پایەی (**عەبدی‌یەت**)، واتە بەندەیی‌یە بەلای خواوە.

نیشانەیێکی تر بۆئەوەی کەهەمو عەبدیێ عەبدی‌نیە ئەوەتە کاتێ شەیتان هەرەشەئەکات وەئەڵێ ئەرومە بن‌کڵێشەی بەندەکانت، وە فریویان ئەدەم، خوای‌گەورە ئەفەرمێ، ئەوەی کەبەراستی بەندەی‌من‌بو، تۆ دەرەقەتی نایێت، وەهیچت بۆناکرێ، جائەوانە، ئەوگەورەپیاوانەن، کەخوایان ناسیوە وئیمانیان دامەزراوە وەبریتین لەوەلی‌یەکان، وەپیاوە زۆر خواپەرستەکان، جا خوا، بەشەیتان ئەفەرمێ «**إنّ عِبادي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطان**»(١٥)(٤٢)، واتە ئەوەی بەتەواوی بەندەی‌من بێت، تۆ ناتوانی لەرێ لای‌دەی.

هەروەها لەشوێنێکی‌ترا ئەفەرمێ «**إنّ الأرْضَ يَرِثُها عِبادِيَ الصّالِحون**». هەروەها لەباسی بەندەی چاکا ئەفەرمێ «**التّائبونَ العابِدونَ**»(٩)(١١٢) (**یان**) (**تائِباتٌ**) **عابِدات**» (٦٦) (٥).

لێرەدا باسی ئەوانەتەکە خواپەرەستی ئەکەن، واتە بەندەیی بەجێ‌دێرن، وە لەزۆر شوێنی‌تری قورئاندا ستایشی بەندەی چاك‌وخواپەرست کراوە، کەبەراستی شێوەی بەندەیی خۆیانیان، بردوەتە رێگاوە، بابزانین لەروانگەی سەرچاوەکانەوە ئەم بەندانە چەن جۆرن، وەسەبارەت بەو مەقامە چی وبژراوە، وەئەم‌وشەی عوبودی‌یەتە لە کتێبەکانی تەصەووف‌دا چۆن لێك‌دراوەتەوە.

(**قوشەیری**) لەریسالەدا، لەم‌بارەوە باسی‌کردوە وە نمونەیێکی زۆر لەباوەری گەورەپیاوانی تەصەووفی سەبارەت بە عوبودی‌یەت نوسیوە.

ئەڵی، لە «**ئەباعەلی دەققاق**» م بیست، ئەی‌فەرمو، عوبودی‌یەت تەواوترە لەعیبادەت، واتە، لەپێشا، «**عیبادەت**»دیت لەپاش‌ئەو «**عوبودی‌یەت**»، **لەپاش‌ئەو** (**عوبودە**)، ئەڵێ عیبادەت کاری موسڵمانانێکی سادەو تێکرایی‌یە، عوبودییەت هی

هەڵبژێراوانە، بەڵام **(عوبودە)** پلەی تایبەتی تایبەتەکانە، واتە هی خواناسە هەڵبژێراوەکانی ناوی هەڵبژێرراوانە.

هەروەها ئەڵێ، لێم بیست ئەیگوت عیبادەت هی ئەوانەیە خاوەنی «**عِلْمُ اليَقين**»بن، عوبودی یەت هی ئەوانەیە خاوەنی «**عَيْنُ اليقين**»بن، بەڵام عوبودە هی ئەوانەتە کەخاوەنی «**حَقُّ اليقين**» بن.

هەروەها ئەڵێ، «**عوبودە**»، دەس هەڵگرتنە لە «**إختيار**»، واتە **(هەستی ویستونەویست)**، دەربارەی هەرچی کە لەوکەسە ڕووئەدات.

لەزمانی ذا النونەوە ئەڵێت، عوبودی یەت بریتی یەلەوەی، ببیتە بەندەی خوا بە هەموجۆرێ وە لەهەموحاڵێکا، هەروا کەئەو خاوەنی تۆو خودای تۆیە بەهەموجۆری وەلەهەموحاڵێکا. ئەڵی «**جەریری**» وتویەتی، بەندەی نیعمەت زۆرن، بەڵام بەندەی خاوەن نیعمەت کەمن، «**واتە خەڵك زۆریان کۆیلەی سەرمایەو سامانو دەس هاتو دەس کەوتەکانی تری ئەم جیهانەن، وەکوپایەو پلەی دنیایی، بێ گومان ئەمانە هەموی لەچوارچێوەی نیعمەت دان، بەڵام ئەوانەی ئەبنە کۆیلەی خاوەنی ئەم نیعمەتانە کە خوای گەورەیە، کەمن**».

پێغەمبەر درودی خوای لەسەر ئەفەرمێ، بەدبەخت ئەوکەسانەن، ئەبنە کۆیلەی، درەم ودینارو پۆشاك وکوتاڵ.

هەروەها ئەڵێ «**عبد الله بن منازل**»، وتویە، بەندە بەندەی خوایە، تا ئەو کاتەی خزمەتکاری تایبەت بۆخۆی ڕائەگرێت، ئەوکاتەی خزمەتکارێکی بۆخۆی گرت، ئیتر لەچوارچێوەی بەندەیی خوا دەرچووە وەدەستی لەنەریتی بەندەیی هەڵگرتوە. ئەڵێ، وقيل «**العُبُودية شُهُودُ الرّبُوبيه**»، واتە بەندەیی ئەوەتە، چاوی بکەوێتە خوایەتی، واتە ئەگەرزانی خوایەتی کامەتاو چۆنە، ئەزانێ بەندەیی ئەبێ چۆن بێت.

وە دەیان باوەڕی تری گەورەپیاوانی تەصەووف، کە قوشەیری پەنجەی بۆکێشاون.

لەکتێبی «**الفاظُ الصُّوفيه**» دا ئەڵێت، صوفی یەکان ووشەی «**عەبد**» بەکارئەبەن، بۆمەقامی **(عوبودی یەت)** هەروەها کە ووشەی «**رب**» بەکار ئەبرێت بۆ مەقامی «**روبوبی یەت**».

ئەڵێ، عوبودی‌یەت دانراوە بۆبەندە صالحەکان، کاتێ کە خوا ئەمخەلاتەی دایەبەندەیێك خۆی سەری ئەخات، وەهەرچی ئارەزوی نەفسە لەوی دورئەخاتەوە، وەهەوای نەفسی لەناوئەبات، ئەوکاتە لەناوی نازو نیعمەتی خۆیا ئەمدیوو ئەودیوی پی ئەکات، ئەیخاتە نیعمەتێکەوە تەنانەت خۆیشی لەیاد ئەچێتەوە، وە خوانەبێ، هیچی تری لەیادنامێنێ، وەبیری لای هیچی ترنیە.

وە ئەمانەن خوا دەربارەیان ئەفەرمێ «نِعْمَ العَبْدُ إنَّهُ أوابٌ».

لەکتێبی «**معجم مصطلحات الصوفيه**» دا، سەبارەت بە «**عەبد**» «**عوبودە**»، «**عوبودیەت**»، باس ئەکات. ئەڵێ عەبد کاتێ عەبدی ڕاستەقینەیە، دڵی ئەو جگە خوا هیچی تیانەبێت، جائەوکاتە پێی ئەوترێ «**عبد الله**»، هەروەکو لەقورئانا دەربارەی حەزرەتی عیسی درودی خوای لەسەر ئەڵێ، «**قالَ إنّي عَبْدُ الله آتانِيَ الكتابَ وَجَعَلَني نَبِيّاً**» (**مريم**)(٣٠).

ئەڵێ، خوای گەورە باشترین ناوێك کە بەبەندە چاکەکانی خۆی فەرموە، ووشەی «**عەبد**» ە. وەکو «**عِبادٌ مُكْرَمُونَ**» وە «**نِعْمَ العَبْدُ**».

ئەڵێ، کاتێ کەپێغەمبەر، درودی خوای لەسەر بەهۆی شەونەخەوتن وشەونوێژ کردنەوە پێی ئاوسابون، لێیان پرسی، ئەی پەیامبەری گەورە، تۆمەگەر خودا خۆی موژدەی نەداویتێ کە گوناهی ئایندەو لەوەپێشی بەخشیوی؟ ئیتر بۆ وائەکەی بەخۆت؟ لەوەلاما فەرموی «**أفلا أكونَ عَبداً شَكوراً**»؟ ئایا بەندەیێکی شوکرانە بژێرنەبم؟

پێغەمبەرئەفەرمێ، خرابوەدەستی خۆم، بمەوێ، پێغەمبەرێکی پادشابم، یان پێغەمبەرێکی (**عەبد**) بەندە، بەلام من خۆم ئەوەم هەڵبژارد وە بە جیبرەئیلم گوت ئەوەم پێ خوشە پێغەمبەرێکی بەندەبم. جائەمەتە مەقامی بەندەیی.

سەبارەت بە عوبودە ئەڵێت، (**عوبودە**) بریتی‌یە لەخواپەرستییێك کەبەهۆی گەورەیی خوا وە خۆشەویستی خوا وەشەرمکردن لەخواوە ئەنجامبدرێت، وە ئەمپایەیە لەپایەی عوبودی‌یەت بەرزترە کەئەویش لەپایەی عیبادەت بەرزترە، ئەڵێ عیبادەت بە لەش ئەنجامئەدرێت، وە شوێنی عوبودی‌یەت ڕۆحە واتە ڕوح ئەنجامی ئەدات، بەلام عوبودە، بە «**سیرر**» ی مرۆڤ ئەنجام ئەدرێت، «**باسی سیرر**» لەکاتی باسی تەریقەتی نەقشبەندی‌دا ڕونی‌ئەکەمەوە، لێرەدا ئەڵێم «**سیرر**»، یەکێکە لە

لەطائف، واتە «**حەواسی مەعنەوی**» کەبریتین لە «**قەلب، رۆح، سیرر، خەفی، ئەخفا**»، جائەڵێ مەقامی حەزرەتی ئەبوبەکر، ئەم مەقامەبوە، چونکە خواپەرستی یەکەی ئەو هی «**گەورەیی وعەزەمەتی خوابوە**»، لێردا دەس نیشان ئەکات بۆ ئەوحەدیثەی ئەفەرمێ، «**لم یفضّلکم ابو بکر بکثرة صیام ولاصلاة، وإنما فضّلکم بشیٔ وقر في صدره، وذلك عظمة الله واجلاله**»، ئەوسەرچاوە پاشان ئەڵێت، عیبادەت پیشەی هەمو موسوڵمانانە بەچەشنێکی تێکرایی، بەڵام عوبودی یەت هی هەڵبژێراوانە، ئەویش ئەوەتە ڕەزات لەسەری ڕەزای خوابێت هەرچی ئەوکردی ئەوەت لاباش بێت.

عوبودە وەعوبودی یەت، لەڕوانگەی زمانی عەرەبیشەوە بریتی یە لەوپەڕی بەندەگی کردن وخۆبەبچووک زانین بەرانبەر بە سەروەری خۆت. «**قاموسی فیروزئابادی وە مونجید**».

١- قەبض ، «قبض»
٢- بەسط ، «بسط»
٣- مەحوئیسبات ، «مَحووإثبات»
٤- صەحوسوکور ، «صَحووسکر»
٥- غەیبەوشوهود ، «غَیبەوشهود»
٦- شەوق ، «شوق»
٧- ئونس ، «اُنس»
٨- وەجد ، «وَجد»
٩- جەلال ، «جَلال»
١٠- جەمال ، «جَمال»
١١- کەمال ، «کَمال»
١٢- مەحەبەت ، «مَحبة»
١٣- لەوائیح ، طەوالیع ، لەوامیع ، «لَوائح ، طَوالع ، لَوامع»
١٤- جەذب ، «جَذْب»
١٥- وارید ، «وارِدْ»

## قبض وبسط :

قەبض وبەسط ، دوحاڵن ، لەوحاڵانەی کەدێنە ڕێگەی ڕێبواری تەصەووف ، واتای ئەم دووووشەیە لەروانگەی تەصەووفەوە ، بریتی‌یە لەگیرانی دەرون وە کرانەوەی دەرون ، واتە : قەبض نارەحەتی و نائارامی و دڵتەنگی‌یە ، وە بەسط دڵکرانەوەوخۆشی‌یە وە لەهەردوکیاندا مرۆڤ ئەگاتە ئەوپەڕی خۆشی ، یان ناخۆشی .

لەکتێبی ، «**الفاظ الصّوفیه**» دا ، ئەڵێت «**قەبض**» لەزاڵبونی حاڵی «**خەوف**» ، پەیدائەبێت وە «**بەسط**» ، لەزاڵبونی حاڵی «**ڕەجا**» دا ، ئەگەر صوفی ترس ڕوی تێ‌کرد بەهۆی هەڕەشەیێکی خوداوە کەلەقورئاندایە ، ئەوە حاڵەتی «**قەبض**» ڕوی تی‌ئەکات ، ئەگەریش سرنجی بەڵێنی پاداشی بەهەشت‌وڕەزامەندی خودایشی‌دا ، «**بەسط**» ، واتە دڵ کرانەوە ڕووی تی‌ئەکات .

برێکی‌تر لایان‌وایە لەوکاتەدا ئەگەرخودا پێناسی «**جەلالی**» بۆئەوبەندەیە خستەڕوو ئەوە دووچاری دڵگیری ئەبێت ، وەئەگەر پێناسی «**جەمالی**» خستەڕوو ، ئەوا دڵکراوەیی ڕووی‌تی‌ئەکات . ماوە ، لەنێوانی قەبض‌و بەسط‌دا هۆی جۆری ئەو بەرەکەتەیە کەئەبارێ بەسەری دەرونا ، هی‌وای‌هەیە ئەبێتە هۆی دڵکرانەوە هی‌وایشی‌هەیە ئەبێتەهۆی دڵگیری .

برێ‌جار ئەودڵگیرانە لەمەترسیی لەدەست‌دانی دەس‌کەوت‌ونیعمەتێکی دورونی‌یەوە سەرئەدات ، واتە ئەو ڕێبوارە حاڵێکی خۆشی هەیە ، لەوحاڵانەی مەگەر خۆیو خودابیزانن ، جا لەمەترسیی لەدەست‌دانی ئەوحاڵەدا «**قەبض**» ، واتەدڵگیری ڕووی‌تی‌ئەکات ، هی‌وایش‌هەیە بەئومێدوئارەزوی بەدەست‌هێنانی دەس‌کەوت‌و بەهرەیێکی دەرونی‌یەوە ، وە بەئارەزوی گەیشتن بەوشتەی کەخۆشی‌ئەوێت دڵکراوەیی ، واتەبەسط ڕووی تی‌ئەکات .

«**شیخ‌ئەبول‌حەسەنی شاذیلی**» (**١١٩٦ – ١٢٥٨**) م ئەڵی «**قەبض**» تاریکاییێکە لەژێری ئەونورەوە پەیدائەبێ کەلەدڵەوە کشاوە ، وە (**بەسط**) نورێکی خودا داوە کە دڵ‌ودەرون دائەپۆشێ ، بەواتاییێکی‌تر «**بەسط**» نوری‌عەلانورە «**وەقەبض**» تاریکاییێکە

لەژێری نوردا، ئەبولقاسیمی قوشەیری، وە شیخ عومەری سەهرەوەردی لەریسالەو لە (**عوارف المعارف**)دا لەمبارەوە زۆری لەسەرچوون.

قوشەیری ئەڵێت «**قەبض‌وبەسط**» دوحاڵن لەپاش سەرکەوتن لەحاڵی «خەوف‌وەرەجا»، دەستی ڕێبوار ئەکەون، وە «**قەبض**»: بۆعاریف وەکو خەوف واتە بۆ شاگردی تازەکار، وەبەسط بۆ مرۆڤی کارامە «**عاریف**»، وەکو رەجا بۆ تازەکار وایە، هەروەها ئەڵێت حاڵەتەکانی «**هەیبەت‌وەئونس**»، وان لای‌ژووروی «**قەبض‌وبەسط**»ەوە. واتە «**هەیبەت**» والای‌ژووروی «**قەبض**». وە «**ئونس**» وا لای‌ژووروی بەسط، واتەئونس لە بەسط تەواوترە، هەروەها ئەڵێ خاوەنی خەوف ورەجا بۆئاینده ئەروانن، وەئایندەیان لە پێش چاوە، واتە یان لەئایندەئەترسیٚ یان ئومیدی بەئایندەیە، بەلام خاوەنی «**قەبض‌وبەسط**» لەو حەلەدا خاوەنی‌حاڵەکەیە سایان‌دڵ‌کراوەو شادمانە یاخۆ دڵ‌داگیراوو پەرێشانە. لە کتێبی (**عوارف المعارف**)دا شێخ عومەری سەهرەوەردی ئەفەرمێ، قەبض‌وبەسط، دووحاڵیٚ شەریفن، ئەڵێ گەورەپیاوانی تەصەووف سەبارەت بەمدووحاڵە بەئیشارە واتە **قامك**کێشان باسیان‌کردوە وە لەژێری پەردەدا، من ئەم‌دیوە کە بەئاشکرایی‌و بی‌پەردە لەمبارەوە باسی‌بکەن، لەبەرئەوە من‌پێم‌خۆش‌بو بەدرێژی لەبارەی ئەم‌دوحاڵەوە بنوسم.

ئەڵیٚ «**قەبض‌وبەسط**» کاتێکی تایبەتی خۆیان هەیە نە لەوەوپێش وەنەلەوەوپاش رووئەدەن وە ئەوکاتەو سەردەمەیان لەسەرەتای دەست‌پیٚ‌کردنی حاڵی «**المحبّة الخاصّة**» دایە، نەك لەپێشی دەست‌پیٚ‌کردنی حاڵی«**المحبّة الخاصّة**» دا، وەئەوەی گەیشتبێتە مەقامی «**المحبّة العامّة الثابتة**» بەفەرمانی «**ئیمان**»، نەقەبض‌وبەسط واتەدڵگیراوی‌و دڵ‌کراوەیی، وە نەخەوف‌ورەجا، واتە «**بیم‌وئومید**» یٚ نامێنیٚ، بەڵام شتێکی ئەبێت کەهەر لەحاڵی دڵ‌گیران‌ودڵ‌کراوەیی ئەکات وە لای‌وایە ئەوچۆنیەتە دڵگیران‌ودڵکراوەیی ڕاستەقینەیە کەچی لەڕاستەکەشیا ئەونیە، بەڵکو جۆرە خەفەتیك رووی‌تی‌ئەکات لای‌واتە دڵگیرانی ڕاستەقینەیە، وە جۆرە سرورو نیشاطێك رووی‌تیٚ‌ئەکات لای‌وایە دڵ‌کرانەوەی ڕاستەقینەیە، سەرۆکی تەریقەتی (**سەهرەوەردیی**) لەپاشان ئەفەرمیٚ ئەم خەفەت‌و نیشاطە لەمەڵبەندی نەفس وە لەگەوهەری نەفسەوە سەرچاوەئەگرن، ئەمەش تێکۆشانێکە لەنەفسەوە بۆهێشتنەوەی پێناسەکانی‌خۆی، وەئەگەر پێناسی فەرمان بەخرابەدان لەنەفسامابێت

واتەپێناسی «اَمّارَةٌ بالسوء»،ئەم جموجوڵ و خەفەت گەیاندنە لەنەفسەوە گڵپەئەسێنێ، وە ئەوجۆرە خۆشی‌وشادی‌یە ناتەواوەش کەباسمان‌کرد بەرزبونەوەی شەپۆلی نەفسە لەکاتی ئاڵۆزبونی دەریای سروشت‌دا «واتەطەبعی‌دەرون» دا، جائەگەر رێبوار لەحالێ «المَحَبَّة العامّة» وە بەرزبووەوە وەگەیشتە سەرەتای «المحبّة الخاصّة»، جائەوکاتە ئەورێبوارە ئەبێتە خاوەن دڵ وەئەبێتە خاوەنی «النَّفْسُ اللَّوامَه»، واتەسەرزەنشی‌کەر،واتەنەفسێك کە لۆمەی خاوەنی‌ئەکات ئەگەربیەوێ کارێکی ناشیرین بکات، جالێرەدایە کە قەبض‌وبەسطی راستەقینە دەس‌پی ئەکات وە بەنۆرە دەرونی مورید ئەگرن، چونکە لەپایەی ئیمانەوە چوەتە پایەی «ئیقان»، واتە «یەقین» وەلە باوەری راستەقینەوە ئەگاتە حالّی «المحبّة الخاصّة»، جائەوکاتە خوای‌گەورە تاوێك دلی ئەگریت وەتاوێ دڵی‌ئەکاتەوە. لەپاشان‌ئەفەرمێ، قەبض هی‌دەرکەوتنی پێناسی نەفسە وەزاڵبونی ئەوپێناسە لەدەرونا، وەپەیدابونی‌بەسط هی‌پەیدابونی پێناسی قەلبە، وەنەفس مادام گەیشتەقۆناغی «سەرزەنش‌کەری»، بری‌جار سەرئەکەوێ وە بری‌جار ژێرئەکەوێ، وە قەبض‌وبەسطەکەی لەوەوەیە خاوەنی‌دڵ والەژێری پەردەی‌نورانییەوە ئەویش هی‌ئەوەتە کەخۆی بەخاوەن‌دڵ ئەزانێت، واتە دلی‌خۆی بەشتێکی «مەوجود»، دائەنێت، وە خاوەنی‌نەفس والەژێری پەردەی تاریکی‌یەوە چونکەخۆی بەخاوەن‌نەفس دائەنێ واتە «اِعْتِراف» بەوجودی نەفس ئەکات.

بەڵام ئەگەر پایەی بەرزبویەوەو لەوپەردانە چویەدەر، واتە لەپەردەی دڵ رزگاری‌بوو هاتەدەر ئەوکاتە هیچ‌حاڵێك ناتوانێ داگیری‌کات وەئیتر لەژێری فەرمانی قەبض‌وبەسطیش دەربازئەبێت، ئیتر نە دڵ ئەگیرێت‌و . . . نەدڵ ئەکرێتەوە چونکە ئەو،لە «وجودی‌نورانی» کەبریتی‌یێت لەدڵ،رزگاری بوە وە «قورب» واتە نزیکی‌ی بێ‌پەردەی‌دڵ‌ونەفس،بۆی دەست‌ئەدات، جائەگەر جارێکی‌تر لەپاش «فەناوبەقا»، «نەمان‌ومان» گەرایەوە، ئەگەرێتەوە بۆلای «وجودی‌نورانی»، کەبریتی‌یە لەدڵ،سەرلەنوێ قەبض‌وبەسط دەست‌پێ‌ئەکاتەوە بەڵام ئەگەر نەگەرایەوە بۆلای وجودی‌نورانی کەوتمان بریتی‌یە لەدڵێکی‌روناك وەهەر لەفەناوبەقادا مایەوە، ئیتر (قەبض‌وبەسط) شوێنی نامێنێ.

شیخ‌عومەر لەزمانی (فارس) ناوێکەوە ئەڵێت. لەپێشا قەبض لەپاشان‌بەسط، لەپاشان نەقەبض‌ئەمێنێ‌و نەبەسط، چونکە قەبض وبەسط، هی وجودن، بەڵام

کەوجود فەنابو وەتیاچو وە بەقا هەربەخودابو ئیتر دڵگیرانودڵکرانەوەیێك نیە.
چونکەخاوەنوڵ هەست بەدڵی خۆی ناکات.

پاش ئەمەش حەزرەتی سەهرەوەردی تۆزێکی تریش لەوردەکاری ئەم باسەئەڕوات، لامەوایە من بەشی پێویست، یان زیاتریش لەسەری ڕۆیشتم.

لێرەدا مەبەست ئەوەبو بزانین «**قەبض وبەسط**»، کەهەمیشە لەدەمی ڕێبوارانی ڕێگەی تەسەووف ئەبیستری بریتی‌یە لەدووحاڵی دڵگوشان وەدڵکرانەوە کەلەڕێبواری ڕێگەی تەصەووف رووئەدەن لەو دڵگیرانەدائەوکەسە ئەوەندەبێزار خەریکە خۆی بکوژێتەوە لەوحاڵەکەیشیا ئەوەندە خۆشحاڵە لەهیچ کوی‌دا ڕێی نابێتەوە.

## مَحْوْ إثْبات، صَحْوسُکرْ، غَیْبة وشُهود:

ئەم سێ مەبەستەش کە هەروەکو خەوف‌ورەجا یان قەبض‌وبەسط سەبارەت بە دوحاڵەتی پێچەوانە هاتون، لەوحاڵانەن کە بەسەری ڕێبوارانی ڕێگەی تەصەووف‌دا دێن، وائێستە تۆزێ لەبارەیانەوە باس ئەکەین.

سەهرە وەردی، لە (**عوارف المعارف**)دا ئەڵێ، مەحو بریتی‌یە لە نەمانو لاچونی پێناسەکانی نەفس، وە ئیسبات بریتی‌یە لەوبەهرەیەی کە بەهوی بادەی (**مەحەبەتەوە**) ، خۆشەویستی‌خوداوە دەس‌ئەدات. یان «**مەحو**» بریتی‌یە لەکوژانەوەو سڕانەوەی داپی کردار لەڕوانگەی فەناوە، کەبڕوانێ بۆنەفسی خۆی، بەڵام، ئیسبات دامەزراندنو سەقامگیربونی داپی‌کردارە بەوشتەی کەخودا پێی داوە، یان‌خودابەشی داوە «**لە**»«**وجود**»، لەهەستی‌ئەو، کەواتە ئەو هی‌خودایەنەك هی خۆی بیت، چونکە خودا پێناسەکانی ئەوبەندەیە سڕیوەتەوە وە ئەوپێناسانەی خەلات‌کردوە کەخۆی ویستویەتی.

وە بەرانبەر بە صەحو وسوکر ئەفەرمێ، سوکر ئەوەتە کە حاڵ فەرمانڕەوایی‌ئەکات

لەعەینی بی‌کاری و لی‌نەهاتوییدا بەکەڵکو بەکارم هەروەکو عەلاماتی ناوی حیساب ،هتد. تائەگاتە سەرئەوەی ئەفەرمیٚ.

ئەی زاهیدی ظاهیربین من چۆن تۆ تی‌گەیینم لە «**قورب**» جگە ئەوەی بڵێم وەکو بۆنی ناوی گوڵاو وایە، لێرەدا شاهی‌نەقشبەند سەبارەت بە پایەی «**قورب**» ئەفەرمیٚ وەکو بۆنی خۆشی ناوی گوڵاو وایە، کەلەناوی **هەمو** «**ذەررە**»یێکی ئاوەکەشا هەیەو کەچی دوشتی لەیەك جیاوازیشن، لەوێدا ئاوەو بۆنی خۆش، لێرەدا «**بەندەیەو**» «**تەجەللا**» ی خوا. «**نوسەر**»

غەززالی لەپاشان ئەفەرمیٚ: بەکورتی ئەوەی لەرێگەی «**ذەوق**» چەشتن وە هەست‌پی‌کردنی دەرونی‌یەوە، بەهرەمەند نەبوبێت، هەرگیز، جگە لەناو، ناتوانی هەست‌بکات بەناوکە بە «**حەقیقەتی‌نبوەت**»، یان بە «**کەراماتی‌ئەولیا**» وە ئەم‌حاڵە یەکێکە لەدەس‌کەوتەکانی رێبواری رێ‌رەوی تەسەووف.

غەززالی پاش باسێکی وردو بەکەڵك سەبارەت بە «**حقیقەتی‌نبوەت**» باسی دەرونی پاك ئەکاتو دەس‌ئەکێشێت بۆ ئایەی «**يَوْمَ لَايَنْفَعُ مَالٌ وَلَابَنُونَ إِلَّا مَنْ أَتَى اللّٰهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ**» وەئەڵیٚ دەرونی «**سەلیم**»، بەو دەرونانە ئەڵێن پاك کرابنەوە لەهەمو خەوشێك، وەتەنها هەر یادی خودایان تیا سەقامگیر بوبێت، وەئەڵیٚ ئەوانەی کەخوا ئەفەرمیٚ «**فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ**» ئەوانەن کەدەرونیان پاك نەبوبێتەوە: دیارە «**قلب**» لێرەدا، ئەوپارچە گۆشتە نیە کەوا لەسینەدا: بەڵکو هەستی دەرونی مرۆڤە، کەهەروەکو ئەندامانی لەش کە دڵیش یەکیٚ لەوانە: دوچاری نەخۆشی ئەبن، هەروایش هەستی دەرونی مرۆڤ: دوچاری نەخۆشی ئەبیٚ: وە هەروا کەئەوان بەدەرمان دەرمان‌ئەکرێن، دەرونیش دەرمانی تایبەتی خۆی‌هەیە: کە گرتنەبەری ئەم رێ‌رەوە، باشترین دەرمانی دەردی دەروونی‌یە.

زوتریش وتمان بەدەردی دەرونی ئەوتریٚ «**صیفاتی رەذیلە**»: خوو خدەی نایەسەند: وە بەڵێمان داوە باسیان‌بکەین، رێ‌رەوی تەصەووف ئەکۆشێت بۆ گۆڕینی ئەوخووخدە بەخۆوخدەی باش «**صیفاتی حەمیدە**».

غەززالی لەکۆتایی کتێبی «**المنقذ**»دا سەبارەت بەکەڵکی هەرەگەورەی رێ‌رەوی تەصەووف ئەڵیٚ: کەڵکی‌ئەم زانیاری‌یە ئەوەتە راستەقینەو «**یەقین**»یە: وەخاوەنی باوەری بی‌ئالایش‌و بی‌چەنوچۆن، هەم لە خودا ئەترسێت هەم ئومێدەواریش ئەبێت بەپاداش «**خوف وەرجا**»: وەئەم حاڵەتە ئەبێتە دیوارێك لەنێوانی ئەوو سەرکەشی‌کردن

لەفەرمانی خوادا، وەئەگەر هاتو هەڵەیێکیشی کرد هی بێ باوەڕی نابێت، چونکە مرۆڤی خاوەن باوەڕ قەت ناکەوێتەوە شوێنی «نەفسی ئەمارە». واتە هەستی کەج ڕەوی لەدەروونا، وە بەتەواوی دوری ئەگرێ لە سەرکەشی ولاڕیگری.

لێرەدا بەشەکەی ئەمجارەمان دوایی پێ ئەدێرین وەئیتر لەمەولا بەیارمەتی خوای گەورە وا ئەکەوینە وەڵامدانەوەی هەموی ئەوپرسیارانەی کەهێنان وەلام نەدراونەتەوە.

تائێرە توانیمان زۆرشت سەبارەت بەناسینی تەسەووف روون کەینەوە وە وەڵامی زۆرێك لە پرسیارە سەرەتایی و بناغەییەکان بدەینەوە، ئەو پرسیارانەی کە کردبومانە درۆشمێك، واتە تەسەووف چی یە؟ تەسەووف چۆن وەلەکەیەوە هاتوە؟ فەرقی نێوانی فەلسەفەو تەسەووف چی یە؟ تەسەووفی بەرلەئیسلام کامەو چۆنە؟

ئاکام وەئامانج لەتەسەووف داچی یە؟

ئەمانە پرسیارێکن کەلەسەرەتاوە تائیستە کرابونە درۆشم وە وەڵامی هەموی درایەوە، بەڵام لەمەولا زۆر پرسیاری تریش دێنە پێشەوە کە بەیارمەتی خودا وەلامی ئەوپرسیارانەش ئەنوسین.

جائەمەش ئەوپرسیارانەی کەلەممودوا وەلامیان ئەدەینەوە، بەلام نەك بەتەرتیب، بەڵکو هەرجۆری پێویست بکات

**١ – تەسەووفی ئیسلامی لەکەیەوە دەست پێ ئەکات؟ وەئایاهەر لەرۆژگاری پەیامبەرەوە «درودی خوای لەسەر» تەسەووف هەربوە؟**

**٢ – چۆن بزانین کەتەسەووف دەق بەدەق لەگەڵ ئاینی ئیسلامایەو جیاوازنیە وەلەئیسلامەوە سەرچاوە ئەگرێت؟**

**٣ – ڕێ ڕەوی تەسەووف چی یە وەچۆن پەیرەوی لێ بکەین؟**

**٤ – تەسەووف بەچی دەست پێ ئەکات وەپایانی کامەتا؟**

**٥ – شتە بەکەڵکەکانی ئەم ڕێ ڕەوە لەڕوانگەی ئایین و کومەڵایەتی و ژیانی مرۆڤایەتی وە چی یە؟**

٦ – ئایا تەسەووف هیچ زیانێکی هەیە بۆئاین، یان بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، وەبەتێکرا بۆ ژیانی مرۆڤ؟

٧ – ئەو ئایەت وحەدیثانەی کەپیشاندەرو روونکەرەوەی رێڕەوی تەسەووفن کامەن؟

٨ – رێڕەوی راستی تەسەووف کامە، وەفەرق لەنێوانی صوفی و موتەصەوویف دا چی یە؟

٩ – هەر لەسەرەتاوە باسمان لەیەقینکرد، ئایا کەڵکی گەیشتن بەپلەی یەقینچی یە؟

١٠ – چۆن ئەگەین بەپلەی یەقین وە چەن رێگەو رەوشهەن بۆ (سلوکی) رێگەی یەقین؟

١١ – پاش گەیشتن بەپلەی یەقین خوودەی مرۆڤ وەهەڵسوئیشتی چی بەسەردێت؟

١٢ – مرۆڤ لەمزانیاری یەگرنگەدا گەیشتوەتە چپلەیێك؟

١٣ – (پی ناس)ی، صیفاتی ستایشکراو «حمیدة» چی یە، وە (پی ناس)ی صیفاتی رەزیلە «ناپەسەند» کامە؟

١٤ – پەیرەوی نهێنیو ئاشکرا «ظاهیرو باطن» لەشەرع، چۆن ئەکرێت؟

١٥ – کردەوە بەرزەکانی صوفیەکان کامەنا وەئەخلاقی صوفی راستەقینە چۆنە؟

١٦ – رێڕەوی صوفیەکان بۆگەیشتن بەمئاواتە چۆنبوە؟ «جگەئەمانەش برێ پرسیاری تایبەت دێنەپێشەوە. وەکو.

١٧ – ئایا رێڕەوەکان «طەریقەت»ەکان لەیەك جیان؟ وەتەریقەت بەچی ئەڵێن؟

١٨ – ئایا شیخیەتی وەئیرشادکردن، یان شێخبونو موریدبون، لەگەڵ تەسەووفدا هەریەکێکن یان جیاوازن. وەچۆن؟

١٩ – لە «إصطلاح» یتەسەووفدا بەکێ ئەڵێن شێخ واتە «مورشید» وەبەکێ ئەڵێن، وەلی؟

٢٠ – کەشف وەکەرامات، چین وەچۆن لەیەك جیائەکرێنەوە؟

٢١ ذیکر، رابیطە، لەطائف، قەلب، تەوبە، سلوك، جەذبە، حالّ، مەقام، تەوەجحوە، ریازەت، نەفس، شەطەحات، موشاهەدە، موراقەبە، ذەوق، ئیشراق... هەتەد... ئەمانە چین وەچۆنن.؟

٢٢ – مەبەستێکی گرنگ هەیە ئەویش بریتی یە لە «ئەدەبی تەسەووف» یان کارێك کەئەم رێڕەوە کردویەتە سەری (وێژەی) زوانەکانی ئەمناوچەیە بەتێکرایی، وەزمانی کوردی بەتایبەت.

**٢٣ - وشەی صوفی وە تەصەووف لەچیەوە سەرچاوەی گرتووە؟ ئەم پرسیارانە پرسیارێکن لە داهاتودا وەڵامیان ئەدەینەوە وەبێگومان لەکاتی شیکردنەوەو لێکدانەوەیانا شتی تازەی زۆریتریش روون ئەکرینەوە.**

ئیستە یەکەم پرسیارمان ئەکەین ، وەئەڵێین تەصەووفی ئیسلامی لەکەیەوە دەستی پی کردوە .؟

ئێمەلەمەو پێش رونمانکردەوە کە تەصەووفی ئیسلامی هیچ جیاوازیێکی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیدانیە بەڵکو سەرەرای ئەوەش ، کە موبەمو ئەبێ پەیرەوی بکرێت لە «ظاهیری شەرع» ، ئەبێ بەتەواوی پەیرەوی بکرێت لە کردارو گوفتاری پەیامبەری گەورەش ، وەجگەئەوەش ئەبێ هەوڵبدرێت کە لەدەرونیشەوە ، پەیرەوی بکرێت لە ئاینی ئیسلام ،

وە لەدەرونیشەوە صوفی خۆی بپارێزێت لەهەمو کارێکی ناپەسەند ، وەپاش هەموی ئەمانەش ئەبێ سۆفی بگاتە پایەیێک کەپەرستشەکانی تەنها بۆئەوە نەبێ کە ئەمە سپاردەیێکی خواییەو لەسەریەتی کەئەنجامی بدات ، بەڵکو ئەبێ لەوپەرستشە خۆشنودبێت وەگەشەی پێ بکات و ئاواتی بۆ بخوازێ ، هەروەها سوفی ئەگاتە رادەیێک کە جەورو ئازاریشی بەلاوە ئاسانە ، بەڵکو چونکە ئەو جەورو ئازارە هی خوایە ئەویشی هەروەکو پاداش وشاباش ، بەلاوە خۆش و شیرینە «قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا» ، کەواتە پەرستش وای لێ دێت ، ئەبێتە ئاواتو ئارەزو ، ئەبێتە ئامانج .

بۆنمونە ئەڵێم ئەگەر لەناو لاویدا تۆ کەسێکت خۆش ویست ئایا پێ ویستی بەوەهەیە کەئەوکەسە بەتۆبڵێ ، وەرە منت خۆش بوێت ، یان بڵێت ئەگەر تۆمنت خۆش بوێت فیسار پاداشت ئەدەمەوە؟ بێ گومان هەرگیز ، چونکە تۆخوا خوائە ئەو بت دوبێ ، ئەو وەڵامت بداتەوە ، یان کارێکت پێ بسپێرێت ، یان داوای شتێکت لێ بکات .

جائەمە «عیشقی مەجازی» یە ، واتە خۆشەویستی دەس هەڵبەسو نەفسی ، وەئێرەتی ، «وەقتی» ، وەرەسەیری خۆشەویستی جاویدانەی بێپایانو ، دوانەهاتو ، واتە «عیشقی حەقیق» بکە ، جا لەم حاڵەدایە کە پەروانەی پەرسوتاوی «عیشقی حەقیق» رابیعەی عەدەوییە ، ئەفەرمێ خوایا ، من تۆنەبۆ بەدەس هێنانی

باغی بەهەشت ئەپەرستم وە نە لەترسی ئاگری جەهەننەم ، بەڵکو لەخۆشەویستی تۆدایە کە تۆ ئەپەرستم» ، جا کە ئێمە تەسەووفمان ئابەم جۆرە ناسی ، وەبۆمان دەرکەوت کە تەسەووفی ئیسلامی بریتی‌یە لەئەوپەری ئامادەیی ، بۆ بەڕێوەبردنی فەرمانی خودا ، بۆمان روون ئەبێتەوە کە هەر لەرۆژێکەوە نوری ئیسلام درەوشاوەتەوە وە خودا ئیسلامی بەخەلاّت نارد بۆپەیامبەری گەورە «**دروودی خوای لەسەر**» ؛ وە دەرونی پیرۆزی ئەوذاتە گەورەیە بەنوری خوا روناکبو ؛ وەسینەی لەهەمو ناخاوێنییەکی «**ئینسانی**» پاک کرایەوە ، هەروا کە خوای گەورە ئەفەرمون «**أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ وَوَضَعْنَا عَنْكَ وِزْرَكَ الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ**» ؟ .... **هتد**» ؛ هەرلەوکاتەوە ئیتر تەصەووف ، دەس پێی ئەکات ، واتە حەقیقەتی شەریعەت ؛ بەڵێ ئەگەر ئیسلام بۆئێمە بریتی بێت لە پەیرەوی‌کردن لە «**ظاهیر**» ی شەرع ؛ بۆ پەیامبەری گەورە پەیرەوی‌بوە لەحەقیقەتی شەرع ، جا پاش ئەوە ئەونوری حەقیقەتە بەهۆی ئەوکانگەی نورەوە رژاوەتە دەرونی یارانو نزیکانی ئەوذاتە ، وەکو چوار یاری پەیامبەر ، بەڵکو هەموی ئەویارانەی کەبەراستی‌ودروستی باوەڕیان پێی‌بوەو فەرمانیان بردوە ؛ هەروەها بەڵگەی‌مێژوویی بەدەستەوەیە کەبری لەم‌یارانە زیاتر لەوانی‌تر لەم‌ڕێڕەوەدا پێش‌کەوتون وەکو «**حوذەیفەی‌بن‌الیمان العبسی**». حوذەیفە ، کەلەپێغەمبەرەوە دروودی‌خوای لەسەر ، بەم‌پایە بەرزە گەیشتبو ؛ ئەڵێت پێغەمبەری‌گەورە هەرچی روئەدات و روی‌داوە تارۆژی قیامەت هەموی بۆگێراومەتەوە یانوەکو «**حارثة بن مالك**» کەپێغەمبەرئەفەرمی «**مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَىٰ مَنْ نَوَّرَ اللهُ قَلْبَهُ فَلْيَنْظُرْ إِلَى حارثةِ بن مالِكْ**» **واتە هەرکەس پێی‌خۆشە ئەوکەسەی چاوپێی‌بکەوێت کەخوا دەرونی روناک‌کردوە باسەیری حاریثەی کوڕی مالیك بکات**» .

جاهەروەکو قوشەیری «**٩٨٦ – ١٠٧٤م**» لەرسالەکەیا ئەڵێ ، لەزەمانی پەیامبەری گەورەدا بەهۆی نزیکی ، وەهاوەڵی کردنی پەیامبەری‌گەورەوە ، کە سەرچاوەو کانگەی نوری خوداوەندی‌یە ، تەنها بەوەی ، کەئەبونە یارو هاوکاری ئەوان ، بەونزیکی‌یە هەمودەرونێکی ژەنگاوی پاک‌ئەبویەوە وە «**شەرەف‌سوحبەت**» ، واتە سەربەرزی هاوڕێیەتی ، ئەیبردنە پلەوپایەیێکی «**مەعنەوی**» ، وەها ، کەئەمرۆ بەهیچ تێکۆشانو دەس‌مایەیێك ، دەستی ئێمە ناکەوێ ، وە «**حالەتی عین الیقین**» دەستی ئەدا بۆیان ، ئەگەر ئەوباوەڕە بەرزە نەبوایێ «**بیلالی حەبەشی**» چۆن بەرانبەر بەوهەموە ستەمە خۆی‌ئەگرتو ئەیوت ، «**أحد أحد**» ، وە چۆن ئەم‌خەڵکە ئامادە ئەبو گیانی بخاتە

سەرلەپێی دەستی وەبرِوات بەرەوپێشی مەرگێ. ئەورۆژە بەرێرەوانی ڕیگەی حەقیقەتی ئیسلامی ، وتراوە ، «**ئەصحاب**» ، پاش ئەوانیش ، بە شوێن کەوتوانی ئەوانیان وتوە ، «**تابعین**» ، وە ئەکرێ بڵێین ، هەموی ئەوانە ، یان زوربەێیکی نزیك لەوەی کە بکرێ بڵێین هەمویان ، هەموی هەربەوجۆرە خاوێن وپاكبون وە مویێك لەکردارو گوفتاری پەیامبەر ، لایان نەئەدا ، جا لەسەردەمانی «**تابعین**» دا وردەوردە موسوڵمانەکان کەوتنە سەر ڕێگەی ماڵوسامان بەیەکەوەنان و بەدەس هێنانی پلەوپایەی دنیایی و خۆش گوزەرانی ، جالێرەدایەو لەم بواری ئازمونو تاقی کردنەوەدایە ، ئیتر برێ لەوانەی کەئەیانەوێ بەخاوێنی بمێننەوە ، وە خۆیان لەم بازارەگەرمو هەڵخەڵەتێنەرە ڕزگار کەن ، دەس ئەکەنە سەرزەنشی لاڕێ ڕەوان ، تەنانەت لەدژی خەلیفەکانی ئەمەوی ، وەکو (**ئەبوذەری غەففاری**) ، وە خۆیان گرتە کەنارەوە ، کاتێ کەزانی یان ئەم هەموە خواروخێچی بە بەوان ڕاست نابێتەوە ، وەئەم هەموە کەلەبەرە بەوان پرِنا کرێتەوە ، وەئەم هەموە کۆسپە بەوان تەخت ناکرێ ، ناچار کەوتنە ئەوەی کەتێکۆشن هیچ نەبێ «**ئیمانی**» خۆیان بە سەلامەت دەرکەن ، وە ئەگەر بۆیان کرا لەڕێگەی ئامۆژگاری یەوە خەڵك لەم داوە ڕزگارکەن ، جا ئالەو سەردەمەوە کەموسوڵمانی ڕاستەقینە خۆیان ئەگرتەکەنارەوە لەفریوخواردنی سامان وپلەوپایە وە ناوی «**ئەصحاب**» کەم کەم ئەبرِایەوەو دوایی ئەهات ، ناوی تازە برِا بەسەری ئەم دەستەی خواپەرستە ڕاستەقینەدا ، وەیەکێ لەوناوانە کەنرا «**صوفی**» بو ، هەروەها وشەی «**زاهید**» ، هەرچەن بەرلەئیسلامیش وشەی زاهید لەناوی عەرەبا بیسترِاوە ، وەهەروەکو زوتریش وتمان ، زاهید بەکەسێ ئەوترێ کەپشت هەڵ کات لەماڵوسامانو پلەوپایەی دنیایی ، زەرقوبەرقی جیهان نەتوانێ فریوی دات ، جا ئەم وشەیە بەر لە ئیسلامیش لەناوعەرەبا بوە ، بەڵام وشەی صوفی ، لەسەردەمی «**تابعین**»ە وە ، واتە چینی پاش «**ئەصحاب**» ئەکەوێتە بەرچاومان .

هەرچەن ئێمە لەدوایی دا زۆربەکورتی باس ئەکەین سەبارەت بەوەی کە سەرچاوەی وشەی (**صوفی**) لەچی یەوەیە ، بەڵام ئیستە چونکە ئەمانەوێ ڕوونی کەینەوە کەلەکەیەوە وشەی صوفی بەکاربراوە ئەڵێین لەسەردەمی (**تابعینەوە**) ئەم وشەیە وتراوە ، بەکەسانێك کەخۆیان لاداوە لەزەرقوبەرقی کۆکردنەدەی سامانو دروس کردنی کۆشك وتەلارو هەڵخڵەتان بەپایەوپلەی دنیایی ، وە هەموی کاتی

خۆیانیان تەرخانکردوە بۆخوا پەرستی‌و «فیکروفیکر» ، جا لەمانە دەستبۆدوبەڵگەی گرنگ ڕائەکێشین ، یەکێکیان ئەوەتە کە «**حسن البصری**» (۲۱ / ۱۱۰) کوچی (٦٤۲ – ۷۲۸) زاین کەیەکێکە لەگەورەپیاوانی ڕێرەوی تەصەووف لەباسی سەرگوزەشتی خۆیا ئەڵێت «**رأیتُ صوفیاً فی الطّواف ، فأعطیتُه شیئاً فلَمْ یأخذهُ وقالَ معی اربعة دوانیقَ فیکفینی مامعی**» واتە لەکاتی تەوافی کەعبەدا چاوم کەوت بە «**سوفی**» یێك شتێکم دایێ لێی وەرنەگرتم ، وەگوتی خۆم پێنج «**دراوم**» پی‌یە وەئەوەی کەپێمە بەشم ئەکات .

هەروەها «**سفیان الثوری**» کەلە تابیعینە (۹۷ – ۱٦۱) کۆچی ئەڵێت «**لولا أبو هاشم الصّوفی ماعرفتُ دقیق الریاء**» .

هەر لە سەدەی یەکەمی کۆچی‌یەوە شایەد هەر لەنیوەی سەدەی یەکەمیشەوە ، ناوی (**سوفی**) هاتەناوەوە ، وەئەم‌ناوەش هی کەسانێك‌بو کەبەوپەڕی توانالی‌یەوە تێئەکۆشان بۆ خواپەرستی‌و پارێزکاری ، وە دوورەپەرێزی لە کۆکردنەوەی ماڵ‌وسامان وخۆهیلاك‌کردن بۆ بەدەس‌هێنانی پلەوپایەی دنیالی ، گومانیشی تیانیە کە پۆشاکی «**خوری**» واتە «**صوف**» هەرلەمێژەوە سیمای هەژاران‌و بی‌نەوایان‌بوە ، وە ئەوکەسەی کە ئەوپۆشاکەی لەبەرکردبێت ، یان هی‌نەبوبوە یان هی «**تەواضوع**» ، واتە خۆبەزل‌نەزانین ، لێرەدا باشتروایە دەس ڕاکێشین بۆ وتارێکی حەزرەتی عومەر خوای لێ‌ڕازی‌بێت ، کەلە ستایشی پیغەمبەری گەورەدا درودی‌خوای‌لەسەر بێت فەرمویەتی «**بأبی أنتَ وأمّی یارسول الله ..... ولبِستَ الصّوفَ وركبْتَ الحمارَ ...هتد**» واتە باوکودایکم بکەمە قوربانت ئەی پەیامبەری‌خودا ... جا زۆرێك لەرەوشە بەرزەکانی‌پەیامبەر باس‌ئەکات پاشان‌ئەڵێ «**تۆبەرگی‌خوری‌ت ئەپۆشی وەسواری گوێدرێژ ئەبویت .... هتد**» ئەمە بۆئەوەتە پیشان‌بدات کەپەیامبەر تاج‌ڕادە ، دژی خۆبەزل‌زانین بوە .

وە تاج‌ڕادەش پۆشاکی «**صوف**» هی بی‌نەوایانە لەکتێبی «**التصوف الاسلامی**» دوکتور موبارەك‌دا وە هەوەها لەکتێبی «**المدخل الی التصوف الاسلامی**» «**محمود ابو الفیض منوفی**» ئەم‌باسانە بەدوورودرێژ باس‌کراون هەرلەم‌کتێبە دواییەدا وتارێکی «**ئیمام مالیکی کوری ئەنەس**» ۹۰ – ۱۷۹ کۆچی خوای‌لی‌خۆش‌بێت ئەگێڕێتەوە کە ئەڵێ «**مَنْ تَشَرَّعَ ولَمْ یَتَصَوَّفْ فَقَدْ تَفَسَّقَ ومن تصوّف ولم یتشرّع فقد تزندق ومن تشرّع ثم تصوّف فقد تحقّقَ**» واتە ئەوەی پەیڕەوی‌کرد لەشەرعو پەیڕەوی نەکرد لەتەصەووف ئەوە فاسقە ، ئەوەش

پەیرەویکرد لەتەصەووف وەپەیرەوی نەکرد لەشەرع ئەوەزەندیقە «**بێدینە**» بەلاّم ئەوەی پەیرەویکرد لەشەرع وەپاشان پەیرەویشیکرد لەتەصەووف ، ئەوەگەیشتوە بەحەقیقەت ، واتە «**راستەقینە** ، **یان ئەوپەڕیباوەڕ**» .

جا ئەوەتە سەیرئەکەین ، وردە وردە وشەی تەسەووف هەر لەنیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی کۆچییەوە ، دێتە ناوەوە وە وردە وردە پەرە ئەسێنێت وتەسەووفیش شێوەیێکی تازە وەرئەگرێت وئەبێتە «**مەدرەسەیێکی**» ناسراوو ، قارەمانی خۆی دەخاتە گۆرەپانی خودا دۆستییەوەو هەتادێت ، باشتر «**سەیقەل**» ئەدرێت و باشتر روون ئەبێت وە ئەدرەوشێتەوە .

جائەکرێت بڵێین کەتەسەووف ، واتە بەشی نهێنیودەرونیی شەریعەت ، هەر لەپەیامبەریگەورەوە دەستپێئەکات ، وەزۆرێك لەهەڵبژێرراوانی «**ئەصحاب**» ، بگرەلەهەزاران کەسزیاتر لەوان ، کەزۆرێکیان لەکتێبی «**المدخل الى التصوف الاسلامیدا ناویانبراوە**» لەوذاتە گەورەوە دڵیان روناكبوەتەوە ، وەبونەتە خاوەن «**بەصیرەت**» واتە «**دیدەیدەرون**» پاشان وردەوردە تائەگاتە «**حەسەنئەلبەصری**» ، وە «**داوود الطائي**» ، وە (**معروف الكرخي**) وە «**سری السقطی**» وە «**جونەیدی بە غدادی**» کەلە (٢٩٧) کۆچیدالەدنیا دەرچوە دێتە خوارەوەو لەشوێنەکانیتری جیهانی ئیسلامیشا چوزەئەکات وسەرهەڵئەدات وەگەشە ئەکات ، هەروەکو وتمان سەرچاوەی ئەمناوەش هەر لە کردەوەی هەژارانەی ئەوگەورەپیاوانەوە هاتوە ، هەر لەپەیامبەریگەورەوە کەستایشکراوە بە پۆشینی بەرگیخوری ، هەتادێتەخوارەوە ، وەلەسەرەتادا گەورەیی ، ناوی «**ئەصحاب**» ، یارانیپەیامبەر ، نەیهێشتوە هیچناوێك بدرەوشێتەوە ، نمونەیتریشمان لەو ناوانە زۆرە کە لەناویئیسلاما هەربوەو کەچی ناویشی لێنەنراوە ، وەکو وشەی «حاجی» کە لەسەرەتادا هەرنەبوە ، یان وشەی «مەلا» .

وە نمونەیکۆنتریش وەکو «**حەواری**»یەکانی حەزرەتی عیسی کەحەواری ئەبێتە «**کراسیسپیپۆش**» ، کەچی وردە وردە بوەتە ناوێکی هەمیشەیی بۆدەستەیێك لەمرۆڤ ، جاوشەی «صوفی» برا **بەسەر ئەو کەنارەگیرە خواپەرستانەدا ، کەبەداخەوە لەپاشان زۆری وەهابون کەلەسوفیەتی ، تەنها پۆشاكو سیپالەکەیان بو ، وە لەواتاو راستەقینە بێ بەشو بەتاڵ و پوچبون ، وە زوورجار ئەوبەرگەئەبویە چەکێکی خەڵکڕوتاندنەوەو خەڵكفریودان ، بەلاّم قارەمانانی ئەمڕێرەوە بەرزە ، مێژو جیایان ئەکاتەوەو . بەخەڵکیان**

**ئەناسێنێت ، وە گزی‌کەرانیش لە هەر پۆشاکێکا بن ، ئەوانیش هەر مێژو بۆمانی باس‌کردوە ، وەشوێنەواری خاوەن شوێنەواری بەرز ئەوەندە زۆرن کەصەدان کتێب ناتوانێ تۆماریان‌کات ، وە هەتا هەتایە هەر رووناکین ، بۆخاوەن دڵان .**

**پرسیار : (چۆن‌بزانین کەتەسەووف دەق‌بەدەق لەگەڵ ئاینی ئیسلامایەو جیاوازنیە ، وەلەئیسلامەوە سەرچاوەئەگرێت ؟)**

وەڵام : لەگەڵ هەموئاسانییەکی وەڵامی ئەم‌پرسیارەدا ، گیروگرفتێکی زۆریش دێتەسەری ڕێگەی وەڵامی ئەم‌پرسیارە وەئەمەش لەبەر چەن هۆیێکە .

یەکێ لەوشتانەی کەبرێکی دودڵ کردوە سەبارەت بەوەی کەتەصەووف گۆیا «**بیدعەت**»ی تێدایە ، «**بیدعەت**» «**واتە ، شتی تازە ، یان شتی بێگانە و نەناسراو بەگوێرەی ئایین**» ، ئەوگوفتارانەیە کەلەدەمی برێ لەسۆفی مەسلەکەکان بیسراوە ، وەکو فەرمودەکانی بایەزیدی بەسطامی و محي الدين عربي ، وەذاالنون‌مصری وە حەللاج ، وە شیخی ئیشراق ، سەهرەوەردی ، «**ئەم سەهرەوەردی یە لەحەڵەب‌دا دراوەلەدار ، وەئاموزای ئەوسەهرەوەردی‌یەنە کە ئارامگە کەی لەبەغدا دایە ، وەسەرۆکی تەریقەتی سەهرەوەردی‌یە وە خاوەنی کتێبی «عوارف المعارفە»** ، «**کە کتێبێکی سەرچاوەیە بۆ ناسینی تەسەووف**» . وە صەدان کەس لەگەورەترین مەردانی ئەم‌ڕێگایە ، مەبەستی دوهەمیش برێ کردارو گوفتاری پەیرەوان ، یان موریدەکانی ئەم گەورە پیاوانەیە ، بەتایبەت پاش مەرگی خۆیان ، کە وایان‌کردوە لەوپیاوە گەورانە ، وەکوئەوەی شەریك بۆخوا دابنرێت ، سێ‌هەم ، کردەوەو گوفتاری برێ «**مُتَصَوِّف یان مُتَشَیِّخە**» ، واتە خۆ بەسوفی‌کردو ، یان خۆ بەشێخ‌کردویە ، کەکردەوەی ئەمانە براوە بەسەری تەسەووف‌دا ، وەئەگەر ئەو دەس‌برانە بەسوفی دانێین ، دیارە ، شکاف‌و درێنێکی گەورە ئەکەوێتە نێوانی ئیسلام‌و تەسەووفەوە .

سەبارەت بەباسی‌یەکەم ، واتە «**شطحات**» ، ئەبێ‌بڵێین ، شەطەحات بەوگوفتارانە ئەڵێن کەلەدەمی برێ لەوسوفی مەسلەکانە دەرئەچێت ، کە ناوەرۆك‌و ، واتا ڕەواڵەتیەکەیان ، پێچەوانەی دەستوراتی قورئان‌و ئیسلامە ، بەڵام وتنی ئەوجۆرە شتانە چەن هۆیێکی هەیە ، لەوانە ، ئەوەتە ، ئەوکەسانە وان لە (**حالی‌غەیرەطەبیعی**) دا ، واتە وان لە (**دەمی دوور لەڕاستەقینە**) دا ، کەئەتوانین وەکو «**سەرخۆشی و مەستی**» لێکی دەینەوە ، بۆئەوانەی کە خۆیان کەوتنە ئەوبازارەوە ، ئەزانن ئەودەمە چۆنە .

جاهەروەکو کەمەست لێی ناگیرێت، چونکە هۆشی بەخۆیەوە نیە، بۆئەوانیش ئەبێ وای بزانین، بۆچی ؟، چونکە پاش لاچونی ئەوحاڵە، هەرهەمان خواپەرستەو زاهیدو خۆبەهیچزانەکەن، یان، ئەوەتە، وتەکانیان لەئاگاداریەوەیە، بەلاَم ئەو ئاگاداری یە هەربۆخۆیانە، وە ئەوگوفتارانەیان دەس نیشانێکە بۆحاڵی دەرونیان، یان، بۆ ئەوشتانەی کەلەپێش چاویان «کەشف» ئەبێت واتە خوای گەورە پیشانیان ئەدات، کاتێکیش پرسیاریان لێ کراوە توانیویانە ئەو وتانەی خۆیان بەراوردبکەن لەگەڵ ئایەتی قورئان، یان فەرمودەی پەیامبەرا «دروودی خوای لەسەر» وە دەق بەدەق کێشانەی بکەن بەکێشانەی ئایین، وە لەکێشانەدا سەری نەکردوەو لای نەداوە، جگەئەمەش برێ شتی تازەشیان خستوەتە بازاری باس کردنەوە ئەوشتانەش هەربونەتە هۆی کێشە» وەکو «وەحدەتی وجود» یان «حولول» یان «اتحاد»، کە ئەمانیش هەریەکەی پێویستی بەباسێکی جیاوازە، بۆنمونە ئەڵێن، وەحدەتی وجود لەباوەڕەکانی «محي الدين عەرەبی» یە، بۆ باشترتێگەیشتن لەم باسە ئەتوانی سەیری پێشەکی کتێبی «اللمع» ی «ابی نصر السراج» بکەیت کەلە (٣٧٨) کۆچی دا لەدنیا دەرچوە، یان کتێبی «شطحات الصوفية» ی «عبد الرحمن بدوی» هەروەها کتێبی «التصوف الاسلامي» «د. زكي مبارك» وەزۆر کتێبی تریش، مەبەست ئەوەبو بڵێم «شطحات»، واتە، وتاری گومان لێ کراوی برێ لەگەورەپیاوانی شاریگەی صوفیەتی، زۆرجار بوەتەهۆی گومان وەدودڵی برێ لەماموستایانی شەرع، بەڵام لەپاشان سەرلەنوێ دەرکەوتوە کە ئەوگومانە بێ جێگەبوە وەکو ئەوەی کەشێخی ئەشعەری کەیەکێکە لەگەورە پیاوانی شەرع، هەموی فەرمودەکانی «محي الدين عربي» روون کردوەتەوەو ساغیش کردوەتەوەکە هەڵەنیە وە لەگەڵ شەرعایەك ئەگرێت.

بەداخەوە زۆرێك لەگەورەپیاوانی ئەم رێگەیە، بەهۆی ئەو گوفتارانەیانەوە، توشی دەردی سەری و دەرکران ودەربەدەری بوون، تەنانەت توشی کوژرانیش، وەکو «حەللاج» وە «يحيى بن حبش السهروردي» بەناوبانگ «بەشێخی ئیشراق»، بۆنمونە، یەکێ لەو وتارانە واتە شەطەح ئەوەتە، بایەزیدی بەسطامی ئەڵێ ئەم «جوبەیە» م یان عەباکەم، هیچی لەژێرانیە «الله» نەبێت، ئەمەیان بۆداناوە بەکوفر، لەکاتێکا لای صوفیەکان، مەقامی «سلطان الاذكار» یان مەقامی «فناء الله» شتێکی راستەو گومان لێ نەکراو، «سلطان الاذكار» ئەوەتە کە دڵ و دەروونی مرۆڤ وە هەموزەرێکی لە لەشی «ذیکری الله» ئەکات، کەواتە ئەگەر بڵێت ژێری عەباکەم

جگەاللەنەبێ هیچی تیانیە درۆ ناکات، بەلاّم لەگەلّ «**ظاهیری شەرعا**» ناگونجێ ئەگەر کەسێ جانتایێکی بەدەستەوەبێت هەموی پربێت لەوگوڵە زێڕانەی کە لەناوی «**الله**» دروس کراون وە ئەکرێنەمل، وەبلّێ ئەم جانتایە پڕیەتی لە «**الله**» «بۆچی **کوفرە**؟.

بەبارێکی ترا، ئەوچی بکا، کە هەم والەحالّەتی مەستی ڕۆحی دا، وەهەم، ڕاستیش ئەلّێت، فەنا فی الله یش ئەوەتە کە خۆی لەیاد ئەچێتەوە وەلەپێش چاوی «**بەصیرەت**» واتە دەرونی ئەودا، هەرچی ذەررەو تۆزە گەردێکە هەموی ذیکری «**الله**» ئەکات. لەهەموی کەونا.

هەروەکووتمان باسی «**شەطەح**» خۆی هەرگیز بەکتێبێك تەواو نابێت، لێرەدا مەبەست ئەوەبو بلّێین یەکێ لەوشتانە، کە برێکی والی کردبو، وا بزانن کە تەصەووف لەئیسلام جیاوازییێکی هەیە بیستنی ئەوجۆرە فەرمودانەبوە لەپیاوچاکان، کە نەیان توانیوە لێی تێ بگەن تا لەپاشان ڕوون کراوەتەوە.

جائیستە ئەلّێین، یەکەم بەلّگەمان بۆئەوەی کەتەسەووف لەئاینی ئیسلام جیانیە، کردارو گوفتاری گەورەپیاوانی ڕێگەی تەسەووفە، کەمویێك لەشەرع لای نەداوە وەسەرەڕای شەرع، وەرع، وە پارێزکاری دەرونیشیان کردوەتە پیشەی خۆیان، دێنەوە سەری ئەوەی بلّێین، تەسەووف چی لەمرۆڤ ئەوێت، ئایائەوشتانە تەسەووف لێیانی داوائەکات، پێچەوانەو دژێ ئاینی ئیسلامە یان نا، وە ئایا ئەو وشانەی کە لەتەسەووف دا هەن، وەکو تەوبە، ذیکر، «**مجاهدە**، **یان**، **جیهاد لەگەلّی نەفسا**» وە زۆرشتی تریش ئایا لەقورئانا هەن، وئاینی ئیسلام دەستورئەدات بە پەیڕەوی لێ کردنیان، یان نا، ؟.

وەلاّمی ئەمپرسیارە زۆر ڕوناکە، وەهەرچی ئەوشتانەی کەوان لەبازاڕی تەسەووف دا، وەدلّی خاوەن دلّانی شەیدای خۆی کردوە، یەکە یەکەی لەقورئانا هەیە، یەکەم هەنگاوێك کە موریدێك «واتە **خوازگاریك**»ی ڕێگەی تەسەووف هەلّی ئەگرێت، پەشیمان بونەوەیە لەکردەوەی ناشیرینی لەوەپێشی خۆی، ئەودەس هەلّگرتنەش «**تەوبە**»کردنە، تەوبە، کەی ئەکرێت؟ بێ گومان، دەرونێك کەتەوبەی نەکردوە دیارە دەرونێکە هێشتا وا لەگومڕاهی و سەرلێ شێوانا، لەمکاتەدا قورئان خاوەنی ئەوجۆرە دلاّنە بەم چەشنە ئەناسێنێ، کەئەفەرمێ؟

«صُمٌّ بُكمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لايَعقِلونَ» . «فهم لايبْصُرون» ئەفەرمیّ «أفلم يَسيروا في الأَرضِ فَتكونَ لَهُمْ قلوبٌ يَعقِلونَ بِها أو آذانٌ يَسْمَعونَ بِها فإنّها لاتَعمى الأبصار وَلكِنْ تَعمى القلوبُ التي في الصُّدور» ، بەڵێ دڵ هەیە ، چاو هەیە ، گوێ هەیە ، بەڵام هەموی کوێرایی داهاتوەو ریّگەی راست بەدی ناکات ، وەچاکەو خراپە لەیەك جویّ ناکاتەوە ، هەروەها ئەفەرمیّ «أفلا يَتدبّرون القُرآنَ أمْ على قُلوبٍ أقفالُها» ؟ یان ئەفەرمیّ «كَلّا بَلْ رانَ على قلوبِهِمْ» واتە دڵیان داپۆشراوە بەژەنگ ، ئەگەر ئایەتی قورئانیان بۆ بخوێنیتەوە ئەڵێن ، ئەفسانەیە ، «إذا تُتلى عَليهِ آياتُنا قالَ أساطيرُ الأوّلين» . «كَذلِكَ يطبعُ اللهُ على كُلِّ قلبٍ متكبّرٍ جبّار» جا هەربەمچەشنە کەلیمەی «في قلوبهم مرض» لەزۆرشوێنی قورئانا هاتوە. لەقورئانی پیرۆزدا باسی «قلب» ئەکات ، هەم بەستایش و رەزامەندی ، وەهەم بەرەخنەلیّ گرتن وسەرزەنش ، دیارە مەبەستیش لەقەلب ، دەرونو ئەندیشەی مرۆڤە ، نەك ئەوپارچەگۆشتەی کە لەناوسنگدایە . بۆستایشی لەدەرونی پیاوچاکانیش ئەفەرمیّ ، «يومَ لايَنفعُ مالٌ ولابنونَ إلاّ من أتى اللهَ بِقَلبٍ سَليم» یان «وَجاءَ بِقلبٍ مُنيب» یان ئەفەرمیّ «إنّما المؤمنون الّذين اذاذُكِرَ اللهُ وَجِلَتْ قُلوبُهم ....» وجلت ، واتە ئەترسیّ ، بەکورتی لەکتێبی «المرشد الى ايات القران الكريم دا» دەست نیشان ئەکات بۆ زیاتر لەصەدوپەنجاجار ، کەخوای گەورە باسی قەلبی کردوە لەقورئاندا ، وەزۆرباش دەرئەکەویّ کە دەرونی مرۆڤ ئەکریّ جێگەی بیروهەستی چاك وپاك بێت ، وەئەشکریّ جێگەی کینەو هەستی ناپاك بێت ، کەوابو «تەوبە» ئەکەوێتە پاش هەستی پەشیمانی لەدەرونا کەپێی ئەڵێن لۆمەکردنی دەرون وەسەرزەنشی دەرون لەمرۆڤ خۆی ، جا ئایا ئەوپەشیمانی یە هەر خۆ بەخۆ لە «هیدایەتێکی» خواییەوە روبدات یان ، بەهۆی عەقل گرتنو بیرکردنەوەو موطالەعەو سەرگوزەشتو روداوەوە بێت ، یان بەهۆی تێکەڵی و دۆستایەتی ی لەگەڵی پیاوچاکێکا بێت ، کە ئەمپەشیمانی یە دەستی دا ، ئیتر نەفسی مرۆڤ ، واتە هەستی دەرونی ، کەلەپێشا لەقۆناغی سەرکێشی و لاریبدابوە ئەبێتە لۆمەکەر ، بەو قۆناغی سەرکێشیە ئەوتریّ «نەفسی أمارە بالسوء» کەخوا لەزوانی حەزرەتی یوسفەوە لەقورئانا ئەفەرمیّ «وما أُبرِّئُ نفسي إنّ النَّفْسَ لأمارةٌ بالسّوء» جا کەترسی خوا کەوتەدەرونەوە ، نەفس ترسا ، ئەکەوێتە لۆمەی خاوەنەکەی ، واتە بیرئەکاتەوە لەکرداری ناپەسەندی خۆی ، خوای گەورە سەبارەت بەوانە ئەفەرمیّ «وأمّا مَنْ خافَ مقامَ ربِّهِ ونَهى النَّفْسَ عَنِ الهوىٰ فإنَّ الجَنَّةَ هِيَ المأوى» ، کەواتە ، ئەم رەوشانە وەئەم پێشەکیانەی تەوبەکردن هەموی لەقورئانا بەرونا کی هاتوە ، وە «ولا

**أقسِمُ بالنَّفسِ اللوامه»** ئەوەش ئەوجۆرە نەفسەتە کەئەکەوێتە سەرزەنشی مرۆڤ خۆی ؛ جائێستە ئەبێ دەرون بڕیاری دەس هەڵگرتن لە کەجڕەوی بگرێت وەتەوبە بکات ؛ وە یەکەم قۆناغی ڕێڕەوی تەسەووف تەوبەیە ، خوا لەمدوئایەتەدا فەرمانی تەوبە ئەدات ؛ «**وَتوبوا اِلی اللّهِ جَمیعاً اَیُّها المؤمنونَ لعلّکُم تُفلِحون**» «**یاأیُّها الّذینَ آمنوا توبوا الی اللّهِ تَوبةً نَصوحاً**» خوای گەورە بەڵێنی داوە کەتەوبە قوبول کات وەئەفەرمێ «**أَلَمْ یَعْلَموا اَنَّ اللّه هُوَ یَقْبَلُ التَّوبةَ عَنْ عِبادِه وَیأخُذ الصَّدَقات**» ؟ هەروەها ئەفەرمێ «**وهو الّذی یَقْبَلُ التّوبة عَن عِبادِهِ وَیَعْفو عَنِ السَیّئات**» لەپاشان بەڵێن ئەدات بۆلێبوردن و بەخشین وەئەفەرمێ «**وَانّی لَغَفارٌ لِمَنْ تابَ وَآمنَ وَعَمِلَ صالحاً ثُمَّ اهتَدَی**» دیسان ئەفەرمێ ، «**غافِرُ الذّنبِ قابِلُ التَوبِ شَدیدُ العِقاب**» جالەپاشان ئەگاتە قۆناغی خۆش ویستن وەئەفەرمێ «**اِنَّ اللّهَ یُحِبُّ التوّابینَ وَیُحِبُّ المُتَطَهِّرین**» ؛ کەواتە ئەومرۆڤە کەچ ڕەوە ئەگەڕێتو تەوبەبکات وەپاشان کەچڕەوی نەکات ؛ هەم خوا تەوبەکەی لێوەرئەگرێت وەهەم ئەیبەخشێت وەهەمیش ئەبێتە خۆشەویستی خودا ؛ کەوابو یەکەم قۆناغی سوفیەتی کەتەوبەکردنە ؛ دەق بەدەقەلەگەڵ فەرمودەو دەستوری خوای گەورەدا ، وەلەڕێگەی شەریعەت لانادات ، جاپاش تەوبە ؛ مەبەستی ، تەزکیەی نەفس وە «**مجاهده**» وەپاك کردنەوەی دەرون ؛ وەذیکرو خواپەرستی بەشێوەیێکی سوفیانە دێتەپێشەوە تائەگاتە دواپلەی خواناسی ویەقین .

مەبەستم لەباس کردنی تەوبە باس لەچۆنیەتی تەوبە لەڕێڕەوی تەسەووفدا نەبو ، چونکە سەبارەت بەوناسینە لەئایندەدا باس ئەکەین ، بەڵام لەمقۆناغەدا ، بۆ سەلماندنی ئەوەبو کەبلێین هەموی ئەو مەبەستانەی کەتەسەووف ئەیانگرێتەوە لەکانگەی ئیسلامی ڕاستەقینەوە سەرچاوە ئەگرن کەیەکەم مەبەستیان «**تەوبە**»یە ، وە بە ئایەتو بە لێکۆڵینەوەش سەلماندمان کەتەوبە فەرمانێکی خوداوەندە وەموسوڵمانانی کەچڕەو وەگوناهبار پێویستیان بە پەشیمانی و پاش گەز هەیە ، بۆئەوەی بتوانن سەرلەنوێ بگەڕێنەوە بۆسەری شارێگەی ئاینی ئیسلام ، کەواتە ئێستە سەبارەت بەمەبەست ، یان قۆناغێکی تر باس ئەکەین ، ئەویش جڵەوشل نەکردنە بۆنەفس ، وەبەرگری کردنە لەئارەزو و ئاواتی چەوت و نالەباری نەفس ، کەئەکرێ پاك کردنەوەی دەرون وەجڵەوشل نەکردن بۆنەفس لەچوارچێوەی «**موجاهەدە**»دا باس کەین ، بۆئەوەی بۆمان دەرکەوێ کەئەم کارەش هەر لەدەستوری خوداوەندەوە سەرچاوە ئەگرێت ، لێرەدا ئەڵێم .

بەداخەوە بڕێ‌کەس ، تەنانەت خوێنەوارەکان ، بێ‌وردبونەوە لەئامانجی جڵەوگیری نەفس ، یان «موجاهەدە» ، خێرا ئەڵێن خوای‌گەورە ئەم جیهانەی بۆیە دروست‌کردوە بۆئەوەی کەئێمە لێی بەرخورداربین وەکەڵکی لێ‌وەرگرین ، ئیتربۆچی نەفسی‌خۆمان بکوژین ، وەخێرا دەس‌ئەکێشن بۆ ئەو چەن‌ئایەتەی کە لەقورئاندا سەبارەت بە بەهرەوەرگرتن لەنیعمەتەکانی خوای گەورە هاتوە ، وەکو ئەوئایەتەی کە ئەفەرمێ ، «یابَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا واشْرَبُوا وَلاتُسْرِفُوا إنه لايُحِبُّ المُسْرِفِين ، قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبادِهِ ، والطَّيِّباتِ مِنَ الرِّزْقِ ؟ قُلْ هِي لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الحَياةِ الدُّنيا خالِصَةً ....» یان کەئەفەرمێ «ياأَيُّها الَّذِينَ آمَنُوا ، لاتُحَرِّمُوا طَيِّباتِ ماأَحَلَّ اللهُ لَكُمْ ، وَلاتَعْتَدُوا إِنَّ اللهَ لايُحِبُّ المُعْتَدِين» ، وەچەن ئایەتێکی‌تری لەم‌چەشنە ، بێ‌گومان لەواتای ئایەتەکانا دەرئەکەوێ ، مەبەست لێرەدا سەرزەنش‌کردنی کەسانێکە کە شتی‌حەلاڵ لە خۆیان حەرام ئەکەن ، «قُلْ مَنْ حَرَّمَ ، لاتُحَرِّمُوا» هەم لە«هۆی هاتنی ئایەتەکانا» «أَسبابُ نزول الآيَة» وەهەم لە «تەفسیرەی ئایەتەکانا ، دەرئەکەوێ بڕێ لەیارانی پەیامبەری‌گەورە ویستویانە حەلاڵ لەخۆیان حەرام‌کەن ، خوای‌گەورەش سەرزەنشی‌کردون و ماوەی نەداون بۆئەوکارە ، «خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ» ، هەروەها «قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ» ، ئەمەش بەرانبەر بەرەفتاری ئەوژنانە هاتوە ، کەویستویانە . بەڕوتی تەواف بکەن بەدەوری «کەعبەدا» ، وەخوای‌گەورە فەرمویانە ئەبێ خۆتان داپۆشن ، زینة لێرەدا پۆشاك وەئیحترام لەبەرکردنە،جائەگەر ئەم‌دەستورە بکەینە دەستورێکی گشتی ، هەروەکو کەشێوەی ئایەتەکانی تری قورئانە وەبڵێین پۆشاکی‌جوان بکەنەبەر ، تەسەووف قەت حەلاڵی حەرام کردوە ؟ یان قەت ئەڵێ تەرکی پۆشاك بکەن ؟

بەڵام ئەگەر بەوزینەتەش بڵێین جوانی وە پۆشاکی ڕێکوپێك ، ئایا خوا فەرمویەتی ، بۆناوی «ڕەش‌بەڵەك» خۆت‌بگۆڕە ، یان ، بۆ ناوی مزگەوت ، ئایافەرمویەتی فیزو دەماری پێ‌بکە بەسەر خەڵکا ، یان ، شوکری خوای‌لەسەربکە ؟ بەلاّم بابێینەسەری ئەودەستورانەی کەشێوەی جڵەوگیری لە «نەفس» وە داخوازە ناپەسەندەکانی ئەکەن ، وەچۆنیەتی بەهرەوەرگرتن لەنیعمەتی خوامان پیشان‌ئەدەن ، وەموسوڵمانی ڕاستەقینە لە موسوڵمانی لاڕێگر جوێ ئەکەنەوە .

لەپێشا بابزانین «تەزکیەی‌نەفس» چی‌یە ، «زکات ، تزکیە» بەعەرەبی واتە «پاك کردنەوە» تەزکیەی‌نەفس ، واتە پاك‌کردنەوەی دەرون لەهەرچی ڕەوشی

ناپەسەندە ، جا کاری واگرنگ پێویستی بە بەربەرکانێ وەخەبات وەتێکۆشانە ، خۆهەروا بەگاڵتە دەرون پاك نابێتەوە ، وەکو هەستی خۆبەزل‌زانین ، هەستی سامان‌بەیەکەوەنان ، هەستی ژێردەس‌خستنی خەڵکی‌تر ، درۆکردن ، حەسەد ، رق‌وکینە هەڵگرتن ، هەستی تۆڵەسەندنەوە ، هەستی گوناەکردن لەهەموجۆرێ ، وەکو داوێن‌پیسی ، هەستی ناوونوتکەنان بەخەڵکەوە ، هەستی خۆ بە چاك لەقەڵەم‌دان وەخەڵك خراب‌کردن ، تۆمەت لەخەڵك‌دان جنێودان بێوەفایی سپڵەیی ، وەلەهەمو گرنگ‌تر ، پێکەوەنانی سامانی‌زۆر وە بەشی‌کەس لێ‌نەدانی ، وەصەدان ڕەوشی ناپەسەندی تر ، جا چۆن بەبێ خەبات وتێکۆشانێکی گرنگ ، مرۆڤ ئەتوانێ ئەم‌ڕەوشە ناپەسەندانە لابات ، وەبەرانبەر بەهەرکام لەوانە ڕەوشی پەسەند لەدەرونیا دامەزرێنێ . بۆنمونە ، بەرانبەر بەدرۆزنی ، ڕاست‌وێژی ، بەرانبەر بەدزی ماڵی‌خەڵك ، تێکۆشان بۆ یارمەتی خەڵك ، بەرانبەر خۆ بەزل‌زانین ، میهرەبانی وە «تەواضوع» ، بەرانبەر بەکینە ، گوزەشت ، بەرانبەر بەهەستی داوێن‌پیسی ، هەستی بە دایکوخوشك زانینی هەرچی مێینە هەیە ، جگەلەژنی خۆت ، بەرانبەر بە ناوی خەڵك بردن و غەیبەت کردن ، ناوی خەڵك بەچاکەبردن ، بەرانبەر بەکۆکردنەوەی سامان و خۆکوشتن بۆ سەرمایە پێکەوەنان وەمشت‌قوچاوی ، هەستی قەناعەت و بەخشش وجوامیری ولاوچاکی ویارمەتی‌دانی دەست‌کورتان هتد ، سەیرئەکەین ئەگەر خاوەن پایەیێکی میری ، یان کۆمەلأیەتی ، یان خاوەن سەرمایە ، وەیاخاوەن‌زانیارییێك یان خاوەن عەشرەتو طائفە ئەگەر بڕواتە ناو «مەجلیسێکەوە» وەلەبەری هەڵ‌نەسن ، پێی ناخۆشە ، یان ، ئەگەر لای‌ژورەوە دای‌نەنین پێی ئەتکە ، ڕێزی لێنەگرن لای‌سەیرە ، کەچی ئەمەش بەنەخۆشی دەرون دانانێت ، وەگوێشی‌ناداتێ ، لەکاتێکا لای مرۆڤێك کەدەرونی پاك بوبێتەوە وەنوری خوا لەدەرونیا درەوشابێتەوە ، ئەمانەی لا گاڵتەی منالأنە ، وە لەهەمو هەنگاوێکا خوای لەپێش‌چاوە وەهەر ئەوی مەبەستە ، ژورو خواری مەجلیس ، وە ئاغاو میرم وتنو ئەم‌جۆرە شتانەی لاهیچە ، چونکە هەم دەرونی پڕلەنورە ، وەهەم ئەزانێ کە لای‌خوا بەڕێزتر ، پارێزکارترە «إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ» وە بەرانبەر بەو ئایەتەش کە لەپێشاوتمان ، خوا ئەفەرمێ حەڵاڵی خوا حەرام مەکەن ، پاك کردنەوەی دەرون بە دورەپەرێزی گرتن لەوکارە ناپەسەندانە دێتە دەس ، وەقەت تەسەووف دەستی کەسی نەگرتوە لەنانی حەڵاڵ ، وەئەوشتەش کەپێی ئەوترێ ڕیازەت ، هەروەکو پارێز

دانانی دوکتورە بۆنەخۆشێك ، تا ئەوماوەیەی کەچاك ئەبێتەوە ، هەروەکو لە قەسیدەی بوردە دا ، ئیمامی بوصیری کە ٦٩٦ کۆچی فەوتی کردوە ئەڵێ (والنفسُ کالطفلِ إنْ تُهمِلْهُ شَبَّ علی ، حُبِّ الرضاعِ وإنْ تفطِمْهُ ینفطِمِ» واتە «نەفس» وەکو منالی شیرەخۆرە وایە ، ئەگەر نەیبڕیتەوە لەشیر ، هەر لەسەر شیرخواردن ئەمێنێتەوە ، بەڵام ئەگەر ویستت بی بڕیتەوە ، وا ، ئەبڕێتەوە .

یان مرۆڤ لە کاتی خوێندنا کەئەوەندە تێ ئەکۆشێت بەلاّم پاش تەواوکردن ئیتر پێ ویستی بەسەعی کردن نیە ، جا خوای گەورە ، سەبارەت بە جڵەوشل نەکردن بۆنەفس چی ئەفەرمێ ،؟ هەروەکو زوتر وتمان ، «إنَّ النَّفسَ لأمّارةٌ بالسوء» کەواتە «نەفس» لەسورشتی خۆیا لاین گری خرابەیە واتە «سوء» ، کەواتە ئەبێ دەسی بۆشل نەکەیت ، وەجڵەوی بگری ، خوای گەورە ئەفەرمێ «فأمّا مَنْ طغی وآثَرَ الحیاةَ الدنیا ، فإنَّ الجحیمَ هي المأوی ، وأمّا مَنْ خافَ مقامَ ربِّهِ ونهی النفسَ عنِ الهوی فإنَّ الجنةَ هيَ المأوی» دەستورو فەرمانی لەمە ڕوناکتر کوا ؟ هەرکەس سەرکێشی کرد ، وە ئەم ژیانەی ئەمرۆی هەڵبژاردو «فەضڵ» دا بەسەری ژیانی جاویدانا ، ئەوە جەهەنەمی کردوەتە جێگەی خۆی ، بەڵام ئەوەش کە لەخوا ترسا وە «جڵەوی نەفسی گرت ، لەئارەزووەکانی» ئەوە جێگەی ئەبێتە بەهەشت ، یان هەر سەبارەت بە نەفس و بە پاك کردنەوەی ، ئەفەرمێ «قد أفلحَ مَنْ زکّاها وقد خابَ مَنْ دسّاها» واتە ئەوکەسەی کە بتوانێ «نەفسی» پاك کاتەوە لەهەستی گوناەکردن ئەوە بۆخۆی ڕزگاری بوە ، بەلاّم ئەو کەسەی جڵەوی شل کردبێ بۆ نەفسی ، وەدەرونی پڕبێت لەهەستی گوناەکردن و لاری گرتن ئەوە دۆڕاندویەتی و نائومێدبوە ، کەوابو ، ئەم تەزکیەی نەفسە ، کە لقێکی هەرەگرنگە لەڕێڕەوی تەسەووف ، دەق بەدەق لەگەڵ فەرمانی خودادا یەکێکە ، وە تێ کۆشان لەم ڕێگایەش دا «موجاهەدە وە جیهادە» ئەویش ، هەر هەمان تێکۆشانە ، کەلەو ئایەتانەدا . وە لەدەها ئایەتی تریشا ، بەئاشکرا دیارە ، وەگومانیشی تیانیە ، نەفس ئەگەر بەرگری لێ نەکەی ، لەهەزاران هەڵدێرا ملی پیاو ئەشکێنێ ، وەجێگەی هەستی لاری گری یە ، «ونعلمُ ماتوسوسُ بهِ أنفسُکم» «قل أعوذُ بربِّ الناسِ ملك الناسِ إلهِ الناسِ مِنْ شرِّ الوسواسِ الخنّاسِ الّذي یوسوسُ في صدورِ الناس ...» صەدر ، بێ گومان دەرونی مرۆڤە ، کە ئەکرێ ببێتە جێگای گومان وەدودڵی ، «وەسوەسە» ، یان ئەفەرمێ «ولا تُطِعْ مَنْ أغفلنا قلبَهُ عَنْ ذِکْرِنا واتّبعَ هواه» یان ئەفەرمێ «زُیِّنَ للناسِ حُبُّ الشهوات» .

بەکورتی ئەڵێم زۆر ئاشکرایە کەدەرون ئەگەر ڕێگەی لێ نەگیرێت، وەئاگاداری نەبێت، لەڕێ لاتئەدا، وە هەڵت ئەدێرێ؛ وە قورئانی پیرۆز بەڕوونی دەستوری بەئێمە داوە بۆ بەرگری کردن لەئارەزوی ناپەسەندی دەرون، جا دێتەوە سەری ئەوەی ئایا بەهرەوەرگرتن لە ماڵ وسامان وخۆشی یەکانی جیهان، ئەبێ چۆن، وە تاچ ڕادەیێ بێت؟ئەوەشیان هەر خوای گەورە ڕونی کردوەتەوە، وەتەصەووف هەرگیز لەوەزیاتر پێی دانەکێشاوەو لەوەزیاتری ناوێت، وا بەشوێنی یەکا چەن ئایەتێك لەم بارەوە ئەنوسین؛ خوائەفەرمێ «**وَلاتَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ، تُرِيدُ زِينَةَ الحَياةِ الدُّنيا، ولاتُطِعْ مَنْ اَغْفَلْنا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنا، واتَّبَعَ هَوَاه، وكانَ اَمْرُهُ فُرُطاً**»واتە چاوت لامەدە لە هەژارەکان، وە بیبڕیتە زەرقوبەرقی ماڵ و سامانی جیهان، وەهەرگیز مل مەدە بەوانەی پەیڕەوی ناکەن لەقورئان، وە کەوتونەتە شوێنی ئارەزوی خۆیان یان ئەفەرمێ «**زُيِّنَ لِلنّاسِ حُبُّ الشَّهواتِ مِنَ النِساءِ والبَنِينَ والقَناطيرِ المُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ والفِضَّةِ والخَيلِ المُسوَّمَةِ. والأنعامِ والحَرْثِ، ذلكَ مَتاعُ الحياةِ الدُّنيا. واللّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ المَآب**» واتە خەڵك ئەوەیان پێ خۆشە کەببنە خاوەنی ژنان و کوڕان وزێڕوزیوی زۆرو ئەسپ و مەڕومالات و زەوی وزار، جا ئەمانە هەموی سەرمایەو تۆشەی دنیان؛ بەڵام ئەوەی لای خوایە، لەهەموی ئەمانە چاترە؛واتە ئاگات لەخۆبێت نەفست وات لێ نەکات. بۆ بەدەس هێنانی ئەم شتە ئێرەنی و «**موقەت**» انە، پاداشی ئەوجیهان لەدەس بدەیت، ئایەتی پاش ئەوەش ئەفەرمێ «**قُلْ أؤُنَبِّئكُمْ بِخَيْرٍمِنْ ذلِكُمْ**،» ئایا شتی لەمە چاترتان پیشان بدەم؟ «**لِلَّذِينَ اتَّقوا عِنْدَ رَبِّهِم جَنّاتٌ تَجْري مِنْ تَحْتِها الاَنْهارُ خالِدِينَ فِيها، وَاَزْواجٌ مُطَهَّرَة ورِضْوانٌ مِنَ اللهِ واللّهُ بَصيرٌ بِالعِبادِ**»؛ ئەوانەی کە پارێزکاری یان کردوەتە پیشە، لای خوداوەبەهەشتێکیان بۆدانراوە جۆگەی ئاوی بەبنا تێئەپەڕێ وە ژنی پاك «**وەرەزامەندی خودا**»، خوا ئاگای لەهەمو شتێکە، یان ئەفەرمێ «**يومَ لاينفَعُ مالٌ وَلابَنونَ اِلاّ مَنْ اَتى اللّهَ بِقَلْبٍ سَليمٍ**» واتە ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکە ئیتر سەرمایەو منالّ «**کەئێوەئەمڕۆ بەلاتانەوە شتی چاکە**» بەدەردی هیچ ناخۆن، وە تەنها دەرونی پاك و ساغ و بێ ئالایش، بەدەردئەخوات، جاهەروەکو وتمان، دەرون ئەبێ خۆت پاکی کەیتەوە بۆیە پاداشی هەیە، ئەگینا پاداشی بۆچی بو ئەگەر خەبات ورەنج و تێکۆشانی پێویست نەبوایە،؟ خوا ئەفەرمێ «**المالُ والبنونَ زينةُ الحياةِ الدُّنيا**» سەرمایەوسامان و منالّ، هەربۆ خۆشی دنیایە، ئەوەی کە بوت ئەمێنێتەوە کردوەی چاکە و ذیکری خودایە، «**والباقِياتُ الصّالِحاتُ خيرٌعِنْدَ ربِّكَ ثَواباً وَخيرٌ اَمَلاً**»، یان ئەفەرمێ «**وَما الحَياةُ الدُّنيا اِلاّ مَتاعُ الغُرُور**» لە سێ شوێنی قورئانا ئەم ئایەتە هاتوە،

واتە ژیانی ئەم‌جیهانە شتێکی «**زوگوزەرو هەڵخلەتێنەرە**» هەروەها ئەفەرمێ «**وَمَا هَذِهِ الحياةُ الدُّنيا إِلاّ لَهْوٌ ولَعِبٌ وإنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الحَيَوانُ. لَوْكانوا يَعْلَمُونَ**» بەکورتی سەبارەت بەبێ‌مایەیی‌و کورتی و کەم‌دەوامی، خۆشی ئەم‌جیهانە، ئایات ئەوەندە زۆرە، هەر لەحیساب نایێت، کەواتە ئەوەی کە لە تەصەووف‌دا سەبارەت بە سەرزەنشتی ئەوکەسانەی. کە خۆیان ئەکوژن بۆ بەدەست‌هێنانی سەرمایەوسامان وە دروست‌کردنی کۆشکو تەلاری هەزار رەنگ، شتێك‌نیە کە خۆیان دروست‌یان کردبێ، یان ئەوەی کەئەڵێن، ئەبێ جلەو شل‌نەکری بۆنەفس، تابگاتە رادەیێك بت‌کاتە بەردەو کۆیلەی خۆی، هەموی لە قورئانەوە سەرچاوە ئەگرێت. بەڵام ئەبێ ئەوەش‌بزانین تەصەووف ناڵێ کاسبی مەکەو ژن مەهێرەو ژیانت دروس مەکە، بەڵکو ئەڵێ دین‌و ژینی جاویدان، مەفرۆشەو دای‌مەنێ لەرێگەی دنیادا، ئەوەندە مەخۆ کە ورگت ببێتە بار بەسەر لەشتەوە، ئەوەندە هەڵپە مەکە بۆدنیا کە ئابروی بۆبفرۆشی، شەووڕۆژ ویردی سەرزوانت نەبێتە پارەو، پارە وپارە. بەڵکو «**وَلاتَنْسَ نَصيبَكَ مِنَ الدُّنْيا**» تۆش بەشی خۆت بەرە، نەك بەشی خەڵك بکەیتە هی‌خۆت! ! ! بە ئەندازەی ژیانت تێکۆشە نەك بەئەندازەی هەزارپشتت، حەڵاڵ‌و حەرام تێکەڵ مەکە، (**دین مەفرۆشە بۆژین**)

«**تەقوی**»، خۆپاراستن، سێ قوناغی هەیە،

١ – خۆپاراستن لەکوفر.
٢ – خۆپاراستن لەگوناه.
٣ – خۆپاراستن لە «**إنْهماك**»خۆهیلاك کردن بۆ بەدەس‌هێنانی ماڵ‌و سامانی زۆر. مەولەوی لەم بابەتەوە، سەبارەت بە تەعریفی وەلی وەشیخی راستەقینە ئەڵێ. وەلی‌کەسێکە ئاواوئاوا تائەگاتە... ئەوەی ئەڵێ.

بیکێشن بە سەنگ هەرسێ تەقوادا،بە ترازوی‌شەرع موێی لانادا.

جا خوایش سەرزەنشتی ئەوکەسانە ئەکاو ئەفەرمێ «**وَيَاكلونَ التراثَ اكلاً لمّاً، وتُحِبُّونَ المالَ حُباً جَمّاً**» «**واتە میرات ئەخۆن بێ‌ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی بزانن بەشی هەتیو یان کەسی تری پێوەیە، وەسامانی دنیایشیان یەك‌جار خۆش‌ئەوێ**» جا خوای‌گەورە ئەوەشی لا پەسەندنیە. هەروەها ئەفەرمێ.

«**والّذينَ يَكْنِزونَ الذَّهَبَ والفِضَّةَ وَلايُنفِقُونَها في سَبيلِ اللهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذابٍ أليمٍ**»واتە ئەوانەی

کە زێڕو زیو ئەنێن بەیەکەوە و لەڕێگەی خوادا خەرجی ناکەن، موژدەی ئازارێکی سەختی‌یان بدەرێ، لەپاشان لەئایەتی پاش ئەودا ئەفەرمێ ئەو دراوانە بەئاگری جەهەننەم سورئەکەینەوە، وە ئەیهێڕین بەناوچاوان وبەلەشیانا، وە ئەڵێین «**هذا ما کَنَزْتُمْ لِأَنْفُسِکُمْ فَذُوقُوا ما کُنْتُمْ تَکْنِزُونَ**» بخۆن ئەوە گۆڕی گیانتان بێت، ئەوە ئەو دراوانەیە کە کۆتان ئەکردەوە.

خۆ ئەو دراوانە حەرامیش نەبوە بەڵام زیندانکردنی سەرمایە و بەشی خەڵك لێ‌نەدانو، کۆکردنەوەی، لای‌خوا ئاوایە کەفەرمویان، هەرئەوەتە،دورەپەرێزگرتنی تەسەووف لەماڵی‌دنیا،وە بۆئەم بابەتەیە.

جا هەروەکو وتمان بۆ زاڵ‌بون بەسەر خواستی دەروندا، خەبات و ڕەنج و تێکۆشان پێویستە، پێغەمبەری گەورە درودی خوای لەسەر، «**لەغەزوەیێك**» گەڕایەوە، فەرموی والەجیهادی بچوك گەڕاینەوە، بادەس‌کەین بەجیهادی گەورە، لێ‌یان پرسی ئەی پەیامبەری خودا جیهادی گەورە کامەتا،؟ فەرمویان جیهاد لەگەڵ نەفسا، واتە بەربەرەکانێ لەگەڵ داخوازیی ناپەسەندی دەرونا، «**وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسانِ إِلَّا ما سَعى**» ئیستە بەباشی ڕوون بویەوە کە بەربەرەکانێ لەگەڵ نەفساواتە «**موجاهەدە**» بۆ پاك‌کردنەوەی دەرون، «**تەزکیەی‌نەفس**»، وە هەڵپە نەکردنو خۆ نەکۆشتن بۆبەدەس هێنانی سامانو پلە وپایەی دنیایی، وەدەرکردنی خۆش‌ویستنی دنیا لەدەرونا، وە تێکۆشان بۆ جی‌گیرکردنی هەستی چاکە لەدەرونا لەجیگەی هەستی کەچرەویدا، کە لەرێڕەوی تەسەووفدا، گرنگو بناغەیین، وەکراونەتە یەکێ لەئلقە گرنگەکانی ئەم ڕێڕەوە، لەسەرچاوەی قورئانەوە هەڵ ئەقوڵێ، وەلەقورئانەوە وەرگیراون، ئەوەش بزانن لەم باسەدا تەنها ویستمان پیشان‌بدەین، کە موجاهەدە وە تەزکیەی‌نەفس، وە خۆنەکوشتن بۆ دنیا، لادان نیە لەقورئان، وە باس‌کردنی چۆنیەتی تەزکیەی نەفس، لەئایندەدا لەکاتی باسی نەفس وەتەزکیەدا باس‌ئەکەین.

**لەبارەی تەوبەوە تەزکی‌یەی نەفسەوە، باسمان‌کرد، وائیستەش لەبارەی «ذیکرە» وە «قەلب» وە «تەقوا»وە ئەکۆڵینەوە، تاروونی‌کەینەوە بزانین چۆن ئەمانەش هەر لەقورئانەوە سەرچاوە ئەگرن، وە تەسەووف‌خۆی شتێکی تازەی نەهاوردوەتە ناوی ئاینی ئیسلامەوە.**

لەپێشا ئەبێ‌بڵێین کە ووشەی «**ذیکر**» لەعەرەبیدا زیاتر لەواتایێکی‌هەیە، وە

لەقورئانی پیرۆزدا ووشەی «ذیکر» بەواتای جۆراوجۆر، پتر لەصەدویەنجا جارهاتوە، یەکیّ لەواتاکانی «**ذیکر**»، بەمەعنای قورئان، وەهەروەها کتێبەئاسمانیەکانی تریش هاتوە. بۆنمونە سەبارەت بەقورئان ئەفەرمیّ، «**انا نحن نزلنا الذکر وانا له لحافظون**» واتە «قورئان ئێمە ناردومانە وەخۆمان ئەیپارێزین» یان ئەفەرمیّ «**وما هو الا ذکر للعالمین**»، واتە، قورئان ئامۆژگارییێکە بۆهەموی جیهانیان «**وانزلنا الیك الذکر لتبین للناس مانزل الیهم ولعلهم یتفکرون**»،

لێرەشا دیارە مەبەست لەوشەی ذیکر هەر قورئانە وەئەفەرمیّ، ئەی‌پەیامبەر ئێمە قورئانمان ڕەوانەکردوە بۆتۆ، کەتۆش بەهۆی ئەو دەستورو ڕاهنمایانەوە کەوان لەقورئانا ڕیّ‌پیشاندەری موسوڵمانان‌بیت بەڵکوئەوانیش بیریّ‌لەودەستورانە بکەنەوەو ڕێگەی ئیسلام بەرنەدەن.

هەروەها چەن ئایەتی تریش، وە ذیکر بەواتای نوێژیش هاتوە، کە ئەفەرمیّ «**یاایها الذین آمنوا اذا نودی للصلاة من یوم الجمعة فاسعوا الی ذکر الله وذروا البیع ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلمون**»، واتە ئەی موسوڵمانانی خاوەن باوەڕ ئەگەر لەڕۆژی جومعەدا بانگ‌کران بۆنوێژی جومعە، دەس‌لەمامەڵەوکار هەڵگرن وەبڕۆن بەلای جومعەکەتانەوە ئەوە چاکترەبۆتان ئەگەربتانزانیایێ، ئیترئەمە لێرەدا زۆرباش‌دیارە کەمەبەست‌لە ذیکر، نوێژە، جالەزۆر شوێنی‌تری‌قورئانیشا، ذیکر بەواتای ناوبردن‌و یادکردن هاتوە کە ئەوەیان مەبەستەکەی ئێمەیە، لەتەسەووفدا، هەروەکو وتمان لەپێشان وتوویرەی پەشیمان‌بونەوە لەلاری‌گرتن ئەکەوێتەدەرونەوە، وەدەرون لۆمەو سەرزەنشتی پیاوئەکات، وەپاش‌ئەوە کەڵکەڵەی «**تەوبە**»، واتە دەس‌هەڵگرتن دێتەپێشەوە، پاشان بەربەرەکانیّ وەدژایەتیە لەگەڵ خواستی ناپەسەندی دەرونا، جا ئەم‌دەرونە بەبارمەتی چ هێزێکە کەئەتوانیّ ئارەزوی ناپەسەند لەناو خۆیادەرکات؟ وەدەرمانی ئەو سەدەها دەردەی کەباسمان‌کردن، وەکو «**حەسەد**» وە **خۆبەزل‌زانین**» وە «**خۆکوشتن وخەڵك ئازاردان بۆ کۆکردنەوەی ماڵ‌وسامانی‌زۆر، وەسەدان هەستی ناپەسەندی دەرون...، وەبەچی‌ئەکریّ کەدڵ دامرکێت...؟**»

وەڵام...، بەیادی‌خودا...، بەناوی خودا..، وەکو کەخوا خۆی ئەفەرمێت «**الذین آمنوا وتطمئن قلوبهم بذکر الله، الا بذکر الله تطمئن القلوب**» ئەوانەی‌کە ئیمانیان‌هاوردوە، وەدڵیان بەیادی‌خوا دائەمرکێت وەئارام ئەگرێت، بەڵی، بەناوبردنی خودا وەبەیادکردنی‌ئەو دڵی خاوەن باوەڕان دائەمرکێت وەئۆقرەئەگرێت،

کەواتە ئەم بەردەوام بونە لەسەری یادی خودا وەلەسەری ناوبردنی خودا وەلەسەر بەردەوام‌بون لەسەری ئەویادکردن‌و ناوبردنە، وەهەروەها بەردەوام‌بون لەسەری زۆری‌ی ئەوناوبردنەش، هەموی هەردەستوری قورئانەو، ئەنجام‌دانی دەستوری خودایە، وە بەپێچەوانەوە،ئەوانەش کە لەیادی‌خودا کردن دورەپەرێزی ئەکەن، وەلایان‌وایە کەڵکێکی نیە، پەنابەخوا لەوانە، وەخوای‌گەورە سەرزەنشتی‌کردون وەبێزاریی خۆیی سەبارەت بەوانە دەربریوە.

هەروەکو ئەفەرمێ «**وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيرًا**» زۆر ناوی‌خوابەرە، «**وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً ودونَ الجَهْرِ مِنَ القَوْلِ بِالغُدُوِّ وَالآصَالِ وَلاتَكُنْ مِنَ الغافِلين**»، بەدڵ ذیکری خوابکە لەدەرونا، وە بەشێوەی ترسوپارانەوە وەهەروەهاش بەبێ‌دەنگیش هەرناوی‌خوابەرە بەیانی‌و ئێواران وەهەرگیز لەیادی‌خوا غافڵ‌مەبە، جا سوفیەتی جگەئەمە چی‌وتوە وەچی‌ئەوێت؟...

یان‌ئەفەرمێت «**الذينَ يَذكُرونَ اللهَ قِيامًا وقُعُودًا وعلى جُنوبِهِم**...»تا پایانی ئایەتەکە، خودا رەزامەندی خۆی پیشان‌ئەدات سەبارەت بەوکەسانەی کەهەمیشە بەهەستان‌و دانیشتن‌و پاڵ‌کەوتنەوە خوایان لەیاد ناچێت و یادی خوا ئەکەن، تەنانەت لەپاڵ‌کەوتنیشا، جا ئەوە ئەوپایەتە کە بەهۆی گرتنەبەری رێ‌رەوی تەسەووفەوە، کەرێگەی ئەنجام‌دانی فەرمانەکانی خودایە، بەئاشکراو بەنهێنی بەزوان وبەدەرون، بەگوفتارو بەکردار، مرۆڤ ئەگاتە ئەوپایەیە، جا کەمرۆڤ یادی‌خوای‌کرد، خوایش مژدەئەدات کەئەویش یادی مرۆڤ ئەکات، وەئەفەرمێ «**فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ**»، ئەوەش پایەیێکی گەورەیە بۆمرۆڤ، هەروەها ئەفەرمێ نەکەن ماڵومناڵ، واتان سەرگەرم کەن، کەیادی خوانەکەن، «**يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا، لاتُلْهِكُمْ أَمْوالُكُم وَلا أَوْلادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ الله**» بەڵێ خودا ئەوەندە ناوبردن‌و یادکردنی خۆیی لاگرنگە،! لەئاکاما خوای‌گەورە هەرەشە ئەکات لەوانەی کە لەذیکری خودا غافڵن وئەفەرمێت «**فَوَيْلٌ لِلقاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِنْ ذِكْرِ الله أولئكَ في ضَلالٍ مُبين**» ئەم‌ذیکرە لێرەدا، هەم نوێژ هەم قورئانیش ئەگرێتەوەو هەم یادی خوایش، پاشان‌ئەڵێ ئازاری سەخت بۆئەوانە ئەبێت کە دڵ‌رەق‌و بێزاریی پیشان‌ئەدەن، بەرانبەر بەیادی خوا، بەناوی‌خوا، بەقورئان، یان ئەفەرمێ بەپەیامبەر درودی‌خوای‌لەسەر «**ولاتُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنا واتَّبَعَ هَواه**..» واتە بەگوێی ئەوانەمەکە کەدڵیان لەیادی‌ئێمە غافڵەو کەوتونەتە شوێنی ئارەزوی دەرونیان...، لێرەشا ذیکر بۆقورئانیشە.

مەبەست ئەوەتە خوا پێی خۆشە بەندەکانی هەمیشە یادی بکەن و ناوی ببەن و لێی غافڵ نەبن، وە هەرچی زۆرتر ناوی بەرن وەیادی بکەن خودا زۆرتر پێی خۆشە، وەپاداشیان ئەداتەوە، وەیادیان چاکتر ئەکات، لەبەرئەوەتە کە تەسەووفیش ئەم ڕێگایەمان پیشان ئەدات بۆ پاککردنەوەی دەرون وەبۆرەزامەندی خوا، بۆگەیشتن بەپایەی درەوشانەوەی نوری خودا لەدەرونا وەلەئاکاما گەیشتن بەپایەی «یەقین» واتە باوەری بێ چەنوچۆن.

لەپاشان سەبارەت بەچۆنیەتی ئەم ذیکرە بەپێی ڕێ ڕەوی تەسەووف باس ئەکەین، وەئیستە دەستێك ئەکێشین بۆ باسی «قەلب» وە «تەقوی» تابزانین ئەم دووشتەیش کە لە گۆرەپانی تەسەووف دا ئەکەونە بەرچاو، تاچرادە لەگەڵ دەستوری قورئاندا یەك ئەگرنەوە.

ووشەی تەقوا بەکوردی ئەبێتە خۆپاراستن، یان پارێزکاری، بەڵام لەئاینی ئیسلامدا ئەم ووشەیە جێگایێکی بەرزی هەیە وە زۆربەربڵاوە، بەچەشنێك کە بەبێ تەقوا هەموی ئاینوباوەر دانەمەرزاوەو، مرۆڤی بێ تەقوا ناتوانێ بێتە ڕیزی موسڵمانی ڕاستەقینەوە

ئێمە باسی سێ تەقوامان زوتر کردوە وە وتنەوەی پێ ناوێ، بەڵام ئەبێ بزانین کە تەقوا زۆربەی تەسەووف ئەگرێتەوە، وەکو وەرع، زوهد، دەرکردنی ئارەزوی هەمو رەوشێکی ناپەسەند لە دەرونا، «نەهی لەمونکەر» وەهەڵنەسان بەهەرکارێ کە خوا پێی ناخۆش بێت، کەواتە ئەم وشەی تەقوایە کە سوفیەکان کردویانەتە بەردی بناغەی ڕێ ڕەوەکەیان، لەکانگەی قورئانەوە هەڵقوڵاوە.

خوای گەورە ئەفەرمێ «وَاتَّقُوا اللهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللهُ»، واتە، بەوچەشنەی خواپێی چاکە خۆتان بپارێزن خواخۆی زانیاری ئەخاتە دەرونتانەوە، یان دەرونتان بەنوری زانیاری روون ئەکاتەوە. بێگومان، هەموزانیارییێکی چاکو بەکەڵك، کە زانیاری خواناسی وائەپێشی هەمویانەوە. هەروەها ئەفەرمون «يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ» خوای گەورە ئەفەرمێ «إِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى» واتە چاکترین توشە پارێزکارییە،جا، تەقوا تەنها بەئاشکرا، واتە، بەکردەوەی «ظاهیر»، ناکرێت بەڵکو مرۆڤ ئەبێ لەدەرونیشا پارێزکاربێت وەکارێکی لێ بێت کە بەدڵیش ویستی نارەوای نەبێت، خوا سەبارەت بەوکەسانە ئەفەرمێ «أُولَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ

عَظیم»، لێرەدا باس باسی تاقی کردنەوەی دڵە، هەروەها ئەفەرمون «وَمَنْ یُعَظِّمْ شَعائِرَ اللهِ فَإنَّها مِنْ تَقْوَی القُلوب» دوبارە باس هەرباسی تەقوای دڵە.

بەکورتی ئەوەندە خوای گەورە بەدەستور وەفەرمان، فەرمانیان داوە بۆ پارێزکاری کەنوسینەوەی ئەوئایەتانە لەوزەی ئەم کورتە باسەدا نیە بەڵکو خۆی پێویستی بە کتێبێکە، بۆنمونە، «واتّقوا اللهَ اِنَّ اللهَ شَدیدُ العِقاب» «واتّقوا اللهَ اِنَّ اللهَ سَریعُ الحِساب» «فَاتّقوا اللهَ یااُولی الألْبابْ» «وَاتّقوا اللهَ لَعَلّکُمْ تُفْلِحون» «اِتّقوا اللهَ وکُونوا مَعَ الصّادقین» ئەمانە هەموی فەرمان ودەستورە وەموسوڵمان لەسەریەتی ئەنجامی بدات و جیٚ بەجێی بکات، هەروەکوو ئەمان خوای گەورە چاکترین تۆشەی دوارۆژی بەتەقوا داناوە، وەئەیش فەرمیٚ «وَلِباسُ التّقویٰ ذلِكَ خَیْر»، واتە چاکترین بەرگ، یان چاکترین عەیب پوش، وەشتێك کەمرۆڤ پیٚ برازێتەوە، تەقوایە، یان ئەفەرمون «اِعْدِلوا هُوَاَ قْرَبُ لِلتّقْوی» یان ئەفەرمیٚ «والعاقِبَةُ لِلتّقْوی» یان «واَنْ تَعْفُوا اَقْرَبُ لِلتّقْوی» کەواتە ئەو تەقوایەی کە رێ ڕەوی تەصەووف ئەیکاتە ئامانجێکی سەرەو، هەڵبژاردەی خۆی، ئەویش هەر لەقورئانەوە سەرچاوە ئەگرێت، وە قورئانی پیرۆز، هەم فەرمان ئەدات بۆئەوەی کەموسوڵمانان پارێزکاربن وەهەمستایشی پارێزکاری و پارێزکاران ئەکات، وەهەم دادگەری و بەخشینوچاوپۆشی، وەهەموچاکەیێك بەبەشیٚ لە تەقوا ئەداتە قەڵەم، وەهەم بۆمان دەرئەخات کەتەقوا نابیٚ تەنها ڕەواڵەتی بێت، بەڵکو ئەبیٚ مرۆڤ لەدڵیشەوە پارێزکار بێت، وەتێکۆشێت بۆئەوەی تەنانەت نیازی بڕیاری چەوتیش، لەدەرونی خۆیا جیٚ نەکاتەوە. وەخوا خۆیشی ئەو مژدەیەئەدا بەپارێزکاران، کەخودا لاینگری ئەوانە وە والەتەکیانا، کەئەفەرمیٚ «اِنَّ اللهَ مَعَ الّذینَ اتّقَوا»، بەکورتی، باسی پارێزکاری و پارێزکاران وە فەرمان بە، پارێزکاری کردن وستایشی پارێزکاران، لەنزیکەی دوصەد شوێن لەقورئانا هاتوە.

ئیستە دێینە سەرباسی دینەمۆی دەرون وە سەرچاوەی هەستی چاکەوخراپە وە ئازمونگەی گۆرەپانی تەسەووف، وەبەردی «مەحەکی» ناسینی مرۆڤ وپلەوپایەی ئەو، لە دەوڵەتی جیهانی، مەعنەوی دا، ئەوشوێنەی کەئەکریٚ بیێتە! مەنزڵی نوری خودا، وەهەوارگەی رەحمەتی ئەو، یاخۆ بیێتە گاڵتەی دەستی نەفسوشەیتان، کە ئەویش «قەلب»ە واتە «دڵ» وە ئەمانەویٚ بزانین، ئایا «قەلب»، کە یەکەم هەنگاوی تەسەووف تێکۆشانە بۆ گسك دان وپاك کردنەوەی، خوای گەورە لەقورئانا چۆن وەبەچی ناوی

ئەبات، وەئایا ئەودەستورانە لەگەڵ ڕێرەوی تەسەووف‌دا یەك‌ئەگرنەوە یامنا؟ هەروەکو سەبارەت بەباسەکانی‌تر، وەکو تەوبەو نەفس وە تەزکیەی‌نەفس وەتەقوا وتمان، کە پتر لە دەها شوێنا لەقورئانا هاتون، سەبارەت بە «**قەلب**» یش هەربەوجۆرەیە وەلەنوسین نایێت، بێ‌گومان قەلب وشەیێکی عەرەبی‌یە وەپتر لەیەك واتای هەیە، کە یەکێکیان ئەوپارچەگۆشتەیە وا لەسینەی مرۆڤا وە وەکو دینەمۆی لەشی‌گیان‌دارانە، هەروەها بە ناوەڕاستی‌شتیش‌ئەوتری، وەهەروەها بەناوەندی هەستی «**عاطفی**» وە «**ئینسانی**»، وەبەناوەندی هەمو بڕیارێکی چاکوخراپی دەرونیش ئەوێژرێ، جادیارە لەقورئانا کە باسی قەلبی، واتە دڵی، مرۆڤ ئەکات، بەو واتای هەستی دەرونی‌و فەرماندەرایەتیی چاکەوخراپەیە ئەوترێ، بێ‌گومان کاتێ کە تەسەووفیش باس لە «**دڵ**» ئەکات هەرمەبەست ئەو دڵەیە، کەلەقورئانا هاتوە، وەهەر بەو واتایەش کەلەقورئانا مەبەستە.

لەقورئان‌دا دڵی نەخوش هەیەو دڵی ساغوسەلیمیش. لە تەسەووفیش‌دا هەروایە خوائەفەرمێ «**فَيَطْمَعَ الَّذي في قَلْبِهِ مَرَضٌ**» یان‌ئەفەرمێ «**لِيَجْعَلَ ما يُلْقِي الشّيطانُ فِتْنَةً لِلّذينَ في قُلوبِهِمْ مَرَضٌ وَالقاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ**..» وەلەحەوت شوێنی‌تری قورئانا ووشەی «**في قُلوبِهِمْ مَرَضٌ**» هاتوە، وەهەموی ئەونەخۆشیانەش کە باسیان هاتوە، نەخۆشی مەعنەوین، وە بە «**مەجازی ئەتوانین بڵێین نەخۆش، نەك بەڕاستی نەخۆشی‌ی تەبیعی** «**سورشتی**» بن، خوائەفەرمێ «**كَلاّ بَلْ رانَ عَلى قُلوبِهِمْ**» واتە دڵیان ژەنگ دای‌پۆشیوە، دیارە کەدڵی گۆشتین ژەنگ نای‌گرێت، وەهەر ئەودڵە مەعنەوی‌یەتە ژەنگی گوناەو کەچڕەوی ئەیگرێت، ئەفەرمێ «**فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ**» واتە: دڵی‌گوناەکارە، بەکورتی‌بەشی چەوتی‌و نەخۆشی وەسەرزەنش‌کراوی دڵ زۆرە، وەکو ئەوەی کەئەفەرمێ «... **يُطْبَعُ اللهُ على كُلِّ قَلْبٍ مُتَكَبِّرٍ جَبّارٍ**» یان «**لَهُمْ قلوبٌ لا يَفقَهونَ بِها**» یان «**أَفَلَمْ يَسيروا في الارضِ فتكونَ لَهُمْ قلوبٌ يعقلونَ بِها أَوْ آذانٌ يَسْمَعونَ بِها: فَإِنَّها لا تَعْمَى الأَبْصارُ وَلكِنْ تَعمَى القُلوبُ الّتي في الصّدور**» ئایا ئایەت لەمەڕوناکتر هەیە بۆئەوەی، کەدڵ ئەکرێ، بەهۆی لەڕێی‌خوالادانەوە،کوێرایی دابێت: بەلام، بەهۆی گرتنەبەری‌ڕێگەی ڕاستی خواناسی‌یەوە ئەکرێ بیبێتە خاوەن بەصیرەت، واتە، چاوی دڵی‌بکرێتەوە ؟؟ ئەگینا ئەگەر چاوی «**مەعنەوی**» **نەبێ دڵ چاوی لەکوێ‌بو تاکوێربێت؟ یان لەفەرمێ** «**أَفَلا يَتَدبَّرونَ القُرآنَ أَمْ عَلى قُلوبٍ أَقْفالُها**»؟ ئایا نابێ لەقورئان وردبنەوە و لێی تێ‌بگەن ؟، یان درگای ئاوەزو هەستی چاکو خراپەلێك‌دانەوەی دەرونیان داخراوە؟ یان، کەئەفەرمێ

«قلوبُهمْ مُنكِرةٌ» «لاهِيَةً قلوبُهُمْ/خَتَمَ اللهُ عَلى قُلوبِهِمْ»، وەزۆر ئایەتی تریش، هەر سەبارەت بەلۆمەو سەرزەنشی دڵی لاروچەوت. وەسەرکەش ولاریگرهەیە کە بە پێ‌ناسی «صیفەتی» جۆراوجۆر خوای‌گەورە باسی‌کردون، پێ‌ناسی نەشیاو، ئەوەش‌بزانین کە خوای‌گەورە دەرون وچاکەوخراپەکانی تری دەرونیشی لەژێر ناوی‌ترا باس‌کردوە، وکو «صەدر» کە ئەویش بەشێوەیێکی «مەجاز» هاتوە. وەمەبەست لەوصەدرە، «سنگ»، هەردەرونی مرۆڤە، وەکو «اَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ»، یان «وَیَشْفِ صُدورَ قَومٍ مُؤْمِنِینَ» یان، «رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْري»، یان «وَنَزَعْنَا ما في صُدورِهِمْ مِنْ غِلٍّ» یان «عَلیمٌ بِذاتِ الصُّدورِ» کە لە زۆرشوێنی قورئانا هاتوە، یان، بەپێچەوانەی ئەم‌واتانەوە، وەکو «یَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَیِّقاً حَرَجاً»، وەهی‌تریش، جامەبەست لە تێ‌هەڵکێشی وشەی صەدر، ئەوەتە لەگوفتاری، گەورەپیاوانی تەصەووف‌دا وشەی «صەدر» واتە «سنگ»، یان دەرون، وەنەخۆشی‌و چاکی‌و کرانەوەو داخرانی سنگ باس‌کراوە هەروەکو کەباسی دڵ‌کراوە، مەبەست ئەوەتە کەئەویش هەر لەقورئانەوە سەرچاوەی گرتوە.

جادێینەوە سەر ئەوئایەتانەی کە ستایشیان لەدڵ‌ودەرونی باش‌کردوە، وەئەویش هەر بۆمان دەرئەخات کەرێرەوی تەسەووفیش هەرشوێنی ئەو رێچکەیە کەوتوەو لای نەداوەو، بەڵکو دەق‌بەدەق لەگەڵ ئەودەستورانەدا دەردێت‌و سەرناکات. «یَوْمَ لا یَنْفَعُ مالٌ وَلاَ بَنونَ إلاَّ مَنْ اَتَی اللهَ بِقَلْبٍ سَلیمٍ» «اِذْ جاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلیمٍ» ئەم‌سەلیمە رێك پێچەوانەی دڵە نەخۆشەکەیە «مَنْ خَشِيَ الرَّحْمٰنَ بِالْغَیْبِ وَجاءَ بِقَلْبٍ مُنیبٍ» منیب، بە پارێزکار وە بەخواپەرست ئەوترێ، یان «اَلّذینَ آمَنوا وَتَطْمَئِنُّ قُلوبُهُمْ بِذِکْرِ اللهِ اَلا بِذِکْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ القُلوبُ» لێرەدا هەم باسی دڵی دڵنیا ئەکات و هەم دەرئەخات کەذیکر و یادی‌خودا ئەبێتە هۆی دڵنیایی دەرون، لەولاوە ئەی‌فەرمو «اَغْفَلْنا قَلْبَهُ عَنْ ذِکْرِنا» وە سەرزەنشی ئەو غافڵ‌بون لەذیکرە ئەکات.

یان «کَتَبَ في قلوبِهِمُ الایمانَ»، یان ئەفەرمێ «اِنَّما المؤمنونَ الّذینَ اِذا ذُکِرَ اللهُ وَجِلَتْ قُلوبُهم» موسوڵمانی خاوەن باوەر بەوانەئەڵێن کە ناوی خوایان لادا ببرێت، لەدڵەوە ئەترسن لەخودا، بەم‌چەشنە، روون‌بوەوە، تاچ‌رادە «دڵ» پەیوەندی راستەوخۆی بەچۆنیەتی پەروەردەی مرۆڤەوە هەیە، وەچۆن دڵ بریتی‌یە لەوشتەی کە ئەکرێت بەهۆی پاك‌کردنیەوە مرۆڤ لە خوا نزیك بێتەوە، وە بەهۆی خاوێن نەکردنیەوە، خاوەنەکەی لەرەحمەتی‌خوا دورکەوێتەوە.

جا ئێمه لەباسەکانمانا تەنها دەسمان بۆئایەتەکان ڕاکێشا ئەگینا فەرمودەی پەیامبەری گەورە وەگەورەپیاوانی ئاینی ئیسلام. سەبارەت بەهەموی باسەکان ئەوەندە زۆرە هەرخۆیان چەندین کتێبی گەورەیان ئەوێ، وەبۆ پایان هێنان بەباس دەس بۆئەو فەرمودەی پەیامبەرە ڕائەکێشین کەئەفەرمێ **«قَلْبُ المؤْمِنِ عَرْشُ الرَّحْمنِ»** واتە دڵی موسوڵمانی خاوەن باوەڕ مەڵبەندی خوایگەورەیە.

ئەمە شتە سەرەك و بناغەییەکانی تەسەووفبون، وەسەبارەت بەهەمویمەبەستە وردەکانی تریش، واتە ئەو وشەو مەبەستانەی کەوان بەسەری زوانی سۆفیەکانەوە هەموی پشتی بە قورئانو دەستوری خوداوە بەستوە، وەکو وشەی **«الصّادقین والصّادقات القانتین والقانتات، والتائبین والتائبات، والخاشعین والخاشعات، والسائحین والسائحات»**.

وەهەروەها **«الموقنین، المخْلِصین، المحْسِنین، المخْبِتین، العابِدین، المتوکّلین، المتّقین، الأَبرار، المقرّبین، والمصطَفینَ الأخیار»** ئەموشانە هەمویان بەپێی جیٚوشوێنی خۆیان، لەتەصەوف وەمەقاماتی تەصەووف، وە وێژەی تەصەووفدا هاتون، هەمویان لەقورئانیپیرۆزەوە سەرچاوە ئەگرنو هیچکامی دەسهەڵبەس نیەو، تەسەووف لەخۆیەوە نەیهاوردونەتە کایەوە.

ئەو پرسیارەی کەنۆرەی وەلاٚمدانەوەی گەیشتوە ئەوەتە کەئەڵێٚ، ڕێڕەوی تەسەووف چییە، وەچۆن پەیرەوی لیٚبکەین؟.

بەرلەهەموشتێك دوبارەی ئەکەمەوە، لەمەولایئەمکتێبە، ئیتر بۆکەسانێکە، کە هەم باوەڕیان بە ئاینی ئیسلام هەیە، وەهەم ڕێڕەوی تەسەووفیان لاپەسەندو بەکەڵکە.

ئەمەش بەوبۆنەوەیە، ئەوەی لەتواناما بوبێت بۆسەلماندنی ئەو دومەبەستە کردومەتەکار، لەبەرئەوە، ئەوەی باوەڕی بوە، یان باوەڕی پەیداکردوە وا ئەتوانیٚ شوێنی باسەکە هەڵگات ولەسەری بڕوات، وەئەوەش وانیە، ئیترلەمەولا بابەتی ئەوی تیانیە، جگەئەوەش باسیئێمە سەبارەت بە **«تەسەووفیئیسلامی»** یە، جونکە لەبارەی تەسەووفەکانی تریشەوە باسمانکردو، تەسەووفی ئیسلامی مان لەوان جویٚکردەوە، کەواتە، ئەو تەسەووفەی کە لەمەولا لەبارەی چەنو چۆنیەوە، ئەدوێم، **«تەسەووفی ئیسلامییە»**ڕیٚڕەوی تەسەووفی ئیسلامی چییە؟ وەچۆن پەیرەوی لیٚبکەین؟

وەڵام: لەسەرەتای ئەم باسەدا لەبارەی ئەوەوە کە تەسەووفچی یە زۆرمان باس کرد، وەدەس نیشانمان بۆ گوفتاری زۆرێك لەگەورەپیاوانی ڕێ ڕەوی تەسەووف کرد. وەبۆمان دەرکەوت کەپێناس بۆتەسەووف لەرادە بەدەرە، بۆمان دەرکەوت هەریەکەی لەگەورەپیاوانی تەسەووف لەروانگەی تایبەتی خۆیانەوە تەسەووفیان بەئێمە ناساندوە، بەلاَم هەموی سەرچاوەکانی تەسەووف ناسیی، لەبرێ شتا یەك ئەگرنەوە کە لە راستیەکەیا تەسەووفیش جگەئەوە هیچی تر نیە، وەئەوە کرۆك و کاکلەو گیانی تەسەووفە.

وەئەکرێ بڵێین پێناسەکانی گەورەپیاوانی ڕێگەی تەسەووف بۆیە جۆراوجۆرن، چونکە لەراستیەکەیا، دەس نیشان کردنە بۆ «**حالێ**» یان «**مەقام**» ێ کە لەوکاتەدا ئەوانی تیابوە، یان هی دەس کەوتێکی تایبەتی «**مەعنەوی**» **هەریەکێ لەو گەورەپیاوانەیە، بەجۆرێکی دیکەش ئەکرێ بڵێین، چونکە باخی زانیاریی تەسەووف باخێکی زۆر گەورەو بێ پایانە، وە ڕازراوەتەوە بەهەزاران جۆر میوەی** «**مەعنەوی**»: فەرمودەی هەریەکێ لەوگەورەپیاوانە، باسی میوەیێکە کەخۆی خواردویەتی، وەباسی گوڵێکە کەخۆی بۆنی کردوە، یان دیمەنێکە کە لەجیهانی «**موشاهەدە**» و «**موراقەبەدا**» خۆی دیویەتی، جاوتمان، ئاکامی هەموی ئەوپێناسانە، وە ئامانجی هەمویان، لەئاکاما یەك ئەگرنەوەو هەموی وەکو بارانێکن، لەهەڵمی دەریای بێ بن و کەناری «**مەعریفەت وحیکمەتی**» خواناسی هەڵساون، وەباغی پڕبەری تەسەووفیان پێ تێراو ئەبێت، هەموی گەورەپیاوانی شارێگەی تەسەووف لەم باوەرەدا یەك ئەگرنەوە، کە: تەسەووف، هەوڵ و تێکوشانێکی مەردانەی، مرۆڤی موسوڵمانە، بەپێی ڕەوش وڕێگەی تایبەتی تەسەووف: لەرێی بەجێ هێنانی فەرمانێ خودای گەورەدا، بە پەیرەوی کردنێکی مویەمو لەشەرع، واتە لەدەستورەکانی قورئانی پیرۆز، وەسوننەتی پێغەمبەری گەورە «**درودی خوای لەسەر**»، بەئاشکراو نهێنی، واتە بە لەشو بەگیان، بە دەرو بەدەرون، وەئەم جۆرە پەیرەوی یە کە لەقورئانا بە «**تەقوا**» ناوبراوە ئەوەندە گرنگو سەختە، تەنها کاری کەڵەمەردان و گەورەپیاوانە، واتە «**خەواص**»، وەئەم تێکۆشانەش هەروەکو زوترو تم، بۆگەیشتنە بە دوو ئاواتی گرنگ، یەکەم بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا، دووهەم: گەیشتن بەپلەی «**عین الیقین**» یان «**حق الیقین**»، واتە باوەری تەواو، بەدیتن، یان بە چەشتن، وەهەست پێ کردنی دەروونی ی،ئەویش لەرێگەی پاك کردنەوەی دەروونەوە لە ویستو نیازی هەمو ڕەوشێکی ناپەسەند، وەرازاندنەوەی دەروون بە

هەموورەوشتێکی پەسەند. تاوەکودڵ ئەبێتە ماواو نشینگەی نوری‌خودا. وە دڵی مرۆڤ سۆفی بەنوری خودا رووناك ئەبێتەوە.

لەئاکاما کە دڵ وای‌لێ‌هات، ئەگاتە: یەقین، وەکەسێ کەدڵی بەنوری خودا رازابەوە، دیارە کەخوا لەو رازی‌یە، وەکەسێکیش کەخوا لێی‌رازی‌بو، دەرگای خۆش‌بەختی‌و کامەرانی جاویدانەی لێ‌کراوەتەوە. کەسێك کەنوری‌خودا دڵی روناك کردەوە ئیتر جگەلەخوا کەس ناپەرستێت‌و ئەگاتە پایەی «**ئیحسان**» کە یەکێکە لەوپایانەی کە سۆفی‌یەکان، ئەیگەنێ، پەیامبەری‌گەورە «**درودی‌خوای‌لەسەربێ**» ئەفەرمێ: «**الإحسانُ أن تعبُدَ اللهَ كأنّكَ تراهُ، فإنْ لَمْ تَكُنْ تراهُ فإنّهُ يَراكَ**». گومانی تیانیە سوفی راستەقینە، تەنها بەرادەی چرکەیێك، وەیان چاوتروکانێك. خوای لەیادناچێت‌وە خوا گوم ناکات، کەواتە بێ‌گومان پلەی «**ئیحسان**» یەکێکە لەپلەی سوفی‌یەکان، ئەبێ لێرەدا مەبەستێك روون کەینەوە: ئەویش ئەوەتە، کاتێ کەئێمە ئەڵێین سۆفی، مەبەستمان دەستەیێکی تایبەت، لە پەیرەوانی تەریقەتەکان نیە. بەڵکو مەبەستمان ئەو وشە بەربلاوەیە کەهەموی ئەو خواپەرستانە ئەگرێتەوە، کە خواپەرستیەکەیان لە شێوەی پەیرەوی‌کردن لە «**ظاهیری‌شەرع**» تێئەپەرێ وەئەگاتە پلەی پەیرەوی‌کردن لەشەریعەتی‌ئیسلامی بەنهێنی‌و ئاشکرا، بەدەرو دەرون، وەرێگەی «**تەقوا**» واتە پارێزکاری وەتەزکیەی‌نەفس ئەگرنەبەر. ئیتر ئەوکەسە: قادری‌یە یان نەقشبەندی، یان پەیرەوی هەر رێ‌رەوێکی‌تری تەسەووف: هەریەکێکن، تەنانەت ئەگەر هەر لەبەینی خۆیو خوای خۆیشیا رێگەی خواناسی‌و خوادۆزی گرتبێتەبەر. جا لەپێشا وتمان، تەسەووف بریتی‌یە لەپەیرەوی‌کردنی ئاشکراونهێنی لە «**شەرع**». بەڵام بەپێی رێگەی تایبەتی تەسووف، جائیستە لێرەدا باسی ئەورێگە تایبەتەتان بۆئەکەین. بێگومان بۆهەر «**فەنو**» زانیاریێك: وەستاو ماموستای خۆی هەیە، وەبۆ هەر رێگایێك رێبەرو رێ‌نومای شارەزای خۆی هەیە. بۆنمونە: ئەوەتا بۆخوێندنی ئەم رۆژگارەمان قوتابخانەو ماموستا هەیە، وەتا ئەگەیتە سەرلوتکەی زانیاری، داب‌و رەوش‌و شێوەی تایبەتی خوێندن‌و دەرس‌وتنەوە هەیە. تەنانەت، چەندین رەوشی جیاوازی فێرکردن‌و خوێندن، لەولاتانی جیهاندا بوەتە باو، کەواتە زانیاری تەسەووفیش کەزانیارییەکی زۆرگرنگ‌و سەختە: خۆناکرێ، خوازیارانی، هەروا لەخۆوە دەستی پێ‌بکەن، تەنانەت بۆ پەیرەوی کردن لە «**ظاهیری‌شەرع**»، بۆ مرۆڤی خوێنەواریش، لەگەڵ بونی قورئان‌و ئەو هەموە کتێب‌و سەرچاوەیەدا کەهەیە: هێمان

مرۆڤ هەرپێویستی بەماموستاو بەخوێندن وبەپرسینە، وە باورمەکە کەسێك بتوانێ بە بێ مامۆستا شارەزایی لە «قەواعیدی عەرەبی» . یان «فیقهی» ئیسلامی پەیدا کات، جا ئەگەر ئەم زانیاری‌یە، زانیاری دەروونی وەئازمونی بێت، چۆن بەبێ ماموستا، یان بەبێ پەیرەوی‌کردن لەرەوش وریبازێکی دیاری‌کراو ئەکرێ ببینە شارەزاو بسپۆر وەچۆن سەری لێ‌دەرکەین وەچۆنی لێ‌تێ‌بگەین، ؟

جا ئەبێ بزانین کە رێ‌رەوی تەسەوفیش لەم «قاعیدە»، جوێ ناکرێتەوە، وە چونکە زانیاریێکی تایبەتە رێرەوێکی تایبەتیشی ئەبێ بێ، وە ئەم رێرەوە خۆی زانینێکە «عیلمێکە» بەناوی «زانیاری تەسەووف» چ لەلای ماموستا وەری گریت، وە چ خۆت لەرێگەی خوێندنەوەو «موطالەعەوە» بی‌بشکنی، بەڵام کەگەیشتە قۆناغی ئەنجامدان واتە «عەمەل» هەرچەند کە لەرێگەی خوێندنەوەشەوە هەمویت خوێندبێتەوە بەبێ‌شارەزاو ماموستا، باورمەکە بگەیتە مراز، هەروەکو سەبارەت، بەهەمو زانیاریێکی‌تر هەروایە، ئایا دوکتورێك لەرێگەی کتێب خوێندنەوە ئەبێتە دوکتور ؟ هەرچەن ئەگەر لەسەر کاغەز تاقی‌کریتەوە «امتحانی» کەیت، وەزۆر باش وەڵام بداتەوە، بەڵام، نە بەبێ‌ماموستا لەوهەموە دەرسەئەگاتو شارەزا ئەبێت وە نە بەبێ تاقی‌کردنەوەش ئەتوانێ لەهەمو رەوشێکی پزشکی سەردەرکاتو شارەزابێت. کەواتە زانیاریی تەسەووفیش چونکە زانیاریێکی تایبەتە، بەتایبەت کەزانینو کردەوەیە، واتە «عیلموعەمەل»، ئەگەر بتەوێ لێی تێ‌بگەیت، ئەبێ قوڵی بۆهەڵ‌کەیتو چاکی بۆبکەی بەلاداو کەلوپەلو پێ‌ویستیەکانی بزینی ئەورێگایە ئامادەکەیت، وە شارەزاو رێ‌نومای باش وەدەس‌خەیت، وەماموستای پسپۆر پەیداکەیت، تابتوانی بگەیتە، مەلبەندی پێویست، وە هەوارگەی دڵانی رێگەی خواناسی، وە بەئاوات بگەیت، کەواتە تەسەووفی ئیسلامی «**پەیرەوی‌کردنە لەرێگەو رەوشی تایبەتی تەسەووف**» .

بەڵام ئایا ئەگەر ماموستاو رێبەرت دەس‌نەکەوت ئەبێ دەس‌هەڵ‌گریت لەئاواتی گەیشتن بەمەڵبەندی رەزای خوا، وە خەڵاتی یەقین ؟؟

ئایا ئەکرێ ئەو قەلو داڵانە بکەیتە ماموستاو رێبەری رێگەی خۆشبەختی ؟ ئەو قەلوداڵانەی کە لەم رۆژگارەدا لەقەنودالێ زۆرترن .

ئایا ئەکرێ کوێر بکەیتە شارەزای خۆت، لەم رێگە سەخت وپر لەمەترسییەدا ؟

ئایا نەخوێندوار کراوەتە ماموستای دەرس وتنەوە ؟ بێ گومان نەکراوەو ناش کرێ، «هەرچەن بریارواپە لە بەشەکانی داهاتودا سەبارەت بەناسینی، وەلی، وە مورشیدی تەواو باس بکەم، بەڵام لێرەدا چونکە مەبەستەکە پێویستی هەیە، بەرروونکردنەوە ئەڵێم» باش ترین هۆی تاقی کردنەوەی «مورشید»واتە ماموستای تەسەووف، بریتی یە لەوەی سەرنج بدەی بزانیت ئایا ئەو مورشیدە خۆی موبەمو پەیرەوی ئەکات لە شەریعەتی ئیسلام ؟ ئایا ئەو مورشیدە شارەزایی تەواوی لە شەریعەت هەیە ؟ ئەمە دوو ئازمونی سەرەتایی یە، چونکە کەسێ کە خۆی «گومرا» وە «وێڵ» بێت، چۆن من بکەومە شوێنی کە ڕێگام پیشان بدات ؟ وە کەسێ کەخۆی لە بنجوبناوانی ئایین ناشارەزابێت، چۆن من شارەزا بکات لەئایین ؟

خوای گەورە سەبارەت بەم جۆرە کەسانە ئەفەرمێ «أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ» ؟ ئایا ئێوە فەرمانی چاکە کردن ئەدەن بەخەڵك وە خۆتان لەبیر ئەچێتەوە ؟ یان ئەفەرمێ، «يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَالاَ تَفْعَلُونَ ؟ كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللهِ أَنْ تَقُولُوا مَالاَتَفْعَلُونَ» .

واتە، ئەی کەسانێك کە باوەڕتان بەخوا هەیە بۆچی دەستوری شتێك ئەدەن بەمەردوم کەخۆتان ئەنجامی نادەن ، «شتی ئەڵێن کەنایکەن» نازانن ئەوە گوناهێکی زۆر گەورەیە شتێك بڵێن بەخەڵك کە خۆتان ئەنجامی نادەن .

جا بێگومان شتی وا هەیە، بۆیە خوای گەورە فەرمویەتی ، کەواتە ئەبێ مرۆڤ سەیری کردەوەی ئەوکەسانە بکات، کەناوێکیان لەخۆیان ناوەو خۆیان بەپیاوی خوا ئەدەنە قەڵەم وە بەرگ وپۆشاك وشوێن و جێگاێکیان بۆخۆیان تەرخان کردوە، ئەگەر گوفتارو کرداریان یەك بو وە لەرێ ڕەوی شەرع وەتەقوا لایان نەدا، وەمویەمو پەیرەوی سوننەتی پەیامبەربون، وە بەتەواوی لەرێگەی شەرع شارەزابون، ئەوە ئەتوانن بڵێن مورشیدن وەپێشەوان، ئەگینا خۆتان لەوان چاکترن «مَااتَّخَذَ اللهُ وَلِيّاً جَاهِلاً» .

واتە خوای گەورە مرۆڤی نەزان و نەخوێنەوار، ناکاتە وەلی خۆی، ئەمەش وەنەبێ بۆئەوەبێ، کە نەخوێنەوار، نابێتە وەلی «ناء»، بەڵکو بۆئەوەیە، ئەگەر ڕاست گەیشتبێتە پایەی «ویلایەت»، خواخۆی شارەزای ئەکات .

«وَاتَّقُوا اللهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللهُ» ئێوە ڕێگەی پارێزکاری بگرنەبەر، خوا خۆی فێرتان ئەکات، یان خوا خۆی ماموستایی تان ئەکات .

کەواتە هەرئەم‌ئایەتە، وەڵام‌دەرەوەی بەشەکەی تری باسەکەمانە، جا کەواتە، وا دامان‌نا، کەسێك، خوازیاری ڕێگەی تەسەووف‌بو، وە هەرچی‌گەڕا، وە کۆلکە شێخ‌و کۆلکەوەلی تاقی‌کردەوە، هیچی لەو تاقی‌کردنەوەدا پەسەند نەبو، ئەوساکە چی‌بکات ، ؟ لێرەدایە هەم‌دیسان پەنا ئەبەینەوە بەر قورئانی پیرۆز «واتقوا الله وَيُعَلِّمُكُمُ الله» ئەوساکە بەپێی ئەوەی کەلەشەرعا هاتوە، خواپەرستی‌بکات، وەرێگەی تەقوا بگرێتەبەر ، وە بەوچەشنەی کە لەرێ‌ڕەوی تەسەووف‌دا هاتوە دەس‌بکاتە «ذیکر» واتە ناوی خوابردن‌و یادی خواکردن ، بێ‌گومان خواخۆی ئەوبەندەیە وێڵ ناکات، وەخوا لەهەمو دڵسۆزێ دڵسوزترە وە «اَرْحَمُ الراحِمين»، خاوەن بەزەیی‌یەو میهرەبان، وە ڕێ‌پیشاندەر هەر خۆیەتی، واتە «هادی»، وە بێگومان ئەیخاتە سەری ڕێگای ڕاست ،

ئەو بەندەیەی کە بەدڵ بڵێ «اِيّاكَ نَعْبُدُ وَاِيّاكَ نَسْتَعين، اِهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقيم» واتە ئێمە تۆئەپەرستین وە پەناو پشتیوانمان هەرتۆی دە تۆیش بمان‌خەرە سەر ڕێگەی ڕاست، لات وانەبێ خوای‌گەورە ئەوبەندەیە ناخاتە سەری ڕێگای ڕاست، وە ڕێبەرو شارەزایێکی بۆ نانێرێت، بەڵام ئەمە بەبێ تێکۆشانی‌زۆر، وەبەبێ لەخۆبوردن ناکرێت، وە ئەو لەخۆبوردن‌و تێ‌کۆشانەش، هەمان پەیڕەوی‌کردنە لە ڕێ‌ڕەوی تەسەووف، کە بە تێکۆشان‌و خەبات «جیهاد» لەگەڵ نەفسا بەدەس‌دێت، وە خوای گەورە لێرەشا جارێکی‌کەش دڵ‌خوشی ئەو بەندەیە ئەداتەوە، کە ڕێگەی ڕاستەقینەی خواپەرستی، وە تەقوا، وە جیهاد، واتە خەبات لەگەڵ هەستی نارەوای دەرونیا ئەکات وە ئەفەرمێ ، «وَالَّذينَ جاهَدوا فينا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنا» واتە ئەوەی بۆگەیشتن بەئێمە خەبات بکات ئێمە خۆمان ئەبینە ڕەهناو ڕێ‌پیشاندەری بۆسەری ڕێگای ڕاست، ئەورێگایەی کەخۆاخۆی لای چاکە.

موژدەیێکی گرنگی‌تر بۆ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوا دۆستی و خوا دۆزی، ئەوەتە کە خوای‌گەورە بەپەیامبەری خۆشەویست ئەفەرمێ، کەئەفەرمێ «قُلْ اِنْ كُنْتُمْ تُحِبّونَ اللهَ فَاتَّبِعوني يُحْبِبْكُمُ اللهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنوبَكُمْ وَاللهُ غَفورٌ رَحيم» .

خوا ئەفەرمێ «ئەی محمد، بڵێ بەو خەڵکە. ئەگەر ڕاست ئێوە خواتان خۆش‌ئەوێت، وەرن پەیڕەوی لە من بکەن، ئەگەر وا بکەن وا خوایش ئێوەی خۆش ئەوێت، ولەگوناهیشتان خۆش ئەبێت، چونکە خوا بەخشەندەیەو میهرەبان» .

هەروەها خوای گەورە ئەومزژدەیە داوە بەو بەندانەی کە یادی ئەوئەکەن و ناوی خوا ئەبەن ، کە ئەفەرمێ «**فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ**» ، **واتە ئێوە یادی من بکەن و ناوی من بەرن ، منیش ناوی ئێوە ئەبەم و ئەکەونەوە یادم ، بێگومان خوای گەورە** کەسی لەیاد ناچێت ، بەڵام مەبەست لەوەیە مرۆڤ کە لەخۆشەویستی دا ناوی خوا دێرێت وە بۆ نزیك بونەوە لەخوایە کە ناوی خوا ئەبات ، خوایش بەوجۆرە یادی ئەو بەندەیە ئەکات ناوی ئەبات ، واتە «**بەخۆش ویستن**» .

لە حەدیثی قودسیدا خوا ئەفەرمێ «**أَنَا جَلِيسُ مَنْ ذَكَرَنِي**» واتە من ئەبمە هاونشینی ئەوکەسەی کە یادم ئەکات ، بێگومان بەردەوام بون لەسەر خواپەرەستی ، بەرادەیێکی زۆرتر لە ئەنجامدانی فەرزەکان ، ئەویش هەر ئەبێتە هۆی نزیك بونەوە لەخوای گەورە .

ئەویش هەر لە حەدیثێکی قودسی دا پەیامبەری خۆشەویست «**درودی خوای لەسەر**» لە زوانی خوای گەورەوە ئەفەرمێ «**لايَزَالُ عبدي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ ، حَتَّى أُحِبَّهُ ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الَّذِي يَبْصُرُ بِهِ ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا ..**»

واتە بەندەی من ئەتوانێ بە بەردەوام بون لەسەر نوێژی «**نەوافل**» ، واتە شەونوێژ وە نوێژی زیادە لەفەرز ، ئەوەندە نزیك بێتەوە لێم ، تا وای لێ دێت کە خۆشم بوێت ، جا کە خۆشم ویست من ئەبمە هۆی بیستنێ کە پێی ئەبیسێت ، وەهۆی دیتنێ کە پێی ئەبینێت ، وە ئەو دەستەی کە کاری پێ ئەکات ....

مەبەست ئەوەتە رێگای خۆنزیك کردنەوە لە خوای گەورە ، خوا خۆی پیشانی داوین ، هەروەکو ئەو رێگایانەی کە باسمان کردن وەهەروەها وەکو ئەوەی کە ئەفەرمێ بە پەیامبەری گەورە ، «**وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ**» واتە کورنوش بەرە بۆ خوا ، وە لەورێگەوە لەخوا نزیك بەرەوە ، بێگومان ئەم فەرمانە هەموی موسوڵمانان ئەگرێتەوە ، وە مەبەست لەو کورنوش بردنەش ، تەنها کورنوش ، واتە «**سَجْدَه**» نیە ، بەڵکو مەبەست ، پەرەستشە ، بە هەموجۆرێك . بەتایبەت بە «**نەوافیل**» زیادەنوێژ ، جا لێرەدا زۆرباش دەرکەوت کە پەرەستش ، وە تەقوا ، وە **(جیهاد)** واتە خەبات لە دژی هەمو پێناسێکی ناپەسەندی دەرون ، هەمویان ئەبنە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ لەخوا نزیك بێتەوە وە خوای خۆش بوێت و خوایش ئەوی خۆش بوێت و لە گوناهی خۆش بێت وببێتە رێگاپیشاندەری لەو خەباتەیا کەئەیکات بۆ

گەیشتن بەخوا ، هەروەها ئەبێ بەندەی خوازیاری خواناسی ی ، داوابکات لە خوای گەورە ، بۆ ئەوەی کە بیخاتە سەر ڕێگەو ، سەری لێ نەشێوێت و وێڵ نەبێ ، بێ گومان خوای گەورە داوا کردنی «دوعای» بەندەی پاکو خاوێنی خۆی وەرئەگرێ ، چونکە خۆی ئەفەرمێ «اُدْعُوني اَسْتَجِبْ لَكُم» ، واتە لێم بپاڕێنەوە من لێتان وەرئەگرم ، جا ئەوبەندەیەی کە لەو نوێژو پەرستش وشەونوێژانەدا ، کە هەموجارێ لە خوا ئەپاڕێتەوەو ئەڵێ «اِهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقيم» ، بێ گومان خوا هەر ئەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست ، چ لەم دنیا و چ لەودنیا ، سا هەرچۆن خۆی بەچاکی بزانێت . «رَبَّنا عَلَيكَ تَوَكَّلنا واِلَيكَ اَنَبْنا» جا ئەوکەسەی کە پشتی بەخوابەست وەداوای ڕێ پیشاندانی لەخواکرد ، خوایش ، هەروەکو کە خۆی بەڵێنی داوە ئەوکەسە ئەخاتەسەر ڕێگە .

وە هەر سەبارەت بەو جۆرە ڕێ پیشاندراوانەیە کە لەزوانی ئەوانەوە خوا ئەفەرمێ لەڕۆژی قیامەتا لەسوپاسی ئەو نیعمەتەدا ئەڵێن . «الحمدُ لِلّهِ الّذي هَدانا لِهذا ، وَما كُنّا لِنَهْتَدي لَولا اَنْ هَدانا الله ...» ، واتە سوپاس بۆئەوخوایەی کە ئێمەی خستەسەری ئەم ڕێگاچاکەی کە ئەمهەمویاداشەمان پێ گەیشتوە ، وە ئەگەر خواخۆی ئەوڕێگایەی پیشان نەدایێن ، خۆمان نەمان ئەتوانی بکەوینە سەری ئەو ڕێگایە .

جابۆیە ئەبێ مرۆڤ هەمیشە ئاگای لە خۆی بێت ، چونکە هەرچەندە کەوتبێتیشە سەر ڕێگای ڕاست ، بەڵام ئەگەر هۆشیار نەبێت وەچاوی لەبەرپێی خۆی نەبێت ، هەرساتێك بۆی هەیە ، پێی هەڵخلیسکێ وە هەڵدێرێت وە ملی بشکێت ، جا هەر ئەوەتە کە لەقورئانا لەزوانی ئەوبەندە ڕاست ڕەوانەوە ، کەچاوی «بەصیرەت» یان ڕون بوەتەوە ، وە دڵیان بەنوری خوا ڕوناکە ، وە لەخوا ئەپاڕێنەوە ئەفەرمێ «رَبَّنا لاتُزِغْ قُلوبَنا بَعْدَ اِذْ هَدَيْتَنا ، وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً اِنَّكَ اَنتَ الوَهّاب» خوایا ، دڵمان لەڕێ لامەدە ، پاش ئەوەی کە خۆت ڕێگات پیشان داوین ، وە لەلایێی خوتەوە چاکەمان پێ ببەخشە چونکە هەرتۆ بەخشەندەیت .

بەمجۆرە بۆمان دەرئەکەوێت کە سەرەتای ڕێڕەوی تەسەووف ، ئەکرێ بەهۆی ڕێبەرایەتی و ماموستایەتی شارەزایانو ڕێڕەوانی ئەو ڕێگایەوە دەست پێ بکەیت ، وەئەگەر شارەزای باشت دەس نەکەوت ، ئەکرێت بەپێی دەستورو فەرمانی خوای گەورە وە پەیڕەوی کردن لە ڕێ نمونی قورئان وسونەت ، کە بریتی یە لە «تەقوا» لە «مجاهدە» لە «ذیکر» لە نوێژی سونەتو زیاد لە فەرض واتە «نوافل»

وه پارانەوەو داواکردنی «هیدایەت» لە خوای گەورە ، دەست پێ بکەیت بەڵکو خواخۆی بیبێتە ڕێ نمون وڕێ پیشاندەرمان بۆ ناوی جیهانی خواناسی و خوادۆسی .

لێرەدا بەپێویستم زانی دەستی بکێشم بۆلای مەبەستی شەونوێژ ، خوای گەورە بۆرەزامەندی دەربرین سەبارەت بەو بەندانەی خۆی کە شەونوێژ «تهجد» ئەکەن ئەفەرمێ :

«تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ» خوای گەورە پاش رەزامەندی دەربرین لە کوڕنوش بەران ونوێژکەران ، پاشان ئەفەرمێ ، ئەو بەندانەی من تەنشتیان بێزارەو بەرزئەبێتەوە لە پاڵ کەوتن ودرێژرا کشان لەناوی جێگەی نوستنا ، واتە لەناوی نوێنو لێفودۆشەکا ، بەڵکو هەڵ ئەستنەوە سەرپێ وە دەس ئەکەنە نوێژکردن وە پەرستش ، هەم لەترسا وەهەم بۆئومید ، واتە «هەم لەترسی خوادا وەهەم بەئومید وە چاوەڕوانی پاداش لە بەخشندەیی و میهرەبانی خوا »، وە لەو سامانەیش کە بەشیان داون ئەوانیش بەشی خەڵکی لێ ئەدەنو لەبەخشن» .

بەڵێ ئەمانە برێ لەو ڕێگایانەن ، ئەگەر بەندەی موسوڵمان بیان گرێتە بەر ، ئەوبەندەیە ئەگەیێنە خوای گەورە ، لەپاشان خوایش خۆی ، سا ، یان ڕاستەوخۆ بەنوری «هیدایەت» سەربەرزیان ئەکات ، یان ، ئەیان داتە دەستی بەندەیێکی شارەزاو پاکوچاکی خۆی ، کە مامۆستایی یان بکات .

ڕێگەی دوهەمی بەخواگەیشتن لەرێ ڕەوی تەسەووفەوە ، بریتی یە لەوەی کەرێبواری ئەم ڕێگایە ، دەستەو داوێنی شارەزایێکو ماموستایێك بیێت ، لەشێوازی تەسەووفدا ، بەم ماموستایە ئەوترێ ، «مورشید» یان «پیر» یان «شیخ» یان «ئوستاد» یان «ڕێبەر» یان «دەلیل» کە هەموویشی هەر یەکشتە ، وە هەر بۆیەك واتایە ، ئەویش بە ماموستاییکی شارەزا ئەوترێ کە ببێتە ڕێ نمون وەڕێ پیشاندەری ڕێبواری تازەکار ، کە ئەویش پێی ئەوترێ «سالیك» یان «مورید» وە (صوفی) و (دەرویش) ئەوانیش ، بۆ ئەم واتایە هەر بەکار ئەبرێن ، هەرچەن بە واتای تریش هاتون ، هەروەکو کە پیر وە شیخ وە ئوستادیش واتای تریان هەیە .

لێرەدا مەبەستمان لێ کۆڵینەوەیە لەوەی بزانین لەڕێگەی ڕێبەرو مورشیدەوە چۆن ئەتوانین بگەین بەخوا ، واتە بە «عین الیقین» یان «حق الیقین» ، لەپێشا باتۆزی سەبارەت بە چۆنیەتی ئەم مورشیدە باس بکەین ، تابزانین بەکێ ئەوترێ مورشید ،

وەسپاردەی ئەم مورشیدە چی‌یە ، وە مورشیدو نامورشید چۆن لەیەك جیا کەینەوە ، بۆئەوەی تەمەنی خۆمان بە خۆڕایی لەدەس نەدەین ، یان خوانەخواسە تەنانەت ئیمان‌و باوەڕیشمان لەدەس دەرچێت .

هەروەکو لەپێشا هەروا لەبڕێ پێشامەدا باسمان کرد :

یەکەم : سەنگی «مەحەك» وەدەزگای تاقی‌کردنەوەی «مورشیدی کـــامیل» وە (ڕێبەری شارەزا) ئەوەتە ، ئەبێ هەڵسونیشتی ئەو مورشیدە مویەمـــو لەگەڵ کردارو سونەتی پێغمبەری گەورەدا ڕێك‌بێت ، وەمـــــــوویێك لانەدات ، وە بەهەمو مانا موسوڵمانێکی تەواو بێت .

**دووهەم** : ئەوەتە تارادەی پێویست لە ڕێڕەوی ئاین شارەزابێت ، واتە عەوام نەبێت ، بەڵکو شارەزای ڕێگەی شەرع بێت ، چونکە هەروەکو وتمان «تەریقەت ڕۆحو جەوهەرو کاکڵەی شەریعەتە» جا کەسێك کە شارەزای شەریعەت نەبو ، لە کاکڵەکەی چۆن تێ‌بگات ؟

**سێهەم** : شارەزای ڕێگەی تەریقەت بێت ، واتە هیچ‌نەبێ لە شتە ئاشکراو ڕەواڵەتیەکانی تەریقەت ئاگاداربێت .

**چوارەم** : مورشید بەکەسێ ئەوترێ کە ئەویش لەلایەن مورشیدێکی شارەزاو پێ‌گەیشتوەوە روخسەتی پێ‌درابێت ، هەروەکو هەڵقەی زەنجیر ، یەك بەسرابێت بەیەکەوە ، تائەگاتە ، سەروەری جیهان ، حەزرەتی «محمد» علیه الصلاة والسلام .

**پێنجەم** : مورشید ئەبێ خۆی دەرونی ڕووناك بوبێتەوە ، واتە «منور» بێت بەنوری «حق الیقین» ، وە بە پایەی «بەقای‌پاش‌فەنا» واتە «هەستی‌ی پاش نیستی‌ی» گەیشتبێت ، «لەپاشان کاتێ کەباسی پایەکانمان‌کرد باسی ئەم پایەیە ئەکەین» .

شەشەم : مورشید ئەبێ دوکتۆرو ماموستای دڵ‌بێت ، واتە مورید وە ڕێبواری ڕێگەی تەسەووف ، خۆی هەست بەو دوکتوری‌یە بکات ، وە بۆی دەرکەوێت کەوا ئەوشێخەی دەسکاری‌ی دەرونی ئەکات ، وە لەپرتەوی نورو بەرەکەتی ئەوشیخەی بەرخوردارو بەهرەمەند بێت . وە بەخۆی بزانێت ، کەوا لە پایەیێکەوە بۆ

پایەیێك وە گەڕدەنەو شاخێکەوە بۆ شاخو هەوارێکی تازە ئەبیاتو ڕێبەریو شارەزایی ئەکات، هەروەها لە نەخۆشیو دەردی سەری دەرونی ی ڕزگاری ئەکاتو داودەرمانی هەمو دەردەکانی ئەزانێت واتە «دەردی دەرون».

ڕێبەرێك خۆی شارەزای ڕێگا نەبێت چۆن من بیکەمە ڕێبەر؟ ئایا کوێر ئەکرێتە چاوساغ؟ نەخوێنەوار ئەکرێتە ماموستا؟ ناشارەزا ئەکرێتە ڕێبەرو بەڵەد؟.

لەکتێبی «نَعْتُ البِدایات وَتَوصیفُ النّهایات» دا سەبارەت بە دیاریکردنی مورشید، زۆری باس کردوە، والێرەدا بۆنمونە توزێکی ئەنوسین.

«الشّیخُ مَنْ علّمَكَ بِقالِهِ، وَانهَضَكَ بِحالِهِ، الشّیخُ مَنْ افاد الطالبَ وفَتحَ المَطالِبَ، الشّیخُ مَن كَمَلَ فی ذاتهِ وکمّلَ بصفاته، الشّیخ مَن اذا حَلّتْ جِماهُ وجَدْتَ بهِ الغِنَی عمّا سواهُ مِنَ النّاسِ، الشّیخُ مَن یُفیدُكَ فی الشّهادةِ والغَیبِ ویُطهّرُ سِرّكَ بسِرّهِ مِنَ العَیبْ..» هتد، کەواتە ڕێرەو، ئەبێ هەروا خۆی نەدا بەدەستەوە وەنەکەوێتە شوێنی هەر «مُتشیّخ وە مُتصَوّفێك» واتە «خۆ بە شیخ زانو خۆبەصوفی زانێك». خوا پایەیێکی بەرزی بەمرۆڤ داوە، جوانی دروس کردوە، ئاوەزی پێ‌داوە ئاینی بۆناردوە، بەتەمای پاداشی کردوە، خوا خۆیو مەلائکە کان دروديان ناردوە بۆسەری پێغەمبەر وەپیاوچاکان، «خوا ئەفەرمێ»

لَقَدْ خَلَقْنا الانسانَ فی اَحْسَنِ تَقویم «سورەی والتین» ولقد کرّمْنا بَنی آدَمَ وحَمَلْناهم فی البرّ والبَحرِ وَرزَقناهُمْ مِنَ الطیّباتِ وَفضّلْناهُم عَلی کَثیرٍ مما خَلقْنا تفضیلا. «اسراء، ئایەتی ۷۰»

وَسخّرَ لکمُ الشّمسَ والقمَرَ دائبین، «سورەی ئیبراهیم»
وسخّرَ لکمُ اللّیلَ والنّهار والشّمسَ والقمر «سورەی النحل»

وَسَخّرَ لکمُ مافی السّماواتِ ومافی الارضِ جمیعاً «سورەی الجاثیه» ئەمانە هەموی پیشاندەری ڕێزی ئادەمی‌زادە بەلای خواوەجابۆمرۆڤ ڕێز لەخۆی نەگرێت وە بۆچی مرۆڤ لەخۆرایی ببێتە نۆکەرو دواکەوتوی مرۆڤێکی‌تری وەك خۆی، شایەد خۆی هەزار ئەوەندی ئەو بەلای‌خواوە چاکترو پاکتر بێت، کەواتە ئەبێ لە هەڵبژاردنی مورشید، وەپێشەوای تەریقەتا، زۆر وردبین، وەسەرنجدەر وەلێکۆڵەر بین، ئەگینا تەمەن وەرەنجمان بەفیڕۆ ئەڕوات.

کەوابو مورشیدی تەریقەت، ئەبێ هەم ماموستا بێت وە هەم دوکتۆری دڵ هەم ڕێنما بێت هەم دڵسۆز، هەم دەرون ڕوناك بێت وەهەم دورون ناس، هەم خواناس بێت، وەهەم شارەزای ڕێگەی خواناسی ی، وە پەیڕەوی **«سونەتی محمدی»**.

موریدیش، ئەبێ کەسێ بێت وێڵی گەیشتن بە هەوارگەی یەقین، مەجنونی لەیلێ ی حەقیقەت بێت، وەگەردەن کەچی ڕێگەی شەریعەت، ئەبێ بەشوێنی کەسێکا بگەڕێ دەردی دەرونی دەرمان کات، وە ژەنگی دەرونی پاك کاتەوە، بەشوێنی شارەزایێکا بگەڕێت کە لەڕێگەی، پڕدرکو داڵو پڕ بەرزو نزمی، وە پڕ قەمچو پێچو پڕ مەترسی، جەردەو چەتەی ئیمانو باوەڕ، بیپارێزێت، تا ئەیگەیێنێتە هەوارگەی ئاوات، ئاواتی خواناسیو دورون پاکی، هەوارگەی **«تەزکیەی نەفس»**، هەوارگەی **«یاایتها النَّفْسُ المطْمَئِنَّةُ اِرْجِعي اِلىٰ رَبِّكِ راضِيَةً مَرْضِيَّةً، فَادْخُلي في عِبادي وَادْخُلي جَنَّتي»**.

مورید بە ویستیاری ڕێگەی تەسەووف ئەوترێ، کەواتە، مورید ئەگەر بەڕاستی موریدی ئەوڕێگایە بێت، ئەبێ چاو بگێڕێ، ئەبێ لەنزیکەوە تادوور بگەڕێت تا دەستی ئەگاتە داوێنی مورشیدێکی شارەزا، بەو جۆرەی کە باسمان کرد، وە ناساندمان، جا کەدەستی گەیشتە داوێنی کەسێك کە دڵی بەلایەوە ئارامی گرت، وە مەیلو ئارەزوی خواپەرستیو خواناسی ئەوەڕۆژبەڕۆژ زیادبو، وە لەدڵو دەرونەوە هەستی بەگەرمی و بەخۆشی کرد، وە دی کەوا ئەو مورشیدە دەستکاری ی دڵی ئەکاتو دوکتوری دەرونە، جا ئەوساکەیە کە ئەبێ بەدڵو گیان، جڵەوی ویستو ئیرادەی دەرونی بداتە دەستی، وە خۆی ئامادەکات بۆ پەیرەوی کردن لەڕێ نومایی و ئامۆژگاری یە کانی، لێرەدا هوشدارییێکی زۆر گرنگ هەیە ئەبێ بزانرێت **«ئەویش ئەوەتە، مورید فریوی کەشفو کەرامات نەخوات»** بەڵکو ئەبێ ڕەفتارو کرداری مورشید سەیرکات، ئەگەر ئەو ڕەفتارو کردارە سەری موویێك لەشەریعەت لای دا، ئەو مورشیدە **«دەس برە»**، وە بۆمورشید، تەنها نوێژو ڕۆژو بەس نیە، بەڵکو پەیرەوی کردن لە **«سونەتی»** پەیامبەری گەورەش پێویستە، ئەگینا ئەگەر مورشید پەیرەوی سونەت نەبو، مورشیدنیە، وە کەراماتیشی **«اِسْتِدْراجە»** کە بە یارمەتی شەیتان دەست ئەدات، یان وەکو کاری **«مورتازە»** کانی هیندە، یان بڕێ جار، لەژێری و ژیرەکی ئەو مورشیدە دەس برەوە ڕوئەدات، یان هی ڕێکەوتە، لەهەموی کتێبەکانی تەصەووفدا، ئەوە هەیە کە بایەزیدی بەستامی خوای لێ ڕازی بێت، ئەڕوات بۆ

دیدەنی کەسێك کە ناوبانگ وابوە پیاوی خوایەو، وەلی کامیلە، وە ئیرشاد ئەکات، کە بایەزید چوە دیدەنی، جارێکیان دی ئەو مورشیدە ڕو بەقیبلە تفی دەمی فڕێدا، بایەزید گەڕایەوە، وتی، چونکە ئەم کارە پێچەوانەی سوننەت بو، ئیتر من بەناوی مورشید وە وەلی نایناسم. جائەمە بۆ ئامۆژگاری یە، واتە تەنانەت ئائەوڕادیە مورشید ئەبێ پارێزکاربێت، چونکی ئەوشتەی بۆ ئێمە مانان، بەهەڵە دائەنرێ، بۆ مورشید، وە «وەلی کامیل»، بەگوناه دائەنرێ، ئەگەر وانەبو، فەرقی منوئەو چییە، ؟ کەواتە قسەی ناشیرین کردن‌و، لە قلەی پێکەنین‌دانو لە پشت‌ملە باسی خەڵك‌کردنو، خۆکوشتن بۆ کۆکردنەوەی ماڵ‌وسامان، وەکردەوەی سوك وەکو خەڵکی تر، بەتایبەت خۆبەزل‌زانین وە لای ژوروی «مەجلیس» تەرخان‌کردن بۆ فیسارکەس، وە حەیوان سەربرین لەبەرپێی فیسار شیخ‌دا، ئەوانە هەموی، کردەوەی مورشید نین، کەواتە، ئەبێ ئەو موسوڵمانەی ئەیەوێ بڕواتە خزمەتی مورشید بۆ ئەوەی کە وەك ماموستاو دوکتورو ڕانماییێك دڵ‌ودەرون‌و ویست‌و ئیرادەی خۆیی پێ‌بسپێرێت، ئەبێ هۆشی بەخۆیەوە بێت، کەرەنجی بەخۆڕایی نەڕوات، وە گومڕا نەبێت، وەسەری لێ نەشێوێت. چونکە ئەم شتانە کاری «مورید»ە نەك مورشید.....

بۆچی؟ چونکە مورشید، یەکێکە لەم‌سێ دەستەیە.

۱ – مورشیدی ڕاستەقینە :

مورشیدی وایێی خۆشە کە ئومەتی «محمد» هەموی تەوبە بکەن‌و، کەم تازۆر ڕێگەی خواناسی بگرنە بەر، کەواتە قەت ناڵێ بەکەسێ تۆ تەوبە مەکە.

۲ – مورشیدی دەس‌بڕ :

ئەمیش لەمورشیدە ڕاستەقینەکە زیاتر پێی خۆشە خەڵکی لێ کۆبێتەوە، گۆرانی بڵێ بەباڵایاو، کاورو گیسکی بۆبێرێت، وە کۆشکوتەلاری بۆ دروست کات، خەڵك، هاتو خۆی ئەوەندە بێ ئاوەزبو، ئامادەبو ئەم کابرایە بکاتە ئاغاو سەروەر بۆ خۆی، ئەم مورشیدە لە خوانەترسەش، بۆچی ئاغایەتی خۆی نەکات؟ کەواتە مورید، خۆی ئەبێ چاوی بێت، وەخۆی نەکاتە کۆیلە و بەندەی کەس. جا ئەم جۆرە مورشیدە دەس‌بڕەش، دوو دەستەن،

ا : خوێنەوارو شارەزا، هی‌وایشیان هەیە مەلاچاکیشە، ئەمانە زۆر پڕمەترسین، چونکە زۆر درەنگ ئەناسرێن، کتێبی تەسەووف ئەخوێننەوە، وەکردەوەی وایش

ناکەن بەئاسانی بناسرێن، بەڵام باشترین «مەحەك» وەترازو بۆناسینی ئەمانە، ئەوەتە بڵێیت، فەرمو ئەمە دڵی‌منو ئەوەش دوکتورى‌ى تۆ، بزانێت چۆن ئەتوانێ دەست‌کاری دەرون‌بکات.

ب : نەخوێنەوارو ناشارە زاکان. بەتایبەت ئەوانەی کە «شیخیەتەکەیان لە باوباپیرانەوە بۆ بەجێ‌ماوە، وەکەلەپورە، ئەوانە زوو ئەناسرێن، وە مرۆڤی خواناس و خۆاویست وە مرۆڤی خوێنەوار، هەرگیز خۆی ناخاتە داوی ئەو جۆرە مورشیدانەوە، مەگەر ئەمیش وەکو ئەومورشیدە، بۆ بازاڕی دەس‌برین بگەڕێت.

**دەستەی سێ‌هەم :**

ئەو کەسانەن کە ناتوانن کەس بگەیێنە هەوارگەی یەقین، بەڵام خاوەن ویجدانن، وە ئەیانەوێ تەنها «ئەمر بمعروف وە نهی لمنکر» بکەن. **گوێ‌گرتن بۆ ئامۆژگاری ئەوجۆرە کەسانە زۆر بەکەڵکە، بەتایبەت ئەگەر مەلا وەخوێنەوار بون، بەڵام ئیتر ئەوانە پێ‌یان ناوترێ مورشیدی طەریقەت بەڵکو هەر مورشیدی «ظاهیری شەرعن»**، قازانجیان هەیەو زیانیان نیە، بەڵام ناتوانن دەردی ئەوکەسانە بخۆن کە وێڵن بەشوێنی تەسەووف، وە گەیشتن بەهەوارگەی «عین الیقین»، وە سەردەرهاوردن لەحەقیقەت وە کاکڵەی خواناسین، لەڕێگەی «مەعنەوی» یاتەوە.

ئەبێ ئەوەش بزانین کە هەر سێ‌چوار جۆرەکەی ئەم بابەتانە، لە وڵاتی ئێمەدا کەمترن، بەڵکو لە وڵاتە ئیسلامیەکانی‌ترا، هەم مورشیدی ڕاستەقینە، وە هەم هی‌دەس‌بڕ زۆرە، وەهەم بابەتی تەسەووف وەبازاڕی خوا دۆزی و خواناسی زۆر زۆرە.

لێرەدا ترازوو کێشانەیێکی‌تر هەیە بۆ هەڵ‌سەنگاندنو ناسینی هەر سێ‌چوار جۆرە مورشیدەکان، کە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پەیامبەری گەورە بۆئێمەی موسوڵمان‌یان داناوە، کە لەڕێگەی ئەو بەراوردانەوە، ڕاستو درۆمان بۆ دەر ئەکەوێت.

ئەوەی بۆهەمومان رونو ئاشکرایە، ئینسان خۆی لەهەموکەسێ خۆشتر ئەوێت، لەپاشان نەتەوەو رۆڵەی خۆی، باوکو دایك، براو برازا، مامو‌خاڵو پورو ئامۆزاو خاڵۆزاو پورزا، هۆزو عەشیرەت..... هتد. هەر لەسەر ئەم چۆنیەتەش، مرۆڤ ئەکۆشێت کە شتی‌باش، لەپێشا بۆخۆی، وە هەروەکو باس‌کرا، ماڵو‌منداڵ...

هتد.... بەدەس بێرێت، وە خۆیو ماڵو خێزانیشی هەر لەسەر ئەم رەوشە بپارێزرێت، لە خراپەو دەردو کۆسپ.

کەوابو بۆناسینی هەرکام لەو جۆرە مورشیدانە، ئەبێ مرۆڤی ویستیاری رێ‌رەوی تەسەووف، لەم هەڵسەنگاندنە کەڵك وەرگرێت، چۆن...؟.

واتە سەیر بکات بزانێت ئەو مورشیدە، یان ئەو ئامۆژگاری کەرە، خۆی تاچ رادەیێك پەیرەوی لەو ئامۆژگاری‌یانەی خۆی ئەکات، لەپاشان تا چ‌رادەیێك بەسەری ماڵو خێزانو منداڵو خزمی خۆیا، بەکاری دێرێت،!!

دیارە فەرمان دان بەچاکە کردن وەخراپە نەکردن، شتێکی باشە، بەڵام وێژەری ئەو فەرمانەواتە ئەو فەرمان دەرە ئەگەر خۆی باوەری بە وتەکەی خۆی هەبێت، بێ‌گومان لەپێشا خۆی هەوڵو تەقەلای بۆئەدات، لەپاشان بۆماڵو خێزانی هەتا دورترو دورتر، وە ئەگەر خۆی ئەو دەستورەی ئەنجام نەداموا دەرئەکەوێ‌کە باوەری پێی نیە، وە تۆیش نابێ بەو بخڵەتێی، سەبارەت بەم کردەوەیە، خوای‌گەورە ئەفەرمێت «یا اَیُّهَا الَّذینَ آمَنوا لِمَ تَقولونَ مالا تَفعلون،؟ کَبُرَ مَقتاً عِندَ اللهِ أنْ تَقُولوا مالا تَفعَلون.» سورەی «صف» ئایەتی (دوو).

واتە ئەی موسوڵمانانی خاوەن باوەر، بۆچی بەدەم، شتێك ئەڵێن کە بەکردەوە پەیرەوی لێ‌وە ناکەن، مەگەر نازانن بەلای خواوە زۆر شتێکی ناپەسەندو ناشیرینە، بەدەم شتێك بڵێن، بەکردەوە پەیرەوی لێ‌نەکەن؟.

دوبارە هەر سەبارەت بە فەرمان‌دان بەکردەوەی چاکە بەخەڵك، وە پەیرەوی لێ‌نەکردنی، خوای‌گەورە ئەفەرمێ «أتأمرون الناس بالبر وتنسون انفسکم ؟».

خوا لۆمەو سەرزەنشی ئەوجۆرە کەسانە ئەکات وە ئەفەرمێ: «جا ئەوە کارە!!! ئێوە دەستوری چاکە ئەدەن بەخەڵك، کەچی خۆتانتان لەبیر ئەچێتەوە؟»، کەواتە هەرچەن فەرمان‌دان بەچاکە کردنو بەخراپە نەکردن شتێکی‌باشە، بەڵام بۆ ئەوکەسان باشتروایە لەپێشا لۆمەی خۆیان بکەن، وە خۆیان دروس کەن، ئەگینا کەڵکی‌چی‌یە، من خانوی وێرانی خۆم دەس لێ‌هەڵگرم، وە خانوی خەڵك چاك کەمەوە.

لەپاشان هەر لەروانگەی قورئانەوە، سەیرێکی خزمو کەسوکاریش بکەین خوای گەورە ئەفەرمێ «یا اَیُّها الَّذینَ آمَنوا، قُوا أنفُسَکُمْ وَاَهلیکُمْ ناراً وُقودُها النّاسُ والحِجارَةُ....» واتە ئەی موسوڵمانانی خاوەن باوەر، خۆتانو ماڵو منداڵتان وەنزیکانی

خۆتان، بپارێزن لە ئاگری جەهەننەم، ئەو ئاگرەی کە سوتەمەنیەکەی خەڵکەو بەرد..
هتد» لێرەدا دەرکەوت، کە سپاردەی هەمو موسوڵمانێکی خاوەن ئاوەزە، لەپێشا خۆی بپارێزیت، لەپاشان خێزانو کەسوکاری، ئەمپارێزەش بەچی ئەکرێت؟. بە خواپەرستی راستەقینە، هەروەها خوای گەورە لەسورەی «شعراء» ئایەی (٢١٤) دا بە پیغەمبەری گەورە درودی خوای لەسەر، ئەفەرمێ، «وأنذِرْ عَشيرَتَكَ الأقْرَبينَ» واتە خزمە نزیکەکانت بترسێنەو ئاگاداریان کەرەوە.

وە باسی کوڕی «نوح» وە ژنی «لوط» درودی خوا لەسەری هەردوکیان، نمونەیێکی گەورەن کە خوا لەکەس خۆش نابێ بەهۆی خزمایەتیەوە، ئەگەر ئەوکەسە چەوتە، دایە لای بیعاریو چەوتیو خواریی.

جا هەرچەند مەبەستی رەحم وە عاطیفە هەیە، وەکو باسی کوڕی نوح، کە لەخوا پارایەوە بۆی، وە خۆی نەگرت، بەلام خوا لۆمەی کرد، خوا فەرموی «إنَّهُ عملٌ غَيْرُ صالح» واتە: ناء، ئەوە کردەوەیێکی باش نیە، (مفسر)ەکان، ئەڵێن خوا فەرمویەتی بەنوح، ئەم کارەت کارێکی باش‌نیە، برێکیشیان ئەڵێن فەرمویەتی کردەوەی کوڕەکەت چاك‌نیە، هەروەها سەبارەت بەباوکی حەزرەتی ئیبراهیم.

بەکورتی مەبەست ئەوەیە، بۆ ناسینی مورشید، یان ئامۆژگاری‌کەر، ئەبێ سەیرکەیت بزانیت ئەوەی دەستوری ئەدات بەتۆ بەسەری خۆیو ماڵو خێزانو خزمانو نزیکانیشیا دەستوری ئەدات، یان‌نا، ئەگەر وای‌نەکرد، ئەوە متمانەی پی‌ناکرێت.

بێگومان هەموتان سەرگوزەشتی حەزرەتی عومەر، خوای لی‌رازی‌بێت ئەزانن، کەدەستوری‌دا داری حەدیان دا لەکوڕەکەی، وە لەژێری ئەو لی‌دانەدا مرد، یەك‌دوجار عەرزیان‌کرد حاڵی کوڕەکەت پەرێشانە، بەسیەتی باتەواوی نەکەین، فەرموی ئەمە دەستوری خودایە و عومەر ناتوانێ خۆی دەستورێك بدات، بەپێچەوانەی فەرمانی خودا، لەئاکاما کوڕەکەی لەژێری داری «حەددا» مرد، وە حەزرەتی عومەر چویە لای‌سەری وە فەرموی، رۆڵە، کە ئەرۆیتە حوزوری خوا، بڵێ وا عومەر فەرمانی ئێوەی ئەنجامدا. جائەوەتە باوەری تەواو وە «حق اليقين».

**«لێرەدا بە پێویستم زانی مەبەستێك روون کەمەوە، ئەویش ئەوەتە، من لێرەدا بەناوی ئامۆژگاری کارێك، ئەمباسە نانوسم، بەڵکو بەناوی نوسەر، ئەینوسم، چونکە من لەروانگەی**

**تەسەووف وخواپەرستی یەوە، بێزم لەخۆم دێتەوە، وەهەرگیز خۆم بەشایستەی ئامۆژگاری کردن نازانم، وە خۆم زۆرپێویستم بەئامۆژگاری هەیە، بەڵام بەناوی نوسەرێك، ئەڵێم ڕێڕەوانی ئەمڕێگایە وایانفەرمووە، ساخوا منیش بخاتە سەر ڕێگەی ڕاست».**

جا ئیستە ئەڕۆینەوە سەرباسەکەو ئەڵێین، پاش ئەم ئازمونو تاقی کردنەوانە، وە پاش بەدەس هێنانی مورشیدو ڕێبەری ڕاستەقینە ئەبێ چی بکەین؟

ئەوەی کەویستیاری پێگەیشتن بێت، ئەڕوانە خذمەتی ئەو خاوەن نوورە، وە هەروەکو شاگردێکی هەرپیشەوکارێك، یان هەروەکو قوتابی پۆلی یەکی سەرەتایی، یان، وەکو فەقێکی وێلی زانیاری ئایین، لە ئەلفی ئەلفوبێی تەسەووفەوە دەس پێ ئەکات، وەچاو ئەبڕێتە هەوار گەی یەقین، یەقینی خواناسی، هەوارگەی ئاواتی دەرون وە هەنگاو بەهەنگاووپلە بەپلە، وەمەنزل بەمەنزل، ئەو ڕێگا پڕمەترسی یە بەیارمەتی و بەلوتفو ڕانمایی ئەو پیاوی خوایە ئەبڕێت، تا ئەگاتە **«منزلی مقصود»**، جا ئەبێ بزانین کە ئەلفوبێی تەسەووف، لە پلەی **«تەوبەوە»** واتە پاشگەز وە پەشیمانی، وە بڕیاری دەس هەڵگرتن لەخرابەو، بەردەوامبون لەسەر چاکەوە، دەس پێ ئەکات، تا ئەگاتە پایەی، **«بەقای پاش فەنا» واتە «هەستی ی پاش نیستی ی» «مانی پاش نمان»**.

پاش ئەوەی بۆمان دەرکەوت بەکێ ئەوترێ مورشید، واتە ماموستاو ڕێپیشاندەری ڕێڕەوی تەسەووف، ئیستە ئەڕۆینەوە سەری سەرەتای باسەکە، کەوتمان

**«چۆن لەڕێگەی مورشیدەوە ئەتوانین ڕێڕەوی تەسەووف ببرین وە بگەین بەخودا. هەروەها ئەپرسین ئایا ئەم خۆخستنە بەردەستی دوکتوری دەرونە. لەڕوانگەی ئاینەوە کارێکی شیاوو پەسەندە یام نا؟ وە ئایا ئەم مورشیدە واسیطەیە؟ سەبەبە؟ وەسیلەیە؟ چی یەو چی پێ ئەکرێت»؟.**

وەکو لەپێشاوتمان، دیارە مورشید بەموسوڵمانێکی زاناو نورانی و ڕوناکدەرون و شارەزاو دڵسۆزی ئاین وەدڵسۆزی موسوڵمانان ئەوترێ، بەکەسێ ئەوترێ کەخۆی بست بەبست ئەوڕێگایەی بڕیوەو لێی شارەزایە. وە لەلایی ڕێبەرێکی شارەزای ترەوە بەمورشیدی ناسراوە، جا ئاوا کەسێك هەرگیز خەیانەت لەموسوڵمانان ناکات، وەدیارە بەدڵودەرونێکی کراوەو ئاوەڵاوە پێشواز ئەکات لەویستیارانی ڕێگەی

خواناسی. وه ماموستاییکه لەهەموی ماموستایان دڵسۆزتر، کەواتە ویستیاری ڕێگەی تەسەووف هەروەکو. شاگردێکی پاکو چالاکی وێلی زانیاری؛ ئەڕواتە خزمەتی ئەو ڕێبەرە وە ئامادەئەبێت بۆ ئەنجامدان وبەکارهێنانی ئامۆژگاریەکانی؛ وە لە ڕێبازی تەسەووفدا ووشەیێکی تایبەت بۆ ئەم خۆدانەدەستی مورشیدە هەیە، کە ئەڵێن ئەبێ وەکو «**مردوی بەردەستی مردوشۆر**»، کەهیچ چەنوچۆنێ لەدەمی دەرنایێ؛ ئاوا بەوجۆرە خۆی بخاتە بەردەستی مورشید «**کالمیّتِ بَیْنَ یَدَيْ الغاسِلْ**»: ئەمەش کەی ڕوویەدات؟ پاش تەوبەکردن لەسەردەستی ئەومورشیدە: وە خوێندنی یەککەم «**وانە**»ی تەسەووف، لەشێوازی تەسەووفدا بەمکارە ئەوترێ «**تەمەسسوك**»، واتە دەس گرتن بە «**سیلسیە**»ی تەریقەتەوە، واتە دەس گرتن بە زەنجیرێکەوە کە هەر هەڵقەیێکی، لەپیرێك، واتە مورشیدێك پێك هاتوە، تائەگاتە سەری سەروەری جیهان حەزرەتی «**محمد**» درودی خودای لەسەر وە بەوەش ئەڵێن «**سیلسیلەی تەریقەت**»، واتە زەنجیرەی ڕێگای تەسەووف. ئەم تەمەسسوکە، کاری شاگردە، واتە: سوفی تازەکار؛ وەبەو یەکەم دەرسە ئەوترێ، «**تەلقینی تەریقەت**» کە شێخ خۆی، یان نوێنەرێکی شێخ کە پێی ئەوترێ «**خەلیفە**»؛ ئەنجامی ئەدەن، بەکورتی ئەم دەرسە، «**وانە**» سەرەتایی یە بریتی یە لە تەوبە دادان لای مورشیدەوە وە «**تەوبە**» کردن لای موریدەوە هەروەها تەعلیمی تەریقەت دادان وەتەعلیم وەرگرتنیشی پێ ئەوترێ وە تەوبەش لەکاتی باسی وشەی تەوبەدا باسی لێوە ئەکەین: بەڵام تەوبە بەکورتی بریتی یە، لە بریارێکی گرنگی دەس هەڵگرتن لەهەمو ڕوشێکی ناپەسەند وەدژی ئاینی ئیسلام، وبریاردان لەسەرنەوەی هەرگیز ئەوکەسە نەڕواتەوە سەری کردەوەی ناشیرین، وە بریاردان لەسەری دووری گرتن لە پێ ناسی: «**صیفاتی**». ناپەسەند، وە هەوڵو تێکۆشانە بۆ وەرگرتنی پێ ناسی «**صیفاتی**» پەسەند: بەوانەش ئەوترێ «**صیفاتی**» رذیلە، وە ئەوصاف «**حمیدە**» کەلەپاشان ئەوانیشتان پێ ئەناسێنین، وە پێ ناسی ناپەسەند، وەکو کینە خۆبەزل زانین بەخیلی هتد...

پەسەندیش بە پیچەوانەی ئەوان، ئارەزوی خۆشی وسەرکەوتن بۆهەموکەس، خۆبەزل نەزانین، بەڵکو خۆبەهیچ زانین، وە بەخشینی ئەوانەی ئازاریان داویت (عفو) هتد... خرابەکان حسد، حقد، غرور تکبر حُبِّ انتقام، چاکەکان وەکو عفو، تواضع، نکران الذات کرم، الخ.. کەلەئایندەدا تابۆمان بکرێت ئەیانخەینە ڕوو.

جا، شاگردی تازە تەوبەکردو، جگە تەوبەش فێری دەرسی سەرەتایی چۆنیەتی «**ذیکر**» واتە یادی خوا کردن‌و ناوی‌خوابردن، ئەکرێت، وە لەبری تەریقەت‌دا، وەکو نەقشبەندی‌یەکان، چۆنیەتی (**رابطە**) «**رابیتە**» واتە پەیوەندی ڕۆحی لەگەڵ ڕێبەردا، بەمورید ئەوترێت کە ئەم‌جۆرە زانینانە، ئەگەرهاتو باسم‌کرد لەبەشێکی تایبەت‌دا، لەژێر ناونیشانی «**چۆنیەتی بەڕێوەبردنی یاسای تەسەووف دا باسی لێوەئەکەین**. **چونکە بەوجۆرە باسەکەمان ئەبێتە دووباس**. **ئەمەی ئیستە، کە تەسەووف**» ناسینە، ئەو یان ئەبێتە (**بەسوفی‌بون**»، کە هەریەکەی شتێکی جیاوازە،

بەڵێ پاش‌ئەوەی کە تازەشاگردی ڕێ‌ڕەوی تەسەووف. (**وانەی**) سەرەتای دەست‌پێ‌کردنی تەسەووف فێربو، ئەوسا کە ئەبێتە (**مورید**)، واتە خوازیاری ڕێ‌ڕەو، بەلاّم لێرەدا زۆرپێویستە وریاتان‌کەمەوە کە مورشیدی ڕاستودروست ئەم دەرسی سەرەتای تەریقەتە، تەنها بەوکەسانە ئەڵێت، کە لە پێشا زۆر باش لەئیمان‌و ئیسلام، وە لەچۆنیەتی فەرزەکان، شارەزابێت، وەبەباشی بزانێت ئەو ئیسلامەی کە ئەو شەیدای گەیشتن بەکرۆکو کاکڵەو جەوهەرەکەیەتی، چی‌یەو چی‌نیە، نەك ئەوەی، هەروەکو داگیرکاری‌ی وە خەڵك‌دابڕکردنی ئەم‌زەمانە، نیوەی بەزۆرو نیوەی بەڕەزا، وە بەشێکی بە ڕوولی‌تان، تەوبەیان دادەن وەیان کەنە مورید، بی‌ئەوەی ئەوکەسە تەپ لەئاینو مەذهەبەکەی بپێکی، چونکە هەروەکو وتمان تەسەووف «**جیهاد**» **واتە خەبات‌و تێکۆشانێکی زۆرسەختی ئاینی‌یە بۆگەیشتن بەپلەی خواناسی‌ی تەواو وە دامرکانی‌دڵ بە ڕووناك‌بونەوەی بەنوری خواناسی‌ی**. **نەك بۆ دەستەوبەستە زۆربون‌و کاوروگیسك هێنەر**. **بەڵکو بۆ پەروەردەکردنی شاگردی دڵ‌گەرم‌وباشە بۆگەیاندنیان** بەپایەکانی خواناسی‌ی، بەکورتی، هەر چۆن فەقی‌یێك، یان شاگردی خوێندن‌گەیێك. لەپۆلی یەکەمی دەرس خوێندنەوە، دەس پی‌ئەکات، وە ئەو دەس‌پێ‌کردنەی بەئومێدو ئارەزوو ئاواتی گەیشتنە بەدواپلەی خوینەواری‌ی، وەپێی‌خۆشەو تی‌ئەکۆشی ببێتە پزشك، یان ئەندازیار، یان دوکتورا، وە ئەگەر لەوە کەمتربو دڵی دانامرکی، وە لەبەر ناچاری‌و دەس‌نەدانە، شاگردانی ڕێگەی تەسەووفیش، واتە، صوفی، دەرویش، مورید، ئەوانیش ئەلێ بۆئەوە تەوبە بکەن، وە برۆنە ئەو گۆرەپانەوە، بۆ ئەوەی بگەن بە ئاوات. وە ئاواتیش خواناسینە، ئەویش، لەیەکی لەومەقام واتە «**پلانە**» دا بەدەست دێت کە باسمان‌کردن، وە لەپاشان، لەکاتی باسی مەقام‌و حاڵ‌دا، باسیان ئەکەین، وەکو مەقامی «**صبر، توکل**»

وە هی‌تر. هەروەها مورشیدیش هەر ئەبێ بۆیە مورید وەرگرێت، بەوئاواتەوە، وە بەونیازەوە، کە یارمەتی‌بدات تا ئەیگەیێنێتە پایەیێك لەوپایانە،

جا بەش‌بەحاڵی‌مورید، هەرکەسەو، لێ‌هاتویی‌و توانایی‌و خەباتی خۆی، کە خوا، تاچ پلەو پایەیێکی کردبێتە بەشی، وەخۆی تاچ رادەیێك «لیاقت» و لێ‌هاتویی هەبێت، وە سەبارەت بەمورشید وە رێ‌بەریش ئەوەتە، ئایا ئەو مورشیدە تا چ‌پلەیێك لە وزەیابێت مورید ببات وە پێی بگەیێنێت، وە خۆی تاکوێ خوێندوەو تاکوێ ئەتوانێ بەشاگردەکانی دەرس بڵێت، چونکە هەروەکو، کە ماموستاکان لە خوێندنی دنیایی‌و شەرعی‌دا رادەو پلەیان هەیە، مورشیدەکانیش هەروەهان، تەنانەت لە نێوانی مورشیدی «کامیل وە موکەممیلیش» دا، هی پایەبەرزترو هەڵکەوتوتر هەیە، وە ئەوەتا: لە ناوی دەها هەزار مورشیدی کامیل‌دا، کەڵەپیاوانێکی، وەکو «بەدەوی. وە رفاعی. وەگیلانی، وەنەقشبەند. وەعەرەبی» وەهی‌تر هەڵکەوتوە، کە واتە، هەم مورید، بەپێی ئامادەیی‌و لێ‌هاتویی خۆیی دەس‌ئەکەوێت، وەهەم، مورشیدیش ئامورشید. فەرقیان هەیە، وە زۆر جار مورشیدێك موریدێکی زۆر لێ‌هاتوی خۆی، تاپایەکەی خۆی ئەیبات‌و رێ‌نمایی ئەکات، پاشان ئەڵێ برام من ئیتر لەمەولا لەوزەمانیە، بەڵکو خۆت بتوانی، یان مورشیدێکی شارەزاتر پەیداکەیت، یان بەخەبات وتی‌کوشانی خۆت بەرەوژورتر برۆیت. وە ئەمەش لەجیهانی تەسەووف‌دا زۆر رووی‌داوە وە نمونەی زۆرە. وەسەرگوزەشتی شاهی‌نەقشبەند یەکێکە لەو نمونانە، ئەگەر عومرباقی‌بو لەکاتی باسی ئەم‌رێ‌رەوەدا ئەیگێرینەوە بۆتان.

هەروەکو لەجیهانی خوێندنی «ظاهیر» یشدا رووئەدات کە زۆر شاگرد لە ماموستا پێشوەکانیان زیاتر ئەخوێنن، بەڵام برێ ماموستا هەن، کەم وێنەن وە بە دەگمەن شاگرد بگاتە قولەپی‌یان.

کەوابو دەرکەوت، «تەسەسوك» وە تەوبەکردن وە بەدەروێش‌و صوفی‌بون، هەر بۆ ئەوەنیە خەڵکێکی‌زۆر بنە پەیرەو، وە نوکەرو بچوکی گەورەپیاوێکی ئاینی، بەڵکو هەروەکو خوێندنی دنیایی، ئەویش بۆ چونە مەکتەبی خواناسی‌یە، بۆئەوەی بگەیێتە ئاوات و مراز، وە مورشیدیش بۆ ئاغەیی‌کردن نابێت، بەڵکو بۆئەوەتە ببێتە ماموستا، بۆگەیاندنی مورید بە پایەکانی خواناسی بەپێی رێبازی تەسەووف، جا ئەم

«تەوبە» وپاش گەزە، هەروەکو کە سەرەتاییکە بۆ جیهانێکی نوێ، کە بریتی یە لەجیهانی تەسەووف، هەروەها، بەڵێن وە پەیماندانیشە بەو ڕێبەرە واتە بەمورشیدەکە، چونکە ئەومور یدە هەروا کە لەگوناهانی لەوەوپێش پەشیمان ئەبێتەوە، بەڵێن ئەدات بۆئەوەی کە ئیتر نەگەڕێتەوە سەر ڕێگای چەوتی لەوەوپێش، کە ئەمە لەئیسلامدا بەناوی «بەیعەت» وە «عهد» هاتوە، هەم لە سەردەمی پەیامبەردا درودی خوای لەسەر، وە هەم لەرۆژگاری جێ نشینەکانیا، دەست بەدەست هاتوە تائەمرۆ، بەتایبەت لەرۆژگاری ئیرشادی **حەزرەتی شیخ عبد القادری گەیلانی‌دا)** کە دەستە دەستە خەڵك شێوەی **«پەشیمانی و بەڵێن»**، واتە **(تەوبەو عەهدیان)** ئەنجام‌داوە. هەروەکو لەقورئان سەبارەت بەو دە کەسە ئایەت هاتوەتە خوارەوە کە بەڵێنو پەیمانیان‌دا، بە پەیامبەری گەورە، وە بەناوی **«عَشَرَه»** ی **«مُبَشَّرَه»** ناویان دەرکرد، واتە ئەو دەکەسەی کە خوا موژدەی چونەبەهەشتی پێ‌دان، ئایەتەکەش ئەفەرمێ **«لَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ...»** الفتح ئایەتی «١٠» یان کە ئەفەرمێ:

«**اِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ اِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللهَ، يَدُ اللهِ فَوقَ أَيْدِيهِمْ....**» تالەپاشان ئەفەرمێ **«فَمَنْ نَكَثَ فَاِنَّمَا يَنْكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللهَ فَسَيُؤْتِيهِ اَجراً عَظِيماً»** الفتح «١٩»، بەکورتی ئەم تەوبەکردن وتەریقەت وەرگرتنە، هەروا کە دەس‌هەڵگرتنە لەخراپە، بەڵێن‌دانێکی مەردانەیشە بۆخەبات و تێکوشان لەسەری‌دەستی ئەومورشیدەدا بۆگەیشتن بەپلەی ڕەزامەندی خوای‌گەورە، وەخواویستی، بەپێی ڕێرەوی تەسەووف.

ئیستە ئەڕۆینەوە سەری ئەوپرسیارەی کەبزانین مورشید چی‌یەو چی پێ ئەکرێت؟... لەوەڵاما ئەڵێین، مورشید هەم ڕێ‌نماو ڕێ‌بەرە، هەم ماموستایە، وەهەم پزیشك....، چۆن؟.

ئێمە لەپێشا لەپێناسی مورشیدا وتمان، ئەبێ ئەومورشیدە خۆی لەسەردەستی مورشیدێکی پێ‌گەیشتوی‌ترا تەواوی کردبێت، وە گەیشتبێتە پلەی **«بەقای‌پاش‌فەنا»** واتە **«مانی پاش نەمان»**، بێ‌گومان مورشیدێك کەوابو، وا خۆی شارەزای ڕێگاکانی گەیشتنە بەو پلەوپایەیە، وە ئەبێتە ڕێبەرو ڕەهنمای شاگردەکەیشی، مەولەوی خوای لێ ڕازی‌بێت لەنامەیێکیا بۆ مورشیدی خۆی حەزرەتی شیخ عوسمان سیراج الدین کە

بەشیعر نوسیویەتی دەس راتەکێشی بۆ ئەومەقامەی مورشیدەکەی واتە «**بەقای پاش فەنا**» کە ئەڵێت.

شێخی دەوڵەمەند بەهرەی سەرمەدی
یاگەی حەقیقەت جیلوەی ئەحمەدی
جە شەوهەوارگەی «**فەنا**» ویەردە
پای هەردەی «**بەقا**» یاتاغگە کەردە

واتە ئەی‌شێخە دەوڵەمەندەکە لە بەهرەی هەمیشەیی‌و بێ‌پایانە کەبوگیتە کانگەی حەقیقەتی ئەحمەدیی واتە (**دینی‌موحەممەدی**). ئەی ئەوکەسەی کەلە هەوارگەی «**فەنا**» تێ‌پەرت کردوەو لەکێوی (**بەقادا**) مەنزڵت گرتوەو بارت لێ‌خستوە. دوهەم ئەوەتە ماموستایشە، چونکە خۆی هەموی دەرسەکانی خوێندوەو تەواوی‌کردون‌و بوەتە پسپۆڕو کارناس تیایاندا، وەئەتوانێ هەمان دەرسیش بڵێتەوە بە موریدەکەی خۆی، وە نەیەڵێت ڕێگا گوم کاتو گورگی نەفس‌و شەیتان لە ناوی‌بەرن، لە هەموی گرنگتر لە پێویست‌بونی مورشیدا، بەشی پزیشکی‌یەکەیەتی، چونکە هەروەکو کە زۆر لە نەخۆشیەکانی ئاشکرایی پێویستیان بە «**عملیات**» هەیە، هەروا، زۆرێك لە نەخۆشی‌ی دەروون، بە «**عملیات**» نەبێ، چارەیان نایێت، یان وەکو منداڵێك یان پیرەمیردێك زۆرجار لەبرێ ڕێگای سەختا لەپێ‌ئەکەون، یان سام وەترس دایان ئەگرێت، وە ئەکەونە پێ‌لەرزەو ورە لەدەس بەرئەدەن، هەرواش برێ‌جار، نەخۆشی‌دەرون، بەدەرمان چارە ناکرێت، بۆنمونە بڵێین هەستی «**حەسادەت**» لەکەسێکا، یان هەستی خۆبەزل‌زانین، یان ناوو نوتکەنان بەخەلکەوە، کە لە فەرمانی «**نەفسی أمارە**» وە سەرچاوە ئەگرن، واتەبێت کە بۆ ئەو موریدە خۆی چار ناکرێن، بەڵام مورشیدی بەدەسەلات ئەتوانێ، بەیەك «**تَوَجُّه**»، واتە ڕوی‌دڵ تێ‌کردن، یان دەست‌کاری‌ی دەرون‌کردن، ئەو هەستە پیسە لە کۆڵی مورید بکاتەوە، وە توری‌دات، وە بۆ هەمیشە ڕزگاری‌کات، جا هەر ئەوەتە کەزۆرجار گەورەپیاوانی ڕێ‌ڕەوی تەسەووف، وەکو (**مەولەوی**) بەمورشیدەکەی خۆیان ئەڵین «**حەکیمی حاڵ‌زان**»، یان ئەوکەسانەی کەلەوڕێگایەدا پەکیان ئەکەوێت وە هەست بەوە ئەکەن ئەو ڕێگایە بەخۆیان نابڕرێت وەئەبێ کەسێ دەسیان بگرێت، لەوێدا بەمورشید ئەڵێن «**پیری دەس‌گیر**»، جاکارکردو شوێنەواری ئەم‌جۆرە یارمەتی‌دانە کە بەهۆی «**تَوَجُّه**»، ڕوونی‌کردنی مورشیدەوە، دەس‌ئەدات، مورید خۆی

هەستی پێ ئەکات، ئەگینا شتێك نیە بۆکەسی‌تر بزانرێت، مەگەر بۆکەسانێك کە ئەوانیش بابەتی ئەوکارەبن کەزۆرجار ئەبێت لە حالی‌بەڵەتر ئەگەنو جاری‌وایش هەیە جگە پیرومورید کەسی‌تر هەستی پێ ناکات، ئەبێ ئەوەش بزانین کە «تَوَجُّه» پێویست نیە کە مورید لە خدمەتی شیخ‌دابێت جا روی‌دڵی تێ بکرێت، بەڵکو ئەکرێت زۆر لەیەکیش دووربن. وە ئەکرێت بەیەکەوەبن.

زۆرجاری وایش ئەبێت کە ئەومورشیدە لەکاتی ئەنجامی «ذیکر» دا، لە حەلقەی «خەتم»، یان ذیکردا، بەرانبەری ئەو موریدە دانیشێت وە روی‌دڵی بکاتە، دڵی ئەوموریدە، واتە لای‌چەپی هەردولایان بەرانبەر بەیەکتر بێت، وە هەردولا چاویان بەیەکا نابێت، وە ئەوموریدە چاوەڕەوانی‌ی بەرەکەت بکات لەوشێخە، یان لەو «تەوەججوە» کــەرە، کە بگرە نوێنەری شێخ بێت، وە هەست بەو چۆنیەتی دەس‌کاری دەرونە، یان بەو نوروبەرەکەت پی‌گەیاندنە بکات، تەنانەت جاری‌وا هەیە ئەودەست‌کاری‌یە مەعنەوی‌یە، هەروەکو عەمەلیاتی ئاشکرایی،یان برین هەڵدرین، یان شکستەگرتنەوە، ئاوا ئێشی هەبێت، وە تەوەججوە لی‌کراو هاواری لێ هەستێ، وە لەپاشان بێهۆش‌کەوێت، یان ئەگەر تەوەججوهەکە، بۆ گەیاندنی بەرەکەتو، گەیاندنی مورید بە مەقام بێت، ئەو تەوەججوە لێکراوە، وەکومەست لێی‌بکەوێت؛ وەپاش ماوەیێکی‌زۆر، کەبرێ‌جار شەووڕۆژێ، برێ‌جار زۆرزیاتر، یان، بۆچەن‌سەعاتێك، هەر مەستی ئەو خۆشی‌و کامیابی‌یە بێت، وەبرێ‌جار ئەو موریدە لەخوشیدا دەس‌ئەکاتە پێکەنین، وەیان هەڵپەرکێ، بەڵێ ئەمانە هەموی راستەکەی هەیەو بوە، بەداخەوە زۆرجاریش هەروەکو «تەمثیل» ولاسایی‌کردنەوە، بەدرۆو تەڵەکە، «لاسایی ئەم «حەقائقە مەعنەوی» یە ئەکرێنەوە، ئەوانەی کە ئاوا دەستی خەڵکی ساویلکە ئەبرن، رۆژێ ئەبێت بە سزای ئەوکردەوەیەوە بتلێنەوە، وەخوا تۆڵەیان لێ بسێنێتەوە.

لێرەدا ئەبێ بپرسین: ئایا لەروانگەی ئاینەوە، ئەکرێت بەکەسێ بوترێ «سەبەب» یان «وەسیلە»؟

بێ‌گومان هیچ‌کارێ بەبێ سەبەب ئەنجام نادرێت ئایا ئەوسەبەبە، مرۆڤێك بێت یان دروس کراوێکی دەستی مرۆڤ، وەئامێرێکی ماددی بێت، هەروەهایش مرۆڤ بۆگەیشتن بە هەرئامانجێ پێویستی بە وەسیلە هەیە، هەروەکو کە بۆخوێندن

پێویستمان بەماموستایە، بەڵام باماموستایشمان هەبێت، وە بریاریشمان لەسەری خوێندن دابێت، مرۆڤی موسوڵمان باوەری لەسەرئەوەتە، ئەبێ خوای گەورە یارمەتی دەری مرۆڤ بێت وە ویستی خوای لەسەربێت، تا لە خوێندنەکەدا سەرکەوێت، یان ئەگەر نەخۆش بوین ئایا ئەکرێ نەرۆینە لای دوکتور وەبڵێین وەسیلەمان ناوێت، وە دەرمان نەخۆین وبڵێین پەنا نابەینە بەر ئەسباب؟ ئایا خوا شتی وای فەرمووە؟...

نا... بەڵکو ئەبێ هەم برۆینە لای دوکتۆر وەهەم دەرمانیش بخۆین، بەلام بەوشەرتەی باوەرمان لەسەرئەوەبێت کە «شیفادەر» وە خۆش کەرەوە هەر خوا خۆیەتی، ئێمە ئەوەی لە وزەماندایە ئەیکەین، وەئەوەشی کە تەنها بەدەستی خوایە پەنائەبەینە بەر دەرگای خودا، وە لێرەدایە کە بەخوا خۆی ئەوترێ «مُسَبِّبُ الأَسْبابِ»، هەرخوایە کە دوابریار بەخۆیەتی؛/ جا بۆرروونکردنەوەی ئەمباوەرە، سەیرئەکەین

خواخۆی لەسورەی مائدە ئایەی «٣٥» دا ئەفەرمێ «یاأیّها الذینَ آمَنوا اتقوا اللهَ وابتَغوا إلیهِ الْوَسیلَةَ، وَجاهِدوا في سَبیلِهِ لَعَلَّكُم تُفْلِحون» لێرەدا خوای گەورە زۆربەروناکی بەموسوڵمانانی خاوەن باوەر دەستور ئەدات کە بۆ گەیشتن بە رەزامەندی ی خودائەبێ هۆیێك بخەنەدەست، بێ گومان ئەم هۆیە، خواپەرستی یە، وەچاکەکاری یە، چونکە ئەفەرمێ إتقوا الله، واتە بترسن لەخوا واتە پارێزکاربن، وەئەفەرمێ جاهدوا في سبیله، واتە تێ کۆشن وەخەبات بکەن، وەزوتر وتمان «جیهاد» وە خەبات، دوو جۆری هەیە، خەبات لەدژی دەرخواستە نارەواکانی دەرون، وە خەبات لەدژی خراپ کاران وەکافران، کەواتە ئایا تۆ ئەگەر ماموستات نەبێ ئەتوانی لە ئایین بگەیت تاپەیرەوی لێوەبکەیت؟ ئەگەر ماموستات نەبێ ئەتوانی فیری خوێندن ونوسین بیت؟ ئایا بۆ زانینی رێگەی خواناسی ی وە ئایین ناسی ی بۆچی پەنا ئەبەیت بە وەسیلە، واتە «ماموستا». ئەکرێ بڵێین خواپەرستی وەسیلەی بۆچی یە؟ ئەی بەبێ ماموستا، واتە وەسیلە، چۆن بخوێنم چۆن خوابناسم، چۆن باوەرم دامەزرێ؟ چۆن لەشەرع بگەم؟

جا من، کە بۆ زانیاری ی ئاشکراو ظاهیری شەرع، ماموستام پێویست بو، بۆ زانیاری ی قوڵ تر وە جیهادی گرنگ تر، وەبۆ بەدەس هێنانی ئاکامی بەکەڵك تر، واتە پلەی «عَیْنُ الیقین»، چۆن پێویستم بەماموستا، واتە، وەسیلە نیە، ئەم وەسیلە خۆی مەقصودنیە، واتە هدف نیە، مەقصود. خودایە، نەك شیخ، کاتێ کەمن روو ئەکەمە. «کەعبە» بۆ نوێژ، لەبەرخاتری نزیك بونەوە لەخودایە روئەکەمە «کەعبە»و

بەرەوکەعبە کورنوش ئەبەم ، «مقصود تونی کعبەوبتخانە بەهانە» ئەگینا خۆ کەعبە ناپەرستم وەکورنوش بۆکەعبەخۆی نابەم.

خوای گەورە سەبارەت بە «ذو القرنین» لەسورەی الکهف‌دا ئەفەرمێ «إنّا مَکَّنّا لَهُ فی الأرضِ وَآتَیناهُ مِنْ کُلِّ شَیءٍ سَبَباً» «فَأتْبَعَ سَبَباً» ، کەواتە سەبەبو وەسیلە بەدەس‌هێنان ، دژی قورئان نیە ، بەومەرجەی ئەو وەسیلەو سەبەبە ، خۆی بە مؤثر واتە «کارکەر» وە هەدەف وە مەقصود «داواکراو» نەزانرێن ، بەڵکو بە هۆیێك دانرێن بۆگەیشتن بەیەقینی تەواو ، وە بەپلەی خواناسی ، وە بەدەس هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە ، .. وەبێ‌گومان خوای گەورە پیاوچاکانی خۆش ئەوێت ، «ألا إنَّ أولیاءَ اللهِ لاخَوفٌ عَلَیهِمْ وَلاهُمْ یَحزَنون» «یونس» وە خوا پێی‌خۆشە کە مرۆڤی موسوڵمان نزیکی بکات لەپیاوچاکان بەڵکو دەستوری‌ئەدات وەئەفەرمێ «یاأیُّها الَّذینَ آمَنوا اتَّقوا اللهَ وَکونوا مَعَ الصّادِقین» سورەی تەوبە ، وەمورشیدی‌کامیل ، بێ‌گومان بۆلای‌خوا نەبێ موسوڵمانان بۆهیچ کوێیێکی‌تر ڕێ‌نمایی ناکات ، کەواتە بۆچی نەکەوینە پشتی‌سەری ،؟ هەمیشە نەریت‌وابوە منداڵ لەدایکوباب بێت ، لەکاتێکا کە خواخۆی خالیقە ، ئایا ئەکرێ بێ‌ژن‌هێنان وشوکردن چاوەڕوانی منداڵ‌بین وەبڵێین خوا خالیقە؟ ... بەڵام دروستیش‌نیە وابزانین تەنها بونی ژنومێرد ، بەسە بۆ منداڵ‌بون ، بەڵکو ئەبێ باوەڕمان لەسەر ئەوەبێت ئەگەر خواستی خوای لەسەر نەبو ئەو منداڵەش دروس نابێت ، وەخوا ئەفەرمێ «إنَّهُ هُوَ خَلَقَ الزَّوجَینِ الذَّکَرَ والأنثی» خوا هەم ئەفەرمێ «اللهُ یَتَوَفَّی الأنفُسَ» سورەی زمر (٤٢) ، هەم ئەفەرمێ «قُلْ یَتَوَفّاکُم مَلَكُ المَوْتِ الَّذی وُکِّلَ بِکُم» سجدە (١١) ئایا ئەکرێ بڵێین مەرگ بەدەستی مَلَكُ الموتە؟ خوا ئەفەرمێ «إنَّ اللهَ هُوَ الرَّزّاقُ ذو القُوَّةِ المَتین» ذاریات «٥٨» ئایا ئەکرێت ئێمە پاڵی لێ‌بدەینەوە وە بڵێین وەسیلەو سەبەبی پێ‌ناوێ چونکە خوا ڕۆزی‌دەرە ، جا هەروا بۆ مورشید وە ماموستایانی ئاین وە ڕێبەرانی ڕێگەی خواناسیش ئەفەرمێ «وَجَعَلنا مِنهُمْ أئِمَّةً یَهدونَ بِأمرِنا لَمّا صَبَروا وَکانوا بآیاتِنا یوقِنون» سورەی سجدە «٢٤».

بەڵێ بەم‌چەشنە ڕوون ئەبێتەوە کە پەنابردنە بەر ئەسباب‌و وەسیلەی ظاهیری ، بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری ڕۆژانە ، چۆن پێویستە ، وەپەنابردنە بەردەستی ماموستایانی خوێندن ، بۆفێربونی خوێنەواری‌ی دینی‌و دنیایی چۆن‌پێ‌ویستە ، هەروەهایش پەنابردنە بەردەستی مورشید وپیری‌کامیل وەموکەمیلی تەریقەتیش بۆگەیشتن بەمراز لەڕێگەی دەرونەوە ئەویش هەر بەوچەشنە پێویستە ، وە چۆن بۆ ئەوانی‌تر هیچ لەگەورەیی خوا کەم نابێتەوە وە رازق وە «مُسَبِّبُ الأسباب» وە «شافی» وە «خالق» ڕاستەقینە خوا خۆیەتی ، بۆگەیشتن بەپلەی بەرزی یەقین وەخواناسیش ، پیر،

«**حُجرات**» یەعنی چی ؟ واتەهیشتائیان نەچوەتە دڵتانەوە، ؟ ئەودڵەگوشتینە چی یە تائیانی تی چێت ؟ بێگومان ئەچێتە وجودو دەرونو مرۆڤایەتیی مرۆڤەوە.

یان کەئەفەرمیّ، «**فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى القلوب**»، ئایا ئەودڵە گوشتینە چۆن پارێزکاریی بکات، بی گومان مەبەست دەرونی مرۆڤە، کەخۆی بپارێزێت لەکینە لەحەسەد لەخۆبەزلزانین، لەخوانەترسان لەصەدان نیازو پێناسی ناپەسەند، کەدێنە دەرونەوە «**تەقوا**» بکات واتە، پارێزبکات، برێکیش ئەڵێن دڵ فەرمانڕەوای لەش نیە، بەڵکومێشکە، لێرەدا دوبارە هەمان شتی ماددی دێتەپێشەوە، چونکە مەبەست نە ئەو دڵە گوشتینەیەو نەئەومێشکەی وا لەناوی سەرا، بەڵکو دەرونی مرۆڤە، وەلەطیفەیێکە کەوا لەسینەی مرۆڤدا، چونکە مەبەست لە «**قەلب**» ناوەڕاست وقوڵایی شتە واتە ناوەند، یان کاکڵەی شت، وەئەوهەستانەش، ناوەندی هەستی ئینسانیو ویجدانیو عاطیفی مرۆڤن، نەکەمتر ونەزیاتر، بەڵام بۆرێبوارانی رێگەی تەصەووف زۆرباش رِوونە کەشوێنی ئەولەطیفەیە سینەی مرۆڤە، هەروا کە شوێنی لەطیفەی «**نەفس**» ناوچاوانی مرۆڤە، شوێنی نەفس لەمێشکەوە نزیکە وەشوێنی قەلب لەدڵی گوشتینەوە، هەروا کەلەطیفەی رۆح، وە سیرر، وەخەفی، وەئەخفایش، هەروان لەسینەدا، وەکارناسانی سلوکی تەریقەت، وەریازەتکێشانی تەصەووفی ئیسلامی زۆرباش هەست بەشوێنی یەکەیەکەی ئەولەطائفە ئەکەن، وەنوری هەرکامەی رەنگی خۆی هەیە وەبەونورەدا لێکیان جوێ ئەکەنەوە، بەیارمەتی خوا لەبەشی تەریقەتی نەقشبەندیدا باسیان ئەکەم. شیرەی باسەکەمان دێتەوەسەری ئەوەی، ئەوقەلبەی کەلەرێبازی تەصەووفدا باسی ئەکرێت، ئەوشوێنەیە لەدەرونا کەخاوەنی ئەوهەموە پێناسانەیە کەلەقورئانا باسی کراوەو برێکمان نوسی، وەرێبوار ئەکۆشێت بەهۆی ذیکرەوە وەبەیارمەتی مورشیدی پیٚگەیشتوو پیٚگەیێنەر، ئەودڵەی خاوێن کاتەوە لەهەموخەوشێك لەوخەوشە ناپەسەندانەی کەباس کران وبیرازێنێتەوە بەپێناسو نیازیپاك، بۆئەوەی شایستەیی ئەوە پەیدابکات، نوری خوا لەودڵەدا بێتە مێوانو سەقامگیربێت، وەذیکری خوابێتە خوردوخۆراکی مەعنەویی ئەمدڵە، ئەوەی خوا بۆی کرد تەوبەی کردو لەسەری بەردەوامما ،ذیکری کردو لەسەری بەردەواما، وا نوری خوا لەدڵیا ئەدرەوشێتەوە. ئەوەش کە لەمنیعمەتو دەس کەوتە گەورەیە بی بەش بو، وا

لەونورەیش بێبەشەو، دوّراندویەتی. هەروەکو خوائەفەرمێ، «وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ» «سورەی» «نور» «٤٠».

ولەکۆتایی دا دەستیشان ئەکەم بۆئەم ئایەتە کەئەفەرمێ. «يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ. وَيَجْعَلْ لَكُمْ نُوراً تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ» «حديد» «٢٨».

ووشەی نوریش واتای زۆری خۆی هەیە لەکاتی باسی ووشەی نوردا باسی کراوە.

## نَفْس :

«نەفس» ووشەیێکی عەرەبی زۆرواتایە، بۆ مرۆڤ خۆی هاتوە. وەبەواتای دەرونی ئادەمی زاد وە ویستی دەرون، وەرۆح، وەخوێن. وەبۆ «عەینی شت» هاتوە هەروەها ئەڵێن نەفس، ئەوشتەیە بانگ ئەکەی فلان کەس ئەڵێ، بەڵێ. ئەوەی ئەڵێ، بەڵی ئەوە نەفسە یان ئەوەی، ئەڵێ من، ئەو منە نەفسە وە زۆر واتای تر. لەقورئانی پیرۆزدا پتر لەدوصەدویەنجاجار ووشەی نەفس وەجۆرەکانی هاتوە. لەقورئانیشدا بەواتای مرۆڤ خۆی وەبە واتای دەرون وەرۆح وەویستی دەرونیش هاتوە.

ئەم ووشەیە لەگۆرەپانی تەصەووفدا زۆر بەکاربراوە، بەڵکو ئەوجەغزەی کە رێرەوی تەصەووفی بەسەرەوە راوەستاوە، وەپاژنە، یان گێجەنەی دەرگای تەصەوف، وە کاکڵەییلێك کەصوفی ئەگەری خاوێنی کاتەوەو بەخاوێنیی رای گرێت هەر ئەونەفسەیە.

بەکورتی گەورەترین خەباتی رێبواری تەصەووف بریتی یە لەوخەباتەی کەبۆ پاك کردنەوەو درەوشاندنەوەو راهێنانی نەفس ئەکرێتەکار بێگومان ئەم کارەی تەصەووف، هەروەکو کارەکانی تری، ئەمیش لەروانگەی قورئانەوە پێش چاوگیراوە، وە لەدەستوری قورئان سەرچاوەئەگرێت.

دەس کاری نەفس، وەپاك کردنەوەی نەفس پێی ئەوترێت «تەزکی یەی نەفس»، زەکات لەعەرەبی دا، بەپاك کردنەوە ئەڵێن زەکات دانی سەرمایەوسامان. واتە بەشی هەژاران لەو سامانە دەرکردن بۆ ئەوەی چونکە لەروانگەی ئاینەوە ئەو سەرمایە،

ئەگەرزەکاتی لیٚ نەدریٚت پاك نیە، بەسەربرینی حەیوانیش ئەڵێن زەکاتی حەیوان ئەویش هەربەمەعنای پاکییە، واتە مردارنەبوەتەوە . کەواتە تەزکییە ئەبێتە پاككردنەوەی نەفس ، لەهەمو پیٚناسیٚکی ناپەسەندو ناشیرین، خوایگەورە لەسورەی والشمس دا، پاش سویٚندخواردن بە شەمس، واتە هەتاو، وەمانگ وەرۆژ وەزەوی، پاشان سویٚند بە «نەفس» ئەخوات، وەئەفەرمیٚ «وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا»، واتە سویٚند بەنەفسی مرۆڤ وەبەوکەسەی کەنەفسی ریٚك خستوە وەکردویەتە خاوەنی ئەوپیٚناسانەی ئامادەبیٚت بۆوەرگرتنی هەموجۆرە فیٚرکردنو راهینانو وپەروەردە کردنیٚك پاش ئەم سویٚندە ئەفەرمیٚ ریٚگەی چاکەوخراپەی بەو نەفسە پیشانداوە، واتەلەقورئاندا هەموشتیٚکی بۆروون کردوەتەوە «وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ» «بلد» «١٠» نیشانەیە بۆئەو ریٚگەی چاکەوخراپە جائەفەرمیٚ «قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا» واتە ئەوەی ئەو نەفسەی پاك کردەوە وارزگاربوەو خۆش بەختە وەئەوەی کە کردویە بەژیٚری «فجور» واتەخراپەو کردەوەی ناشیرینەوە «قد خاب» نائومیٚدو بەدبەختەو تیٚشکاوە .

ئەم ئایەتە، بەروونیپیشان ئەدات، کەچۆن صوفی یەکان بە پەیرەوی ئەم ریٚ نماییەی خوای گەورە ئەکۆشن لەبەشی رزگاربوەکان بن واتە لەوانەبن کەنەفسی یان پاككردوەتەوە هەروەها هەر بە وشەی رزگار بون وەسەرکەوتن، وەسەبارەت بەنەفس لەئایەتی «١٦» «تغابن» دا ئەڵیٚ. «وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ» ئەوانەی خۆیان ئەپاریٚزن لەرژدی نەفس ئەوانە لەرزگار بوانن .

کەواتە «تەزکیەی نەفس» واتە خاویٚن کردنەوەی نەفس گەورەترین کاری ریٚبواری ریٚگەی تەصەووفە وەتاوەکو نەفس پاك نەبیٚتەوە ئەوریٚبوارە هەروا لەمەترسیی سەرنەکەوتنو تیٚشکانایە، وەتا نەفس خاویٚن نەبوەتەوە، پایەی «ویلایەت»، دەستی ریٚبوار ناکەویٚت، بەڵام پاش زاڵ بون بەسەری نەفساوە خاوین کردنەوەی لە پیٚناس و نیازی ناپەسەند، ئیتر ئەوکاتە نۆرەی رازاندنەوەی دەرونە بە پیٚناس و نیازی پەسەند وە خرانە سەرپشتی دەرگای خوش بەختیو پیٚش کەوتن لە ریٚبازی تەصەووفدا، بەڵام ئایا ئەم پاككردنەوە هەروا ئاسانە؟ وە ئایا چۆن مرۆڤ ئەتوانیٚ زاڵ بیٚت بەسەری نەفسا؟ وەئایادەسکەوتی چی یە؟

یەکەم قۆناغی دەس پیٚ کردنی کار، بە تەوبە دەست پیٚ ئەکات، پاش تەوبەکردن لەئەنجامدانی هەرچی شتیٚ کە خواپیٚی ناخوشە «نەهی لەمونکەر»

ئەوساکە بڕیاردانو بەردەوام بون لەسەرهەرچی خواپێی خۆشە «**ئەمربەمەعروف**» ، پاشان لەسەری خواپەرستی بەپێی دەستووری قورئانو شەریعەتی موحەممەدی، بەتایبەتی بەردەوامبوون لەسەری «**ذیکر**» بەهەموجۆرێکی، وەبەرگری‌کردن لەداخوازەکانی نەفس، وەکوحەزکردن بەدەسەڵات، بەسەرمایەو سامانی‌زۆر بەرابوردن بەشێوەیێکی زیادەڕەوی باوەکو ئەوشتەش حەڵاڵ بێ . بەکورتی ی ڕاهێنانو وەرزاندنی نەفس، تائەوکاتەی کەمورشید بەپێی‌ویستی ئەزانێت، یان‌مرۆڤ خۆی‌بزانێت، ئیتر بوەتە خاوەنی ئیمانی «**عین الیقین**» وەتازە هیچ‌شتی‌کاری تی‌ناکات، پاش‌ئەوەش «**افراط**» یان «**تەفریط**» هەرخراپە، واتە زۆرلەسنورتێپەربون یان زۆرکشانەدواوەو کۆتاهاتن .

ڕێبوارانی ڕێگەی تەصەووف چەن‌قۆناغێکیان بۆ ئەم‌خاوێن‌کردنەوەی نەفسە داناوە، وە لەهەر قۆناغێکا ئەم‌نەفسە ناوێکی هەیە کەئەویش هەرلەقورئانەوە وەرگیراوە .

لەکتێبی «**معجم مصطلحات الصوفیة**» دا ئەڵێت نەفس پێنج جۆری هەیە «**حەیوانی، ئەممارە، موڵهەمە، لەووامە، موطمەئینە**» ، پاشان‌ئەڵێ ئەڵێن نەفس «**ناطیقەیەوصالیحە وە حەکیمە**» ، پاشان ئەڵێ «**نەبەوی‌یەیشی**» هەیە .

لەکتێبی (**الفاظ الصوفیة ومعانیها**) دا باسی «**ئەممارە، لەووامە، موطمەئینە، راضی‌یە، مەرضی‌یە، کامیلە**» ئەکات .

بەلاّم «**شیخ محمد امین الکردي**» لەکتێبی «**تَنْوِیرُ القُلُوب**» دا حەوت‌پلە دائەنێ بۆنەفس «**الأمّارة، اللّوامه، المُطْمَئِنّة، المُلْهَمَة، الرّاضیة، المرضیّة، الكامِلة**».

بەکورتی ی، ئەم‌ناوانە ناوی‌خۆیان وابەخۆیانەوە؛ الامارە: بەونەفسەی مرۆڤ‌ئەڵێن کە هەستی‌حەیوانی‌و شەهوانی ئەو زاڵە بەسەری هەستی‌ئینسانیی ئەودا، وەبۆیەپێی ئەوترێ ئەممارە، چونکەفەرمان بەخراپەکردن ئەدا بەسەری خاوەنیا، واتە هەڵی ئەنێت‌و پاڵی‌پێوەئەنێت بۆخراپەکردن، مەقامی ئەم‌نەفسە لەوئایەتەدا دەرئەکەوێت، کەحەزرەتی‌یوسف ئەفەرمێ، «**وما أُبَرِّئُ نَفْسِي، إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوء**» (**یوسف**) (**٥٣**) جا برێکیان ئەڵێن هێشتائەم‌قۆناغە باشترە لەقۆناغی نەفسی حەیوانیی، ئەویش هی‌ئەوکەسانەیە کەلەژیان، هەرخواردن‌و نوستن‌و رابواردن زیاتر، هیچی‌ترنازانن، وەهیچ‌بەلایانەوە گرنك‌نیە رابواردن‌و سەرمایە چۆن دەست‌بدات، حەرامە حەلاّلە، کوشتنەبرینە، فەرقی‌نیە، ئەو لەوەڕو رابواردنی

بەلاوە گرنگە، ئیتر هەرجۆریّ بۆی ریّك کەویّت. جائەگەر هەرلەبناغەدا ئەوکەسە خاوەنی ئەمجۆرە نەفسە نەبو، یان، دەستی لەوجۆرە ژیانەهەلّگرتبو نەفسەکەی «ئەمارە بالسوئە» هیشتا هەرحەز لەشتی ناشیرین ئەکات، جائەگەر گەیشتە ئەوەی لەمحالّە. روەو چاكبون رۆیشت، وەتەوبەی کرد، وەریّگەی خواپەرستی و ئینسانییەتی گرتەبەر، ئەوکاتە نەفسەکەی ئەبیّتە «لەووامە» واتە لومەکەر. لۆمەی خاوەنەکەی ئەکات، ئەگەرکاریّکی ناشیرینی کرد، یان ویستی بیکات، «لا اُقْسِمُ بِيَوْمِ القِيامَةِ وَلا اُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوامه». واتە قەسەم بەرۆژی قیامەت، وەقەسەم بەونەفسەی کەلۆمەی خاوەنەکەی ئەکات، لەسەری کاری ناپەسەند، کەواتە ئەمەقۆناغیّکی گەورەو پەسەندە بۆنەفسی مرۆڤ.

ملهمەیش، هەر نیشانەییّکە لەوئایەتەی کەزوتر باسمان کرد «وَنَفْسٍ وَما سَوّاها فَاَلْهَمَها فجورَها وَتَقْواها» لیّرەدا، نەفس، والەحالّیّکا، چاکەوخراپە لیّك ئەداتەوە، ئەزانیّ «فجور» واتەکاری ناپەسەند کامە، وە «تقوا» واتە پارّیزکاریی کامەتە.

پاشان نەفسی، «مطمئنە، راضیە، وە مرضیە» دیّنەپیّشەوە کەلەسورەی «الفجر» دا، ئەفەرمیّ «يااَيَّتُها النَّفْسُ المُطْمَئِنَّةُ ارجعي اِلى رَبِّكِ راضِيةً مَرْضِيةً». ئەمەش لەحالّیّکایە هەم ئەو لەخوا راضی یەو هەمخوایش لەوراضی یە، واتە ئەونەفسەی خوای لیّرازی یەو ئەویش دلّخۆش و رازی یە لەوپاداشەی خوا ئەیداتیّ «رضى الله عنهم ورضوا عنه». پاشان باسی نەفسی کامیلە دیّتەپیّشەوە. کە بەلای ئەمسەرچاوانەوە ئەمپایە پایەی نەفسی پیّغەمبەرانەو، وەلی یە کامیلەکان، نەفس لەروانگەی ریّبوارانی ریّرەوی تەصەووفەوە بریتی یە، لە لەطیفەییّك لە لەطیفەکانی عالەمی خەلق، کەلەگەلّی (چوارعونصور) دا ئەبیّتەپیّنجەمین واتە، رطوبەت یان ئاو، وەخاك، وە هەوا وەگەرما، واتە (حەرارە) یان ئاگر، بەرانبەر بەقەلب، وەروح، وەسیرر وە خەفی، وەئەخفا، کە هی عالەمی ئەمرن، جاریّکی تریش باسی ئەم لەتیفانەمان کرد، بەلاّم بەیارمەتی خوا لەکاتی باسی «طەریقەی نەقشبەندی» دا باشتر باسی ئەکەم.

جائەبیّ ئەو لەطیفەی نەفسەیش بەهۆی ذیکرەوە خاویّن بکریّتەوە، جا لە «اصطلاحی» نەقشبەندی یەکان بەمنەفسە ئەوتریّ «نەفسی ناطیقە».

«ئیمام شرف الدين محمد بن سعيد البوصيرى» کە لە ٦٩٦ ك، لەدنیا دەرچوە، لەقەصیدەی (بوردەدا) شیعریّکی جوانی هەیە سەبارەت بەراهیّنانی نەفس، کەئەلّیّ:

«والنفسُ كالطفلِ اِن تُهْمِله شَبّ على حُبِّ الرّضاعِ وَانْ تَفْطِمْهُ يَنفَطِمِ» ئەڵێ، نەفسیش هەروەکو منداڵ‌وایە، منداڵ ئەگەربێت‌و لەشیری نەبڕیتەوە، گەورەئەبێت کەچی هەر دەس لەشیرخواردن هەڵ‌ناگرێ، بەڵام ئەگەر خۆت بیبڕیتەوە، هەرماوەیێکی زەحمەتە، ئیتر رادێت‌ودەست لەشیرخواردن هەڵ‌ئەگرێت.

حەزرەتی «**شیخ عبد القادری گەیلانی**» لەکتێبی غونیەدا ئەفەرمێ، ئافەتی نەفس ئەوەتە حەزئەکات لەوەی خەڵك پیاپاهەڵ‌دەن‌وتەعریفی بکەن، وەناوی بەچاکە بەرن، وەستایشی‌بکەن، ئەفەرمێ ئەوکەسە ئەبێتە «**حممال**» بارکێش، باربەری عیبادەت، بۆچی؟ چونکە وای لی‌دێت بۆ ئەوستایش‌کردن‌و لێرازی‌بونەی خەڵق خوا ئەپەرستێ، خۆیشی بەخۆی نازانێت، بەخۆی نازانێت، تا ریا بەجارێکا ئەیکاتە ژێرەوە.

مرۆڤ کاتێ ئەم نەخۆشی‌یەی خۆی بۆ دەرئەکەوێت، چاوپۆشی‌بکات لەو رەزامەندی خەڵقەو لەوستایش‌کاری‌یە، ئەگەر وای کرد سەیرئەکات، وردەوردە نەفسی رووئەکاتە، تەمەڵی، وەمەیلی‌خواپەرستییەکەی کەم‌ئەبێتەوە. پاش ئەم تاقی‌کردنەوەیە، مرۆڤ نەفسی‌خۆی ئەناسێ، وەئەزانێ چ بەلاێیکە، وە چ درۆزن‌و فیڵ‌بازو دەس‌برێکە.

بەڵێ هەروەکو خوای‌گەورەئەفەرمێ «**وان لیس للانسان الا ماسعی وان سعیه سوف یری**».

بەبێ تێ‌کۆشان هیچ‌بەرهەمێك دەستی‌مرۆڤ ناکەوێت ئەگەریش تێکۆشا بەرهەمی وەرئەگرێت.

هەروەها ئەفەرمێ «**والذین جَاهَدوا فینا لَنَهدِیَنَّهُمْ سُبلَنا**» «**عنکبوت**» یان «**وجَاهِدوا بِاَموالِکُمْ وَاَنْفُسِکُمْ فِي سَبیلِ الله**»، شێخ زکریا أنصاری لەحاشیەی ریسالەی قوشەیری‌یەدا ئەفەرمێ رزگاربی نەفس والەوەدا جڵەوی‌بگریت لەئارەزوەکانی، وجڵەوی ببەی بۆلای ئەوشتانەی کەخوا لەوی داواکردوە، بێگومان خوا ئیحتیاجی بەم‌تێکۆشانی‌ئێمە نیە بەڵکو ئێمە بۆقانجازی هەردوجیهانی خومانە ئەبێ‌تێکۆشین، هەروا کەئەفەرمێ «**وَمَنْ جاهَدَ فَاِنَّمَا یُجاهِدُ لِنَفْسِه**». شیخ عبد القادری گەیلانی لەکتێبی (**فتوح الغیب**) دا ئەفەرمێ «**نەفسی ئەمارە**» دووحاڵەتی‌هەیە، یان وا لەخۆشی‌دا یان والەناخۆشیدا، ئەگەر کەوتە گرفتاری‌و دەردی‌سەر، وادنیای بەلاوە ئەبێتە چەرمەچۆلەکەو سەری‌دنیای لی‌دێتەوە یەك‌و دەس ئەکاتە ناشوکری‌و کوفرکردن.

ئەگەریش دنیابەئارەزوی‌ئەوبو، دەس‌ئەکاتە رابواردن‌و لەوەرو داوێن‌پیسی، وەئەگەر هەزاری‌بوو داوای‌دوهەزار ئەکات دوی‌بو چواری‌ئەویٚ، بەکورتی بەهیچ‌تێرناخوات. هەروەکو خوای‌گەورەئەفەرمیٚ «كَلَّا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى» (علق) (٦) (٧)، واتە مرۆڤ کە لەنیازو هەژاری‌کەوت، وەدەسەلاتی‌پەیداکرد ئیترلەخۆی دەرئەچیٚت، وەخوای‌خۆی بەهەق‌ناناسیٚ، وەهەتادیٚت پیٚ‌داتەکیٚشیٚت.

ئەوەی‌خۆی ناسی خوای‌خۆیشی ئەناسیٚت «مَنْ عَرَفَ نَفْسَهُ فَقَدْ عَرَفَ رَبَّهُ» ئەوەی خۆی‌ناسی خوایش ئەناسیٚت، هەروا کەحەزرەتی یوسف نەفسی‌خۆی ناسی وەفەرموی «وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ»، کەنەفسیشی‌ناسی ئیترجلەوی بۆشل‌ناکات. بەکورتی خەبات‌و تیٚکۆشان بۆپاك‌کردنەوەی نەفس یەکیٚکە لەپایە بناغەییەکانی ریٚرەوی تەصەووف وە بەبیٚ ئەوخەباتەو بیٚ ئەوپاك‌کردنەوەیٚ، هیچی بۆناکریٚت. منیش مەبەستم ناساندنی نەفس، وەپیٚویست‌بونی خاویٚن‌کردنەوەی نەفسە، نەك بەوەیٚ، بیٚ‌سەلیٚنم کەئەم‌کارە چاکەو، ئیٚوە ئەبیٚ‌بیکەن، بیٚگومان ئەوەی ئەم ریٚبازەی دایەبەر، ئامادەیش ئەبیٚت بۆئەم‌خەباتە، گەورەپیاوانی ریٚرەوی تەصەووف، وەکو جونەید، شیخ‌معروف، وە سری‌سقطی، وەسهل‌بن عبد الله، وغەززالی، وصەدان لەگەورەپیاوانی ئەم‌ریٚبازە، هەزاران فەرمودەی بەرزیان هەیە، بۆپال‌پیٚوەنان‌و دل‌گەرم‌کردنی موریدی ئەم‌ریٚبازە سەبارەت بەخاویٚن کردنەوەی نەفس، کەباس‌کردنیان لەچوارچیٚوەی ئامانجەکەمان بەدەرە.

---

## ذکر:

---

ذیکر، ووشەییٚکی‌عەرەبی‌یە، بۆ ناوبردن‌و یادکردن بەکارئەبریٚت، وە واتای تریش‌هەیە کەپیٚوەندی بەباسەکەوە نیە، بەلاٚم لەروانگەی ئیسلامەوە بۆستایش‌کردنی‌خوا وە یادکردن‌و ناوبردنی بەکارئەبریٚت، وەکو ئەوەی، بلیٚین «سُبْحان الله، الحمد لله لا اله الا الله»، یان‌صەلەوات خویٚندن‌و دوعاخویٚندنیش هەرئەکریٚ بخریٚنە چوارچیٚوەی ذیکرەوە چونکە ئەویش هەر ریٚزگرتن‌و

ستایش‌کردن‌و پیێ‌هاتنه، به‌گه‌وره‌یی خوا، هه‌روه‌ها هه‌ر ئه‌وه‌دونۆ ناوه‌کانی خودا، له‌قورئانی پیرۆزدا، ،ووشه‌ی ذیکر، جگه‌له‌مانه‌ش بۆنویژکردنیش واته‌بۆناوی نویژ وه هه‌روه‌ها بۆناوی قورئان به‌کاربراوه، له‌وشوێنه‌دا که‌باسی ئه‌وه‌م‌کردوه، ذیکر که‌نه‌ریتی صوفی یه‌کانه، ریێك ئه‌که‌وێت له‌گه‌ڵی فه‌رمانی قورئاندا، په‌نجه‌م راکێشاوه بۆ زۆرێك له‌وئایه‌تانه.

بۆنمونه، «اِنّا نَحْنُ نَزَّلنا الذِّكرَ واِنّا لَهُ لَحافِظون» سوره‌ی الحجر «٩»، روونه که‌مه‌به‌ست له‌ووشه‌ی ذیکر لێره‌دا قورئانی پیرۆزه.

لێره‌شا که‌ئه‌ڵێت، (یاایُّها الذین آمَنوا، اِذا نودِیَ لِلصَّلاةِ مِنْ یومِ الجُمعةِ فاسْعَوا اِلی ذِكرِ اللهِ وَذَروا البَیْعْ) الجمعة (٩) دیاره لێره‌دا مه‌به‌ست له‌ووشه‌ی ذیکر نوێژی جومعه‌یه. مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه له‌قورئانا ووشه‌ی ذیکر جگه‌ له‌واتای ناوبردن‌و یادکردن، به‌واتای‌تریش هاتوه، به‌ڵام به‌واتای ناوبردن‌و یادکردن، ده‌یان ئایه‌ت هاتوه، وه‌کو، «وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ» «فاذْكُروا الله» یان «فاذْكُروا اللهَ قِیاماً وَقُعُودا» «وَاذْكُروا اللهَ كَثیراً»، «اذْكروا اللهَ ذِكْراً كَثیرا»، وَلَذِكْرُ اللهِ اَكْبَرْ «الا بِذِكْرِ الله تَطْمَئِنُّ القُلُوب»، وه ده‌یان ئایه‌تی‌تر.

لێره‌دا مه‌به‌ستم هه‌رئه‌وه‌نه بڵێم، له‌قورئان‌دا، ذیکر، به‌واتای ناوبردن‌و‌یادکردن هاتوه، ئه‌مه له‌روانگه‌ی واتای ووشه‌وه.

له‌روانگه‌ی ئه‌وه‌یشه‌وه، ئه‌م‌یادکردن‌و ناوبردنه ده‌ستورێکی خوداوه‌ندی‌یه، وه‌فه‌رمانێکه‌و ئه‌بێ ئه‌نجام‌درێت، چ له چوارچێوه‌ی نوێژا، چ له‌چوارچێوه‌ی ناوبردن‌و یادکردنا، خۆ هه‌موی ئه‌وئایه‌تانه خۆیان فه‌رمانن وه‌کو «وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثیراً، واذْكُرْ رَبَّكَ فی نَفْسِكَ، فَاذْكُرونی اَذْكُرْكُمْ، یاایُّها الَّذینَ آمَنوا اذْكُروا اللهَ كَثیراً، یاأَیُّها الَّذین آمنوا لاتُلْهِكُمْ أَمْوالُكُمْ وَلا اَوْلادُكُم عَنْ ذِكْرِ الله، وَاذْكُرُوهُ كَما هَداكُمْ» وه‌ده‌یان ده‌ستوری‌تر، بۆمانی ده‌رئه‌خه‌ن که ئه‌م‌یادکردن‌و ناوبردنه واجبێکه له‌سه‌ری هه‌مو موسوڵمانێ، وه موسوڵمانی ته‌واو به‌که‌سێ ئه‌ڵێن، هیچ کارو کاسبی‌و سه‌رجه‌نجالێکی ماڵ‌و خێزان، نه‌توانێ رێگه‌ی ناوی‌خوابردن‌و یادی‌خواکردنی لێ‌بگرێت، «رِجالٌ لاتُلْهیهِمْ تِجارةٌ وَلابَیْعٌ عَنْ ذِكْرِ الله».

یان‌وه‌کو له‌پێشاوتم «لاتُلْهِكُمْ اَمْوالُكُمْ وَلا اولادُكُمْ عَنْ ذِكر الله» ئه‌مانه خۆی ئه‌وه ئه‌گه‌یێنێ نابێ هیچ‌شتێ بکه‌ینه‌بیانو، یان نابێ ئه‌وه بکه‌ین به‌بیانو که ده‌س‌نوێژمان

نیه ، یان ئەبێ لە مزگەوتابین ، یان دەورمان چۆڵبێت جائەتوانین ذیکربکەین بەهەرحاڵ ، ئەوەی بیەوێ ناوی خوابیات ، لەهەموحاڵێکا ئەتوانێ ناوی‌بیات ، «فَاذْكُرُوا اللّهَ قِياماً وَقُعُوداً وَعلى جُنوبكُمْ» النّساء (١٠٣) ئەمەخۆی فەرمانە ، یان «الَّذِينَ يَذْكرونَ الله قياماً وَقُعُوداً وَعلى جُنُوبِهِمْ» آل عمران (١٩١) ئەم‌فەرمانەش ئەوەنیە بلێین ڕۆژی جارێ یادی‌بکەین ، یان هەرنوێژکردنەکە ، ئیتربەسە ، چونکە ئەوە لەکوێ ، ئەوەلەکوێ فەرمان‌بدات بەهەڵسان‌ودانیشتن‌و پاڵ کەوتن ، بەدڵ‌وبەزمان ، بەشەووبەڕۆژ ، ناوی‌بەرین ویادی‌بکەین ، وە ووشەی «كثيراً» ، زۆرجار دوبارە کراوەتەوە ، «اُذْكُرُوا اللّهَ ذِكْراً كثيراً» (٣٣) (٤١) ، «واذْكُرْ رَبَّكَ كثيراً» (٣) (٤١) ئەمانە هەموی ئەوە ئەگەیێنن ئەم‌ذیکرە ئەبێ‌زۆربێت ، هەروەها ئەفەرمێ ، «وَاذْكُرْ رَبَّكَ فى نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الجَهْرِ مِنَ القَوْلِ ، بالغُدُوِّ والآصال وَلاتَكُنْ مِنَ الغافلين» اعراف (٢٠٥) لێرەشا ئەگەیێنێ هەروەها کەذیکر بەزمان پێویستە بەدڵیش پێویستە «فى نَفْسِكَ» وەئەویش هەرحسیبە ، وەئاخری ئایەتەکەیش «وَلاتَكُنْ مِنَ الغافلين» فەرمان‌بەوەئەدا ، نابێ دەس لەذیکر هەڵگرین ، هەروەها ئەفەرمێ ، «وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمٰنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطاناً فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ» (زخرف) (٣٦) . ئەوەی دەس‌هەڵگرێ لەذیکری‌ڕەحمان ، شەیتانێکی بۆتایین‌ئەکەین ، یان ئەیکەینە هاوملی شەیتانێك ، کەواتە ذیکرکردن ، لەڕوانگەی‌دینەوە ، سپاردەیێکی هەمو موسوڵمانێکە وەلەسەری هەمومانە بەئاشکراو نهێنی شەوو ڕۆژ ، ناوی‌خوا ببەین‌و یادی بکەین ، وەئەگەریش نەیکەین خواپێی‌ناخۆشەو هاوملی شەیتانمان‌ئەکات یان‌ئەفەرمێ «فَوَيْلٌ لِلْقاسِيَةِ قلوبُهُمْ مِنْ ذِكْرِ اللّه» هاواربۆئەوانەی دڵیان‌تاریکە ، چونکە ذیکری‌خوا ناکەن «زمر» «٢٢» ، لەم‌ڕوانگەوەیە سوفیی‌یەکان ، مادام هەدەفیان ئەوەتە بکۆشن بۆئەوەی ، موبەمو ، فەرمانەکانی خوای‌گەورە ئەنجام‌دەن ، ڕوودێرن بوذیکر ، ئایا ئەم‌ذیکرە نوێژکردن ، یان قورئان‌خویندن ، یان ناوی‌خوابردن‌و ، صەڵەوات خوێندن‌و دوعاخوێندن بێت «اُدْعوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعاً وَخُفْيَةً» (أعْراف) (٥٥) .

دێتەوەسەری چۆنیەتی ئەم‌ذیکرە لەڕوانگەی تەصەووفەوە .

هەروەکو بۆمان‌دەرکەوت ، ذیکر دوو جۆرە ، بەزمان ، یان بەدڵ ، هەروەکووتمان «فى نَفْسِكَ» ، برێ لەتەریقەتەکان لاین‌گیری ذیکری زمان ، وەبرێکیان لاین‌گری ذیکری دەرون ، وەبرێ‌ئەڵێن هەردوکی باشە واتە بەرلەوا

بەزمان ، تاوردە وردە ئەوکەسە رادێت ، لەپاشان بەدڵ . لەکتێبی «**حقائق عن التصوف**»دا ، لەزمانی «**علامە المناوی**» یەوە ، ئەڵێت ، ذیکر سێ بەشە ذیکری «**عەوام**» ، واتە نەخوێنەوار یان خەڵك بەتێکڕا بەزمانە ، ذیکری هەڵبژێرراوان ، یان گەورەپیاوان بەدڵە ، ذیکری هەڵبژاردەی ناوی ئەوانیش ئەوەتە ، لەخۆشیی «**موشاهەدە**» واتە دیتنی ذیکربۆکراو ، واتە «خوادا «**مذکور**» ئیترناوبردنیشیان لەبیرئەچێتەوە ، لەم کتێبەدا نزیکەی «**صەدلاپەرە**» ، هەر لەسەری ذیکر چوە ، ئەوەی بیەوێ ئەتوانێ سەیری بکات هەروەها کتێبی ، «**الفتوحات الربانیه علی الاذکار النوویه**» ج (١) ، یان ریسالەی قوشەیری ، وەهەموکتێبەکانی تری تەصەووف ، یان «**المرشد الی ایات القران الکریم وکلماته**» ، بەشی «**ذیکر**» یان کتێبی «**المواهب السرمدیة فی مناقب النقشبندیه**» «**محمد امین الکردی**» ، وەصەدان کتێبی تر .

«**ئیمامی نەوەوی**» باوەڕی لەسەرئەوەتە ذیکر هەمو جۆرێکی هەرباشە ، چ بەزمان چ بەدڵ چ بەهەردوکیان ، بەڵام ئەڵێ ، ئەگەر هاتو هاتەسەری ئەوەی هەربەیەکێکیان ذیکربکات ذیکری دڵ باشترە . «**الفتوحات الربانیة علی الاذکار النوویه**» ج (١) «**وَلاتُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنا واتَّبَعَ هَواه**» (٢٨) (**الکهف**) زۆربەباشی پیشاندەری ذیکری قەلبە هەروەها گرنگیی ئەوذیکرە .

بەهەرحاڵ مەبەست ئەوەتە ، ناوی خوابردن وەخواپەرستی ، وەلەخواپارانەوە ، هەرجۆرێ بێت باشە ، وەبەشوێن و بەجێگاو بەڕاهێنانی مورشید ، وە بەوەزعی ئەوکەسە کەوتوە ، بۆنمونە ، ئەگەر ئەودەنگی بەرزە ریائی تیابێت باش نیە ، ئەگەر هۆی نارەحەتیی خەڵکی نەخۆش و نوستو ونوێژکەری تیابێت چاك نیە ئەگەریش دەستەیێك ، بە ئەدەب ، وە بەبێ ئەوشتانەی وترا سەرگەرمی ذیکری خوابن چی هەیە لەوەچاتر ، دەنگی بەرزیش تادەنگی بەرز فەرق هەیە ، ئەکرێ دەنگیش بەرزبێت بەڵام وانەبێ هۆی نارەحەتی خۆی و خەڵك بێت ، بەکورتی مرۆڤی موسڵمانی خاوەن ئاوەز ، خۆی ئەتوانی ، بزانێت کوێ بۆئەوە ئەشێ بەدەنگی بەرز ناوی خوا ببات ، وەکوێ بۆئەوە ناشێت ، کامی لەسنوری شەرع دەرئەچێ ، وەکامی وا لەچوارچێوەی شەرعا ، جا برێ لەرێبوارانی تەسەووف لەرێی ذیکری نهێنی یەوە سلوك ئەکەن ، برێکیان لەرێی ذیکری ئاشکراوە برێکیش بەهەردوکی .

وتمان هەمو ناوی خوابردنێك ذیکرە ، وەکو «سبحان الله ، الحمد لله لا اله الا الله ، الله اکبر» وەهەروەها ذیکری «منفرد» ، واتە تەنها ناوی‌خوابردن کەبریتی‌بێت لەذیکری «الله» یان‌ذیکری تەوحید «لا اله الا الله» ئێمەوتمان ڕێبواری تەسەووف تی‌ئەکۆشێت کەدڵی لەخەوش پاك‌کاتەوە ، بۆئەوەی ئەودڵەشیاوی ئەوەبێت نوری‌خوای تیابدرەوشێتەوە ، وەهەروەکو لە حەدیثا هەیە ببێتە «عرش الرحمن» واتە مەنزڵی خوا جا ئەو دڵ‌پاك‌کردنەش ، خۆبەگاڵتە نابێت ، گاڵتەنیە مرۆڤ بتوانێ هەرچی‌پێناسی خراپە وەکو حەسەد ، وەکو خۆبەزل‌زانین ، وەکو مشت‌قوچاویی ، وەکو درۆزنیی ، وەکو زۆربڵێ‌یی ، وەئەوشتانەی زوتر باسمان‌کردن ، لەدڵی خۆیا ، لایان‌بات ، وەدڵی پڕکات لەپێناسی پەسەند ، خۆهەروا ناکرێت ، ... ، خەبات‌و تی‌کۆشانی‌ئەوێ ، زۆرانگرتنی ئەوێت لەگەڵی (نەفسی‌ئەممارە)دا ، جا بەوجۆرەی لەهەزارو چوارصەد ساڵەوە ، تاقی‌کراوەتەوە ، باشترین دەرمان وە بەکارترین ، ژەنگ‌لابەر ، وە ژەنگ‌سوتێنی‌دڵ ، ذیکری‌خوایە ، دڵ بەذیکری خوا ئارام ئەگرێت‌و دڵ‌نیائەبێت ، «أَلا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ القُلوب» (رعد) (٢٨) ، ذیکر ، ئەبێتە هۆی ئەوەی خوای‌گەورەیش یادی ئەوکەسە بکات «فاذکرونی اذکرکم» (البقرة) (١٥٢) دڵ ژەنگی هەیە ، بی‌گومان ئەوژەنگە مەعنەوی‌یە ، هەروەکو لەقورئانا ئەفەرمێ «كَلاَّ بَلْ رانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ ماكانوا يَكْسِبونَ» (مطففين) (١٤) واتە کردەوە ناپەسەندەکانیان بوەتە ژەنگ بەسەری دڵیانەوە ، یان «وَنَزَعْنا مافي صُدورِهِمْ مِنْ غِلّ» بیگومان ئەم «غیلە» هەیە وە مەعنەویشەو ئێمەهەستی‌ناکەین ، غیل ، واتە کینەو خەیاڵی‌ناپەسەند ، کەواتە ڕێبواری ڕیگەی تەسەووف تی‌ئەکۆشێت بەهۆی بەردەوام‌بونەوە لەسەری‌ذیکر دڵی‌خۆی لەهەموژەنگی پاك‌کاتەوە ، ... وەهەروەکو خۆیان باس‌ئەکەن وە صەدان‌ساڵە هەزاران هەزار ، لەم‌نیعمەتی دڵ‌پاکی‌یە بەرخوردار بوون ، ئەڵێن ، دڵ وەکو ئاوێنەی دوکەڵ‌گرتو وایە ، بەهۆی ذیکرو ڕیازەتەوە صەیقەل ئەدرێ ، وەپاك ئەبێتەوە ، ئەوساکە نوری‌خوای تیا ئەدرەوشێتەوە ، وەئەسراری مەعنەوی تیادەرئەکەوێ وەهەرکەسەو بەگوێرەی ئیستیعدادو ئامادەیی خۆی ، دەس‌کەوتو ، بەرهەمو بەهرەی پی‌ئەگات .

هەرچەن ئەم‌ذیکرە بۆئەوانەی مورشیدیان هەیە بەپی‌ی دەستوری مورشید ئەنجام ئەدرێت ، بەڵام ذیکری هەمیشەیی‌و هەمولاگر ، بریتی‌یە لەذیکری (الله) وە ذیکری «لا اله الا الله» پیغەمبەر ئەفەرمێ «أَفْضَل ماقُلْتُ أَنا والنَّبيين مِن قَبْلُ كَلِمة لا اله الا

الله» ، واته باشترین ووشه‌یێك من وپێغه‌مبه‌رانی تر وتومانه ووشه‌ی «**لا اله الا الله**» یه ، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شا بگره مورشیدێك له‌كاتێكی تایبه‌تا ، ذیكری لاحول ولا قوة الا بالله به‌مورید پیشان بدات ، یان خوێندنی سوره‌تێكی تایبه‌ت له‌قورئاندا. زوتر باسی قه‌بض وبه‌سطمان كرد ، زۆرجار له‌وحاڵانه‌دا مورشید به‌پێی «**ته‌شخیص**» خۆی ذیكری ئه‌و رێبواره ئه‌گۆرێت .

هه‌رچه‌ن وتمان ذیكر به‌هه‌موجۆرێ دروسته ، له‌گه‌ڵی ئه‌وه‌شا برێ مه‌رج هه‌یه بۆ ذیكر كردن ، كه كارناسانی ته‌صه‌ووف دایان ناوه ، بۆئه‌وه‌ی رێبوار زوتر به به‌هره بگات ، به‌رله‌هه‌موشتێ پاكو ته‌میزی‌و ده‌س‌نوێژ، پاشان له‌جێگه‌یێكی كه‌نار ، وه به‌وجۆره‌ی هه‌ستی ریایی لێ‌نه‌كرێت ، سێ‌هه‌م «**حوزوری‌قه‌لب**» واته له‌دڵه‌وه خۆی ئاماده‌كات بۆ ئه‌وه‌ی كه‌وا له‌حوزوری خوادایه ، وه‌ئه‌بێ یاسای ئه‌ده‌ب به‌كار ببرێت ، وه چاوه‌روانی كه‌ره‌می خوابێت ، چونكه غافڵبون زۆر كارئه‌كاته سه‌ری كه‌م‌به‌هره‌یی .

وه‌له‌دڵه‌وه بڵێت خوایا من مه‌به‌ستم ئه‌وه‌ته تۆم لێ‌رازی‌بیت ، وه‌له‌تۆوه نزیك‌بم ، به‌لاّم مه‌رجی پێویست بۆهه‌ردولا ، وه‌بۆ مورشیددارو بێ‌مورشید ، ته‌وبه‌كردنه ، چونكه مرۆڤ تابه‌ڵێن‌نه‌دا ئیترخراپه‌نه‌كات چاكه‌ی بۆسه‌ر ناگرێت به‌لاّم بۆذیكری ده‌رونی شتی‌تری پێ‌زیادئه‌بێت ، به‌رله‌هه‌موشتێ ، هه‌تا ئه‌وشوێنه چۆڵ‌و چۆڵتربێت باشتره ، ته‌نانه‌ت بیابانێك ، یان وه‌كو مه‌شهوره ، «**خه‌لوه**» یێك بێت ، ده‌نگی خه‌ڵك نه‌گاته گوێی ، وه ئه‌مه‌ش بۆ «**ته‌ركیزه**» ، له‌كاتی باسی «**ته‌ریقه‌ی‌نه‌قشبه‌ندی**» دا باشتر ئه‌م‌مه‌به‌سته شی‌ئه‌كه‌مه‌وه ، جا له‌سه‌ره‌تادا به ذیكری «**الله**» ، واته‌ذیكری ذات ، ده‌ست‌پێ‌ئه‌كرێت ئه‌ویش هه‌ر به‌پێی باوه‌ری مورشیده ، ئه‌گه‌ریش بێ‌مورشیدبو وا خۆیو ئاره‌زوی خۆی ، ده‌س ئه‌كاته ذیكركردن ، واته ذیكری «**قه‌لب**» .

مه‌به‌ستێك هه‌یه كاتی‌هاتوه روونی كه‌مه‌وه ، ئه‌ویش چه‌سپاندنی زمانه به‌ئاسمانه‌ی ده‌مه‌وه ، له‌كاتی ئه‌م ذیكره‌دا ئه‌مه مه‌رجێكی زۆرگرنگه ، بگره زۆركه‌س بڵێ ئه‌مه چی‌یه‌و بۆچی‌باشه؟ من‌خۆم به‌سه‌رماهاتوه ، وه ئه‌وه‌ڵ‌جاربو ته‌مه‌نم چوارده ساڵ‌بو ، شیخی‌باوكم ده‌ره‌جه‌ی‌عالی‌بێت ، ته‌ریقه‌تی ته‌ڵقین‌كردم ، فه‌رموی ذیكری (**الله**) بكه له‌دڵه‌وه ، وه له‌و كاته‌دا زمانت بچه‌سپێنه به‌ئاسمانه‌ی ده‌متا ، خێراوتم به‌ڵێ ، بێ‌ئه‌وه‌ی بپرسم بۆچی ، چونكه هه‌م رومنه‌بو هه‌م عه‌قڵم پێی نه‌ئه‌شكا ،

ئیستەئەزانم مەبەست لەمکارە بەستنەوەی زمانە، چونکە زمان عادەتی کردوە بەحەرەکەت لەکاتی قسەکردنا، جائەگەر نەیبەستیتەوە تەکان ئەخوات، تەکانی خوارد پێ ئەوەی بەخۆت بزانیت ذیکرەکە لەدڵەوە ئەگەرێتەوە بۆزمان، وە ڕێسەکەت ئەبێتەوە بەخوری، واتە هەرچی دڵت رامکردوەو راتهانیوە بەوەی وردە وردە رابێت لەسەری ذیکر، خێرا ئەچێتەوە سەری خدەکەی لەوەوپێشی، وەهیچت بەهیچ نابێ.

کەواتە ئەم زمان بەئاسانەی دەمەوە چەسپاندنەش هەربۆ «تەرکیزە»، هەرچەن باش شەتەکی دەیت، زوتر دڵت بۆرادێت، وە خوایاربێت، وەئەگەر مورشیدی باش هەبێت، پاش ماوەیێکی کەم، دڵ دەس ئەکاتە ذیکرکردن، وە «لەطیفە»ی دڵ لەژەنگ پاك ئەبێتەوە، وتم لەپاشان باسی «لەطائف» ئەکەم، لێرەدا، «إصطلاحیك» هەیە، ئەویش صوفی یەکان بەکاری ئەبەن، کەبریتی یە، لە عالەمی خەلق، وەعالەمی ئەمر، «ألا لَهُ الخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبارَكَ اللهُ رَبُّ العالَمین» (٥٤)(أعراف)، جا بەلای ڕێبوارانی تەصەووفەوە، عالەمی خەلق، ئەمجیهانی مادە، وەمەوجوداتەیە، عالەمی ئەمریش، (ممکنات یان معنویاته) کە بە ئەمری خوا دروس بوە، بەئەمری «کن». ئەولەطائفەی کەوتمان. هیچ کام مەحسوسات نین، وەکو قەلب، رۆح، سیرر، خەفی، ئەخفا، ئەمانە، یەك لەشوێنی یەك بەم ذیکری الله، پاك ئەکرێنەوە، جا پاشان نۆرەی پاككردنەوەی عالەمی مەحسوساتی مرۆڤ دێت، کەبریتی یە لەنەفسی ئەوکەسە (نەفسی ناطیقە)، کە لەبەشی نەفس دا باسی ئەکەم، وە (عەناصیری ئەربەعە)، واتە چوارعونصور، یان چوارماددە، واتە «ئاوو هەواو وشکی و حەرارەت»، ئەویش بەجیا باس ئەکەم، جائەگەر ذیکر لەقەلبەوە دەستی پێ کرا ئەڵێن، لەعالەمی ئەمرەوە دەستی پێ کردوە ئەگەریش لەزمانەوە دەستی پێ کرا، ئەڵێن لەعالەمی خەلقەوە دەستی کردوە بەذیکر، جائەوەی لەعالەمی خەلقەوە، واتەلەذیکری زمانەوە، دەستی پێ کرد، ئاخرین قۆناغی ئەبێتە تەزکیەی «دڵ»، واتە پاككردنەوەی دڵ، بەڵام ئەگەر لەدڵەوە دەستی پێ کرد، وا هەر بەپاكبونەوەی دڵ کە (سولطانی) لەشە، هەمو لەطائف و عەناصیرەکان مل کەچ ئەبن، وەزوو، یەك لەشوێنی یەك، خۆئەدەن بەدەستەوەو پاك ئەبنەوەو، ڕێبوار ئەگاتە مراز.

جائەڵێن شاهی نەقشبەند کەفەرمویەتی «یەکەم قوناغی ئێمە دواقوناغی خەڵکە»، یان ئەوکارەی ئێمە لەپێشا ئەی کەین خەڵك پاش ماوەیێکی زۆر، خەبات کردن، جا

ئەیگاتیێ، ئەمەتە، واتە ئەوان پاش بڕینی نۆقۆناغ جائەگەنە دڵ، ئێمە بەرلەهەموشتێ دڵپاك ئەکەینەوە.

ذیکری دووهەم، بۆهەردولا، «**نەفی و إثباتە**»، کەبریتی یە، لەذیکری «**لا اله الا الله**»، لا اله، نەفی ئەکات، کە هیچ خواییێك نیە، پاشان (**إثبات**)، واتە «**جگەلە الله**»، بۆئەوانەی ذیکری ئاشکرایان هەیە، بەردەوامئەبن لەسەری ئەمذیکرە بەزمان، تا بەمرازئەگەن

وەئەوانەش کە بەدڵ ذیکرئەکەن هەروەکو ذیکری «**الله**» دەس ئەکەنە ذیکری لا اله الا الله، ئەگەرمورشیدبو وا بەدەستوری ئەو، ئەگینا خۆیوبەختی، بۆئەوکەسەی مورشیدی هەیە هەم بۆ گواستنەوەی ذیکر لەم لەطیفەوە بۆ ئەو لەطیفە وەهەم بۆگواستنەوە لە ذیکری ذاتەوە بۆ نەفی و ئیسبات، بەفەرمانی مورشید ئەگوێزێتەوە، جائەگەر ذیکری «**الله**» یان «**لا اله الا الله**» توانی لەنەفسا دامەزرێت، واتە ئەوکاتە هەموی لەشی ئینسان، وە موبەموی ذیکرئەکات، تەنانەت وای لیدێت لەذەررە ذەررەی ئەمجیهانە، ئەوذیکرە ئەبیسێ، بەوذیکری لەشە ئەڵێن. «**سُلطانُ الأَذْكار**» یان «**سلطان الذكر**»، وە بەذیکری جیهانوەکەون ئەڵێن ذیکری «**ماسوی**».

شێوەی ئەملا إله إلا الله یە، کەنفی و ئیسباتە دابی تایبەتی هەیە، کەچۆن ئەکرێت، لەکاتی باسی تەریقەی نەقشبەندی دا، بەیارمەتی خوا باسی ئەکەم.

بەمچەشنە دەرئەکەوێ کەپایەی بناغەیی و سەرەکی ی رێبازی تەصەووف، بەسەری ذیکرەوە دامەزراوە، وەسەردەفتەرو گەورەترین ذیکرێ، کەبەکارئەبرێت، ذیکری ذات، واتە «**الله**» وە «**لا اله الا الله**»یە.

وەئیمامی غەززالی لەکتیبێ «**المنقذ من الضلال**»دا، لەبەشی ریێمایی رێبوارانداه، لای وایە جگە لەراسەنوێژو سونەتەکان، ئیتر رێبوار، نابێ کاتی خۆی بەهیچی ترەوە بگرێت، بەذیکرەوە نەبێت، تەنانەت بۆقورئان خوێندنیش ئەفەرمێ ئەبێ زۆرکەم، بەویشەوە کاتی بباتەسەر، چونکە دڵوەدەرون تەنها بەذیکر، «**لیبی**» واتە، (**مالی**)ئەکرێت، وە لە یاخی گەری و سەرکێشی و کێوی گەربی، ئەکەوێت، بێگومانئەوەی کەخۆی شتی تاقیکردەوە لەئێمە باشترئەزانێت.

••

## إشْراق :

ئیشراق وتەیێکە کە لەنیوەی دوهەمی صەدەی شەشەمی کۆچی‌دا کەوتوەتە ناوی تەصەووفەوە. ئەکرێ ئیشراق بەناوی فەلسەفەیێکی تازەیش وەرگرین کەبناغەی بەسەری فەلسەفەی ئیفلاطونەوە دامەزرابێت، یان‌بلێین بەرهەمێکی تازەیە لەپەیوەندی **«موتوربە»**ی تەصەووف لەفەلسەفەی ئیفلاطون هاتوەتە دی.

بەدی‌هێنەری ئەم رێڕەوە تازەیە **«شەهاب الدین بن‌یحی بن حبش بن ئەمیرەك»**، ی سەهرەوەردی‌یە خەڵکی سەهرەوەردی لای **(زەنجان)** لەمیدیای‌قەدیم. لە **٥٤٩ك (١١٥٥)م**، لەسەهرەوەردهاتەدنیاوە وەلەساڵی **(٥٨٧) ك ٢٩** تەموزی **«١١٩١»** لەشاری حەڵەب‌دا لە زەمانی**«ملك»**ظاهردا هەرلەسەری ئەم‌بیرو باوەڕە تازەیە، ئەویش وەك‌حەللاج فتوای کوشتنی‌درا وەکوژرا، وەلەپاشا پەشیمان‌بونەوە وەزۆربەی ئەوانەی بونەهۆی‌کوشتنی کوژرانەوە، **«ئەم‌سەهرەوردی‌یە لەگەڵی‌شیخ‌عومەری سەهرەوەردی (بەغدا)** لێك‌جیان، بەڵام‌لەخانەدانێکن.

لێرەدا مەبەست ئەوەتە مادام باسمان باسی‌تەصەووفە وەئیشراقیش مەبەستێکە خواهی‌نەخواهی لەمەوضوعی‌تەصەووفدا هەردێتەناوەوە تۆزێ باسەکە روون کەینەوە، **«ئەبولقاسم ئەلکازرونی»** ١٠٥٠ ك ١٦١٠ م ئەڵی **«هەرواکە فارابی تازەکەرەوەی فەلسەفەی «مشائی»** یەکان‌بو **«واتە فەلسەفەی ئەرەسطۆ»**، وەناوی‌نرا **«موعەللیمی ثانی»**، واتە، ئەرەسطو، ماموستای‌یەکەم وەفارابی ماموستای دووهەم لەم‌فەلسەفەدا، هەروەها ئەبێ بەسەهرەوەردیش بوترێت زیندوکەرەوەی فەلسەفەی ئیشراق واتە فەلسەفەی ئیفلاطون. **(کوربان) «تاریخ الفلسفة الأسلامیة»**.

سەهرەوەردی خۆی سەبارەت بەم‌فەلسەفەیە ئەڵێت. **«ئیمە ئەگەر بێتو خۆمان لە لەززەت وەرگرتنی جیسم «لاشە»** دامالین، **«واتە دەس لەتاسەشکاندنی‌حیسمی هەڵگرین»**، نوری‌خودا لەدەرونمانا هەڵ‌دێت **«دەرئەکەوێت» «ئەدرەوشێتەوە»**، نورێك کە هەتاهەتایە هەربەردەوام‌ئەبێت ئەم‌نورەش لەسەرچاوەیێکەوە هەڵ‌دێت کەبۆئێمە وەکو باوك وەیان سەروەرێکی گەورە لەبەنی‌ئادەم وایە، وەئەو بەخشندەی هەمو شێوەکانە وەسەرچاوەو کانگەی هەموگیان‌لەبەرێکە لەهەموجۆرێکی،

بەوسەرچاوەیە ئەڵێن «**رەوانی پیرۆز**»، «**الروح المقدسة**»، وە بەزمانی فەیلەسوفەکان پێی ئەڵێن «**العقل الفعال**» «**ئاوەزوهۆشی بەکار**».

مەبەست لێرەدا ئەوەتە (**ئیشراق**) ووشەیێکە، بەکار ئەبرێت بۆ ئەوباوەرەی کەئەڵێ ئەگەربێتو مرۆڤ دەس لە «**مَلذّات**» واتە «**کام گیری**» «**تاسەشکاندنی جیسمی**»، بەهەموجۆرێکی هەڵگرێت وە ڕوی دڵی بکاتەخودا خوداخۆی دڵی ئەوکەسە ڕووناك ئەکاتەوە، وەنوری خودا لەودڵەدا «**ئیشراق**» ئەکات، واتە وەکوخۆر هەڵ دێت.

جا سەبارەت بەم باوەرە «**حاجی خەلیفە**» لەکتێبی «**کشفُ الظنون**» دا وە «**تەهانەوی**» لەکتێبی «**کشاف اصطلاحات الفنون**» دا، سەبارەت بەم ئیشراقە باوەرێکی جوانیان دەربریوە کەئەڵێن. «**رێگە بۆگەیشتن بەمەعریفەت** «**خوداناسی ی**» دووجۆرە یەکێکیان رێگەی خاوەن بیرو ئیستیدلالە، واتە «**هەستوبەڵگە**»، وەئەویتریان رێگەی ریازەتکێشانو خەباتکارانە «**موجاهەدە**»، ئەوانەی کەپەیرەوانی رێگەی یەکەمن ئەگەر پەیرەوی یەکێ لەپێغەمبەرەکان بون «**درودی خودایان لەسەر**، **ئەوە پێیان ئەڵێن** «**متکلمون**»، ئەگینا: «**حوکەمای مەششائین**» ئەوانەش کە رێگەی دووهەمیان گرتوەتەبەر ئەگەر لەو ریازەت کێشانەدا پەیرەوی یان کرد لەشەریعەتی ئیسلام، ئەوە پێیان ئەڵێن «**صوفی**»، ئەگینا پێیان ئەڵێن «**ئیشراقی**» یەکان.

بەم چەشنە بەپێی باوەری ئەم دوکارناسە ئیشراقیەکان ریازەتکێشیکن کەپەیرەوی کردن لەشەریعەت بەلایانەوە گرنگ نیە.

بێ گومان باوەرەکانی سەهروەردی لەکتێبەکانی خۆیا کەزۆرن دەرئەکەوێت، بەتایبەت «**هیاکل النور**، **وەحکمة الاشراق**» وەئەوانی تریش.

لێرەدا مەبەست هەرئەوەبو ئێوەبزانن، ئیشراق درەوشانەوەی نوری خودایە لەدەروندا ئیترچەنو چۆنەکەی خۆی پێویستی بەکتێبێکە. لەم دواییەدا دوکتور عرفان عبد الحمید فتاح لەکتێبی «**نشأة الفلسفة الصوفية وتطوّرها**» چەن پەرەیێکی لەبارەی فەلسەفەی ئیشراقەوە نوسیوە، ئەکرێ لەویش کەڵك وەرگیرێت بەتایبەت چونکەناوی سەرچاوەکانی تیایە، وەمن خۆم لەکتێبەفارسیەکەما ژیانی سەهروەردیەکان هەمویانم بەدرێژی نوسیوە.

وەلەکۆتاییدا ئەڵێم هەرچی بەڵگە هەیە هەمویپیشاندەری ئەوەتە کەئەمسەهرەوردی‌یە «بەناوبانگ» بە «مەقتول» باوەری بەخوداو بەدینی‌ئیسلام‌زۆر بتەوە وەصوفێیکی بەتەواو مەعنابوە، بەڵام زیرەکی‌ی لەرادەبەدەر، وە خوێندەواری‌ی لەرادەبەر، وەتوانایی باسو موناقەشەی لەرادەبەر، بونەهۆی‌ئەوەی بەجوانی‌ی‌بکوژرێت وە دەرفەتی ئەوەی نەبێت‌بگاتە تەمەنی دامەزراوی‌و دامرکاویی تائەم باوەرەی خۆی‌بکاتە رێرەوی لەری‌رەوەکانی‌تەسەووف وەهەروا جوانەمەرگ‌بو وەلەسی‌وشەش‌ساڵیدا کوژرا .

---

**موشاهەدە :**

---

عەمر کوری‌عوسمان «ئەلەککی»، لەکتێبی «قوت القلوب» دا ئەڵێت موشاهەدە بریتی‌یە لەوشتەی کەدڵ‌ئەیبینی لەغەیب، واتەلەشتی پشتی‌پەردە وەنەزانراو، وە ئەوشتە قەت نەئاشکرائەبێت‌و نەئەبینە» وەجد»، هەرلەم‌سەرچاوەدا ئەڵێ «موشاهەدە واتە موحاضەرە» موحاضەرەش واتە نزیك‌بونەوە، لەپاشان‌ئەڵێن موشاهەدە ئەو نزیکی‌یەتە کەئەبێتەهۆی «علم الیقین»،وە خاوەن موشاهەدەکان وان لە سی‌حاڵ‌دا ،

دەستەی یەکەمیان موریدە تازەکارەکانن وەئەوانە شت بەچاوی عیبرەت «پەند»، ئەبینن یان بەچاوی «بیروهۆش»؛ حاڵی دوهەمی موشاهەدە، هی مام‌ناوەندی‌یەکانە ، حاڵی ئەمانەش وەکو «ئەبوسەعید الخراز» ئەڵێ، خەڵك وان لەناوی مشتی قودرەتی هەق‌دا وەوان لە موڵکی ئەودا، ئەگەر بێتو «موشاهەدە»، لەنێوانی خوداو بەندەدا روویدات ئیتر نەلە «سیرر» وە نە لە «وەهم» ی ئەوکەسەدا جگە لەخودا هیچی‌تر نامێنێتەوە .

وە حاڵەتی‌سی‌هەم لەموشاهەدە هەروەکو «عَمرو بن عثمان المکي» ئەڵێت، دڵی عاریفان خودا موشاهەدە ئەکات، موشاهەدەیێکی دامەزراو، بەو کائنات ئەبینن وە لەکائناتەوە ئەو ئەبینن .

خاوەنی کتێبی «اللمع» لەپاشان خۆی ئەڵێت موشاهەدە حاڵێکی زۆربەرزە وە روونا کی‌ی حەقائقی یەقینە، واتە راستەقینەکانی باوەری تەواوە .

شیخ عومەری سەهرەوەردی ئەڵێت، موحاضەرە وە موکاشەفە وە موشاهەدەمان هەیە، موحاضەرە هی ئەوانەتە وان لەپایەی تەلوین دا موشاهەدەیش هی ئەوانەتە کە خاوەنی مەقامی تەمکینن وە موکاشەفەیش هی قۆناغێکە کەوا لەنێوانی ئەم دوومەقامەدا، تائە وکاتەی کە موشاهەدەکەی دامەزرێت، ئەڵێ، موشاهەدەو موحاضەرە هی ئەوانەتە کەباوریان **«علم الیقین»**ە واتە لەرێگەی زانیاری یەوە خوداناسن، بەڵام موکاشفە هی ئەوانەتە کەباوەریان گەیشتوەتە **«عین الیقین»**، واتە ئەوەتە شتی نهێنی لەئەسراری خودا ئەبینن وەباوەرەکەیان بتەو بوەو بوەتە دیتن، بەڵام موشاهەدە هی ئەوانەتە کەئیمانیان ئەبێتە **«حق الیقین»**، واتە ئەوپەری باوەر، باوەرێك کە لەگەڵی رەگوریشەو خوێنی مرۆڤدا تێکەڵ ئەبێت.

کەواتە موشاهەدە ئەبێتە چاوپی کەوتن بەچاوی دڵ واتەچاوی بەصیرەت بەنوری هەق، وەهەست کردنو تام کردنو چەشتنی ئەوخۆشی یە، بەدڵ ودەرون، موکاشەفەش شت بۆرِوون بونەوەیە، موحاضەرەش ئامادەبون لەگەڵی شتێکایە یان حاضربونی ئەوشتەیە. تەلوین و تەمکینیش زووتریش وتمان، دوو مەقامن تەلوین هی رێبوارانە **«سالیك»** کە لەپایەیێکەوە مەقامی ئەگۆررێت بۆمەقامێك بەڵام تەمکین هی ئەوانەتە کە پی گەیشتونو دامەزراون.

**«شیخ الاسلام هروی»** ئەویش لە **«مَنازِلُ السّائرین»** دا ئەڵێت، موشاهەدە بریتی یە لە هەڵگیرانو لاچونی پەردە وەئیتر بێ پەردە رێبواری رێگەی تەصەووف بەچاوی دڵ خودای خۆی ئەبینی، ئەویش هەرئەڵێ موشاهەدە باڵاترە لەموکاشەفە، جائەڵێ موشاهەدە سێ پلەی هەیە **«موشاهەدەی مەعریفە»** واتە دیتنی زانین کەوا لەژوری سنوری عیلمەوە لە لەوحەکانی **«نوری‌وجوددا»** واتە لەروناکی ی هەستی دا وە لە فەنای جەمع دا باری لێ خستوە.

پلەی دوهەمی **«موشاهەدەی موعایەنەیە»**، واتە دیتنی بشکنین وە لێ وردبونەوە کە زمانی ئیشارەیشی تێدا کوڵە، وە پلەی سێ هەمی **«موشاهەدەی جەمع»** ە واتە دیتنی یەك گرتن، کەسواری دەریای هەستی ئەبێت.

لەکتێبی **«مُعجَم مصطلحات الصوفیەدا»** سەبارەت بەموشاهەدە ئەڵێت، بریتی یە لەئەوپەری نزیك بونەوە لەخودا، ئەڵێت وتراوە کەبریتی یە لەچاوپی کەوتنی هەق بەچاوی دڵ.

زۆرجار وادێتەپێشەوە، لەخوێندنەوەی ئەوباسانەدا، کەپەیوەندی هەبێت بەتەصەووفەوە، ئەم ناوانە ئەکەونە پێش چاو، هەرچەن وەنەبێ ئەم ناوانە بەشێك بن لەزانیاریی تەصەووف، بەڵام وەکو وتم بەکارئەبرێن، کەواتە بەکورتی ی دەسنیشانێیکیان بۆئەکەم .

**عالەمی لاهوت :**

ئەبێتە عالەمی «**ئەرواح**» هەروەها، ئەڵێن، زانیاریی لاهوت، ئەو زانیاری یەتە لەبارەی ئەومەبەستانەوە باس ئەکات کەپەیوەندی یان بەخوایگەورەوە هەیە، وە «**لاهوتی**» بەکەسێ ئەڵێن، زانابێت لەزانیاری ئەرواح دا یان لەوزانیاری یانەدا پەیوەندی یان بەخواوەهەیە .

**جیهانی ناسوت :**

یان زانیاریی ناسوت، یان وشەی ناسوت پێچەوانەی زانیاری لاهوتە چونکە جیهانی لاهوت جیهانی «**ئەرواحە**» ، وەجیهانی ناسوت بریتی یە لەم جیهانە خاکی یەی ئێمە وەسەبارەت بەوشتانە باس ئەکات کەپەیوەندی یان بەمرۆڤەوە هەیە وەکو ئەوە وایە بڵێین جیهانی مرۆڤ، یان جیهانی ماددی، وەلەبناغەدا لەووشەی «**ناس**» دروس بوە، وە واوو تێی بۆزیادکراوە کە شێوەیێکی «**سورەیانی یە**» وە بوەتە «**ناسوت**»، کەوابو ئەبێتە جیهانی «**سوروشتی ئینسانی**»، وە ئەو زانیاری یانەی کەسەبارەت بەئینسان ئەدوێن. بەرانبەر بەلاهوت کەخواناسی یە، یان ڕۆح ناسی یە، ئەم جیهانی خاك ئەوجیهانی ڕۆح .

**جەبەروت :**

سەرچاوەی ئەمووشەیە لەناوی خوایگەورەوە «**جەببار**»، هاتوە، پێناسی جەببار یش ئەوەتە هەرچی بوێت ئەیکا، وەئەوەی بیەوی بەزۆر بەدروس کراوەکانی خۆیی ئەکات، وەکوئەوەی برێك وتویانە ئەگەر بەندە گەیشتە جیهانی مەلەکوت چارەنوسی خۆی بەدەستی خۆیەتی، واتە ئەوەی بیەوێ ئەیکات و ئەوەی نەیویست

نایکات، بەڵام کە لە جیهانی جەبەروت دابو ئیتر ئەبێ ئەوەی خوائەیەوێ ئەوە بکات وەهیچ چارەنوسێکی لەدەستی خۆیا نەهێڵێ.

«**أبو طالب المكي**» ئەڵێ جیهانی جەبەروت جیهانی عەظەمەتی خوایە، وەبریتی یە لە جیهانی ناوەکان و پێناسەکانی خوای گەورە کەواتە هەرزانیارێك لەم بارەوە باسی کرد پێی ئەوترێ زانیاری جەبەروت.

زۆرێك لەگەورەپیاوانی تەصەووف وتویانە جیهانی جەبەروت وا لەبەرزەخا، واتە وا لە ناوەراستی جیهانی ناسوت وە مەلەکوتا واتە جیهانی غەیب. محی الدینی عەرەبی لەزمانی حەزرەتی عەلی یەوە ئەیگێڕێتەوە ئەڵێت، جیهانی جەبەروت، جیهانی «**عەزەمەتە**»، ئەم جیهانەش والەژێری فەرمانو چاودێری برێ رەوانی پاكو نورانی دا، وەناپێڵن ئەوانەی ئەیانەوێ لەناسوتەوە، بڕۆن بوجیهانی مەلەکوت، بەبێ روخسەتی ئەوان تێپەڕن، چا چونکە لێرەدا جەبر بەکارئەبرێت، ئەبێتە جیهانی جەبەروت.

## جیهانی مەلەکوت :

ئەم جیهانەش بریتی یە لەجیهانی غەیب، یان ئەوجیهانەی کەنەفسی پاکی مەلائکەکانی تیا ئەژین، هەروەها وەکوتمان هەربەندەیێکی خوا مەقامی رۆحیی ئەو گەیشتە ئەم مەقامە، لەدیاری کردنی سەرنویشتی خۆیا ئازادە، وەکو جیهانی جەبەروت نیە، جابۆیە لەپلەی جەبەروتا بەرگری ئەکەن لەبەرزبونەوەی، بۆئەوەی جیهانیکی بەرزترە وەکەسێ بەتەواوی نەپاڵێورێت و نەبوبێتە نور، رێگای جیهانی مەلەکوتی نادەن.

کەواتە، ناسوت ئەبێتە جیهانی ماددە، وەسوروشت وەلەشی ئینسانیی، هەروەها ئەوشتانەی پەیوەندیان بەئینسانەوەیە.

جەبەروت مامناوەندی یە وە بەرزەخە لەنێوانی ناسوت وەمەلەکوت دا مەلەکوتیش جیهانی رەوانی رەوانپاکانو رەوانی مەلائکەکانە.

وەجیهانی لاهوت، جیهانی غەیب، یانجیهانی ئەرواح یان جیهانی «**ئولوهی یەت**»، واتە خوایە،

## العَناصِرُ الأَرْبَعَة :

بریٚجار، لەکاتی باسی تەزکی یەی لەطائفدا، ووشەی «**چوار عونصور**» ئەبینریٚت، بەتایبەت، لەروانگەی سولوکی تەریقەتی نەقشبەندی دا، کەئەلیٚن، لەطائفیٚك کە وجودی ظاهیروباطین، یان ماددی ومەعنەوی مرۆڤ لی دروس بوە دە لەطیفەن، پیٚنج یان هی عالەمی خەلقە، کەبریتین لەم چوار عونصورە وەنەفس، ئەوانیشی لەطیفەی قەلب، رۆح، سیرر، خەفی، ئەخفا یە، «**نەك قەلبی گوشتین**»، بەلکو هەروەکو وتمان، دەرونی مرۆڤە، یان مەرکەزیٚکی تایبەت لەدەرونایە، کە شتیٚکی مەعنەوی یە، جا بەم لەطائفانە ئەلیٚن لەطائفی عالەمی ئەمر، واتە بەئەمری خوا هەن، وەتەنها ریٚبوارانی ریٚگەی تەصەووف هەستی ئەکەن وەشتیٚکی هەستکراو بە هەست پیٚ کراوەکان نین با بزانین ئەوچوار عونصورەکە چین، هەر لەزەمانی لەمیٚژەوە کەفەلسەفە پایەریٚژی کراوە، وادانراوە کە ئەم جیهانە، هەموی لەچوار عونصور، چوار جۆرماددە دروس بوە، هەروەها پیٚیان وتوە «**الأُسْتُقِصّات**»، یان «**المواد والأركان**»، ئایا ئەم چوارعونصورەی کەهەموی جیهان لەوانەدروس بوبیٚت، وە لەشی مرۆڤیش هەر لەوچوار عونصورە دروس بوبیٚت چی یە؟ ئەمانەن.. ئاو، خاك، ئاگر، هەوا، هەرچەن ئیستە زانیاری باوەری هەبیٚت بەم بیرە، یان نەی بیٚت، ئەم مەبەستە لەروانگەییٚکەوە زۆر لەئاوەزەوە نزیکە، ئیمە کەئەلیٚین ئاگر خیٚرا هۆشمان ئەروات بۆلای ئاگری نان و چیٚشتی لای خۆمان، یان ئەوئاگرانەی کە لەدریٚژایی رۆژا چاومان پی یان ئەکەویٚ، یان، کەئەلیٚین خاك، هۆشمان ئەروات بۆلای ئەم گلەو، ئەم خاك و خۆلەی لەبەردەستمانایە، .. بەلام راستەکەی وانیە، بەلکو ئەم چوار عونصورە، خاکەکەی بریتیە لە هەمو مادەییٚکی وشك لەم کەونەدا، دیارەخاکیش لەو ماددە وشکانە دروس بوە، چ زیٚرو گەوهەربیٚت یان هەر مادەییٚك لەهەر کانگەییٚك، وەهەر خاك و بەردو دارو شتیٚکی وشکی تر، بەچەشنیٚکی تیکرا هەرچی مادەییٚکی وشکە، سەبارەت بە ئاوەکەش، مەبەست رطوبەت، نم، وەتەری یە، ئاگرەکەیش مەبەست، تیشکی رۆژو حەرارەتە، هەمومان ئەزانین، لەشی هەمو گیان داروبی گیانیٚك، حەرارەتی تیایە، وەکوئەوەی سەهولیٚك کەچلوپیٚنج پلەی ژیری خال بیٚت، گەرمترە لەسەهولیٚك، کەپەنجا پلەی ژیری خالە، یان زەوی کە

هەڵی کوڵین. هەرمیترێك کە ئەرۆینە خوارەوە، گەرمای زیاتر ئەبێت، تائەگاتە هەزاران پلەی گەرما، بەجۆرێ هەرچییێکی تیایە، نەك هەر تواوەتەوە، بەلکو بوخاریشە، سەبارەت بە هەوایش، بریتی یە لەو عونصورانەی کە هەوایان لیّ دروس ئەبیّ، وە بەبیّ ئەوان هەوا دروس نابێت، بیّ هەوایش هیچ گیاندارێ ناژیت، کە ئوکسجین سەرۆکیانە، بەبارێکی ترا، ئایا بیّ تیشکی هەتاو، کە گەرمایەو وە بەبیّ ئاوو هەواو خاك، هیچ شتیّ ئەژیت؟.. خوایش ئەفەرمیّ «وَجَعَلنَا مِنَ الماءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيّ».

کەواتە بەراستیّ ئەوچوارعونصورە بناغەی ژیانن ئیتر مەبەست ئەوەنیە، ئەمجیهانە تەنها لەچوار عونصور دروس بوە، بەڵکو مەبەست ئەوەتە ئەکریّ هەمو عونصورەکان لەچوارچێوەی ئەم چوار عونصەرەدا کۆکەینەوە، وەبڵێین، ئەوەی ئەمجیهانەو ئێمەی گیاندارانیشی لیّ دروس بوە، بریتی یە لە «**وشکی و تەری و گەرماو هەوا**» وەئەمانەن هوی بەردەوامبونی ژیانن، بەتایبەت سەبارەت بە لەشی مرۆڤ، وەهەموی گیان لەبەران، ئەبینن لە زانیاریی گیاندار ناسیدا دیاریی ئەکەن، ئەگەربێتو لاشەی مرۆڤێك، یان گیان لەبەریّ بسوتینین، لەصەدا ئەوەندەی خاکە. واتە خۆڵەمێش، ئەوەندەشی هەڵمو نمە، ئەوەندەشی هەوایەو ئەوشتانەی هەوای لیّ دروس ئەبێت، بیگومان، هەرجیسمیّ بەرادەی پێویست حەرارەتی هەیە، وەپێویستی بەتیشکی رۆژیش هەیە کە حەرارەتە کەوابو چ مرۆڤ، وەچ هەربەشێکی ئەمکەونە، لەیەکیّ، یان زیاتر لەمچوارشتە دروس بوە. واتە، گەرما «**ئاگر**»،نم وەتەری «**ئاو**»وشکی ی، واتە (**خاك**)، وە «**هەوا**»، کەئەبێتە، هەمان چوارعونصورەکە.

بەکورتی، ئاکام هەرچیی وەهەرچۆن بیت، هەرکاتیّ ناوی (**چوار عونصور**)، برا، وا مەبەست ئەو چوارعونصورەتە.

---

**وَلیّ:**

---

وەلی، ووشەیێکە چ لەروانگەی ئیسلامەوە بەشێوەیێکی گشتی، وە چ لەروانگەی تەصەووفەوە، زۆر بەکاربراوە، لەکوردی خۆماندا، هەمیشە بەخواپەرستانی راستەقینەو پیاوچاکان ئەڵێن وەلی.

لەروانگەی قورئانەوە ووشەی وەلی، هەم بۆخوا، وەهەم بۆ بەندە لەئایەتی زۆرا بەکاربراوە، وەکوئەوەی خواتەفەرمی «اللهُ وَلِیُّ الَّذِینَ آمَنوا»، «وَاللهُ وَلِیُّ المُؤمِنِین»، «وَاللهُ وَلِیُّ المُتَّقِین»، «وَکَفی بِاللهِ وَلِیّاً» «قُلْ اَغَیْرَ اللهِ اَتَّخِذُ وَلِیّاً»؟ «وَهُوَ یَتَوَلّی الصّالِحِین». وە دەیان ئایەتی تر، هەموی پیشان دەری ئەوەتە خوای گەورە وەلی بەندەکانیەتی، جالێرەدا ئەم ویلایەتە، بەواتەی ژێری سایەی خۆگرتن و، ژێری چاودیری لی کردن و ئاگالی بون و ئەوجۆرە واتانەیە، بەڵام لەم واتاکەیا کەبەندە وەلی یە، بەومەعنایە کە چاودێری لی کراوو خۆشەویستی خوایە، وەخوا موژدەیان ئەداتێ کەترسیان نەبێت بەهەشت جیگەیانەو خوایان لی رازی یە، هەروەکو، لەسورەی «یونس» ئایەتی، (٦٢) دا، ئەفەرمێ، «اَلا اِنَّ اَوْلِیاءَ اللهِ لاخَوْفٌ عَلَیْهِمْ وَلاهُمْ یَحْزَنونَ»، لەپاشان ئەفەرمێ «الَّذِینَ آمَنوا وَکانوا یَتَّقون» خوا خۆی پێناسی وەلی پیشان ئەدات کە ئەفەرمی «آمَنوا وَکانوا یَتَّقون»، واتە، هەم خاوەن باوەربون، وەهەم پارێزکاری، واتە هەم خواپەرستی یان کردوە، هەم خۆیان لاداوە لەگوناه، جا پاشان ئەفەرمێ «لَهُمُ البُشْری فی الحَیاةِ الدُّنیا وَفی الآخِرَةِ» واتە بۆ هەردو ژیانەکە موژدەیان ئەدەمێ، وە لەسەری ئەوموژدەیەش هەربەردەوامم، چونکە خوا لەبەخشین و لەموژدەی خۆی پەشیمان نابێتەوە، ئەفەرمێ، «لاتَبْدیلَ لِکَلِماتِ اللهِ» لەپاشان ئەفەرمێ ئەمەگەورەترین سەرکەوتنە بۆ بەندەیێك. «ذلِكَ هُوَ الفَوْزُ العَظیم».

جا هەر لەقورئاندا پێناسەکانی تری وەلی، بەباشی ی دەرئەکەوێت، کەئەفەرمێ، «وهو یَتَوَلّی الصّالحین»، «واللهُ وَلِیُّ المؤمنین» «والله وَلِیُّ المتقین»، هەروەکووتمان، کەواتە لەپێناسەکانی وەلی ئەوەتە، خاوەن باوەر، پارێزکار، وە صالح بێت، صالح چاکەویستانن، چاکەیش هەموجۆرە چاکێك لەروانگەی ئیسلامەوە ئەگرێتەبەر، مەولەوی تاوگۆزی ئەفەرمێ،

١ – وەلی کەسێکە (عارفٌ بِالله)

(ما اَمْکَنْ) لە ذات لە صیفات ئاگاه.

٢) بیکێشی بەسەنگ هەر سێ تەقوادا

بە ترازووی شەرع مویێ لانادا.

٣) مُواظِبْ لەسەر ئەدای طاعاتە

صاحیب ئیجتیناب لەشەناعاتە.

واتە وەلی بەوخواناسە موسوڵمانە ئەڵێن، بەرادەی پێویست لەذاتو صیفاتی خوا ئاگاداربێت، وەئەگەر بەترازوی شەرع کێشانەی بکەیت، هەرسێ جۆرە تەقواکەی ئەو، موێ لەشەرع لانەدەن، وە فەرمانەکانی خوا بەباشیی ئەنجام ئەدات خۆیشی ئەپارێزێ لەکردەوەی خیلافی شەرع.

سێ تەقوایش، یان سێ جۆرە پارێزکردنو خۆلادان، بریتین لە پارێز کردن لەکوفر، پارێزکردن لەگوناە، پارێزکردن لەهەڵپەکردنو ئارام لێبڕانو خۆپڕوکاندن بۆ کۆکردنەوەو بەدەس هێنانی سەرمایەو سامانی دنیا، «**نعلك کاسبی حەلاڵ**»، کاسبی حەلاڵ دروستە، بەلام هەڵپەکردن پێناسێکی ناپەسەندە. لەروانگەی تەصەووفیشەوە، بەتایبەت بەلای .نسبەندی یەکانەوە، وەلی ئەبێ، لە دە مەقامەکان، کەناومان بردن، وەکو، تەوبە، زوهدو صەبرو.. هتد، تێپەری کردبێت، وچەشنو جۆر دائەنێت بۆ ویلایەت، ویلایەتی (**صوغری**) واتە بچوك وە (**کوبری**)، واتە گەورە، بۆگەیشتن بە ویلایەتی کوبری، ئەڵێ ئەبێ هەمو لەطائفەکانی پاكبوبنەوەو «**ذاکرۃ**» بن، جائەتوانێ پێ بنێتە یەکەم پایەی ویلایەتی کوبری، زۆربەی گەورەپیاوانی تەصەووف لایانوایە ئاخرین پایەی ویلایەت کەهات، ئیتر یەکەم پایەی «**نوبووەت**» دەست پێ ئەکات واتە وەلی تائەوشوێنە ئەروات، ئیترلەوەولا یەکەم پلەی نوبووەتە، کە مەقامی ئەوانیش جۆراو جۆری هەیە، وەکو خەلیل الله، کلیم الله، روح الله، وەگەورەترین پایەی پێغەمبەری پایەی حەزرەتی موحەممەدە «**رۆحم بەقوربانی ناوی بێت**»، وە درودی خوای لەسەربێت.

برێك پرسیاریان کردوە، ئایا وەلی خۆی ئەزانێت وەلی یە، یام ناء؟ وەلام ئەوەتە زۆرجار رێك ئەکەوێت وەلی بەخۆی نازانێت، بەلام زۆرتریان بەخۆیان ئەزانن.

من خۆم جارێکیان شتێکی وام دیوە، ئەویش ئەوەبو، (**فەقێ موحەممەد**) ناو خەڵکی کوفری ساڵهای سالێ لەبیارە سەرگەرمی سلوكو خواپەرستی بو، ئیتر خواپەرستی وا هەر زۆرکەمە، جارێکیان من،لاو بوم، بگرە چواردەپانزەساڵێ تەمەنم بو، لیم پارایەوە وتی برۆرە خذمەتی باوکت بڵێ ئاگای لیم بێت، هەرچی هەوڵ ئەدم هیچم دیارنیە، منیش رۆیشتم وەپەیامەکەیم گەیاند، شیخ پێکەنی فەرموی، رۆڵە، ئەو لەزووەوە بوەتەوەلی، بەلام خۆی بەخۆیی نەزانیوە، ئیستە مادام وایە برۆ تۆ ئەو موژدەیە بدەرێ، بادوعای خیریشت بۆبکات، منیش خێرا رۆیشتم وەپەیامەکەم

گەیاندیێ، لەپێشا لەخۆشیا وەخت‌بو شادی‌مەرگ بێت، پاشی‌تۆزێ هەستم‌کرد وەکوشتیێ تەریق‌بێتەوە، یان پەشیمان‌بێت بۆچی خۆی‌نەگرتوە، یان لەمەقامەکەی ئاگادارکرا، بەلاّم بەرلەوحال‌گۆرانەی دوعاێکی زۆری بۆکردم، ئیتر من بەجێم‌هێشت، ئیستە، کە لەوچۆنیەتانە سەردەردێرم، وەموتاڵایان ئەکەم، جاتیێ‌نەگەم ئەوحاڵەی فەقێ موحەممەدیش لەوانە بوە.

سەبارەت بەکەشف‌وکەراماتیش زۆرێك لەگەورەپیاوانی تەصەووف ئەڵێن مەرج‌نیە هەرکەس وەلی‌بێت ئەبیێ کەشفوکەراماتیشی هەبیێ، وە نەبونی کەرامات ئەوەناگەیێنیێ ئەوکەسە وەلی‌نیە، باوەری هەموان لەسەری بەردەوام‌بونە لەسەری خواپەرستی‌و تەوبەنەشکاندن وەپارێزکاری، ئەڵێن «**العِبرَةُ بالإستِقامَه وَلَیْسَتْ بالکَرامه**» یان ئەڵێن کەرامەت ئەوەتەپیاو بتوانیێ خوو خدەیێکی ناشیرینی خۆی بگۆرێ، ئەوەخۆی گەورەترین کەرامەتە.

شیخ محی الدین عەرەبی، لای‌وایە ویلایەت بەتێکۆشان وەخواپەرەستی‌و ریازەت دەس‌ناکەوێت، بەڵکو ئەویش وەکو «**حال**»، کەلەبەشی حال‌ومەقام‌دا باسم‌کرد، بەهرەیێکەو خوا ئەیدات، بەلاّم بێگومان دروست‌کاری‌و خواپەرستی هۆی زەمینەئامادەکردنن بۆ ئەوخەلاّتە، چونکە کەسیێ پارێزکارو خواپەرست نەبیێ ئەوخەلاّتە ناکرێت، مەبەستی ئەو ئەوەتە، وانیە بەدەستی خۆت‌بێت، کە ئەگەر ئەوەندە رۆژ یان‌ساڵێ بەوجۆرەو بەوجۆرە خواپەرستی‌بکەیت ئەبیتە وەلی، بەوجۆرەنیە، لەتۆ راستی‌و خواپەرستی، باقی‌تری ویستی خواخۆیەتی.

حەکیم «**محمدعلی‌ترمزی**» کەلە (**۲۹٦**) ك کۆچی‌کردوە لەهەموی گەورەپیاوانی تەصەووف زیاتر لەبارەی ویلایەتەوە باسی‌کردوە. وادەرئەکەویێ وردەوردە باسی ویلایەت پاش تی‌پەربونی رۆژگاری ئەصحاب، شێوەی ئیستەی گرتوەتە خۆی، چونکە لەپێشا هەمو وەلی‌بون، چونکە مەقامی صەحابە لەهی‌وەلی‌گەورەترە، وەپێویستی بەوەنەکردوە بەکەسی‌بلێن وەلی،له «**فەضیل‌بن‌عیاض**» ەوە کە لە «**۱۸۷**» ك لەدنیادەرچوە، وردە وردە باسەکەی رون بوەتەوە، پاشان لەزبانی شیخ‌معروفی کەرخی‌دا (**۲۰۰**) ك پاشان «**جونەید**»«**۲۹۷**» ك، پاشان «**محاسبی**»(**۲٤۳**) ك پاشان «**ذی‌النون‌میصری**» «**۲٤٥**» ك، وەلەزەمانی بایەزیدی بەسطامی‌دا بەتەواوی باسی وەلی وە ویلایەت بەم‌چەشنەی ئیستە روون‌بوەتەوە، کەلە (**۲٦۱**) ك فەوتی‌کردوە. حەکیم

**(ترمزی)** چەن کتێبی سەبارەت بەپایەوپلەی وەلی یەکان داناوە، وەکو **(عِلْمُ الأولیاء)** «**سیرةُ الأولیاء**»، «**خَتْمُ الأولیاء**»، **محی الدین عەرەبی** دەسنیشان ئەکات بۆنوسینەکانی **(ترمزی)** وەزۆر لاینگری نوسینەکانیەتی، وەنزیکەی صەدوپەنجا ووشەو موصطەلەح لەموصطەلەحەکانی **(ترمزی)**، راڤە کردوەو لیٚیان کۆڵیوەتەوە.

خوای گەورە هەروا کە لەقورئانا لوطفی خۆی سەبارەت بە وەلی یەکانی خۆی دەربریوە، لەحەدیثی قودسیشا هەر دوبارەی کردوەتەوە وەئەفەرمیٚ **(مَنْ عادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْب... هتد)** «**صەحیحی بوخاری**»، جابویە ئەوانەی شارەزای ئەم رێبازە مەعنەوی یەن، ئەپارێنەوە لەخەڵك، کەدژایەتی لەگەڵی پیاوچاکان و خواناسانا نەکەن، چونکە راستەکەی ئەوەتە دژایەتی لەگەڵ خوادا ئەکەن، کەئەفەرمیٚ «**عادی لی**» نافەرمیٚ «**عادی ولیا**» ووشەی «**لی**» دەری ئەخات کەخوا بەهی خۆی دایان ئەنیٚ، چونکەلەبەندە چاك هەڵبژێرراوە کانن.

کەواتە وەلی، بەوبەندە موسوڵمانە خاوەن باوەڕە پارێزکارە لەخواترسە ئەڵێن، کەخوا بەخەڵاتی «**ویلایەت**» سەربەرزی کردوە، وەخستویەتە ژێری چەتری کەرەم ولوطفی خۆی وە موژدەی بەهەشتی داوەتیٚ، وە دڵنیای کردوە کە لەهیچ نەترسیٚ. بگرە کەشف و کەراماتی هەبێت، بگرە نەیبێت، بگرە بەخۆی بزانیٚ بگرە نەیزانیٚ، وە وەلی بەکەسیٚ ئەڵێن هەرگیز لەرێگەی شەریعەت لانادات، ئەبێتە پارچەیێ لەنور، وە خوا ئەیپارێزێت لە شەیتان، هەروا کە ئەنبیا مەعصومن، ئەولیاش مەحفوظ ئەبن، پایەومەقامیشان خوائەیان داتیٚ هەرکامەی بەپێی ئیستیعدادی خۆی، وەبەوجۆرەی کەخواخۆی مەیلی لیٚیەتی.

## مُرید– مُراد:

مورید وە موراد دوو ووشەن لەتەصەووفدا بەکارئەبرێن، سەرچاوەی ئەم ووشانە لە «**ئیرادە**» وە دێت «**إرادة**» واتە ویستن، کەواتە مورید ئەبێتە ویستیار، مورادیش، ئەوکەسەیە کەئەیانەوێت، لەروانگەی تەصەووفەوە، ئەوەی کەڵکەڵەی خواپەرستی کەوتە سەری، لەخوا نزیك بێتەوە، واتە ئیرادەی کرد کە خوا لەخۆی

رازی‌کات، واتەبێتە مورید «واتە خواویست»، کەواتە ئەوکەسەی لەکانگەی دڵەوە دەستی لەچەوتی‌و لاریێی هەڵگرت، وە دەستی‌کردە خواپەرستی «**ئەوە موریدی خوایە**»، واتە خوای ئەوێت، ئەمانەی کەدان بەخوایی خوادا ئەنێن وەلەوەوپاش لەسەر ڕێگەی خواپەرەستی بەردەوام ئەبن خوا لەبارەیانەوە ئەفەرمێ، «**إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ**» (**فُصِّلَتْ**) (٣٠)، هەروەها ئەفەرمێ «**إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ، أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ**» (**أحقاف**) «١٣»وە «١٤».

کەواتە ئەوەی خوای‌ویست وەلەپاشان بەردەوام‌بو لەسەری ئەو خواویستی‌یە، ئەوەی خوایێ‌خۆش‌بوکردی، وەئەوەی خوایێ‌ناخۆش‌بو نەی‌کرد، لەهەردو ئایەتەکەدا ئەفەرمێ «**ترسیان لە هیچ نەبێ وە بەهەشت جێگەیانە**»، هەروەها ئایەتێکی‌تر سەبارەت بەخواویستان هەیە، کەجگە خوا هیچ داخوازیکی‌تریان نیە، خوابەپێغەمبەر دەستورئەدات وەئەفەرمێ «**وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ**.» (**انعام**) (**٥٢**) مەبەست ئەوەتە ووشەی مورید بۆئەوانەتە کە ویستیاری خوا، وەنزیك‌بونەوە لەخودا وە ڕەزامەندیی خودان.

لەتەصەووف‌دا ئەم موریدی‌یە، هەرچەن هەر هەمان‌شتە، بەلاّم شێوەیێکی تایبەت ئەگرێتەخۆی، هەروەکو (**طالب**) بەداواکارو ویستیار ئەڵێن، بەلاّم لەروانگەی نەریتی خوێنەواریی ئەمرۆوە، خێرا ئەزانرێ بە «**تەلەبە**»ی مەکتەب‌و دانشگا ئەڵێن، لەنەریتی صوفیەتیشدا هەرکەوترا (**مورید**)، بەو «**تەوبەکار**»ە ئەڵێن خوا هیدایەتی داوەو تۆبەی‌کردوەو لەسەری‌نەریتی تەصەووف سەرگەرمی خواپەرستی‌یە،.

موراد، هەوەکوتمان بەداوا کراوو بەکەسێ ئەلێن خواستبێتیان، «**داخوازکراو**»، بەلاّم لەروانگەی تەصەووفەوە ئەمیش واتایێکی تایبەتی بۆخۆی تەرخان‌کردوە، وەبریتی‌یە لەو تەوبەکارو سەررێی «**استقامەت**» کەوتوەی، کەخواخۆی خۆشی ئەوێت‌و خۆی ئەیکێشێ بۆلای‌خۆی. جائەمە هەموی‌پێغەمبەرەکان ئەگرێتەوە چونکە هەمویان خواخۆی هەڵی‌بژاردوون، وە هی‌وایان‌بوە هەرلەمناڵی‌یەوە بونەتەپێغەمبەر، سەبارەت بەگەورەپیاوانی تەصەووفیش، زۆریان هەیە (**موراد**) بون،

وەکوئیبراهیمی ئەدهەم، ئەوئەمیرێك بو بۆراوئەچو، چی دەنگێ هاتەگوێی دووجار لەسەری یەك پێی گوت ئیبراهیم تۆبۆئەمە دروس نەکراوی، ئەویش کەخۆی سەردارو فەرمان‌رەوابو هەر لەودەشتەدا پۆشاکەکانی خۆی دەرهانی، دایە شوانێك وەسپاڵەکانی ئەوی‌کردەبەرو سەری‌خۆی هەڵگرت، وەژیانی خۆی لەشامو لەمەدینەدا بەخواپەرەستی‌بردەسەر، وەبویە یەکێ لەگەورەپیاوانی تەصەووف.

(**صائب**)شاعیرێکی ئێرانی‌یە سەبارەت بەم مەقامەی ئیبراهیم ئەلی :—

زُ ابراهیم ادهم پرُس قدر مُلكِ درویشی
که طوفان‌دیده از آسایش ساحل خبر دارد

واتە عەزەمەتی پادشایی دەروێشی، لەئیبراهیمی ئەدهەم بپرسە واتە ئەو خۆی هەم لەم‌لا خاوەن دەسەلاتەو هەم‌لەولا فەرمان‌رەوابوە، جائەڵی ئەوەی‌کەلافاو (**بردویەتی**) ئەو لەهەموکەس زیاتر قەدری وشکانیی ئەزانێت. کەواتە مورید ئەوەتە خوای‌ئەوێت موڕادیش‌ئەوەتە خوا ئەوی‌ئەوێت، بەلام ئەوەتە لەناوی کوردەواری خۆمان‌دا بەهەڵە ئەڵین موریدی فلان‌شێخە، ئەمە مەگەرجۆری بگونجێ، واتە، لەودەستە خواویستانەیە، کەبە مامۆستایی‌و ڕێبەرایەتی فلان شێخ، سەرگەرمی خواپەرستین، وەسەرگەرمی سلوکی تەریقەتن، «**واتە گرتنەبەری ڕێگەی تەسەوف**»، ئەوە شیاوەو دروستە ئەگینا دروست‌نیە، چونکەموریدئەبێ‌موریدی خوابێت نەك موریدی‌شێخ. جائیستە دێینەوە سەری باوەڕو شی‌کردنەوەی برێ لەکەلەمەردانی ئەم ڕێگایە بزانین ووشەی موریدوموراد چۆن لێك‌ئەدەنەوە.

لەکتێبی (**الفاظ الصوفیة**) دا، ئەڵێت موریدی ڕێگەی تەصەووف، ئەبێ خۆی دورخاتەوە لەوکردەوە ناشیرینانەی کە لەووبەر لەسەریان‌بوەو پی‌یان‌راهاتوە، وەئەبێ‌دەس لەویستی «**نەفسی‌ئەممارە**»، هەڵگرێت، وەبەهەمو دڵ وگیانێکەوە ڕووبکاتە هەق، پاشان‌ئەڵێ کەواتە «**ئیرادە**» بناغەی خۆشەویستی‌یە، وەمورید کاتێ موریدە ئیرادەکەی پاك‌بێت وە ئەم ویستەپاکەش کاتێ ئەبێ، کە دڵ‌پاك‌کرابێتەوە لەهەمو خەوشێك، هەروەکو زوترباسمان‌کرد دڵ‌پاك‌کاتەوە لەپێناسی‌ناپەسەند وەناشیرین، وە بیرازێنێتەوە بەپێناسی‌پەسەند.

ئەم ، لێرەدا شتێك ئەڵێ ، ئەویش هەرشیاوی لێك دانەوەو وردبونەوەیە ، ئەڵێ ئەوکەسەی توانی ئەم کارەبکات ئەوە خۆی مورادە ، مادام خوابۆی کردوە ئەم دەس کەوتەی دەس کەویّت مورادە ، وەپاش ئەوەی کەگەیشتەئەم پایەی پاك کردنەوەو رازاندنەوەو دامەزراندنە ، ئیتر خوا نزیکی ئەکاتەوە لەخۆیو ئەیخاتە ژێری سێبەری رەحمەتی خۆی وەدەروی خەیری لیّ ئەکاتەوە ، وەخەڵاتی ئەکات بەو خەڵاتانەی رێبوارانی رێ رەوی تەسەووفی پیّ خەڵات ئەکریّ ، وە نهێنی وای لەجیهانی مەعنەوی بۆدەرئەکەویّ کەخوا بەشیاوی ئەوانەی بزانێت .

پاشان ئەڵیّ ئەو لە خەبات کاری لەدژی خواستە ناپەسەندەکانی دەرونا موریدبوە ، ئیستەش کەخوا ئەیخاتە بەری کەرەمی خۆیەوە مورادە .

پاشان ، لەکتێبی «غونیە» کەهی حەزرەتی شیخ عبد القادری گەیلانیە ئەگێرێتەوە ئەڵیّ .

موریدخەبات کارە بەڵام موراد خۆش بەختێکە کە خوا بەختەوەری ئەکات موریدبەپیادە ئەروات ، موراد بال ئەگرێتەوە ، **«موريد طالبه» «موراد مطلوبه»** وە زۆرشتی تری لەم بابەتەی کە دەری ئەخا ، موراد ئەوکەسانەن کەجەذبەی هەق رایان ئەکێشیّ وەموريد ئەوانەن خۆیان تیّ ئەکۆشن وە بەو تیّ کۆشانە ئەگەنە هەق. **«ئەوی شیاوی باسە پاش ماوەیێك لە (سلوك)»**، واتە تێکۆشان، بەپیّ دابی تەصەووف، هەردولا خۆیان بۆیان روونە کیّ موریدەو کیّ مورادە .وە ئەمە زۆر ئاشکرایە، لە باسی جەذبەیشدا وتم، جەذبە هی مورادە، واتە بگرە خۆی لەخەیاڵی هیچێکا نەبێت وەخوارای کێشیّ هەروەکو ئەوەی ئیبراهیمی ئەدهەم.

لەخوێندنەوەی ژیانی سەرۆکی تەریقەتەکان وەپیاوە هەرەگەورەکانی تەصەووف دا، دەرئەکەویّ، کەهەمویان یان زۆربەیێکی زۆریان، مورادبوون.

لەکتێبی **(معجم مصطلحات الصوفيه)** دا ئەڵیّ.

موریدئەوکەسەتە بەتەواوی لیّ برابێت بۆ خواپەرەستی وە ئەم لیّ برانەشی لەسەری چاوکراوەیی و تیّ گەیشتن دەستی دابێت، بۆی دەرکەوتبیّ ئەوەی لەم جیهانەدا روو ئەدات بەپیّ ویستی خوا روونادات ، نەك بە ویستی کەسێ تر ، بەم جۆرە

ویستی خۆی «إرادە»ی خۆی ئەنێتەلاوە وەئیرادەی‌دێرێتەسەری ئیرادەی هەق، وەئەبێتە **«مورید»**، واتە موریدی ئیرادەی‌خوا.

هەرئەم‌سەرچاوە سەبارەت بەموراد ئەڵێت.

موراد: ئەوخواناسەتە ئیرادەی نەماوە وەگەیشتوەتە دواپلەی خواناسی، وەلەهەمو حاڵ‌و مەقامێك تێ‌پەریوە وەهیچ‌ویست‌و ئیرادەیێکی نەماوە.

ئەوەی‌ئەوێ، خوائەیەوێ، خوایش ئەوەی لەگەڵا ئەکات کە خۆی ئەیەوێ. لەکتێبی **«التَّعَرُّف لِمَذْهَبِ اَهْلِ التَّصوف»** دا ئەڵێت.

مورید هەر خۆی مورادە، مورادیش‌موریدە، چونکە ئەوەی خوای ویست ئەوەی ئەوێت کەخوائەیەوێت، پاش‌برێ لێك‌دانەوە ئەڵێت.

بەڵام ئەوەی‌هەیە، مورید بەوەئەڵێن کە، کەشفوکەراماتی ئەکەوێتە پاشی خەبات‌وتێکۆشانی، بەڵام موراد، کەشفوکەراماتی ئەکەوێتە پێشی خەبات‌و تێکۆشانی، **«کەواتە باوەری ئەمیش هەروەکو باوەرەکانی‌ترە»**، موراد ئەوکەسەیە خوا هەڵی‌ئەبژێرێت، پاشان‌ئەڵێ، موراد خوا خۆی بەجەذبەی قودرەت رای‌ئەکێشێت بۆلای‌خۆی، وەشتی‌نهێنی مەعنەوی‌و دەرونیی بۆئاشکرا ئەکات، وەهەرئەم **«شوهودە»**، واتە چاوپی‌کەوتن‌و بۆروون‌بونەوە، ئەبێتە هۆی دڵ خۆشی‌و تێکۆشانی بۆگەیشتن‌بەخوا، بەچەشنێ کەبتوانێ هەرچی رەنجی ئەو رێگەیە هەیە بە دڵوگیان قوبوڵی‌کات.

جا ئەڵبەتە مەرجەکانی مورید هەروەکو لەپێشاوتم زۆرە بەرلەهەموی پاکی‌دڵ‌ودەرون‌و ئیرادەی‌تەواو بۆسەرکەوتن، وەتێکوشان وەبەردەوام‌بون لەسەری ئەوتی‌کۆشانە، واتەئەوخواپەرستی‌یە، وەیەکێ لەشتەبناغەییەکان، بەتایبەت بۆ ئەوماوەی سلوکە، کەم‌خواردن، کەم‌نوستن، وە کەم‌قسەکردنە، گۆشەگیری‌و خواپەرستیی‌بەردەوامە، بەتایبەت بەردەوام‌بون لەسەری ذیکر، وە خۆتی‌نەگەیاندن لەشتێکدا پەیوەندی‌راستەقینەی بەوەوەنیە، لەهەموی‌گرنگ‌تر بەدەس‌هێنانی رێبەرو مامۆستاو رێ‌پێشاندەرێکە، بەوجۆرەی زوتروتم، کەبەراستیی رێ‌بەربێت، نەك **«رێ‌بڕ»**، جا یەکەم‌شتیش بۆئەوموریدە سەبارەت بەرێ‌بەرەکەی، **«ئەدەب»**ە. برێك

باوەڕیان لەسەری ئەوەتە، «**ئەصلەن تەصەووف هەرئەدەبە**»، پاشان ڕاستگۆیی و وە، وەئیخلاص، سەبارەت بەوموورشیدە باشە، پاشان «**إستقامەت**» واتە بەردەوام بون وەزۆرشتی تریش کەلەماوەی نوسینەکانا دەرخراون.

«**قوشەیری**» لە «**ریسالە**»دا بەدوورودرێژی وتاری گەورەپیاوان سەبارەت بەوشەی موریدومورراد باس ئەکات، لەشوێنێکا ئەڵێ لە ئەباعەلی دەققاقم بیست، ئەلی (**ئیراد گرێکە لەناوی دلا، وە کزەوچزەیێکە لەدەرونا، وەعیشقێکەلەویجدانا دڵەخورپەیێکە لەناوەوەی مرۆڤدا، وەئاگرێکەولەدڵودەرون بەرئەبێت**)، «**بەڵێ ئیرادەی موریدیڕاست ئەبێ ئاوابێ**» لەزمانی جونەیدەوە ئەڵێت، ئەگەر خواویستی چاك بکات بو (**مورید**)، ئەیخاتەسەری ڕێگەی تەصەووف، وەئەیکاتە هاوەڵی هەژاران.

لەزمانی، ئەبابەکری دەققاقەوە، ئەڵێت، مورید نابێتە مورید تاوەکو مەلائیکەی سەری شانی چەپی بیست ساڵ لەسەری یەك هیچی لەسەر نەنوسێت، بەپێی ئایەت بۆهەرمرۆڤێ مەلائکەی تایبەت هەن چاکەوخراپەکانی ئەنوسن، بێگومان باوەڕ بەمەلائکە لەمەرجی «**ئیمانە**» ئیتر چۆنیەتی مەلائکە هەرخواخۆی ئەزانێ چیەوچۆنە لەئایەتەکانی «**١٠و١١**» سورەی«**انفطار**» دا ئەفەرمێ «**وإنَّ عَلَيكُمْ لَحافِظِينَ كراماً كاتبين**» مەلائکە وان لەگەڵتانا وەچاکەوخراپەتان یادداشت ئەکەن،جائەڵێ دەققاق وتویە ئەبێ موریدی ڕێگەی خواناسی، واتە تەصەووف ئەوەندەپاك بێت بیست ساڵ مەلائکە گوناەنوسەکەی هیچی لەسەرنەنوسیبێت بەڵێ موریدی ڕێ هەق ئەبێ وابێت، خوهەروا بە «**دەمبر**» ناکرێت.

قوشەیری، پاشان باوەڕی خۆیشی سەبارەت بەفەرق لەنێوانی موریدو مورادا دەرئەبڕێ، ئەویش هەر ئەڵێت هەرلەسەرەتاوە خواویستویەتی وابێت، زۆربەی ڕێبوارانی پاش خەبات و تێکۆشانێکی زۆر جا پێ گەیشتون وە زۆریشیان هەیە هەرلەسەرەتاوە خوا پەردە لەسەری دڵیان لائەبات و بەرچاوی دڵیان کەشف ئەبێت وەزۆر شتی گرنگیان لەنهێنی یەکانی جیهانی مەعنەوی بۆدەرئەکەوێ، وە ئەگەنە پایەو مەقامی وا ڕیازەت کیشان و خەبات کارانی ناگاتێ بەڵام هی وایشیان هەیە لەم«**مورادانە**» لەگەڵی ئەوهەموە پێش کەوتن وخەڵات و بەراتەشا، هەرخۆیان ئەیانەوێ ڕیازەت بکێشن بۆئەوەی لەو بەرهەمانەی دەستی ڕیازەت کێشان ئەکەوێ، لەوانەش بەرخوردار بن.

پاشان سەرلەنوێ لەزمانی «**ئەباعەلی دەققاق**»ەوە، بەراوردێکی سەیرئەگێڕێتەوە، ئەویش، **فەرقە** لەنێوانی پێغەمبەرەکانا، وەئەڵێ لەناوی ئەوانیشا (**هەرچەن هەمو مورادن**) لەگەڵ ئەوشا، مورادو موریدهەیە، لێرەدا **قامك** ڕائەکێشێ بۆ «**شەرحی صەدری**» موساوموحەممەد درودیان لەسەر، ئەڵێ حەزرەتی موسی لەخوا پاڕایەوە وەفەرموی «**رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي**»، کەچی سەبارەت بە حەزرەتی موحەممەد، خوافەرموی «**أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ**»؟.. ئەم بەبێ داواکردن بەڵام ئەوپاش داواکردن موحەممەدبەمناڵی موسی پاشی بەپێغەمبەربوون، لەپاشان باوەڕیان لەسەری ئەوەتە موراد ئەبەن مورید ئەڕوات موراد دەعوەوت ئەکرێ مورید خۆی ئەڕوات، کەواتەپێش کەوتنی موراد زووترە لەمورید، بەڵام لەئاکاماهەردولا بەمرازئەگەن.

٢

۩

تەریقەت لە دابو نەریتی تەصەووف دا بە ڕێبازێ ئەڵێن بەشێوەیێ لە شێوەکانی تەصەووف ڕێبوار بیگرێتە بەر بۆ گەیشتن بەئامانج، ئەو ئامانجەش بریتی‌یە لە ئیمانی تەواو واتە «**عین الیقین**، **یان**، **حق الیقین**» سەبارەت بەخواناسی‌ی، بەرهەمە دوایی‌یەکەیشی ئەوەتە ئیتر صوّفی بە باوەڕێکی یەقینی‌یەوە خوا ئەپەرستێ، ئیمانەکەی تەقلیدی یان عیلمی نیە کەشیاوی تەکان خواردن بێت، وە چونکە بەچاوی بەصیرەت بە نوری خودا سەرئەفراز بوە ئیتر هیچ هێزێ نیە بتوانێ کاربکاتە سەری باوەڕی،... ئیمامی ڕەببانی لە «**مەکتوبات**» دا ئەفەرمێ، جیاوازیی لەنێوانی زانیاریی عولەما و زانیاریی مەشایخی تەریقەتدا ئەوەتە مەعریفەتی عولەمابەهۆی ئیستیدلال وە عیلمەوەیە وە مەعریفەتی مەشایخ لەڕێگەی کەشف وە ذەوقەوە وە هەردوکیشی بۆ پەیرەوی‌یە لە شەریعەتی موحەممەدیی.

برێ لە هەڵکەوتوانی تەصەووف ئەوەندە لەو دانشەدا وە لەو بەرهەم وەرگرتن وە خاوەن مەقام بونەدا گەیشتونەتە پایەی هەرە هەرە بەرزەبونەتە کارناس و پسپۆڕ، واتە «**موجتەهید**» هەروا کە لەعیلمی شەریعەتدا گەورە پیاوانێکی وەکو، ئیمام مالیکی کوری ئەنەس «**٧١٥ - ٧٩٥**»م وە ئەبوحەنیفە «**٦٩٩ - ٧٦٧**»م **وە محمد بن ادریسی شافیعی** «**٧٦٧ - ٨٢٠**»م وە احمد بن حنبل «**٧٨٠ - ٨٥٥**»م وەبرێکی‌تر لەو گەورە پیاوانە بونەتە موجتەهید لە زانیاریی شەریعەتدا، هەروایش لەزانیاریی تەصەووفدا هەڵکەوتوانێکی وەکو شێخ مەعروفی کەرخی، وە بایەزیدی بەسطامی، وە ذالنونی میصری وە عبد القادری گەیلانی، وە ئەحمەدی بەدەوی وە ئەحمەدی ڕیفاعی، وە بەهائوددینی نەقشبەند، وەعومەری سەهرەوەردی، وە ئەبولحەسەنی شاذلی، وە نجم الدین الکبری وە جەلالەدینی ڕۆمی، وە موعینەدین حەسەنی چەشتی، وە ئەبولعەبباسی تیجانی، وە دەیان لەو هەرە پایە بەرزانە بونەتە خاوەنی تەریقەت، واتە خاوەنی ڕێڕەوی تایبەتی پەروەردەکردنی ڕێبوار بۆ گەیاندنیان

بە لوتکەی مراز، واتە: هەر کامەی بۆ گەیاندن بۆ ئەو سەرلوتکەیە ڕێگاییکی تایبەتی دۆزیوەتەوە وە کەوتوەتە بەردەمی ڕێبوارە کان بۆئەوەی بیان گەیێنێتە مراز، ئامێرو تۆشەی هەموی ئەمانە هەر لەیەك شت دروست ئەکرێت، بۆ نمونە، ئێمە هەرلەگەنم، دەیان جۆر نان دروس ئەکەین، لە برنج وە دانەویلەو گوشت صەدان جۆر خۆراك وە خواردەمەنی دروس ئەکەین کە هەموی هەر بۆ خواردنە هەمویشی بۆ خۆشی‌و تێربون‌و هێزی لەشە کەچی هەرکامەی تام‌و بۆن‌و ڕەنگێکیان هەیە، وەکوتریش هەمویان یەك شتن وە ئاکام‌و نەتیجەی هەمویشیان هەریەك شتە، واتە، تێربون، لەذەت لەخواردن بردن، بەهێزکردنی لەش.

هەروەها مەذهەبە شەرعی یە کانیش هەموی بۆ دامەزراندنی دین وە ڕێك‌و پێك کردنی خواپەرستی وە هەوڵ دانە بۆ پەیرەوی کردن لە دەستورو فەرمانی خوداو سوننەتی پێغەمبەر.

تەریقەتە کانیش هەر هەوڵە بۆ کامڵ کردنی باوەر وە گەیاندنی ڕێبوار بەباوەری «**عين اليقين**» وەکوگوتمان بۆ ئەوەی خواپەرستی یەکەی لەتەك ئەوەدا کە خوا پەرستی یەو پەیرەوی کردنە لە شەرع بە یەقینێکی تەواوەوە ئەنجام بدرێ وە دەرون باشتر سوکنایی بێت وە دڵی باشتر ئاو بخواتەوە وە بەهەمو هەستێکەوە هەوڵ بدات بۆ نزیك بونەوە لەخودا.

جا تەریقەتی نەقشبەندی، یان ڕێبازی نقشبەندی یەکان بۆ سەرکەوتن بەکێوی ئاوات دا بۆ گەیشتن بەو هەوارگەی مرازە، داب‌و نەریتێکی تایبەتی خۆی هەیە، وەکو ئەوەی بلێین قادری یەکان ذیکری بەدەنگی بەرز ڕەوشیانە. مەولەوی یەکان شیعر خوێندنەوەو ذیکرو ڕەقصی تایبەتی خۆیان هەیە، کە هەرکامەی سەر زەنجیرەی تەریقەتەکە بۆی داناون، هەروەهایش نەقشبەندی یە کانیش ذیکری تایبەتی خۆیان هەیە، کەواتە هەمووی هەر ذیکرو خواپەرستی‌و تێکۆشانە بۆ نزیك بونەوە لەخودا، بەلاّم هەرکامەی بەشێوەی تایبەتی خۆی، شێوەیێ کە موجتەهیدە پسپۆرە کەیان بۆی داناون، واتە ئەورێبازەی کە خوا خۆی هیدایەتی داون بۆ دۆزینەوەی «**وَاتَّقُوا اللهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللهُ**» «**البقرە**» «**٢٨٢**» «**وَالَّذِينَ جاهدوا فينا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنا**» (**عنكبوت**) «**٦٩**» جا خوا خۆی ئەو گەورە پیاوانەی خستوەتە سەری ڕێگاییك وە بەهۆیەوە گەیشتونەتە مراز، ئەمانیش ئێستە ئەو ڕێگایە پیشانی موریدەکانیان ئەدەن، یان وەکو پزشکێك

دەرمانێك بۆدەردێك بدۆزێتەوە كە نەخۆشەكانی خۆیی پێ دەرمان كات، ئەمانیش پزیشكی دەرونن دەرمانێكی دۆزیوەتەوە یان تێكۆشەرێكە هەڵزنیوە بەشاخی ئاواتی خواپەرستیدا وە لەو رێبازەوە كە خۆی گەیشتوە بەئاوات خەڵك لەوێوە راهنمایی ئەكات كە بیان گەیێنێتە مراز.

بێگومان هەموی ئەم رێبازانەش سەرچاوەیان ئەگەرێتەوە بۆسەری گوفتارو كرداری خانەدان وەیارانی پێغەمبەر كەسەرچاوەی هەموی ئەوانیش قورئانەو پێغەمبەر، هەروا كە سەرچاوەی شەریعەتیش پێغەمبەرەو قورئان.

گوتمان شەریعەت وە تەریقەت فەرقیان‌نیە ئەوە هەیە صوفی بەهۆی ذیكرو فیكری زیاترەوە دەرونی روناك ئەبێتەوە ئیمانەكەی ئەبێتە «عين اليقين» **جا بەو دەرونە روناكەوەو بەوباوەڕە بتەوەوە موبەمو شەریعەتەكە ئەباتە رێگاوە، هەر صوفیێك موێی لەرێگەی شەرعو سونەت لای‌دا، تەریقەت لەوكەسە خۆی بەری كردوە.**

**پاش ئەم پێشەكییە ئیستە بابزانین**

**١ - نەقشبەندی‌یەكان لە چ رێبازێكەوە خەڵك ئەبەن بۆ لوتكەی ئاوات؟**

**٢ - سیلسیلەی واتە، زەنجیرەی ئەم رێبازە چۆن دەس پی‌ئەكات وە گەورە پیاوانی تا ئەگاتەوە سەری باوكم، واتە «شێخ عەلادینی‌بیارە» كێن؟**

٣ - بۆچی وە لەكەیەوە ئەم رێبازە ناونراوە **(نەقشبەندی)؟**

بەر لە وەڵام دانەوەی پرسیارەكان هەر بۆ روون كردنەوەی بیری خوێنەرانی ئەم‌كتێبە یەك‌دو فەرمودەی گەورەپیاوان هەیە ئەمەوێ پەنجەیان بۆراكێشم، جا دەست بكەمە وەڵامی پرسیارەكان.

شاە عبد اللّٰە‌ی دهلوی كە لە «١٢٤٠» كۆچی‌دا فەوتی كردوە ئەڵێ، بەرهەمو دەست‌كەوتی ئەم تەریقەتە بریتی‌یە لە بەدەست هێنانی ئاگاداریی‌و حوزوری هەمیشەیی لەحوزوری هەق تەعالادا لەگەڵی دامەزرانی ئیمانی كامیل بەپێی باوەڕی ئەهلی سونەت‌و جەماعەت وە پەیڕەوی كردن لە سونەتی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر.

محمد بن سەلمانی بەغدادی لەکتێبی «**الحديقة النّديّة**» دا لەزمانی «**محمد مراد ئوزبەکی**» یەوە ئەڵێ «**ان الطريقة النقشبندية طريقة الصحابة الكرام (رض)** باقية على اصلها لم يزيدوا ولم ينقصوا. وهي عبارة عن دوام العبودية ظاهرا وباطنا بكمال الالتزام بالسنة والعزيمة وتمام اجتناب البدعة والرخصة في جميع الحركات والسكنات من عادات ومعاملات. مع دوام الحضور مع الله تعالى على طريق الذهول والاستهلاك».

هەروەها لەم کتێبەدا لەزمانی «**ابن الحجر الهيتمي**» (**٩٠٩ - ٩٧٤**) ڵە یەوە ئەڵێ «**الطريقه العلية السالمة من كدورات جهلة الصوفية هي الطريقة النقشبندية**».

نوسەری کتێبی قودسیە لەپێشەکی چاپی کتێبەکەدا ئەڵێ تەصەووفی نەقشبەندی پەیرەوی کردنە لەسوننەت وە «**موعتەدیلەو ناوەراست رەو**» پەیرەوی کردن لەسوننەت وە پاراستنی رەوشی شەریعەت وەدووری گرتن لە بیدعەت بناغەی ئەم تەریقەتەیە، لەپاشان ئەڵێ ئەم ناوەندیی رەوی وە پەیرەوی کردن لە شەریعەتە، وە ئاسانی و سادەیی سلوکە، بویە هۆی رەواجی لەرادە بەدەری ئەم تەریقەتە وەبویە هۆی ئەوەی زۆرێکی یەجگار زۆر لەعولەمای دین ببنە پەیرەوی ئەم تەریقەتە وە بێنە کۆری نەقشبەندییەکانەوە، صوفی نەقشبەندی، دڵی هی خودایەو لەشی هی مەردومە.

بەراستی ی هەموی گەورە پیاوانی ئەم رێگایە هەر کامەی کەسەبارەت بە ناساندنی ئەم تەریقەتە باسیان کردوە، هەموی ناساندنەکانیان دێتەوە سەری پەیرەوی کردن لە سوننەت وە بەردەوام بون لەسەری ذیکر وە فەقرو هەژاریی و بەندەیی لەدەرگای خوادا وە دڵ گەرم کردنی پەیرەوانیان لەسەری «**ایثار**» وە «**نوکرانی ذات**» واتە خۆ بەخت کردن لەرێگەی خۆش بەخت کردنی موسوڵمانانندا. وەبۆ ناسینی خودای گەورە.

ئیستە لەوەلامی پرسیاری یەکەمدا ئەڵێین. لەکتێبی «**ایضاحُ الطرّيق**» دا ئەڵێ نەقشبەندییەکان لە سێ رێبازەوە ئەتوانن بگەنە سەری لوتەی مراز.

١ - بەردەوامبون لەسەری ذیکر.
٢ - لە رێگەی موراقەبەوە.
٣ - لەرێگەی دەستەو داوێنبونی مورشیدەوە.

لێرەدا پێویستە بڵێم یەکەم هەنگاوی تەصەووف بەر لە هەموشتێ تەوبەکردنە،

بەو مەرجانەی کە زووتر باسمان کرد ، واتە ، دەست لەهەمو خراپەیێك هەڵگرتن وە نەگەڕانەوە بۆسەری خراپەکردن ، لەپاشان پەیڕەویی کردن لە دەستوری قورئان‌و سوننەتی موحەممەدی

١ – ذیکر :

ذیکر خۆی دووجۆرە .

أ : ذیکری «**الله**» واتە ذیکری «**ذات**» یان ذیکری جەلالە .

ب : ذیکری «**لا اله إلاالله**» ، واتە «**نەفیو ئیسبات**» ، «**لااله**» نەفیە «**إلاالله**»ئیسباتە کەیەتی .

ئەبێ ئەوەش بزانین ذیکری نەقشبەندییە کان ، ذیکری «**خەفی**»واتە ، بێدەنگە ، کە بەخەیاڵ لە دەروندا ئەنجام ئەدرێت .

أ : ذیکری «**الله**» .

باشتروایە دەست بەدەست نوێژەوە بێ لە شوێنێکی خاوێنو بێدەنگا ڕووەو قیبلە دانیشێ ، پاش پاڕانەوە لەخودا بۆ سەرکەوتن وە پاراستن لەدەستی نەفس‌و شەیتان وە وەسواس ، وە پاش «**أستغفرالله**» کردن ، وە ئەگەر مورشیدی هەبو ، یادێ لە مورشید کردن ،..بە دەرون دەست بکاتە ذیکر کردن ، ئەگەریش هەموی ئەم مەرجانە ، یان یەکێکی دەستی نەدا مانع نیە هەرجۆرێ بۆی ڕێك کەوێ ذیکری خۆی بکات ، چونکە ذیکر لەهەمو کاتێکا ئەکرێ ، لەدەرە‌یان لەماڵ ، بەتەنهایی یان لەناوی خەڵکا ، هەروەکو کە خوا ئەفەرمێ :

«الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وقعوداً وعلى جنوبِهِم وَيَتَفَكَّرونَ في خلقِ السمواتِ والارضِ»«**ال عمران**» بەڵام ئەگەر بەو مەرجانەی بێت کە گوتمان ، بەتایبەت بۆ تازەکار ، ئەوە باشترە.

ئەو موریدەی دانیشت بۆ ذیکر، کاتێ ویستی دەست پێ بکات، زوانی

ئەچەسپێنێ بە عاسمانەی دەمیەوە بەجۆرێ کەهیچ تەکان نەخوات، زوتریش لەم بارەوە باسم‌کردوە، ئەمە بۆئەوەتە زوان سەر نەشێوێنێ لە دەرون، وە دەرون ناچاربکرێت خوو بگرێت بە ذیکر کردنەوە.

جا بەدڵ دەست بکاتە «الله» گوتن: دڵ بریتی‌یە لە لەطیفەیێك لە لەطائفی دەرون ئەو دڵە گۆشتینە نیە بەڵکو وا لەو شوێنەدا، والەژێری مەمکی چەپەوە رووەو تەنشتی چەپی مرۆڤ بەئەندازەی دوو پەنجە، جا بەزمانی ئەو دڵە ئەڵێ «الله» بەلاّم ئەبێ مەفهومی الله لەپێش‌چاو بگرێ نەك شێوەی نوسینی الله، یان خوانەخواستە هیچ جۆرە شێوەو شکڵێ، چونکە خوای گەورە هەروەکو خۆی ئەفەرمێ (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ)، ئەبێ هەر لەو کاتەدا باوەڕی لەسەری ئەوەبێت کە خودا مەوصوفە بەهەمو وەصفێکی کەمال وە (مونەززەهە)، واتە دورە لە هەمو «نەقصێ» واتە، ناتەواوی‌یێك،.بەفارسی بەم حاڵە ئەڵێن «بەرداختێ وجودێ ذیهنی» واتە ورد بونەوە لە وجودێك کە لەزیهنی خۆتا بۆخودای دائەنێیت، وە نابێ لەم کاتی ذیکرەدا، نە زمان وە نە لەش جوڵە بکەن ئەبێ شەووڕۆژ ئەوەندە لەسەری ئەم‌ذیکرە بەردەوام بێ تا ئەودڵەی دەست ئەکاتە ذیکر وە ئەوکەسە خۆی هەستی پی‌ئەکات،جا کە دڵ دەستی‌کردە ذیکر ئیتر ئەڕۆی بەسەردەمی لەطیفەی ڕۆحەوە کە وا بەوبەری دڵەوە واتە لەژێری مەمکی ڕاستا بە دوو پەنجە رووەو تەنشتی ڕاست، ئەویش هەر بەوجۆرە ئەوەندە ذیکری پی‌ئەکا تا ذاکیر ئەبێت، پاشان لەطیفەی سیرر کە وا لەم‌دیوی مەمکی چەپەوە نۆزێ لای ژوری مەمکەوە بەروی ناوەڕاستی سینەدا بە دوو پەنجە، پاشان نۆرەی لەطیفەی خەفی‌یە کەوا لە لای ژۆروی مەمکی ڕاستەوە ڕووەو ناوەڕاستی سینە بە دوو پەنجە پاشان بە لەطیفەی ئەخفا «اخفى» دەست ئەکاتە ذیکر کە ئەکەوێتە ناوەڕاستی سینەی مرۆڤەوە واتە ناوەڕاستی هەرچوار لەطیفەکەوە.

کاتێ کە سەیری کرد هەرپێنج لەطیفەکانی دەسیان کردە ذیکرو هەرکامەی بەجیا بۆخۆی چراێکی تیا هەڵکرا وە هەرکامەی بەنوری تایبەتی خۆی ڕووناك بونەوە ئەوکاتە بە لەطیفەی نەفس دەست ئەکاتە ذیکر، لەطیفەی نەفس ئەکەوێتە ناو چاوانی مرۆڤ وە لەجنس‌و ڕەگەزی ئەمان نیە، چونکە لەطیفەی نەفس هی عالەمی خەلقەو سەر بەتەبیعەت‌و ماددەیە وەئەوان هی عالەمی ئەمرن وە شتێکی مەعنەوی‌یە، مەگەر ئەو ڕێبوارانە خۆیان هەستی پێ بکەن، من زوتر باسی لەطائفم

کردوه ئیستە دوبارەکردنەوەی پی‌ناویَ پاشان نۆرەی لەطیفەی «**قالبیه**» یە واتە، هەموی لەش،کە لە ماددە،واتە لە (**عەناصر**) دروست‌بوە، بە هەموی لەش بەتێکرایی ئەوەندە ذیکر ئەکات تا ذەررە ذەررەی لەشی بەجارێکا دەست‌ئەکاتە ذیکر وە ئەوکەسەش خۆی زورباش هەستی پی‌ئەکات.

بریَ لەنوسەرانی کتێبی تەصەووف لە نەقشبەندی‌یە کان وەکو مەلا حامیدی بێسارانی‌ی ئەڵێن هی‌وا هەیە لەشەوو رۆژێکا بیست‌وپێنج هەزار جار ذیکر ئەکات لای‌کەمیشی پێنج هەزار جار، بەم چەشنە دیمان پێنج قۆناغ دانراوە بۆ ذیکری لەطائفی عالەمی ئەمر، وە دوو قوناغ بۆ لەطائفی عالەمی خەلق، کە ئەبێتە حەوت قوناغ، یان حەوت هەنگاو. سەبارەت بەم حاڵەتە ئیامی رەببانی‌ی ئەفەرمی‌«**ئەم رێبازەی ئێمە حەوت هەنگاوە**».

ئەوەش کەبرێکیان بەکینایە فەرمویانە، تەریقەت دوو هەنگاوە، ئەو دوو هەنگاوەی عالەمی ئەمرو عالەمی خەلقە، گوتمان بەهۆی بەردەوام بونەوە لەسەری ذیکری ئەم حەوت لەطیفەیە موبەمو وە ذەررە ذەررەی جیسم «**الله**» ئەکات، وەمورید لەم کاتەدا هەست بەئاسایش وەلەطافەتێك لەدەرونی خۆیا ئەکات. بەم‌حاڵەتە ئەڵێن (**سُلطانُ الأذْكار**) یان‌«سلطانُ الذِّكر، جا ئەگەر مورید هەر لەسەری ئەم ذیکرە بەردەوام بو، وردە وردە ئەو ذیکرە لە خۆیەوە تەشەنە ئەکات ئەیتەنێتەوەو پەرە ئەسێنیَ تاوای لی‌دێت ئەوکەسە بەگوێی خۆی ئەبیسیَ کە تەواوی دنیا ذیکر ئەکات وە دەنگی «**الله**» لە ذەررە ذەررەی کەون ئەبیسیَ، بەم ذیکرە ئەڵێن ذیکری «**ماسیوا**»، واتە ماسوی‌الله هەرچی مەخلوقی خودایە ذیکرئەکات.

ئەم مەبەستانە لە شتە نهێنی‌و زۆر گرنگەکانی تەریقەتە، شیعرێکی حەزرەتی ضیاء الدین مان دی کە ئەفەرمیَ، «**لەطائف سەربەسەر موستەغریق ذیکری هو الله یە**»،ئەوە پەنجە راکێشانە بۆ ئەم حاڵەتە، لێرەدا مەبەستێکی زۆر گرنگ هەیە پێویستە بزانریَ ئەمیش ئەوەتە، ئەم حاڵەتانە وە ئەم دەس‌کەوتە گرنگانە هی سەرەتای کارە،وەهی ئەلف‌وبی‌ی تەصەووفە.

ئەم حاڵەتانە هی‌تەزکیە، واتە پاك‌بونەوەی لەطائفە، نەك (**فەنای**) لەطائف، ئەم

لەطائفە هەرکامەی فەنای خۆی هەیە جا کەهەموی فەنای بەسەرا هات پاشان بەقای بەسەرادێت وە لەم ماوەیەدایە ڕێبوار هەزاران نهێنی بۆ دەرئەکەوێ وە هەزاران دەس کەوتی مەعنەوی ئەکرێتە خەلاتی.

فەناو بەقای ئەم لەطائفە پاش «عوروج» واتە بەرزبونەوەو سەرکەوتن لەجیهانی ئافاق وەئەنفوس، دەس ئەکەوێ، وەکاتێ دەست ئەدات بگەنەوە بە «ئەصلی ئەصلی» خۆیان: کە لە مەرتەبەی وجوبدا بویانە.

بابگەڕێینەوە سەری ئەو مەبەستەی کە گوتمان هەر لەطیفەیێك پاش پاك بوونەوەی، وە کە ئیتر دەستی کردە ذیکر ڕووناك ئەبێتەوەو چرایێکی تیا هەڵ ئەکرێ، ئەوە شتێ نیە هەروا لەخۆمەوە بیڵێم بەڵکو بەراستی‌ی هەروایە، وە لەهەرکام لەو لەطائفەدا نورێکی تایبەتی خۆی هەڵ ئەکرێ کە ئەو ڕێبوارە خۆی هە، بەورووناکی یە ئەکات وە چەسپاوی بەصیرەت ئەبینی کە ئەوا لەطیفەی (دڵی) یان (سیری)، نوری تایبەتی ی خۆی تیا هەڵکرا هەروا کە نوری هەرکامەی جوێیە هەروایش جۆری بەرەکەت. وەبەواتەی( صوفی یەکان (نیسبەت) ی هەرکامەی دیارەو هەستی پێ ئەکرێ وە تامو مەزەو خۆشی‌و فەرەحی خۆی هەیە.
وە ئەوکەسە بەبۆنەی ئەم دەس کەوت‌و بەرەکەتەوە باوەری زیاد ئەبێ وە هەتادێت دڵگەرمتر ئەبێ لەسەری خواپەرستی یەکەی.

جگە ئەم نورو ڕوناکی یەش هەرکام لەم لەطائفانە وان لە ژێری قەدەم«پێ‌ی» یەکێ لە ئەنبایی ئولول‌عەزم‌دا، وە هەرکامەش لەڕێبواران «فەتح» واتە سەرکەوتن‌و پێش کەوتنی لەڕێگەی یەکێ لەو لەطائفەوە دەست ئەکەوێ. وە مەشرەبی مەعنەوی ئەو کەسەش وا لەسەری مەشرەبی ئەو پێغەمبەرە وە ئەو مامەڵە دەرونیەش هەمدیسان هەم لەمورشید وەهەم لە مورید وە هەم لەوانەی کە ئەهلی دڵن شاراوە نیە بەڵکو تەنانەت پاش مردنیش ئەگەر بڕۆنە سەری گۆری یەکتر ئەزانن ئەو گەورەپیاوە خاوەنی چ مەشرەبێ بوە بۆ نمونە ئەزانن (موحەممەدی مەشرەب) یان (عیسای مەشرەبە)، جا ئەم شتانەیە کەئەڵێن باوەری صوفی یەکان (عین الیقین)ە چونکە کەسێ ئەم شتانە بەچاوی بەصیرەت سەیرکات ئیتر چۆن ئیمانی کامل نیە وە ئاوا باوەرێ بەچی ئەکان

ئەخوات؟ ئێمە لەپێشا شوێنی لەطائفەکانمان دیاری کرد،بۆباسی ڕەنگی نورەکانیان وە هەرکامەی وان لەژێری قەدەمی کام «نەبی» دا ئەڵێین.

لەطیفەی دڵ والەژێری قەدەمی حەزرەتی ئادەمدا وە ڕەنگی نورەکەی **(زەردە)** ، لەطیفەی ڕۆح وا لەژێری پێی دوو پێغەمبەردا ، واتە لەژێری پێی نوح وە ئیبراهیم دا وەڕەنگی نورەکەی «**سورە**» ، لەطیفە سیرر وا لەژێری پێی حەزرەتی موسی دا وە نورەکەی سپی یە ، لەطیفەی «**خەفی**» وا لەژێری پێی حەزرەتی عیسی دا وە نورەکەی ڕەشە ، لێرەدا ئەبێ بڵێم ڕەنگە بپرسن چۆن نور ئەبێ ڕەش بێت بەلام ئەم نورە هەیە وەزۆر یش جوانە وەدڵی خاوەن دڵ ئەفرێنێ زورجار ڕەنگی موی سەر . یان چاووبرۆ کەڕەش بێت لەهەمو جوانیی یێ جوانترە منیش هەر ئەوەندە ئەتوانم تەشبیهی بکەم.

لەطیفەی «**اَخْفی**» ئەخفا، ڕەنگی صەوزەو والەژێری قەدەمی حەزرەتی «**محمد**»دا درودی خوا لەسەری هەمویان. ئەگەر مورشیدبو وا ئەومورشیدە هەر کە لەطیفەیێك لەو لەطیفانە کاری تەواوبو دەستور ئەدات بەرێبوار کە بگوێزێتەوە بۆ لەطیفەیێکی تر ، ئەوەی شیاوی باسە«لەطیفە»کە تەواو نورانی بو ، ڕەنگی ئەونورە لەسەری شانی ئەو موریدە بەرزئەبێتەوە هەم خۆی هەستی ئەکات هەم مورشیدەکەی.

سەبارەت بە لەطائف هەرچەن زوتریش گوتومە ، ئەتوانین لێك یان بدەینەوە بە «**حەواس**» واتە هەست پێ کەرەکان ، چۆن ئەمانە لە جیهانی ماددەو سروشتدا هەرکامەی دەورێ ئەبینێ ئەوانیش لەجیهانی دەرونی و مەعنەویدا هەرکامە سپاردەیێکی هەیەو دەورێ ئەبینێ وە هەستی تایبەت ئەکات.

جا لەپاشی تەزکی یەی لەطائف عالەمی ئەمر نۆرەی تەزکیەی نەفسەکەلەعالەمی خەلقە وە ڕەنگی نەفس . بێ ڕەنگی یە بڵێین وەکو ئاو وایە کە کرایە هەرشتی ڕەنگی ئەو ئەدات . بۆیە تەزکی یەو فێری ذیکر کردنی نەفس ، ئەخرێتە پاشی هەمویانەوە چونکە تەزکیەی نەفس سەختە ، هەم هی جیهانی سورشتە هەم لەبناغەشا **(امارة بالسوء)**ە- وە هەرچی هەستی چەوتی و لاڕێ یی و ڕێ گرییە لەنەفسەوە هەڵ ئەقوڵێ بەلام ذیکری خودا هەموی ئەمانە دائەمرکێنێ وە پاکیان ئەکاتەوەو ئەیانوەرزێنێ . بێگومان هەموی گەورەپیاوانی ڕەیڕەوی تەصەووف دوبارەی ئەکەنەوە کە ئەمکارانە بەبێ مورشید زۆر سەختە وە بوونی مورشید وە ماموستاو ڕێنوما هەموی ئاسان ئەکات ، بالێرەشا دووبارەی کەمەوە . کاتێ کە ئەڵێین مورشید مەبەست

کەسێکە شکی تیانەبێ کە وەلی بێت، خودالناس و لەخوداترس بێت، خۆی بەهەموی ئەم مەقامانەدا تێپەربێ کەسێکیوا بەناو ئینسانە ئەگینا یەكپارچە نوورەو مەلائیکە صیفەتو رەببانیمەسلەکەو وا لەمەقامە بەرزەکانی بەقای پاش فەنادا، ئایا کەسێ ئاوابێت ئەکرێ خەیانەت بکات لە ئوممەتی موحەممەد وە مەبەستی لە ئیرشاد پلەو پایەی دنیایی وە دەسکەوتو سەرمایەو سامان بێت.؟

بێگومان ئەگەر کەسێکی ئاوا پایە بەرزو لەخوداترس دەسکەوت هیچ عەیبی تیانیە ئەگەر ئینسان بیکاتە چاوساغو رەبەرو رێپیشاندەرو ئوستادی خۆی وە خۆی بسپێرێتە دەستی ئەو.

وتمان ذیکر دوجۆرە یەکێکی ذیکری «**الله**» بو، کە باسمانکرد.

ب : ذیکری «**لاالەالاالله**» یە، کە مەشهورە بە، «**نەفیو ئیسبات**»، زۆربەی رێبواران لەپێشا بەذیکری «**الله**» دەستپیئەکەن پاشان نەفیو ئیسبات، جاری وا هەیە مورشید بەپێی تەشخیصی خۆی کە حالزانی رێبوارە، پاشو پێشیان پێئەکات بەو جۆرەی کە خۆی بە پێویستی بزانێت.

بە هەرحال رەوشی دووهەمی رێگرتنەبەر ذیکری «**لا الەالا الله**» یە.

بزانین ئەم ذیکرە چۆن ئەکرێت. هەر بەو جۆرەی بۆ ذیکری (**ذات**)واتە (**الله**) گوتمان بەوجۆرە ئەوکەسە خۆی ئامادە ئەکات، وە روەو قیبلە دائەنیشێ چاوئەنێ بەیەکاو زمانی ئەچەسپێنێ بە عاسمانەی دەمیا، وە هەناسەی هەل ئەکێشێ بۆ لای خواروی سینەی وە ئەیگرێ، پاشان بە زمانی خەیال لە ناوکییەوە وشەی «**لا**» هەل ئەکێشێ بۆ ناوچاوانی ، بە واتایێکیتر ووشەی «**لا**» لایخواروی لەطیفەی ئەخفاوە بەسەری لەطیفەی ئەخفا دا هەل ئەکێشێ بۆ لەطیفەی نەفس، بۆ ناوچاوان، پاشان لە ناوچاوانەوە ووشەی «**الە**» دێرێت بۆلای مەمکی راستی بۆلای لەطیفەی رۆح وە لەطیفەی خەفی ، لەوێوە ووشەی «**الا**» ئەباتەوە بۆپشتی مەمکی چەپی کە جێگەی لەطیفەی (**سیر**) ە پاشان ووشەی (**الله**) زۆر بەتوندیی ئەدات لە «**قەلب**» وەکو ئەوەی بە چەکوشێك بیدات بەدلیا بەجۆرێك کە گەرماو سۆزی بگاتە هەموی لەش، پاش تەواوکردنی «**لا الە الا الله**» بە زمانی خەیال وە بەوجۆرەی کە گوترا ئەوەستێ،




وینەی ذیکری لا إله الاالله بەشێوەی نهێنی لەدەرونا

---

جائەگەر ذیکرەکەی. جاریٚ یان سیٚ یان زیاتر، ئەنجام داو پشوی داو هەناسەی دا لەوکاتی هەناسەدانو ڕاوەستانەدا. ئەڵیٚ «**محمد رسول الله**».

لەم کاتی ذیکرەدا مەرج ئەوەتە واتاو مەفهومی مەبەست لە بەرچاو بگرێت نەك شێوەی نوسینی لا اله الا الله، واتە. لە دڵی خۆیا هەر لەو کاتی ذیکرەدا مەبەستی ئەوەبێت کە هیچ مەوجودیٚ شیاوی پەرستن نیە جگە «الله»، وە نیازی ئەوەبێت، کە من هیچ مەبەستو داخوازێکم نیە جگە بەندەیی ذاتی الله، بەکورتی ی، واتا، پێویستە

نەك لەفظەکە. هەروەها لەکاتی لا اله دا مەبەستی ئەوەبێت کەمن خۆم وە هەرچی مەوجوداتە هەموم لاهیچە وەهەموی هی تیاچونەو ڕۆژێ تیائەچێت،وە لەکاتی الاّ الله دا مەبەستی ئەوەبێ بڵێ ئەوەی ئەمێنێتەوە تەنها هەرخودایە.

جا لە هەردوو جۆرە ذیکرەکەدا چ ذیکری الله، وە چ لا اله الا الله پاش چەن جارێك ذیکر کردن پشوێك بدات وە لەو پشودانەدا بڵێ خودایا من لەم ذیکرو پەرستشەدا مەبەستم هەرتۆو ڕەزامەندیی تۆیە وامن دەستم لە هەردوجیهان هەڵگرت بۆتۆ، ئومیدم ئەوەتە تۆیش مەحەببەت وە ناسینی خۆت «مەعریفەت» بکەیتە خەلاّتم، وە ئەبێ لەم کاتی ذیکرەدا سەرنجی دڵی خۆی بدات بێ ئەوەی شێوەو شکڵێ بۆ ئەودڵە لەپێش چاو بگرێت، واتە ئەبێ شێوەو شکڵی دڵی گۆشتین لەپێش چاو نەگرێت. ئابەم چاودێری کردن لە دڵە ئەڵێن (**الوقوف القلبی**). لێرەدا بەبۆنەی ئەم هاتنە پێشەوەی باسی وقوفی قەلبی‌یە وە ئەڵێم بۆ گرتنە بەری ڕێبازی نەقشبەندی‌یەکان یانزە ماددە، یان یانزە ووشە، یان یانزە پایەو ستون دانراوە، هەروا کە زووتر گوتمان ئەوەی لە دەمەقامەکان تێ نەپەڕێ ناگاتە پلەی فەناو بەقا، کە بریتی‌بون لە مەقامی، تەوبە، ئینابە، زوهد قەناعەت، وەرع، صەبر، شوکر تەوەککول تەسلیم، ڕەضا.

هەروایش لەکاتی بریتی ڕێگای سلوكدا یانزە فەرمان، یان یانزە ڕەوش هەیە ئەبێ ڕێبوار پەیرەوی‌یان لێ بکات ئەگینا هیچی بەهیچ نابێت. ئەم وشانە لە بناغەدا فارسین. هەشت ووشە لەم ووشانە «**حەزرەتی شێخ عبد الخالقی غەجدەوانی**» (**٥٧٥**)ك، داینا‌وە لەپاشان شاهی نەقشبەند سێ ووشەی تری خستونەتە سەر کە بەتێکڕا بونەتە یانزە ووشە. ووشەکان ئەمانەن (**هۆش‌دەردەم، نەظر بەرقەدەم، سەفەر دەر وەتەن. خەلوەت دەر ئەنجومەن. یادکرد، بازگەشت، یادداشت. ئەمانەیان هی حەزرەتی غەجدەوانین**).

وقوفی قەلبی، وقوفی عەدەدی، وقوفی زەمانی،ئەمانەش شاهی نەقشبەند خستویەتە سەری. بێگومان لەپاشان بەجیا باسێ ئەکەین کە مەبەست لەم ووشانە چی‌یەو چ کارێ ئەکەنە سەری سلوکی مورید، بەلاّم ئیستە ئەبوایێ پەنجەیێکم بۆڕاکێشایێ.

هەروەها پێویستە لەوکاتی ئەنجامدانی ذیکرەدا لە دڵەوە داوای فەیض‌و ڕەحمەتی خودا بکات کە بڕژێ بەسەری دەرونیا وە چاوەڕوانیی ئەو فەیضە لای ژوروی خۆیەوە بکات. هەرچەن خوا لە هەمو شوێنێکا هەیە وەلای ژوورو خوارێك بۆئەو نیە. بەلاّم هەربۆ

لەپێش چاوگرتنی ڕەوشی ئەدەب، ئەبێ ئەدڵەوە بۆلای ژورو بڕوانێ بەونیازەی خوا واڵای ژوروی هەموشتێکەوە.

ئەم وقوفی قەلبی یە وە ئەو چاودێری کردنی سەرچاوەی فەیضە دوو مەرجی شی هەیە. یەکەم، هەوڵ بدات هیچ جۆرە خەیاڵ و خەتەرەیێ ڕوو نەکاتە دەرونی.

دووهەم ئەوەتە هەرلەگەڵ خەتەرەو خەیاڵێ، چ خەیاڵی چاك چ خەیاڵی خراپ ڕووی کردە دەروونی یەوە ئەبێ ذیکرەکە ڕاگرێت وەکو لەغاوی شتێ یان ستوپی ئوتومبیلێ بگرێت ئاوا ذیکرەکە ڕاگرێت وە بکۆشێ کە خەتەرە وخەیاڵەکە لەدڵ دەرکات. ئەوجا سەرلەنوێ دەست کاتەوە بەذیکر، بەم کردەوەیەش ئەڵێن «**بازداشت**»، بازداشت بەفارسی ئەبێتە ڕاگرتن. لێرەدایە سەیرئەکەین ئەم یانزە ڕەوشە چی یەو بۆچی دانراون، هەرکامەی لەسەری سەرگوزەشت و ئازمونێکی قوڵ هاتونەتەدی.

جگە ئەم مەرجانەی باس کران مەرجێکی بەکەڵکی تر بۆ ئەنجامدانی ذیکر، ڕاگرتنی هەناسەیە لەکاتی ئەنجامدانی ذیکرەکەدا، هەرچەن ڕاگرتنی هەناسە مەرجێك نیە کە بەبێ ئەو نەکرێ ذیکر بکرێت، بەڵام ئەگەر پەیرەوی لێوە بکرێت باشترە، بەپێی ئازمونی ڕێبوارانی ئەم ڕێگایە گەرمی ی دڵ، شەوق و ذەوقی دەرون دڵ ناسکی و دورکەوتنەوەی وەس وەسە وە سەرهەڵدان و پەیدابونی مەحەبەت هەموی لەم ڕاگرتنی هەناسەیەوە دەست ئەدات وە دەستکەوتی ئەون، هەروەها ئەبێتە هۆی کەشف بۆ ڕێبوار وەشتی پشتی پەردەی لەغەیب، بۆدەرئەخەن.

ئەم جۆرە شتانەیە دەری ئەخات کە تەصەووف کردەوەیە وەئەوەی بەکردەوە نەبێتە مەیدان نازانێ چی یە،...هەروەها ئازمونە «کە شتی بۆدەرئەخات» ئازمون و تاقی کردنەوەیە دەری ئەخات هەناسەنەدان لەکاتی ذیکرا چ دەرامەدێکی هەیە، کەچی عەقڵ تیالەنگە.

مەرجێکی تر لەذیکری نەفی و ئیسبات دا ئەوەتە هەوڵ بدەی لەهەر هەناسەیێکا ژمارەیێکی «تاك» ذیکر بکەیت، واتە، جارێ، یان سێ یان پێنج یان حەوت.... هتد. ئا بەم چاودێری کردنی ژمارەی تاکە ئەڵێن **(وقوفی عەدەدی)** هەروەکو گوتمان ئەمیش پایەیێکە لەسلوکی نەقشبەندی یەکان.

شوێنەواری پەیرەوی کردن لەژمارەی تاکیش ئەوەتە زانیاری ڕێبوار لەزانستی مەعنەوی یات دا زیادئەکات وە نهێنی یەکانی تەریقەتی بۆدەرئەکەوێ وە لەپێش چاوی ڕوون ئەبنەوە.

لای‌زۆروی ژماره‌یێك که‌پێویسته ڕێبوار له‌ذیکری لا اله الا الله دا، له یه‌ك‌هه‌ناسه‌دا بیگاتێ، بیست‌و یه‌ك جاره، ئه‌وه‌ی توانی ئه‌گه‌ڵی چاودێری کردن‌و ئه‌نجام‌دانی ئه‌و مه‌رجانه‌دا که باسمان کردن له‌یه‌ك هه‌ناسه‌دا بیست‌و یه‌ك جار ذیکری لا اله الا الله‌ی ئه‌نجام‌دا که‌ڵکی مه‌عنه‌ویی‌و پاکی‌ی ده‌رونی ده‌ست ئه‌که‌وێ وه زۆرێك له‌و نهێنی‌یانه‌ی که گوتمان بۆی ڕوون ئه‌بنه‌وه، وه خۆی زۆرباش هه‌ستیان پی‌ئه‌کات ئه‌گه‌ر ئه‌م ده‌ست‌که‌وتانه‌ی نه‌بو بێگومان کاره‌که‌ی به ڕێك‌وپێکی‌و به‌باش‌ی ئه‌نجام نه‌داوه ئه‌بێ بیری لێ بکاته‌وه تا که‌م‌و کوڕی ئیشه‌که‌ی ئه‌دۆزێته‌وه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر مورشیدی باش هه‌بێت، ئه‌و خێرا یادئاوه‌ری ئه‌کات وه بۆی دیاری ئه‌کات که نوکولی کاره‌که‌ی له کوێ‌دایه.

ئه‌وه‌ش بزانین ته‌واوی ئه‌م مه‌رجانه، وه‌کو وقوفی قه‌لبی‌ی عه‌دده‌دیی یان بازداشت یان هه‌ناسه نه‌دان یان بیر به‌لای کاره‌وه بون وه تی‌په‌ڕاندنی ذیکر به‌سه‌ری له‌طائف‌دا، ئه‌مانه هه‌مویان پاش ماوه‌یێ به‌رده‌وام‌بون‌و کارکردن زۆر ئاسانن بۆ ڕێبوار.

بۆنمونه که‌سێ ده‌ست ئه‌کاته «وه‌رزش» له‌پێشا به‌رزکردنه‌وه‌ی ده کیلو شتی لاسه‌خته پاش ماوه‌یێ صه‌د کیلویش به‌ئاسانی‌ی به‌رز ئه‌کاته‌وه، هه‌روه‌ها صه‌دان وه‌رزشی تری له‌ش، وه‌رزشی ڕۆحیش هه‌روایه. ده‌ست‌که‌وتی وه‌رزشی له‌ش ڕه‌زامه‌ندی خه‌ڵك وه‌ده‌ست‌که‌وتی ماددیی‌یه، به‌ڵام ده‌ست‌که‌وتی خواپه‌رستی‌و عیباده‌ت ڕه‌زامه‌ندی خالیقه، وه‌رزش پاش چه‌ن ساڵێ په‌کی ئه‌که‌وێ ئه‌م هه‌تادێت سه‌رئه‌که‌وێت‌و به‌هێزترو پایه‌به‌رزتر ئه‌بێ، وه هه‌تاهه‌تایه چراییکه بۆخذمه‌ت به‌خه‌ڵك.

لێره‌دا ئه‌بێ بڵێم ده‌ست‌که‌وتی بناغه‌یی ئه‌م ڕه‌وشه هه‌روه‌کو ذیکری الله، ئه‌میش بۆ ته‌زکی‌یه، واته پاك کردنه‌وه‌ی له‌طائفه‌، له‌ذیکری الله‌دا له‌طائف یه‌که‌یه‌که وه یه‌ك له‌دوای‌یه‌ك پاك ئه‌بونه‌وه‌و ذیکریان ئه‌کردو نوری تایبه‌تیان ئه‌دره‌وشایه‌وه، به‌ڵام لێره‌دا چونکه ذیکره‌که به‌سه‌ری هه‌موی له‌طائف‌دا تی‌ئه‌په‌ڕێ، که هه‌ڵ‌کرا، هه‌موی به‌جارێکا هه‌ڵ ئه‌کرێ. یان له‌پێشا له‌دڵه‌وه ده‌ست‌پی‌ئه‌کات پاشان یه‌ك له‌شوێنی یه‌ك هه‌مویان ده‌ست ئه‌که‌نه ذیکر، وه نوری تایبه‌تیان ئه‌دره‌وشێته‌وه. وه ئه‌وکه‌سه خۆی هه‌ستی پی‌ئه‌کات.

## ڕەوشی دووهەم:

ڕەوشی دووهەم بۆگەیشتن بە سەری لوتکەی ئاوات لەڕێبازی نەقشبەندی‌دا بریتی‌یە لە «**موراقەبە**» بێگومان بۆ ئەنجامدانی موراقەبەیش هەر پێشەکی‌یێك بۆ ئەنجامدانی ذیکر پێویستە، بۆ ئەمیش پێویستە، وەکو لەپێشی هەموشتێکا تەوبەکردن، پاشان دەست بەدەست نوێژەوە بون وە «**استغفار**» کردن، وە لەشوێنێکی کەنارو بێ‌دەنگا دانیشتن.

موراقەبە بریتی‌یە لەوەی ئەگەر دەستی‌دا بەوجۆرەی کەگوتمان خۆت ئامادەکەی وە لە گوشەیێکی چۆلا دانیشی هەمو خەتەرەو خەیاڵێ لەدڵ دەرکەیت وە ڕوی دڵت بکەیتە قاپی‌ی هەق، بەبێ واسیطەی مورشید وە بەبێ ئەنجامدانی ذیکر، بەوپەری نیازمەندیو کزی‌یەوە بەهەمو توانایی‌و خواستێکی دەرونەوە لە خوای‌گەورە بپاڕێیتەوە کە ڕەحمەت پێ‌بکات وە فەیضو بەرەکەت بڕێژێ بەسەری دڵو دەرونتا وە دەرونت بەنوری خۆی ڕوناك کاتەوە.

جا بەردەوام‌بونی شەوو ڕۆژ لەسەری ئەم حاڵەتە ئەبێ ئەوەندە درێژەی بدرێتێ تا ڕووکردنە قاپی‌هەق ئەبێتە (**مەلەکە**) واتە: خدە بۆمرۆڤ، ئەم حاڵەتە لە تەصەووف‌دا پێی ئەڵێن ڕووکردنە (**مەذکور**) نەك ذیکر، واتە دڵ‌بدەیتە خاوەن ناوکە خودایە، نەك (**ناو**) کە ذیکرە.

بەم جۆرە خاوەن ناو لە دەرونا ئەدرەوشێتەوە وە (حوزور) وە (**موشاهەدە**) یان «**شوهود**» دەست‌ئەدات.

گەورەپیاوانی ئەم ڕێگایە فەرمویانە (**جەذبە**) واتە ڕاکێشران بۆلای‌هەق، لەڕێگای موراقەبەوە زووتر دەست ئەکەوێت تا لەڕێگای ذیکرەوە، هەرووەها ئەڵێن بەردەوام‌بون لەسەری موراقەبە مەرد ئەگەیێنێتە پلەی «وەزارەت» واتە، وەزارەتی مەعنەویی، واتە دواپلەی پێش‌کەوتن. لەبەرهەمەکانی موراقەبەش ئەوەتە ئەوکەسە ئەبێتە فەرمان‌ڕەوا بەسەری «مولك‌و مەلەکوت» دا، هەرووەها ئەبێتە دەرون‌ناس وە فەرمان‌ڕەوا بەسەری دەروونەکاندا.

پێویستە بزانین ئەوانە کە خدەئەدەنە موراقەبە ئەبێ لە ذیکرو خواپەرستی‌و شەونوێژو ئەو جۆرەشتانەش غافڵ نەبن، وە بەڕادەیێکی مەعقول ئەو پەرستشانەش

ئەنجام بدات هەروەها فەرمویانە نزیکی ی کردن لە پیاوچاکان یەکێکە لەوشتانەی ئەبنە هۆی پێش ڕەوت وە سەرکەوتنی پیاو ، هەر بەوجۆرەی کە خوا ئەفەرمێ «یاأیها الّذین آمنوا اتّقوا اللّهَ وکونوا مَعَ الصّادقین» سورەی تەوبە «۱۱۹» .

واتە ، هەم پارێزکارو خوداپەرست بن ، وە هەم هاوڕێو هاو خدەی ڕاستکاران‌و ڕاست وێژان بن . گەورەپیاوان زۆرشت لەئەسراری غەیبیان لەکاتی موراقەبەدا پێ نیشان ئەدرێ ، تەنانەت سەبارەت بە وەزعی سلوکی خۆیان ڕاهنمایی ئەکرێن .

زوتر لەبارەی موراقەبەوە باسم کردوە چونکە موراقەبە لەبازاری تەصەووفدا واتای تریشی هەیە وەکو ئەوەی مرۆڤ ڕەقیب وە چاودێری کەری کردەوەو ڕەفتاری خۆی بێت وە جڵەو بۆ نەفسی شل نەکات .

بەڵام لەڕەوشی ڕێ گرتنەبەری ڕێبازی نەقشبەندی دا مەبەست لەموراقەبە ئەمەتە کەباسمان کرد .

## ڕەوشی سێ هەم :

ڕەوشی سێ هەم لە ڕێبازی نەقشبەندی دا بۆگەیشتن بەخودا ، بەهرەوەرگرتنە لە دەستەو داوێن بونی خاوەن کەماڵێك ، واتە ، بونە شاگردی مورشیدێکی کامیل ، ئەوانەی ئەبنە شاگردی پیرێکی دەس گیر وە خاوەن کەمال ، وە ئیخلاص‌و ئەدەب‌و پەیرەوی کردن لە دەستوری ئەو خوانانسە ئەکەنە پیشەی هەمیشەیی یان ، وەهەروەکو شاگردێکی ویستیاری فێربونی زانیاریی لای ماموستای دەرس ئەخوێنێ ، وە ئەبێ ڕێی نومایی‌و دەستورەکانی ئەنجام دات ، ئەم چەن بەرابەری شاگردێکی دەرس خوێن ڕێی نمایی ڕێبەرەکەیی ئەنجامدا ، ئەویش هەروەکو ڕێ ڕەوانی ڕێبازەکانی تر ئەگاتە مراز وە دڵی بەنوری هەق ڕوناك ئەبێتەوە .

گەورەپیاوانی تەریقەت فەرمویانە ئەم ڕێگایە لە هەموی ئاسانترە وە لەهەمویشی زوتر مرۆڤ ئەگەیێنێتە مراز ، بەم ڕێ ڕەوە ئەڵێن ذیکری رابیطە ، واتە یادی مورشید وە تێ کۆشان بە یارمەتی ی ڕاستەوخۆی مورشید .

زوتر لەبارەی رابیطەوە باسمان کردوە گوتمان رابیطە بریتی‌یە لە بەردەوام کردنی پەیوەندی دەرون لەگەڵی خوای‌گەورەدا ، جا ئەوانەی کە مورشیدیان هەیە ئەو پەیوەندە لەرێگەی دەرونی مورشیدەوە بەرقەرار ئەکەن ، واتە دڵیان پەیوەند ئەدەن بەدڵی مورشیدەوە کە بێگومان دڵی مورشیدی کامیل هەم خۆی نورانی‌یەو نوری خودای تیا درەوشاوەتەوە وە هەم دڵی پەیوەندە بەدڵی حەزرەتی موحەممەدەوە «**درودی خوای لەسەر**» دەرونی ئەویش دیارە جێگەو کانگەی نوری خودایە وە پەیوەندە بە سەرچاوەی ئەنوارەوە کە ئەنواری خودای گەورەیە ، وە هەمیشەو بەردەوام وەکو تافگەیێکی بێ‌پایان نوری هەق ئەرژێ بەسەری دەرونی پێغەمبەرداەوە هەروەکو کارەبا ، کە چۆن دابەش ئەکرێ بەهەر چوارلادا‌یان وەکو سەرچاوەی ئاوێکی بێ‌پایان چۆن بە هەمولایێکا جۆگای لێ هەڵ‌ئەگرن وە هەرجۆگەی هەزاران مەزراو هەر جۆگەلەی هەزاران دارودەرخت‌وگیاو صەوزەی پێ ئاو ئەدێرن ئەمیش بەوجۆرە ئەو رووناکی‌و فەیضە وەئەو ئاوە زەلاڵ‌و پر خێروبێرە دابەش ئەکرێ بەسەری ویستیاران‌و خوازیارانێکا قۆڵیان لێ هەڵ‌کردوەو چاکی مەردایەتی‌یان لێ‌کردوە بەلادا بۆئەوەی مەزرای دەرونیان بەو فەیض‌و بەرەکەتە پەروەردەو بەرهەم دار بکەن .

بێگومان مورشیدی کامیل سەرپشکەو بەوجۆرەی پێویستی‌بێت بەشی خۆی دێرێت وە دابەشی ئەکات بەسەری خوازیاراندا .

زوتر لەبارەی شیعرێکی مەولەوی‌یەوە کۆڵیانەوە کە بۆمورشیدی خۆی شێخ‌عوسمانی نەقشبەندی نوسیوە ،کە ئەڵێ :

حەیفە تۆ میراو سەرجۆی بادە بی
بە هەرکەس بەقەد کەفاف دادە بی
من کشتم روزەرد هام‌فەردانم لێ
دانەم روسیای هام‌دەردانم لێ
سا هەڵ‌کە با بێ جۆ جۆ جۆگەی مەی
وەسەر کشتم‌دا پەی‌پەی پەیاپەی .

هتد ... مەبەستی ئەم شیعرانەی مەولەوی ئەم کەڵک وەرگرتنە مەعنەوی‌یەو ئەو ئاودێرانەی کشتگەی رۆحی‌یەتە .

بەسەری ئەو صوفی یەدا وە صەحو ئەوەتە، ئەوبەندەیە ئەگەڕێتەوە بۆسەری هۆشی جاران وەریکوپێکی کردارو گوفتارە کانی، هەرئەو بەزمانی «**محمّدبن خفیف**»ە وە ئەفەرمی. (**سوکر**) بریتی یە لە هاتنەکوڵی دەرون لەکاتی ناوبردنی خۆشەویست، (خودادا)، وەهەروەها ئەڵێ: «**مەقاماتی وەجد**» چوارن، ذُهول، حیرەت، سوکر، صەحو، کەواتە سوکروصەحو بەشێکن لەچوارمەقامەکەی وەجد، کە لەبەشی (**وەجد**) دا باسیان کردوەو، واتا کانمان لێك داوەتەوە.

هەروەها شیخ عومەر سەبارەت بە «**غەیبەت وە شوهود**»، ئەفەرمێ، شوهود، بریتی یە لەحوزور، شوهود، کوردی یەکەی ئەبێتە چاوپێ کەوتن، بێگومان لێرەدا مەبەست لەچاوپێ کەوتن دەرونیی وەمەعنەوی یە واتەبە بەصەر نیە بە بەصیرەتە، وە حوزور ئامادەبونە بەلای کەسێکەوە، ئەویش هەر بەحاڵەتی مەعنەوی وە دەرونیە، جائەڵێت ئەم دیتنە بە ئامادەبونە یان روبەروبونە، تاوێك لەشێوەی، یان لەحاڵی (**موراقەبە**) دا (**وتمان موراقەبە چاودیری کردنی رەحمەتی خودا، وە خودا بە حازر زانینە**)، دەمیك بەحالی (**موشاهەدە**)، واتە دیتنە، تاوەکو پێناسی ئەوبەندەیە لەسەری دیتن وە چاودێری بێت، ئەوە، حازرە، واتە حالەتی حوزوری هەیە، وەئەگەریش لەحالی موشاهەدەو موراقەبە دەرچو ئەوە لەدائرەی حوزور دەرئەچێ، کەواتە غائبە واتەلەحالی غەیبەت دایە.

بریێجاریش مەبەست لە (**غەیبەت**)، غائب بون، وە گوم بون لە ئەشیا، واتە لەهەمو گیاندارو بێ گیانێك. جائەگەر غەیبەتەکە لەم چەشنەیان بو ئەوە مەقامی «**فەنا**» یە، وە غەیبەت نیە، کەواتە غەیبەت ئەوەتە لەحوزوری حەق غائب بێت، ئەگینا لەئەشیا غائب نیە، ئەگەر لەئەشیابو فەنایە، ئەگەر موشاهەدەو حوزوری لەدەس دا ئەوەتەغەیبەت، واتەغەیبەت لەحوزورە، ئەگەریش سەرلەنوێ خودابۆی کردەوە وە نوری حوزوروموشاهدە، واتەئامادەبون و دیتنی ئەنوار وئەسرار بۆی دەست دا ئەوە (**شوهودە**).

قوشەیری سەبارەت بە (**مەحو**) وەئیسبات، ئەڵێ، (**مەحو**) لاچونی پێناسی «**عادەت**»، واتە خووخدەیە «**ئیسبات**»، ئەنجامدانی فەرمانی خودایە واتە بەجێ هێنانی رەوشی بەندەگی، وە ئەوکەسەی پێناس و رەوشە ناپەسەندەکانی خۆی لابردبێت وە پێناسی لەبارو باشی کردبێتە جێ نشینی ئەوان ئەوکەسە خاوەنی مەحوئیسباتە، واتە خراپەی لەناوبردوەو چاکەی کردوەتە جێ نشینی.

لەپاشان پاش برێ لێکۆڵینەوە ، ئەڵێت ، کاکڵەی مەحووئیسبات لەلای خوداوە دێت ، ئەوەی خودا لەناوی ئەبات ئەوە مەحوە وەئەوەش خودا دای ئەمەرزێنێ ئەوە ئیسباتە ، کەوابو مەحوو ئیسبات راستەوخۆ بەسراون بەخواستی خوداوە ، هەروەکو خودا خۆی ئەفەرمێ «**يَمْحُو اللهُ مايَشاءُ وَيُثْبِتُ**» .

سەبارەت بە «**صەحو وەسوکر**» ، ئەڵێت (**صەحو**) هاتنە سەرهۆشی خۆیە ، لەپاش بێهۆشی وە سوکر ، مەستی‌یێکە بەهۆی نوروبەرەکەتێك (**وارید**) یێکی بەهێزەوە ، دەستئەدات .

وتمان «**غەیبە**» هەیە ، وە سوکریش هەیە ، لێرەدا ئەڵێت غەیبە بەهۆی «**وارید**» ێك واتە بەرەکەتێکەوە پەیدائەبێ بەڵام سوکر ، قوڵترو بەهێزترە لە ، «**غەیبە**» واتە بێهۆشی ی ، وەئەمیش هەر بەهۆی بەرەکەتێکەوە دەس ئەدات ، کەخوا بەکەرەمی خۆی ئەیبارێنێ بەسەری دەرونی رێبوارانی رێگەی تەصەووفدا

وە سەبارەت ، بە «**غەیبەوحوزور**» ئەڵێت ، غەیبە بریتی‌یە لەبێهەواڵی قەلب لەوەی کە بەدەوروبەریا لەخەڵکی‌تر رووئەدات ، ئەویش هی‌ئەوەتە چونکە هەستپێ‌کەرەکانی ئەوکەسە هۆشیان وابەلای ئەو بەرەکەتەوە کەخودا خەڵاتی کردون ، وە ئەوکەسە وای‌لێ‌دێت تەنانەت خۆیشی لەیاد ئەچێتەوە ، وە سزادان‌و پاداشی پاشەرۆژیشی هەر لەیادا نامێنێ ، زۆرجار پێش‌هاتوە بۆئەوانەی کە وان لەم‌حاڵەتی «غەیبەت»ە»واتە لەهۆش‌چونەدا»دەمیان چوە بەناوی ئاگرا وە بەخۆیان نەزانیوە ، هەرچەن وکوتر قسەیش ئەکەن وەهاتوچوو ئەکەن ، بەڵام خۆشی ئەوحاڵەیان بێهۆشی کردون ، جارێکیان «**شیبلی**» ، کەیەکێکە لەگەورە پیاوانی تەصەووف دێت‌بۆلای جونەید ، گەورەپیاوی شارێی تەصەووف ، ژنەکەی جونەید ، ئەیەوێ سەری داپۆشێت ، جونەید ئەڵێ پێویست ناکات چونکە شیبلی حاڵی لەسەری خۆنیە ، پاشان جونەید دەست ئەکاتە قسەکردن لەگەڵیا تا ئەیکاتە گریان ، جا کەشیبلی دەست‌ئەکاتە گریان ، جونەید ئەڵێ بەژنەکەی ئیستە سەرت داپۆشە چونکە شیبلی هاتەوە سەری خۆی .

یەکێ لەموریدەکانی «**ابوعلی دَقّاق**» لەنەیسابور بەناوی «**ابونصر المؤذّن**» ئەڵێ هەمیشە لەکۆڕەکانی ئەبوعلی‌دەقاق دا قورئانم بۆئەخوێندن ،ساڵێکیان ئەبوعەلی ئەچو بۆحەج ئەوەندە لەبارەی چاکی حەجەوە باسی‌کرد منیش‌بریارم‌دا لەگەڵی برۆم بۆحەج ،

وەلەگەڵی جەماعەتێکا لەتەکیا چوین بوحەج ، رۆژێکیان دەس نوێژی ئەگرت رویشتو مەسینەکەی لەیادچو منیش زانیم مەسینەی ئەوە هەڵم‌گرت تاگەیشتینە مەنزڵێکی‌تر دیم ئەیەوێ دەس نوێژبگرێت وەدەستەپاچەیە بۆمەسینە منیش مەسینەکەم بردەخزمەتی وە لەبەردەمیا دامنا لەپاشان وتی خودا پاداشی‌چاکەت بداتەوە وە بەوردیی سەیرێکی‌کردم وەگوتی باوەڕئەکەی وەکو ئەوەی من‌جارێکیان تۆم دی‌بێت تۆ کێ‌یت ؟ گوتم قوربان نام‌ناسیتەوە ؟ من شوێنی تۆکەوتوم وەلەبەری تۆماڵ‌ومنداڵم بەجێ هێشتوە ئیستە ئەڵێیت جارێکیان تۆم‌دیوە ؟ .

مەبەست ئەوەتە ئەوە حاڵەتی (**غەیبە**) ، واتە لەهۆش‌چون یان هۆش‌لەدەس‌دانە ، بەڵام حوزورەکەی ئەوەتە لەوکاتەدا چونکە هۆشی‌بەلای خەڵکەوە نەماوە ئەوە لەحوزوری هەق‌دایە ، ئەمەش بەهۆی ذیکری خوداکردن‌و ناوی‌خوابردنەوە دەست‌ئەدات لەراستەکەیا ئەو بەدڵ والەحوزوری خودادا وە تا هەرڕادەیێك زۆرتر لە (**خەلق**) دووربێت ، لە (**خالیق**) ، نزیکترئەبێتەوە ، تائەگاتە رادەی بەتەواوی لەیادبردنەوەی خەڵك وجهان وە نوقوم‌بون‌و داپۆشران لەحوزوری خوادا ، جا کە لەم‌حاڵەتە دەرچو ئەوکاتە وەکوئیستەی ئێمە کارەکەی پێچەوانە ئەبێتەوە واتە حوزورەکەی ئەبێتە حوزوری ناوی خەڵك ، جا ئەم حاڵی «**غەیبەتە**» واتە لەهۆش‌چونە ، یان خەڵك‌لەیادچونەوەیە ، برێ‌جار کەم‌دەوامە وە جاری‌وایش هەیە ، زۆر دەوام ئەکات ، سا تا هەر ئەندازەیێك خودا ویستی .

بەناوبانگە ، جارێکیان «**ذا النون المصری**» یەکێك‌ئەنێرێ بۆلای بایەزید کەحاڵ‌وئەحواڵی بایەزیدی بۆبزانێت ئەوکەسە کەئەگاتە ئەوێ وەهەواڵی بایەزید ئەپرسێت وشوێنی بایەزیدی پیشان‌ئەدەن ئەروات بۆماڵیان سەیرئەکات بایەزید دانیشتوە ، بایەزید ئەڵێ ، کێت ئەوێ ؟ ئەڵێ بایەزیدم ئەوێ ، بایەزید ئەڵێ بایەزید کێ‌یە ؟ بایەزید لەکوێ‌یە منیش بەشوێنیا ئەگەڕێم ، پیاوەکە گەڕایەوە وتی بابە ئەمەشێتە ، کاتێ گەڕایەوە بۆلای ذا النون وەسەرگوزەشتەکەی بۆگێڕایەوە ، ذا النون دەستی‌کردە گریان گوتی بایزیدی‌برام لەگەڵی هەموی ئەوانەی‌ترا کە هۆشوبیریان لای خۆیان نیەو تەنها هۆشیان لای‌خودایە ، لەگەڵی‌ئەواندا ئەمیش‌چوە .

لەکتێبی مُعْجَم مصطلحات الصوفّیەدا ، سەبارەت بە «**سُکْر**» وە «**صَحْو**»

ئەڵێت ، سوکور مەقامێکە لە مەقامی خۆشەویستان فەنای بەسەرانایێت وە دەستی (عیلم)،زانیاریی ناگاتە داوێنی ، ئەڵی صەحو والای ژورری سوکرەوە ، وەلەگەڵ مەقامی «بەسط» دا رێك ئەکەوێت ، صەحو مەقامێکە چاوەروانی کردنی ناوی وەپێویستی بەوەنیە بڕۆیت بەشوێنیا وە لەهەمو کەموکوڕیێك پاك کراوەتەوە .

سەبارەت بە(غەیبە) ، ئەڵێت ، سێ پلەیە ، «غەیبە» واتە لەهۆش چونی (مورید) بەجۆرێك یادی نە لای ماڵ ومناڵ وسەروسامانەوە ئەمێنی وەنە ترسی لەهیچ کوسپ کەندێکە وەنە بۆئاوات گەیشتن دەستەوداوێنی هیچ شتێ ئەبێت . پلەی دووهەم لەهۆش چونی (سالیك)ە ، ئەویش دابی زانیاریو هۆی کۆششو روخسەتی پشوی لەیاد ئەچێتەوە .

پلەی سێ هەم ، لەهۆش چونی «عاریفە» ، واتە گەورەپیاوانی پێ گەیشتوی تەصەووف ، ئەوانیش لەچاوی ئەحواڵ و دیتنو پایەوپلە گوم ئەبن وە ئەکەونە ناوی بارومی (جەمع)ە وە ، واتە کۆبونەوەو نزیکی ی لەلوطفی خوداوە .

لەکتێبی «معجم مصطلحات الصوفیە» دا ، ئەڵێت ، (مەحو) بریتی یە لەلاچونی پێناسەکانی دابو ڕەوش ، بەجۆرێك ئەوکەسە لەوکاتەدا هۆشی لانامێنێ ، وە ڕەوشو ڕەفتارێکی وای لی سەرئەدات کەلەدەستی ئاوەزی ئەودا نیە ، هەروەکو ئەوانەی کەمەستی بادەن ، «مَحْوُ الجَمْع» واتە بەجارێکا تیاچوون ، یان تیاچونی هەموشتێ ، هەروەها ، «المَحْوُ الحقیقي» ، واتە تیاچونی ڕاستەقینە،ئەوەخۆی تیاچون وە(فەنای زۆری یە ، لەتاکی دا) (فناء الكثرة فی الوحدە) .

وە «الثبات» ، دژی (مەحو)ە ، ئەویش بریتی یە لە ئەنجامدانی (عبادەت) ، واتە خواپەرستی ی . هەروەها سەبارەت بە (صَحو وەسوکر) ئەڵێ ، صەحو گەڕانەوەی ، عاریفە بۆسەری هۆشیاری ، واتە هۆشیاربونەوەی عاریفە پاش غەیبەت وەپاش ئەوەی کە هەستی لەدەست دابو،ئەڵێ پێچەوانەی صەحو ئەبێتە سوکر ، واتە مەستیی ، ئەڵێ واتای صەحو وەسوکر ، «هۆشیاری ومەستی» ، نزیکە لەواتای «حوزوروغەیبە» ، واتە ئامادەبونو لەسەرخۆچون ، یان ئامادەبونو ونبون ، فەرق لەنێوانی حوزورو صەحودا ئەوەتە صەحو ڕوداوێکە دێت وئەچێت بەڵام حوزور هەمیشەیی یەو بەردەوام ، وە صەحوو سوکر بەهێزترو تەواوترن لەحوزوروغەیبە ، سەبارەت بەغەیبەش هەرئەم سەرچاوەیە ئەڵێت ، «غەیبە» بریتی یە لە وون بونی دڵ

لەهەموی ئەوەی لەخەڵق‌ڕووئەدات ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە هەستی ئەوکەسە سەرگەرمی ئەوحاڵەیە کەبۆی دەستی‌داوە . ئەڵێ گوتراوە بریتی‌یە لەوەی کەهەستی بەلای نەفسەوە نامێنێ وەنابینێ ، چونکە بەهۆی ئەو ئەسرارەوە کەخودا بۆی‌دەرخستوە نەفسی لەبیر ئەچێتەوە .

سەبارەت بە (**شوهود**) ئەڵێت بەپێچەوانەی (**غەیبە**) وە ، واتە وون‌بون‌و لەهۆش‌چونەوە ، لێرەدا ئاگای لە نەفس وە نیازەکانی نەفسە لەغەیبەدا وتمان هۆشی لای نیازەکانی نەفس ئامێنێ بەڵام لەشهوداناگای لی‌یان ئەبێت. شیخ محی الدین عەرەبی ئەڵێ ، «**مەحو وەإثبات**» یەکێکن لەشتە دوانەکانی تەصەووف ، وەکو (**فەناوبەقا**) کاتێ کە مەحو واتەکات لەبەندە ئاگای لەنەفسی خۆی‌نەبێت لەوکاتەدا وا لەگەرمەی حوزوری خودادا ، واتە لێرە وون ئەبێت‌و لەوێ دائەمەزرێت .

لەپاشان باسی دوو ووشەی‌تر ئەکات «**السَّحقُ والمحق**» ، ئەڵێ ، لەسەحق‌دا بەندە هەستی ئەوەئەکات کە لاشەی‌خۆی تیاچوەو وردبوەو بوەتە تۆزو شوێنەمای نەماوە ، ئەمەش بەهۆی زاڵ‌بونی دەسەڵاتی «**تەجەللی**» نوری خوداوەیە ، واتە دەرکەوتن‌و زاڵ‌بون‌و زۆرسەندنی نوری خودا بەسەری وجودی بەندەدا .

ئەڵێ ، «**مەحق**» ، لە سەحقیش باڵاترە ئەویش بریتی‌یە لەفەنا ، واتە تیاچونی یەکجارەکی بەندە بەچەشنێ هەستی بونی خۆی ناکات ، وەتەنها هەست بەوجودی خالیق ئەکات ، وە هەروەها لەهەموی کەونیشا جگە لە قودرەتی‌خودا هەستی‌هیچ‌ناکات وەهەرچی شتێکیش ئەکرێت بۆی‌ڕونە کەبەهۆی هێزوتوانای خوداوەیە وە بە نوێنەرایەتی لەلاینی ئەوەوەیە کەئەکرێت .

---

«**شەوق**»

---

بەلای برێ لەگەورەپیاوانی ئەم‌ڕێگەوە ، وایە ، کە حاڵی‌شەوق حاڵێکە بەشوێنی مەحەبەت‌دا دەست‌ئەدات .

معجم‌مصطلحات‌الصوفیة ئەڵێت ، شەوق بریتی‌یە لەبڵێسە سەندنی دڵ لەکاتی‌ناوبردنی خۆشەویست‌دا .

وه ماوه لەنێوانی شەوق وەئیشتیاقدا ئەوەتە، شەوق پاش دیدار وەچاوپێکەوتن دائەمرکێت وە نامێنێ، بەڵام ئیشتیاق پاش ئەوەش هەربەردەوامە.

مەبەست لەم شەوقە، واتە «**تاسەکردن**»، وەئارەزوی دیدار، بریتی یە لەشەوقی رێبوارانی رێگەی تەصەووف، کەئەویش حاڵێکی تایبەتەو جیهانێکی هەیە بۆخۆی،... بێگومان لەباسی هەموی ئەم حاڵ و مەقامانەدا ئەوچۆنیەتەی کەبەسەری رێبواراداێت هەرگیز بەتەواوی وە بەبێ کەموکوری باس ناکرێت، چونکە هەم وشەیێک نیە بۆباسی، هەم مەجبورنین باسی بکەن، لەگەڵ ئەوەشا هەرکامەو شتێکی وتوە، وەرازێکی درکاندوە جائەوەتا شیخ عومەری سەهرەوەردی باوەری خۆی و هی گەورەپیاوانی تر پیشانئەدات، برێ لەوگەورەپیاوانە ئەڵێن، شەوق هی غائبە خودا مادام هەمیشەحازرە، بەتایبەت بۆئەوان کەحازری یەکە بەچاوی دەرون هەستئەکەن، ئیتر شەوق کوا ئەمێنێ، بەڵکو شەوق هی بەر لەحاڵی موشاهەدەیە، جالەم روانگەوە سەهرەوەردی ئەڵێت شەوق یەکێکە لەحاڵەکانی مەحەبەت، وە (**موحیب**) واتە، کەسێ کە کەسێکی خۆش بوێت، هەمیشە هەر (**موشتاقە**) واتە ئارەزومەندەو تاسەی ناشکێت، ئەوکەسەی کەخوای خۆش بوێت لەهەمو موشتاقێك موشتاقترە چونکە «**ئەمر**»ی خودا، واتە حالاتی نهێنی (**غەیبی**) لەجیهانی غەیرەماددیدا بێ پایانە «اَلا لَهُ الخَلقُ وَالاَمْرُ» ئایە (٥٤) (**أعراف**)، بەمجۆرە رێبوار هەرکە گەیشتە حاڵێکی تازە، واتە، حاڵێکی تازە دەمەتی دابۆی، ئەوساکە ئەزانێ کەحاڵێ لەوحاڵی خۆیە باشترو بەرزتر هەیە، جا ئیشتیاق سەرلەنوێ دەستئەداتەوە بۆ ئەومەڵبەندە تازەیە وە بەمچەشنە حاڵی شەوق لەناوی جەغزی مەحەبەت دا هەر دەوامی ئەبێت،

دوبارە ئەڵێت، ئەمەحاڵی دەستەیێکە لە خۆشویستان، کە لەمەقامی شەوق دا جێگایان پێ دراوە، شەوقیش بۆ مەحەبەت وەکو زوهد وایە بۆ تەوبە، واتە ئەگەر تەوبە دامەزرا زوهد دەرئەکەوێ ئەگەر یش مەحەبەت دامەزرا شەوق پەیدائەبێت.

لە «**إبن العطا**» یان پرسی وە شەوق چی یە؟

ئەڵێ سوتانی ناوسکەو کڵپەگرتنی دڵ وەپارچەپارچەبونی جەرگ لەترسی دوری، ئەویش لەپاش نزیکی و دیدار.

هەروەها پرسیویانە ئایا (**شەوق**) بەرزترە یان (**مەحەبیەت**) ئەڵێن شەوق، چونکە شەوق لەمەحەبیەت پەیدائەبێت وەئەوەی مەحەبیەتی نەبێت شەوقی نابێت، کەواتە مەحەبیەت لاسکی دارەو شەوق لقەکانیەتی.

لەکتێبی «**مَنازِلُ السّائِرین**» دا سێ پلە دائەنێت بۆشەوق، یەکێکی شەوقی خوداپەرستانە بۆبەهەشت، بۆئەوەی لەدەستی ترسی ئاگر رزگاربن، وە ئەوەی خەم دای گرتوە لەخەم دەرچێ، وەئەوەی ئاواتی بەهەشت بوە بەئاواتی بگات.

پلەی دووهەم، شەوقی گەیشتنە بەخودا.

وە پلەی سێهەم، ئاگرێکە، مەحەبیەت خستویەتە دەرونەوە، ژیانی لەمرۆڤ شێواندوە وخۆشی ی لەدەست سەندوە وە هیچ دەرمانێ چارەی ناکات جگە دیداری خودا. «**بێگومان بەچاوی بەصیرەت**» خاوەنی «**اللُّمَع**» پاش باس کردنی شەوق هەر بەشێوەیێك وەکو ئەوانی تر، لەپاشان ئەڵێ «**وَالشَّوقُ يَقْتَضِي الأُنس**» واتە شەوق پێویستی بەئونس ئەبێت، واتە حاڵی ئونس بەشوێنی شەوقدا دێت.

قوشەیری لەسەرەتای باسی شەوقدا دەسێیشان بۆ ئەم ئایەتەئەکات کەئەفەرمێ «**مَنْ كانَ يَرْجو لِقاءَ اللهِ فإنَّ أجَلَ اللهِ لآتٍ**»، مەبەست لێرەدا ئەوەتە ئەوانەی موشتاقی ئەوەن بگەن بەخودا، رۆژێك ئەبێ ئەجەلیان بگات، واتە ئەبێ پێیان ناخۆش نەبێ کەئەمرن، بەڵکو چونکە بۆعالەمی ئەرواح ئەڕۆن، وە لەخوا نزیکتر ئەبنەوە ئەبێ هەراسیان لەمردن نەبێت.

«**يحيى بن معاذ**» (**٢٥٨ ك ٨٧٢م**) ئەڵێت نیشانەی شەوق بریتی یە لەبڕینەوەی ئەندامی لەش لە (**شەهەوات**)، واتە قەدەغەکردنی ئارەزوی حەیوانیی لە لەش، چونکە شەوقی گەیشتن بەخودا لەکوێ وە ئارەزوی حەیوانیی لەکوێ، هەروەها قوشەیری ئەڵێت لە «**سري**»م بیست، ئەیوت شەوق پایەیێکی بەرزی خوداناسانە...

••

## أُنس:

ئونس، یەکێکی ترە لەحاڵەکانی تەصەووف، ئونس ئەبێتە هۆگربی بەشتێکەوە وە دڵ کرانەوە بەوشتە، بێگومان لێرەدا مەبەست ئەوەتە کەدڵی رێبواری رێگەی تەصەووف هۆگرئەبێ بەخۆشەویستی ی خوداوە، وە جگە خوای گەورە دڵی بەهیچ شتێ ناکرێتەوە، مرۆڤ لەم حاڵەدا لەخەڵك بێزارە وە هەتا بۆی دەست بدات دووربی ئەگرێت لەخەڵك، وە خواخوایەتی کەس نزیکی ی لێوەنەکات، تەنانەت ئەگەر یش واهاتە پێشەوە چوەناوی خەڵك، یان خەڵك هاتن بۆلای ئەو، بەلاشە لای ئەوانەو بەدڵ لای خودایە، ئەم رێبوارە لەم حاڵەتی ئونسەدا، ئەوەندە دڵ خۆشە بەونزیکی و هۆگربی خۆیە، ئەگەر بدرێتە بەری بەردیش، زویر نابێت، وەهەر دڵ خۆش و خۆشحاڵە، وەنایەوێ کەس ئەم خۆشی یەی لی تێك بدات وەئەو بازارەی لی بشلەژێنی.

لەم حاڵەدا، رێبوار ناوبردنی خوای لەهەموشتێ پی خۆشترە، واتە، «ذیکر» وە ئەم ئونسە لای بری لە خواپی داوان، ئەگاتە رادەی کەشف وەشوهود، واتە دەرکەوتنی نوری خودا بۆ دیدەی دڵ، واتە «بەصیرەت». **وە ئەم پایەی دوایی یە بەهیچ زمانێك باس ناکرێت، وە لەهیچ گوفتارێکا ناگونجێت، وە هەرئەم نەبونی ووشەو گوفتارو واژەیە بۆ باسی حالآتی تەصەووفەتە، ئەبێتە هۆی ئەوەی زۆر مەبەستی تەصەووف، هەروا لەدڵی خاوەنیا ماوەتەوەو، لەمێنێتەوە، چونکە هەم وشەیێك نیە بۆباس کردنی، وە لەناو وتارا ناگونجی، وەهەم، هەرکامەی بۆخۆی جیهانێکی بۆدەرئەکەوێ لەهی ئەوی تر ناچێت. وەکوئەوەی هەزاران کەس لەلای یەك کەسەوە دەعوەت کرێن، بەلأم بۆهەرکامەی خانوو بەرەیێك تەرخان کرابێ، وەبۆهەرکامەی خۆراکێکی تایبەت برابێت، بەڵێ هەمو دەعوەت کراون وەخاوەن ماڵی هەمویان یەك کەسە، بەلأم جی وشوێن و خواردن و مێوانداربی هەرکامەی هی تەنهاخۆیەتی، جا بی گومان هەرکامەی باسی ئەوەی خۆی ئەکات، وەئاگای لەوی ترنیە، جا بەداخەوە، زمان و ووشەو واژەیێك نیە بۆ باس کردن و گێرانەوەی ئەوسەرگوزەشتانە، وەهەموی مەعنەوی یە، وە بەچاوی دەرون هەست ئەکرێت، وە هەرئەوەندەمان بۆدەرئەکەوێت کەباسیان کردوە.**

لەکتێبی «**معجم مصطلحات الصوفیه**»دا بەرانبەر بەووشەی «**أُنس**» زۆر بەکورتی ی ئەمچەند ووشەیە نوسراون.

الأنس «**إلتذاذُ الرّوح بِكمالِ الجَمال، وهو أثرُ مُشاهَدة الحضرةِ الإلهية في القَلْب، وَهُوَ جَمالُ الجَلال، وقيل الأنسُ ضدّ الهَيْبَة، وقيل مَعَ الهَيْبَة**».

لەکتێبی «**الفاظ الصوفیة**»دا، ئەڵێت، خاوەن ئونسەکان ئەبنە سێ بەشەوە.

برێکیان، دڵیان بەذیکر ئەکرێتەوەو بێزارن لە «**غەفلەت**»، واتە بێزارن لەوەی لەخوداغافڵبن، وە هۆگری خوداپەرستین وەبێزارن لەگوناهباریی.

برێکیان، تەنها هۆگری خودان، وە بەخوانەیێ دڵیان بەهیچ ناکرێتەوە وەلەهەموشتێکی کە بێزارن.

دەستەی سێهەمیان، ئەوانەن، کە سامووەهەیبەتی ئونسو نزیکی خودا، هەموشتێکی لەبیر بردونەتەوە، تەنانەت ئونسەکەیشیان لەبیرچوەتەوە.

لە داوود الطائی کە لە «**١٦٥**»ك، کۆچی‌کردوە، ئەگێرنەوە: جارێك صوفیێك تووشی ئەبیت، لەداود ئەپرسێ، ئەی ئەباسولەیمان، ئەوەچیتە، واتەووەندە خۆشحاڵو دەم بەبزەی، داوود وتی، ئەمبەیانی‌یە، شەرابێکیان دامێ، کە پێی‌ئەڵێن شەرابی «**ئونس**»، بەوبۆنەوە ئەمرۆ رۆژی جەژنی منە، وە ئەوەتە ئەمبینی چەندە خوشحاڵم. کەواتە ئونس ئەو حاڵەخۆشەیە کە بەهۆی هەستی نزیکی‌ی لەخوداوە وەهەستی نوری‌خودا لەدەرونا دەست‌ئەدات، وەئەوپەری خۆشی ئەخاتە دەرونی صوفی‌یەوە، بەجۆرێ کە حەزناکات کەسی لێ‌نزیك‌کەوێت، وە ئەمشادی‌یەی لێ‌تێك‌دات.

---

«**وَجْــد**»

---

وەجد یەکێکە لەحاڵەکان، (**تاج الأسلام كُلاباذي**) لەکتێبی (**التعرف لمذهب أهل التصوف**) دائەڵێ، وەجد بریتی‌یە لەحاڵەتێکی خۆشی، یان ناخۆشی، یان ترس‌وراچڵەکان، یان دەرکەوتنی برێ شتی‌نهێنی لەجیهانی پاش‌مەرگ، یان

دەرکەوتنی هەرنهێنییێك لەئەسراری مەعنەوی، کەخوا بیەوێ بۆ ئەوبەندەی خۆیە ئاشکرای کات.

لەناوی صوفی و دەروێشی کوردا، بەمچۆنیەتە ئەڵێن حالّ لیّ هاتن، یان جەذبە لیّ هاتن.

هەرچەن لە واتا عەرەبیەکەدا جەذبەوحالّ واتای ئەگۆرێت.

شیخ عومەری سەهرەوەردی لە «**عوارف المعارف**»دا سەبارەت بە «**وەجد**» «**تەواجود**» وە «**وجود**» باس ئەکات.

سەبارەت بەوەجد هەروە کو «**تاج الأسلام**» باس ئەکات ئەڵێ حاڵەتێکە ئەبێتە هۆی خۆشی ی یان ناخۆشی ی کەحاڵی ئەوصوفی یە لەحاڵەتی سوروشتی ی دەرئەکات وەئەیگۆرێ.

بەڵام «**تەواجود**» ئەوەتە ئەوکەسە خۆی بیەوێت، لەرێگەی بیرکردنەوە، یان ذیکرکردن حاڵی وەجد بۆخۆی بێرێتەدەست، بەڵام وجود بریتی یەلە تەشەنەکردنو پەرەسەندنی ئەوخۆشی وەجدەیە بەچەشنێك ئەوەندە دەوام کاتو پەرەبسێنێ تائەگاتە بۆشایی «**فەضا**»ی، ویجدان، وەجد لەوانەیەبڕوات بەڵام وجود وەکوکێو هەرپایەدارە. لێرەدا باس لە «**غەلەبە**» ئەکات وەئەڵێت «**وەجد**» حاڵەتێکە زوو گوزەر، بەڵام «**غەلەبە**» بریتی یە لەوەجدێك یان لەحاڵێك، کەهەروەکو تەوژمی کارەبا بەشوێنی یەکا دێت وە هەر بەردەوام ئەبێ، پاشان ئەڵێت «**وەجد**» چوار پلەی هەیە، ذهول، حیرەت، سوکر، صەحو، ئەڵێ ئەم حاڵەتانە وەکو ئەوەتە کەسێ ناوی دەریای بیستبێت لەپاشان بڕوات لێی نزیك بێتەوە پاشان بڕواتە ناوی پاشان شەپولی ئاو بیبات‌و شوێنەمای نەمێنێ. لەپاشان ئەڵێ ئەوەی شوێنەمای ئەوحاڵەی بەسەرەوە مابێت، شوێنەمای ئەومەستی یەی بەسەرەوە ماوە ئەوەش بەتەواوی هاتبێتەوە سەری خۆی ئەوە لەومەستی یەش دەرچوە، وە هۆشیار بوەتەوە، مەستی هی خاوەن دڵانەو هۆشیاری هی ئەوانەتە شتیان بەچاودیوەو خودا ویستویە لەئەسراری «**غەیب**» برێ شتیان بۆدەرخات.

هەروەکووتمان وەجد بریتی یە لەحاڵێك کەدێت بەسەری رێبوارانی رێرەوی تەصەووفدا، تەنانەت برێجار بەسەری هەرکەسێکی تریشا کەبەهۆی خوێندنی قورئانەوە یان دەنگێکی کاری گەرو بە «**تأثیر**»، ئەوکەسە هاوارئەکات یان ئەگریت یان

جاری‌واش هه‌یه قاقا پێ‌ئه‌کەنێ، ئەمە «وەجدە»، واته دڵ‌هاتنه‌جۆش، وەهەر سەبارەت بەم چۆنیەتەیە خوای‌گەورە ئەفەرمێ «اِنَّمَا المؤمنونَ الّذینَ اِذا ذُکِرَ اللهُ وَجِلَت قُلوبُهُم» «انفال» ئایەتی «۲» پەنجەرا کێشانە بۆلای ئەم‌مەبەستە کەبرێ کەس بەخوێندنی قورئان دڵی گەرم‌ئەبێت یان‌ئەگریت، یان‌هاواری لێ بەرزئەبێتەوە، ئەوە خۆی وەجدە، جا برێ‌کەس لەگەورەپیاوانی تەصەووف لایان‌وایە رێبوار هەتا خۆی بگرێت وەهاوارو گریان نەکات بەهرەی زیاتری دەست‌ئەکەوێت، برێکیان لایان واتە ئەم‌باوەرە دروستە، بەڵام برێ بەرەکەت هەیە بەحاڵی جوڵان موناسیب‌ترە، وە هەرکامەی دەلیلێکی بۆهانیوە.

بەهەرحاڵ زۆربەیان لەسەرئەوەن ئەگەر کەسێ خۆی‌بۆبگیرێت خۆگرتن‌باشترە.
لەپێشا باسی «ذُهول» مان‌کرد، ذوهول، واتە شت‌لەبیربردنەوە یان لەهۆشی‌خۆچون، «حیرەت» سەرسام‌مان «سوکر» سەرخۆش‌بون «صەحو» هاتنەوەسەرخۆ.
لەپاشان ئەبێ ئەوەش بزانین حاڵەتی «وەجد»، یان بەکوردی خۆمان، حاڵ‌لێ‌هاتن، وەهاوارکردن‌و ئەوجۆرەشتانە هی تازەکارو پێ‌نەگەیشتوانە واتە هی ئەوانەیە وان لە «تەلوین» دا، وە ئەوەی چوە مەقامی «تەمکین» ئیتر ئەمجۆرە شتانەی نابێت وە مەقامی باڵاترە لەوانە.
بەڵام بەشێوەیێکی تیکرایی ئەم حاڵ‌گۆرانە لەزەمانی پێغەمبەرا درودی‌خوای‌لەسەر، هەربوە وە خوا ستایشی لێ‌کردوە وە بەپێچەوانەوە نارەزایی پیشان داوە سەبارەت بەدڵ‌رەقان وەبەوکەسانەی کە بەهیچ‌دڵیان گەرم‌نابێت، حاڵ‌گۆران یان وەجد، وەحاڵ‌لێ‌هاتن وەگریانی ئەصحاب زۆرتری بەهۆی خوێندنی قورئانەوە روی‌داوە هەروەکو لەم‌ئایەتانەدا دەرئەکەوێ.

« اِنَّمَا المؤمنونَ الّذینَ اِذا ذُکِرَ اللهُ وَجِلَتْ قُلوبُهم» «انفال» «۲» هەروەهالەسورەی «زُمَر» ئایەتی «۲۳» دائەفەرمێ، «اَللهُ نَزَّلَ اَحْسَنَ الحَدیثِ کِتاباً مُتشابِهاً مَثانِیَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلودُ الّذینَ یَخْشَوْنَ رَبَّهُم ثُمَّ تَلینُ جُلودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ اِلیٰ ذِکْرِ اللهِ» یان «اِذا تُتْلیٰ عَلَیْهِمْ آیاتُ الرّحمنِ خَرّوا سُجَّداً وَبُکِیّاً» «مریم» «۵۸» «وَاِذا سَمِعوا مااُنْزِلَ اِلی الرّسولِ تَریٰ اَعْیُنَهُمْ تَفیضُ مِنَ الدَّمعِ مِمّا عَرَفوا مِنَ الحَقِّ.» مائدە «۸۳».

«وَیَخِرّونَ لِلأَذْقانِ یَبْکونَ وَیَزیدُهُمْ خُشوعاً» «اِسراء» «۱۰۹».

لەمچەن ئایەتەدا زۆرباش دەرئەکەوێ خوا باسی ئەوانە ئەکات «**وَجِلَتْ قُلوبهم**»، دڵیان ترسی لیّ نیشت یان، «**تَقْشَعِرُّ منه جلودُ الذين يخشونَ ربّهم ثم تَلينُ جلودهم**» لەپاشان ئەفەرمیّ «**خَرّوا سُجّدا وبُكيّا**». پێستی بەدەنیان دێتەوەیەك و ئەترسن و پاشان پێستیان خاو ئەبێتەوە، لەپاشان کورنوش ئەبەن و ئەگرین. یان ئەفەرمیّ، «**ترى أعيُنَهم تفيضُ من الدّمع**» چاویان پڕئەبیّ لەفرمێسك.

یان «**ويخرّون للأذقانِ يَبْكونَ وَيَزيدهُمْ خُشوعا**»، کورنوش ئەبەن و ئەگرین وەهەتادێت زیاترلەخواتەترسن ئەمانە هەموی پیشان دەری ئەوحاڵەن کە بەندەی خوادۆست وەلەخواترس چ بەرلەئیسلام وە چ لەزەمانی پێغەمبەردا ترسی خوا لەدڵیانابوە، وە بەبۆنەی ناوی خوا بردن یان قورئان خوێندنەوە دڵیان هاتوەتە جۆش و گریاون، وە رەواڵەتیان تێك چوە، لەئایەتی تری قورئاندا باسی ئەوانەش کراوە کەدڵ رەقن وە بەپێچەوانەی ئەمانی ترەوە، چونکەدڵیان ژەنگ گرتویەتی نە بەخوێندنی قورئان وە نە بەهیچ شتێکی لەوجۆرە دڵیان گەرم نابێت وەخوای گەورە بێزاری خۆی دەربارەیان پیشان ئەدات.

خوای گەورە لەسورەی «**البقرة**» ئایەتی «٧٤» دا، سەبارەت بە بەنی ئیسرائیلیەکان بۆئەو هەموە بیانوەی کە ئەیان گرت لەحەزرەتی موسی، ئەفەرمیّ. «**ثُمَّ قَسَتْ قلوبُكُمْ مِنْ بَعْدِ ذلكَ فَهِيَ كالحِجارَةِ اَوْ اَشَدُّ قَسْوةً، وَاِنَّ مِنَ الحجارَةِ لَما يَتفجَّرُ مِنْهُ الانهارُ وَاِنَّ مِنْها لَما يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْه الماءُ واِنَّ مِنها لَما يَهْبُطُ مِنْ خَشْيَةِ الله، وماالله بِغافِلٍ عَمّا تَعْمَلون**».

ئەفەرمیّ تەنانەت موعجزەی زیندوبونەوەی مانگاکەتان دی ئەویش پاش پارچەپارچەکردن و شەقوپەق کردنی، کەچی پاش ئەوەیش هەردڵ رەقن وەدڵی ئێوە لەبەردیش رەقترە چونکە بەردی واهەیە شەق ئەبات و کانی ئاوی لیّ دەردێت وەشاخی وایش هەیە لەترسی خوادا پراش پراش ئەبێت، واتە دڵی ئێوە لەهەموی ئەوانە رەقترە، کەواتەدڵ رەقی بەلای خواوە کارێکی ناپەسەندە.

یان کەئەفەرمیّ «**اَلَمْ يَأنِ للذينَ آمنوا اَنْ تَخْشَعَ قلوبُهُمْ لِذِكرِ الله؟**......» لەپاشان هەرئەم ئایەتە ئەفەرمیّ «**ولايكونوا كالذينَ اوتوا الكتابَ مِنْ قَبْلُ فَطالَ عَلَيْهِمُ الأمَدُ فَقَسَتْ قُلوبُهُمْ وكثيرٌ مِنْهُمْ فاسِقونَ**» «**حديد**» «١٦» خوای گەورە سەبارەت بەئەصحابی پێغەمبەر کەلەسەرەتاوە هەروەکو جارانیان گاڵتەو پێکەنینیان ئەکردو بەتەواوی گرەویدەی رەوشی ئیسلام نەبوبون ئەفەرمیّ ئایا ئیترکاتی ئەوەنەهاتوە دڵیان بەرانبەر بەقورئان

خوێندنو ناوی‌خوابردن سامو ترسی‌لی‌ نیشێت وەمل‌کەچ‌کات ؟ وەوەکو، پەیڕەوانی پێغەمبەرەکانی لەوەپێشیان لی‌ نەیێت، کە بەبوونەی دورکەوتنەوەی زەمانی پێغەمبەرەکەیان دڵیان تاریكو ڕەش‌بوەتەوە وەزۆریان لە ڕێ دەرچونو کردەوە ناشیرینن ؟ ......

یان لەسورەی «زمر» ئایەی «٢٢» دا، ئەفەرمێ، «**فَوَيْلٌ لِلْقاسِيةِ قُلوبُهمْ مِنْ ذِكْرِ الله**»، عەذابی جەهەنەم هی‌ئەوانەتە کەدڵیان ڕەش‌بوەتەوە لە وەرگرتنو پەسەندکردنی‌قورئان. یان لە ناوی‌خوابردن وە خواپەرەستی،لێرەدا مەبەست‌ئەوەتە ئەوحاڵی وەجدو گریانو موچرکە بەلەشاهاتنە، لەکاتی‌قورئان خوێندنو یادی خواکردنا، لەخواپەرستان‌ ڕووی‌داوەو ڕووئەدات کەڕێبوارانی ڕێی‌تەسەوفیش لەو خواپەرستە ڕاستەقینانەن وەتێك نەچونو کارتی‌نەکردنی قورئان یان‌ناوی‌خوابردن، وەنەبێ شتێکی‌باش‌بێت وەزۆرجار لە«**قەسوەت**» واتە تاریکی‌و ژەنگداریی دڵەوە سەرچاوە ئەگرێت .

---

**جَلال وجَمال :**

---

جەلال وجەمال دوووشەن زۆرجار پێکەوەدێن وە لە کتێبی صوفیەکاندا ئەکەونەبەرچاو .

لەڕوانگەی زمانی‌عەرەبیەوە جەلال، بۆ دەسەڵاتو عەظەمەت وڕێزگرتنە«**رَجُلٌ جَليل**»، پیاوێکی‌ماقوڵ وەخاوەن‌ڕێزە .

جەمال، واتە جوانیی، «**جەمیل**» جوان .

بەڵام جەمالو جەلالێك کەلێرەدا مەبەستی‌ئێمەن دووصیفەت لەصیفەتەکانی خوای‌گەورەن هەروەها دوو ڕووداوو بەسەرهاتن کەبەسەری ڕێبوارانی ڕێ‌ڕەوی تەصەووف‌دا دێت ، خوای‌گەورە ئەفەرمێ «**كُلُّ مَنْ عَلَيْها فانٍ وَيَبْقى وَجْهُ رَبِّكَ ذو الْجَلالِ والإِكْرام**» «**الرحمن**» «**٢٦**» و«**٢٧**» یان ئەفەرمێ «**تبارَكَ اسْمُ رَبِّكَ ذي الجَلالِ والإكْرام**»

«الرحمن ۷۸» ڕێبوارانی ڕێ‌ڕەوی تەصەووف لەکاتی «سلوك»دا واتە بەجێ‌هێنانی تەریقی تەصەووف‌دا، برێجار بەرخوردار ئەبن لەصیفەتی جەلالی خوای‌گەورە، وەبرێجار لەجەمالی‌ئەو، ئەگەر خوای گەورە پێناسی جەلالی خۆی لەدڵی ئەوبەندەیەدا دەرخست، حاڵی‌ئەوبەندەیە ئەبێتە حاڵێکی دیهشەت واتە سەرسام‌مان‌و ترس لی‌نیشتن، وەئەگەر پێناسی جەمالی لەدەرونی ئەو کەسەدا دەرخست حاڵی ئەبێتە حاڵێکی ئارەزوو تینویەتی، ڕێبواری ڕێگەی هەق ئەگەر خودا لەجەلالی خۆی بەهرەمەندی‌کرد ئەوە فەنا ئەبێت، واتە ئەتوێتەوە وەخۆی لەیادئەچێت وەئەگەر لەجەمالی خۆی بەهرەمەندی‌کرد وا زیندوی ئەکاتەوە. بی‌گومان ئەم‌مردن‌و زیندوبونەوەیە حاڵەتێکی مەعنەوی‌یە، وە بەترازوی ماددە کێشانە ناکرێت وە ئەحواڵێکن ئەوکەسانە چۆنیەتەکەی ئەزانن کەبەسەریانا دێت . کەواتە کەشفی‌جەلال ئەبێتە هۆی «مەحو» کەجۆرە لەهۆشی‌خو چونوبی‌حاڵێکی مەعنەوی‌یە وەهەروەها ئەبێتە هۆی «غەیبە» کەئەویش هەر لەوبابەتەیە کەلەبەشی مەحو، وە غەیبەدا باسمان‌کردوە، بەڵام کەشفی جەمال، ئەبێتەهۆی بەهۆشا هاتنەوەو نزیکی لەخوای‌گەورە، واتە قورب، ئەڵێ «**العارفونَ باللهِ إذا كاشَفَهُمْ بجلالِهِ غابوا وأمّا المُحِبّونَ اذا كاشَفهم بجمالِهِ طابوا**،» لەپاشان‌ئەڵێ فمن غاب **فهو مُهيم**، ومن طاب **فهو مُتيم**، واتە غائب ئەوەتە لەخۆشەویستیدا دڵی‌لەدەست‌ئەدا وەشەیدای دەستی‌عیشق‌ئەبێت، متیم زەلیلی‌دەستی عیشقە .

شیخ محي الدين بن العربي ئەڵێ، جەلال پێناسی «**جەبەروت**»ی خودایە کەپێناسی «**قەهر**» واتە زاڵی‌و سەرکەوتنی خودایە، بەڵام جەمال لەپێناسەکانی بەزەیی‌و لوطفی خودایە «**الفاظ الصوفية**» .

لەکتێبی «**معجم مصطلحات الصوفيه**» دائەڵێ: جەلال پێناسی «**قەهر**»ە، لەپاشان ئەڵێ جەلال بریتی‌یە لەپێناسی، «**عەزەمەت، کیبریاء، مەجد،سەنا**» ی خودا، عەزەمەت پێچەوانەی بچوکی‌یە،وەکیبریاء گەورەتربون لەهەموگەورەیێکە،کە بێ بەپێناس بۆ کەسێك وە لە کەبیر وە ئەکبەرەوە هاتوە، وە کیبریاء پێناسێکە کەهەرشایستەی خودایە وەشایستەی بەندە نیە، چونکە خودا هەتاهەتایە هەرخاوەنی عەزەمەت‌وکیبریایە، مەجدوسەنایش هەر واتایان نزیکە لەعەزەمەت‌و کیبریاوە مەجید ناوی خودایە واتە خاوەن مەجد، کەسێکە شیاوی ستایش لی‌کردنەو بەگەورەناسراوەو هۆی‌شانازی‌یە.

سەنایش بۆ بەرزیی هەورو بەخشەندەیی هەور ئەوتریٚ کەئەبارێنیٚ بەسەری زەویدا، هەمبەرزەو هەمبەخشەندە، وە ئەمسەنایە لەگەڵی سەنای سیٚ **«نوقطه»**، سیٚخالٚدا لێك جوێن.

لەپاشان ئەڵیٚ هەموجەمالێکی خودا کەئەوژمی دەرکەوتنەکەی لەدەرونی ئەورێبوارەدا رووئەکاتە کەمیونەمان ئەبێتە جەلال، هەروەها، هەمو جەلالێکی لەسەرەتای دەرکەوتنیا جەمالە، جاهەر بەمبۆنەوەیە ئەڵێن، هەموجەمالیٚ جەلالێکی هەیەو هەمو جەلالیٚ جەمالێکی هەیە.

بەلاٚم **«جەمالی موطلەق وەجەلالی موطلەق»** جگە لەخودادا نەبیٚت لەبەندەدا نابینرێت، وەپێناسی تایبەتی خودان، وە تەنهالە ناوەکان وپێناسەکانی خوادا ئەدرەوشێنەوە. بۆنمونە، ناوی **«الله»**، هەمپێناسی جەمالی تیایەو هەمپێناسی جەلال.

سەرچاوەی ناوبراو، سەبارەت بەووشەی جەمال ئەڵێت، جەمال دوو واتای هەیە، یەکێکیان ئەوەتە کەهەمومان ئەیزانین وەبریتی‌یە لەجوانیی ئەوی‌تریشیان، ئەوجوانیەتە کەپێناسێکی **«ئەزەلی‌ی»** وەهەرگیزاوهەرگیزی خودایە، ئەڵیٚ بەلای جورجانی‌یەوە، جەمال پێناسی **«رەضا ولوطف»** ی خودایە، وە بەلای کاشانی‌یەوە جەمال پێناسی **«لوطف و رەحمەت»** ی خودایە، لەپاشان لەزمانی **«ابن الدبّاغ»** ەوە، باسێکی دوورو درێژی جەمال ئەکات کەپەیوەندی بەم باسی‌ئێمەوە نیە.

لەدوایی‌باسەکەدا ئەڵیٚ، بەلای مرۆڤی **«کاملەوە»**، جەمالی‌خودا بریتی‌یە لەپێناسە بەرزەکانی، وەناوەجوانەکانی بەچەشنێکی گشتی‌ی، ئەگەر بەچەشنێکی تایبەت‌تر بلێین، ئەڵێین، پێناسی‌رەحمەت، عیلم، لوطف، وەئەوانەی لەمجۆرەن، هەمویان پێناسی جەمالن، بەلاٚم بریٚ پێناس هەن کە هەردوحاڵەکەی تیایە واتە هەم پێناسی جەمالی‌تیایە و هەمپێناسی‌جەلال، وەکو ناوی (رَبّ)، کە لەروانگەی پەروەردە کردنی بەندەکانەوە جەمالی‌تیایە، وەلەروانگەی خاوەن بونو هێزوتوانایی ئەو خاوەنیەتەوە جەلالی‌تیایە، یان ناوی اللهّ.

هەروەها شیخ‌محی‌الدین‌عەرەبی سەبارەت بەم دوپێناسەی خوای‌گەورە ئەڵێت **«هەیبەت‌و ئونس»** کەدوحاڵی رێبواری ریٚرەوی تەصەووفن لەپێناسەکانی جەلال‌و جەمالەوە سەرچاوە ئەگرن، ئەڵیٚ هەیبەت بەهۆی موشاهەدەی جەلالەوەیە لەدلاٚ وەئەکریٚ بەهۆی جەمالێکیشەوەبیٚت کە لەناوەرۆکا جەمالێکە کە لەجەلالەوە هاتوە

بەلاّم ئونس، بەهۆی «**موشاهەدەی**»، واتە چاوپی‌کەوتنی جەمالی خوداوە، دەست‌ئەدات، سەبارەت بەحالّی جەمال‌وجەلال، لەکتێبی «**قودسیە**» کەبریتی‌یە لەفەرمودەکانی شاهی نەقشبەند، وە خواجەمحمدپارسا (**٧٤٩- ٨٢٢**) لە نوسیویەتی باسی ئەم‌دوپێناسە کراوە، بابزانین، شاهی نەقشبەند چی ئەفەرمێ.

ئەلّێ، ئەگەر رێبواری «**تەریقەت**» بەهەردوپێناسی جەمال‌وجەلال پەروەردەکرێت جەلالی‌ئەو جەمال ئەبێت‌و جەمالیشی‌جەلال‌ئەبێت، کاتێ کە «**خەوف**» دای‌ئەگرێت والەرجادا کاتێکیش کە رەجا زۆرئەسێنێت، ئەکەوێتە «**خەوف**»، وەهەرلەوکاتەدا کەئەوبەندەیە ئەبێتە «**مەظهەری‌صیفاتی‌جەلال**»، واتە پیشان‌دەرو دەرخەری پێناسی جەلال، ئەوکاتە ئەکرێ «**تەوەججوە**» بکرێت لەپێناسی جەمالی ئەو، «**باسی‌تەوەججوە وەخەوف وە رەجا، لەکانی‌خۆیا کراوە**».

ئەلّێ کارناسانی ئەم‌رشتە فەرمویانە، هەردوپێناسەکانی جەلال‌و جەمالی رێبوار کاتێ پەروەردەئەکرێن کە ئەورێبوارە گەیشتبێتە «**حەقیقەتی مەحەببەتی ذاتیی**» وەیەکێ لە نیشانەکانی گەیشتن بە پایەی حەقیقەتی مەحەبیەتی ذاتی‌ی رێبوار، ئەوەتە، کە هەرچی پێناسەکانی‌تری خۆشەویستە، وەکویەك‌بن بەلایەوە، واتە پێناسی «**مُعِزٌ وَمُذِلٌّ**» «**ضارٌّ ونافِعٌ**»، هەموی بەلاوە یەکێ‌بێت، واتە خوای‌گەورە هەرچی‌لێ‌بکات بەلایەوە یەك‌سان‌بێت، جائەوەتە، حەقیقەتی مەحەببەتی‌ذاتیی، واتە، مەحەببەتی ذاتی‌خودا وای‌لێ‌کردوە هەرچی لای‌ئەوەوەبێت، ئەوسالیکە «**رێبوارە**»، پێی‌خۆشە.

ئەفەرمێ شوێنەواری ئەم‌مەقامەش ئەوەتە مرۆڤ وای‌لێ‌دێت هەرچی‌بوێت خودا بۆی‌ئەکات، چونکە ئەم بوەتە (**رەببانی**)، واتەپێناسەکانی بونەتە شەبیهی پێناسی هەق، هەقیش ئەفەرمێ «**كُنْ رَبّانِيّاً تَقُلْ لِلشَّيْءِ كُنْ فَيَكُون**»، ئەگەر لەپێناسەحەیوانی‌یەکانی ئینسان خۆت‌دامالّی وەتەنها پێناسە خودایی‌یەکانت مایەوە تۆش هەرچیت بوێ خوابوت‌ئەکا، بەلاّم‌گرنگ ئەوەتە بەندەکان کەگەیشتنە ئەومەقامە ئیتر جگە ویستی‌خوداو رەزای‌خودا هیچیان ناوێت، چونکە بەناوئینسانن ئەگینا مەلائکەن، وەجگەپەرستشی‌خودا نەهیچیان ئەوێت‌و نەهیچ ئەتوانێ لەدلّی‌ئەواندا جێ‌ی‌خۆی بکاتەوە، دلّی‌ئەوان جگە نووری خودا هچی تیا نیە، ئەم شیعرە قامك‌کیشانە بۆئەومەقامە، «**ئەولیارا هەست‌قودرەت ئەزئیلاە، تیرێ جوستە بازگەردانەد زوراە**» واتە ئەولیا لەلای‌خوداوە ئەوهێزەیان دراوەتێ تیری تەقیو، وە لەکەوان‌دەرچو لەرێگەدا بگێرنەوە.

لەجێگایێکی تری کتێبی «قودسیە» دا بەهاتوودێن نەقشبەند، لەباسی (ویلات) دا ئەفەرمێ: ئەڵێن پێگەیشتووان وە «کامیلان»: دووبەشن، بەشێکیان پێناسی جەلالی خودا دای پۆشیون، واتە لەپێناسی جەلال بەهرەمەندن، ئەمانەیان پەروەردەکردنی ڕێبوارانیان پێ نەسپێرراوە، بەڵکو پاشی ئەوەی خۆیان ئەگەنە پلەی کەمال ئیتر سەرگەرم ئابن بەپێ گەیاندنی کەسەوە نوقی دەریای «جمع» واتە کۆبونەوەی لای خودا ئەبن. وەئەڕۆنە دەرونی فەناوە، وەئەوانە نیشتەجێ و مەنزڵ گرتوانی دەریای حیرەت و خێوەتی غیرەت ئەبن، ئەوانە «هۆشێکیان» بەلای خۆیانەوە نیە، جا کەسێ لەحیرەت دابێت وەهۆشی بەلای خۆیەوە نەبێت و نەپیەرژێتەوە سەری خۆی، کەی ئەتوانێ بڕوات بەلای پێ گەیاندن و پەروەردەکردنی خەڵکەوە. ئەمانە لە مەشرەبی «نبوەت» دا بەشیان نیە. واتە مەشرەبی خەڵك پی گەیاندن.

وە بەشی دووهەم: لەپێ گەیشتوان وە «کامیلان»: ئەوانەن: تەنانەت ئەگەر بێت و دڵیشیان ببڕێت سەرلەنوێ توانایی (جەمالی ئەزەلی)، دڵیان ئەگێڕێتەوە بۆیان، وەلەدەریای فەنا ڕزگاریان ئەکات، وخەلاتی فەرمانڕەوایی و کاربەدەستی یان بۆ ئەگێڕێتەوە، وەکارێك ئەکات کەدەستوریان لەولاتدا پەیرەوی لێوەبکرێت.

وە فەضل و چاودێری ئەزەلی، پاش ئەوەی لەسەرچاوەی کۆبونەوەو دەریای تەوحیدا نوقوم بوبون ئەیان گێڕێتەوە بۆ کەناری ئەو دەریایە وەبۆ سەری وشکی ی بەقا، بۆئەوەی ببنە مورشید وەرێبەر وەخەڵك بانگ کەن بۆسەری ڕێبازی ڕزگاری وەبۆ شارێگەی پێش کەوتن و سەرکەوتنی مەعنەوی.

بەم دەستەیە ئەڵێن «کامیلی موکەمیل»، واتە، هەم خۆی پێ گەیشتوەو هەم ئەتوانێ خەڵکیش پێ بگەیێنێ، ئەم گەورەپیاوانە بە پەیرەوی کردن لە ڕێ ڕەوی پێغەمبەری گەورە درودی خودای لەسەر، گەیشتونە پلەی پی گەیشتویی، وەلەپاشان پی یان ئەسپێرڕێت کەئەوانیش بە پەیرەوی لە پەیامبەری گەورە بانگی خەڵك بکەن بۆ ئەم ڕێگەی خۆش بەختی یە، «قُلْ هذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنْ اتَّبَعَنِي» (یوسف) (١٠٨).

«وَمَنْ اَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللهِ وَعَمِلَ صالحاً وقالَ إنَنِي مِنَ المُسْلِمين» فصلت (٣٣).

وهەروەها «وَجَعَلْنا مِنْهُم ائمة يَهْدُون بِأَمْرِنا لمَّا صَبَرُوا وَكانوا بِآياتِنا يوقِنون» (سجده) (٢٤).

ئەم ئایەتانە پیشاندەری رەوش و پێ سپێراوی ئەم کەڵەمەردانەیە. لەپاشان ئەڵێم، ئەو گەورەپیاوانەی کە وان لەژێری تیشکی جەمالدا، تاوان لەوحاڵەدا هەمیشە دڵ فراوان و بەخشندەو میهرەبانن، تەنانەت ئەگەر ئازاریشیان بدەن ناوچاوانیان نەوە یەك، وە بەهیچ توندوتیژییەك زویرنابن.

بەڵام ئەوانەی کەتیشکی جەلال ئەیانگرێتەوە باڵدار بەبێ ئارەزوویان بروابەلایاندا باڵی ئەشکێنن، وەئەوانەی کە ئەتوانن ئەوهەستەبکەن هەمیشە خۆیان لائەدەن لەوانەی لەوحاڵەدان، بەڵام بەداخەوە بۆئێمە ناناسرێن، وەخۆزگە بەوەی خودا لەوبەهرە بەرزانە بەخورداری کردوە.

## کمال - کامِلْ - مُکَمِّلْ -

کەمال، ناوێکە سەرچاوەو کانگەیە واتە «مەصدەر» واتە ئەوپەری تەواوی و بێ کەموکوری لەشتێکا، پێچەوانەکەی ئەبێتە «نەقص» واتە، ناتەواو، کامیل. بەکەسێك ئەوترێ لەشتێکا بەتەواوی پێ گەیشتبێت، وە کەموکوری تیانەبێت، وە (موکەممیل) بەکەسێ ئەوترێ بتوانێ، کەسێك یان شتێك تەواوکات وەبەپلەی تەواوی بگەیێنێ، بەنایێك خانوییێکمان بۆتەواو ئەکات، کەواتە (موکەممیل) ە جا ئەم ووشەیە لەرێبازی تەصەووفدا زۆر بەکاربراوە، وەزۆرتری سەبارەت بەووشەی «مورشیدی کامیل» واتە رێبەری تەواو پێ گەیشتو کەئەبێ «کامیل وە موکەممیل» بێت، هەروا لەکاتی باسی جەمال وجەلالدا باسمان کرد، بەرلەهەموشتێ ئەبێ بڵێین، کەمال پێناسێکە هەرشایستەی خودای گەورەیە، چونکە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ لەهەموشتێکا خاوەن کەمال بێت. کەمالی «موطلەق»، هەر هی خودایە، ئینسانێك هەرچەن کەجوانیش بێت، لەهەموشتێکا ناگاتەئەوپەری، یان لە عەقڵ و ئاوەزو هێزی لەش و هەزاران پێناسی تردا مرۆڤ پیرئەبێت. وەلەهەموی روونا کتر مرۆڤ ئەمرێت، «کُلُّ نَفْسٍ ذائِقَةُ المَوْتِ» کەوابو ئەم کەمالە «نیسبی یە»، واتە «کەمالی ئینسانی یە»، ئەوپەری کەمال بۆئینسانێك چەندەو چۆنە، بێ گومان حەزرەتی موحەممەد خاوەنی ئەوکەمالەتە، وەکو خوائەفەرمێ «اِنَّكَ لَعَلَی خُلُقٍ عَظیمٍ»، بەڵام لەگەڵی ئەو کەمال و خۆشەویستی و

گەورەیی پەیدا، خوائەفەرمێ «اِنَّكَ لا تَهدي مَنْ اَحْبَبْتَ وَلٰكِنَّ اللهَ يَهْدي مَنْ يَشاءُ وَهُوَ اَعْلَمُ بِالْمُهْتَدين» (٥٦) (قصص) ئەمە لەکاتێکابو کەپێغەمبەر تێ ئەکوشا، ئەبوطالیبی مامۆی موسوڵمان‌کات ئەویش نەئەهاتە سەرێ‌رێ، بێگومان ئەمە بۆ گەوهەرو چۆنیەتی هیدایەتە، واتە بناغەوسەرچاوەی هیدایەت بەدەستی‌خودایە، هەرچەن ئەورێگەی تۆ خەڵکی بۆبانگ ئەکەیت، رێگاییکی راستودروستە، ئەویش بەوجۆرەیە کە لە ئایەتی «٥٢ شوری» دا ئەفەرمێ «وَكَذٰلِكَ اَوْحَيْنا اِلَيْكَ روحاً مِنْ اَمْرِنا. ما كُنْتَ تَدْري ما الكِتابُ وَلا الايمانُ، وَلٰكِنْ جَعَلْناهُ نوراً نَهْدي بِهِ، مَنْ نَشاءُ مِنْ عِبادِنا. وَاِنَّكَ لَتَهْدي اِلى صِراطٍ مُسْتَقيم» کەوابو قورئان نورو روناکییکە بۆ رێ‌پیشان‌دانی خەڵك، وەئەورێگایەش رێگاییکی راستی‌سەرفەرازی‌یە، وەرێگاییکە کەپێغەمبەر درودی‌لەسەر خەڵکی بۆبانگ ئەکات، مەبەست ئەوەتە «ئینسانی‌کامیل» کەپێغەمبەرە، وەلەپاش ئەو پێغەمبەرەکان وەلەپاش‌ئەوان مرۆڤەکامیلەکانی‌تر، ئەو مافەیان‌هەیەو ئەوسپاردەیان پی‌سپێرراوە کە خەڵك‌بانگ‌کەن بۆسەری رێگەی راست، بەڵام لەگەڵ‌ئەوەشا کە رێگا کە رێگاییکی‌راستە، وەلەگەڵ‌ئەوەشا ئەمان پی‌یان سپێرراوە، لەگەڵ‌ئەمانەشا هیدایەت بەدەستی‌خودایەو بەدەستی‌بەندەنیە، بەندە لەسەریەتی بانگ‌هێشتن، وەسەرکەوتنەکە بەدەستی‌خودایە، وە پێسپێرراوی ئیرشاد وەتەعلیم بەئینسانە کامیلەکان هەرلەحەزرەتی ئادەمەوە دەست پی‌ئەکات کەناوی‌مەلائکەکانی بەوان‌فێرکرد ئەمەخۆی گەورەترین پایەیە بۆمرۆڤ، وەکارگەیشتە جێگاییك کەخوافەرموی (سوجدەبەرن) بۆئادەم، ئەڵبەتە مەبەست لەم‌سوجدە رێزگرتنە «وەکوسوجدەی‌براکانی‌یوسف بۆیوسف» نەك سوجدەی پەرستش کەسوجدەبێت بۆخودا، وەیەکێ لەهۆی ئەورێزگرتنەش هەقی‌ماموستاییك‌بو کەئادەم پەیدای‌کرد بەسەری مەلائکەکان‌دا، بەم‌جۆرەی لەم‌ئایەتانەی خوارەوەدا دەرئەکەوێ، جگەئەمەش دەرئەکەوێ کەخودا چۆن مرۆڤی هەڵبژاردەو دڵپاك ئەکاتە نوێنەرو جێ‌نشینی‌خۆی لەسەرزەویدا، کەهەر ئەو مرۆڤە «کامیلە» تە، خوای‌گەورە لەسوری (البقره) دا لەئایەتی (٣٠/تا ٣٤) دا ئەفەرمێ بەپێغەمبەری ئیسلام لەئایەتی «وَاِذْ قالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ اِنّي جاعِلٌ فِي الاَرْضِ خَليفَةً» وادیاربو چونکەئاگایان لەهەموشتێ‌نەبو سەریان‌سورما، وتیان، «قالوا اَتَجْعَلُ فيها مَنْ يُفْسِدُ فيها وَيَسْفِكُ الدِّماءَ، وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ؟» خوا لەوەلامیانا ویستی بەنرخی‌و خۆشەویستی‌ی ئادەم‌و رۆڵەکانی ئادەم، بەتایبەت حەزرەتی‌موحەممەد دەربخات، فەرموی، «قالَ اِنّي اَعْلَمُ ما لا تَعْلَمونَ»

من هەموشتی ئەزانم نەك ئیوە، «**وَعَلَّمَ آدَمَ الاسماءَ کلَّها**» لیرەدا، ئەسماء، تەنها ناوی مەلائکەکان نیە، بەڵکو زۆرشت لەنهێنیەکانی ئایندەبو وەلەوشتانەی کەمەلائکەکان لێی بێ هەواڵ بون، پاش ئەوەی ئادەمی فێرکرد، واتە بە «**کُنْ فَیکُون**» خستیە دەرونیەوە، ئەوعیلمو زانیاری یانەی لەمەلائکەکان پرسی «**ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلی الملائِکَةِ، فَقالَ اَنْبِؤنی بِاَسماءِ هؤلاءِ اِنْ کُنْتُمْ صادِقین**» فەرموی دادەی ئیوە پێم بڵێن ئەمانەچین «**قالوا سُبْحانَکَ لا عِلْمَ لَنا اِلاّ ما عَلَّمْتَنا اِنَّكَ اَنْتَ العلیمُ الحکیم**». وتیان ئەوەی پێمانی نەفەرموی ئێمەنایزانین. جافەرموی: «**قال یاآدَمُ أَنْبِئْهُمْ بِأَسْمائِهِم**» واتە ناوی ئەوشتانەیان پێ بڵێ و باسی ئەوزانیاری یانەی بۆبکەو دەرسی ئەو زانستانەیان پێ بڵێ، کەخۆت فێرکراوی.
«**فَلَمّا أَنْبَأَهُمْ بِأَسْمائِهِمْ قالَ اَلَمْ اَقُلْ لَکُمْ اِنّی اَعْلَمُ غَیْبَ السَّماواتِ وَالاَرْضِ وَاَعْلَمُ ما تُبْدونَ وَما کُنْتُمْ تَکْتُمونَ**» پێم نەوتن من چاك ئەزانم وەهەرچی نهێنی یە هەموی ئەزانم.؟. جا کەئەم دەستوراتە دران وەوەزعی ئادەم روون بویەوە، دەرکەوت خەلیفەی خودایە لەسەری زەویدا وەزانیاری ئەو لەهی مەلائکەکان زیاترە؛ وە دەرسی زانیاریی وت بەمەلائکەکان، وەدەرکەوت کەخاوەنی ئەم هەموە فەضلو کەمالاتەیە جافەرموی «**وَاِذْ قُلْنا لِلملائِکَةِ اسْجُدوا لِآدَمَ**» کەواتە ئەبێ رێزبگرن لەئادە م وە (**اعتراف**) ی پێ بکەن. فَسَجَدوا اِلاّ اِبْلیس، هەمو سەریان لەبەرابەریا دانەواند جگەلەئیبلیس، ئەوسەری هەڵ وەشاندو خۆی بەزل زانی، «**وَکانَ مِنَ الکافِرین**» وەبەمجۆرە چوە رێزی کافرانەوە، واتە داپۆشەرانی نیعمەت وەسەرکێشان، هەرسەبارەت بەم «**خەلافەتە**»، واتە نوێنەریی و هەڵسوڕێنەری کاری مەردوم، وەئەنجام دەری دەستوری خودا سەبارەت بەحەزرەتی داوودیش لە ئایەی (**٢٦**) (**ص**) دائەفەرمێ «**یاداوودُ اِنّا جَعلناكَ خَلیفةً فی الأَرْضِ فَاحْکُمْ بَیْنَ النّاسِ بِالحَقِّ وَلا تَتَّبِعِ الهَوی**» کەواتە ئینسانی کامیل ئەکرێ بەنوێنەرایەتی خوای گەورە رێبەرو رێ پێشاندەر بێت، وەبێگومان ئەمە کاتێ ئەبێت لەلای خوداوەپێی سپێررابێت.

جا ئەم کەمالی مەعنەوی یەش هەر بەردەوامە چونکە پلەیێ ئەبرێ پلەیێکی تر دێتەپێشەوە، کەماڵێ ئەبری کەمالیکی تر والەرێتا، بەلام، لەروانگەی تەصەووفەوە سەرەتای هەیە، ئەویش «**ویلایەتە**» **ویلایەتی صوغری پاشان کوبری وە گەیشتن بەمەقامی بەقای پاش فەنا بەلام ئەوبەقای پاش فەنایەش پاش برینی ئەومەقامانەدەس ئەکەوێت کەباسمان کردن وەکوتەوبەو زوهدو ئەوانی تر مرۆڤ کە ئەوخەلاتەی کرا وەگەیشتەپلەی کەمال، ئەوکەمالەی کەپاش کەمالی ئینسانی «موحەممەد»** بۆبەیرەوانی ئەو دەست ئەدات، ئیتر ئەوە

کامیله جا، هەروەکو لەباسی جەلال‌وجەمال‌دا وتمان، کامیل ئەوەتە خۆی دەستی گەیشتوەتە سەرەتای هەوارگەی کەمال، واتە ئیتر بیٚ‌مورشید ئەتوانیٚ خۆی کاروباری دەرونی‌ومەعنەوی خۆی هەلٚ سوریٚنیٚ، بەلاٚم کاملی موکەمیل بەوکەسە ئەلٚیٚن، هەم خۆی لەو سەرەتای کەماله تیٚ‌پەریوە، وەهەم ئەتوانیٚ بەرِوخسەتی پیٚغەمبەر، وەبەئیجازەی مەعنەویی‌لەلای ئەوذاتەوە، ریٚبواری ئارەزومەندو تیٚ‌کوشەر بگەیێنیٚتە ئەو پایەو مەقامە وسەری‌خات هەتا ئەیگەیێنیٚتە شوێنەکەی خۆی، هەروەکو،خوێنەواریٚك ئەتوانیٚ هەرچی خوێندبیٚ بەکەسیٚکی‌تری فیٚرکات، یان شارەزای‌شاریٚك هەرکویٚ خۆی‌چوبیٚت تۆیش‌ببات، ئیترلەوە بەولاوە زانستی‌ئەو ئەوەستیٚ، ئەوەمورشیدەش‌وایە، وەزۆرجار ریٚبك‌هاتوە، کەلەمەردانی ریٚگای تەصەووف وەکو سەرۆکی تەریقەتەکان، مەقامیان لەمەقامی ماموستاکانیان تیٚپەریوە، وەگەیشتونەتە پلەوپایەییٚك کەمەگەر هەرخۆیو خوای‌خۆی چەنوچۆنی بزانن، وەئیترئەمانەن ئەبنە ریٚ‌پیشاندەر بۆ شاریٚی خوداپەرستی وەئایەتەکانی «**قُلْ هَذه سَبيلي أدْعو إلى الله عَلى بَصيرةٍ أنا وَمَن اتّبعَني**» «**وَمَنْ أحْسَنُ قَولاً مِمَّنْ دَعا إلى الله وَعَمِلَ صالِحاً وَقالَ إنّني مِنَ المسلمين**» بەسەری ئەوبەندە خۆشەویستانەدا تەطبیق‌ئەبیٚت، هەروەها،هەرئەوانن کەخوالەبارەیانەوە ئەفەرمیٚ «**وَجَعَلْنا مِنْهُمْ أئِمّةً يَهدونَ بِأمْرِنا لَمّا صَبَروا وكانوا بِآياتِنا يوقِنون**».

«**محبة**»

مەحەببەت، بریتی‌یە لەخوشەویستی، خۆشەویستی لەروانگەی تەصەووفەوە، هەرچەن هەر لەخۆش‌ویستنەوە سەرچاوە ئەگریٚت، بەلٚام فەرقی‌زۆرە لەگەلٚی ئەم خۆش‌ویستنی ئیٚمەدا، خۆش‌ویستنی ئیٚمە، یان خۆش ویستنی «**جِنْسە**»، واتە نیٚر بۆ میٚ یان میٚ‌بۆنیٚر،کەئەمە خۆش‌ویستنیٚکی مەجازی‌یە، واتە روالٚەتیی وەزووتیٚپەر، بەلام خۆش‌ویستنی تەصەووف حەقیقی‌یە، واتە،راستەقینە،چونکە بەردەوامو بیٚ‌پایانە، واتەخۆش‌ویستنی خودایە کەماوەونامریٚ، هەروەها خۆش‌ویستنی‌تری ئیٚمە

عاطفی‌یە، وەکو خۆش‌ویستنی منداڵ باوکودایك، یان خۆش‌ویستنی نەفسە وەکو خواردن یان پۆشاك یان خۆش‌ویستنی پارەوسامان‌و پایەوپلەی دنیایی‌یە، هەموی‌ئەمانە شتێکی بێ‌دەوام وەتیاچوون، بەڵام خۆش‌ویستنی صۆفی‌یەکان خۆش‌ویستنی خوای‌گەورەیە، جا ئەکرێت بەهرەیێك‌بێت وەخودا بیدات، وەکوشیخ‌عومەری سەهرەوەردی ئەفەرمێ، وەئەوە حاڵە، یان‌ئەکرێ بەهەوڵ‌و کۆششی بەندە بێتەدی کە ئەبێتە مەقامی **«مەحەبەت»**.

ئەوکتێبانەی کەئێستە لەبەری‌دەستمایە نزیکەی بیست‌سەرچاوەم خوێندەوە هەرکامەی لەروانگەی خۆیانەوە باس لەمەحەبەت ئەکەن، هی‌وایان‌هەیە وەکوکتێبی **«قوتُ القلوب»** «۳۰» لاپەرەی لەسەری مەحەبەت، نوسیوە، بەلام لەئاکاما، کاتێ شیرەی وتارەکان ئەگرین، سەیرئەکەین ئاخرەکەی هەردێتەوە سەری چەن خاڵێك.

١ – بەلای صوفی‌یەکانەوە مەحەبەت ئەوەتە کە خوای گەورەت لەخۆتو ماڵ‌ومنداڵ وەجیهان‌و هەرچی لەجیهان‌دایە خۆشتربوێت، وە فەرمان‌بەرداری بکەیت و هەمیشە یادی‌بکەیت‌و ناوی بێریت.

٢ – مادام کەوابو ئەبێ بەپێی فەرمانی ئەوخۆشەویستەت هەڵسیت‌و دانیشیت، وە زۆربەیان سەبارەت بەم‌بەشە پەنجەرائەکێشن بۆ دو هۆنراوەی **(رابیعەی عەدەوی‌یە)**، کەگەورەترین پاڵەوانی رێگەی مەحەبەت، وە پەروباڵ سوتاوترین پەروانەی عیشقی‌خودایە، کە ئەفەرمێ:

تَعْصِی الالَه وَانتَ تُظهِر حُبَّهَ
هذا لَعَمْرِي في القياسِ بَديعُ
لوكانَ حُبُّكَ صادقا لأطَعْتَهُ
انّ المُحِبَّ لِمَنْ يُحِبُّ مُطيعُ

٣ – سەرهەڵ‌نەوەشاندنە لەفەرمانی خودا، وەهەمویان ئەم‌بەشەیان بەلاوە گرنگ‌ترە، چونکە ئەڵێن، ئەکرێت عاصی‌وسەرکێش خواپەرستیش‌بکات، بەڵام هەرگیز کەسێ کەسێکی خۆش‌ویست سەرپێچی ناکات لەفەرمانی، وەهەرچی پێ بڵێت ئەیکات.

محمدبن علي الكتاني، لەبارەی رادەی خۆش ویستنی خوداوە ئەلی خواخۆش ویستن، ئەبێ بەرادەیێك بێت ئەوکەسە غیرەت بیگرێ وەهەوڵی ئەوەبدات کەس لەو زیاتر خوای خۆش نەوێت، هەروەکو چۆن **(موسابەقە)** ئەکرێت، لەهەموکارێکی چاکدا، مرۆڤ ئەیەوێ خۆی یەکەم بێت، لیرەشا هەوڵی صووفی ئەوەتە خۆی پێشی هەموان بکەوێت، ئەم خۆش ویستنی بەندەیە، بەهرە وە قانجازێکی گەورەی هەیە ئەویش ئەوەتە ئەوەی خودای خۆش ویست خودایش ئەوی خۆش ئەوێت، بێگومان ئەوەی خوای خۆش ویست پەیرەوی لەفەرمانی ئەکات، واتە پەیرەوی لەفەرمانی پێغەمبەری گەورە، کەفرستادەی خودایەو خوا لەسورەی آلِ عِمْران دا ئەفەرمێ. **«قُلْ إنْ كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ، فَاتَّبِعونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ»**،

کەواتە یەکێ لەدەلیلی خودا خۆش ویستن پەیرەوی کردنە لەپێغەمبەر، وەبەرهەمی ئەوکارەش ئەوەتە خودایش تۆی خۆش ئەوێت.

هەروەها یەکێ لەپێناسی خاوەن ئیمانەکان **«باوەرداران»** ئەوەتە کە خودایان زۆرخۆش ئەوێت، هەروەکو خوداخۆی لە **(سورەی البقرە)** دا ئەفەرمێ، **«يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللهِ، وَالَّذِينَ آمَنوا أَشَدُّ حُبًّا لِلّهِ»**.

بەم دوئایەتەدا هەم مەحەببەتی خودا بۆموسوڵمانی راستەقینە وەهەم مەحەببەتی موسوڵمانی راستەقینە بۆخودا دەرئەکەوێ، وە ئاکام وەئامانجی تەصەووفیش هەربۆگەیشتن بەم ئاواتەو بەم پلەوپایەتە.

موژدەیێکی گەورەی تر بۆئەوانەی خودایان خۆش ئەوێت ئەوەتە پێغەمبەر ئەفەرمێ **«المرءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ»** واتە مرۆڤ لەگەڵی ئەوکەسەدا ئەبێ کە خۆشی ئەوێت، دیارە ئەوەی خوداوپێغەمبەری خۆش ویست لەگەڵی ئەواندایە، وەئەوەش لەگەڵی ئەواندابو خۆش بەختە، هەرچەن **(هەدەف)** وەئامانجی دوادوایی خۆش ویستنی خودایەوبەس بەڵام خۆش ویستنی ئەنبیاو ئەولیایش پێویستە چونکە خۆش ویستنی انبیاو پیاوچاکانیش لەبەرخاتری خودایە وەلەبەرئەوەتە لەخۆشەویستانی خودان.

لە کتێبی **«معجم مصطلحات الصوفیەدا»**، ئەڵێ، مەحەببەت ئەکرێ بە دە بەشەوە کەپێنجیان لەمەقامەکانی خۆش ویستانی رێبواری رێگەی تەصەووفن،

که بەمچەشنە دەست پێ ئەکەن «الْأُلْفَةُ، الهَوَى، الخِلّة، الشَغَف، الوَجد»، بەلام ئەو پێنجەکەیان هی مەقامی عاشقانن بەمجۆرە «الغرام، الإفْتِتان، الْوَلَهْ، الدَّهَش، الْفَناء»: وەناوی مەحەبیەت هەموی ئەمانە ئەگرێتەوە

بەلاّم د. زکی موبارەك لە کتێبی «**التصوف الاسلامی**» دا لەزمانی «**محمد بن داوود**» ەوە سەبارەت بە «**مەقاماتی عیشق وەئەحوالی حوبّ**»، ئەڵێ: بە «**ئیستیحسان**» دەست پێ ئەکات، لەپاشان بەهیزئەبێت و ئەبێتە «**مَوَدَّة**» لەپاشان بەهێزترئەبیت وەئەبێتە «**مَحَبَّة**» پاشان ئەبێتە «**خِلّة**». لەپاشان ئەبیتە، «**هَوَی**» ئەویش ئەبێتە (**عِشْق**) ئەویش ئەبێتە «**تَتَيُّمْ**»، ئەویش ئەبێتە «**وَلَه**»، وەشەوق، جائەڵێت شەوق والەگەڵی هەموی ئەم حاڵانەدا، وە هەرچەن ئەوحاڵە بەتین‌تر بێت شەوقەکەش بەتین‌تر ئەبێت لەگەڵیاندا.

وە ئەم گەورە پیاوانە لەسەری ئەوباورەن کەحاڵی شەوق حاڵێکە بەشوێنی حاڵی مەحەبیەت‌دا پەیدائەبێت. لەکتێبی «**حقائق عن التصوف**» دا نوسینی عبد القادر عیسی، ئەڵێ زانایان دەپلەیان داناوەبۆمەحەبیەت.
العَلاقَة. الإرادَة. الصَّبابَة. الغَرام. الوِداد. الشَّغَف. العِشْق. التَتَيُّم. التَعَبُّد. الخِلَّة.

بەهەرحاڵ باڵاترین پلەی مەحەبیەت بۆصوفی ئەوەتە ئەو خودای خۆش بوێت، وەخودایش ئەوی خۆش بوێت هەروەکو کە ئەفەرمێ «**يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ**» (**مائده**) (**٥٤**). هەروەکو لەمەقامی رەضادا ئاوات ئەوەتە بگەنە ئەوەی خوا لەوان ڕازی بێت وە ئەمانیش لەخوا راضی بن هەروەکو کەئەفەرمێ «**رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ**»، البيّنه (٨). یان وەکو ناوبردنی یەکتر کەئاوات ئەوەتە هەروا کەتۆ ناوی‌خودا ئەبەیت ویادی خوائەکەیت بەخۆشیو بەچاکە هەروایش خودا بەوجۆرە کە بەڵێنی‌داوەو فەرمویەتی: یادی بەندەی بکاتو ناوی‌ببات، هەروەکو کەئەفەرمێ، «**فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ**» (**البقره**) (**١٥٢**). ئایەتو حەدیث وفەرمودەی گەورەپیاوان سەبارەت بەمەحەبیەت زۆرە وەهەموی ئەوەپیشان ئەدات، مەحەبیەت، بەسەر زمانی نایێت، وەئەبێ بەکردەوە دەری‌بری، ونیشانەکانیشی ئاشکران ئەویش فەرمان‌بردنە لەدەستوری خودا، وەخۆشەویستی خوا خستنەبەری هەمو خۆشەویستێك، تامرۆڤ وای‌لێ‌دێت قانجازوزیانی بەلاوە یەکسانە کوربونو کورمردنی بەلاوە ئەبێتەیەك، چونکە

هەموی بەهی خودای ئەزانیٚ، وەهەمویشی هەربیٚ‌دەوامن، ئەوەی کەبوە ئەمڕۆنەبی سبەی، ئەڕوات، ئەوەش کەئەمریٚ ئەمڕۆ نەمردایە سبەی ئەمرد، هەر ئەوەی ئەمیٚنیٚتەوە، بەدەردئەخوا، وەجگە لەخوا هیچشتیٚك مانەوەی نابیٚت. هەر لەم‌سەرچاوەدا ئەڵیٚت صوفییٚك دای‌بەلای کەسیٚکا، دی بەسەری قەبریٚکەوە ئەگریت، وتی ئەوە بوچی ئەگریت؟ وتی خۆشەویستیٚکمە مردوەو بۆی ئەگریم، صۆفیەکە گوتی ستەمت کردوە لە خۆت، کەسیٚکت خۆش‌ویستوە کەئەمریٚ، ئەگەر کەسیٚکت خۆش‌ویستایی کەهەرگیز نامریٚت، ئاوا توشی‌گریان نەئەبوی بەشوینیا.

ئەبیٚ ئەوەش‌بڵیٚم مەبەست [illegible]یە ئەبیٚ مرۆڤ عاطیفەی نەبیٚت، وەکورمردنی بەلاوە باش‌بیٚت. بەلام مەبەست حاڵی‌مەحەبیەتە کەئەوکەسە، لەوحاڵەدا ئەوەندە غەرقی مەحەبیەتە، هەم ئەوەندە نای‌پەرژیٚتەوە سەری بیرکردنەوە، وەهەم خۆشی‌و ناخۆشی‌ی بەخەڵاتی‌خودا ئەزانیٚ کەواتە ئەگەرراست خۆشەویستە ئەبیٚ جەوروئازاری خۆشەویستی بەدڵیٚکی فراوانەوە قوبوڵ‌ئکات نەك بەجەوروئازاری نەزانیٚ. بۆنمونە، ئایا ئیمە ئەوەی لەمنالیٚ خۆمانی قوبول ئەکەین لەمناڵی خەڵکی قوبوڵ‌ئەکەین؟ یان ئایا لەڕیٚگەی خۆشویستنیٚکی مەجازی وەعیشقی دنیایی‌دا ئامادەنین هەزاران دەردی‌سەرو ماندوبون قوبول‌کەین هەزاران سەرمایە بکەینە کار، یان بۆپایەو پلەییٚکی دنیایی ئایائامادەنین هەزارجەور بکیٚشین؟ بۆ وەرگرتنی‌شەها دەییٚك ئامادە نین دەیان‌ساڵ بخویٚنین وەچاومان‌کویٚر کەین؟ لەکاتیٚکا تاچاوئەکەیتەوە پیری‌و ناتەوانی و خانەنشینی‌و مردن، دیتەپیش وەهەزار شەهادە بەومردوەچی؟ جائایا چۆن بۆژیانی ئەبەدیی وەشەهادەی ئەبەدیی وە خۆشەویستی ئەبەدیی وەخۆش‌بەختی‌و کامەرانی هەرگیزاوهرگیز ئامادەنەبین بۆخەبات‌و زیان لیٚ‌کەوتن؟ ئەو خۆشەویست‌و خۆشەویستی‌و خۆش‌ویستنە جاویدانە لەکویٚ ئەم خۆش‌ویستن‌و وخۆشەویستی‌یە بیٚ‌دەوامە لەکویٚ؟ لەقورئانی پیروزدا ئایەتی زۆرهەیە پیشان‌دەری ئەوەن کەخوا چ‌جۆرە بەندەییٚکی خۆش‌ئەویٚت، وەکو چاکە کاران «مُحسنین»، تەوبەکاران، (تَوّابین)، دڵ‌وەدەرون‌پاکان‌و پاك‌ئەندامان (مُتَطَهِّرین)، هەروەها زۆر پاکان‌و پاك‌ئەندامان، (مُطَّهِّرین)، پاریزکاران، «مُتَّقین»، ئەوانەی بەرانبەر بە موصیبەت وەلیٚ‌قەومان خۆیان‌ئەگرن صابرەکان،

(**الصّابرين**)، ئەوانەی پشت بەخوا ئەبەستن، (**مُتَوكّلين**)، دادگەران، (**مُقْسِطين**)، ئەوانەی لەرێی خوادا شەرئەکەن و گیانبازی ئەکەن، «**يُقَاتِلُونَ فِي سبيلِه صَفّاً**»، ئەوانەی شوێنی فەرمانی پێغەمبەر ئەکەون، «**قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ**»، دیارە ئەوەی خوای خۆش بوێت، ئەبێ خۆی بکاتە خاوەنی ئەم پێناسانە تاخوایش ئەوی خۆش بوێت، هەروەها دووری بگرێت لەو پێناسانەش کەخودا پێی ناخۆشن وەخۆی ئەفەرمێ، ئەوجۆرەکەسانەم خۆش ناوێت، خوا دەس درێژکارانی خۆش ناوێ «**المُعْتَدِين**». **هەروەها** «**فەساد**»، واتە کاری زشت و ناپەسەندو خەڵك خراپ کەر، وە «**المُفْسِدِين**» بەدرەوشتان وەزشت کاران، هەروەها «**كەففار**»، واتە کوفری نیعمەت کەر وە خودانەناس، (**أَثيم**) گوناهکار، (**كافر**) خوا نەپەرس (**ظالم**) ستەمکار، «**مُخْتال**» دەمارزل و لوت بەرز «**فَخُور**» خۆهەڵ کێش، «**خَوّان**» خەیانەت پیشە، «**المُسْرِفِين**» ئیسراف کەران واتە دەس بەماڵی خۆنەگیران و دەس هەڵەکان، «**خائِنين**» خائنەکان، وەمتانەپێ نەکراوان، «**مُسْتَكْبِرِين**»، خۆبەزل زانان،

ئەوەتا لێرەدا دەقی ئایەتەکانیش ئەنوسین، هەم ئەوئایەتانەی کەسەبارەت بەوکەسانەهاتوە کە ئەگەر خاوەنی ئەوخووخدەیە بن خوا ئەوانی خۆش ئەوێ، وەهەم ئەوئایەتانەش، سەبارەت بەوکەسانە هاتون کە ئەگەر خاوەنی ئەو خووخدەیە بن خوا ئەوانی خۆش نەوێ، جاصوفیەکان بۆیەئەکۆشن خۆیان بکەنە خاوەنی خووخدەی بەرز وەخوداپەسەند، بۆئەوەی چونکە خوایان خۆش ئەوێت وەبۆئەوەش کە خوا لەخۆیان رازی کەن، هەروەکو لەبەشی (**صیفاتی حەمیدەو صیفاتی رذیلە**، **یان صیفاتی مەذمومە**»دا وتمان، واتەپێناسە پەسەندەکان وپێناسە ناپەسەندەکانی مرۆڤ، ئەمەش دەقی ئەو ئایەتانە.

«**وأَحْسِنُوا إِنَّ اللهَ يُحِبُّ المُحْسِنِين**» (**١٩٥/٢**)
«**يُحِبُّ التَّوّابِينَ ويُحِبُّ المُتَطَهِّرِين**» (**٢٢٢/٢**)

«**يحب المُطَّهِّرِين**» (**١٠٨/٩**) «**يُحِبُّ المتقين**» (**٧٦/٣**) «**يُحِبُّ الصّابِرِين**» (**١٤٦/٣**)، «**يُحِبُّ المُتَوَكِّلِين**» (**١٥٩/٣**). «**يُحِبُّ المُقْسِطِين**» (**٤٢/٥، ٩/٤٩**)، «**يُحِبُّ الَّذين يُقاتِلونَ في سَبيله صفّاً**» (**٤/٦١**)، «**قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ الله فاتَّبِعُوني يُحْبِبْكُمُ الله**» (**٣١/٣**)، ئەمەش دەقی ئەوئایەتانەی، کەسەبارەت بەخاوەنی رەوشتانێك هاتوە هەرکەس خوانەخواسە

خاوەنیان بێت خوا ئەوی خۆش ناوێت ، وە ئەورەوش وپێناسانە لەرەوشە ناپەسەندەکانن کەصوفیەکان دووری یان لێ ئەگرن .

«ان الله لایحبُ المُعْتَدین» (٥/٨٧) «والله لایُحِبّ الفَساد» (٢/٢٠٥) ،
«والله لایُحبُ کُلَّ کفارٍ أثیم» (٢/٢٧٦) ،
«فان الله لایُحبُّ الکافرین» (٣/٣٢) ،
«والله لایُحبّ الظالمین» (٣/٥٧ و ١٤٠) ،
«لایُحبّ مَنْ کانَ مُختالاً فخوراً» (٤/٣٦) ،
«لایُحِبُّ مَنْ کانَ خوّاناً أثیماً» (٤/١٠٧) ،
«لایحبّ المُفْسِدین» (٥/٦٤) ،
«إنه لایُحبُّ المسْرفین» (٧/٣١) ،
«انه لایُحبّ المُعْتَدین» (٧/٥٥) ،
«ان الله لایُحبُّ الخائنین» (٨/٥٨) ،
«انه لایُحبُّ المُسْتَکبرین» (١٦/٢٣) ،
«إنه لایُحبُّ الظّالمین» (٤٢/٤٠) ،

بەم چەشنە دەرکەوت مەحەبەتی راستەقینە کەیەکێکە لەحاڵەکانی تەصەووف ، بریتی یە لەدوایلەی خۆش ویستنی ئائەگاتەرادەیێك ، رێبوارانی رێگەی تەصەووف خودایان لەخۆیان وەلەماڵ و منداڵ و هەموی جیهان و هەموخۆشی و هەمو سامان و مەقام و دەس کەوت و دەست هاتێك خۆشترئەوێ . بەم چەشنە ئەبنە «**موحیب**» وەهەروەها ئەیشبنەخۆشەویستی خودا ، چونکە خودایش ئاوابەندەیێکی خۆش ئەوێت وە ئەو مەقامە پێی ئەڵێن «**مەحەبەت**» .

اللّوائح ،، الطّوالع ،، اللّوامع ،، لەکتێبی «**معجم الصوفی**»دا ئەڵێ ، ئەمانە سێ ناوی نزیك لەیەکترن ، بەرادەیێك کە لەیەك جویێناکرێنەوە ، وە هەمویان لەپێناسەکانی ، تازەکارانی ڕێڕەوی تەصەووفن. لەوائح ، وەکو پرشنگێك یان پزوسکێکی ئاگرو کارەبا وایە ، هەرکە دەرەوشایەوە خێرا ئەکوژێتەوە ، «**لەوامیع**» تۆزێ لەوە روناکترەو تۆزێکیش بەردەوامتر ، وە(**طەوالیع**) لەویش زیاترو بەردەوامترو بەهێزترە بۆلابردنی تاریکی ی دەرون ، وەئەم حاڵەتانەهەمویان هی سەرەتان وە بەرلەوەن کە هەتاوی «**مەعریفەت**» ، واتە خواناسی ی لەدەرونی ڕێبواردا هەڵبێت .

ئیمامی غەززالیش لەکتێبی «المنقذ» دا هەر لەم بارەوە ئەفەرمێ لەدڵی ڕێبواری تازەکاردا جارجارە نورێك ئەدرەوشێتەوەو لەپاشان ون ئەبێت تاوردەوردە ئەونورە سەقامگیرئەبێت و ئوقرەئەگرێت وەدەرونی ڕێبوار وەکوڕۆژی ڕووناك ڕوون ئەکاتەوە .

## جَذب

جەذب ، بریتی‌یە لەوەی کەخودا بەندەیێکی خۆی ڕاکێشێ بۆلای‌خۆی ، جەذبەیش بریتی‌یە لەنزیکی‌ی‌بەندە لەخودای‌گەورەوە بەپێی ویستو «**عینایەت**»ی خودا خۆی ، بەبێ خۆماندو کردنو تێکۆشانێکی ئەوبەندەیە ، جا بەوکەسانەی کەلەڕێگەی جەذبەوە پی‌ئەگەن ، ئەڵێن مەجذوب واتە وەنەبێ خۆی‌ڕۆیشتبێت ، بەڵکو ڕاکێشراوە . ئەم‌جۆرە خواپی‌داوانە تەنانەت بەبێ‌مورشیدیش پی‌ئەگەن ، یان‌خۆ ئەکرێ بڕۆنەلای‌مورشیدیش ، من لەباسی (**وەجد**)دا وتم حاڵ‌وشەوقێکە کە لای خۆمان بەوحاڵی وەجدە ئەڵێن (**جەذبە**) ، وەبەوکەسە ئەڵێن مەجذوب ، بەڵێ ئەکرێ مەجذوب واتە ئەو مەجذوبەی لەسەرەوە باسمان‌کرد حاڵی‌وەجدیش بۆی دەست‌بدات بەڵکو زۆربەیان ئەوحاڵی وەجدەیان هەیە ، بەکورتی‌ی بەشێوەیێکی‌گشتی‌ی لەبازاری تەصەووف‌دا مەجذوب بەو کەسانە ئەڵێن بەبێ داخوازو هەوڵی خۆیان خواڕایان‌کێشی بۆلای‌خۆی .

## وارِد :

وارید بریتی‌یە لەو نورو بەرەکەت‌وئیشارە غەیبی‌یانەی بێ‌ئەوەی ئەوکەسە بەدەستی‌خۆی‌بێت بێتە ناوی دڵودەرونەوە .

لەگەڵی ناوی واریددا ناوی «**بادی**» ش دێت بادی لە وارید کارکردی کەمترە ، لەپێشا «**بادی**» دێت ، وەکوپێشەنگێ ؛ بەڵام (**وارید**) کەهات ، دڵودەرون دائەپۆشێ ئەتوانین‌بڵێین وارید خەڵاتێکی خوداوەندی‌یە وەبەرەکەتێکە کەخودا ئەیڕێژێ بەسەری دڵی ڕێبوارانی ڕێگەی تەصەووف‌دا .

ئەوەی‌سەرەوە باوەری کتێبی «**اللمع**» بو. قوشەیریش لە الرّسالەدا هەر باوەری بەم‌جۆرەیە ، وەئەڵێت ، «**الوارِدُ ، مایرِدُعلی القلوب من الخواطر المحمودة مما لایکون بتَعَمّلِ العبد ، قد یکون وارداً من الحق ، وواردأ من العلم ، والوارداتُ تکون واردَ سُرورٍ او واردَ حُزْنٍ او واردَ قَبضٍ او واردَ بَسْطٍ الی غیر ذلك من معانٍ**» .

١ - ریاضەت.
٢ - موجاهەدە.
٣ - کەشف.
٤ - کەرامات.
٥ - نوور.
٦ - فەنب.
٧ - نەفس.
٨ - ذیکر.
٩ - ئیشراق.
١٠ - موشاهەدە.
١١ - لاهوت.
١٢ - ناسوت.
١٣ - جەبەرووت.
١٤ - مەلەکوت.
١٥ - عەناصیری ئەربەعە
«چوار عونصور».
١٦ - وەلی.
١٧ - مُرید.
١٨ - موراد.

ئەم دوو وشە دەس نیشانە بۆدوو کار ، یان دوو ڕەفتار ، کە لەڕێبازی تەصەووف دا ئەبێ ئەنجام بدرێن ، وە سەرمەشق و پێشەنگی ، هەموکردەوەکانن ، وە لەچوارچێوەی ئەم دووڕەفتارایە ، کەتۆوی ڕەوشەکانی تری تەصەووف ئەچێنرێن ، وە دێنە بەرهەم ، ئایەتی قورئان سەبارەت بەچەوتی نەفس ، وەتێکۆشان بۆپاككردنەوەی ، زۆرن وەلەکاتی خۆیشیا باسمان کردوە ، وەئەکرێ لەوێشا موتالەی بکەن ، بەڵام لێرەدا پەنجە ڕائەکێشین بۆدووئایەت کەپیشان دەری ئەو دووشەیەن ، سەبارەت بەجڵەوگرتنی نەفس لەکردەوەی ناشیرین ، وەڕاهێنانی بەکردەوەی چاك ، خوائەفەرمێ **«فَأَمَّا مَنْ طَغَى وَآثَرَ الحياةَ الدُّنيا فَإِنَّ الجَحِيمَ هِيَ المَأْوى وأَمَّا مَنْ خافَ مَقامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الهَوَى فَإِنَّ الجَنَّةَ هِيَ المَأْوى»** **(نازعات)** ئەم ئایەتە زۆربەباشیی ڕوونی ئەکاتەوە ، کەئەبێ ژیانی ئەم جیهانە فەضلی نەدرێ بەسەری جیهانی ئەبەدی دا وەئەگەر کەسێ وابکات ئەوە سەرکەشی و یاخی بونە ، بەڵام ئەگەر ئەوکەسە لەخواترساو ، جڵەوی نەفسی گرت لەکردەوەی ناشیرین ، ئەوە بەهەشت جێگەیەتی .

جا ئەوجڵەوگیریی نەفسەو ئەو فەضلی ئەوجیهانە بەسەری ئەمجیهانەدا دانە ، وە ئەو ترسی خوا لەدڵا جێدانە ، ئەوەخۆی کرۆکو کاکڵەی ڕیازەکەیە .

سەبارەت بەموجاهەدەیش دەیان ئایەت هەیە ، کەزۆریانم زوتر نوسیوە ، بۆنمونە ، خوای گەورە ئەفەرمێ **«وَالَّذِينَ جاهدوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا»** **(٦٩/عنكبوت)** ، ئەوەی لەڕێی ئێمەدا موجاهەدە ، واتە خەباتی کردو ڕەنجی دا ، ئێمە ، ئەیخەینە سەری ڕێگاکانی خۆمان ، واتە ئەورێگایانەی کەپێمان خۆشە ، یان ئەفەرمێ **«وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنْسانِ إِلاّ ماسَعَى وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى»** **(النجم)** واتە بەبێ ڕەنج و تێکۆشان هیچ دەستی کەس ناکەوێ ئەگەریش تێکۆشێ ، هەم خۆی ئاکامی ئەبینێت لەهەردوجیهاندا هەم خوایش لەبەرچاویەتی وەگوم نابێ .

ئەمە تەنها دەس ڕاکێشانێ بو بۆ ئەم دووڕەفتارە ، واتە تێکۆشان بۆبەرگری لەنەفس ، وەجڵەوگرتنی لەتێکۆشانەکانی ، بوگەیشتن بەئاواتە دنیایی یە ڕووتەکان ،

که لەفەرهەنگی تەسەووفدا بەم تێکۆشانەو بەمجڵەوگیرییە ئەوترێ ، ریازەت هەروەها موجاهەدەیش هەم ئەمکردەوەیە ئەگریتەوە وەهەم بەردەوامبونی بێوچانی شەووڕۆژ لەسەری خواپەرستیو ذیکرو شەونوێژو ، ئەمربەمەعروفو نەهی لەمونکەر .

هەرچەند ئەمدووناوە تارادەیێك لەیەك جیان ، بەڵام ئەکرێ پێکەوە لێیان بکۆڵینەوە ، هەروەکو وتم لەمەوبەریش باسمکردوە ، ریازەت لەروانگەی تەسەووفەوە بریتییە ، لەوەرزاندنی نەفس ، وەراهێنانو پەروەردەکردنی ، وەتێکۆشان بۆگرتنەوە وەبرینەوەی ، لەو مەمکەیە کە لەسەری راهاتوە ، ئێمە خۆمان ئەزانین ، نەفس یان هەستی داخوازیی دەرون ، ئەگەر بدرێت بەدەمیەوە ، وەجڵەوی نەگیرێت وا مل ئەنێ بەلەغاوەوە ، وەخاوەنەکەی هەڵ‌ئەگرێت ، کەبگرە خاوەنی لەهەڵدێرێکی سەخت هەڵ‌دێرێت ، بۆقوڵایی دەربەندێکی پرلەتاشوبەرد ، وە پراشپراشی بکات ، لەقورئاندا ئەفەرمێ ، «إنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ» ، کەواتە ، هەم تاقی کردنەوەی خۆمان بۆمان دەرئەخات وەهەم بەپێی ئایەتی قورئانیش ، ئەڵێت نەفس فەرمان بەخراپە ئەدات ، جا چیبکەین ئەم خووخدە ناپەسەندەی نەفس بگۆڕین وەبیگەیینینە پایە پێشکەوتوەکانی نەفس کەباسمان کردون ، تابیبێتە نەفسی موڵهەمە ، یان موطمەئینە ، یان مەرضییە ...؟ بێگومان ئەبێ بیوەرزێنین ، ئەبێ دایبێڕین بە خووخدەیجوان ئەبێ هەروەکو منالێك کەلەشیر ئەبڕێتەوە ، وردەوردە بیبڕینەوە بەڵام لەچی بیبڕینەوەو ، دوریخەینەوە ، خۆ لەشتیحەڵاڵ ... نا ... ، بەڵکو لەهەرچی شتێ کەخوا پێیناخۆشە ، واتەلەهەمو پێناسێکی ناشیرین وەناپەسەند ، وەبیرازێنینەوە بە هەمو پێناسێکی جوانو پەسەند ، خۆ ئەمەش هەروا بەقسەنابێت ، وەهەروا ئاسانیش نیە ، چۆن ئاسانە ، ئەونەفسەی کەحەزئەکات بەوەی خەڵك هەڵ‌دەن بەبالای خاوەنیا ، بڵێن دیندارە ، بڵێن رەوشجوانە ، بڵێن پیاوچاکە ، حۆئەمانە هیچکامی کارێکی ناشیرین وەخراب نین ، بەلام ئەگەر ئیشیێچاکت بۆئەوەکرد ، بڵێن پیاوچاکە ، ئەوە ریایە ، هەروا خواپەرستیو دینداریی ، زۆرکەس هەیە کەڵك‌گیرە ، بەلام بۆئەوە کەڵك ئەگرێ ، خەڵك بەوجۆرە ناوی‌بەرن ، نەك بۆرەزامەندیی‌خوا وەخدمەت بەمەخلوق ، ئەمەش لەروانگەی شەرعەوە پەسەند نیە ، لەهەموی‌گرنگ‌تر ئەوەتە ، ئەوکەسەی کەبیەوێ رێبازی تەسەووف بگرێتەبەر ، ئەگەر ئەوکارەچاکانە بۆئەورەزامەندیی خەڵکە

ئەنجامیدات هەم هیچی بەهیچ نابێ، وەهەم دوایش ئەکەوێت، ئەمە سەبارەت بەکاری چاکە ئەنجامدانبو، جاوەرە سەیری کاری ناشیرین ئەنجامدانو دەس بڕینو، پروپاگاندەکردن، بۆ بەدەس هێنانی سەرمایەو سامانو مەقام، یان دەوڵەمەندبون لەسەری حیسابی خەڵك خەڵەتاندن، خۆئەوانە هەر زۆر لەویجدانی زۆرێك لەخەڵکی ساکاریشەوە دورە، ئەی بۆ کەسێك بیەوێ خوا لە خۆی رازی کات وە لەخوا نزیك بێتەوە، ئەبێ چۆن بێ؟ کەواتە، ئەم وەرزاندنی نەفسە، ئەبێتە ڕیازەتی نەفس، وەئەنجامدان وەبەدی هێنانی کارەکەش ئەبێتە خەبات یان جیهاد لەگەڵی نەفسا کەپێشی ئەڵێن «موجاهەدە» هەروەکو وتم ئەم جیهادە بۆئەوەتە بکۆشیت موبەمو خوا چی لەتۆ ویستوە ئەوە بکەیت، «ئەمربەمەعروف» فەرمان بەچاکە، «نەهی لە مونکەر» ئەنجامنەدانی کاری ناشیرین، یان بەرگری کردن لەکاری ناپەسەند، ئەو مەعروفە، ئەنجامدانی دەستورەکانی خوایە، بەوپەڕی تەواوی و جوانی، ئەمیشیان بەرگری کردن لەهەرچی گوناەو شتی خراپە بەوپەڕی توانایی یەوە.

لەڕوانگەی تەسەووفەوە شتەکە ئەگاتە ڕادەیێك مرۆڤ ئەبێتە مەلائکە، واتە وەکوئەوەی جگە خواپەرستی، کردەوەیێکی لەسەر نەبێ بیکات وە خووخدەو ڕەوشتی ئەبێتە خودایی، واتە بەوجۆرەی خوا ئەیەوێ.

مەبەستێك هەیە زۆرپێویستە بەڕوونکردنەوە کە بریتی یە لەوحاڵەتی چلەکێشانە، ئەمکارە شتێکە تاقی کراوەتەوە، وەکەڵکی لەرادەبەدەرە بۆئەوانەی ئەیانەوێ لەمڕێبازەوە بگەنەمراز بەلاّم ئەمکارانە هەموی هەوڵو تێکۆشانێکە بۆئەوەی، نەفس لەکۆڵی مرۆڤ بێتەخوار، وەمرۆڤ سواری نەفس بێت، وە لەغاوی بگرێتەدەست، کارەکە وای لێدێت، نەفس لەو خووخدە ئەکەوێ، لەو خدەیە کەوت، ئیتر هەروەکو ئەسپێکی سەرکێش، بەهۆی وەرزاندنو تەعلیم دانەوە، وای لێبێت خاوەنەکەی چی ئەوێت وابکات، ئیتر پاشان تەعلیمی پێناوێت، یان، نەخوێنەوارێ لەمناڵی یەوە بەزۆر ئەینبە خوێندن، بۆئەوەی بێتە خوێنەوار پاش ئەوەی بوبەخوێنەوار، ئیتر ئەو زۆربۆهێنانە نامێنی، یان وەکو سەعی کردنو دەرس خوێندنی بەر لەتاقی کردنەوەو شەهادە وەرگرتن، کەهاتو شەهادەکەی وەرگرت ئیتر شەونەنوستنو دەرس خوێندن تەواوئەبێت، وە ئیتر ئەوکەسە بوەتە خاوەنی ئەودانشەی کە ئەیەویست.

یان‌وەکو هەوڵ‌وتێکۆشانو هەناسەسواربون بۆگەیشتنە سەرلوتەی شاخێك، کەگەیشت ئیتر گەیشتوەتەمراز وە هەناسەبرکێ‌و ماندوبونی پی‌ناوێت.

کەواتە وەرزاندنی نەفس دەرکەوتوەو تاقی‌کراوەتەوە، کەپێویستە، وە هەروەها بۆقوناغێکە نەك بۆهەمویتەمەن، چونکە پاش ئەو قۆناغە ئیتر نەفس خۆی بەتەبیعەت وای‌لی‌دێت، حەزئەکات بەعیبادەت وخواپەرستی‌ی، وەخۆی بەتەبیعەت دژی گوناهکاری‌و کردەوەی ناشیرینە، وە لەهەموناپاکی‌یێك پاك‌بوەتەوە. ئەوەی پێویستە بۆئەوماوەیە، کەم خواردن، کەم گوتن، کەم‌نوستن، وە خواپەرستی‌ی بەردەوامو ذیکرو فیکرە، بەوجۆرانەی کەباس‌کران، ئەگەریش بلێن پێغەمبەری گەورە کەی ریازەتی کێشاوە یان ئەصحاب؟... وەلام ئەوەتە،

یەکەم

ژیانی‌ئەوان هەرلەسەرەتادا سادەبوە، چ‌بەر لەپێغەمبەریی وەچ لەپاش ئەوەش.

دوهەم:

هەموساڵێ مانگێ یان‌زیاتر چوەتە غاری حیرا، وەبیری لەژیانو لەچۆنیەتی دروس‌بونی کەون‌کردوە.

سێهەم:

ئەو (موراد) وە دەس‌چن‌کراوو پاڵێوراو بوە، وەخوا بۆپێغەمبەریی‌یەتی‌دروستی‌کردوە، وەپێغەمبەران **«مەعصومن لە گوناە»** واتە خواخۆی ئەیان پارێزێ.

چوارەم:

خوا خۆی سینەی پیرۆزی ئەوی پاك‌کردوەتەوە، لەهەمو خدەیێکی نەفسی ئەمارە، بەوجۆرەی، قورەیش نازناوی **(ئەمین)** یان دابێ، بەرلەوەی ببێتەپێغەمبەر، وە ئەوپاك کردنەوەی سینەیە. لەم‌سورەتەدا، دیارە. **«أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ؟ وَوَضَعْنَا عَنْكَ وِزْرَكَ الَّذِي أَنْقَضَ ظَهْرَكَ؟ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ؟»** ئیترپاك‌کردنەوە لەمەپاك‌تر؟..

ئەصحابیش بەھۆی ھاوڕێی ئەوەوە پێویستیان بەھیچ نەبو بەڵکو ھەموی ژیانیان بەجیهاد وەخەبات، وە خواپەرستی ی وە شەونەنوستن وە قنیاتکردن بەکەم، وە بێعینوانیو بێدەماریی بردەسەر، چونکە ئەوەندە ئایەت زۆرە بۆفەرماندان بە خواپەرستی ی لەرادەبەدەر، ھەر بەدیھێنانی ئەو ئایەتانە، بەسە، بۆئەوەی مرۆڤ بێتەمەلائکە.

سەیری ئەم ئایەتە چۆن شەو نەنوستنو خواپەرستی ی بەشەوا روون ئەکاتەوەو، خەڵك دڵگەرم ئەکا بۆ ئەنجامدانی، کەئەفەرمێ، «أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ ساجِداً وَقائِماً يَحْذَرُ الآخِرَةَ وَيَرْجو رَحْمَةَ رَبِّهِ...؟»، ئەفەرمێ، ئایا کەسێك بەندەیی خوابکات، بە شەوا خەریکی خواپەرستی بێت، تا نە، بەپێوەبێتو تانە لەکورنوش بردنا بێت لە دوا ڕۆژ بترسێت، وە سزای قیامەتی لەبەرچاوبێت، وە ئومیدی بەرەحمەتی خوابێت، ئایائاواکەسێ وەکو ئەوانە وایە، کەخاوەنی ئەمپێناسە باشانە نەبێت، جا ئەفەرمێ بە پێغەمبەر «قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمونَ والَّذِينَ لا يَعْلَمونَ؟» ئایا زاناو نەزان ئەبنە یەك؟ ئەمە خۆی ئەوەئەگەیێنێ ھەرکەسێ خاوەنی ئەم جۆرە پێناسانە بو خوا زانای ئەکات، بەو مەعریفەتو زانیارییانەی کەخۆی ئەیەوێ ھەروەکو ئەفەرمێ «وَاتَّقوا اللهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللهُ».

یان ھەروەکو کەئەفەرمێ «والَّذِينَ جاهَدوا فينا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنا» ئەوانەی خەباتیانکرد لەرێگەی ئێمەدا، رێگەی خۆمانیان پیشان ئەدەین، پاشان ئەفەرمێ ئەوانەی کەخاوەنی عەقڵو ئاوەزو دڵی رووناكو پڕلەزانیارین، ئەوانەن کەعەقڵیان،بەمجۆرە چاکوخراپییانە ئەشکێت. ئەویش ئەمەتە کە لەدوادوایی ئایەتەکەدا ئەفەرمێ «إِنَّما يَتَذَكَّرُ أولوا الأَلْبابِ» (زمر) (٩) یان، کە ئەفەرمێ «تَتَجافى جُنُوبُهُمْ عَنِ المَضاجِعِ يَدْعونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً وَمِمّا رَزَقْناهُمْ يُنْفِقونَ» (سجده) (١٦) واتە، تەنشتیان بێزارە لەناوجێگە، یان خۆیان دورئەگرن لە «پێخەو»، یان ھەرچی شتێ بۆنوستن بێت، جێگەنوستن، واتە لەشیان بێزارە لەراکشان، ھەرخەریکی شەونوێژکردنو خواپەرستیو لەخوا پارانەوەن، کەھەم لەسزای خوائەترسن، وە ھەم ئومیدی پاداشیان ھەیە، وەتەنها بەوەیشەوە ناوەستن، واتە بەشەونوێژ، بەڵکو لەوەی کەخوا دابێتی، یارمەتی ھەژاران ئەدەن. یان کەئەفەرمێ «الَّذِين يَذْكُرونَ اللهَ قِياماً وَقُعوداً وَعَلى جُنوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرونَ في خَلْقِ السَّماواتِ وَالأَرْضِ رَبَّنا ما خَلَقْتَ هذا باطِلاً سُبْحانَكَ فَقِنا عَذابَ النّارِ» (آل عمران) «١٩١»، لێرەشا خوایگەورە ستایش ئەکا لەوکەسانە کەھەمیشە وە لەھەموحاڵێکا ناوی

خوائەبەن، وەیادی خوائەکەن، جگەئەوەش بیر لەدروس بون وە لەدروس کاری ئەم کەونو کائناتە ئەکەن، «**کەواتە بیرکردنەوەیش هەر پەرستنی خوایە**» لەپاشان ئەڵێن گەورەیی هەربۆتۆیە، داوات لیّ ئەکەین لەعەزابی جەهەننەم لامان دەیت. وەدەیان ئایەتی تر، بەلاّم ئێمە ئەگەر هەر مەفهومی ئەم چەن ئایەتە سەیر کەین، ریازەتەکەمان بۆدەرئەکەویّ، وەکو شەونویّژ، کەم نوستن لەخواپارانەوە بۆ بەخشین، ئومیدەواربون بۆپاداش، بیرکردنەوە لە خەلّق ئەرزو ئاسمان، بەخشینی ئەوەی دەست بروات، بە هەژارانو، ناوی خوا بردنو یادی خوا کردن بەشەووبەرۆژ، وەبەچەشنێکی تیکرا پارێزکاریی، . «**واتّقوا الله**»، . وەدەرکەوت، ئاکامی ئەم خواپەرستیو شەونوێژو بەخشندەییو پارێزکارییە، . . هەروەها ترسی سزای خواو ئاگری جەهەننەم، ەئومێدەواربون بەپاداشی پاشەڕۆژ، وە شوێن نەکەوتنی ئارەزووی نەفس، چونکەئەمّارە بالسوئە، ئەمانە هەموی ئەبنە هۆی، ئەوەی ئەو مرۆڤەی خاوەنی ئەم پێناسانە بێت، لەگەڵی خەڵکی ترا فەرق هەیە، کەخوا ئەفەرمیّ «**اَمَّنْ هُوَ قانِتٌ**...» تائاخری ئایەتەکە، وەهەم ئەبێتە هۆی زانیاریی، هَلْ يَسْتَوِى الَّذِينَ يَعْلَمونَ والَّذِينَ لا يَعْلَمونَ؟ هەم خوا ئەیخاتە سەری ڕێگا «**سَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنا**» وەهەم خوا زانستی خۆی . . . ەرونیانەوە، وَيُعَلِّمَكُمُ اللهُ، وەهەم خوا تەواوی ئەم کردەوانەی پیّ خۆشەو سەندیان ئەکات چونکە لەهەمویانا ستایشی خاوەنی ئەوپێناسانەی کردوە.

ئەمە هەموی لەم چەن ئایەتەدا، جائەگەر بەچاوی خیرەد سەیری هەموی قورئان بکەین بۆمان دەرئەکەویّ خوای گەورە، لەگەڵی هەموی ئەوەشدا ئەفەرمیّ کەڵك وەرگرن، لەم جیهانە «**بیّگومان کەلکی حەلاڵ**» بەلاّم لەصەدان شوێنا ئەفەرمیّ، ئەم جیهانە شتێکی براوەو بیّ دەوامە، ئەوەی بەدەرد ئەخوات شتێکە کەتۆشەبێت بۆژیانی، جاویدانو نەبراوە، وەهەروەکووتم لەوێدا کەقانجازەکانی هەردوجیهان لەروانگەی قورئانەوە ئەخەمەپێش چاو دەسم بۆئەوئایەتانە ڕاکێشاوە وەدوبارەکردنەوەی ناویّ،

ئەوەش کە ڕیازەت، چل ڕۆژە وەپێی ئەڵێن چلەکێشان، ئەوەش کارناسانی ئەم ڕێبازە تاقی یان کردوەتەوە هەرکەسێکی موسوڵمان چل ڕۆژ لیّ براو کەناری گرت و سەرگەرمی عیبادەت بو، شتێکی وای بۆروون ئەبێتەوە، دڵ گەرمی کات لەسەری بەردەوام بون لەسەری ئەوڕێبازە وەئیمامی غەززالی لەکتێبی «**اَلْمُنْقِذُ**»، زۆر سوورە لەسەری ئەوە، ئەوەی کەڕیازەت نەکێشیّ وە شەونەنوستنو کەم خواردنو،

لەخەڵك کەنارگرتن بۆماوەیێکی زۆر نەکاتە پیشەی هیچی لێ حاڵی نابێت، وەسەرگوزەشتی خۆی ئەگێڕێتەوە چۆن دەرگای منارەکەی مزگەوتی ئەمەوی شام،وە مزگەوتی «صەخرە» ی «بیت المقدس» ی لەسەری خۆی دائەخستو لەوێ سەرگەرمی ذیکرو فیکرئەبو.

نمونەیێکی ئەمقسەنەکردنو کەنارەگیری لەخەڵكو بەردەوامبون لەسەری خواپەرستی یە لەقورئانایە لە سورەی ئالی عمران دا لەوکاتەدا حەزرەتی زەکەریا، داوای لەخواکرد خوا کوری بداتێ خوایش دوعای قوبوڵ کرد وە موژدەی کوری دا بێ زەکەریا لەخۆشی یا وتی، خوایا لەپاداشی ئەم لوطفەدا شتێك بفەرمو بامن ئەنجامی بدەم واتە، بەرانبەر بەم لوطفە گەورەیە بامنیش خواپەرستی وەیان کردارێکی جوان، لەسوپاسا ئەنجام بدەم، جائەڵێ.

**«قال رَبِّ اجْعَلْ لي آيَةً. قال آيَتُكَ الاّتُكَلِّمَ النّاسَ ثَلاثَةَ اَيامٍ اِلاّ رَمْزا وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثيراً وَسَبِّحْ بالعَشِيِّ والاِبْكار»**.

واتە، کەوابو لەسەرتە سێ رۆژ لەسەری یەك هیچقسەنەکەی لەگەڵی کەسا، مەگەر بەئیشارە وەبەردەوام بیت لەسەری ذیکرءوەبەیانیان وەئێوارانیش سوپاسی خوابکە.

جائەمە نمونەیێکی ریازەت، ئەمکارە ئەگەر کەڵکی رەوانیو دەرونیی نەبێت چۆن خوا دەستور ئەدات بەپێغەمبەرێکی خۆی ئەنجامی بداتێ، لەسورەی مەریەمیش دا هەر لەمبارەوە ئەم فەرمانە دوبارەکراوەتەوە بەڵام لەمیانا خوای گەورە بەزکریا ئەفەرمێ **«آيَتُكَ اَلاّتُكَلِّمَ النّاسَ ثَلاثَ لَيالٍ سَوِيّاً»** زۆرباش دەرئەکەوێ مەبەستی سێ شەوورۆژ لەسەری یەك بوە، چونکە لەولائەفەرمێ سێ رۆژ لەملایش سێ شەو کەواتە سێ شەوو رۆژە

هەروەها کاتێ کەخوا فەرمانیدا بەحەزرەتی موسی بروات بۆکێوی **«طور»** کە رازونیازی خۆی بکات لەگەڵی خواداو فەرمانو دەستوری ئاینەکەی لێ وەرگرێت ئەفەرمێ **«وَاِذْ واعَدْنا موسى اَرْبَعينَ لَيْلَةً»** واتە چل رۆژ وەعدەمان دانا بۆ ئەم کەنارەگیری و **«خەلوەت»** کردنە، واتە بەتەنها لای خوابون، ئەمەش قامك راکێشانێکە، بۆ ئەو چل رۆژە هەروەها لەسورەی **«اَعْراف»** دا ئەفەرمێ. **«وَواعَدْنا موسى ثَلاثينَ ليلة وأتممناها بِعَشْرٍ فَتَمَّ ميقاتُ رَبِّهِ اَرْبَعينَ لَيْلَةً»** کەوابو جگە تاقی کردنەوەی رێبوارانی رێگەی

تەسەووف کەخۆیان ئەزانن ئەمچلەکێشانو جلەوگیری لەئارەزوی نەفسو خواپەرستیو کەنارەگیری یە چەند بەکەڵکەو چەندە ڕاستو پی‌ویستە، سەرچاوەکانیشی لەقورئاندا، دێتەدەست وەتەصەووفی ئیسلامیش خەباتێکە بۆ ئەنجامدانی فەرمانی خوا لەڕوانگەی ئیسلامەوە موبەمو.

## کەشف‌وکەرامات :

یەکێ لەو بەرهەمانەی دانراوە هی ڕێبوارانی ڕێگەی تەصەووف بێت کەشف‌و کەراماتە، لەپێشا بابزانین کەشفوکەرامات چی‌یە، لەوەدوا لەمەبەستەکانی ئەکۆڵینەوە.

«**موعجیزە**، **کەشف**، **کەرامەت**، **موخادەعات**، **ئیستیدراج**» ئەمانە هەموی لەیەك چوارچێوەدا کۆئەبنەوە، کەپێی ئەوترێ «**خَرْقُ العادة**»، خەرق العادە، بەکارێك ئەوترێ ئەنجامدانو بەدی‌هێنانی ئەوکارە، بەرەوالەت لەوزەی کەسا نەبێت، وەکو زیندو کردنەوەی مردو، بۆحەزرەتی‌عیسی، یان هاوردنی تەختی مەلەکەی سەبا «**بەلقیس**» لەوڵاتێکەوە بۆوڵاتێکی تر، لەچاوتروکاندنێکا «**قالَ الّذي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكتابِ انا آتيكَ بِهِ قَبْلَ انْ يَرْتَدَّ اِلَيْكَ طَرْفُكَ**» «**٤٠**» «**النمل**»، وەزۆر نمونەی‌تر لەوکارانەی، کە بەپێی عورف‌وعادەت وە سەرگوزەشتو تاقی‌کردنەوەی هێزی ساکاری مرۆڤ، لەوزەی مرۆڤ بەدەرن جاهەرکەس هاتو کاریێ لەمکارانەی ئەنجامدا، ئەوە خەرقی عادەتە، واتە عادەتی ساکاری ژیانی، شکاندوە، کەواتە موعجیزەو کەشف‌وکەرامەتو ئیستیدراج هەمویان هەر «**خەرقی‌عادە**»تن، ئەم، خەرقی‌عادەتە وەئەم شکاندنی «**سونەتی‌ژیانە**»، ئەگەر پێغەمبەرێك کردی، پێی‌ئەڵێن موعجیزە ئەگەرپیاوچاكو خوا پەرستێك‌کردی پێی‌ئەڵێن کەشف وکەرامەت، ئەگەر غەیرە موسوڵمانێ وەکو «**یوگا**» کان یان فاسقێك کردی، ئەوە ئەبێتە ئیستیدراج یان موخادەعە. هەموی خەرقی عادەتی کردوە، لێك جوی‌کردنەوەیشیان ئاسانە ئەوەی خەرقی عادەتەکەی بۆئەوەبو بلێ پێغەمبەرە، وەخاوەنی ڕیسالەو شەریعەتێکی تایبەتە ئەوا خەرق‌العادەکەی ئەبێتە موعجیزە، بەڵام فەرقێکی زۆرگەورە لەنێوانی موعجیزەو

کەشف‌وکەرامەتدا ئەوەتە خاوەنی موعجیزە لەسەریەتی ئەبێ هەمیشە ئەوموعجیزەیە دەرخات بۆئەوەی تەرویجی ریسالەکەی پێ‌بدات وەخەڵك بێنە سەری ئایینەکەی بۆئەوەیش ئەوکەسەی نەهات لێ‌پرسراوبێت، تاخوا تۆڵەی لێ‌بکاتەوە. وەئەوەش شوێنی نەکەوتبێ زۆربەیان، خوا هەرلەم دنیایەدا غەزەبی لێ‌گرتون، وەدوچاری هەزاران بەڵای کردون. بەڵام خاوەنی کەرامەت، ئەکۆشێ کەرامەتەکەی بشارێتەوە، وەتابۆی‌بکرێت ئاشکرای نەکات مەگەر زەرورەتی هیدایەتی گومراو سەرلێ‌شێواوێ ناچاری‌کات لەزۆربەی کتێبەکانی تەصەووف‌دا ئەگێرنەوە زۆرێك لەوپیاوچاکانە ئاواتیان خواستوە کاشکی خوا لەکەشفوکەرامەت بێ‌بەشی کردایین، زۆرتریشی لەترسی مەغروری یان لەبەری خۆلادان لەزانینی **«ئەسراری»** خەڵکە وەزۆریان لەسەرەمەرگا وتویانە خۆزگە لەوبارەوە هیچمان نەئەزانی، یان لەترسی کەم‌بونەوەی ترسی خوا، لەوەدا مادام خاوەنی‌کەراماتن دیارە پیاوچاکن، وەلەخواوەنزیکن وەئەمەترسیان‌کەم‌کاتەوە، وەدڵنیایان‌ئەکات لە سزای‌جەهەننەم.

هەروەها هەموی کارناسانی ئەم‌ڕێگایە باوەڕیان لەسەری ئەوەتە، کەشف، ئەوە ناگەیێنێ خاوەنەکەی پایەو مەقامیان بەرزترە لەوخواناسانەی‌تر کە کەشف‌وکەرامەتیان نیە چونکە زۆرجار وا ئەبێت، وەلی وە پیاوچاکی واهەیە گومانێك لەگەورەیی‌و پیرۆزی ئەودانیە، کەچی هیچ کەشفی بۆ دەست نادات، کەچی جاری‌وایش‌هەیە **«شێت»** کەشفی‌بۆئەبێت.

بەکورتی‌ی، وەکو ئەوەی کەسێ چاوی لەکەسی‌تر بەهێزتر بێت، یان بەهۆی وەرزشەوە لەشی بەهێزتر بێت، ئەوە ناگەیێنێ لەخەڵکی‌تر گەورەترو پایەبەرزتر بێت، بەڵکو ئەکرێ پایەیشی بەرزبێت، وەهێزی‌لەشی کەم‌بێت، لەو گۆڕەپانەشا، هەربەوچەشنەیە، ئەکرێ خواناسیش‌بێت، وەکەرامەتی نەبێت، بەڵام ئەوەی **(خەرق‌العادە)**ی‌بو، وەخواناس‌نەبو، باڵیش‌بگرێتەوە، لەروانگەی ئیسلامەوە هیچی‌بەسەری هیچەوە نیە، نەوەلی‌یەو، نەپیاوچاك، بەڵکو لەپێشا ئەبێ خواپەرستو پارێزکاربێت، جائەگەر وابو، وەکاری خەرق‌العادەی لێ‌رودا ئەوە کەرامەتە، واتەپیاوچاك‌وخواپەرست‌بو.

برێ‌جاریش روداوێکی **(خەرق‌العادە)** ئەکەوێتە پێشی لەدایك‌بون، یان هاتنی خاوەن بەرەکەتێك، وەخۆشەویستیکی‌خوا، وەکو شەق‌بونی **(تاق‌کیسری)**، بەهۆی

لەدایك بونی پێغەمبەری گەورەوە، ئەوجۆرە کارانە، خوا بۆپیشاندانی خۆشەویستی ئەو خۆشەویستە پیشانی ئەدا، بێ ئەوەی خۆشەویستەکە دەستی تیابێت، بەوە ئەڵێن «إرْهاص»، واتای ئیرهاص ئەبێتە دامەزراندن، وە پایە دارژاندن، جاری وایش ئەبێت پیاوچاکێ، بگرە وەلی بێت، یان وەلی نەبێت، خوایارمەتی ئەدات، وەکو تۆڵەسەندنەوە لەکەسێك ئازاری ئەوی دابێت، یان پاداش دانەوەی چاك، بەکەسێ کە چاکەی لەگەڵی ئەوکردبێت، یان قوبول کردنی دوعایێکی ئەوکەسە، ئەمانەش هەرخەرقی عادەتە، بەوەش ئەڵێن «مەعونە»، واتە، یارمەتی دان، وەخوا یارمەتی خۆشەویستان و پیاوچاکان ئەدات.

بەرلەوە باسی کەشفوکەرامات بکەم مەبەستێکی تر هەیە، ماوەیێکی زۆربو بۆ هەلێکی وا ئەگەڕام کەهاوزمانە ئازیزەکانم، لەومەبەستە ئاگادار کەم، ئەویش، ووشەی «غەیب»، وە «غەیب زانینە»، لای خۆمان بریێ جار بەهەڵە، بەم کەشف وکەرامەتە ئەڵێن «غەیب زانین»، یان ئەڵێن فلان کەس غەیبی پێیە، یان غەیبی زانی، غەیب زانە.

ئەبێ بزانین کەشفوکەرامەت غەیب زانین نیە، وەغەیب کەس نەی زانیوەو نایشی زانی، نەوەلی و نە نەبی، هەرچەن بریێ جار ئەوکەشفە حاڵەتی غەیب زانینی هەیە، غەیب زانین ئەوەتە، تۆ بەئارەزوو، بەویستی خۆت، شتێکی نهێنی و پشتی پەردەو داپۆشراو بزانیت، لەداهاتو، یان لەرابوردو، یان لەهەمان کاتا، ئەمەیان هیچ کەس نایزانێ واتەکەس بەمەیل و ئاروزوی خۆی ناتوانێ شتێ بزانێت، جابۆیە بەوەیان گوتوە کەشف، واتە هەرکاتێ خواخۆی ویستی پەردەی سەرچاوی بەصیرەتی ئەوکەسە لائەدات، وەئەوشتەی پیشان ئەدات، جابگرە جاری واهەبێت ئەو وەلیە خۆی لەخوای داوا کردبێت ئەوشتەی بۆدەرخات، جا خوا ئارەزوی خۆیەتی پیشانی دا ئەیدات، پیشانی نەدا پیشانی نادات، نمونەی زۆر ئاشکرای ئەم کارە لەژیانی پێغەمبەری گەورەدا دەرئەکەوێ.

خوای گەورە، بەپێغەمبەری خۆشەویست ئەفەرمێ.

«قُلْ لا اَقولُ لكُمْ عِنْدى خَزائِنُ الله، وَلا اَعْلَمُ الغَيْبَ، وَلا اقولُ لَكُمْ اِنّى مَلَكٌ اِنْ اَتَّبِعُ اِلاّ ما يُوحَى اِلَىَّ» «انعام» «٥٠»، بڵێ، من ناڵێم رزقی سەرزەوی بەدەستی منە، وەبڵێ خۆمن غەیب زان نیم، وەمەلائکەیش نیم، واتە بەشەرێکم وەکوئێوە، وەبڵێ من ئەوەی

ئەیڵێم، وەحیم بۆدێ: واتە بەبێ وەحی هیچ ناڵێم، هەرعەینی شێوەی ئەم ئایەتە لەسورەی (**هود**) ئایەتی «۳۱»دا دوبارەکراوەتەوە.

لەهەموی روونتر، ئەم ئایەتەیە. کەخوا پەیغەمبەر فەرمان ئەدات، کە بەخەڵك بفەرمێ، «**قُلْ لا اَمْلِكُ لِنَفْسي نَفْعاً وَلا ضَراً إلاّ ما شاءَ الله، وَلَوْ كُنْتُ اَعلَمُ الغَيْبَ لاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الخَيْرِ وَما مَسَّنِي السّوء، إنْ أنا إلاّ نَذيرٌ وَبَشيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنون**» «**اَعراف**» (۱۸۸).

ئەفەرمێ بڵێ بەخەڵقی مەککە، من هیچ قانجازێ یان هیچ زیانێکی نەفسی خۆم بەدەستی خۆم نیە، مەگەر ئەوەی خوا خۆی ئارەزوی لەسەری بێت، وەئەگەر من غەیبم بزانیایێ قانجازو دەسکەوتی خۆم زۆرئەکرد، وەنەمئەهێشت هیچ زیانێکم لێ بکەوێت، من جگەئەوەنەبێ لەسەرمە ئێوەبترسێنم لەئاکامی کاری خراب، وەموژدەی پاداشی کاری چاکە بدەم بەموسوڵمانان، هیچی ترم بەدەست نیە.

ئایا بەڵگە لەمەروونا کتر ئەبێت بۆئەوەی خوا خۆی نەبێت، کەس غەیب نازانێ؟.

کەواتە هەرگیز وەلی وەخۆشەویستانی خوا، ناڵێن ئێمە غەیب ئەزانین، بەڵکو ئەوەی ئەوان بۆیان دەس ئەدات، کەشف وکەراماتە، «**قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ في السَّماواتِ وَالأرْضِ الغَيْبَ إلاّ الله**» «**٦٥**» **النمل**.

جا با بزانین کەشف کامەو کەرامات کامە، کەشف بریتی یە لەلاچونی پەردە بەسەری بەصیرەتی دەرونەوە، بۆ چاوپێکەوتنی برێ لەونهێنیانەی کە خواخۆی ئەیەوێ، هەروەکو، غەززالی لەکتێبی «**المنقذ**» دا ئەڵێ، «**وانكَشَفَ لي في اَثناء هذه الخَلَوات أمورٌ لايُمْكِنُ احصاءُها واسْتقْصائُها**»، لەپاشان ئەڵێ، «**وَمِنْ اَوَّلِ الطّريق تَبْتَدىء المُكاشَفات والمُشاهَدات، حَتّى اِنَّهم في يَقْظَتِهِمْ يُشاهدونَ الملائكة. وَاَرواح الأنبياء، وَيَسْمعون مِنْهُمْ اَصواتاً وَيَقْتَبِسونَ مِنْهُمْ فَوائد**».

ئەڵێ لەسەرەتای کاری گرتنەبەری رێ‌رەوی تەصەووفدا «**کەشف**» وە «**موشاهەدە**»، دەس ئەدات بۆرێبواران، برێ‌جاری واهەیە هەر بەچاوی سەر، مەلائکەکان وەرۆحی پێغەمبەرەکان ئەبینن، دەنگیان ئەبیسن پرسیاریان لێ ئەکەن و کەڵکیان لێ‌وەرئەگرن، ئەمە کەشفە، کەواتە کەشف بریتی یە لەچاوپێکەوتنی ئەسراری کەون وەشتی نهێنی، لەرابوردوو ئاییندەی ژیانی خۆیو خەڵك، بەلام کەرامەت بریتی یە لەئەنجامدانی کاری «**خارق العادە**»، وەکو هاوردنی تەختەکەی

مەلیکەی سەبا، بۆلای سولەیمان، یان دوعاکردن بۆ شیفای نەخۆشێك، تەنانەت شێت، یان نەخۆشێکی بێ‌دەرمان، یان‌داواکردن لەخوا ئەولاد بدات بەکەسێ، کەئەولادی‌نیە، یان بەرەکەت کەوتنە زەراعەت یان‌کاسبی کەسێك، یان‌شتی‌زۆر گرنگتر لەمانە، جائەگەر هی‌ئەنبیابو، وائەبێتە موعجیزە، وەئەگەر هی‌ئەولیابو ئەبێتە کەرامەت.

گرنگترئەوەتە بەلای گەورە پیاوانی تەصەووفەوە، هەر کەرامەتێ کەلەوەلی رووبدات، درێژەدان وەبەردەوام بونە بۆ موعجیزەی پێغەمبەرەکەی خۆی، کەواتە کەرامەتی ئەولیای ئیسلام، هەر موعجیزەیە بۆپێغەمبەر، چونکە یەکێ لەئوممەتی ئەوە، خوا ئەوکەرەمەی لەگەلا کردوە، چونکە ناوی کەرامەت هەر لەوەوە هاتوە، کەخوا کەرەم‌ئەکات لەگەلی‌بەندەیێکا وەپاداشی ئەداتەوە.

ئەگەریش ئەوکارە، لەغەیرە موسولمان رویدا، واپێ‌ئەلێن ئیستیدراج، وە ئەبێتەئەوەی بەهۆی ریازەت، وە موخالەفەی نەفسەوە، دەسیان ئەکەوێت، جا هەربۆ ئەوەتە بایەزید، ئەفەرمێ ئەگەر کەسێکت‌دی بالی‌گرتەوە یان بەرمالی بەسەری‌ئاوەوە راخستو نەچوە ئاوەکە، سەیری کردارو رەفتاری بکەن، ئەگەر کردوەی موبەمو، لەگەلی شرعو سوننەتدا رێك‌نەکەوت، هەرگیز باوەری پێ‌مەکەن، وەئەوە شەیتان یارمەتی‌دەریەتی، چونکە لەروانگەی ئیسلامەوە، ئەوکەسە موسولمانە، کە بەپیرەوی شەرع‌بێت، نەك ئەوەی خاوەنی **(خەرق العادە)** بێت، جا ئەوحالەتانەیە کە لەمورتازی هیندیو خاوەنی یۆگاکاندا بەرچاو ئەکەوێت.

بەلام ئەبێ‌ئەوەش بزانین، ئەم‌جۆرە دور لەئیسلامانە، هەرگیز ئەسراری هەقیان بۆکەشف نابێت، وانە لەگەلی ئەرواحی ئەنبیاو مەلائکەدا کۆنابنەوە، وەحالی مردووەکان نازانن، لەکاتێکا ئەوە، بۆ پیاوچاکانی ئیسلام دەست ئەدات،پێناسێکی ئاشکرای‌تر هەیە بۆجوێ‌کردنەوەی خاوەن کەرامەت، لەخاوەن ئیستیدراج، ئەویش ئەوەتە خاوەنی ئیستیدراج ئەکۆشێت بۆئەوەی لەم کارەی‌خۆی بەهرە وەرگرێت، وەکو بەدەست‌هێنانی پارەو سەرمایە، یان بۆ خۆهەلکێشانو خۆپیشان‌دان، وەهەول‌ئەدات لای‌خەلك بلێت من فلان‌کارو فلان‌کاری خەرق‌العادەم لەدەست‌دێت، وائەکەمو وائەکەم، تەنانەت لەشوێنێکا ئەوکارانەی پیشان ئەداتو پسولەی بۆئەبرن وە پروپاگاندەی بۆئەکەن، بەلام خاوەنی کەرامەت هیچ‌مەبەستی کەلك‌وەرگرتنی دنیایی نیەو بۆ پولو پارەی ناکات مەبەستی هەر

دڵنەوایی موسوڵمانانەو هیدایەتی ئەوان، وە تازۆری بۆنەیێت وە ناچاریی نەبێ کەشفوکەرامەت دەرناخات وەپێیەوە شانازی ناکات، وەدوبارەو سێبارەی ناکاتەوە بۆخەڵك.

جاری واهەیە کەشف وکەرامەت پێکەوە بۆپیاوچاکێ دەست ئەدات، بۆنمونە، بۆی دەرئەکەوێ فلان کەسێ لەخۆشەویستان یان مەنسوب وشاگردێکی گرفتاری نەخۆشی ی یان دەردی سەرێ بوە، ئەم بۆدەرکەوتنە کەشفە جا ئەو وەلی یە هەرلەوێوە فریای ئەکەوێ وەرزگاری ئەکات یان دوعای شیفای بۆئەکات، ئەمەشیان ئەبێتە کەرامەت.

یان کارکردنەسەری دڵی مورید بۆسەرخستنی لەرێبازی تەریقەت دا وەچارەکردنی نەخۆشی نەفس وقەلبی ئەوکەسە، وە هەزاران شتی لەم جۆرە ئەمانەش هەم کەشفەو هەم کەرامەتە.

من بەڵگەیێکی نوسراوم لەم کەشفوکەرامەتە لایە کە هی شێخی باوکمە بەیارمەتی خوا لەشوێنی پێویستدا لەم کتیبەدا باسی ئەکەم سایان لەپێشەکی دا یان لەباسی تەریقەتی نەقشبەندی دا . ،

لاموایە بەرادەی پێویست باسم کردبێت.

ئەوەی زیاتری بوێت لەکتێبەکانی تەصەووف دا وەهەروەها لەکتیبێ بریێ لەفوقەهادا بەدرێژیی باسی کراوە کەچۆن کەشف وکەرامەت لەروانگەی شەرعەوە دروستە.

ناوی ئەوکتێبانە لە پێڕستی ئاخری کتێبەکەدا نوسراوە.

---

| نور :

---

نورر، ووشەیێکی، زۆرواتایە، ووشە رەواڵەتی و ساکارەکەی، بەروناکی ئەوترێ، بەرانبەر بەتاریکی، «ظُلُمات، نور»، لەروانگەی تەسەووفەوە ئەوروناکی یەتە کەدەروونی مرۆڤ دائەپۆشێ کە هەمرەنگی جوانو هەم بۆنی خۆش وهەم تام ومەزەی لێ هەست ئەکرێ، بەلام هەموی ئەوکارانە کاروبارێکی

دەرونیو مەعنەوییە. وە قەت بەوجۆرەی کەهەیە نانوسرێت وباس ناکرێت، لەقورئانا بەواتای جۆراو جۆر هاتوە، یەکەم، یەکێکە لەناوەکانی خوا، وەلەپێناسەکانی خوا، «اللهُ نورُ السَّمواتِ والأرْضِ» سورەی نور «٣٥» ناوە بۆقورئان وەبۆ کتێبەئاسمانی یەکان کەهۆی رێ پیشان دانی خەڵکن، «فآمِنوا باللهِ وَرَسُولِهِ والنّورِ الّذي أنْزَلْنا، وَاللهُ بما تَعْمَلونَ خَبير» تغابن (٨) «ياأيُّها النّاسُ قَدْ جائَكُمْ بُرْهانٌ مِنْ رَبِّكُمْ، وأنْزَلْنا إلَيْكُمْ نوراً مُبيناً» (١٧٤) «نساء». وەچەن ئایەتی تر کەهەموو ئەوە ئەگەیێنن مەبەست لەوەشەی نور، قورئانی پیرۆزە، هەروەها ئەفەرمێ «قُلْ مَنْ أنزَلَ الكِتابَ الّذي جاءَ بِهِ مُوسَىٰ نوراً وَهُدىً لِلنّاسِ» «٩١» «أنعام».

هەروەها بەواتای ئیمان بەرانبەر بەکوفر هاتوە، هەروەکو لەیەکەم ئایەتی سورەتی ئیبراهیم دائەفەرمێ بە (مُحَمَّد) «كتابٌ أنْزَلْناهُ إلَيْكَ لِتُخْرِجَ النّاسَ مِنَ الظُّلُماتِ إلى النّورِ بإذْنِ رَبِّهِمْ إلى صِراطِ العَزيزِ الْحَميدِ».

یان کەئەفەرمێ «يَهْدي بِهِ اللهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوانَهُ سُبُلَ السَّلامِ ويُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُماتِ إلى النّورِ بإذْنِهِ، وَيَهْديهِمْ إلى صِراطٍ مُسْتَقيمٍ» (١٦) (مائدە) لەم دوئایەتە، وەدەیان ئایەتی ترا، بەئاشکرا دیارە مەبەست لەنور، نوری ئیمان وە لە «ظلمات» تاریکی ی کوفرە، هەروەها لەم قیاسەدا دەرئەکەوێ کەنور، بۆنوری چاویش هاتوە چونکە رووناکی کاتێ هەست ئەکرێت چاویچ رووناکی هەبێت ئەگینا کەچاو کوێر، واتەتاریك بو، با دنیا هەر رۆشن بێت سوودی چی یە.

جائەفەرمێ. «هَلْ يَسْتَوي الأعْمَىٰ والبَصيرُ؟ أمْ هَلْ تَسْتَوي الظُّلُماتُ والنّورُ» (رعد) (١٦) بێگومان نور بەرووناکیش وتراوە بەرانبەر بەتاریکی، وەبەخوێنەواری بەرانبەر بەنەخوێنەواری، چونکە بەنوری عیلم چاکەوخرابە لەیەك جیائەکرێنەوە. هەروەکو کەوتراوە «العلمُ نورٌ والجهلُ ظلامٌ». هەروەها، بەعەقڵیش وتراوە نور، چونکە هیچ شتێ بەبێ عەقڵ بەدەردناخوات نەعیلمو نە چاوو نەسەرمایەوسامان، عەقڵ کەنەبو مرۆڤ ناتوانێ بەوجۆرەی شیاوی مرۆڤە بژیت، وەخۆی لە حەیوان جیاکاتەوە. پەندێکی فارسی هەیە ئەڵێ «عالِمْ شُدَنْ چە آسان عاقِلْ شُدَنْ چە مُشْكِلْ»، واتە بەخوێنەواربون چەن ئاسانەو بەعاقڵ بون چەن سەختو نارەحەتە، بەرانبەر بە عەقڵ شێتی دێت، کەواتە هەم عیلم هەم عەقڵ پێیان وتراوە نور، چونکە چاکەوخراپەیان لەیەك پێ جیائەکرێتەوە. لە فەلسەفەی ئیشراق دا، سەهرەوەردی (حەڵەب)، جیهانی تاریکی و جیهانی روناکی ی باس ئەکات، وە خوای گەورە بە «نور

«الانوار» دائەنێ، کە سەرچاوەی هەمونورەکانە. وەدوعایێکی بەناوبانگی هەیە، سەرەتاکەی ئەڵێت «**یاقیوم أیدّنا بالنّور. وثبّتنا علی النّور واحشرنا الی النّور... هتد**» «کتێبی هیاکلُ النّور»، شیخ محی الدین عەرەبی، ئەڵێ نور ئەو خەلاتە خوایی یەتە، کەدێتە دڵەوەو تاریکیی دنیای «**فانی**» لەدڵ دەرئەکات، وەئیتر جگەئەو نورە، هیچی تر لەدڵا نامێنێتەوە.

ئیمامی غەززالی لەکتێبی المنقذدا ئەڵێ، زانیاریی «**تەصەووف**»، یانزانیاریی مەعنەوی، نورێکە خوائەیخاتە دەرونەوە. بەکورتیی ئەونورەی لە بواری تەصەووف‌دا باسی لێوەئەکرێت هەروەکو غەززالی و محی الدین ئەڵێن، رووناکی و بەرەکەت و زانیارییێکی بێ‌پایان وە «**موکاشەفەو موشاهەدە**»، واتە بۆدەرکەوتن و چاوپێ‌کەوتنیکی مەعنەوی یە، کەبۆرێبوارانی رێگەی تەسەووف دەس ئەدات، وە کەشف‌وکەرامات، وە مەقامات هەموی لەو نوروبەرەکەتەوە دەس ئەکەوێت، ئەو نورەتە، وا ئەکات لەوگەورەپیاوانە، بەبێ خوێندن سەر لەزۆرێك لەزانیاری‌یەکان دەرئەکەن، وەخوا چاوی بەصیرەتیان وا روون‌ئەکاتەوە، کە ئەبنە پیاوێکی تر، هەروا کەبۆ پێغەمبەرەکان رویداوە، بێگومان ئەوە نورەورووناکی.

هەروەکو ئەزانین پێغەمبەری گەورە درودی‌خوای لەسەر نەخوێنەواربو، بەلام خوای‌گەورە وادڵی روون‌کردەوە کەهیچ‌زاناو دانشمەندێکی جیهانی نەگەیشتێ، وەسینەی‌موبارەکی پڕکردلەنور، هەروەکو ئەفەرمێ «**اَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ. وَوَضَعْنا عَنْكَ وِزْرَكَ اَلَّذی اَنْقَضَ ظَهْرَكَ. وَرَفَعْنا لَكَ ذِكْرَكَ**؟»

مەبەست ئەوەتە ئەوەش نورە کەخراوەتە دڵی پەیامبەرانەوە، وە بەپەیرەویی لەوانیش دڵی پەیرەوە راست‌و پاکەکانیان، بەشێوەیێکی تر کەخوابیەوێ روون‌ئەکاتەوە، خوای‌گەورە لەباسی حەزرەتی‌موسا وەحەزرەتی یوشەع‌دا لەسورەی «**الكهف**» دا سەبارەت بەوپیاوەگەورەیە کەدیویانەو زۆرشتی لەزانستیی‌نهێنی زانیوە کەموسی نەیزانیوە، سەبارەت بەوبەندەیە ئەفەرمێ، «**فَوَجَدا عَبْداً مِنْ عِبادِنا اٰتَیْناهُ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنا وَعَلَّمْناهُ مِنْ لَدُنّا عِلْماً**»، بەڵێ ئەوە ئەوعیلمەیە کە خوا ئەیخاتە دەرونەوە، جا بەوزانیاری‌یەش ئەوترێ نور، سەبارەت بەحەزرەتی‌یوسف وەحەزرەتی‌لوط وحەزرەتی‌موسی لەسی‌ئایەتی جیاوازدا سەبارەت بەهەرسێکیان، ئەم (**جوملە**) یە، دوبارەکراوەتەوە کەئەفەرمێ «**اٰتَیْناهُ حُكْماً وَعِلْماً**» هەموی‌قورئان پڕیەتی لەم‌جۆرە کەرەمی

خودایی‌یە، لەگەڵی بەندەکاندا، وەئەمانە هەموی ئەکرێ لەچوارچێوەی ئەونورەدا کۆیان‌کەینەوە، کە بریتی بێت لە کەرەم‌و بەخشینی خوای گەورە بە بەندە خۆشەویستەکانی. ئیتریاعیلمە یاحیکمەتە یاخۆشی‌و خۆش‌حاڵی‌و پایەو مەقامە. وە نور لەروانگەی تەصەووفەوە بەوانەئەڵێن.

## قَلْبْ :

قەلب ووشەیێکە، ئەگەر لەبازاری تەصەووف، وە لە وێژەی تەصەووف‌دا ئەم‌ووشەیە لابەرین، هیچی نامێنێتەوە.

قەلب، دوو واتای‌هەیە، واتاییێکیان ئەو پارچەگۆشتەیە کەوا لەسینەی هەموئینسان‌و گیانداریێکی‌ترا، وەپاڵێوگەخانەو دینەموی لەشی مرۆڤە، وەبەکورتیی، یەکێ لەئەندامەکانی ناوەوەی لەشی مرۆڤە، ئەندامێکە بە پەك‌کەوتن‌و راوەستانی، گیان‌دار بی‌گیان ئەکەوێ، وە بەکوردیی پێی ئەڵێن «**دڵ**».

واتای‌دوهەمی ئەم دڵە، واتایێکی مەعنەویی، وە مەجازی‌یە، کە هەم لەروانگەی تەصەووفەوە، زۆرگرنگەو جەغزی ئەوزانستەیە، وەکاکڵەی کارە، وەهەم لەروانگەی کاروباری عاطیفی‌و ویجدانی‌و وێژەوانی‌یەوە، داری‌دەستی وێژەوانان‌و هەست‌یارانە کەواتە ئەوشتەی لەتەصەووف‌دا بەناوی «**قَلْب**»، واتە «**دڵ**»، باسی‌لێوەئەکرێت، ئەو دڵە گۆشتینەنیە، بەڵکو بەشێوەییێکی مەجازیی پێی‌ئەوترێ دڵ، لەراستیدا بە مەرکەزی هەستی عاطیفی‌و ویجدانی‌و ئینسانیی مرۆڤ ئەوترێ.

خۆیشمان زۆرجار ئەڵێن، بۆفلان‌شت دڵم‌سارده یان دڵم‌گەرمە، یان دڵم‌تەنگە یان دڵ‌رەقە، لەکاتێکا ئەودڵەگۆشتینە هیچ‌کام لەم‌حاڵانەی بەسەرا نایێت، بەڵکو هەرکام لەم وتانە دەسنیشانە بۆ حاڵەتێکی تایبەتی دەروونیی. لەتەصەووف‌دا مەبەست لەدڵ لەطیفەییێکە جێگەی ویست‌وحەزلی‌کردنی‌چاکەو خراپە، وەسوفی تی‌ئەکۆشێت ئەو ناوەندی هەستە خاوێن‌کاتەوە، بەجۆرێ ببێتەجێگەی تەنها هەست‌و ویستی‌چاك، وەئەم خاوێن‌کاری‌یەی دڵ پێی‌ئەڵێن تەزکی‌یەی دڵ.

کەباسی ذیکری دڵیان ئەکرد هەرچیم ئەکرد نەئەچوە مێشکمەوە ، دڵ پارچەگۆشتێکە چۆن ذیکرئەکات ، ئەیوت حەزرەتی شیخ نجم الدینی برام ، ئەمەی بیستبو رۆژێکیان بانگی کردم لێی پرسیم راست کامیل باوەرت بەذیکری دەرون نیە ؟ عەرزم کرد ، قوربان ناچێتەدڵمەوە بەبێ زمان ذیکربکرێت ، نەك باوەرم نیە ، ئەیوت رۆژێکیان شیخ وەستابو فەرموی کامیل وەرە پێشەوە ، چومە پێشەوە فەرموی پێشتر ، تابەتەواوی نزیکی بومەوە ، سەری گرتم وەگوێمی نا بەسەری سنگی یەوە ، سوێندی ئەخوارد ئەیوت ، بەزمانێکی زۆر پاراو ، ئەمبیست ئەیوت «اللهالله» ، گوێی سەرم هانی یە دواوە ، ئەمجارەکەیان خۆم سەرم نا بەسنگی یەوە ، سەیرئەکەم بەهەمان شێوە دەرونی ، (الله) ئەکات ، منیش دەستم کردە گریان وە خۆم خست بەسەری پێ یا ، ئەویش ئەم پەندە فارسی یەی فەرمو .

**«نەبدین شوری شور ، نەبدان بی نمکی»** واتە نەئەوەندەسوێر وەکوئیستە ، نەئەوەندەش بێ خوێ وەکوئەوسا .

جاسوێندی ئەخوارد ئەیگوت هەردوجارەکەی ، گوێم دووسێ پەنجەی ئەما بۆسەری سینگی وەك **(مەغناطیسی)** سەرم راکێشێ ئاوا گوێم ئەنوسا بەسنگی یەوە ، هەر وەکو وتم هەمیشە ئەوسوێندەی ئەخوارد ، وەلەتەمەنی هەشتاونەوەد ساڵیدا چەندین جار ئەم سەرگوزەشتەم لێ بیستوە .

بەلای رێبوارانی ئەم رێگەوە شتەکە شتێکی زۆرئاشکرایە ، تەنانەت هی وای هەیە پاش حەفتەییك ، یان پاش چل رۆژ دڵی دەس ئەکاتە ذیکرکردن ، شتەکە پێویستی بەلێ بڕان وباوەری تەواوو خەریك بونەوەیە .

زوتروتمان لە دەرونا چەن لەطیفەیێك هەن کە بەلای نەقشبەندی یەکانەوە پێنج لەطیفەن ، قەلب ، رۆح ، سیرر ، خەفی ، ئەخفاء نەفسیش هەیە ، بەڵام نەفس بەلطیفەی عالەمی خەلق واتە مادده ، یان بەشەماددەیی یەکەی مرۆڤ دائەنرێت .

جا نەقش بەندی یەکان لەدڵەوە دەس ئەکەنە راهێنانی ، وە بە بەردەوام بون لەسەری ذیکر ، بەشێوەی تایبەتی خۆی ، ئەودڵە دەس ئەکاتە ذیکر ، پاشان هەموی **(لەطائفەکانی تر)** پاشان لەطیفەی نەفس ، کەناوەندی هەستی حەیوانیی واتە شەهوانیی مرۆڤە ، وە **«أمّارَةٌ بالسّوء»** ، لێرەداپەنجەئەکێشم بۆچوارشیعر لەقەصیدەیێکی حەزرەتی شیخ عومەر ضیائوددینی نەقشبەندی ، کەخۆی پیری تەریقەت و مورشیدێکی کامیل بوە ، لە کاتی سلوکی تەریقەت دا ئەم شیعرانەی

فەرموە ، وادیارە لەوکاتەدا مەقامێکی گەورەی خەڵات کراوە کەئەمشیعرانەی بەوبۆنەوە فەرمووە ، وە دەس نیشانە بۆخاوێن کردنی لەطائف ، وەذیکری ئەو لەطائفانە کەئەفەرمێ .

**(لەنەشئەی فەیضی عیشقی فەخری عالەم دڵ موصەففایە**
**لەژەنگی مەعصی یەت شۆراوەسینەم پڕتەجەللایە)**
**(لەدەس تەزویری نەفس و مەکری شەیتانی لەعین دەرچوم**
**عەجەب بالأیە ڕوتبەی عیشقم و نەفسم تەوللایە)**
**(مەقامی عاریفان بێ زەحمەت و ڕەنج و مەشەققەت دیم)**
**لەزومرەی عاشقانم بۆیەعالەم لێم تەبەڕڕایە**
**لەهەرچی ڕوودەکەم وەك ڕۆژعەیانە چی ڕموزاتە**
**«لەطائف» سەربەسەر موستەغریقی ذیکری «هو الله»یە**

سەرەڕای باسی لەطائف وەذیکر ئەوەش دەرئەخات کە(موراد)بوە . واکەئەڵێ ، مەقامی عاریفان بێ زەحمەت و ڕەنج و مەشەققەت دیم ، چونکەوتمان موراد بەبێ ڕیازەت و دەردی سەر ، خواخۆی سەری ئەخات ، مورادەکان ، خۆیان نارۆن بەڵکو ئەیان بەن .

لەم بەینەدا کتێبێکم دی هی (**عبدالرحمن الدمشقی)ناو کەلەحیجازدا** نوسراوە وەرەخنەی گرتبو لەتەصەووف ، یەکێ لەوشتانەی کەوتبوی ، ئەوەتە ، دڵ چۆن ذیکرئەکات ، ئەوکەسە لای وابوە دڵ بریتی یە لەوپارچەگۆشتە ، لەکاتێکا ، ئەمرۆ بەهۆی شریتی تەسجیل «**دەنگزدەرە**» وە ، دەرئەکەوێ قسەکردن پێویست نیە هەر بەزمان بێت ، تەنانەت بێ گیانیش قسەئەکات ، یان ڕادیۆو تەلەفزیۆن بۆچی زمانیان هەیە ؟ ئەمەلەروانگەی شتەماددی یەکانەوە ، بەڵام لەروانگەی مەعنەوی و مەجازی یەوە ، ئایا ئەوهەموە ئایەتانەی قورئان چی لێ ئەکات کەسەبارەت بەژەنگی دڵ ، بە کلۆم لێدرانی دڵ ، بەرەشی و تاریکی دڵ ، لەمۆرکردنی دڵ ، وەدەیان پێناسی تری دڵ هاتون ، (**سبحان الله**) ، خوا کەدەرگای هیدایەتی داخست ، تەنانەت لەخوێنەواریشی دائەخات ، بەجۆرێ ئەم هەموە ئایەتەی لەبەرچاو ون بێت .

جاریّ بەرلەهەموشتیّ خوا سەبارەت بەناردنی خەڵاتی قورئان بۆ پێغەمبەر درودی‌خوای‌لەسەر ، ئەفەرمیّ «فَانَّهُ نَزَّلَهُ عَلی قَلْبِكَ» هەم قورئان‌خۆی ماددەنیە ، تابێتەخوارەوە بەڵکو مەفهومەو فەرمودەیە ، وەهەم دلّ ، ئەگەر ئەودڵەی پیّ ئەوشەخصە ئەڵیّ، چۆن قورئانی دێتەسەر ، بەڵکو لەوێدا ئەو قەلبە ، حەقیقەتی موحەممەد وەحەقیقەتی «نوبووەتی» موحەممەدە ، یان ئەفەرمیّ ، «إنَّ في ذلِكَ ذِكْرى لِمَنْ كانَ لَهُ قَلْبٌ» ئەگەرلێرەدا مەبەست دڵی گوشتین‌بوایێ خۆهەموگیان‌داریّ دڵی‌هەیە ، ئەم‌قەلبەلێرەدا ئەودەرونەیە کەئەتوانیّ پەندوئامۆژگاری وەرگرێت ، یان وەری‌نەگرێت .

یان کەئەفەرمیّ ، «إلاّ مَنْ اَتی اللهَ بِقَلْبٍ سَليم» یان دەیان پێناسی‌تر وەکو؛ قَلْبِ مُتَکَبِّر، فَظاً غَليظَ القَلْب ، «وَلكِنْ تَعْمَى القُلوبُ الّتی فی الصُّدور» ، «اَمْ علی قلوبٌ أقْفالُها» ، «وَبَلَغَتِ القلوبُ الحَناجِرَ» «فإنّها مِنْ تَقوی القُلوب» «وَيُشْهِدُ اللهَ عَلى ما في قَلْبِه» «وَخَتَمَ عَلی سَمْعِه وقَلْبِه» «رَبَطْنا عَلی قَلْبِه» «وقالوا قُلوبُنا غُلْفٌ» «وَلا تَجْعَلْ فی قُلوبِنا غِلاًّ» ، «رَبَّنا لاتزِغْ قلوبَنا» «بِما كَسَبَتْ قلوبُكُمْ» «ثم قَسَتْ قلوبُكُمْ» «خَتَمَ اللهُ عَلى قلوبِهِمْ» «فَوَيْلٌ للقاسِيَةِ قَلوبُهُمْ» «للّذينَ في قلوبِهِمْ مَرَضٌ» «وَطَبَعَ اللهُ عَلى قلوبِهِمْ» وەدەیان پێناسی‌تر کەهەموی سەبارەت بە «قلب» لەقورئاناهاتوە ، وەهەموی ئەوە ئەگەیێنیّ ئەودڵەی کەخاوەنی ئەم‌هەموە پێناسانەیە ،- ئەوپارچەگوشتەنیە ، وەبەپێی ئەوئایەتانە ئەودڵە هەم‌خاوەنی کردەوەی‌چاکەو هەم‌خراپ ، هەم پاداشی‌ئەبێت‌و هەم‌سزائەدرێت .

ئایا ئەوکەسە ئەم‌هەموە ئایەتەی نەدیوە ؟ .

بەراستی‌ی وەڵامی ئەوجۆرەکەسانە هەروالێرەدا کەخوائەفەرمیّ ، «وَخَتَمَ عَلی سَمْعِهِ وَقَلْبِه» .

بەتایبەت ، ئایا ئەوجۆرە کەسانە کەوا ئەزانن مەبەست لەدلّ ئەم دڵەگوشتینەیە ، وە ئایادلّ چۆن ذیکرئەکات ، ئایا بەراستی ئەم ئایەتانەیان نەدیوە بەتایبەت ، لەوێدا کەئەفەرمیّ بەپێغەمبەر درودی‌خوای لەسەر «ولاتُطِعْ مَنْ اَغْفَلْنا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنا واتَّبَعَ هَواه» «٢٨) الکَهف» ئایاسەبارەت بەم‌ئایەتە ئەڵیّ‌چی ؟ اَغْفَلْنا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنا واتای‌چی‌یە ؟ ئایائەمە ذیکری دەرون‌نیە ؟ .

یان‌کەئەفەرمیّ «وَمَنْ يُؤمِنْ بِاللهِ يَهْدِ قلبه» «١١» تغابن» ، ئەمەچی‌ئەگەیێنیّ هیدایەتی قەلبی‌گوشتین‌ئەگەیێنیّ ، یان حەقیقەتی ئەومرۆڤە ؟ «وَلَمّا يَدْخُلِ الايمانُ فی قُلوبِكُم» «١٤»

ئەبێ ئەوەش بزانین تەواوی ئەم پەیوەندانەو ئەم مامەڵانە هەموی مەعنەوی‌و ڕۆحی‌یە وە تەنها بەچاوی دەرون «**بەصیرەت**» هەست ئەکرێن ئەگینا نە جۆگە ئاوەو نە پەیوەندی ماددی .

جا کەئەو پەیوەندە «**رابیطە**» بەرقەرار کرا وەئەو موریدە توانی ئەوپەیوەندە بەدەست بێرێ ئەمجارەیان نورو بەرەکەتێ کە لەرابیطەی مورشیدەوە دەستی ئەکەوێ ئەونورە هەمان کارئەکاتەوە سەری لەطائف وە لەطائفەکان یەك لەدوای یەك تەزکی‌یە ئەبن وە دەردەکان یەك لەشوێنی یەك چار ئەکرێن وەکو دەردی حەسەد،یان خۆ بەزل‌زانین وغرورو بیرلەمردن نەکردنەوە «**طولی‌ئەمەل**» وە خۆ پروکاندن بەشوێنی سەرمایەو سامان پێکەوەنان‌و هەموی ئەوپێناسە ناپەسەندو خراپانەی کە باسمان کردن . جا پاش پاك بونەوەی دەرون لە خەوش وە هەڵکرانی نوری هەق لە لەطائف‌دا وە دەست‌کردنە ذیکری لەطائف،ئیتر ئەوموریدە ئەگات بە ئاواتی حوزورو موشاهەدە وە دڵ‌ودەرون بەو بەئاوات گەیشتنە دائەمرکێ وە دەست ئەکاتە (**سەیری ئەنفوس**) ڕووەو هەوارگەی فەنا وە بۆگەیشتن بەمەنزڵی بەقا .

مەبەستێکی‌تر لە ڕوون کردنەوەی ئەم بەرهەم‌وەرگرتن لەمورشیدی کامیلە ئەوەتە ، لەکاتی ذیکرا گومان ڕێبوار بەدڵ دەست‌ئەکاتە ذیکر تادڵی ذاکیرئەبێ پاشان‌بەو لەطیفەکەو بەو طیفەکەی‌تر ، بەلام لێرەدا ئەومورشیدە یارمەتی ئەدات ، ئەویش بەوجۆرەیە هەرجارەی «تَوَجُّه» تەوەججوە ئەکات،واتە ڕووی‌دڵ‌تی‌کردن ، ڕوی دڵی ئەکاتە یەکێ لەو لەطائیفە وە پەیوەندی ئەدا بە لەطیفەی خۆی‌یەوە بێگومان لەطیفەی مورشید هەم ذاکیرەو هەم نورانی‌ی هەرکە پەیوەندی‌دا بە لەطیفەکەی خۆیەوە لەطیفەی موریدەکەش دەس‌ئەکاتە ذیکرو نورانی‌ی ئەبێت ماوەیێك وازی‌لێ دێرێت تاپاش بەوحاڵەوە دامرکێ‌و دامەزرێ جا ڕوی‌دڵ ئەکاتە لەطیفەیێکی تری بەم‌جۆرە ماوەیێك نابات ، بەتایبەت ئەگەر موریذ ئیستیعدادی‌بێت(هەروەکوز یرەکی‌وئیستیعدادی‌خوێندن)ئەگەر ئیستیعدادی بو ، زۆر زوتر لەو ڕەوشەکانی‌تر ئەو موریدە پێ ئەگات‌و لەطائفەکانی تەزکیە ئەبن ، هەروا بۆ مەقامەکانی لەوەو لاش تائەگاتە فەناو بەقا .

لەوەولا ئیتر ئەوکەسە خۆیو هیممەت‌و ئیستیعدادی وەئیتر پی‌ویستی بەمورشید نامێنێ وەخۆی کامیلە ، بەلام هەروەکو گوتمان ئەم کەماڵە نیسبی‌یە وەهەر دوایی نایێ هەتا هەر شوێنێ خوا مەیلی لێ‌بێت ئەو بەندەیە پێش ئەکەوێت‌و سەر ئەکەوێ هەروا

کە زانیاریی ظاهیریو ماددی بێپایانەو هەردوایی نایێ وە مرۆڤ هەرئەتوانێ زاناترو زاناتربێ یان دەوڵەمەندترو دەوڵەمەندتربێ ئەمیش هەروایەو لوطفو کەرەمی خوداو فەیضو مەقام هەر دوایی نایێ بۆیەئەڵێم کەمال نیسبیە کەمالی تەواو هەرهی خوایە وە ئینسانی کامیل کە گەیشتبێتە دواپلەیێك ئینسانێك بتوانێ بگات، حەزرەتی موحەممەددە،پاش مەقامی ئەو ئەنبیاکانن پاش مەقامی ئەوان جا مەقامی ئەولیایە .

بەڵام لە عورفی تەصەووفدا ئەو خوداپێداوەی گەیشتە بەقای پاشی فەنا بەکامیل دائەنرێت وەکو شەهادەی بەرزی دنیایی بڵێین (**دوکتۆرا**) ئیتر ئەوکەسە ئەتوانێ لەو رشتەیەی خۆیا کارناسو ماموستابێت .

یادئاوەرییو هۆشدارییێك هەیە لێرەدا کاتی گوتنیەتی ، ئەویش ئەوەتە پرمەترسیترین شت لەتەریقەی نەقشبەندیدا ئەوەتە کەسێك نەگەیشتبێتە ئەم بەقای پاش فەنایە وە روخصەتبدات موریدەکانی رابیطەی بکەن ، یەکەم گوناهێکی زۆر گەورەیە شایەد وەکو شیرك وایە وە گوناهەکەی وا لەگەردنی ئەو مورشیدەدا،بێگومان خوا سزای ئەدات ، دووهەم،نەخۆشیی رۆحیو دوچاربونی وەسوەسەو دەیان گرفتارییە کە ئەو موریدە توشی ئەبێت .

ئیرشاد جیایەو ئیجازەی رابیطەدان جیایە،ئیرشاد ئەگەر **«ئەمر بەمەعروفو نەهی لەمونکەر»** هەمومان لەسەرمانە بیکەین ئەگەر ئیرشادە بۆ شەریعەت هەمو مەلاچاکێ لەسەریەتی بیکات . بەڵام بۆ تەریقەت ئەبێ ئەوکەسە ریكو راست بەموریدەکانی بڵێ،بڵێت من نەصیحەتتان ئەکەم ئەبمە هۆی تەوبە دادانو وە راهنماییتان ، بەڵام من مورشیدی کامیلنیم وە رابیطەم دروس نیە .

یان وەکو ئەمیرکولالی مورشیدی شاهی نەقشبەندە،بڵێ من تائێرە شارەزام لەمەولا برۆ کەسێکیتر پەیداکە دەرست پێبڵێ .

مەبەستێکیتر سەبارەت بە تەوجججوە لەموریدە ، پێویستنیە ئەومورشیدە هەر روبەروو تەوججوە بکات ، مورشید کەمورشیدبو دوورو نزیکی بۆنیە وە لە دوریشەوە ئەتوانێ رووی دڵی بکاتە مورید وە بەهرەی پێبگەیێنێ لەگەڵ ئەوەشا نزیکییەکە کەڵكو دەستکەوتی زۆرترە ، هەروەکو وتمان نزیکیی لەپیاوچاکان کەڵکیزۆرە وەمایەی خۆشیو خۆشبەختیو پێشکەوتنە پیاوچاكو وەلی خۆشەویستی خودان وە نزیکیکردن لە خۆشەویستانی خودا مایەی خۆشبەختیی هەردو دنیایە وە سەرگوزەشتو ئازمونیش ئەمەی بۆ رێبواران روون کردوەتەوە .

مەبەستێکی تر لەپێشا پەنجەمان بۆرا کێشاوە ئەوەتە پێش‌کەوتن بۆ هەموکەسێ بەکسان نیە بەڵکو بەپێی ئامادەگی ی وەئیخلاص وەئەدەبی ئەوکەسەتە هەروەکو بۆهەموکارێکی گرنگی‌تر ئەو مەرجانە هەیە .

بۆ ئەوکەسانەی مورشیدیان هەیە ، باوەکو خەریکی ذیکرەیان موراقەبەش‌بن ، بەر لە دەست‌پێ‌کردنی ئەوکارەیان،ئەبێ یادێ لەمورشیدەکەیان بکەن وەداوای یارمەتی لی‌بکەن بەتایبەت بۆ پاراستنیان لە وەسوەسەی شەیتان وە نەفس وە ئەویادکردنە ئەوەنیە شێوەو قیافەی بێرێتە پێش‌چاو بەڵکو وابزانێ کە رۆحی مورشیدەکەی حازرە ، ئیتر پاشان بەبێ خەیالێ لەهیچ‌شتێ دەست‌کاتە ذیکر یان موراقەبە .

شاە عبد الله دهلوی ئەفەرمێ هەرچەن لەرێ‌بازی نەقشبەندی‌دا ذیکری زمانی تائەوکاتەی کە ذیکر لەدەرونا ئەبێتە مەلەکەو خدەی هەمیشەیی رێ‌بوار ئەنجامی نادرێ لەگەڵ ئەوەشا ذیکری زمانییش ئەگەر بەومەرجانە کرا کە باسمان کردن ئەویش هەر بەکەڵکەو بەهرەی مەعنەویی خۆی ئەدات .

پاشان ئەڵێ موریدی تەریقەی نەقشبەندی نابێ هیچ کاتێکی خۆی بێ ذیکرو فیکرو نیازو گەردەن‌کەچی دەرگای هەق بباتەسەر ، تەنانەت لەکاتێکیشا وا لەناوی خەڵکا وە سەرگەرمی کاروکاسبییە ئەبێ یادی خوا بکات‌و هۆشی بەلای خوداوە بێت ، وە ذیکری خوا بکات ، پاشان ئەم جوملەیە ئەفەرمێ .

«فَیْضِ‌حق بِناگاهْرَسَدْ وَلِی بَرْدِلِ ئاگاه رُسَدْ» .

نوروبەرەکەتی خودا لەکوتوپرا ئەبارێ
بەلاّم بەسەری دڵی ئاگادارا ئەبارێ

ئەفەرمێ بەم حاڵە ئەڵێن خەلوەت دەر ئەنجومەن واتە لەتەکی خوا بوندا لەوکاتەی کەوا لەناوی خەڵکیشا .

هەرئەمەتە کە گوتراوە (الصُّوفِیُّ کائِنٌ بائِنْ) واتە؛ بالجسم کائنٌ مَعَ النّاسِ وبالرّوحِ بائِنٌ عَنْهُمْ . بەلەش والەناوی خەڵکاو بەدڵ وا لای خودا جا گوتمان ، خەلوەت دەرئەنجومەن ، یەکێکە لە رەوشەکان وەلە پایەکانی گرتنەبەری رێبازی نەقشبەندی‌یە کان .

ئێمه تائێره باسی هەرسێ ڕەوشەکەی ڕێگرتنەبەری ڕێبازی نەقشبەندی‌مان‌کرد ، واته ٬ ذیکر٬موراقەبە٬وە مورشید٬یان ذیکری رابیطه .

لەیادتانه باسی نەخۆشی‌ی دەرونمان کرد وە وتمان پێیان ئەوترێ پێناسی ناپەسەند . وەکو حەسەد وە کینه ... هتد وەگوتمان موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەوەتە بتوانێ دەرونی خۆی لەم دەردانە پاك‌کاتەوە دیارە ئەم کارەش زۆر ستەمە وە ئەگەر ستەم نەبوانێ ئیتر هەرچی گیروگرفتی ژیانی ئینسانە هەموی چارە ئەکرا ، جا لەوبەشەدا کە مورید ڕێبازی رابیطە ئەگرێتە بەرەوا لەسەری مورشیدە ئەو نەخۆشی‌یە دەرونی‌یانە لەدڵی مورید دەربکات .

بەلاّم دەربارەی گرتنەبەری ڕەوشی ذیکری لا اله الا الله واته نەفی‌وئیسبات هەربەم ذیکرە ڕێبوار ئەتوانێ دەردەکانی دەرونی‌خۆی چارەکات وە ئەم ڕەوشە تاقی کراوەتەوە وپەیرەوی لێ‌کراوە وەبەم جۆرەیە . ئەو ڕێبوارە کاتێ ئەیەوێ بەوشێوەیەی کەباسمان‌کرد دەست‌بکاتە ذیکر لەهەمان کاتا ئەتوانێ تێ‌کۆشێ بۆ دەرمانی دەردەکان ، ئەوکەسە لەوکاتەدا کە ئەڵێ لا إلهَ٬لەعەینی ئەوکاتەشا بەخەیاڵ ئەڵێ لەدڵی‌منا حەسەد وجودی‌نیە وە ئەوەی هەیە هەر الله یە ، هیچ‌نیە لەدەرونی منا إلا الله٬جگەخوا ، بەم جۆرە ئەوکەسە خۆی هەست‌ئەکات بەوەی وادەرونی لەو ڕەذیلەیە پاك بویەوە هەروا سەبارەت بەیەکە یەکەی ئەوپێناسە ناپەسەندانەی کە هەست ئەکات لەدەرونیا جێ‌گیرن ، چونکە زۆرکەس هەیە خۆبەخۆ برێ پێناسی نیە ، بۆنمونە قەت درۆزن نەبوە یان خۆ بەزل‌زان نەبوە ، بەکورتی‌ی خۆی ئەبشکێنێ هەرچی صیفەتێکی خراپی دی ئەتوانێ بەوجۆرە وە بەکارکردی بەرەکەتی ئەوذیکرە لەناوی‌بەرێت مەرجی ئەوەتە جارجارەش لەدڵەوە لەخوا بپارێتەوە بڵێ خودایا من ئەم سورشتە نارەوایەم هەیە وەلەتۆ داوا ئەکەم چارەم بکەی وە لەکۆڵمی بکەیتەوە ، بەمجۆرە خۆی هەست ئەکات وردە وردە یەك لەدوای یەك پێناسە ناپەسەندەکانی لەرەگو ڕیشە دەردێن .

ئەم دەرون پاك کردنەوەو ئەم تەزکی‌یەو پاك کردنەوەو ڕوون کردنەوەی لەطائفانە وە لەم مەڵبەند گواستنەوە بۆ ئەو مەڵبەند وە هەروەکو لەپێشا گوتمان برینی حەوت قۆناغ یان پاك‌کردنەوەی حەوت قۆناغە٬پێی ئەڵێن **(سەفەر لەندەر وەتەن)** واتە گەشت‌وگوزار لە وەتەنا وە لەدەرونی مرۆڤ خۆیا لەم مەڵبەندەوە بۆئەومەڵبەند تاهەمویان پاك ئەکاتەوە هەروەها ئەمەتا وردبونەوە لەدەرون تابزانی دەرونت دەردی

چی‌یەو کەم‌وکورپی کامەتا تاوەکو چارەی کەیت هەروەکو کەخوا ئەفەرمیٚ (**وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ** .؟) صوفی لەم قۆناغەدا وای لی‌دێت وە بەجۆریٚ خدە ئەداتە ذیکر ، لەهەموشتیٚ بێزارە جگە لەناوی خوابردن‌و یادی خواکردن ، ئەوەتە کەفەرمویانە .

ئانچە جُزْ ذِكْرِ خُدای أَحْسَن است
گَرْ شَكَرْ خوردَنْ بُوَدْ جانكَنْدَنْ است

واتە ، ئەوەی جگە ذیکری خودا بێت شەکر خواردنیش بێت وەکو گیان کەنشت وایە .

هەروەکو سەبارەت بە ذیکرکردنی زۆرءخوا ئەفەرمیٚ. (**وَاذْكُرُوا اللهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**) (**جومعە**) «١٠». ئەوکەسەی لەکاتی ذیکرا بەرەکەت‌ءیان هەرجۆرە دەست‌کەوتێکی مەعنەوی بۆدەست‌ئەدات کەخۆی هەستی پیٚ ئەکات ، ئەبی تێکۆشیٚ ئەوحاڵەتەی لەدەست دەرنەچیٚ ، واتە لەگەڵی دەست‌دانی حاڵەتەکەدا ئیتر خۆی بداتە دەستی ئەوحاڵەتە تاهەرکاتیٚ ئەو چۆنیەتە هەیەو بەردەوامە ، هەرکە حاڵەتەکە نەما سەرلەنویٚ دەست‌بکاتەوە بەذیکر تاجارێکی‌تر ئەوحاڵەتە دەست‌ئەداتەوە ، ئەم‌کارە ئەوەندە دوبارە ئەکاتەوە تا ئەو حاڵەتە وە ئەو دەس کەوتە هەرچی هەیە ئایا نورە یان بەرەکەتە ، ئەبێتە «**مەلەکە**» و ئەبێتە خدەو دەس‌کەوتێکی هەمیشەیی .

ئەر لەیادتانابێت لەباسی لەوامیع‌دا وتمان موریدی تازەکار لەپێشا ئەبینیٚ نوریٚ دێتە دڵیەوەو بەلاٚم سەقام‌گیر نابێت‌و ئەروات وەئەم حاڵە دوبارەو چەن‌بارە ئەبێتەوە تا ئەودەمەی ئولفەت وەخدە ئەگریٚ بەو دەرونەوەو سەقام‌گیر ئەبێت .

وە لەزمانی ئیامی غەززالیشەوە هەر عەینی‌شت ئەم مەبەستە باس‌کرا ، وە ئەمە پێشەنگو سەرەتای دەست‌کەوتی رێبوارانی تازەکارە .

پاش‌ئەمە کاتی «**جەذبەی قوبول**» ە ، ئەمەش ناوێکە کە رێبواران دایان ناوە بۆ حاڵێکی تایبەت کە رویان تی‌ئەکات واتاکەی ئەبێتە راکێشران بۆلای‌خودا ، وە پەسەندبونی ئەو رێبوارە بەلای‌خوداوە . جا ئەگەر ئەو جەذبەیە گەیشت وەسەری هەل‌دا ، شنەی شەماڵی بەرەکەتی خوایی بەجۆریٚ لەدەرونا هەل‌ئەکات ئەوکەسە زۆرباش ئاگای لی‌ئەبێت وە هەستی پێئەکات رۆحی پێی‌شاد ئەبێتەوەو گەشەی

پیی ئەکات، بریٚجار ئەم شنەو بەرەکەتە ئەوەندە خۆش و دڵ کێشە مرۆڤ لەسەری خۆی ئەچیٚ وە ئاگایێکی بەلای ئەم جیهانەوە نامێنیٚ.

ئەگەر ئەم حاڵە زۆربوو وەبەردەوام هەرهات ئومێدی حوزورو فەنایش ئەکرێت، کاتیٚ حوزوریش دەستی داو بەردەوام بوو بەوە ئەڵێن «**حەقیقەتی ذیکر**»، چونکە ئەوشنەیەی کە لەپێشا هەڵی کردبو صورەتی ذیکربوە، واتە وێنەبوە نەك حەقیقەت، بەلاٚم کەحوزور دەستی داو دامەزرا ئەوە حەقیقەتی ذیکرە، وەبەم حاڵەتەئەڵێن «**دَرْجُ النِّهَايَةِ فِي البِدايَة**» یان «**اِنْدِراجُ النِّهايَةِ فِي البداية**» ئەمەش خۆ وەنەبیٚ هەموی لەرۆژێکا یان بەجارێکا دەست بدات، هەرشتەو کات و ساتی خۆی هەیەو ماوەو ئەندازەی خۆی.

سەبارەت بەجۆری دەست کەوتە مەعنەوی یەکان وەدەس کەوتی هەر لەطیفەییٚ یان دەس کەوتی هەرجۆرە عیبادەتیٚ وەکو شەونوێژ قورئان خوێندن صەلەوات دان ئەوەندە زۆرن هەرلەباس نایێن، یان سەبارەت بەجۆری بەرەکەتی تەریقەتەکان کە هەرکامەی جۆرە حاڵێکی تایبەتی هەیە، ئیمامی رەببانی لە مەکتوبات دا باسیان ئەکات، چونکە ئەو وای بۆ رێك کەوتوە جگە لەوەی خۆی گەورەپیاوی تەریقەی نەقشبەندی یە، ئیجازەی ئیرشادی تەریقەتەکانی قادری و سەهرەوەردی و چەشتی پیی دراوە، شاه عبداللەی دهلی ئەفەرمیٚ بەرەکەتی پیاوچاکان، هی وای هەیە وەکو تیشکی رۆژێکە لە کوناوجێك «**کلاٚورۆچنێك**» ەوە بدات لەدەرون، هی وای هەیە وەکو هەوریٚ وایە کەچواردەوری دەرون دائەپۆشیٚ هی وای هەیە وەکو شەماڵێکی فێنك وایە کە هەڵ کات «**بەوجۆرەی لەپێشا باسم کرد**» یان وەکو باران یان جۆگە ئاوێکی پاکی رەوان وایە یان وەکو چادرێکی ئاوریشم هەموی لەش دائەپۆشی یان وەکو شەونمێك بەوجۆرە ئەبارێتە سەری دەرون.

یان ئەفەرمیٚ، زۆرتر لەگەورەپیاوانی رێبازی چەشتی یەکان گەرماو شەوق وە لەگەورەپیاوانی قادری یەکان صەفاو لەمەعان واتە رووناکی و درەوشانەوە دەس ئەدات وە لەگەورەپیاوانی نەقشبەندی بیٚ حاڵی و لەسەرخۆچون رووئەدات بۆمرۆڤ، ئەفەرمیٚ شوێنەواری سەهرەوەردی یەکانیش هەروەکو هی نەقشی یەکانە.

ئەمانە دسکە گوڵیٚ بون لە گوڵشەنیٚ وە قەترەییٚ لە دەریاییٚ، کە بۆ روون کردنەوەی ئێوە نوسیم، ئەگینا بەراستی ی، جیهانی تەصەووف وە خوداناسی ی

بێپایانەو ئەم پەرو ئەوپەری نادیارە. بەرلەم روون کردنەوەیە باسی ووشەی «**اندراج النهاية في البداية**» هاتەپێشەوە. چونکە ئەم ووشەیە لە بازاری ری‌گرتنەبەری رێبازی نەقشبەندی دا زۆرجار ئەبێنرێ بەپێویستم زانی تۆزێ باسی لێوە بکەم.

گوتمان پەیدابونی شوێنەواری حەقیقەتی ذیکر لەدەرون‌دا پێی ئەوترێ «**اندراج النهاية في البداية**» شێوەی تری ئەم ئیندیراجە ئەوەتە، برێ‌جار مورشید لەوکاتەدا کە تەوەججوە ئەکات لەمورید برێ مەقامی گەورەی پیشان ئەدات، یان بۆماوەیێك لەومەقامەدا ئەیهێڵێتەوە، بەجۆرێ وای لی‌دێت خۆی بەخاوەنی ئەومەقامە ئەزانێ، جا سەرلەنوێ ئەیگێڕێتەوە بۆحاڵەکەی لەوەوپێشی خۆی، ئەمەیان بۆ تەشویق وە دڵ گەرم کردنە. بۆئەوەتە ئەومورێدە پاش ناسینی ئەو مەقامە هەوڵ‌بدات بۆ بەدەست‌هێنانی.

هەروەکو لەکاروباری دنیایی‌دا مرۆڤ ببەن کۆشك‌و تەلارێکی پیشان‌دەن بڵێن ئەوکەسەی بویە خاوەنی فلان پایەی دنیایی ئەم‌کۆشك‌و تەلارە ئەبێتە هی‌ئەو، بێ‌گومان ئەوەی خوازیاری پایەو پلە بێت، هەوڵی زیاتر ئەدات بۆگەیشتن بەو پایەو پلەیە.

شێوەیێکی تری ئیندیراج ئەوەتە کەشف دەست‌ئەدات بۆ ئەو رێبوارە وەبرێ‌شت لە نهێنی‌یەکانی پیشان ئەدەن، وەکو ئەوەی حاڵی مردوو، چاك چ‌خراپی پیشان ئەدەن. کە خۆی لە راستەکەیا کاتی ئەوەی نەهاتوە بەهێزی مەعنەویی خۆی ئەوشتانە دەرك کات، بەڵام ئەم‌کارەی بۆیە لەتەکا ئەکەن هەم بترسێ وەهەم ئومیدەواربێت «**خەوف‌وەرەجا**» وە باوەری ببێتە «**عَيْنُ اليَقين**».

شێوەیێکی تری کاتێکە ئەومورێدە لەهەموی ئەم قۆناغانە تێ‌پەریوە وەروەو پی‌گەیشتن ئەروات بەشێوەیێك کە کراوەتە خەلیفە، بەڵام خۆی خاوەنی بەرەکەت وە دەسەڵات نیە، ئەوەی هەیە، هێزی دەرونی‌ی ئەو وا لەسێبەری هێزی دەرونی‌ی مورشیدەکەیا بە «**ئیصطیلاحی**» خۆیان ئەڵێن والەظیللی مورشیدا، یان‌وا لەظیللی قوطب‌دا. ئیصطیلاحێ‌تر هەیە بۆ ئەم لەسێبەر بونەدا کە ئەڵێن وا لە «**ضیمنی‌یەتی**» مورشیدا. جا ئەم خەلیفەیە خۆی بەخۆی نازانێ کە ئەم دەسەڵاتە هی خۆی‌نیە وەهی مورشیدەکەیەتی. زۆرجار پیرانی تەریقەت خەلیفەکانیان ئالەم حاڵەدا ئەنێرن بۆ ئیرشاد، دەرکەوت ئەم دەرجی نیهایەتە لەوانی‌تر گرنگ‌ترە، کاتی وائەبێ خەڵك سەری لەو هەموە نورو بەرەکەت‌و تەصەرروفاتی مەعنەوی‌و کەشف‌و کەرامات‌و

جەذبەی ئەوخەلیفەیە سور ئەمێنێ تەوەججوهی ئەوخەلیفەیە هەروەکو هی مورشیدەکەی، هەزاران دەردی دەرون دەرمان ئەکات وە ڕێبوار پێ ئەگەیێنێ، ئەم دەسەلاٙت پێ دانە لە هەمان کاتیشا ئازمونو تاقی کردنەوەیە تابزانن ظەرفی یەتی ئەوکەسە چەندە، جا زۆرجار خەلیفەو مورید لەم تاقی کردنەوەیە دەرناچن وە غورور رووبان تێ ئەکات وە وائەزانن ئەمە توانایی خۆیانە، جائەگەر لەم تاقی کردنەوەیە دەرنەچون نەك هەر ئەبڕێنەوە شوێنەکەی لەوەو پێشی خۆیان بەڵکو لەوانەیشە ماوەیێك سەرگەردان بن، ئەگەریش لەو ئازمونە دەرچون دیارە ئەبێ بیان گێرنەوە شوێنەکەی خۆیان، بەلاٙم ئەو دەورە چاوپێ کەوتنە زۆر کەڵکی ئەبێت بۆی، وەئەگەر خۆی زانی چی بکات وە لە سنوری ئەدەب دەرنەچو وا ئیحسانی ئەوهەموە ئیرشادو خذمەت بەخەڵکەیشی دەست ئەکەوێ وە پایەی بەرزئەبێت وە لەو ماوەیەدا لەمەقامە بالاٙکانیش شتێ تێ ئەگات.

پاشان کە ئەهێنرێتەوە بۆشوێنەکەی لەوەوپێشی خۆی، ئەوساکە ئەزانێ ئەو دەسەلاٙتە هی خۆی نەبوە وەهی مورشیدەکەی بوە، ئەولەکوێ و ئەومەقامە بالاٙیە لەکوێ!!!! ئەبێ ڕەنجی زۆر بکێشێ تابەهرەی وای دەس کەوێت.

ئەم چەن جۆرانەی «**درج النهایة في البدایه**» بەسراون بەویستی مورشیدەوە چونکە ئەو ماموستاو شارەزایەو پزیشکی دەرون، خۆی ئەزانێ هەرکەسێ چەن وە چۆن وەکەی، ئەو کارە پێویست ئەکات، شایەد هەر پێویستیشی نەکرد.

ئیستە سەربارەت بەلەطائف وەتەزکی یەی لەطائف کە باسمان کردن برێ شت کە زانینیان پێویستە باسیان ئەکەین، ئەم ڕەوشی بەجیاوازیی سەیروسلوکی لەطائف کردنە ڕەوشی ئیمامی ڕەببانی یە، ڕەوشی پاشی ئەو، واتە جێ نشینەکانی وەکو «**شیخ محمّد معصوم**» ی کوری، ئەوان ئەم کارەیان لاسەخت بوە، وە تەنها لەطیفەی قەلب لەعالەمی ئەمر، وەلەطیفەی نەفس لەعالەمی خەلق یان پەروەردە کردوەو پێ گەیاندوە وەئیتر لەطیفەکانی تر بە پەیرەویی لەوان تەزکی یە بوون تا گەیاندونیانەتە فەناو بەقا، جا «**شاه عبدالله دهلوی**» ئەڵێ، ئیستە ئێمەیش وائەکەین، کە واتە مورشیدی نەقشبەندیی خۆی ئەزانێ هەرکامی لاچاك بو، یان بۆموریدێك بە پێویستی زانی وائەکات، بەتایبەت ئەوانەی لەرێگەی ذیکری رابیطەوە پەروەردە ئەکرێن، ئەوساکە کە لەطائف کەوتنە ذیکر، حوزوری هەق بۆی دەست ئەدات بەلاٙم

ئەوحوزوورە جۆری هەیە وە کەڵەمەردانی ئەم ڕێگایە بۆهەرکام لەم حوزورانە ناوێکیان داناوە؛ ئەوەش بۆناسین وە تێگەیاندنی موریدەکانە.

ئەگەر ئەوحوزورەی هەق بەرابەربو لەگەڵی حوزوری خەلق دا واتە لەرادەیێکابو نە حوزورەکە وا مەستت کات خەڵکەکەت لەیاد بەرێت وە نەخەڵکەکە بتوانێ حوزەرەکەت لابات ئەوە پێی ئەڵێن «**ذیکری قەلب**».

ئەگەریش حوزوری هەق غاڵب بو بەسەری حوزوری خەلق دا وە خەڵکەکەی لەیادی ڕێبوار بردەوە ئەوە پێی ئەڵێن «**ذیکری ڕۆح**».

ئەگەر ئەو حوزورەش جۆرێ بو خۆت لەیادچو بەلاّم خەڵکت لەیادنەچو ئەوە پێی ئەڵێن «**ذیکری سیرر**».

ئەگەر ئەو حوزورەی خودا وای لێهات کە نەخۆتت لەیادماو نەخەڵك ئەوە «**ذیکری خەفی**» یە. جا حوزور خۆی چی یەو چۆن هەست ئەکرێ؟

ئەفەرمێ ئەگەر ڕێبوار توانی سەیری دەرونی خۆی بکات وەبۆی دەرکەوێ کە ئەوەتا ئیتر لەخواوە نزیکە، بەوحاڵەتە ئەڵێن حوزور، ئەو حوزورەی کە باسمان کرد، جا بگرە ئەوحوزورە هەمیشەیی نەبێت بەلاّم ئیتر حوزورەو ڕێبوار خۆی بۆی ڕونە.

زۆرجار بەبونەی سەرگەرم بونی مرۆڤەوە بەکاروکاسبی دنیایی یەوە ئەم حوزورە کەم ئەکات، واتە عیلم هەیە بەلاّم عیلمی عیلم نیە، بەلاّم ئەگەر ئەو حوزورە وای لێهات بەجۆرێ بو «**کَأَنَّكَ تَرَاهُ**»، لە خەوو بێداریدا لەکاتی قسەکردنو لە خۆشیو ناخۆشیدا تەنانەت لە توورەییو عاجزیدا ئەو حوزورەت کەمی نەکرد وە دڵی جێ نەهێشت، ئیتر حوزوری هەمیشەییو بێبچڕان ئەبێتە «**مەلەکە**» واتە خدە، وە بەم حاڵە ئەڵێن «**ئاگاداریی بەردەوام**» وە ئەمەتە «**یادداشت**» کە یەکێکی ترە لەبناغەو ماددەکانی تەریقەی نەقشبەندی کە باسمان کرد، وە حاڵەتە پێشوەکەی بەر لەم حاڵە کە گوتمان کەموزیاد وە هاتوچۆ ئەکاتو باش دانەمەزراوە، بەوەش ئەڵێن «**پنداشت**» جا ناوێکی تری ئەم یادداشتە «**عَینُ الیقین**» ە.

ئەو ئاواتەی کە ئەم هەموە ڕەنجەی بۆدراوە بۆچی؟ چونکە بەچاوی بەصیرەت شادبوە بە چاوپێکەوتن وە موشاهەدە، وە هەر لەم حاڵەتایە ئەوڕێبوارە لەکاتی مەستیی ئەم خۆشی یەدا وا ئەزانێ ئەم دیتنە بەچاوی سەرە نەك چاوی بەصیرەت، یان کاتی وا هەیە ئەوەندە ئەو حوزورە غەلّەبە ئەکات ئەوکەسە برێ‌شت ئەڵێ، بۆنی

وەحدەت، یان، حولول، یان ئیتیحادی لێوەدێت، لەکاتێکا ئەمە حوزورە وە ئەوکەسە، ئەوەی ئەیڵێ شەطەحە، وە لەدەمی دەرئەچێ، وەکاتێ کە هاتەوە هۆشی خۆی ئەگەر بڵێن واتگوتوە شێت ئەبێو باوڕناکات، وەکو مەستێك بێتەوە هۆش.

ئەو چاوپێکەوتنە ئەتوانین تەشبیە بکەین بە خەو بینین، ئایا ئەوەی مرۆڤ لەخەویا ئەیبینێ بە چ چاوێکە، ئەمیش جۆرە شتێکی ئاوایە. بەڵێ نوری هەق هەست ئەکات بەڵام بەچاوی بەصیرەت، وەهەرگیز بەچاوی سەر لەم جیهانەدا خودا نابینرێت، وەئەگەر لەوجۆرە مەجذوبانە شتێکی خیلافمان بیست ئەبێ بزانین مەبەستی شتێکە کەخۆی هەستی ئەکات نەك لەواقیعدا وابێت.

شیخ عبدالله دهلوی، لەپاشان ئەفەرمێ، پاش ئەم حاڵەتی یادداشتە کە عین الیقینە «**موراقەبەی مەعیەت**»دەست ئەدات هەروەکو خودای گەورە لەسورەی «**حەدید**» ئایەتی «**٤**» دا، ئەفەرمێ. «**وَهوَ مَعَكُمْ ايْنَمَا كُنتُمْ**».

جا ئیتر لێرەدا دەستور ئەدەن بۆذیکرو تەهلیلە بەزمان، وە ئەم جۆرە موراقەبەیە لەپایەی «**ویلایەتی صوغرا**» دا ئەنجام ئەدرێت کە یەکەم قۆناغی ویلایەتی وەلیەکانە، ئەم ویلایەتە بریتییە لە رێگابڕین لەسێبەری «**أَسماءُ الله**»، واتە لەسێبەری ناوەکانی خودادا، وە مەقامەکەی مەقامی پەیدابونی جەذبەی پێئەڵێن، لێرەدایە کە جەذبە وە هەستی بەرەکەت وە دڵەتەپێو شەوقو هاوارکردنو گریانو ذەوق، هەروەها تەوحیدی فیعلیی وە درەوشانەوەی نوری تەجەللای هەق وە چاوپێکەوتنی «**وەحدەت وە کەثرەت**» وە حاڵەتی «**ئونس، هەیان، وەحشەت، وەحیرەت**» ئەمانە بۆ ئەوکەسە دەس ئەدەن. «**کما لايَخْفىٰ على أَربابِ هذِهِ الوِلايَه**».

لەپاشان ئەڵێ، هەروەها «**إستغراق**» واتە ونبون لە دەریای «**مەعریفەت**» دا، وە مەستیی وە بچڕانی پەیوەندی زانست وە خۆشویستنی خەڵك، وە لە یادبردنەوەی «**ماسیوا**» واتە، لەیادچونی هەموشتێ جگەخوا. وە سەلامەتیی دڵ لە خەتەرەو هەموجۆرە دودڵیو نیگەرانیێك، ئەمانە هەموی لەو قۆناغەدا، واتە لەقۆناغی ویلایەتدا دەست ئەدات وە لێرەدایە کە «**فەنای قەلب**» واتە بەردەوامبونی ئەم حاڵەتی لەسەرخۆچونو لەیادچونەوەی هەموشتێ جگەخودا، پەیدائەبێ.

شاعیریك كه ئاوات بۆ ئەمحاڵە ئەخوازێ ئەڵێ:

کَیْ بُوَدْ خُوْدْ زْخودْ جُداماندَه
مَن وتو رُفتەو خُدا ماندَه

داخۆ کەیبێت خۆم خۆم جێبێڵم، منوتۆ نەمێنێ ئەوەی ئەمێنێ تەنها هەرخوا خۆی بێت. جا ئەوەتە حاڵەتی «**مەعیەت**» یان «**موراقەبەی مەعیەت**».

زوتر گوتمان خوا لەئێمە نزیکە لەقورئانا ئەفەرمێ من لەرەگی لایمل نزیکترم بە بەندەکانم، بەلاّم لەم حاڵەدا بەندەکەیش بەهۆی پاکیی دەرونیەوە ئەویش هەست بەونزیکیەیە ئەکات، ئەگینا لە واقیعدا نزیکییەکە هەیە، ئەوەی پاكبو هەستی پێئەکا پاکیش نەبو نەهەست بەو نیعمەتەو نەهەست بەهەزاران نیعمەتی تریش ئەکات. لەکاتی باسی ئەم فەنای قەلبەدا، شاەعبداللە باسی چوار جۆر فەنا ئەکات.

١ – فەنایخەلق، واتە، ئەوکەسە هیچجۆرە ترسو ئومێدیکی بەکەسو لەکەس نیە جگەخودا.

٢– فەنای ئارەزو، ئەویش ئەوەتە رێبوار ئەکەوێتە حاڵێك جگە ئاواتو ئارەزوی نزیکیی لە خودا هیچ ئاواتو ئارەزوییێکی نامێنێ.

٣– فەنای ئیرادە، واتە، ویستو خواستو ئیرادەی تیائەچێت هیچ داواکردنو ویستێکی نامێنێ هەروەکو مردوویێکی لێدێت.

٤ – فەنای ئەفعال، ویستی ئەنجامی هیچ کردەوەیێکی نامێنێ، هەرچی هەیە لە خوای ئەوێ، یان کـــەویستی کردەوەی نەما خوا خۆیەتی کردەوەکانی هەڵئەسوڕێنێ. ئەمە پەنجەراکێشانە بۆلای ئەو حەدیثە قودسییەی کە ئەفەرمێ ومایزال عبدی یتقرب الی بالنوافل، حتی احبه، فاذا احببته کنت سمعه الذي یسمع به، وبصره الذي یبصر به، ویده التي یبطش بها..... واتە خودا ئەبێتە سەرچاوەی کردوەکانی.

هەروەکو چەن جاریتر باسم کردوە،نەقشبەندیەکان ئەڵێن مەقامی ویلایەت پاش

بریتی (۱۰) مەقامی تەوبە ، ئینابە ، زوهد ، قەناعەت ، وەرع ، صەبر ، شوکر ، تەوەککول تەسلیم ، وەرەزا ، جا دەستی مرۆڤ ئەکەوێت .

بەپێی دابی نەقشبەندی یەکان تەنها بەدەست هێنانی مەقامی (**ویلایەتی صوغری**) وە (**فەنای قەلب**) کافی نیە بۆئەوەی کەسێك بێتە مورشید ، بەڵکو پاشی گەیشتن بە (**فەنای نەفس**) وە بەدەست هێنانی کەمالاتی ویلایەتی «**کوبری**» جا ئەوکەسە ئەکرێ ، (**ئیجازەی ئیرشادی موطلەق**» بدرێتێ ، ئەفەرمێ ، لەکاتی «**فەنای قەلب**»دا ، خەتەرە لەدڵ دەرئەکرێ بەلاّم ئەرژێتە ناوی نەفس ، بەلاّم پاش «**فەنای نەفس**» ، کە شوێنی وا لە ناوچاواندا ، ئیتر شوێن بۆ خەتەرە وە دڵە راوکێ نەماوەو نامێنێ .

ئەو پلەو پایانەی کە رێبوارێکی رێبازی نەقشبەندی ئەیان برێت وە هەر لە سەرەتای دەست پێ کردنەوە دەست پێ ئەکات تا ئەگاتە ئەوشوێنەی کەلەوەولا مەگەر هەر ئەورێبوارەو خوا خۆی سەری لێ دەرکەن ، دانراون بە (**دەوائر**) واتە جەغزەکان . ئەم دائرانە «**بازنانە**» هەم هەموی ئەم قۆناغانەی تەزکییەی لەطائف ئەگرێتە بەر وەهەم هەرچی دەس کەوت و سەرکەوتی لەوەو دوایشە ، سەرەتاو پێشەنگی ئەم دائرانە پێی ئەڵێن «**دائرەی ئیمکان**» دوا دوایەکەیشیان پێی ئەڵێن «**لاتەعیین**» . ئەمانە نزیکەی بیست دائرەن کە باسیان ئەکەین . سەبارەت بە بڕینی ئەم مەقامانە شاعیر ئەڵێ :

هَرْ نِقابی رویِ جانانرْا نِقابی دیگَراست
هَرْحِجابی را کە طَیْ کَرْدی حِجابی دیگَراست

واتە هەر «**رووپۆشێك**» کە بەسەری رومەتی خۆشەویستانەوە لائەدەیت روپۆشێکی تر دەرئەکەوێ وە هەر حیجابێك کە ئەبڕیت حیجابێکی تر دەرئەکەوێ جا ، هەم ئیمامی رەببانی لە بەرگی یەکەم لاپەرەی (۲٤۰ - ۲٦۰) دا ، وەهەم ، شا عبداللە دهلوی لەکتێبی «**ایضاح الطریق**»دا ، باسی ئەم دائرانە ئەکەن ئەم ناوە بێ گومان ناوێکی مەعنەوی یە ، لەگەڵ ئەوەشا هەر بەراستی ی برێ جار لەباسەکاندا دەرئەکەوێ کە لەگەڵ مەعنەوی بونیشیاندا حاڵەتی دائرەیان هەیە ، وامن لێرەدا بەپێی توانایی پەنجەیان بۆ رائەکێشم وە باسیان ئەکەم ، بەلاّم زۆر بەکورتی .

پێشەنگی ئەم دائرانە کە ئەبێ رێبوار پی برێت دائرەی ئیمکانە ، ئەم دائرەی ئیمکانە تەواوی عالەمی خەلق و ئەمر وەسەرکەوتن بەتەزکی یەی ئەو عالەمەدا

ئەگرێتەبەر ، کە بریتی‌یە لەتەزکی‌یەی پێنج لەطائف وە تەزکی‌یەی نەفس وەهەر چوارعونصری تەبیعەتەکەی لەشی مرۆڤ ، واتە بەشی عالەمی‌خەلقی مرۆڤ . ئەورێبوارە کە ئەم تەزکی‌یانەی تەواوکرد ، وە لی‌بویەوە ، لەم دائرەی‌ئیمکانە رزگاری ئەبێت وە پی‌ ئەنێتە دووهەم دائرە واتە ، دائرەی ویلایەتی صوغری . دائرەی ویلایەتی صوغرا کە سەرەتای ویلایەتی وەلی‌یەکانە ، لەم ویلایەتەدا (سەیر) واتە ، رێگابرین و پێش‌کەوتن رووەو لوتکەی مراز لەسێبەری ناوەکانی خودادا پێك دێت ، مەقامی جەذبە لە دەست‌کەوتەکانی ئەم دائرەتە .

## دائرەی ویلایەتی کوبری .

پاش برینی دائرەی پێشو ئیتر رێبوار پی‌ ئەنێتە دائرەی ویلایەتی کوبرا ، کە ویلاتی پێغەمبەرەکانە درودی خوایان لەسەر وە بە نوێنەرایەتی‌ی ئەکرێتە خەلاتی پیاوچاکانی موسوڵمان ، ئەوەی بویە خاوەنی ئەم مەقامە وە پێی‌نایە ئەم دائرەوە بی‌گومان لەمەقامی **(فەنای نەفس)** تێپەریوە .

ئەبی‌ بڵێم فەنای نەفس یان فەنای‌قەلب ، جیایە لە تەزکی‌یەی قەلب‌و نەفس ، تەزکی‌یە هی سەرەتای کارە وە تەنها پاك‌کردنەوەو ذاکیر بونە بەلام فەنای لە طائف دواپلەی کارەو مەقامێکی باڵایە .

ئەم دائرەی ویلایەتی کوبرایە خۆی لەخۆیا سی‌ دائرەو یەك کەوانە ، واتە سی‌ دائرەو نیوە دائرەیێکە ، رێبوار خۆی هەستیان ئەکات‌و ئەبی‌ مەردانە یەك لەدوای‌یەك بیان برێت هەروەکو چۆن رێبوارێك لەشاخ‌وداخ ، یان دەشت‌و دەرێکا رێگار ئەبری‌ ، هەروا ئەوکەسەش خۆی‌بەخۆی ئەزانێت گەیشتوەتە کوی‌ ، وەکوگوتمان ئەم رێگایە لەسایەی **(ئەسماو صیفاتی)** خوادا ئەبررێن ، دەست‌کەوتەکانی رێبوار ، لەبرینی ئەم دائرەدا بریتی‌یە لە فەنای راستەقینە ، حەقیقەتی ئیسلام وە **(شَرحُ الصَّدر)** وە مەقامی دەوامی شوکرو رەزا ، لاچونی رەوشی ناپەسەند **«الأخلاق المذمومة»** ، ئەمانە هەموی دەست‌کەوتی ئەو دائرەن .




دائیرەی ویلایەتی کوبرا

---

**چوارەم :** دائرەی ویلایەتی عولیا.

ئەم دائیرەیە بەئەصالەت هی (**ملاءاعلی**)واتە هی مەلائیکەو ئەرواحە ، وە پیاوچاکان بەنوێنەرایەتی ئەبنە خاوەنی .

ئیمامی رەببانی لە مەکتوباتدا ، بەوردیی و دوورودرێژیی باسی ئەکات ، وە ئەفەرمێ : ئەگەر خوا یارمەتی بدات ئەکرێ رێبوار ئەم رێگایانە ببڕێت ئەگینا تەمەنی مرۆڤ هەرگیز بەشی هەنگاوێکیان ناکات ، سەبارەت بەم مەقامی ویلایەتی عولیایە ئیشارەئەکات بۆ ئەو ئایەتەی کە ئەفەرمێ«تَعْرُجُ الملائِكَةُ والرّوحُ إليْهِ في يَوْمٍ كانَ مِقْدارُهُ خَمسينَ ألْفَ سَنَةٍ»«المعارج» «٤» .

ئەڵێ ئەوە پەنجە ڕاکێشانە بۆ ئەم مەقامە ، کە بڕانەوەی هەرنیە مەگەر خوداخۆی مرۆڤ ببات .

له بەرهەمەکانی ئەممەقامە ، رووناکیو پاکییێکە کە بۆرێبوار دەستئەدات ، لێرەدا مورید یادی ئەوکاتە ئەکاتەوە کە لەسەرەتای کارا**له**«**سلطانُ الأذکار**» دا بۆی دەست دابوو. بەڵام ئەم رووناکیو پاکییە لەکوێ ئەو لەکوێ ، ئیرە ئەگەر خودا بیدات مەقامێکی زۆربالآیە .

هەروەها چونکە ویلایەتەکەی لە ئەصلا هی«**مەلەئی ئەعلا**»یە پەیوەند لەگەڵی ئەرواح وە مەلائکەدا بۆ ئەورێبوارە دەست ئەدات ، وە ئەو نهێنییانەی کە دەستکەوتی لەطیفەی «**سیر**» وە لەطیفەی «**ئەخفا**» یە ، لێرەدا هەستیان پێ ئەکرێت ، (**هنیئاً لِأَرْبابِ النَّعیمِ نَعیمهُمْ**) . **پاش ئەم حاڵەتانە ، سەیر لە «دائرەی کەمالاتی نوبووەت**» دا دەست پێئەکات .

لە دائرەی کەمالاتی نوبووەتدا «**تەجەللای ذاتی**» **بەبێ پەردەی ئەسماء وەصیفات دەستی رێبوار ئەکەوێ** .

**ئەفەرمێ لێرەدا تەنها یەك‌خاڵ پێش‌کەوتن باشترە لەهەرچی مەقامی ویلایەتە ، لیرەدا حوزور دەست‌ئەدات وە هیچ‌جۆرە دڵەتەپەو نیگەرانییێك بۆرێبوار نامێنێ ، وە «بَرْدُ الیقین»** ئەکرێتە خەڵاتی رێبوار ، وەئیتر دەستی حاڵو مەقام ناگاتە ئەم شوێنە .

لێرەدا هەرچی زانیاریی رێبوارە هەموی دێتە سەری زانیاریی شەریعەت وەزۆر بەپاکیی‌و بەروناکیی شەریعەت بۆ ئەو خاوەن کەماڵە خواپێداوە ، دەرئەکەوێ .

ئەبێ ئەوەش بزانین ئەم مەقامە لەبناغەدا هی پێغەمبەرانە وە ئەولیا بە «**وراثەت**» وە پەیرەوی لەوانەوە دەسیان ئەکەوێ .

ئەفەرمون (**تەوحیدی وجودیو شوهودی**) کە یەکێکە لەو زانیارییانەی دەستی ئەولیا ئەکەوێ ، لێرەدا پەکیەتی ، مەبەستی ئەوەتە لێرەدا مەعریفەت وە زانیاریی ئەو خاوەن کەماڵە ئەوەندە بالآیە تەنانەت زانیاریی ئەولیایش نانوێنێ .

شاه عبد اللەی دهلوی لەکتێبی ئیضاح الطریق‌دا لەم‌بارەوە سێ‌چوار لاپەرەی نووسیوە ، ئەگەر من بمەوێ هەرچی لەم بارانەوە نوسراوە هەموی بنوسم ئەم باسی نەقشبەندییە خۆی پێویستی بەکتێبێکە ، لەگەڵ ئەوەشا هیچ‌مەبەستێکی سەرەتاییو پێویستم جێ نەهێشتوە تەنها وردەکاریو لەسەرچونەکانم نەنوسیوە .

ئەو دائراتەی لەمەولا دێن هەموی سەیرە لە کەمالاتدا ، کە کەمال بەشوێنی کەمالدا دەستی ئەو گەورە پیاوانە ئەکەوێ ، وەکو ،

دائیرەی کەمالاتی ریسالەت .
دائیرەی کەمالاتی ئولول عەزم .
دائیرەی حەقیقەتی کەعبە .
دائیرەی حەقیقەتی قورئان .
دائیرەی حەقیقەتی صەلات .
دائیرەی مەعبودییەتی صیرفە .

ئیتر لێرەولا **(سەیری قەدەمی ی)** ، **واتە پیادەرەوێی مەعنەوی ، راڵەوەستیٚ . وە پەکیەتی ، وە ئیتر (سەیر)** ، واتە رۆیشتن ، ئەبێتە رۆیشتنی **(نەظەری)** ، واتە ، تەنها بەچاوی بەصیرەت ئەو مەقامانە ئەبینێتو سەریان لیٚ دەرئەکات ، لێرەدا کە بەچاوی بەصیرەت ئەو گەورە پیاوانە ، دائرەی «**خیللەت**» ئەبینن کە مەقامی حەزرەتی ئیراهیم «**خلیل الله**» یە ، درودی خوای لەسەر ، لەم مەقامەدا کەهی حەزرەتی ئیبراهیمە ، پێغەمبەرەکانی تر تابیعن ، «**اِتَّبِعْ مِلَّةَ اِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً**» «**نەحل ١٢٣**» .

هەروەکو لە نوێژا ئەڵێین ، **(اللهم صلی علی محمد وعلی ال محمد کما صَلَّيْتَ علی ابراهيم وعلی آل ابراهيم)** ئەم **(کما صلّيت)** واتە ، وەکویەك بونە ، **(تەبەعی یەتە)** ، بەمەرکەزی ئەم دائرە ئەوتریٚ حەقیقەتی ئیبراهیمی ی . پاشان دائیرەی «**المحبة الصرفة الذاتية**» پیشانی ئەو گەورە پیاوە رێبوارە ئەدریٚ ، کە مەرکەزی ئەم دائیرە حەقیقەتی موسەوی یە لەمدائیرەدا کە هی حەقیقەتی حەزرەتی موسایە زۆرێك لەپێغەمبەران ئەم نزیکی و هاوەڵ بونەیان بەپەیرەوێی لەحەزرەتی موساوە خەڵات ئەکریٚ .

پاشان دائرەی «**المُحِبيَّةُ و المَحْبُوبِيَّةُ المُتْزَجَتَيْنْ**» بەورێبوارە پیشان ئەدریٚ ، کەهی حەقیقەتی موحەممەدی یە ، وە دائیرەیێکی زۆرگەورەو خاوەن شکۆیە .

پاشان دائیرەی «**المحبوبية الصرفة الذاتية**» دێتەپێشەوە کەهی حەقیقەتی ئەحمەدی یە . پاش ئەوە دائیرەی «**حوبی صیرفە**» واتە ، خۆشەویستی ی رووت .

پاش هەموی ئەمدائیرانە دائیرەی «**لاتعیینیە**» یە کە هەرگیز سەیری قەدەمی ی ، نایگاتیٚ سەیری نەظەری ی نەبێت .

واتە هیچ کەس بەرۆیشتنی مەعنەوێی ناگاتە ئەو دائیرەیە ، بەڵام ئەوەی خوا پیٚ ی دابیٚ بەسەیری نەظەری ی ئەیگاتیٚ وەپیشانی ئەدرێت ، هەرکامەی لەم

داثیرانه دەس کەوتو بەرهەمی رۆحی و مەعنەوی وەناوونیشانو دەسەلاتی خۆی هەیە وە هەمویشی نوسراوە . هەروەکو گوتم ئیتر هەموی لەنوسین نەئەهات ، ئەوەی بیەویّ ، وا ناوی سەرچاوەکانم بردوەو لەپاشانیش ئەینوسم ، ئەتوانیّ خۆی دوای کەویّت ، بریّ لەو ناوانەشم هەروەکو خۆی نوسی‌یەوە چونکە بەگۆرینیان بۆسەری کوردی سەر لە خوێنەوار ئەشێویّ .

هەروەکو ئەزانن لێرەدا بریّجار گوتمان (**بە تەبەعی‌یەت**) فلاّن مەقامیان ئەدریّتیّ ، بۆ ئەم ئیصطیلاحە وە بۆ وێنەو شەبیهی ئەو ، لەبازاری تەصەووفدا ووشەی «**ضیمنی‌یەت**» کە لە «**ضمن**» ەوە هاتوە ، یان «**ظلیلەت**» کە لەظل واتە سێبەرەوە هاتوە ، زۆر بەکار ئەبریّ ئەویش ئەوەتە خاوەن بەرەکەتیّ ئەتوانیّ خۆشەویستێکی لایق خۆی بە «**تەبەعی‌یەت**» ببات لەتەکی خۆیا بۆ مەقامێك ، دیارە ئەو تابیعە ، نەبوەتە خاوەنی ئەو مەقامە ، بەلاّم چونکە خاوەنی مەقامەکە بردویەتی ، وا ئەویش شارەزابوە وە چونکە لەو مەلّبەندەدا ناسراوە کە خۆشەویستی خاوەن مەقامەکەیە ، ریّزی لیّ ئەگرن .

هەروەکو لە کاروباری دینایی‌دا کەسێك خۆشەویستێکی خۆی شارەزا کات لە شوێنی کارو شوێنی ژیانی خۆی وە بەوخەلّکەی بناسێنیّ .

ئەم مامەلّەیە لەجیهانی تەصەووفدا، سەرەتاکەی لە خۆشەویستی‌و نزیکی‌ی حەزرەتی ئەبوبەکر لە حەزرەتی موحەممەدەوە سەرچاوەی گرتوە ، پێغەمبەر درودی‌خوای‌لە سەر لە حەدیثێکا ئەفەرمیّ ، «**ماصَبَّ اللهُ شیئاً في صدري إلاّ وَصَبَبْتُهُ في صَدْرِ أبي بَكْرٍ**» ، لەبەرئەوە وتراوە ئەبوبەکر خاوەنی ضیمنی‌یەتە ، واتە وا لەضیمنی‌یەتی پێغەمبەردا .

شاه عبد اللهی دهلوی لە پایانی ئەم باسەدا ئەفەرمیّ .

بزانن ئەم سیّ پایەی ویلایەتەی کە باسمان کردن واتە «**صوغرا کوبرا عولیا**» ، وەسیّ کەمالاتەکان واتە ، کەمالاتی «**نوبووەت ، ریسالەت ، ئولول‌عزم**» وە حەوت حەقائقەکان «**حەقیقەتی کەعبە ، قورئان ، صەلات ، ئیبراهیمی‌ی ، موسەوی ، موحەممەدی ئەحمەدی**» ، وە پاش ئەوانیش دائرەکانی «**خۆشەویستی صیرف وە لاتەعیین**» . بۆ هەموکەسیّ لەپەیرەوانو رێبوارانی ئەم تەریقەتە دەست نادەن ، برێکیان ئەگەنە ویلایەتی قەلبی بەلّکو هەر لەدائرەی ئیمکانیش تیّناپەرن ، برێکیشیان ئەگەنە

ویلایەتی کوبرا وەکەمێکیان ئەگەنە ویلایەتی عولیا ، وە زۆرکەمیان ئەگەنە هەرسێ کەمالاتەکان وە بە «نودرەت» وە دەگمەن هی وایانهەیە بگاتە (**حەقائقی سەبعە**) یان لەوەولاتر .




دائیرەکان لەرێبازی نەقشبەندیدا

زوتر گوتم تەریقەی نەقشبەندی یانزە ماددەی بۆ ڕێبواری تەریقەت داناوە کە ئەبێ پەیڕەوی‌کردن لەم یانزە ماددەیە ڕێبوار ، واتە ، «**سالیك**» هەرگیز ناتوانێ بگاتە مراز .

بێگومان ئەم ڕەوشانە لە ئازمون‌و سەرگوزەشتی پیرانی تەریقەتەوە بەدەست هاتوە ، نۆ ماددە لەم ماددانە هی «**خواجه عبد الخالق غه‌جده‌وانی**» «**٥٧٥**»ك لە دنیادەرچوە ، وە سێ ماددەیشیان «**محمد بهاء الدین نەقشبەند**» «**٧١٧ - ٧٩١**» ك ، دای ناوە ، ئەم کردەوەو ڕەوشانە وەنەبێ لەسەرەتادا هەر نەبوبێت بەڵام ناونان‌و ڕاست‌کردنەوەو دیاری‌کردنیان بۆ ڕێبواران زۆر پێویست بوە ، لەبەرئەوە خراونەتە قاڵبێکی زانیاری‌یەوە کەسەر لەڕێبوار نەشێوێ وە بزانی چی‌بکات ، بگرە هی وایشی هەبێت خۆیان دایان نابێ .

وتمان پایەی تەریقەی نەقشبەندی بەسەری ذیکری دەروونی‌یەوە دامەزراوە ، ذیکریش هەروەکو کە ئەزانن ناوی خوا بردنەو یادی خواکردن تارادەیێ کە هەموی دەرون وەهەموی‌لەش دەست‌ئەکاتە ذیکر ، وە بەرهەمی ئەم‌ذیکرە ، هەم پاك کردنەوەی دەروونە لە پێناسە ناپەسەندەکان وە هەم دەوامی حوزورە ، ئەگینا لەڕاستەکەیا مەبەست مەذکورە ، کە خودایە،نەك ذیکر ، کە ناوی خودایە ، مەبەست نزیك بونەوەیە لە هەق ، وە ئەم ذیکرە وەسیلەیە بۆ نزیك‌بونەوە ، ئەوکاتەی نوری‌خودا لەدەرونا دەرەوشایەوە وە حوزور دەستی‌دا ئیتر ذیکر نامێنێ چونکە مەذکور حاضرە ، با هەم دیسانیش دووبارەی کەمەوە ئەم نزیکی‌یە نزیکی ذات لەذات،واتە لەشی‌مرۆڤ لەذاتی خودا نیە،بەڵکو نزیکی‌ی دەرونی مرۆڤە لەحەقیقەتی خودا لە نوری خودا ، وە ئەم نزیکی‌یە بە چاوی دەرون هەست ئەکرێ نەك بەچاوی سەر،بە «**بەصیرەت**» نەك بە «**بەصەر**» .

بۆ نمونە ، وەکو خەوبینین ، ئایا دیتنی خەو بە کام جیسم وە کام چاوە ؟ بەم جۆرە ئەتوانین شتەکە لەمێشکی خۆمان نزیك کەینەوە .

بابرۆ ینەوە سەری باسی یانزە ووشەکە ، ئەم ووشانە کاتی خۆی بە زمانی فارسی گوتراون کەسانێکی وەکو شیخ محمد أمین الکردی ، یان هەرنوسەرێکی تر کە باسیانکردوە ناچار فارسی‌یەکەیان نوسیوە پاشان گۆریویانەتە سەری عەرەبی . ووشەکان ئەمانەن .

١ – هوش دەر دەم .
٢ – نەظەر بەر قەدەم .
٣ – سەفەر دەر وەتەن .
٤ – خەلوەت دەر ئەنجومەن .
٥ – یادکرد .
٦ – بازگەشت .
٧ – نیگاەداشت .
٨ – یادداشت .
٩ – وقوفی زەمانی‌ی .
١٠ – وقوفی عەدەدیی .
١١ – وقوفی قەلبی‌ی .

هەروەکو وتمان ، تا ووشەی هەشتەم ، هی خواجە عبد الخالق‌ی غەجدەوانی ، وەسیٚ ووشەی دوایی شاهی نەقشبەند خستویەتە سەری .

١ – هوش دەر دەم :

هۆش ، هەر ئەو هۆش‌وبیری کوردی‌یەتە ، یان عەقلٚ وەژیری ، دەم واتە هەناسە ، کەوابو ئەبیٚتە هۆش لەکاتی هەناسەدا ، مەبەست ئەوەتەئەو ڕیٚبوارە لەکاتی ذیکرا لەهەمو هەناسە هەلٚکیٚشانو هەناسە دانیٚکدا هۆشی لای خۆی وەلای خوای خۆی بیٚت ، وە خەیالٚی بەملاو بەولادا نەڕوات .

شاهی نەقشبەند ئەڵێ : کاری ڕێبواری ئەم ڕێگایە بەستراوە بە هەناسەوە ، واتە ئەبێ ڕێبوار بۆی دەرکەوێ ئایا ئەوهەناسە بە ئاگاداریو بەحوزور تێ'ی پەڕاندوە یان بەغەفڵەت وە «**نائاگایی**» ، هەروەها بۆئەوەتە مرۆڤ سەرگەرمی ئەو کاتو ساتو چرکەیەبێ کە واتیایا ، واتە هۆشی بۆلای ڕابوردوو یان ئایندە نەڕوات ، کە نائاگایی بەسەرا بێت .

شیخ عوبەیدالله ئەحرار «**٨٠٦ – ٨٩٥**» ك ، کە یەکێکە لە گەورەپیاوانی تەریقەی نەقشبەندیی لەمبارەوە ئەڵێ ، گرنگترین کاری ئەمڕێگای نەقشبەندییانە ئاگاداریی کردن لە هەناسەیە ، کە بە نائاگایی نەڕوات وە ئەوکەسەی هۆشی بەلای هەناسەوە نەبێت ، واتە سپاردەی «**هۆشدەردەم**» ئەنجام نەدات، ئەڵێن فڵانکەس هەناسەکەی وونکرد .

سەعدەدینی کاشغەریی کە هاوەڵو هاوچەرخی شێخ عوبەیدالله یە ، ئەڵێ هۆش‌دەردەم ئەوەتە لە هەناسەیێکەوە بۆ هەناسەیێکی تر غەفڵەتی تیانەبێت وە بە حوزورەوە ئەنجام بدرێت ، وە نابێ ئەو هەناسە خاڵی بێت لە حەق .

بەکورتیی لای هەمو گەورەپیاوانی تەریقەی نەقشبەندی هۆش‌دەردەم ، واتە هۆش بەلای هەناسەدانەوە بون ، پایەیێکی گەورەیە لە پایەکانی تەریقەت ، وە ئەگەر ڕێبوار هەناسەیێکی بەخۆڕایی بڕوات وەکو ئەوەتە گوناهێکی کردبێت وایە ، وە هەر وایشە چونکە خۆی هەستی پێ'ئەکات کە ئەو هەناسە بەخۆڕاییدانە زیانی لێ'داوە .

## ٢ – نەظەر بەرقەدەم :

بڕێك لایان وایە مەبەست لەمووشەیە ئەوەتە صۆفی ئەبێ لەکاتی ڕێوەڕۆشتنا چاوی لەبەری پێی خۆی بێت ، واتە سەری‌خۆی دابخاتو بڕوات ، بۆئەوەی هۆشی پرژوبڵاو نەبێتەوە بەملاو بەولادا ، وە هەستەکانی جەمبن ، وەهۆشی لای خوای بێ ، نەکا زەرقو بەرق دنیایش فریوی بدات ، دیارە ئەمە کارێکی شیاوو پەسەندە ، بەڵام ئیامی ڕەببانی ئەڵێ نەظەربەرقەدەم هی حاڵی سەفەر دەروەتەنە کەهەردوکی دوو مەبەستی مەعنەوین ، ئەڵی مەبەست لەم ووشەیە ئەوەتە ڕێبوار

بەرلەوەی لە مەقامێکەوە بڕوات بۆ مەقامێك ، بەرلەوەی بە «قەدەم» ، دیارە قەدەمی مەعنەویی هەنگاو بنێتە مەقامەکەی بە نەظەری مەعنەوی سەیری ئەو مەقامەی خۆی ئەکات ، لەکاتی باسی دائرەکاندا کەبریتین لەم مەقامانە گوتمان سەیری قەدەمی ی تاپایانی مەقاماتی حەقیقەتەکان ئەڕوات کە ئاخرەکەیان حەقیقەتی صەلات بو ، گوتمان لەوەلا «سەیر» واتە ، ڕۆیشتن هەموی ئەبێتە نەظەریی ، واتە بینین ، جا ئیمامی ڕەببانی ئەفەرمێ لە سەیری قەدەمی دا بۆ بڕینی مەقامەکان سەیری نەظەریی ئەبێتە پێشەنگ وە ئەوکەسە بەرلەوەی بە قەدەم هەنگاو بنێتە مەقامە تازەکەیەوە ئەبێ سرنجێکی ئەو مەقامە بدات وە بەچاویی کەوتن لێی شارەزا بێت ئەوسا کە هەنگاو هەڵ بێنێت وەبڕواتە مەقامەکە،جائەڵێ بەم سرنج دانو وردبونەوە لەومەقامە تازەیە کەوا لەبەری پێی ڕێبواردا بەوە ئەڵێن نەظەر بەرقەدەم جابۆیە هی حاڵی سەفەر دەروەتەنە چونکە ئەو ڕۆیشتن وە پێش کەوتنە لەمەقامێکەوە بۆ مەقامێکی تر ئەوە خۆی سەفەر دەر وەتەنە وەبەسرنج دانی بەرپێی خۆ لەکاتی ئەم سەفەرەدا ئەڵێن نەظەر بەرقەدەم کە ئاگادار کردنی ڕێبوارە لە پلەو پایەو لە مەنزڵی ئایندەی خۆی ، تائەوشوێنە کەڕۆیشتن بەقەدەم هەیە لەوەو پاش ئیتر هەر چاوپی کەوتنەو ڕێبوار تەنها بەچاو مەقامە هەرە باڵاکان ئەبینێ .

«فخر الدين كاشفي» لە «ڕەشەحات» دا ، ئەڵێ ، نەظەربەرقەدەم پەنجە ڕاکێشانە بۆ ڕادەی پێش کەوتنی ڕێبوار لە ڕێبازی تەریقەت دا وە بۆ بڕینی مەقاماتی هەستیی وەبڕینی کۆسپی خۆپەرەستی یە .

کاشیفی کتێبێکی هەیە بەناوی «ئوصولی نەقشبەندی یە» دەستخەتە وە نوسخەیێکی بەم ناوونیشانە ، (Suppl. PERS. 698) وا لەکتێبخانەی نەتەوەیی فەرەنسەدا .

هەروەها برێ لەشارەزایانی ئەم ڕێبازە ئەڵێن یەکێ لەواتاکانی نەظەربەرقەدەم ئەوەتە ڕێبوار ئاگاداربێ کەوا لەژێری قەدەمی کام پێغەمبەری ئولول عەزمدا وە خاوەنی چ مەشرەبێکە ، زوتر گوتمان هەر ڕێبوارێ مەشرەبێکی ئەبێت کەبریتی یە لەمەشرەبی ئەو پێغەمبەرەی ئەو وا لەژێری قەدەمیا .

ئەمە ئەگەر هەبێت هەر بۆ یەك جارە ، بەڵام چونکە ئەم ووشانە بۆئەوە دانراون ڕێبوار لەکاتی سلوکدا پەیڕەویی لێ بکات وە دەستورێکە بۆ ئەوەی ڕێبوار ئەنجامی

دلێ زیندووه بەعیشقو بژیتۆ لەمەرگ ئەمین
بەم دەردە بمرە تا ببیە حیلایموت
گەر سەنگی کۆهسارە بوە لەعلی تابدار
هەرکەس بە جەبری صەبروحەیا خوێنیبو بەقوت

ئەڵێ تۆ ئەگەر رووبکەیتە خوا لەهەمو دێوو گیان لەبەرێ ، خوا ئەتپارێزێ ، تەنانەت ، تاڵی جالێجاڵۆکەت بۆئەکاتە زەنجیرو قەڵغان ، هەروەکو بۆ پێغەمبەر درودی خودای لەسەر،بویە قەڵغان،ئەڵێ ئەگەر دڵت بەعیشقی خودایی زیندو بویەوە ئیتر لەمەرگ ناترسی چونکە مەرگێ وجودینیە ، تەصەووف سەلماندویەتی ئەوەی گەیشتە پایەی بەقای پاش فەنا ئیتر هەتا هەتایە زیندویە زیندو بونێك وەکو هی شەهیدان،جا ئەڵێ ئەوەی بەدەردی عیشق مرد دەبێتە (**حَيٌّ لا يموت**) ، زووتریش گوتمان ، هیواهەیە لەو حاڵەتی فەنادا ئەوەندە نوقم ئەبێت وەئەوەندە وا لەخۆشیی رۆحیدا،کە یان شایی مەرگ ئەبێ،یان ئەوەندە خۆیی لەیاد ئەچێتەوەو خوردو خاوی نامێنێ ئەبێتە هۆی مەرگی ، یان خەڵك تاوانی کوفری لێ ئەدەنو ئەیکوژن جا هەرکام لەمانەبو وا ئەبێتە ، شەهیدی عیشق ، وەشەهیدیش مردنی بۆنیە جا بەوانەی کە رزگار ئەبن وە ئەرۆنە جیهانی بەقاو جاویدان ئەبن ، ئەڵێ ئەگەر بەردی ئەو شاخو داخەیش بێت ئەبێتە لەعل (**یاقوت**) واتە ئەگەر عەوامو نەخوێنەوار بوبێت ، یان بێکەسو بێدەس بوبێت وای لێدێت لە هەمو زانایێ زاناترو لە هەمو خاوەن هیممەتێ بەهێزترو بەپێزترو بە برشتتر ئەبێت .

هەروەکو مەولەوی باسی بەردەکەیکرد کەپاش لە کورەدا سوتان بویە گەوهەر ، ئەمیش هەر ئەوە ئەڵێت .

جا ئەڵێ بۆگەیشتن بەو عیشقە پیروزە ئەبێ صەبرو ئەدەبو حەیا بکەیتە پیشە وە خوێنیخۆت بخۆیتەوە .

زوتر گوتمان صەبرو ئەدەب دوو رەوشی بناغەیی ڕێبازی تەصەووفن ، وە موجاهەدەش هەروا کە لێرەدا بە خوێنی خۆ خواردنەوە ناوی بردوە .

لە لاپەرەی «٨٨» ئەڵێ «**خودایی داوە هەرکەس بەونەظەر کەوت**». زوتریش باسمانکرد نەظەری پیری تەریقەت بۆی هەیە هەر بە نەظەر کەخۆی جۆرە دەست کارییێکی دەرونی موریدە ئەو موریدە پێ ئەگەیێنێ،وە زۆرکەس خودا بۆی کردون بەر نەظەری مورشید کەوتون وە بونەتە پیاو ، مەحوی لێرەدا ئەم نەظەرەی مەبەستە .

موسڵمانان کە بگەڕێن وە چاو قوچاو نەبن وە لەم جیهانە ورد بنەوە تاباشتر خوا بناسن ، کەوابو ئەو دەستورەی تەصەووفیش وە دڵگەرمکردنی ڕێبوارانی ئەم ڕێبازە بۆ گەشتو گەڕان لێرەشەوە سەرچاوە ئەگرێت .

دووهەمی بۆ گەڕانە بەشوێنی مامۆستاو مورشیدی باشا ، بەم بۆنەوە گەورە پیاوانی تەصەووف خوازیارانی ئەم ڕێبازە ئاموژگاری ئەکەن کە بڕۆن بگەڕێن بەشوێنی مورشیدی باشدا ، بەڵام ئەڵێن ئەگەر هاتو مورشیدی باشت دەست کەوت ئیتر ئەبێ هەرچی ئەو ئەڵێ وابکەیت وە بۆخۆت دامرکێیت ، وە سەفەری مەولانا خالیدی نەقشبەندی لێرەوە بۆشامو بوحیجازو سەرلەنوێ لەحیجازەوە گەڕانەوە بۆ کوردوستانو لێرەوە بەسەری ئێرانو ئەفغانو کابولو غەزنەینو قەندەهاردا تاگەیشتنە خزمەتی شاە عبداللەی دهلوی وە بەهرەمەندبون وە بەمراز گەیشتن لەخزمەتی ئەو خاوەن کەمالەدا گەشتێکە لەگەشتە گرنکەکانی صوفی یەکان بەشوێنی مورشیدی باشدا. هەروەها گەڕانی غەزالی لە طوسەوە بۆ بەغداوە لە بەغداوە بۆ شامو بۆ حیجاز وەسەر گەردانی بە شوێنی مورشیدا ئەویش نمونەیێکی ئەم گەشتانەیە .

سێهەم واتا مەعنەوی یەکەیەتی ، بەتایبەت لەروانگەی نەقشبەندی یەکانەوە . نەقشبەندی یەکان ئەڵێن واتا مەعنەوی یە کەی ئەم ووشەیە بریتی یە لەتێکۆشانی ڕێبوار بۆ سەفەرکردن وە مەنزڵ گۆڕین لەپێناسی بەشەری یەوە بۆ پێناسی مەلەکوتی ، وە لە پێناسی ناپەسەندەوە بۆ پێناسی پەسەند، هەروەها سەفەرکردنە لەجیهانی خەلقەوە بۆلای حەق ، واتە دورکەوتنەوە لە هەڵفریوێنەکانی جیهان وە نزیك کەوتنەوە لە خاوەنی هەردو جیهان .

هەروەها سەفەرکردنە لە حاڵو مەقامێکەوە بۆ حاڵو مەقامێکی باشترو باڵاتر .

ئیمامی ڕەببانی ئەفەرمێ ئەم سەفەر دەر وەتەنە لەسلوکی تەریقەتدا بریتی یە لە «**سەیری ئەنفوس**» وە سەرچاوەو سەرەتای «**اندراج النهاية في البداية**» یە ، ئەفەرمێ ئەم ڕێگا برینە ، لە تەریقەتەکانی تریشا هەیە بەڵام لەواندا لە دواپلەی سلوکدا ئەنجام ئەدرێت ، وە لەپاش سەیری «**ئافاق**» ، بەڵام نەقشبەندی یەکان هەر لەسەرەتای کارا دەس ئەکەنە ئەم سەیرە واتە ئەم «**سەفەرە**» ، کە سەیری ئافاقیش خۆبەخۆ لەتەکی ئەم سەیرەدا ڕووئەدات وە ئەنجام ئەدرێت .

ئەوەی شیاوی گوتنە سەیری ئافاقی ڕێگاکانی دوورو درێژە لەبەری ئەوە ، نەقشبەندی یەکان خۆیانی پێوە ماندو ناکەن بەڵکو هەر لەتەکی سەیری ئەنفوسی دا بەحاڵەتی «**طوفیلی**» ئەنجام ئەگرێ ، هەر ئەمەتە پیرانی نەقشبەندی ئەفەرمون ، سەرەتای کاری ئێمە دواپلەی ڕێگاکانی ترە . «**بدایتِ ما نهایتِ دیگرانْ است**» ، ئەمەش پەنجە کێشانە بۆ ئەوەی نەقشبەندی یەکان لەپێشا سەیری ئەنفوس تەواو ئەکەن کە تەریقەکانی تر پاش سەیری ئافاقی جا ئەتوانن ئەم ڕێگایە ببڕن ، دووهەم ئەوەتە ، ڕێبازەکانی تر لەپێشا تەزکی یەی عالەمی خەلق بەذیکری «**جەهر**» واتە ئاشکرا دەست پێ ئەکەن ، پاش ڕەنجو ڕیازەتێکی زۆر جائەگەنە عالەمی ئەمر ، کە تەزکییەی قەلب وە لەطائفەکانی ترە .

سێ هەم ، ئەم حاڵەتی «**اندراج النهاية في البداية**» تەیە کە هەر زۆر زوو تەصفیەو تەزکی یە بۆمورید دەست ئەدا ، وە کەشف و موشاهەدەی دەس ئەکەوێ .

پێش تریش وتم بەگۆڕان لەحاڵێکە وە بو حاڵێ وە لەمەقامێکەوە بۆ مەقامێکیش هەر ئەڵێن سەفەر ئەندەر وەتەن ، جا ئەو گۆڕانانە تەزکی یەی لەطائف وەبڕینی دائرەکان وەهەموی ئەوکارانەش ئەگرێتەوە .

## ٤ ـ خەلوەت دەر ئەنجومەن :

بەعەرەبی ئەبێتە (**الخلوة فى الجلوة**) . واتە بەلەش لەناوی خەڵکاو بەدڵ بەلای خوداوە بون . ئەم کەنارەگیری یە کە پێی ئەڵێن (خەلوەت) دوو جۆرە یەکێکی خەلوەتی ڕەواڵەتی یە ، بریتی یە لەوەی ڕێبواری تەریقەت ئەڕوات ، لەگۆشەیێکەوە لەشوێنێکی کەنارا دەست ئەکاتە خوا پەرستی و ذیکرو فیکر ، بێگومان ئەم کەنارەگیری یە بۆ کاری سلوك کەڵکی زۆرە چونکە (حەواسی) ئەوکەسە پرژو بلاو نابێت وە تەرکیز ئەکاتە سەری دەرون وەسەرگەرمی کاری دەرونی ی خۆی ئەبێت ئاشکرایە هەرچی زیاتر پێناسەکانی دەرەوە لەکار بوەستن پێناسەکانی دەرون باشتر ئەکەونە کار ، وە بەوجۆرە مرۆڤ زووتر وەباشتر لەجیهانی مەلەکوتی ی نزیك ئەبێتەوە .

جۆری دووهەمی خەلوەت ، خەلوەتی دەرونە ئەمەش بەوجۆرەتە ، هەرچەن ڕێبوار خۆی لەناوی خەڵکابێت وە بەرەواڵەت سەرگەرمی کارو کاسبی و هاتوچونە

بەلاَم لە دەرونەوە لەخودا غافلْ نیە ، هەم دەرونی ذیکر ئەکات هەم خوای لەیاد ناچێت .

«رِجالٌ لاتُلْهِيهِمْ تِجارَةٌ وَلابَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ الله» (٣٧) (نور) جا ، مەبەست لەووشەی خەلوەت دەر ئەنجومەن ، یان الخلوة فی الجلوة ئەم دووهەمیانەتە .

شیخ محمد امين الكردی لەکتێبی «**تنوير القلوب**» دا بەعەرەبی ئەڵێ «فعناه أن يكون قلب السالك حاضرا مع الحق فی الاحوال كلها غائبا عن الخلق مع كونه بين الناس .»

هەموی رێبەرانی تەریقەت وایان لاباشە ، پاش ئەوەی رێبوار تۆزێ باوەری دامەرزا وە لەکاروباری سلوكدا پێش‌کەوت ، ئیتر لەخەڵك دوور نەکەوێتەوە بەڵکو سەرگەرمی کاروکاسبی حەلاڵی خۆی بێت وە خوایش غافلْ نەکات .

شیخ ئەبوسەعیدی خەرراز (٢٧٩)ك ، لەدنیادەرچوە . ئەڵێ ، (**لَيْسَ الكامِلُ مَنْ صَدَرَ عَنْهُ أَنْواع الكرامات ، وَإِنّما الكامِل الّذی يَقْعُدُ بَيْنَ الخَلْقِ يبيع ويشتری معهم ويتزوّج ويختلط بالنّاس ولايَغْفَلُ عَنِ الله لحَظَةً واحدةً**) .

هەرئەمەتە ئەڵێن (الصّوفی كائنٌ بائن) اَیْ بالظّاهر والجسم كائن مع الخلق وبالباطن والقلب بائن عنهم .

ئیمامی رەببانی‌ی ئەفەرمێ خەلوەت دەر ئەنجومەن لقێکە لە سەفەر دەر وەتەن جیا بوەتەوە ، چونکە ئەگەر سەفەر دەر وەتەن دەستی‌دا خەلوەت دەر ئەنجومەنیش دێ بەشوێنیا وە رێبوار لەکاتی پڕو بلاَوی ناوی خەڵکا لەوەتەنی خەلوەت‌دائەکەوێتە گەشت‌و گوزار .

ئەڵێ تەفرەقەی ئافاق لەناوی حوجرەی ئەنفوس‌دا رێگا نادەن ، ئەفەرمێ ئەم کارە لە سەرەتادا سەختە بەلاَم لەپاشان وردە وردە ئاسان ئەبێت ، هەروەها ئەفەرمێ ئەم خەلاَتە لە تەریقەی ئێمەدا دەس‌کەوتی تازەکارانە بەلاَم لە تەریقەتەکانی ترا کۆنەکاران جا خەلاَتی وایان دەس ئەکەوێ ، ئەمەش بۆ ئەوەتە ئەم خەلاَتە لەکاتی سەیری ، واتە (رێ‌بڕینی) **ئەنفوسی‌دا ، دەس ئەکەوێ ، کە سەرەتای تەریقەی نەقشبەندی لەسەیری ئەنفوسەوە دەست پی ئەکات ، وە سەیری ئافاقی خۆبەخۆ لەگەڵی سەیری ئەنفوسی‌دا دەست‌ئەکەوێ ، بەلاَم رێبازەکانی‌تر لەپێشا ئەبێ سەیری ئافاقی تەواوکەن جا دەست بکەنە سەیری ئەنفوس ، کتێبی (مناهجُ السّیر)** .

بۆ روون کردنەوە ئەڵێم سەیری ئافاق سەیری جیهانی سوروشتە کە هی دەرەوەی مرۆڤ وە بەشی عالەمی خەلقە ، سەیری ئەنفوس بڕینی مەقامەکانی دەرونە کەگوتمان ، پی‌یان ئەڵێن لەطائف ، وەهی عالەمی ئەمرە ، ئەو شتانەی ، وە ئەو

ئەنوارو ئەسرارەی ، لەدەرەوەی دەرونەوە ئەبێنرێن ، هی عالەمی خەلقە ، واتە هی ئافاقە ، ئەوەش لەدەرونا هەستی پێ ئەکرێت و ئەبینرێت ، هی ئەنفوسە ، وە هی عالەمی ئەمرە .

لێرەدا خۆم ئەلێم زۆر جار لەباوکم ئەمبیست ئەیفەرمو ، پیاوچاکان ، بەتایبەت ئەوانەی کە خەڵك نایان ناسن ئەرۆنە ناوی بازارو قەرەبالغ ، ئەمەش بۆ ئەوەتە خوای گەورە هەمیشە (تەجەللا) ی هەیە ، واتە نوری رەحمەتی ئەرێژی بەسەری خەڵکا ، بەلاّم ئەوەی لەخوا غافل بێت لەو بەهرەیە بێبەش ئەبێت بەڵکو ئەروات بۆ ئەوانەی کە غافڵ نین ، جا چونکە لەوجۆرە شوێنانەدا خەڵك زۆربەی سەرگەرمی کاری دنیایی یە ئاگای لە هیچی تر نیە ، ئەوەی ئاگاداریێ هەموی ئەرژێ بەسەری دەرونی ئەوکەسەدا جا ئەمەش هەر (**خەلوەت دەر ئەنجومەن**)ە .

**توانایی بۆ ئەنجامی ئەمکارانە وە بەجێهێنانی ئەم رەوشانە . ئەویش ، خۆی دەس کەوتنێکن دەستی ئەو رێبوارانە ئەکەون ، کە بەهۆی خواپەرستی و راست رەوی و ذیکرو فیکرەوە گەیشتونەتە ئەوپایانە .**

### ٥ - یادکرد :

واتە ، یادکردنەوە کە بەعەرەبی ئەبێتە «**ذیکر**» ذیکری خودا بناغەی کاری هەموی رێبازەکانی تەصەووفە ، مەبەستم لێرەدا ، هەموی واتاکانی ذیکرە ، واتە ، قورئان خوێندن ، نوێژکردن ، ناویخوابردن وە یادی خواکردن ، لەناوی ئەم ذیکرانەدا ، بەشی ناوی خوابردن وە یادی خواکردن لەهەموی زیاترە ، برێ لەرێبازەکان بەدەنگی بەرز وەبرێکی لە دەرونەوە ذیکرئەکەن ، گوتمان نەقشبەندی یەکان پەیرەوی ذیکری دەرونن هەروەها گوتمان ئەم ذیکری خودایە دووجۆرە ذیکری (الله) واتە ذیکری «ذات» وە ذیکری «**لا اله الا الله**» واتە نەفی و ئیسبات ، پێغەمبەر فەرمویەتی ، باشترین وە بەرێزترین شتێك من وە پێغەمبەرانی پێش لەمن وتومانە ، ووشەی «لااله الا الله» یە .

بەر لەرۆژگاری شاهی نەقشبەند بەمرێبازە گوتراوە تەریقەی «خواجەگان» گەورەترینی ئەو مورشیدانەی بە خواجە بەناوبانگ بون خواجە عبد الخالق غەجدەوانی یە جا ، بەرلەو ذیکری زمانییش ئەنجام دراوە ، بەلاّم شێخ عبد الخالق ذیکری دەرونی ی رەواج دا ، ئەمە ئەوکەسەتە کە بناغەدانەری ئەم ووشانەیە کە

باسیان ئەکەین ، پاش ئەویش سەرلەنوێ برێ لە ناوی نەقشبەندییەکانا ذیکری زمانیش ئەنجام ئەدرا تا زەمانی شاهی نەقشبەند ، محمد بهاء الدین ، کە سەرۆك و گەورە پیاوی ئەم رێبازەتە ، ئەو جارێکیتر دەستوریدا ئەبێ رێبواری ئەم رێبازە هەر لەرێگای ذیکری دەروونییەوە تێ‌کۆشێت ، وە ئەوسێ ووشەیەشی خستە سەری دابی رێبازەکە ، واتەوقوفی قەلبیی ، وقوفی عەددەدیی ، وقوفی زەمانیی . کە تێکرا بونە یازدە ووشە .

مەبەست لەم ووشەی یادکردە بەردەوام بونە لەسەری «یاد» واتە ذیکر ، قانجازێکی گەورەی ئەم ذیکرە دەروونیی‌یە ئەوەتە ، پێویستی بەدەنگ وە پیت ، واتە بە گوتنی زمان نیە ، کەوابو مرۆڤ ئەتوانێ بەئاسانیی هەمیشە ذیکربکات تەنانەت لەکاتی ئیش‌وکاریشا ، بەلاّم ذیکری زمان لەکاتی ئیش‌وکارا بەتایبەت لەکاتی قسەکردنا ئەنجام نادرێ ، بۆیەلێرەدا ئەم باسی ذیکرە واتە : یادکرد هاتوە کە رۆشن بێت یەکێ لەبناغەکانی تەریقەی نەقشبەندیی‌یە ، جا ، ئەبێ ئەم ذیکرە دەروونیی‌یە ئەوەندە درێژەی بدرێتێ تا وای لیّ‌دێت ذاکیر واتە ئەورێبوارە حوزوری هەمیشەیی ، مەذکورە کەخودایە بۆی دەست ئەدات ، وە هەدەفیش هەر ئەو حوزورەتە ، وەئیتر رێبوار هەمیشە بەهەستی دەروونیی خۆی وا لەحوزوری خوادا وە بەچاوی بەصیرەت ئەونورو بەرەکەتە ئەبینێ کە ئەبێتە ، موشاهەدە .

لام وایە زووتریش وتومە هی واهەیە لەشەوو رۆژا بیست‌و پێنج هەزار جار ذیکری «الله» ئەکات ، وە لای کەمی بۆئەوانەی تازەکارن وە دەستیان کردوەتە بڕینی ئەم رێگایە ، پێنج هەزار جار ، یاد ئەکەن . وەکووتمان ، پاش گەیشتن بەمراز وەحوزور ، وەکاتێ کەمەذکور لەدەرونا هەست‌کرا ، ئیتر باسی ژمارەو ئەو جۆرەشتانە ، تەنانەت ذیکر کردنیش نامێنێ . چونکە مەذکور کەخودایە دلّ‌ودەرونی داپۆشیوە ، وەرێبوار وا لەبڕینی مەقاماتدا . مورشید ئەزانێت ، یان ئەوکەسە خۆیو خوای خۆی کەئەبێ چیبکاو چی‌نەکات شایەد پیّ‌ویستیش بێت ذیکربکات .

## ٦ – بازگەشت :

واتاکەی ئەبێتە گەڕانەوە ، لێرەدا مەبەست ئەوەتە رێبوار لەکاتی نەفی‌و ئیسباتدا پاش‌ئەوەی کە هەناسەی خۆیی گرتبو وە بە ژمارەی تاك تا ئەورادەیەی بۆیکرابو جارێ ، یان سێ‌جار ، یان پانزە .. هتد ، ذیکری کردبو جاکە هەناسەی

دا ، ئەگەرێتەوە بۆلای پارانەوەو داواکردن لە خودای خۆی ، جا ئەگەر ذیکرەکەی بەزمانبو ئەم جوملەیە بەزمان ئەڵێ ئەگەر ذیکرەکەیشی بەدڵ بوو ، بەدڵو خەیاڵ ئەڵێ «**الهی أنت مقصودی ورضاك مطلوبی**» ، واتە خودایا مەبەستی من هەرتۆیەو رەزامەندیی تۆم پێویستە ، ئەمە بۆچییە ؟ بۆ ئەوەتە هەر بیرو خەیاڵێکی چاك یان خراپ لەو چەن چرکەیەدا روی کردبێتە دەرونی دوری خاتەوەو هۆش‌و بیری بگەرێتەوە بۆلای خوای خۆی ، وە جگە خوا لە هیچیتر بیرنەکاتەوە .

**٧ – نیگاه داشت :**

واتە راگرتن ، خۆیشمان ئەڵێین نیگای بدێرە . نیگاەداشت ئەوەتە لەکاتی ذیکرکردنا ئەوکەسە بکۆشێ هەرگیز خەتەرە رونەکاتە دەرونی ، ئەگەر هاتو خەتەرە روی‌کردە دەرونی چ خەتەرەی باش چ هی‌خراپ ، ئەبێ ذیکرەکە راگرێ ، تا خەتەرەکە لەدڵ دەرئەکات ، جا سەرلەنوێ دەست‌کاتەوە بەذیکر ، هەروەکو لە کتێبی «مَناهِجُ السَّیر» دا ئەڵێ ، نیگاهداشت ، ئەوەتە ، ئەو بەرەکەت‌و دەست‌کەوتەی کە لەسایەی بەردەوامیی ذیکرەوە دەست ئەکەوێ یان ئەو چۆنیەتی ئاگاداریی‌و حوزورەی بەهۆی ذیکرەوە دەست‌ئەدات بۆرێبوار ، رای‌گرێ وەنەیێڵێ هیچ خەتەرەیی روو بکاتە دڵی .

مەناهیج ئەل‌سەیر نوسینی (ابو الحسن زید مجددی فاروقی) یە ، ساڵی ١٩٥٧ لەدهلی‌چاپ‌کراوە .

لە کتێبی رەشەحات عین الحیاة دا کەلەساڵی (١٩١٢) لەکانپوردا لەچاپ‌دراوە فخر الدین علی کاشفی لەزمانی سعد الدین کاشغەرییە وە ئەڵێ ، رێبوار هەرچەندە بۆی بکرێت ، سەعاتێ دوان سیان ، هەرچی بۆی‌کرا هۆش‌وبیری دەرونی خۆی بەجۆرێ راگرێت جگە لەخودا هیچ بە دەرونیا تێ نەپەرێ .

برێ لە گەورەپیاوانی تەریقەت ئەڵێن نیگاهداشت تەنها بۆکاتی ذیکری نەفی‌وئیسباتە ئەویش ئەوەتە مەعنای ذیکرەکە لەدڵا راگرێت بۆئەوەی ئەو مەعنایە هەر بەردەوام لەدلابێت کە بریتییە لەوەی هیچ خودایێك نیە جگە الله ، وە ئەگەر نەتوانێ ئەم‌کارە بکات حوزوری دڵ بۆی دەست نادات .

بەکورتیی هەموی ئەم کۆششە بۆ ئەو بەردەوام بونی حوزورەتە ، چونکە حوزوری دڵ وە پاراستنی دەرون لەهەمو خەتەرەو خەیاڵێك ئەوە خۆی گرنگ ترین

مەبەستێکە هەمیشە صۆفی‌یەکان گرتویانەتە پێش‌چاو وە پایەیێکە لە پایەکانی تەصەووف ، وە مەشایخان لەم بارەوە زۆر باسیان کردووەو زۆر رایان سپاردوە بۆ چاودێری لی‌کردنی .

ئەبێ ئەوەش بزانین ئەوە دەست نادات کە هەرگیز هیچ خەتەرەیێك بەدلا تێ‌پەر نەکات بەلاّم ئەم نیگاهداشتە ئەوەتە مرۆڤ هەولێ بدات خەتەرەو خەیالێ لەدلاّ سەقامگیر نەبی‌ّو نەمێنێتەوە وەکو پوش‌و پەلاّشی سەری ئاوی تیژبەر وابێت نەوێسێتەوەو بروات ، لە کتێبی (الحدائق الوردیە) نوسینی عبد المجید الخانی لەزمانی علاء الدین العطارەوە ئەلێ ، ئەوەی نەیێلن هیچ خەتەرەو خەیالێك روو بکاتە دەرون زۆر سەختە وە ناکرێت ، بەلاّم ئەبێ بکۆشن دەوامی نەبێت ، ئەفەرمێ من بیست سالێ دلی خۆم پاراست لە خەتەرەو خەیالێ کەچی پاش بیست‌سالێ هەر خۆی گەیاندە دلم ، بەلاّم نەم‌هێشت سەقامگیر بێت .

## ٨ – یاد داشت :

یادداشت شوهود یان موشاهەدە وە (عین الیقین) یشی پێ ئەلێن ، شیخ محمد امین الکردي ئەلێ «الکنایةُ عَنْ حُضور القلب مع الله تعالی علی الدّوام فی کل حال من غیر تکلّفٍ ولا مجاهدةٍ وهذا الحضور فی الحقیقة لایتیسّرُ الاّ بعد طيّ مقامات الجذبةِ وقَطْعِ منازلِ السّلوك .

لە شوێنیکی‌ترا لە کتێبی (تنویر القلوب) دا ئەلێ ، یادداشت لەپاشی فەناو لەپاشی بەقای حەوتەم‌دا جا دەستی رێبوار ئەکەوێ .

کەوابو یادداشت بەرهەمی رەنجی رێبوارە وەبریتی‌یە لەو حالّەتی گەیشتن بە ئاواتی پاش رەنج‌و تێکۆشانە ، یادداشت ئەتوانێ بەرهەمی ذیکر ، یان موراقەبە ، یان یارمەتی‌ی مورشید بێت ، وە رێبوار پاش برینی هەمو کۆسپێ جا ئەیگاتێ .

عبیداللە ئەحرار ئەفەرمێ :

یادداشت بریتی‌یە لەوەی کەشوهودی حەق بەهۆی (حوبی ذاتی) ، واتە خۆشەویستی‌یەوە ، ئەو رێبوارە داپۆشێ ، ئەتوانین بلێین بریتی‌یە لە (حوزوری بی‌غەیب) واتە ئامادەبونێ کە ئیتر وون‌بون وە لاچونی نەبێت . هەروەها ، بۆ روون کردنەوەیێکی زۆرتر گوتراوە یادکرد بریتی‌یە لە بەردەوام بون لەسەری ذیکر ، وە بازگەشت ، ئەوەتە پاش هەر پشودانێ لەذیکر ئەوکەسە ئەگەرێتەوە بۆلای ئەوەی

کە لەدڵەوە بڵێت ، خودایا مەقصودیمن هەرتۆی وەرەزامەندیی تۆ و نزیکیی تۆیە مەبەستم ، وەنیگاهداشت بریتییە لە پاراستنی ئەو گەڕانەوە بێئەوەی بەزمان هیچ بڵێت .

جا یادداشت بریتییە لە بەردەوام کردنی ئەو نیگاهداشتە وە تێکۆشان بۆ لەدەستنەدانی ئەو حوزورە .

ئێستە دێینە سەری باسی ئەو سێ ووشەیەی کە شاهی نەقشبەند خستونیەتە سەری ئەم نۆ ووشانەی کە باسمان کردن ، کە بریتین ، لە وقوفی زەمانیی ، وقوفی عەددەدیی ، وقوفی قەلبیی ، ئەم یانزە وشەیە (لازمومەلزوم)ی یەکن . وەرێبوار بەچاودێری لێکردنی هەمویان ئەو خوا بۆی بکات ئەگاتە سەری لوتکەی شاخی ئاوات .

## ٩ - وقوفی زەمانیی :

ئەم وقوفی زەمانییە ئەتوانین بڵێین وەکو (موحاسەبە) ی دەرون وایە . واتە رێبوار هەر ماوەی چەنساتێ یان چەن کاتێ جارێ لە ذیکر رائەوەستێ وە لە دەروێ خۆی ورد ئەبێتەوە بزانێ ئەو ماوەیە بەچی تێپەڕاندوەئەگەر بە ئامادەبون حوروری هەقدا بوە وا سوپاسی خوا بکات وە ئەگەر بەغەفڵەت وە بێهەواڵی تێپەڕیوە پەشیمانیی پیشان بدات واتە (**ئیستیغفار**) وە داوای لێبوردن وە بەخشین بکات لە خودا .

لە کتێبی رەشەحاتدا لەزمانی بەهائوددین نەقشبەندەوە ئەڵێ وقوفی زەمانیی وەکو کاروبار بەرێوەبەری رێبواری ئەم رێبازەتە ، بریتییە لەوەی رێبوار هۆشی بەخۆیەوەبێت وە ئاگای لەحاڵی خۆیبێت بزانێ لە هەردەمێکا حاڵیخۆی چیەو چۆنە ئایا هیئەوەتە شوکری خودا بکات یان هیئەوەتە عوذر بێڕێتەوە هی هەرکامبو ئەوەیان بکات .

مەولانا یەعقوبی چەرخیی کە یەکێکە لە موریدە پایە بەرزەکانی شاهی نەقشبەند ئەڵێ ، حەزرەتی خواجە واتە ، شاهی نەقشبەند خوای لێرازیبێ ، هەرکاتێ رێبوار دوچاری دڵگیران «**قەبض**» بوایە ئەیفەرمو ئەبێ (**ئیستیغفار**) بکات ئەگەریش دڵکرانەوە «**بەسط**» رووی تێکردائی ئەیفەرمو سوپاسیخوا بکە ، کە

چاودێری ئەم دووحاڵە «**وقوفی زەمانی**» یە ، بەم فەرمودەیەدا وادەرئەکەوێ حاڵەتی (**قەبض**) لە غەفڵەتەوە ، وە حاڵەتی (**بەسط**) لە ئاگاداری‌یەوە سەرچاوە بگرن .
` باسی قەبض‌و بەسط لەبەشی موصطەلەحات‌دا کراوە .

## ١٠ – وقوفی عەددەدی :

بریتی‌یە لەوەی لەکاتی ذیکری نەفی‌و ئیسبات دا کە ئەبێ هەناسە پەنگ بدرێتەوە لەم کاتەدا ذیکرەکان بەتاك ئەنجام بدرێن واتە جارێ یان سێ ، یان پێنج ... هتد ، هی واهەیە ئەتوانێ تا بیست‌ویەك جار بە یەك هەناسە ذیکر ئەکات ، جا ، بەم چاودێری کردنی ژمارەی تاکە ئەڵێن وقوفی عەددەدی ، واتە ڕێبوار (**واقیف**) بێت ، ئاگاداربێت ژمارەی ذیکرەکانی تاك بێت .

بێگومان ئەم ذیکرە بە زمان نیە بەڵکو بە دڵە ، واتە بە دەروونە ، ژمارە کردنە کەیش هەروا ، نابێ بە زمان بێت ئەبێ بەدەروون بێت .

ئەبێ ئەوەش بزانین بە ئەنجامدانی ئەم ڕەوشە بەرهەمی مەعنەوی زۆر دەستی ڕێبوار ئەکەوێ ، وە ئەم ڕەوش‌و دەرامەدی ڕەوشانە ، لە ماوەی صەدان ساڵدا ئەوەندە تاقی کراونەتەوە بونەتە بەدیهی‌یاتی تەریقەت ، وەلای ڕێبواران ئاشکراو ڕووناکە .

«**عبد الرحمن ، جامی**» (٨١٧ – ٨٩٨) ك ، خاوەنی «**نَفَحاتُ الانْس**» ، لەریسالەی نوری‌یەدا کە دەست‌خەتەو نوسخەیێکی وا لە «**دار الکتب المصریة**» دا ، ئەڵێ وقوفی عەددەدی ، بۆئەوەتە ئەو ڕێبوارە بزانێت کەی‌واتە لە چ ژمارەیێکا ئەو ذیکرە بەرهەم ئەدات ، زووتر گومانی ئەگەر گەیشتەبیست‌ویەك جار وە بەرهەمی مەعنەوی نەبو دیارە مەرجەکانی بەباشی ئەنجام نەداوە ، جابۆئەوە چاودێری لە ژمارەکان ئەکات تا بزانێ ئایا بەرهەمی هەیە یام نا ئەگەر گەیشتە بیست‌ویەك‌و بەرهەمی نەبو بگەرێت وە کەموکوری کارەکەی بدۆزێتەوە ، شاهی نەقشبەند خۆی ئەفەرمێ ، ئەم لەپێش‌چاوگرتنی ژمارەیە بۆئەوەتە هۆش‌وبیری ئەوکەسە نەڕوات بەم‌لاو بەولادا .

بدات ڕەوشەکەی ئیمامی ڕەببانی لەهەموی تەواوترە بەڵام ئەمانی تریش هەرکامەی لەکاتو ساتی خۆیا کەڵکی هەیە .

### ٣ – سەفەر دەر وەتەن :

واتە سەفەرکردن لە وەتەندا ، ئەم گوتنەش هەرچەکو ئەو ووشەکانی تر ، هەم واتای ڕەواڵەتیی هەیە هەم واتای دەروونیو مەعنەویی .

واتا ڕەواڵەتیەکەی ئەوەتە سەفەرکردن هەمیشە بەکەڵکەو چاوو مێشکی ئینسان ئەکاتەوەو ئازمون وەر ئەگرێ وە ڕەنجی سەفەرو غەریبیی خۆی لای خودا بێپاداش نابێت ، هەروەها هەرچی مرۆڤ شتی زۆر ببینێت وە مەخلوقاتی جۆراو جۆر سەیربکات هەم پەندو عیبرەت ئەگرێ وە هەم لەعەزەمەتی خوا زۆرتر سەری سور ئەمێنێ ، جا هەر لەبەرئەوە خواستایشی کردوە لەوانەی وردئەبنەوەو تێئەفکرێن لە دروس بونی ئەرزو ئاسمان وە شانبەشانی ذیکرکردن ناوی ئەم بیرکردنەوە ئەبات کە لە ئایاتی «١٩١» ال عمراندا ، ئەفەرمێ **الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السماوات والارض»** ، لەپاشان مەدحی ئەوکەسانە ئەکات کە بەدنیادا ئەگەرێن بۆ پەند وەرگرتن ، هەرچەن ووشەی **(سائح)** بەواتای نوێژیش لێك دراوەتەوە بەڵام بەواتای گەشت کردنیش هاتوە . وە کراوەتە هاوشانو هاوترازوی تەوبەو خواپەرستیی وەکو لەئایەتی **(١١٢)** تەوبەدا ، ئەفەرمێ .

**«التائبون العابدون الحامدون السائحون الراكعون الساجدون الآمِرونَ بالمعروفِ والنّاهونَ عَنِ المُنكرِ والحافظونَ لحدودِ الله وَبَشّرِ المُؤمنين»** .

یان کە لەسورەی تەحریم ئایەتی «٥» دا ، ئەفەرمێ . **«تائباتٌ عابداتٌ سائحاتٌ»** .

بەڵام سەبارەت بەگەڕان بەسەرێ زەویدا وەپەند وەرگرتن لە بەسەرهاتی خراپ کارانو هەمو جۆرە ئاڵوگۆرێکی جیهاندا لەچوار شوێنی قورئاندا **«أفلَمْ يَسيروا في الأرضِ»** لە چوارشوێنا **«قُلْ سيروا في الأرض»** لە سێ شوێنا **«أوَ لَمْ يَسيروا في الأرْض»** لە دووشوێنا **«فَسيروا في الأرض»** . هاتوە . ئەمانە هەمو دڵ گەرم کەرو پاڵپێوەنەرن ، بۆ

موسڵمانان کە بگەڕێن وە چاو قوچاو نەبن وە لەمجیهانە ورد بنەوە تاباشتر خوا بناسن ، کەوابو ئەو دەستورەی تەصەووفیش وە دڵگەرمکردنی ڕێبوارانی ئەم ڕێبازە بۆ گەشتو گەڕان لێرەشەوە سەرچاوە ئەگرێت .

دووهەمی بۆ گەڕانە بەشوێنی مامۆستاو مورشیدی باشا ، بەم بۆنەوە گەورە پیاوانی تەصەووف خوازیارانی ئەم ڕێبازە ئامۆژگاری ئەکەن کە برۆن بگەڕێن بەشوێنی مورشیدی باشدا ، بەڵام ئەڵێن ئەگەر هاتو مورشیدی باشت دەست کەوت ئیتر ئەبێ هەرچی ئەو ئەڵێ وابکەیت وە بۆخۆت دامرکێیت ، وە سەفەری مەولانا خالیدی نەقشبەندی لێرەوە بۆشامو بوحیجازو سەرلەنوێ لەحیجازەوە گەڕانەوە بۆ کوردوستانو لێرەوە بەسەری ئێرانو ئەفغانو کابولو غەزنەینو قەندەهاردا تاگەیشتنە خزمەتی شاه عبداللّەی دهلوی وە بەهرەمەندبون وە بەمراز گەیشتن لەخزمەتی ئەو خاوەن کەمالەدا گەشتێکە لەگەشتە گرنکە کانی صوفی یەکان بەشوێنی مورشیدی باشدا .          هەروەها گەڕانی غەزالی لە طوسەوە بۆ بەغداوە لە بەغداوە بۆ شامو بۆ حیجاز وەسەر گەردانی بە شوێنی مورشیدا ئەویش نمونەیێکی ئەم گەشتانەیە .

سێ‌هەم واتا مەعنەوی یەکەیەتی ، بەتایبەت لەروانگەی نەقشبەندی یەکانەوە .

نەقشبەندی یەکان ئەڵێن واتا مەعنەوی یە کەی ئەم ووشەیە بریتی یە لەتێکۆشانی ڕێبوار بۆ سەفەرکردن وە مەنزڵ گۆڕین لەپێناسی بەشەری یەوە بۆ پێناسی مەلەکوتی ، وە لە پێناسی ناپەسەندەوە بۆ پێناسی پەسەند ، هەروەها سەفەرکردنە لەجیهانی خەلقەوە بۆلای حەق ، واتە دورکەوتنەوە لە هەڵفریوێنەکانی جیهان وە نزیك کەوتنەوە لە خاوەنی هەردو جیهان .

هەروەها سەفەرکردنە لە حاڵو مەقامێکەوە بۆ حاڵو مەقامێکی باشترو باڵاتر .

ئیمامی ڕەببانی ئەفەرمێ ئەم سەفەر دەر وەتەنە لەسلوکی تەریقەتدا بریتی یە لە **«سەیری ئەنفوس»** وە سەرچاوەو سەرەتای **«اندراج النهاية في البداية»** یە ، ئەفەرمێ ئەم ڕێگا برینە ، لە تەریقەتەکانی تریشا هەیە بەڵام لەواندا لە دواپلەی سلوکدا ئەنجام ئەدرێت ، وە لەپاش سەیری **«ئافاق»** ، بەڵام نەقشبەندی یەکان هەر لەسەرەتای کارا دەس ئەکەنە ئەم سەیرە واتە ئەم **«سەفەرە»** ، کە سەیری ئافاقیش خۆبەخۆ لەتەکی ئەم سەیرەدا ڕووئەدات وە ئەنجام ئەدرێت .

ئەوەی شیاوی گوتنە سەیری ئافاقی ڕێگاڵیکی دوورو درێژە لەبەری ئەوە ، نەقشبەندی‌یەکان خۆیانی پێوە ماندو ناکەن بەڵکو هەر لەتەکی سەیری ئەنفوسی‌دا بەحاڵەتی «**طوفەیلی**» ئەنجام ئەگرێ ، هەر ئەمەتە پیرانی نەقشبەندی ئەفەرمون ، سەرەتای کاری‌ئێمە دواپلەی ڕێگاکانی ترە . «**بدایتِ مانهایتِ دیگرانْاست**» ، ئەمەش پەنجە کێشانە بۆ ئەوەی نەقشبەندی‌یەکان لەپێشا سەیری ئەنفوس تەواو ئەکەن کە تەریقەکانی‌تر پاش سەیری ئافاقی جا ئەتوانن ئەم ڕیگایە ببڕن ، دووهەم ئەوەتە ، ڕێبازەکانی‌تر لەپێشا تەزکی‌یەی عالەمی خەلق بەذیکری «**جەهر**» واتە ئاشکرا دەست‌پی‌ئەکەن ، پاش ڕەنجو ڕیازەتێکی‌زۆر جائەگەنە عالەمی ئەمر ، کە تەزکییەی قەلب وە لەطائفەکانی ترە .

سێ‌هەم ، ئەم حاڵەتی «**اندراج النهایة فی البدایة**» تەیە کە هەر زۆر زوو تەصفیەو تەزکی‌یە بۆموریدە دەست ئەدا ، وە کەشفو موشاهەدەی دەس ئەکەوێ .

پێش‌تریش وتم بەگۆران لەحاڵێکە وە بو حاڵێ وە لەمەقامێکەوە بۆ مەقامێکیش هەر ئەڵێن سەفەر ئەندەر وەتەن ، جا ئەو گۆڕانانە تەزکی‌یەی لەطائف وەبڕینی دائرەکان وەهەموی ئەوکارانەش ئەگرێتەوە .

## ٤ – خەلوەت دەر ئەنجومەن :

بەعەرەبی ئەبێتە (**الخلوة فی الجلوة**) . واتە بەلەش لەناوی خەڵکاو بەدڵ بەلای‌خوداوە بون . ئەم کەنارەگیری‌یە کە پێی ئەڵێن (خەلوەت) دوو جۆرە یەکێکی خەلوەتی ڕەواڵەتی‌یە . بریتی‌یە لەوەی ڕێبواری تەریقەت ئەڕوات ، لە گۆشەیێکەوە لەشوێنێکی کەنارا دەست ئەکاتە خوا پەرستی‌و ذیکرو فیکر ، بێگومان ئەم کەنارەگیری‌یە بۆ کاری سلوك کەڵکی زۆرە چونکە (حەواسی) ئەوکەسە پرژو بلاو نابێت وە تەرکیز ئەکاتە سەری دەرون وەسەرگەرمی کاری دەرونی‌ی خۆی ئەبێت ئاشکرایە هەرچی زیاتر پێناسەکانی دەرەوە لەکار بوەستن پێناسەکانی دەرون باشتر ئەکەونە کار ، وە بەوجۆرە مرۆڤ زووتر وەباشتر لەجیهانی مەلەکوتی‌ی نزیك ئەبێتەوە .

جۆری دووهەمی خەلوەت ، خەلوەتی دەرونە ئەمەش بەوجۆرەتە ، هەرچەن ڕێبوار خۆی لەناوی خەڵکابێت وە بەرەواڵەت سەرگەرمی کارو کاسبی‌و هاتوچونە

بەلاّم لە دەرونەوە لەخودا غافلْ نیە ، هەم دەرونی ذیکر ئەکات هەم خوای لەیاد ناچێت .

«**رِجالٌ لاتُلهيهِمْ تِجارَةٌ ولابَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ الله**» (٣٧) (نور) جا ، مەبەست لەووشەی خەلوەت دەر ئەنجومەن ، یان الخلوة فی الجلوة ئەم دووهەمیانەتە .

شیخ محمد امین الکردی لەکتێبی «**تنوير القلوب**» دا بەعەرەبی ئەلێ «فمعناه أن يكون قلب السالك حاضرا مع الحق فی الاحوال كلها غائبا عن الخلق مع كونه بين الناس .»

هەموی رێبەرانی تەریقەت وایان لاباشە ، پاش ئەوەی رێبوار تۆزێ باوەری دامەرزا وە لەکاروباری سلوكدا پێش کەوت ، ئیتر لەخەڵك دوور نەکەوێتەوە بەڵکو سەرگەرمی کاروکاسبی حەلاڵی خۆی بێت وە خوایش غافلْ نەکات .

شیخ ئەبوسەعیدی خەرراز (٢٧٩)ك ، لەدنیادەرچوە . ئەلێ ، (**لَيْسَ الكامِلُ مَنْ صَدَرَ عَنْهُ أنْواعِ الكرامات ، وَإنَّما الكامِل الّذی يَقْعُدُ بَيْنَ الخَلْقِ يبيع ويشترى معهم ويتزوّج ويختلط بالنّاس ولايَغْفَلُ عَنِ الله لحظةً واحدةً**) .

هەرئەمەتە ئەلێن (الصّوفی كائنٌ بائن) اَیْ بالظّاهر والجسم كائن مع الخلق وبالباطن والقلب بائن عنهم .

ئیامی رەببانیی ئەفەرمێ خەلوەت دەر ئەنجومەن لقێکە لە سەفەر دەر وەتەن جیا بوەتەوە ، چونکە ئەگەر سەفەر دەر وەتەن دەستیدا خەلوەت دەر ئەنجومەنیش دێ بەشوێنیا وە رێبوار لەکاتی پرژو بلاوی ناوی خەڵکا لەوەتەنی خەلوەتدائەکەوێتە گەشتو گوزار .

ئەلێ تەفرەقەی ئافاق لەناوی حوجرەی ئەنفوسدا رێگا نادەن ، ئەفەرمێ ئەم کارە لە سەرەتادا سەختە بەلاّم لەپاشان وردە وردە ئاسان ئەبێت ، هەروەها ئەفەرمێ ئەم خەلاّتە لە تەریقەی ئێمەدا دەس کەوتی تازەکارانە بەلاّم لە تەریقەتەکانی ترا کۆنەکاران جا خەلاّتی وایان دەس ئەکەوی ، ئەمەش بۆ ئەوەتە ئەم خەلاّتە لەکاتی سەیری ، واتە (رێبرینی» ئەنفوسیدا ، دەس ئەکەوێ ، **کە سەرەتای تەریقەی نەقشبەندی لەسەیری ئەنفوسەوە دەست پی ئەکات ، وە سەیری ئافاقی خۆبەخۆ لەگەڵی سەیری ئەنفوسیدا دەستئەکەوێ ، بەلاّم رێبازەکانی تر لەپێشا ئەبێ سەیری ئافاقی تەواوکەن جا دەست بکەنە سەیری ئەنفوس ، کتێبی (مناهِجُ السّير)** .

بۆ روون کردنەوە ئەلێم سەیری ئافاق سەیری جیهانی سوروشتە کە هی دەرەوەی مرۆڤ وە بەشی عالەمی خەلقە ، سەیری ئەنفوس بڕینی مەقامەکانی دەرونە کەگوتمان ، پیێان ئەلێن لەطائف ، وەهی عالەمی ئەمرە ، ئەو شتانەی ، وە ئەو

ئەنوارو ئەسرارەی ، لەدەرەوەی دەرونەوە ئەبێنرێن ، هی عالەمی خەلقە ، واتە هی ئافاقە ، ئەوەش لەدەرونا هەستی پیێ ئەکرێت و ئەبینرێت ، هی ئەنفوسە ، وە هی عالەمی ئەمرە .

لێرەدا خۆم ئەلێم زۆر جار لەباوکم ئەمبیست ئەیفەرمو ، پیاوچاکان ، بەتایبەت ئەوانەی کە خەڵك نایان ناسن ئەڕۆنە ناوی بازارو قەرەبالغ ، ئەمەش بۆ ئەوەتە خوای گەورە هەمیشە (**تەجەللا**) ی هەیە ، واتە نوری رەحمەتی ئەڕێژێ بەسەری خەڵکا ، بەڵام ئەوەی لەخوا غافل بێت لەو بەهرەیە بێبەش ئەبێت بەڵکو ئەروات بۆ ئەوانەی کە غافل نین ، جا چونکە لەوجۆرە شوێنانەدا خەڵك زۆربەی سەرگەرمی کاری دنیایی یە ئاگای لە هیچی تر نیە ، ئەوەی ئاگاداربێ هەموی ئەڕژێ بەسەری دەرونی ئەوکەسەدا جا ئەمەش هەر (**خەلوەت دەر ئەنجومەن**)ە .

**توانایی بۆ ئەنجامی ئەمکارانە وە بەجێهێنانی ئەم رەوشانە ، ئەویش ، خۆی دەس کەوتێکن دەستی ئەو رێبوارانە ئەکەون ، کە بەهۆی خواپەرستی و راست رەوی و ذیکرو فیکرەوە گەیشتونەتە ،ئەوپایانە .**

٥ — یادکرد :

واتە ، یادکردنەوە کە بەعەرەبی ئەبێتە «**ذیکر**» ذیکری خودا بناغەی کاری هەموی رێبازەکانی تەصەووفە ، مەبەستم لێرەدا ، هەموی واتاکانی ذیکرە ، واتە ، قورئان خوێندن ، نوێژکردن ، ناوی‌خوابردن وە یادی خواکردن ، لەناوی ئەم ذیکرانەدا ، بەشی ناوی خوابردن وە یادی خواکردن لەهەموی زیاترە ، بری لەرێبازەکان بەدەنگی بەرز وەبرێکی لە دەرونەوە ذیکرئەکەن ، گوتمان نەقشبەندی یەکان پەیرەوی ذیکری دەرونن هەروەها گوتمان ئەم ذیکری خودایە دووجۆرە ذیکری (الله) واتە ذیکری «ذات» وە ذیکری «**لا اله الا الله**» واتە نەفی و ئیسبات ، پێغەمبەر فەرمویەتی ، باشترین وە بەرزترین شتێك من وە پێغەمبەرانی پێش لەمن وتومانە ، ووشەی «لااله الا الله» یە .

بەر لەرۆژگاری شاهی نەقشبەند بەم‌رێبازە گوتراوە تەریقەی «خواجەگان» گەورەترینی ئەو مورشیدانەی بە خواجە بەناوبانگ بون خواجە عبد الخالق غەجدەوانی‌یە جا ، بەرلەو، ذیکری زمانییش ئەنجام دراوە ، بەڵام شێخ عبد الخالق ذیکری دەرونی ی رەواجدا ، ئەمە ئەوکەسەتە کە بناغەدانەری ئەم ووشانەیە کە

باسیان ئەکەین ، پاش ئەویش سەرلەنوێ بڕێ لە ناوی نەقشبەندی یەکانا ذیکری زمانیش ئەنجام ئەدرا تا زەمانی شاهی نەقشبەند ، محمد بهاء الدین ، کە سەرۆلکو گەورە پیاوی ئەم ڕێبازەتە ، ئەو جارێکی تر دەستوری دا ئەبێ ڕێبواری ئەم ڕێبازە هەر لەرێگای ذیکری دەروونی یەوە تێ بکۆشێت ، وە ئەوسێ ووشەیەشی خستە سەری دابی ڕێبازەکە ، واتەوقوفی قەلبی ی ، وقوفی عەدەدی ، وقوفی زەمانی ی . کە تێکرا بونە یازدە ووشە .

مەبەست لەم ووشەی یادکردە بەردەوام بونە لەسەری «یاد» واتە ذیکر . قانجازێکی گەورەی ئەم ذیکرە دەرونی ی یە ئەوەتە ، پێویستی بەدەنگ وە پیت ، واتە بە گوتنی زمان نیە ، کەوابو مرۆڤ ئەتوانێ بەئاسانی ی هەمیشە ذیکربکات تەنانەت لەکاتی ئیش و کاریشا ، بەلاَم ذیکری زمان لەکاتی ئیش وکارا بەتایبەت لەکاتی قسەکردنا ئەنجام نادرێ ، بۆیەلێرەدا ئەم باسی ذیکرە واتە : یادکرد هاتوە کە ڕۆشن بێت یەکێ لەبناغەکانی تەریقەی نەقشبەندی یە ، جا ، ئەبێ ئەم ذیکرە دەروونی یە ئەوەندە درێژەی بدرێتێ تا وای لێ دێت ذاکیر واتە ئەورێبوارە حوزوری هەمیشەیی ، مەذکور ، کەخودایە بۆی دەست ئەدات ، وە هەدەفیش هەر ئەو حوزورەتە ، وەئیتر ڕێبوار هەمیشە بەهەستی دەرونی ی خۆی وا لەحوزوری خوادا وە بەچاوی بەصیرەت ئەونورو بەرەکەتە ئەبینێ کە ئەبێتە ، موشاهەدە .

لام وایە زووتریش وتومە هی واهەیە لەشەوو ڕۆژا بیست و پێنج هەزار جار ذیکری «الله» ئەکات ، وە لای کەمی بۆئەوانەی تازەکارن وە دەستیان کردوەتە بڕینی ئەم ڕێگایە ، پێنج هەزار جار ، یاد ئەکەن . وەکووتمان ، پاش گەیشتن بەمراز وەحوزور ، وەکاتێ کەمەذکور لەدەرونا هەستکرا ، ئیتر باسی ژمارەو ئەو جۆرەشتانە ، تەنانەت ذیکر کردنیش نامێنێ . چونکە مەذکور کەخودایە دڵودەرونی داپۆشیوە ، وەرێبوار وا لەبڕینی مەقاماتدا . مورشید ئەزانێت ، یان ئەوکەسە خۆیو خوای خۆی کەئەبێ چی بکاو چی نەکات شایەد پێویستیش بێت ذیکربکات .

## ٦ – بازگەشت :

واتاکەی ئەبێتە گەڕانەوە ، لێرەدا مەبەست ئەوەتە ڕێبوار لەکاتی نەفی و ئیسباتدا پاش ئەوەی کە هەناسەی خۆیی گرتبو وە بە ژمارەی تاك تا ئەورادەیەی بۆی کرابو جارێ ، یان سێجار ، یان پانزە .. هتد ، ذیکری کردبو جا کە هەناسەی

دا ، ئەگەڕێتەوە بۆلای پاڕانەوەو داواکردن لە خودای خۆی ، جا ئەگەر ذیکرەکەی بەزمانبو ئەم جوملەیە بەزمان ئەڵێ ئەگەر ذیکرەکەیشی بەدڵ بوو ، بەدڵو خەیاڵ ئەڵێ «**الهی أنت مقصودی ورضاك مطلوبی**» ، واتە خودایا مەبەستی من هەرتۆیەو ڕەزامەندیی تۆم پێویستە ، ئەمە بۆچی‌یە ؟ بۆ ئەوەتە هەر بیرو خەیاڵێکی چاك یان خراپ لەو چەن چرکەیەدا ڕوی کردبێتە دەرونی دوری خاتەوەو هۆش‌و بیری بگەڕێتەوە بۆلای خوای خۆی ، وە جگە خوا لە هیچی‌تر بیرنەکاتەوە .

### ۷ – نیگاە داشت :

واتە ڕاگرتن ، خۆیشمان ئەڵێین نیگای بدێرە . نیگاەداشت ئەوەتە لەکاتی ذیکرکردنا ئەوکەسە بکۆشێ هەرگیز خەتەرە ڕونەکاتە دەرونی ، ئەگەر هاتو خەتەرە ڕوی‌کردە دەرونی چ خەتەرەی باش چ هی‌خراپ ، ئەبێ ذیکرەکە ڕاگرێ ، تا خەتەرەکە لەدڵ دەرئەکات ، جا سەرلەنوێ دەست‌کاتەوە بەذیکر ، هەروەکو لە کتێبی «مُناهِجُ السَّیر» دا ئەڵێ ، نیگاهداشت ، ئەوەتە ، ئەو بەرەکەت‌و دەست‌کەوتەی کە لەسایەی بەردەوامی‌ی ذیکرەوە دەست ئەکەوێ یان ئەو چۆنیەتی ئاگاداریی‌و حوزورەی بەهۆی ذیکرەوە دەست‌ئەدات بۆڕێبوار ، ڕای‌گرێ وەنەیێڵێ هیچ خەتەرەیی ڕوو بکاتە دڵی .

مەناهیج ئەل‌سەیر نوسینی (ابو الحسن زید مجددی فاروقی) یە ، ساڵی ۱۹۵۷ لەدهلی‌چاپ‌کراوە .

لە کتێبی ڕەشەحات عین الحیاة دا کەلەساڵی (۱۹۱۲) لەکانپوردا لەچاپ‌دراوە فخر الدین علی کاشفی لەزمانی سعد الدین کاشغەری‌یەوە ئەڵێ ، ڕێبوار هەرچەندە بۆی بکرێت ، سەعاتێ دوان سیان ، هەرچی بۆی‌کرا هۆش‌وبیری دەرونی خۆی بەجۆرێ ڕاگرێت جگە لەخودا هیچ بە دەرونیا تێ نەپەڕێ .

برێ لە گەورەپیاوانی تەریقەت ئەڵێن نیگاهداشت تەنها بۆکاتی ذیکری نەفی‌وئیسباتە ئەویش ئەوەتە مەعنای ذیکرەکە لەدڵا ڕاگرێت بۆئەوەی ئەو مەعنایە هەر بەردەوام لەدڵابێت کە بریتی‌یە لەوەی هیچ خودایێك نیە جگە الله ، وە ئەگەر نەتوانێ ئەم‌کارە بکات حوزوری دڵ بۆی دەست نادات .

بەکورتی‌ی هەموی ئەم کۆششە بۆ ئەو بەردەوام بونی حوزورەتە ، چونکە حوزوری دڵ وە پاراستنی دەرون لەهەمو خەتەرەو خەیاڵێك ئەوە خۆی گرنگ ترین

مەبەستێکە هەمیشە صۆفی یەکان گرتویانەتە پێش چاو وە پایەیێکە لە پایەکانی تەصەووف ، وە مەشایخان لەم بارەوە زۆر باسیان کردوەو زۆر رایان سپاردوە بۆ چاودێری لی کردنی .

ئەبێ ئەوەش بزانین ئەوە دەست نادات کە هەرگیز هیچ خەتەرەیێك بەدڵا تێپەر نەکات بەلاّم ئەم نیگاهداشتە ئەوەتە مرۆڤ هەولێ بدات خەتەرەو خەیالێ لەدڵا سەقامگیر نەبێ‌و نەمێنێتەوە وەکو پوش‌و پەلاّشی سەری ئاوی تیژبەر وابێت نەوێسیێتەوەو بروات ، لە کتێبی (الحدائق الوردیه) نوسینی عبد المجید الخانی لەزمانی علاء الدین العطارەوە ئەڵێ ، ئەوەی نەیێڵن هیچ خەتەرەو خەیاڵێك روو بکاتە دەرون زۆر سەختە وە ناکرێت ، بەلاّم ئەبێ بکۆشن دەوامی نەبێت ، ئەفەرمێ من بیست ساڵێ دڵی خۆمم پاراست لە خەتەرەو خەیاڵ کەچی پاش بیست‌ساڵێ هەر خۆی گەیاندە دڵم ، بەلاّم نەم‌هێشت سەقامگیر بێت .

## ٨ – یاد داشت :

یادداشت شوهود یان موشاهەدە وە (عین الیقین) یشی پێ ئەڵێن ، شیخ محمد امین الکردي ئەڵێ «الکنایةُ عَنْ حُضور القلبِ مع الله تعالی علی الدّوام فی کل حال من غیر تکلّفٍ ولا مجاهدةٍ وهذا الحضور فی الحقیقة لایتیسّرُ الاّ بعد طیّ مقامات الجذبةِ وقَطعِ منازلِ السّلوك .

لە شوێنیکی‌ترا لە کتێبی (تنویر القلوب) دا ئەڵێ ، یادداشت لەپاشی فەناو لەپاشی بەقای حەوتەم‌دا جا دەستی رێبوار ئەکەوێ .

کەوابو یادداشت بەرهەمی رەنجی رێبوارە وەبریتی‌یە لەو حاڵەتی گەیشتن بە ئاواتی پاش رەنج‌و تێکۆشانە ، یادداشت ئەتوانێ بەرهەمی ذیکر ، یان موراقەبە ، یان یارمەتی‌ی موڕشید بێت ، وە رێبوار پاش برینی هەمو کۆسپێ جا ئەیگاتێ .

عبیدالله ئەحرار ئەفەرمێ :

یادداشت بریتی‌یە لەوەی کەشوهودی حەق بەهۆی (حوبی ذاتی) ، واتە خۆشەویستی‌یەوە ، ئەو رێبوارە داپۆشێ ، ئەتوانین بڵێین بریتی‌یە لە (حوزوری بێ غەیب) واتە ئامادەبونێ کە ئیتر وون‌بون وە لاچونی نەبێت . هەروەها ، بۆ روون کردنەوەیێکی زۆرتر گوتراوە یادکرد بریتی‌یە لە بەردەوام بون لەسەری ذیکر ، وە بازگەشت ، ئەوەتە پاش هەر پشودانێ لەذیکر ئەوکەسە ئەگەرێتەوە بۆلای ئەوەی

کە لەدڵەوە بڵێت ، خودایا مەقصودیمن هەرتۆی وەرەزامەندیی تۆو نزیکی ی تۆیە مەبەستم ، وەنیگاهداشت بریتی یە لە پاراستنی ئەو گەڕانەوە بێئەوەی بەزمان هیچ بڵێت .

جا یادداشت بریتی یە لە بەردەوام کردنی ئەو نیگاهداشتە وە تێکۆشان بۆ لەدەستنەدانی ئەو حوزورە .

ئێستە دێینە سەری باسی ئەو سێ ووشەیەی کە شاهی نەقشبەند خستونیەتە سەری ئەم نۆ ووشانەی کە باسمان کردن ، کە بریتین ، لە وقوفی زەمانی ی ، وقوفی عەدەدیی ، وقوفی قەلبیی ، ئەم یانزە وشەیە (لازمومەلزوم)ی یەکن ، وەرێبوار بەچاودێری لێکردنی هەمویان ئەر خوا بۆی بکات ئەگاتە سەری لوتکەی شاخی ئاوات .

٩ — وقوفی زەمانیی :

ئەم وقوفی زەمانی یە ئەتوانین بڵێین وەکو (موحاسەبە) ی دەرونی وایە ، واتە رێبوار هەر ماوەی چەنساتێ یان چەن کاتێ جارێ لە ذیکر رائەوەستێ وە لە دەرونی خۆی ورد ئەبێتەوە بزانێ ئەو ماوەیە بەچی تێپەڕاندوە ئەگەر بە ئامادەبون حوزوری هەقدا بوە وا سوپاسی خوا بکات وە ئەگەر بە غەفڵەت وە بێهەواڵی تێپەڕیوە پەشیمانی ی پیشان بدات واتە (**ئیستیغفار**) وە داوای لێبوردن وە بەخشین بکات لە خودا .

لە کتێبی رەشەحاتدا لەزمانی بەهائوددین نەقشبەندەوە ئەڵێ وقوفی زەمانیی وەکو کاروبار بەرێوەبەری رێبواری ئەم رێبازەتە ، بریتی یە لەوەی رێبوار هۆشی بەخۆیەوەبێت وە ئاگای لەحاڵی خۆیبێت بزانێ لە هەردەمێکا حاڵیخۆی چیەو چۆنە ئایا هیئەوەتە شوکری خودا بکات یان هیئەوەتە عوذر بێرێتەوە هی هەرکامبو ئەوەیان بکات .

مەولانا یەعقوبی چەرخی ی کە یەکێکە لە موریدە پایە بەرزەکانی شاهی نەقشبەند ئەڵێ ، حەزرەتی خواجە واتە ، شاهی نەقشبەند خوای لێرازیبێ ، هەرکاتێ رێبوار دوچاری دڵگیران «**قەبض**» بوایە ئەیفەرمو ئەبێ (**ئیستیغفار**) بکات ئەگەریش دڵکرانەوە «**بەسط**» رووی تێکردایێ ئەیفەرمو سوپاسیخوا بکە ، کە

چاودێری ئەم دووحاڵە «وقوفی زەمانی» یە ، بەم فەرمودەیەدا وادەرئەکەوێ حاڵەتی **(قەبض)** لە غەفڵەتەوە ، وە حاڵەتی **(بەسط)** لە ئاگاداری‌یەوە سەرچاوە بگرن .

باسی قەبض‌و بەسط لەبەشی موصطەلەحات‌دا کراوە .

## ١٠ – وقوفی عەدەدی :

بریتی‌یە لەوەی لەکاتی ذیکری نەفی‌و ئیسبات دا کە ئەبێ هەناسە پەنگ بدرێتەوە لەم کاتەدا ذیکرەکان بەتاك ئەنجام بدرێن واتە جارێ یان سێ ، یان پێنج ... هتد ، هی واهەیە ئەتوانێ تا بیست‌ویەك جار بە یەك هەناسە ذیکر ئەکات ، جا ، بەم چاودێری کردنی ژمارەی تاکە ئەڵێن وقوفی عەدەدی ، واتە رێبوار **(واقیف)** بێت ، ئاگاداربێت ژمارەی ذیکرەکانی تاك بێت .

بێگومان ئەم ذیکرە بە زمان نیە بەڵکو بە دڵە ، واتە بە دەروونە ، ژمارە کردنە کەیش هەروا ، نابێ بە زمان بێت ئەبێ بەدەروون بێت .

ئەبێ ئەوەش بزانین بە ئەنجامدانی ئەم رەوشە بەرهەمی مەعنەوی زۆر دەستی رێبوار ئەکەوێ ، وە ئەم رەوش‌و دەرامەدی رەوشانە ، لە ماوەی صەدان ساڵ‌دا ئەوەندە تاقی کراونەتەوە بونەتە بەدیهی‌یاتی تەریقەت ، وەلای رێبواران ئاشکراو رووناکە .

«**عبد الرحمن ، جامی‌ی**» (**٨١٧ – ٨٩٨**) ك ، خاوەنی «**نَفَحاتُ الاُنس**» ، لەریسالەی نوری‌یەدا کە دەست‌خەتەو نوسخەیێکی وا لە «**دار الکتب المصریة**» دا ، ئەڵێ وقوفی عەدەدی ، بۆئەوەتە ئەو رێبوارە بزانێت کەی،واتە لە چ ژمارەیێکا ئەو ذیکرە بەرهەم ئەدات ، زووتر گوتمان ئەگەر گەیشتەبیست‌ویەك جار وە بەرهەمی مەعنەوی نەبو دیارە مەرجەکانی بەباشی ئەنجام نەداوە ، جابۆئەوە چاودێری لە ژمارەکان ئەکات تا بزانێ ئایا بەرهەمی هەیە یام نا ئەگەر گەیشتە بیست‌ویەك‌و بەرهەمی نەبو بگەرێت وە کەموکوری کارەکەی بدۆزێتەوە ، شاهی نەقشبەند خۆی ئەفەرمێ ، ئەم لەپێش‌چاوگرتنی ژمارەیە بۆئەوەتە هۆش‌وبیری ئەوکەسە نەروات بەم‌لاو بەولادا .

عەلائوددینی عەتتار ئەڵێ کەڵك وەرگرتن لەذیکر بەوەنیە کە زۆربێت بەڵکو بەوەتە بەئاگادارپی وە چاودێری ئەنجام بدرێت ، ئەو ئاگاداریو چاودێری‌یەش ئەبێتە وقوفی زەمانیو عەدەدیی .

## ١١ - وقوفی قەلبی :

شاە عبد اللە‌ی دهلوی ، ئەڵێ وقوفی قەلبی‌ی بریتی‌یە لە ئاگاداربونی رێبوار لەحاڵی دڵی خۆی واتە دڵی بخاتە ژێری چاودێری‌یەوە وە هەوڵ‌بدات بۆئەوە‌ی بزانێت ئایا دڵی ذیکر ئەکات یانا . لە هەمان کاتا ئەبێ تێکۆشێ شێوەیێك بۆدڵ دانەنێ ، واتە شکڵی دڵی گۆشتین لەپێش چاو لابەرێ ، هەروەها بۆ ناوی خودایش کە (**الله**) یە ، ئەو شێوەی نوسینە نەگرێتە پێش چاو بەڵکو مەبەستی ذاتی (الله) بێت ، کە خودای هەردو جیهانە .

کەواتە وقوفی قەلبی راوەستانە بەسەری دڵەوە وەکو (**مەنور**) وە پی‌سپێرراو کە هەم ذیکر بکات وە هەم لەخودا غافل نەبێ ، وە هەم مەبەست لەشوێنی دڵ بێت نەك شێوەی ، وە مەبەست لە ذیکر مەذکور بێت نەك پیت وە ووشە ، لەگەڵی ئەوەشا ئاگادارپی دڵ بکات کەدڵ چاوەروانی نورو بەرەکەت بێت لای ژورەوە ، بێگومان خودای گەورە شوێنێکی دیاری‌کراوی بۆ نیە وە لە هەمو شوێنێکا هەیە ، بەلام چونکە ، بە ئیعتیباراتی ئینسانی‌ی ، لای‌ژورو هی رێزگرتنە ، لەبەری ئەوە دڵی رووەو ئاسمان ، رووەو لای ژورو ، چاوەروانی نورو بەرەکەت بێت .

بەلای بهاء الدین محمد واتە شاهی نەقشبەندەوە ئەم وقوفی قەلبی‌یە لە وقوفی زەمانیو عەدەدیی گرنگ‌ترە ، چونکە ئەفەرمێ وقوفی عەدەدیی وەزەمانیی هەرچەندە پی‌ویست وە بەکەڵکن وە بەهرە ئەدەن بەلام ئەگەریش نەکران ، کار پەکی ناکەوێ بەلام وقوفی قەلبی زۆر پێویستە بەجۆرێك ئەگەر مرۆڤ لەکاتی ذیکرا ئاگای لەدڵی نەبو وە هەروا ذیکر هات بە دەمیا یان بەدەرونیا ئەوە رەنجی بەهەدەر ئەروات .



## «زەنجیرەی نەقشبەندی یەکان»

لەوەلاّمی پرسیاری دوهەمدا ئەڵێم هەروەکو شێخ محمد امین الکردی لەکتێبی **(المواهب)** دا ئەڵێ ، وەهەروەکو لە کتێبی **(قدسیە)**ی فەرمایشەکانی بەهائوددینی نەقشبەندا هاتوە .

تەریقەی نەقشبەندی دەست بەدەست ئەروا تا ئەگاتە سەری پێغەمبەر **(درودی خوای لەسەر)**. بۆ ئەم گەیشتنە سێ زەنجیرە هەیە ، زەنجیرەی یەکەمی هی **(ئالی بەیتە)** واتە نەتەوەکانی حەزرەتی عەلی ، بەوبۆنەوە بەناوبانگە بە **(سلسلة الذهب)** ، واتە زەنجیرەی زێرین ، کە بەم جۆرەیە .

١ – حەزرەتی موحەممەد **(درودی خوای لەسەر)**
٢ – حەزرەتی عەلی
٣ – ئیمام حوسەین
٤ – ئیمام زەینول عابیدین
٥ – ئیمام باقر
٦ – ئیمام جەعفەری صادیق
٧ – ئیمام موسی کاظم
٨ – ئیمام رەضا

٩ - شێخ مەعروفی کەرخی
١٠ - سیرری سەقطی
١١ - جونەیدی بەغدادی
١٢ - شێخ ئەبوعەلی رودباری
١٣ - ئەبو عەلی کاتب
١٤ - ئەبو عوسمانی مەغریبی
١٥ - ئەبولقاسیمی گورگانی
١٦ - شێخ ئەبوعەلی فارمەدی .

لە شێخ ئەبوعەلی دا هەرسێ زەنجیرەکە یەك ئەگرنەوە چونکە لە هەردولاوە ئیجازەی ئیرشادی موطلەقی وەرگرتوە ، وەزوتر لە شێخ مەعروف دا دوو زەنجیرە لە زەنجیرەکان بونەتەوە بەیەك .

زەنجیرەی دووهەم بریتی یە ، لە .

١ - حەزرەتی موحەممەد درودی خودای لەسەر .
٢ - حەزرەتی عەلی .
٣ - حسن البصري
٤ - داوود الطائي
٥ - معروف الكرخي

ئەوەتا سەیر ئەکەین شێخ مەعروفی کەرخی لەدوولاوە ئیجازەی دراوەتێ .

هەروەکو لەپاشان دەرئەکەوێ ئیمام جەعفەری صادیقیش لەدوولاوە ئیجازەی دراوە هەم لەلایێ باوای باوکی یەوە حەزرەتی عەلی ، وە هەم لەلایێ باوای دایکی یەوە حەزرەتی ئەبوبەکر .

ئەوەی شیاوی باسە کاتێ خۆی دۆستی بەرێز زاناو شاعیرو خەت خۆش وە ئەدیب ، سەیید طاهیری هاشیمی بەو خەتە جوانەی خۆی هەمو زەنجیرەکانی

بەزیادیشەوە بەجوانیی بۆنوسیوم بەئومیدی خوا لەم کتێبەدا چاپی ئەکەم ، هەروەها ئەو زەنجیرەیەش کە لە کتێبەکەی قودسی‌یەدا چاپکراوە ئەویش چاپ‌ئەکەین ، وەمن خۆیشم بەوجۆرەی،خەتم،لەزەمانی باوکما خوێنراوەتەوە ئەینوسم، خەتم بریتی‌یە لەو ذیکرەی ئێواران‌و بەیانیان پەیرەوانی نەقشبەندیی ئەنجامی ئەدەن ، لەپێشا یادێك لەمردن ئەکەن ، یادێك لە پیری ئەو سەردەمە ئەکەن ، صەلەوات ولاحول‌ولاقوةالاباللە ، وە یاباقی انت‌الباقی ، هەرکامەی بەرادەی دیاری‌کراو ئەخوێنن ، وە قورئانیش ئەخوێنن ، وە وێنەی ئەوابی ئەم قورئان‌و خەتمە ئەنێرن بۆ رۆحی مورشیدی خۆیان ، هەروەها بومورشیدی ئەو وەمورشیدی ئەو ، تا ئەگاتە سەری حەزرەتی موحەممەد ، (د) ئەمە لەکاتێکایە ، چرا کوژاوەتەوە خەڵکەکەش چاو ئەنوقێنن ، ئەوەش هەر بۆ تەرکیزە ، وەبۆ ئەوەی بیروهۆش بەملاو لادا نەروات ، ئەم خوێندنانە هەریەکەی ئەندازەی خۆی هەیە ، ئەمە زۆر بەکورتی‌ی ، تەنها بۆ ئەوەبو تێبگەن خەتم بەچی ئەڵێن .

زۆرجار مورشید خۆی لەوکۆڕەدا بەشداریی ئەکات ، وەزۆر وایش ئەبێ لەو کۆڕەدا رووی دڵی ئەکاتە یەك یان چەن کەسێ لەو خەڵکە وە بەهرەمەندیان ئەکات ، بەو رویدڵ تێکردنە ئەڵێن ، تەوەججوە ، جاری وایش ئەبێ ، جگە خۆیشی چەن کەسێ لە خەلیفەکان هەڵ ئەسێنێ بۆ تەوەججوە ، بێگومان ئەوەی شێخ هەڵی ئەسێنێ نیشانەی ئەوەتە گەییوەتە پایەیێکی وا ئەم سپاردەیە پی‌بسپێرن ، بەلام ئەم کارە هێشتا سەرەتایێکی کەمی تەریقەتە .

مورشید ئەگەر مورشیدبو حازریش نەبێ هەرکەسە بەپێی ئامادەیی خۆی ، بەهرەی لێ وەرئەگرێت ، کاتی وا هەیە ئەوەی ئەو مورشیدە لە ساتێکا بۆ ڕێبوارێکی ئەکات ، خۆی بەدەسالێ تێکۆشان بۆی ناکرێت .

من تائیستە چەن جارێکی تریش عەرزم کردن من خۆم بەهیچ نازانم ئەمانەی کە نوسیومە هی برێ وردە شارەزایی یەو هی ئەو سەرچاوانەیە کەوان بەدەستمەوە .

لەگەڵی ئەوەشا سەرفرازم بەوەی باوکم حەزرەتی شێخ علاء الدین **(تەریقەتی تەلقین کردوم)** ، کەواتە هەرچەند نەمتوانی لەو سەرچاوەی فەیزە بەهرەمەندبم وە خوا نەیکردە نەصیب ، بەلام ئەو دلخۆشیەم هەیە هەروا کە رۆڵەیم هەروایش رۆڵەی

مەعنەویم وە خۆم بە یەکێ لە پەیڕەوانی ئەو ذاتە دائەنێم ، سا خوایش بە پەیڕەوی ئەوان کە پەیڕەوی‌یە لە ڕێگای ڕاستی موحەممەدی وەرم گرێت .

ئەمەش زەنجیرەی تەریقەتی نەقشبەندی لە مورشیدی خۆمەوە ، واتە لەباوکمەوە . وە ناوەکان لەسەری شێوەی خەتی عەرەبی ئەنوسم چونکە هەمویان عەرەبین .

١ – شێخ محمد علاء الدین ،
٢ – شێخ عمر ضیاء الدین
٣ – شێخ محمد بهاء الدین
٤ – شێخ عثمان سراج الدین
٥ – شێخ مولانا خالد نقشبندی
٦ – شاه عبد الله الدهلوی
٧ – شمس الدین حبیب الله جانْ جانان مظهر
٨ – سید نور محمد البدوانی
٩ – سید محمد سیف الدین
١٠ – شێخ محمد معصوم
١١ – الامام الربانی شێخ احمد الفاروقی .
١٢ – شێخ محمد باقی .
١٣ – محمد خواجَگی أَمْکَنِی .
١٤ – درویش محمد
١٥ – شێخ محمد القاضی الزاهد .
١٦ – شێخ عُبَیْدُ الله الأحرار .
١٧ – شێخ یعقوب الچَرْخی
١٨ – شێخ علاء الدین العطار
١٩ – شێخ محمد بهاء الدین (نقشبند) .
٢٠ – شێخ سید کلال
٢١ – شێخ محمد بابا سماسی
٢٢ – شێخ علی الرامتینی

٢٣ – شیخ محمود انجیر فغنوی
٢٤ – شیخ عارف ریوگری
٢٥ – شیخ عبد الخالق غجدوانی
٢٦ – یوسف الهمدانی
٢٧ – ابو علی الفارمدی
٢٨ – ابو الحسن الخرقانی
٢٩ – ابو یزید البسطامی .
٣٠ – سیدنا جعفر الصادق .
٣١ – قاسم بن محمد بن ابی بکر الصدیق
٣٢ – سلمان الفارسی
٣٣ – سیدنا ابو بکر الصدیق
٣٤ – سیدنا وحبیبنا وشفیعنا محمد . (صلى الله علیه وسلم)

«درەختی زنجیرەی ڕێبازی نەقشبەندی»



بۆچی، وە لەکەیەوە،

ئەم ڕێبازە ناونراوە نەقشبەندی. ؟ 

هەروەکو لە چۆنیەتی زەنجیرەی گەورە پیاوەکاندا بۆمان دەرکەوت وەهەروەکو لەکاتی لێکۆڵینەوەی سەرچاوەی تەصەووفدا باسمانکرد ،... تەصەووف پەیرەوی‌یێکی موبەمویە لە ئاینی ئیسلام وە لە گوفتارو کردارو دەستوری پێغەمبەری ئیسلام .

لەزەمانی پەیامبەر خۆیشیا کەسانێکی وا هەبون زیاتر لە هاوەڵە کانیان سەرگەرمی خواپەرستیی بون بەڵام هەمویان بەهۆی هاوریێی ئەو سەروەرەوە بەناوی ئەصحاب ، واتە ؛ هاوەڵ ناونران ، پاش ئەویش هەرچی وەزعی رێبەرانی ئیسلام رووی ئەکردە دنیاو تێکەڵبونی لەرادەبەدەری دنیاو هەوڵدان بۆ دەستکەوتی دنیایی ، برێ لە خواناسان و خواپەرستان زیاتر دورئەکەوتنەوە لەدنیا وە سەرزەنشی ئەوانەیان ئەکرد کە خدەیان داوەتە دەستکەوتە دنیایی‌یەکان .

ئەم چۆنیەتە لەزەمانی «تابعین» دا بو ، تابیعین چینی پاش ئەصحاب بون ، ناوی ئەصحاب وە تابیعین ئەوەندە پیرۆزبو ئەو خوا پەرستوکەنارە گیرانە هەر لەژێری ئەو ناوانەدا مانەوە ، بەڵام لە ناوەراستی صەدەی دوهەم بەملاوە وردە وردە کە ناوی تابیعین تیائەچو ناوی زاهید،یان عابید،وە ئەوجۆرە ناوانە بونە هی خواپەرستانی کەنارەگیر ، لەئاکامدا لەدوایی صەدەی دوهەمدا بو ، کە ناوی صوفی برا بەباڵای ئەو خوا پەرستانەدا کە ئەو زەرق‌و بەرقە نەی خەڵەتاندبون وە هەر لەسەری ئەوجۆرە خواپەرستی‌یە مانەوە کە گەورەپیاوانی ئەصحاب وە تابیعین لەسەری بون .

لەپاشی ئەم هەموە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە ئیستە هیچ گومانم نەماوە ، پۆشینی پۆشاکی بێ زەرق‌وبەرقی خوری گرنگترین هۆیە بۆ ئەوەی ئەم ناوەی بریبێ بەسەری ئەو خواپەرستە کەنارە گیرانەدا ، لەم ماوەیەدا باسێکم سەبارەت بە پەپولەی باڵسوتاوی مەحەببەت رابیعەی عەدەوی‌یە ئەخوێندەوە ئەڵێ لەکاتی سەرەمەرگا بە ژنێکی هاوەڵی خۆی گوت ، کە مردم بمشۆ وە بەم عەبا خوری‌یەی خۆم کە لەبەرمایە کەفنم‌بکە ، هەروەها لەکتێبی «تذکرة الأولیا» ی فەریدوددینی عەتتار دا (٥١٣ - ٥٨٦) ، لەباسی حەسەنی بەصری‌دا ئەڵێ لەکاتی وەعظ دا تا رابیعە نەهاتایێ دەستی نەئەکردە مەوعیظە وە ئەیگوت ئەم هەموە گەرمی‌و بەرەکەتی وەعظەم هی ئەو پیرەژنە خوری پۆشەیە .

مەبەستم ئەوەتە بڵێم تەنانەت ئەوژنەش کە صوْفی مەسلەك بوە لە گەرمای بەصرەدا پۆشاکی خوری لەبەر کردوە .

مەبەست لەم پێشەکی یەتارادەیێ دوبارەیە ، ئەوەتە بڵێم تائەوکاتە ناوی تەریقەت بەم جۆرەی ئیستە نەبوە وە هەر ناوی ئەصحاب وە تابعین بوە ، هەروەکو ناوی مەزهەبیش کە نەبوە لەپاشان هەم مەذهەب هەم تەریقەت بەناوی قارەمانە کانیانەوە ناونراون ، ئەگەر ئیمامی ئەبوحەنیفە وە ئیمامی شافیعی یێك نەبوایێ ناوی مەذهەبی حەنەفی و شافیعی نەئەبو وەئەگەر عبد القادری گەیلانی و بەهاءالدینی نەقشبەندیێك نەبوایێ قادری و نەقشبەندییێك نەئەبو .

نەقشبەندی یە کان ئەڵێن لە سەرەتادا ئەم ڕێبازی ئێمە پێی گوتراوە «**صیددیقیە**» واتە تەریقەی حەزرەتی ئەبوبەکری صیددیق ، پاشان بوەتە طەیفوریە ، تەریقەی بایەزیدی بەسطامی ، کە ناوی ، طەیفور بوە .

لێرەدا ئەڵێم ئەمە،وا ناگەیێنێ کە ئەبوبەکرەیان عەلی خۆیان ناوێکیان دانابێت بۆ ڕێ ڕەوێکی تایبەت ، مەبەستێکی ئەوەتە مامۆستا بە ماموستا ، یان بڵێین مورشید بەمورشید دەست بەدەست ئەگاتەوە لای ئەبوبەکر ، یان عەلی،خوایان لێ ڕازی ، یان ئەوەتە ئەڵێن ئێمە پەیرەوی ڕاهێنانی و کردارێکین کە ئەبوبەکر پاش فەوتی حەزرەتی موحەممەد ڕاهێنانی ئەوانی کردوە ، لەپێشا گوتمان پێغەمبەر فەرمویەتی ، خوای گەورە شتێکی نەرشتوەتە سنگی من کەمن نەی ڕێژمە سنگی ئەبوبەکر «**ماصَبَّ اللهُ في صدری شَیْئاً إلا وَصَبَّبْتُهُ في صَدْرِ أبي بکر**» ، دیارە ئەم ڕژاندنە ماددی نەبوە ، بەڵکو مەعنەوی یات وە مەعریفەت و حیکمەتە ، ئەسرارێکە ببێتە هۆی خۆش بەختی ی ، «**ئەمە لە بازاری تەصەووفدا پێی ئەڵێن ، ضیمنی یەت**» واتە مەقامەکە ، بە ڕیشەو بناغە هی یەکێکە ، بەڵام ئەوکەسە ئەتوانێ کەسێکی تر بخاتە سایەی خۆی ، وە لەونیعمەتە بەرخورداری کات ، وەکو لەباسی (**اندراج النهایه في البدایة**) وەباسی خەلیفەدا پەنجەمان بۆ ڕاکێشا .

یان کە ئەفەرمێ «**أنا مَدینةُ العلمِ وعليٌّ بابُها**» .

کەوابو چ تەریقەت وە چ مەذهەب هەرچەن بەناوی برێ گەورە پیاوەوە ناو ئەنرێن بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێ ئەوانە خۆیان شتێکی تازەیان هاوردبێتە ناوی ئیسلامەوە ، بەڵام بریتی یە لەوەی ئەو دانشمەندە لەشەرعا یان ئەو خاوەن کەماڵە

لەوەرعا رەوشەکانیان نوسیوەتەوەو دایان رشتوەتە قالَبیّ کە خوازیار بتوانیّ بەئاسانی ی کەلّکیان لیّ وەرگریّت وە بەهەلّەدا نەچیّت .

ئەرۆینەوە سەری باسەکە ، ئەلّیّین مادام حەزرەتی ئەبوبەکر ئاوا لە فەیضی پەیامبەر بەرخوردار بوبیّت ، ئایا نابیّ ئەویش پەیرەوی لەوذاتە بکاتو ئەم خەیرو بەرەکەتو حیکمەتو مەعریفەتە بداتەوە دەستی ئەمینیّك لە ئوممەتی موحەممەد بۆئەوەی ببیّتە هۆی خۆش بەختیو کامەرانی ی ئەوکەسانەی ئامادەن بۆ بەجی هیّنانی مەرجەکانی لایق بون بۆ ئەو خەلّاتە ؟ .

بەم جۆرە ئەبینین بریّك لە ریّگەی ئالی بەیتەوە ، بریّك لەریگەی حەزرەتی ئەبوبەکرەوە ، بریّکی وەکو ئیمام جەعفەری صادیق لەهەردوو ریّگاکەوە لەو خەلّاتە پیرۆزە بەهرەمەند ئەبن وە ئەبنە هۆی هیدایەتی ملیۆنها کەس لەئوممەتی موحەممەد ، بەناوی پەیرەوانی ریّبازەکانی تەصەووف ، ئیتر هەر تەریقەتیّك بیّت ، مەبەست پەیرەوی کردنە لە دەستوری قورئان وەگوفتارو کردارو دەستوری حەزرەتی موحەممەد ، چ شافیعی چ حەنەفی چ نەقشبەندی چقادری چ ریفاعی ی ، مادام ئەوکەسە شویّن کەوتەی فەرمودەی پیّغەمبەرو دەستوری قورئانبو ، هەم خۆی خۆش بەختەو هەم ئەبیّتە هۆی خیّرو بەرەکەت بۆ موسولّمانان ، ئەگەریش ئەوکەسە خۆی چەوت رەوو لاریگر بو ئیتر نەگوناهی ئەبو حەنیفەیەو نەهی شافیعی ، نەتاوانی بەهائەددینی نەقشبەندەو نە غەوثی گەیلانی ی .

کەواتە ئەوانەی لە کردارو گوفتاردا وە لە بەدەست هیّنانی ئەنوارو ئەسراری مەعریفەتدا شویّنی حەزرەتی ئەبوبەکر کەوتبون ، خۆیان ناونابو صیددیقی ی ، یان ئەوانەی پاش خۆیان کە لە پەیرەوانی ئەوان بون بەوانەی پیّشی خۆیان گوتوە صیددیقی ی ئەمە تا بایەزیدی بەسطامی ، لە بایەزیدبەملاوە بەم ریّبازە گوتراوە تەریقەی طەیفوری تائەگاتە سەری خواجە یوسفی هەمەدانی ی بەتایبەت خواجە عەبدولخالیق غەجدەوانی ی لەویش بەملاوە تا موحەممەد بەهائەددینی نەقشبەند پیّی گوتراوە ریّبازی خواجەگان ، وە لەم ذاتە بەملاوە بەم ریّبازە گوتراوە نەقشبەندی ، وە تائەمرۆ بەم ناوەوە ماوەتەوە .

سەبارەت بەوشەی خواجە ، لەو سەردەمەدا لەمەلّبەندی بوخارادا چ لەفەرمان رەوایی تەیموری یەکان وەچ بەرلەوانیش ، بە گەورەپیاوانی دین وتراوە خواجە ، خواجە بەواتای سەرۆەر ، سەیید ، وە گەورە پیاوی دین هاتوە .

لەپاشی شاهی نەقشبەند برێجار بەهۆی هەڵکەوتنی گەورە پیاوانێکی وەکو عوبیداللە ئەحرار یان ئیمامی ڕەبانی «موجەددید» ەوە ، یان مەولانا خالیدی نەقشبەندی ، تەریقەت بەناوی ئەوانیشەوە ناونراوە وە کو ئەحراری‌یە ، یان موجەددیدی ، یان خالیدی ، بەڵام سەیر ئەکەین گەورەیی و پایەبەرزیی شاهی نەقشبەند بەڕادەیێکە ناوی هیچ کەڵەمەردێ تەنانەت گەورەییێکی وەکو ئیمامی ڕەبانیش نەیتوانیوە ناوی ئەو بشارێتەوە ، تائیستەش ناوی ئەم ڕێبازە هەر بە نەقشبەندیی ماوەتەوە .

لەهەموی گرنگ‌تر ئەوەتە پاش شاهی نەقشبەند هیچ‌کام لەو گەورە پیاوانەش خۆیان ئەوەیان پیشان نەداوە کە مەقامیان لەمەقامی ئەو باڵاتر بێت ، هەروەکو لەڕێبازی قادری دا کەس خۆی بەهاو پایەو هاو مەقامی ئەوذاتە واتە شێخ عەبدولقادر دانەناوە . کەواتە ئیستە بەکورتە باسێکی ژیانی ئەم گەورە پیاوە دوایی بەباسی نەقشبەندی دێرین .




وێنەی شوێنی لەطائفەکان لەسینەی مرۆڤدا



وێنه ی ئارامگه و مزگه وتی شاهی نه قشبه ند



وێنه ی ئارامگه و هه یوانی مزگه وتی به هائوددینی نه قشبه ند

خواجه بەهائوددین : موحەممەدی کوری موحەممەدی کوری موحەممەد ، بەناوبانگ بە نەقشبەند ، یان ، شاهی نەقشبەند یان موحەممەدی بوخاری ، لەمانگی موحەررەمی سالی «٧١٧» ی کۆچی دا ، لەگوندی «**قەصری هیندوان**» دا کە لەپاشان ناونراوە بە «**قەصری عاریفان**» وە کەوتوەتە یەك تا دوو فرسەخی شاری بوخاراوە ، لەدایك بوە ، بریّ لە سەرچاوەکان ئەلّێن سەییدەو حوسەینی یە ، باواگەورەی ناوی «**محمد جلال الدین**» ە .

ئەم موحەممەد جەلالەدینە خۆی موریدی «**خواجە محمد بابا السماسی یە ، کە پیری تەریقەتی خواجەگانە . وەکو گوتمان بەرلە نەقشبەند بەم رێبازە گوتراوە رێبازی خواجەگان .**

**خواجە موحەممەد بابا سەمماسی لە** «٧٥٥» ك دا لە دنیا دەرچوە .

«**محمد بهاء الدین**» تەنها سێ رۆژ لە تەمەنی تێ پەریبو خواجەی سەمماسی کە مورشیدی باوای بەهائوددین بو ، بەخۆیو موریدو مەنسوبێکی زۆرەوە رێی کەوتە قەصری هیندوان واتە گوندەکەی موحەممەد بەهائوددین ، باوای بەهائوددین نەوەکەی گرتە باوەش وە بردی بۆ خزمەتی خواجەی سەمماسی ئەویش زۆری پێ خۆش ئەبێت وەئەلّێ من ئەم کۆرپەیەم بە رۆلّەی خۆم قوبول کرد ، وە موژدە ئەدات بەموریدە کانی کەئەم منداڵە ئەبێتە پێشەوای رۆژگاری خۆی .

باوای بەهائوددین زۆر هەولّی دا بۆ پەروەردە کردنو پێ گەیاندنی ، لەتەمەنی هەژدە سالّیدابو ژنی بۆهێنا وەهەر لەم کاتەدابو کە هێشتا خواجەی سەمماسی مابو رۆیشتە خزمەتی وە بویە موریدی وە ماوەیێك سەرگەرمی سلوکی تەریقەت بو ، پاش ئەوەی سەمماسی لەسالّی «٧٥٥» ك ، دا فەوتی کرد ، باوای موحەممەد بەهائوددین موحەممەدی بردو پێکەوە رۆیشتن بۆ «**سەمەرقەند**» . بەشوێنی مورشیدێکی باشا ئەگەران کە بتوانێ بەهائوددین پەروەردە بکات ، لەوێ رۆیشتنە خزمەتی «**ئەمیرکولال**» کە جێ نشینی سەمماسی بو ، بەهائوددین دەستی ئیرادەتی دایە خذمەتی ئەمیرکولال وەبویە موریدی وەدەستی کردە سلوك وە تێکۆشان ، ئەمیرکولال فەرموی کاتی خۆی خواجە سەمماسی ی ئەمانەتی تۆی داوەتە دەستی من وە فەرمویەتی موحەممەد کوری منە هیچ دریغ مەکە لە پەروەردە کردنیا . بەهائوددین دەستی کردە ذیکرو فیکرو بڕینی رێبازی تەصەووف وەپەروەردەکردنی دەروون وە تەزکی یەی

نەفس. «ئیستیعداد» ی لەرادە بەدەربو ڕێگای مانگیێ بەرۆژی وەسالّی بەچەن رۆژ ئەبڕی، تا وای لیێهات رۆژ یێ لەرۆژان «سیدأمیرکلال» ، هەموی موریدەکانی کۆکردەوە وە لەپێشی چاوی هەمواندا بە بەهائوددینی فەرمو، وامن وەسیەتی مورشیدی خۆم خواجەی سەمماسی سەبارەت بە پەروەردە کردنی تۆ ئەنجامدا وە لە پەروەردە کردنی تۆدا دریغم نەکرد، پاشان دەستی ڕاکێشا بۆسەری سینەی خۆی فەرموی ئەوەی لەسنگمابو هەموم دادۆشی بۆت، وە ئیتر مەمکم وشکی کردوە، من توانیم بالّندەی رەوانی تۆ لەناوی تویکلّی (بەشەریەت)بێرمە دەر وە لەچنگی نەفس و شەیتان رزگارت کەم وە بیتە گەورە پیاویێ بۆخۆت وە تۆم کردە جیێنشینی خۆم، بەلاّم بالّندەی هیمەتی تۆ، بولّەند پەروازە، وەمنیش ئەمە ئەوپەری توانایم بو لە پەروەردە کردنتا، لەمەولا ئیجازەت ئەدەم خۆیشت برۆ بەلّکو پیاوی خودای بە دەسەلاّت‌تر پەیداکەیت وەئەوان بتوانن لەمەیش زیاتر سەرت‌خەن.

لێرەدا ئەیخەمەوە یاد، من لەشوێنێکی ئەم کتێبەدا گوتم، ئەگریێ بریێکەس لە مورشیدی خۆیشیان زیاتر سەرکەون وەکو شاهی نەقشبەندو مورشیدەکەی، واتە سەیید ئەمیر کولال جا ئەمەبو کەئیستە باسم‌کرد. بەهائوددین پاش ئەوەی لەخذمەتی ئەمیرکولال رۆیشت حەوت سالّی تریش لای مەولانا عاریفی دیگ گەرانیش دا کە ئەویش هەر ئەمیرکولال ئیجازەی ئیرشادی دابو، واتە هاو موریدی شاهی نەقشبەند بو مایەوە وەسەرگەرمی خودا پەرستیی بو، پاشان، ماوەی دوانزە سالّیش لای شێخێکی تورك کە ناوی «خەلیل ئاتا» بوە سەرگەرمی خوا پەرستیو سولوك بوە.

خواجە بەهائوددین هەر بەدەمی بەرێوە بردنی یاسای تەریقەتەوە زۆر جار ئەرۆیشتە خذمەتی عولەمای شەرع ئەی‌خوێند بەتایبەت حەدیث وە ڕەوشی ئەصحاب.

بەهائوددینی نەقشبەند دوو جاریش چوە بۆ حەج، لەیەکیێ لەم سەفەرانەدا کە لای داوەتە (هەرات) (مەلیك (معز الدین) ئەمیری ئالی کەرت، زۆر ڕێزی لیگرتوە، هەروەها زۆرجار سەفەری کردوەو تێکۆشاوە دنیای دەوروبەری خۆی ببینیو بناسیێ، چوەتە سەمەرقەند، ریوەرتون، سەمنان، مەرو، طوس، مەشهەد، تایباد، وە قزل‌رباطی کیش.

حەزرەتی خواجە بەهائوددینی نەقشبەند سەرەنجام لەتەمەنی حەفتاوسیٚ ساڵیدا شەوی دووشەممەی سیٚی رەبیع ئەل ئەووەل ساڵی (**٧٩١**) کۆچی‌ی ئەم جیهانەی بەجیٚ هیٚشت وە لە گوندەکەی خۆیا واتە (**قەصری عاریفان**) ئەسپەردەی خاك کرا. مەرقەدو ئارامگەکەی ئیستەش هەر زیارەت ئەکریٚت.

بەهائوددینی نەقشبەند کاتیٚ لەدنیا دەرچو دەیان هەزار موریدی پەروەردە کردبو کە لەناوی ئەواندا زۆریانی گەیاندبوە پایەی ئیرشادی موطلەق، وە لە چەندین پایەی بەقای پاش فەنا تیٚی پەراندبون، وە جیٚ نشینانو خەلیفەکانی ئەوانیش هەر لە بەرەکەتی ئەو ذاتەوە صەدان وە هەزاران کەسیان بە بەهرە گەیاندوە یەکیٚ لە جیٚنشینە زۆر بەناوبانگەکانی خواجە موحەممەدی پارسایە کە لەساڵی (**٧٤٩**)ك دا لە بوخارادا هاتوەتە دنیاوە ولەساڵی (**٨٦٥**) ك دا لە شاری بەلْخ دا لەدنیا دەرچوە بیست تەئلیفی لیٚ بەجیٚماوە، یەکیٚکیان کتیٚبی قودسیەیە کە فەرمودەکانی بەهائوددینی مورشیدیەتی وە نوسیونیەتەوە کوریٚکی لەشویٚن جیٚما بەناوی ئەبونەصر پارسا کە ئەویش لەگەورە پیاوانی تەریقەی نەقشبەندی‌یە؛ یەکیٚکی تر لە جیٚنشینە هەرە بەناو بانگەکانی بەهائوددینی نەقشبەند کە زنجیرەی ئیٚمە ئەرواتەوە سەری ئەو، (**شیٚخ محمد کوری محمد، بەناوبانگ بە عەلائوددینی عەتتار**) ە کە ئەویش صەدان گەورەپیاوی گەیاندوەتە لوتکەی مراز وەناوی دەیان خەلیفەی پی‌گەیشتوی لەکتیٚبەکانی نەقشبەندی دا هەیە لە «**حەدائق الوردیە**» دا جگە ئەوەی سەر گوزەشتی دەیان لە جیٚنشینانی عەلائوددینی نوسیوە ئەڵی (**ولەخلفاء کنجوم السماء**)، ئەرِۆینەوە سەری باسەکەمان.

سەبارەت بە ئارامگەی شاهی نەقشبەند لەکتیٚبی قودسی‌یەدا، گوتمان نوسینی خواجە موحەممەدی پارسا یەکیٚ لە جیٚ نشینەکانی بەهائوددینی نەقشبەندە وەدەساڵیٚك لەمەوبەر بە شیٚوەییٚکی زۆر زانایانەو ریکوپیٚك «**ئەحمەد طاهیر عیراق**» ناویك لە چاپی داوە، پاش تویٚژینەوەو پیٚشەکی نوسینو دەست نیشانکردنی صەدان سەرچاوەی دەستخەتو بەکەڵك لە کتیٚب خانە کانی جیهاندا، وە رازاندنەوەی کتیٚبەکە بە چەند ویٚنەییٚکی میٚژویی وە کو ویٚنەی ئارامگەی شاهی نەقشبەند؛ ئەڵیٚ ئەلوفسین ناویٚك، (O. Olufsen.) کە رۆژ هەلاٰت ناسیٚکی دانیمارکی‌یە وە لە ساڵەکانی «**١٨٩٦ - ١٨٩٩**» دا لە بوخارادا بوە، نوسیویەتی